پێشکەشە:

بەو هەڵوێست نەخشێنەی،

هەرگیز بیرناچێتەوە؛

هەڤاڵی ئازیز عەبدوڵڵا تۆفیق

# ناوەرۆک

# دەروازە

ئەم كتێبە، كۆبەندی سێ چەشن بابەتە: باسی نوسراو، كۆڕو چاوپێكەوتن. مێژووی نوسینی بابەتەكان لەساڵی (١٩٩٤)وە دەستپێدەكەنو ساڵی (٢٠٠٦) كۆتاییان دێت. بەسەریەكەوە (١٢) ساڵە بابەتەكانی كتێبەكە بەئەركی سەرشانی هەموو دیموكراتخوازێكم زانیووە؛ كە خۆشم بەیەكێك لەوان دەزانم. لەوساڵانەدا، كە سەرەتای بینای ئەزمونی دیموكراسیو گەرمەی خەباتی دیموكراتخوازان دژی دوژمنانی دیموكراسی بووە، ئەم بابەتانەم پێشكەش كردووە. هەربۆیە بەپێویستم زانی یەكەمین كۆڕم لەسەر (عەلمانیەتو سەلەفیەت) سەرەڕای چاپكردنی لەكتێبی (دیموكراسی دوای جەنگی سارد) لەم كتێبەشدا چاپ بكەمەوە. بێگومان بابەتەكان تەواوی ئەو هەولانە نین كە لەوپێناوەدا داوومن، بەلام لەروانگەی خۆمەوە، بۆ زانینی راستیەكانو رۆژگاری چۆنیەتی سەرهەلدانو درێژەكێشانی خەبات دژی سەلەفیەت، لەناو روداوە جۆراوجۆرەكاندا، هەلبژاردنو چاپكردنی ساڵ بەساڵی بابەتەكانم بەگرنگ زانی. بۆیە، پێم وایە، خوێنەر دەتوانێ لەرێی ئەم بابەتانەوە، بەدەهەی رابوردوودا بچێتەوەو بشزانێ ململانێی نێوان عەلمانیو سەلەفیەكان، كە دەكاتە ململانێی دیموكراتخوازانو دوژمنانی دیموكراسی، لەچ ساڵێكەوە بەچری سەریهەلداوەو چ هەورازو نشێوێكیشی بەخۆیەوە دیووە. هەروەها بشزانرێ، ئەركێكی دژوارو سەختی ئاوەهای دیموكراسی، لەلایەن تەواوی حیزبەكانەوە (بەتایبەتی یەكێتیو پارتی) لەهەمان كاتدا، زۆربەی ئۆرگانە روناكبیریەكانو روناكبیرانەوە، چەند كەمتەرخەمی بەرامبەر ئەركێكی مێژوویی ئاوا كراوە.

ئەمە لەکاتێکدا لەرۆژئاوادا، سەرەڕای ئەوەی پێشینەی سەدان ساڵەی رینسانسو ریفۆرمی ئاینیو رۆشنگەریان هەبووە، ئینجا، کاتێك روبەڕوی چۆنیەتی راپەڕاندنی ئەرکە دیموکراسیەکانی بینای سیستەمی دیموکراسی بونەتەوە، دەزانین کە لەبەرامبەر سەلەفیەتی مەسیحیو باقی فەلسەفە سەلەفیەکانی دیکەو دابو نەریتی سەلەفیانە، چەند لیبراو بوون. چەندیش دەسەلاتدارانی دیموکراتخوازو دیموکراتخوازانی دەرەوەی دەسەلاتیش، دژی سەلەفیەکان هاوسەنگەر بوون.

لەکوردستاندا.. ئەوە هیچ پێشینەی رینسانس، ریفۆرمی ئاینیو رۆشنگەری وەکو رۆژئاوا نەبووە. بەڵکو سەیرەکە لەوەدایە، هێزە سیاسییەکانیش، بەدەسەلاتدارو بەرهەڵستکاریشەوە، لەراپەڕاندنی ئەرکەکانی سکولاریزم (عەلمانیەت) لەبەرامبەر هێزە ئیسلامگەراکاندا، هەتا کۆتایی نەوەدەکانیش، زۆر کەمتەرخەم بوون. تەنانەت زۆربەی حیزبە عەلمانیەکانی کوردستان، سەرەڕای ئەوەی باوەڕیان بەعەلمانیەت هەیە، بەلام ئێستاش لەبەرنامەکانیاندا، باسی عەلمانیەتیان بەرۆشنیو راشکاوی نەکردووە. لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە:

ئۆرگانە روناکبیریەکانو روناکبیرانیش، لەم بارەوە، کە ئەرکێکی چارەنوسسازی دیموکراسی، فەلسەفیو مەعریفی سەرشانیان دژایەتیکردنی سەلەفیەتو سەلەفیەکانە، بەتایبەتی ئیسلامگەراکانیان، کەچی بەپێچەوانەوە، زۆربەیان، هێندەی دژی حیزبە سکولاریستەکان بوون، نیو هێندە دژی سەلەفیەکان نەبوون.

ئەو بەیارە فکریو فەلسەفییەی رابوردوو لەکوردستاندا، هاوشانی نەبوونی پرۆژەیەکی ستراتیژی هەمەلایەنەی دیموکراسیو سکولاریزمو فەلسەفەی حوکمڕانی حکومەتی کوردستان، لەباری پرۆژەی لاسایکردنەوەی کوتومتی فکرو فەلسەفەی بەبنبەست گەیشتوی پۆستمۆدێرنێتە، سەرلێشێواوییەکی لەناوەندی خوێنەوارو روناکبیرانو مەیدانی تاقیکردنەوەی دیموکراسیدا خوڵقاندووە، کە زۆر لەقازانجی سەلەفیەکان شکاوەتەوە. بەتایبەتی سەلەفییە میانڕەوەکان!!

لەهەلومەرجێکی تەمومژاوی فەلسەفیی ئاوادا، لەدوای راپەڕینەوە، ئاسان نەبووە راستو رەوان باس لەدیموکراسی راستەقینە بکرێو لەوەش گرانتر،

باسکردنی سکولاریزم هەمەلایەنە، تەنانەت لەلایەن خودی حیزبە سکولاریستەکانیشەوە قبوڵ نەدەکرا. لەبەرئەوە، ئەوکاتە کە باس لە سیستەمێکی دیموکراسی راستەقینە دەکرا، جۆرەها کاردانەوە لەلایەن ئەمو ئەو حیزبەوە دەهاتنەئاراوە؛ کاتێك باسی سکولاریزمیش دەکرا، کۆنخوازەکانی ناو حیزبە عەلمانیەکان، نەك پێیان قوت نەدەچوو، بەڵکو ئەمانیش بەئەندێشەی میتافیزیکیەتو زمانی رۆژەوە! دژایەتی باسو کۆڕەکانیشیان دەکرد. ئەمە جگە لەو مەترسییانەی لەلایەن سەلەفیە تیرۆریستەکانەوە لەسەر ئەو هەڵسوڕاوانە هەبوو کە لەپێشکەش کردنو نوسینی بابەتەکانی سکولاریزمو ئازادی ویژدان، چ حیزبیەکانو چ بێلایەنەکان نەدەپرینگانەوە. چەندین تێکۆشەریش لەوپێناوەدا تیرۆرکرانو دەیانیش هەوڵی تیرۆرکردنیان درا. ئەمە جگە لەهەڵهاتنی دەیانیشیان.

چەندساڵێکە.. قسەکردن لەسکولاریزم زۆرەو رێبازی سکولاریزمیش برەوی پەیداکردووە. بەڵام هێشتا ئەرکی بەدیهێنانی سیستەمێکی راستەقینەی (دیموکرات – سکولار) ئەرکێکی مێژوویی گرانەو تێکۆشانێکی بێوچانی دەیان ساڵی دیکەی دەوێ. بێگومان، دەتوانرێ لەمەودوا باشتر ئەرکەکان رابپەرێندرێن. ئەمەش، تەنها بەوەناکرێ حکومەتی کوردستان بواری زیاتر لەم پێناوەدا برەخسێنێ، بەڵکو بەدەرس وەرگرتن لەهەڵەکانی رابوردوو، هاوشانی دەرككردنی باشتری ئەرکەکانی سکولاریزم، لەلایەن ئۆرگانە روناکبیرەکانو روناکبیرانەوە، ئاراستەیەکی ئاوا پێشدەخرێو دەچەسپێ. بەتایبەتی ئێستا، خەریکە باشتر ساغ دەبێتەوە کە گەلی کوردستانمانو ئەزمونی بینای دیموکراسیمان، ناتوانێ خۆی لەپرۆسەی مۆدێرنێتەکردنی دەسەڵاتو دەزگاکانو ژیانی کۆمەڵایەتی لابدا؛ چونکە مۆدێرنێتە، بەهەموو کەموکوڕیەکانیشیەوە، چارەنوسی گەلانو ئەزمونە دیموکراسیەکانە، بەکوردستانیشەوە. کە هۆیەکی بنچینەیی گرفتەکانی ئێستای دەسەڵاتی کوردستان، دەگەڕێتەوە بۆئەوە کە پرۆژەو فەلسەفەی حوکمڕانێتی مۆدێرنێتە، بەتەواوەتی پەیکەری حکومەتو دەزگاکانی نەتەنیووە.

بەهیوام.. خوێنەری ئازیز لەکەموکوڕی بابەتەکانی ئەم کتێبە بمبەخشن. بەتایبەتی پێم خۆشە خوێنەر بزانێ کەوا:

مـن وەکـو باسنوسـێکی بێلایـەن، نـە باسـەکانم نوسـیووەو، نـە کۆڕەکـانم پێشکەش کـردووەو، نـە وەڵامـی چاوپێکەوتنەکانیشم داوەتـەوە. بـەڵکو وەکـو کەسـێکی پابەنـد بـەڕێبازێکی سیاسـی‌و فەلـسەفیی حیزبێکـی دیـاریکراو، ئـەم هەوڵانەم داوە. کە ئەمە خۆی لەخۆیدا، بۆ راپەڕاندنی ئەرکە فکری‌و فەلـسەفی‌و تیۆریـیەکان، گیروگرفتـی هەیـە. گەرچـی زۆرجـاریش هەوڵمـداوە کـۆتی ئـەو گیروگرفتە حیزبیانە بشکێنم، بەتایبەتی لەبەرامبەر کۆنخوازەکانی ناوحیزبەکەم. بەهەرحاڵ..

بـەکاڵی‌و کرمییێـەوە، بەنـدە بەرپرسـیاری کتێبەکـەم. کـە دڵنیـام، لـەو شوێنانەی ئامانجم پێکابێ، سوودم گەیاندووە. لەوشوێنانەی کورتیـشم هێنابـێ، هەڵبەتە سوودم بەو ئازیزانە گەیاندووە کـە سـەرقاڵی ئـەم کارانـەن‌و هـیچ نـەبێ هەڵەکانی من دووپات ناکەنەوە.

سوپاس بۆ تایبێستی ماندوونەناسمان (تەها حەمەنوری) کە ساڵەهایە لەگەڵ دەستوخەتە ناخۆشەکەم ماندوودەبێ، بەڵام چاکیش شارەزام بـووە. هـەروەها سوپاسیش بـۆ (ژیـلا مـەحمود) و (ئەحمـەد عـەلی رەزا)ی هاوسـەری کـە بـەرگی کتێبەکەیان بەسەلیقەکاری خۆیـان جـوان بـۆ نەخـشاندووم. سـوپاس بـۆ کاکـە (زانا جەزا) کە لەگواستنـەوەی کۆڕو چاوپێکەوتنەکان بەڕاستی ماندووم کـردووە. ناشکرێ تایبەت سوپاسی سـامی هـادی نەکـەم، کـە لەکۆکردنـەوەی بابەتـەکانی کتێبەکـەدا، مانـدووم کـردووە، هەرچـەندە ئـەو سوپاسیـشی بکـەیت، شـەرم دایدەگرێ! سوپاس بۆ هەموان‌و بۆ خوێنەری ئازیزیش.

م. ب

٢٠٠٦/٥/١٨

## عەلمانیەت لەنێوان
## ئیسلامی سیاسی و دیموکراتیخوازاندا [+]

گۆڤاری (نڤار) لەچوارچێوەی هەوڵە باشەکانی، لەم ژمارەیەدا، لەمەلەفی (عەلمانیەت)و ( دژەکانیدا) وتارێکی بەڕێز (ئەبوبەکر عەلی) بەناونیشانی (عەلمانیەت لەنێو خۆرهەلاّتو خۆرئاوادا لەشەڕی ناو فەرهەنگەکانەوە بۆ لە یەکتر تێگەیشتنی مەیدانی) بلاّوکردۆتەوە. بەسوپاسیشەوە، ئەرکی وەلاّم دانەوەی وتارەکەیان پێ سپاردم، منیش بەناونیشانی سەرەوە، وەلاّمەکە ئەخەمە بەر زەهنی خوێنەر.

پێش ئەوەی (ئەوەندەی پێویستە) وەلاّمی چەند برگەیەكو چەند تێکستێکی وتارەکە بدەمەوە، حەز ئەکەم خوێنەر لەوە ئاگاداربێ کەوا:

بەحوکمی ئەوەی بەدرێژایی مێژووی سەرهەلّدانی مەفهومی عەلمانیەتو بوونی بە حوکم لەولاّتە ئۆروپایەکاندا، کورد هەمیشە لەدەسەلاّتو دەولّەتی بریار لێدراوی خۆی بێبەش کراوەو مافە دیموکراتیەکانی لێ زەوت کراوە، بۆیە مەفهومە هاوچەرخو گرنگەکانی خەباتی (رزگاری –دیموکراتی– ئازادی) لەناوماندا، سەرەنجامی مشتو مرە پێویستیەکانی حوکمرانی هاوچەرخو دیموکراسی ،بلاّونەبۆتەوە، بەلّکو رۆشنبیرانی کورد بەپێی دەرفەتو فرسەت (نەك وەکو پرەنسیپێکی رۆشنگەری) هانایان بۆ ئەو مەفهومانە بردووە، کە لەئۆروپادا کراوەتە بەشێکی چارەنوسازی بینای دەولّەتو کۆمەلّەکانیان.

---

[+] لە ژمارە (١١)ی گۆڤاری (نڤار) لەسالّی (١٩٩٨) دا بلاّوکراوەتەوە.

حكومەتــە داگــیر كــەرەكانی كوردســتانیش، بــەحوكمی ئــەوەی هەمیــشە نادیموكراسی بوون، ئەگەر بۆ بەهێزكردنی دەسەلاتەكانیان بوویێ یان بۆ رازی كردنیێ كۆلۆنیالیستەكان، كەمو زۆر باسیشیان لەو مەفهومانە كردبێ، بەتایبەتی لەعەلمانیەت، لەكاتی دەستور دارشتندا، هێندە خوارو خێچو پوچ باسیان كردووە، لەباتی ئەوەی خزمەت بە عەلمانیەت بكەن، بەپێچەوانەوە، خزمەتیان بەكۆنەپەرستی پێ كردووە. چونكە نمونەی حوكمرانێكی ئەوەندە خراپی عەلمانی بوون، نەیارانی عەلمانی، بە تایبەتی ئیسلامی سیاسی توانیویانە بەئاسانی عەلمانیەت لەناو خەلكدا بشكێنن. هەر بۆیە زۆر گرنگە بەوریاییەكی زۆرەوە، دوور لەمەرامە ناراستو كاریگەریە خراپەكانی بیروڕای كۆنەپەرستی، دژەكانی عەلمانیەت لە رابوردووداو لەناو كۆمەلدا، قسەو باس لە سەر زاراوەكەو پێویستیەكانی بهێنینەوە ناوانەوە.

فەرمون ئەمەش وەلامی عەلمانیەك..بەسەلەفیەك!

## - ئایدلۆجیەتو خاسیەتی (ئەبو بەكر عەلی)

بۆ ناسینی هەموو نوسەرێكی مولتەزم، ئاوڕ دانەوە لە ئایدۆلۆجیەتی ئەو نوسەرە، هەروەها باسكردنی خاسیەتی فكرو عەقلیەتی نوسەرەكە، كارێكی زۆر گرنگە، چونكە ئاوێنەی عەقلیەتی هەموو كەسێك ئیلتزامی ئەو كەسەیە بەو ئایدۆلۆجیەتە، كە باوەڕی پێیەتی، خاسیەتی نوسەرەكەش دەور ئەبینێ لە چۆنیەتی مامەلەكردن لەگەل ئایدۆلۆجیەتەكە، یان گەیاندنی ئەو ئایدۆلۆجیەتە بە خەلكو خوێنەر. هەروەكو چۆن تێكۆشانی هەموو تێكۆشەرێكی مولتەزم بۆ سەرخستنی حیزبەكەیەتی، ئاواش نوسینی هەموو نوسەرێكی حیزبی، بۆ زالكردنو سەركەوتنی رێبازی ئایدیۆلۆجی حیزبەكەیەتی.

كاك (ئەبوبەكر) كادرێكی یەكگرتووی ئیسلامیە. یەكگرتووی ئیسلامیشر لەسالی (١٩٩٤)وە رایان گەیاند كە رەنگدانەوەی حیزبی (اخوان المسلمین)ز لەكوردستاندا. كەوابێ، ئەبێ لەبنەوانی ئایدۆلۆجیەتی یەكگرتووەوە یەكگرتو بناسێنین. بۆ ئەمەش كورتە باسێكی (اخوان المسلمین) پێویستە

اخوان المسلمین...

سالی (١٩٢٨) بە رێبەرایەتی (حسن البنا) وەكو بزوتنەوەیەكی سیاسی-ئیسلامی لەمیسر دامەزراوە. سەرەتا كە لاواز بوون، باسی ئەوەیان ئەكرد كا (اخوان) باوەڕیان بە هێمنیو ئاشتیو سیاسەتی شارستانی ئیسلامی هەیە؛ دژێ

توندوتيژیو کوشتنو تۆقاندنن. بەلام دوای پەرەسەندنيان، باڵێکی عەسکەريان بەناوی (فرق الرحلات)وە دامەزراند.
سەرەتا، مەرامی سەرەکی ئيخوان رەتکردنەوەی رۆژئاواگەری (تغريب) بوو لەميسردا. چونکە ئەو کاتە بەرەبەرە ژن حيجابی لائەبردو نەريتە کۆنەکان بايەخيان نەئەماو پەنا ئەبرايە بەر زانستو عەقڵ. (حسن البنا) لەبەر ئەوەی رەگە کۆمەلايەتيەکەی لەناو لادێیو جوتيارانو پەروەردەی حوجرەی بەر دەستی مەلای ئەوسا بوو، هەموو ئەو پێشکەوتنانەی بە تێك چونی رەوشتی ئيسلامو داوەشێنی پايەکانی موسوڵمانان ئەزانیّ.
کاتێك (حەسەن البنا) لە (دار العلوم)ی ئيسلامی خوێندنی تەواوکرد، لەگەڵ نزيکترين هاورِێکانيدا، (أخوانَ المسلمين)ی لەسەر ئەم بنچينانە دامەزراند.
١-شموليەتی ئيسلام کە دينو دونيا ئەگرێتەوەو لێك هەرگيز دانابرِێت: ئيسلام پەرستنو سەرکردايەتی کردنە. روحيانەتو کارکردنە. نوێژو جيهادە. ملکەچیو حوکمە. قورئانو شمشێرە.
٢- گەرانەوە بۆ رێنوێنە رەسەنەکانی ئيسلام کە ئێستا لە خەڵك تێك چووە.
٣- ئيسلام، هەم عەقيدەيەو هەم نيشتمانو هەم ناسنامەيە. موسوڵمانان تێکرِا نەتەوەيەکنو نيشتمانی ئيسلاميش يەك نيشتمانە.
٤- پەيوەست بوون بە بيری خەلافەتو لەسەر بنچينەی پێشينەی خەلافەت (سەلەفيەت).
ئەم بنچينانەی ئايدلۆجيەتی ئيخوان الموسلمين، هەر خاڵێکی باسێکی زۆر هەڵدەگریّ، کە ئەڵێين: ئيسلام دينو دونيايە. بەو مانايە ئەيلێين ئەم دونيا بکەنە داوانی ئەو دونيا. ئيتر هەموو ئادەميزادێك، نەك هەر کۆيلەی خوا بیّ، بەڵکو لەم دونياش کۆيلەی خۆيان بیّ، کاتێك ئادەميزاديش ئيسلام بە دينو دونيا بزانیّ. دينەکە دينی خوايەو لەم دونياش ئيخوان خۆيان بە نوێنەری ئيسلام بزانن، ئەوابیّ خەڵك دەبنە کۆيلەيان.
کە ئەشڵێن ئيسلام پەرەستنو سەرکردايەتی کردنە. مەبەستيان ئەوەيە خەڵك لە رووی روحيەوە سەرقاڵی پەرستن بکەنو لە رووی سەرکردايەتيشەوە بە سەرکردايەتی ئيخوانەکان رازی بن.
(نوێژو جيهاد)يش هەر ئاشکرايە. نوێژەکەيان پیّ ببەستنەوە بە جيهادی خۆيان کە جيهادی بەرنامەی ئيخوانە. (ملکەچیو حوکم)يش، هەر زۆر روونە ئەوا: هەموو کەسێك وا لێبکەن بیّ مشتو مرِ ملکەچی رِێبازەکەيان بیّو حوکمەکەيان هەر جۆرێك بیّ جێبەجیّ بکا.

بۆ ئەوەی هەموو موسوڵمانێکیش فێری ڕقو توندو تیژی مرۆڤ کوژی بکەن، بوونی (قورئان) دەبەستنەوە بە (شمشێر)

لە خاڵی دووەمدا، ئەڵێین خەلک ئەگەڕێننەوە بۆ ڕێنوێنیەکانی سەرەتای ئیسلام. ئەمە ڕێك گێڕانەوەی گۆڕانو پێشکەوتنەکانە بۆ دواوە. بۆ سەردەمی کوێرەوەریو دەرەبەگایەتی. خەتەری ئەم تەرحە لەوەدایە کە بەڕێگای شمشێرو ملکەچ پێکردنو جیهادکردنەوە، خەڵك بۆ دواوە ئەگێڕنەوە. نەك بە سەلماندنو کۆششی فکری. یان بە دیموکراسیو ئازادی.

لە خاڵی سێیەمیشدا (عەقیدەی) ئیسلام ئەبەستنەوە بە نیشتمانو ناسنامەوە. بەمەش تەواوی موسوڵمانان لەیەك قاڵبی نەتەوایەتیو لەچوارچێوەی یەك نیشتماندا، قەتیس ئەکەن.

عەقیدە.. چ پەیوەندیەکی بە نیشتمانی جیاوازەوە هەیە. عەقیدە، سنوری نیشتمانەکان ئەبەزێنێ، بەلام سنورەکان ناسڕێتەوە. ئەوەتانێ، لە زەمانی پێغەمبەریشەوە، هەر نیشتمانو نەتەوەیەك توانیبێتی خۆی لەبەردە، شالاوەکانی جیهادی تەعریبی خەلیفەکاندا ڕابگرێ، هەتا ئێستاش لەناو نەتەوە، نیشتمانی جیاوازدا، هەر ماوون. دەیان نیشتمانو دەیان نەتەوەی جیاواز جیاوا، هەن.

چۆن ئەکرێ، نیشتمانو نەتەوەی جیاجیا، بە زەبری شمشێرو عەقیدە لەیەك قاڵب.. ئەویش قاڵبی نەتەوەو نیشتمانی عەرەبی (بە ناوی ئیسلامەوە) بدرێ، عەقیدە عەقیدەیەو نیشتمانو نەتەوەش، نیشتمانو نەتەوەی ئاشکرای هەزارا،ساڵەن. بۆ خەلیفەکان ، بۆ ئیمپراتۆرە هەرە گەورەکانی عەرەبو ئیسلا، نەچۆتە سەر کە سەرجەم نیشتمانو نەتەوەکان قوت بدەن، ئیتر چۆن هێزێکی سیاسی وەکو ئیخوان پەیامی ئاوا ئەکاتە ڕێبازی خۆی.

دوا خاڵیش، پەیوەست بوونە بە بیری خەلافەتەوە، ئەمیش بەلگەی تەواو، کۆنەپەرستی ئیخوانەکانە. ئەمە جگە لەوەی ئەوەش دەرئەخا کەوا ئیخوانەکانو هەموو ئەو لایانانەی وەکو ئەوان بیر ئەکەنەوە، جگە لە دەسەلاتی خەلافەت بەدیلێکی تریان نییە، بۆیە پەنا ئەبەنەوە بەر خەلافەت. ناتوانن دیموکراسی بن، ناتوانن سۆسیالیست بن، ناتوانن ئازادیخواز بن، ناتوانن پێشکەوتنخواز بن، ناتوانن هیچ جۆرە ڕژێمێکی نوێو نوێخواز بکەنە پێناو خۆیان، بۆیە، هێندە کۆنەپەرستن، هەر پەنا ئەبەنەوە بەر حوکمی خەلافەت، کە هەرگیز لەگەڵ دۆخی ئێستادا ناسازێ.

واتە: كاتێك حیزبێكی وەكو ئیخوان، لەبۆتەی كەلەپوری ئیسلامدا، ئیسلامی عەقیدەو ئیسلامی حوكمڕانیدا، خۆی ئەتوێنێتەوەو پابەندی مێژووی عەقیدەو حوكمرانی ئیسلامی ئەبێ، ئیتر وایان لێ‌یەت جگە لەچوار چێوەی ئەو بۆتەیەی لەناویا تواونەتەوە، چێوەیەكی ترو ئاسۆیەكی تر نابینن. بۆیە، بە ناچاریش ئەبێ لەم ڕۆژگارە هەلگەڕێن‌و خۆیان بۆ مێژویەكی هەزار بەهەزاری دەسەڵاتی خەلیفە هەڵبدێرن. ئەنجام ئیسك‌و پروسكیشیان وردوخاش ئەبێ. چونكە هەرگیز لەگەڵ گۆڕانكاریەكان ناگونجێن. بەڵكو وردەوردە ئەبنە دوژمنی سەرسەختی گۆڕانكاریەكان، هەروەكو ئیخوانەكان‌و ئیخوانی ئیخوانەكان لە كۆنەوە هەتا ئێستا وایان بەسەرهاتووە.

دڵسۆزی بۆ دێرینە، هیچ لایەك تەسكیە ناكا بۆ سەركەوتن. هەلومەرجی ئێستاو پێشهاتەكانی ئایندەش، رەحم بەهیچ لایەك ناكەن، تایبەت ئەو لایانانەی بیانەوێ دێرینە خوازی بسەپێننە سەر نوێخوازی. ئەو بنچینانە، لە سەرەتادا، بنچینەی عەقیدەو فكرو ئایدلۆجیەتی ئیسلامی ئیخوان بوو. هەروەكو وتمان سەرەتا بەهێمنی‌و بە حساب بە عەقڵی شارستانی هەوڵیان ئەدا، پاشان كە بەهێزبوون، هێزیان بۆ فەرزكردنی بنچینەكانیان دروست كرد. ئیتر شانەو رێكخستن‌و ئەركانی جەنگو (موبایعەی)ی موتڵەقیان هێنایە گۆڕێ. دیسپلینێكی زۆر نهێنی‌و توندو تیژیان هەبوو. جگە لە هەموو ئەمانە، موخابەراتیشیان بۆ چاودێری حیزبەكان‌و كەمایەتیە سیاسیەكان دروست كرد. هێزی چەكداری نهێنی خۆیان لە خەڵكی بەتواناو بەپارەو بە چەكی باش، پێكەوە نا، بەڵام هەموو نهێنی. هێزی چەكداریان گەیشتە دەیان هەزار چەكدار.

دوای ئەوەی ئیخوان لەژێر پەردەی هێمنی‌و خەباتی شارستانیدا، خۆیان بەهێزكردو بە تاكتیك‌و فرت‌وفێڵی جۆراوجۆر، لەگەڵ حیزبەكان، كاربەدەستەكان، وەزیرەكان‌و مەلیك (فاروق)دا، لەگەڵ مەلیك‌و لەگەڵ سەرۆك وەزیرەكانی میسردا، لەگەڵ حیزب‌و لایەنەكاندا، هەریەكە بە جۆرێك، بە تاكتیكێك، هەریەكە بە زمانێكی جیا، بەرژەوەندیان چۆنی بویستایە ئاوا قسەیان ئەكرد. پشتیوانی مەلیكیان هەتا رادەی خۆپیشاندانی گەورە ئەكرد، بۆ ئەوەی هیچ دەزگایەك فشاریان نەخاتە سەر. جاسوسیان بۆ وەزارەتی ناوخۆی میسر لەسەر حیزبەكان ئەكرد، بەتایبەتی حیزبی (الوفد)و حیزبی (شیوعی)، هەتا خۆیان لە ژێرەوە تەشەنە بسەنن. كورتیەكەی: هەموو رێگەیەكی فرت‌و فێڵیان بۆ مەرامەكانیان ئەگرتەبەر. پاشان دەركەوت كە تەنانەت رێزگرتنی كاربەدەستانیشیان بە مەرام بووە.

چەند جارێك ئیخوان لە زەمانی حکومەتی مەلیکدا، لەگەڵ کاربەدەستان نەرمو رەقیان ئەنواند. هەروا لە زەمانی حکومەتی (جمال عبدالناصر)یشدا، هەر بەو جۆرە. بەڵکو لە زەمانی جەمهوریدا پیلانیان زیاتر ئەگێڕا. گەیشتنە رادەی هەوڵی تیرۆرکردنی (عبدالناصر). حکومەتیش شاڵاوی توندو تیژی ئەکردنە سەر. هەندێ جار خەفەیان ئەکردن. ئەمە جگە لەوەی لەناو خۆشیانا دیدی جیاواز دروست بوو. بە تایبەتی لە نێوان موحافیز کارو توندەکانیان. یان باڵی سیاسیو باڵی عەسکەریان.

دوای ئەوەی چەندین جار رێبەرایەتیو رێبەریان ئەگیراو لەناو ئەبرا، دواجار (سەید قوتب) بوو بە رێبەریان، کە ئەمیش لە هەرە دەمارگیرە توندەکانی ئیسلامی سیاسی بووە، تەنانەت لە (حەسەن البنا)ش زیرەکترو توندتریش بوو. سەید قوتب دژی هەموو حاکمیەتی بەشەر بوو لەسەر ئەرز. جیهادی بۆ حوکمی موتلەقی خوا ئەکرد. جگە لە حوکمی خوا، هیچ حوکمێکی تری قبوڵ نەبوو. باوەری بە دیموکراسیو ئازادیو سەربەستی هەر نەبوو. لە ژێر فشاری روداوەکانیشدا، کە ناچار بوو قسە لە دیموکراسیەت بکا، داوای ئەکرد دیموکراتیەت تەنها بدرێتە خەڵکی هەڵبژاردەو دەست نیشان کراو، تەنانەت پێی وابوو لە دوای نەمانی حوکمی ئیسلام، ژیانو حوکمەکان هەموو جاهلین. جاهلیەتی کردبووە ویردی سەر زمانو هەموو جیهانی بە جاهیلیەت تاوانبار ئەکرد. جگە لەوەش، (سەید) کۆمەڵی لە نێوان دووجەمسەردا دابەش کردووە:

١- دار السلام، ٢- دار الحرب. پێی وابوو دار السلام ئەوەیە کە موسوڵمانان بەپێی شەرعو شەریعەتی ئیسلام، کوتو مت وەکو سەرەتاکانی ئیسلام ئەژین. دار الحربیش ئەوەیە کە کوتو مت شەریعەت تیایا جێبەجێ ناکرێ.

خەتەری ئەم دوو جەمسەر بەندییە لەوەدایە (سەید قوتب) تەئکید لەسەر ئەوە ئەکا کە هەرکەسێ لەناو (دار السلام)دا نەژیو لەناو (دار الحرب) دا بژی، موسوڵمانی راستەقینەئەبێ دژایەتی بکاو نابوتی بکاو هیچ جۆرە سۆزێکی لەگەڵیا نەبێ. تەنانەت ئەگەر براو کەسو کارو خزمو ناسیاویش بێ. ئەویش کارێکی خەتەرناكو تێکدانی کۆمەڵو ژیانی کۆمەڵایەتیە. نەهێشتنی متمانەیەك لەناو خەڵكو تێکدانی سەرجەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانە کە بەدرێژایی مێژوو دروست بووە.

بێگومان، ئەم پێناسەیەی (أخوان المسلمین) زۆر کورتو کەمە. بەڵام گرنگیشە بۆ چونە سەر بنەوانی ئایدیۆلۆجی یەکگرتووی ئیسلامی.

ئێستا کە (٧١) سـاڵ (١٩٢٨-١٩٩٩) بەسـەر ئیخـوان دا تێئەپـەڕێ، ئیخـوان لەمیـسردا لـە جاران لاوازتـرن. لەوپـەڕی زەمـانی هەڵـچونیاندا کـە دوو ملیـۆن ئەنـدامو دەیـان هـەزار چـەکداریان هـەبوو، گەیشتنە بـن بەسـت. بێگومـان لـەم زەمانەدا مەحاڵە ئەو بیرورا کۆنو کۆنەپەرسییە بکرێتـە ڕێبـازی گشتی خـەڵكو حوکمرانێتی. چونکە لە (٧١)ساڵدا، ئـەم جەماعەتـە دەرکـەوتن کـە تـەنها بـەناو ئیـسلامی راسـتەقینەن، بـەڵام بـە کـردەوەو بـۆ مەبەسـتو مەرامـەکانیان لەحیزبەکانی نائیسلامی بە مانۆرتـرو فرتو فێڵاویترن. جیاوازییەکان لەوەدایە کە حیزبە بەناو ئیسلامیەکان وەکو ئیخوان غەدر لە ئیسلامو خـوای گـەورە ناکـەن. بەناوی دیموکراسیەت، عیلمانیـەت، سۆسیالیزمو نەتـەوەوە سیاسـەت ئەکـەن، ئـەوانیش بـەناوی خـواو ئیـسلامەتیەوە سیاسـەت ئەکـەن. ئەگـەر مەسـەلەکەش سیاسەت بێو لەپێناوی ئامانجی سیاسیدا بێ، بۆ دەسـەڵاتو مـەرامی تایبـەتی چینایەتییان شەخسی بێ، کەوابێ: ئیخوانەکانو ئەوانـەی پەیرەولـەوان ئەکـەن، غەدرێکی گەورە لە ئیسلام ئەکەن، چونکە بەناوی ئیـسلامەوە، مـەرامی تایبـەتی سیاسی دەهێننە دی.

سەبارەت بە خاسیەتی کەسایەتی کاك (ئەبوبەکر)یش. ئـەم بـەڕێزە، لـەدوای ئاشکرا بـوونی یـەکگرتووی ئیسلامی، وەکو پـەیڕەو کـردن لـە ڕێبـازی ئیخـوان المسلمین، وەکو کادرێکی پروپاگەندەی خۆیان هێناویانەتە سەر شانۆ؛ لە کادرە توندرەوەکانیانـە. قـسەو بۆچـونەکانیان وەکـو خـەتیبێکی ئیـسلامی مـۆدێرن دەرازێنێتەوە. بەڵام ئەوەی دیقەتی بدا، بە ئاسانی بۆی دەرئەکەوێ کە نـاوبراو، قسەیەکی زۆر زۆر ئەکا، بەڵام ناوەرۆكو مەبەست نادات بەدەستەوە، یان درەنگ شـتێ ئـەدا بەدەسـتەوە. قـسەیەکی زۆر ئـەکا، بـەڵام مانـای کـەمیان هەیـە، لـە کاتێکدا کادری ژیر ئـەو کادرەیـە کـە بـە قـسەی کـەمو پوخـت، مەبەسـت بداتـە گوێگر یان خوێنەر.

عیبرەتی قسە لە زۆر وتندا نییە. بـەڵکو لـە بـاش وتندایـە. جگـە لـەوە، ئـەم برایـە، لـە هـەموو کـۆڕو کۆبونەوەیەکـدا هـەوڵ ئـەدا وا خـۆی پیـشان بـدا کـە دیموکراتو ئازادیخوازەو زۆر باوەڕی بەشارستانیەتو دیالۆگە. ئەوەی بـەزۆریش پشتی پێئەبەستێ، مەسەلەی (ڕەوشـت)و (کەلـەپوری) هـەزار سـاڵەی ئیـسلامو (خێرو) (أحسان)ە. کە ئـەم مەسـەلانە زۆرتـر ڕۆحـیو عەقیـدەییو چاکخوازین، پەیوەندیان بە مەعریفەوە نییە.

کاك (ئەبو بەکر)و هەڤاڵەکانی، وا ئەزانن خەڵك نازانن کە ئەو قسانە هی سەرەتای سەرهەڵدانی یەکگرتووی ئیسلامیە. هەروەکو چۆن، ئیخوانەکانیش لەسەرەتاوە نەرمو هێمن بوون. دڵنیاین لە پاشە ڕۆژدا کە ئەگەر یەکگرتوو بەهێز بن، ئەگەر ئەمانیش ئەو چەکانەی بەنهێنی ئەیکڕنو بە نهێنی لەژێر زەمینەکاندا مەشق بە ئەندامەکانیان بۆ شەڕی ناوشار ئەکەن، ئەگەر بەو چەكو خەڵكو پشتیوانیانەی هەیانە، لە پاشە ڕۆژدا لە خۆیان رابینی، بێگومان لەئیخوانەکانیش خراپتر ئەبن. چونکە کوردو موسوڵمانی کورد، توندرەوترن لەموسوڵمانی عەرەب.

ئەم کاك (ئەبو بەکر عەلی)یە یەك شتی چاکی هەیە کە کاتێك لە گفتوگۆکاندا توند ئەبێ، خۆی ناگرێو جارو بار بڕیارەکانی نیازی پاشە ڕۆژیان ئەدرکێنێ. هەمرو جارێ ئەڵێ: یەکگرتوو خاوەنی هەزاران ئەندامە. لەناو ئەم وڵاتی میلیشیایەدا، بۆچی پەنا نابەینە بەر چەك، خۆ ئێمەش ئەمان توانی ناوچەیەك بۆ خۆمان داببڕینو حوکمرانی تیا بکەین.

ئەو قسانە، قسەی نیازەکانیانە کە کاك ئەبو بەکر ناراستەوخۆ دەریان ئەبڕێ. جگە لەوەش، نازانین چۆن زات ئەکەن بە کوردستانی ئازاد بڵێین وڵاتی میلیشیا. ئەمە (ببورن) جۆرێکە لە بێ‌نمەکی بەرامبەر بەو ئازادیەی پێیان دراوە. ئەگینا یەکگرتوو باش ئەزانێ چ لایەك میلیشیای هەیەو چ لایەکیش حوکمێکی دیموکراسی ئەکا. هیچ نەبێ، لە دیموکراسیەتی سایەی حکومەتی کوردستانیان سەرکەوتووەو لەنا دیموکراتیەتی سایەی حوکمی میلیشیان چەشتووە!

لەم پێشەکیەوە، کە بە پێویستمان زانی بۆ پێناس کردنی ئایدیۆلۆجیەتو خاسیەتی کاکە (ئەبوبەکر) دێنە سەر وەڵامی ئەو پەرەگرافانەی بە گرنگمان ... وەڵامیان بدەینەوە. چونکە نوسینەکە لە راستیا زۆر درێژەو ئەو ... بەستانەی نوسەر هەیەتی، ئەیتوانی بە نیوەی ئەو نوسینەش مەبەستەکانی بپێکێ. بەڵام وا دیارە، هەروەکو چۆن لە قسەو مشتومڕدا کاك (ئەبو بەکر) زۆری لەسەر ئەرواو کەم بەدەستەوە ئەدا، ئاواش لە نوسیندا، زۆری نوسیوەو کەمی پێکاوە.

- کاك (ئەبو بەکر) لە پێشەکیەکی درێژدا پێناسەی عەلمانیەتی کردوەو هەوڵی داوە بە گیانی دیالۆگ دابەزێتە مەیدان. قسەکانیشی پاکژ کردنی مێژووی ئیسلامەو بیانوو هێنانەوەیە بۆئەوەی خوێنەر باوەر پێ‌بهێنێ گوایە ئیسلامیەکانیش دیموکراسی بونو هەنو ئەمێنن. لەیەکەمین پەرەگرافی باسەکەیدائاوا دەرگای لێکدانەوە ئەکاتەوە:

## مامەڵەی میکانیزم یان سەپاندنی عەقیدە

(پێویستە مامەڵە کردن لەگەڵ چەمك و زاراوەو مەقولە فکرییەکان نەچێتە بازنەی دەمارگیری و ڕۆمانسیەتی سیاسییەوە. چونکە ئەو جۆرە مامەڵانەو بە پەیڕەو کردن لە میکانیزمەکانی کاری عاتفی لە کایەی فکریدا نەك هەر نابێتە هۆی چارەسەر کردنی کێشەکان بەڵکو ڕەوشەکە ئاڵۆزترو دیدگاکانیش لێڵتر دەکات و پانتایی بەیەك گەیشتن و دیالۆگیش بەرتەسکتر دەکاتەوە. سەرەنجامیش جەماوەری خەڵك باجەکەی دەدەن و لە سایەیدا تووشی چەندان کێشمەکێشی بێجێ و بێئاکام دەبن).

ئەم پەرەگرافە، ئەگەر نوسەر لەبەرامبەر نەیارێك یان دژێکی ئیسلامی خۆیان وتبێتی، ڕێی تێئەچێ گوێی لێبگیرێ. چونکە ناکۆکی شێوازی کاردن لەناو لایەنە ئیسلامیەکاندا هەیە. بەڵام بەرامبەر دیموکراتیخوازان و عەلمانیەکان ئەم قسەیە جێی خۆی نییە. برای نووسەر باش ئەزانێ کە چەمك و زاراوەو مەقولە فکریەکان، سەرەتا لە ئەورووپادا بەرامبەر بە ڕەوتە ئاینیەکان و دەسەلاتە خوێنرێژەکان خولقاوون. لە پێناویشیاندا سەدان هەزار قوربانی دراون. واتە: دەمارگیریەکە لای ئاینیەکان بووە، نەك عەلمانیەکان. کە ئەو بیروڕایانەش لە ڕۆژهەڵات و ناو وڵاتانی موسوڵماندا ڕەنگی داوەتەوە، متنەورەکانی گەلانی عەرەب و غەیرە عەرەب لەناو دەسەڵاتەکانی ئیسلامدا (ئیمپراتۆریەکانی عوسمانی و سەفەویدا) بە پێی تێگەیشتنی ئەوسا، نەك هەر دژی دەسەڵاتەکانی موتڵەقی ئیسلامی، بەڵکو دژی پیاوی ئاینی و بیرمەندەکانی ئیسلامیش، بیری تەنویریان بڵاوئەکردەوە. چونکە ئیسلامیەکان، بە هیچ شێوەیەك بیری تریان جگە لە بیری خۆیان پێ قبوڵ نەبوو. خەلیفەیان بە سایەی خواوەندی سەر ئەرزو پیاوە ئاینیەکانیشیان بە زانای خوا ئەزانن. بیری جیاوازو لە کاتی شۆڕشی دیموکراسیدا، لەناو دەسەڵاتەکانی مادی و روحی ئیسلامدا، بقە بووە، تەنانەت ئەگەر بیرکردنەوە جیاوازەکان ئیسلامی نوێگەریش بوبێ، بۆ خودی ئیسلامیش چ جای بۆ بیروڕای نائیسلامی.

کاکە (ئەبو بەکر) باش ئەزانێ کە ناکۆکییە فکریەکانی مێژووی ئیسلام، ئەگەر سەرەتاش بە حوکمی تەنگوچەڵەمەکانی دەسەڵاتەکانی ئیسلامەوە لەناو خۆیان دا (ئەمەوی و عەباسی) پێش ئەوەش لەناو خودی خولەفای ڕاشدیندا، جۆرێك لە نەرمی بەرامبەر فەقیهێك، یان زانایەکی بیر جیاواز، یان موفەسەرێکی

جياواز، نواندرابێت، ئاوا سەرەنجام کە خەليفە يان زاناکانى دەسەڵات، خۆيان بەهێز بينيبێتەوە، شمشێريان هەڵکێشاوەتەوەو سەرى ئەوانەيان پەراندووە کە بيرێکى جياوازيان هەبوبێ.

خولەفاى راشدين لەناو خۆياندا لەسەر تەفسيرى وەسيەتى پێغەمبەر، تێکچوون. هەتا ئێستاش نەبراوەتەوە.

ئومەوىو عەباسيەکان لەسەر جياوازى حوکمرانى تێك بەربوونو قەتلوعاميان خستە ناو يەکتر.

لە خولەفاى راشدينەوە، هەتا عەباسىو ئەمەويەکان، لە سايەى هەرکاميانو لەدژى هەرکاميانو لە جياوازى هەر خەليفەو زاناو موفەکرێکى ئەو کاتەدا، گروپێکى جياواز، يان لێکدانەوەيەکى سياسىو فکرى سەرى هەڵدابێ، بەپەلامارو کوشتنو تيکە تيکە کردن کۆتايى هاتووە. نموونەش مەسەلەى شيعەکانو تراژيدياى کەربەلاو موعتەزيلەو ئەو گروپو رەوتە جياوازانەى شيعەو سوننەن، کە بەشێکى زۆريان بە کوشتو کوشتار خەفەکراون، هەر بۆ نموونە:

کاتێك موعتەزيلەکان کە يەکەمين رەوشى فکرىو فەلسەفى جياواز بوون لەناو زاناکانى ئيسلاميدا، بەرامبەر کۆمەڵێك بنچينەى ئيسلامو خەلافەتى ئەمەويەکان، سەريان هەڵدا. باشترين بيرمەندەکانيان لەسەر دەستى دەسەلاتدارانى ئيسلام کوژران: (معبد الجهنى) لەسەر دەستى حەجاجى کورى يوسف کوژرا (ساڵى ٨٠—٩٠کۆچى). هەروا (مروان غيلانس ديمەشقى)يش کە رێبەرى (قدريە)کان بوو، خەليفەى موسوڵمانان، (هشام أبن عبدالله) لەسەر مشتو مڕێك کە لەگەڵ خۆىو لە ماڵى خۆشيدا، روئەداو (مروان) زۆر ئازايانە بيروراى خۆى بەرامبەر زوڵم، عەداڵەت، دزى، فسقو فجور ئەحکامى خوا دەرئەبڕێ، خەليفە دەستبەجێ ئەيگرێو هەڵيئەواسێو دەستو قاچو زمانيشى ئەبرێو ئەمرێ. ئەمەش ساڵى (١٠٦ کۆچى) روويئەدا.

دواى ئەوەش، کێشەى قەرمەتيەکانو زەگەکان ئاشکرايە، قەلاچۆى سەدان هەزار کەسيان لێکرا.

(حەلاج)يش زانراوە کە بەوەحشيترين شێوەى تۆڵەسەندنەوەى عەقڵى دەسەلات لە فيکرى جياواز، لەناو پايتەختى فکرى دەسەڵاتى ئيسلامدا (بەغدا) رەجم کرا.

عەباسییەکان، لە باشەکانیان (مهدی)و (هارون رەشید)ی کوریشی، لەتوندرەوەکانی پارێزەری ئاینی بوون. مەهدی، خوێنێکی زۆری ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی رشت، کە متەنەوری کاتی خۆیان بوون. بە دەستی خۆی (صالح عەبدالقدوس) شاعیری حیکمەت‌و تەسەوفی کوشت. دەگوترێ: بە شمشێرەکەی لە تەوقی سەرەوە بۆ خوارەوە دوولەتی کردووە. لاشەکەشی لەناو بەغدادا هەڵواسی.(*)

ئەوە پیاچونەوەیەکی کورت بوو بە بیری دێرینە خوازی کە (کاك ئەبو بەکر) دەیەوێ بیکاتە نموونەی پشت پێ بەستراو بە حوکمڕانی دیموکراسی ئێستایان (بەبێ عەلمانیەت).

- ئامرازەکانی سەپاندن

(خۆ لە هەموو ئەمانەش مەترسیدارتر، ئەوەیە کە ئامرازە فکرییەکان‌و بەرهەمهێنانی چەمکەکان، بکرێتە ئامرازی خۆسەپاندن‌و هەژمون‌و هەوڵدان بۆ سڕینەوەی بەرامبەرو بەسەنتەرکردنی خود. هەروەك ڕۆژ ئاواو لەم چەند سەدەی رابوردوداو بەهۆی ئەو پێشکەوتنە زانستیەی بەخۆیەوە دەبینی‌و ئەو دەست ڕۆیشتویی‌و هێزە ئابوری‌و سیاسی‌و سەربازییەی وەدەستی هێنا)

لەم پەرەگرافەدا، نوسەر ئەیەوێ بیری خۆرئاوا لە چەند سەدەی رابوردودا تاوانبارتر بکا، لە بیری ئیسلامخوازەکانی سیاسی.

باس لە سەنتەرکردنی خودی ئەوروپاو فکریان ئەکا. هەروا گوایە هەوڵیان داوە بیروراکانی بەرامبەریان بسرنەوە.

سەبارەت بە رابوردوی کۆن (پێش ئیسلام‌و مەسیحیەت) دەسەڵاتەکانی ئەوروپاو ڕۆژهەڵاتیەکانیش، لەشەری بەردەوامدا بوون ببنە تاقە چەقی سەرەکی سەر ئەرز. تەنانەت شارستانیەتی یۆنانیش لەم بارەوە بێبەری نین کە چەمکی دیموکراسیەت‌و ئازادی‌و فەلسەفەی جۆراوجۆر لەوێدا سەری هەڵدا.

بەلام ئەوەتەی ئاینە ئاسمانیەکان سەریان هەڵداوە، جولەکە یەکەم‌و مەسیحیەت دووەم‌و ئیسلامیش ئاخرین ئاینی ئاسمانیە. مەسیحیەت‌و ئیسلام تێکەلاوی دەسەلاتەکان بەفراوانی‌و بە یاسارێژی بوون.

---

* لاپەرە (٧٢) من تاريخ التعذيب في الأسلام، مركز الأبحاث والدراسات الأشتراكية في العالم العربي — هادى العلوي

مەسیحیەت، لە بنەچەدا ئاینی دەسەڵات نەبوو، بەڵکو ئاینی چاکسازی‌و چاکخوازی مرۆڤ و کۆمەڵ بوو. وەکو سەرچاوەی ئاینەکە هەرگیز باوەری بە(شمشێر)و (توندو تیژی)ی (کوشت‌و کوشتار)و (فتح)و (ئەنفال) نەبووە. پاشان دەسەڵاتدارەکانی رۆم‌و ئەوروپا ئەم ئاینەیان کردە ئامرازی سەپاندنی مەرامەکانیان. هەرچی دەسەڵاتدارەکان بەناوی حوکمی ئەم ئاینەوە کردبێتیان، ئاینەکە لە بنەچەدا لێی بێبەرییە.

بەڵام، ئاینی ئیسلام وانەبوو، ئەم ئاینە لەگەڵ ئاشکرا سەریهەڵدا، شمشێری دەسەڵات‌و حوکمیشی هەڵکێشا بوو، کرایە ئاینی ئەو دونیاو ئەم دونیا. پێغەمبەریش (خاتم الأنبیاء) بوو. دوای قورئانیش هەموو جۆرە ئاینێکی دیکە بە کوفرو هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لەقەڵەم درا.

واتە: ئیسلام، ئاینێکی شمولییە. ئاینەکانی پێش خۆی، ئەگەر بەتاڵیشی نەکردبن، خۆی لەوان زۆر بە راستترو لێبراوتر زانیوە. بۆ دوای خۆشی هیچ دەرەتانێکی نەهێشتۆتەوە. ڕێگەکانی ئەگەری خولقانی ئاینی تری تەواو داخستووە.

ئاینێکیش لە ئاینەکانی پێشووی خۆی بەراستتر راگەیاندبێ، دوای خۆی ڕێگاکانی سەرجەم داخستبێ. هەڵبەتە ئاینێکی ئاوا پشت ئەستوور بە یەکتاپەرستی‌و قورئان‌و حەدیس، خۆی لە هەموو بیروباوەڕێکی تری غەیرە ئاینیش بە راستترو دروستتریش ئەزانێ. خۆیشی ئەکاتە چەقی بون‌و نەبوون. ئەوەی هەیەو ئەوەی نییە دەبەستێتەوە بە دەق‌و شەرع‌و ئەحکامەکانی خۆی. ئەگەر شەرع‌و حوکمیش، بۆچونی جیاواز هەڵبگرن، ئەوا دەقەکان بفەیە جیاواز ایلێك بدرێنەوە. لێکدانەوە جیاوازەکانی دەقیش بە زەندەق‌و کوفرو هەڵگەڕانەوە لە ئاینەکە لەقەڵەم دراوە.

لێرەوە، ئەتوانین جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە: فکری ئیسلام‌و ئیسلامخوازەکان، پێش چەند سەدەیەك لە مەوبەر (کە ئەبو بەکر مەبەستی سەردەمی ریتیسانسە) لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیسلامەوە، خۆیان کردۆتە مەرکەزی سەپاندنی شمولیەتی فکرو عەقیدەو فەلسەفە.

ئێستاش، بە بیروڕای هێزە سیاسیەکانی ئیسلامی بێ، دوای ئەو هەموو ئاڵوگۆڕە، دیسان ئیسلام دەکەنەوە چەقی گەردون. جگە لە عەقیدەی خۆیان ڕێگە بە هیچ بیرو باوەڕێکی تر نادەن. بەرنامەی شمولی ئیخوان المسلمینیش

روونە کە چەند جیهانگیرین. حوکمێکی ترو ئەحکامێکی تر جگە لە خۆیان قبـوڵ ناکەن. بۆیە هەق وابوو، کاکە ئەبو بەکر پێش ئەو چەند سەدەیەش ببینێ کە لـە ئـەوروپادا بـیری ئۆروپـایی زاڵکـراوە. ئەگـەر بـیری شمولیـەتی ئیسلام نەبوایـە، ئیـسلام چـۆن لـە دورگـەی عـەرەبی ئـەترازاو ئەگەیـشتە هیندسـتان‌و ئاسـیای مەرکەزی‌و تەنانەت، ئەگەیەندرایە ئیسپانیاو بولگاریاو نەمساش.

ئەگەر لای ئیسلام، ئـاینی مەسـیحی، ئـاینێکی خـوایی‌و ئاسمانییـە، بۆچـی پەلاماری ئیسپانیاو نەمساو بولگاریا ئەدەن کە مەسیحی بوون، یان مەسـیحیەت لەناویاندا زاڵ بووە. ئەم پەلامار دانانە هەر لەسەر ئەو بنەمایە بـووە کـە ئیـسلام شمولیەو بۆی هەیە تەواوی دونیـاو تـەواوی ئاینـەکان لـەناو خۆیـدا بتوێنێتـەوە. لەراستیا، ئەم مەرکەزیەت‌و شمولیەتە، بنچینەی سیاسەتی ئیـسلامی سیاسـییە، نەك هەوڵ دان بۆ پێش گرتن لە شارستانیەتی رۆژئاوا. ئەگەر چی نکۆڵیش لـەوە ناکرێ کە لەرۆژئاوادا، بیرمەندانی رۆژهەڵاتناسـیان، دووچـاری مـەزنخوازی بـون‌و هـەولی خـۆ سەپاندنیـشیان داوە. بـەڵام ئەمانـەتی نووسـەر ئەوەیـە راسـتیەکان لەکۆنەوە واقعیانە باسبکا. مەبەستەکانی خۆشی بە تەمو مژ نەخاتە روو.

ئێستاش ئیسلامیە سیاسیەکان وازیان لە باوەری شـمولی ئیـسلام نـەهێناوەو لـــە ئـــەمریکاو ئۆروپـــادا، ئەوپـــەڕی هەوڵیانـــە مەســـیحیەکان بـــە هـــەموو مەزهەبەکانیانەوە، لە ئاینی خۆیان هەڵبگێڕنەوە.(*)

- موسوڵمانێك بۆی هەیە مەسیحی یان جوویەك بکاتە ئیسلام، بەڵام نـاکرێ خۆی بچێتە سەر ئاینێکی تر.
- کورە موسوڵمانێك بۆی هەیە کچێکی سەر بە ئـاینی تـر بخـوازێ‌و بیکاتـە موســوڵمان. بــەڵام کــچێکی موســڵمان، یــان کوڕێــك، ئەگــەر غــەیرە ئیـسلامێکیان خۆشویـست، کفـرە لـە پێنـاوی هاوسـەرێتیان بـچنە سـەر ئاینێکی تر.
- موسڵمان بۆیان هەیە بە هەمووشێوەیەك فشار بخەنە سەر ئاینەکانی تـر، گەرچی ئاسمانیش بن، بەڵام موریدو ئـاڵا هـەڵگرانی ئاینـەکانی تـر بۆیـان نییە توخنی ململانێ لەگەڵ ئیسلام بکەوون. ئەمەیان حەرامەو ئـەویتریان حەڵاڵە!!

---

* لەهەر وڵاتێکی رۆژئاوادا، ئێستاش کەسێکی مەسـیحی ببێتـە موسـڵمان، لەمزگـەوتێکی ئـەو وڵاتەدا، یادی ئایینی دەگێڕن‌و شانازی بەئیسلامەوە دەکەن کە مەسیحیەکی هەڵگێڕاوەتەوە لەئاینەکەی! (تێبینی دوای چاپ)

ئەم بریارو شەرعو باوەرانە هەر هەموو لە شمولیەتی ئاینی ئیسلامەوە داكەوتوون. شمولیەتیش لوتكەی مەركەزیەتی ئاینو بیروباوەرەكان قوت ئەكاتەوە.

واتە: مەركەزیەتی هەموو باوەرێك، هەتا توند بێ، بێگومان لەسەر زەمینەی شمولیەتی بیروباوەرەكە، مەركەزیەتەكە بینا ئەكرێ. مەركەزیەت لە خۆیەوە ناكرێتە مەركەز.

## - مەترسیەكانی سەر پێشكەوتن

(گرفتی ئێمە لە (تعمیم) كردنو بە رەشدانانی تەواوی بەرامبەرو چاوپۆشین لەواقیعە. بۆ نموونە هەرنەوەندە باسی سیستمی سیاسی ئیسلامی بێتە گۆرێ هەندێ كەسو ناوەند پێش ئەوەی چاوەرێی ئەوە بكەن لایەنگرانی ئەو جۆرە تێزە سیاسییە باسی ئەركو پێكهاتەو دامو دەزگاو ژیانی سیاسیو مەدەنی ژێر سایەی ئەو دەسەلاتو سیستمە بكەن تێروانینیان بۆ مافو ئازادییە گشتییەكان دیاری بكەن، یەكسەر بێ هیچ هەلوێستەیەكی فكری جدیو تاووتوێ كردنێكی باباتیانەو رەچاوكردنی واقیعی لە ئارادا بوو، بانگەشەو تێزە كە بە مەترسییەكی گەورە دادەنێن، لەسەر پێشكەوتنو مافو ئازادییە گشتییەكانو تازەكردنەوەو پەرەسەندنی كۆمەلگا).

لەم پەرەگرافەدا، كاكە (ئەبو بەكر) باسی هەموو بیروباوەرە نەیارەكانی ئیسلامی سیاسیو گێرانەوەیدەسەلاتی ئیسلامی ئەكا. ئەیەوێ بلێ: واقیعی ولاتانو گەلانی موسولمان، بە هیچ شێوەیەك جگە لە فكری ئیسلامو دەسەلاتی ئیسلامی، بە فكرو دەسەلاتی تر قبولێ ناكەن. دیارە فكرەكانیشی بە حوكمی سەرپێیو كاردانەوەی دەست بەجێ بەرامبەر تێزەكانی خۆیان تاوانبار ئەكا.

دیسانەوە ئەبێ بلێین: برای نووسەر بیر خۆی ئەباتەوە كەوا: دەسەلاتی ئیسلامیو ئیسلامی سیاسی، دیاردەیەكی سیاسیو حوكمرانیو عەقیدەیی تازە نین، هەتا خەلك، یان هەندێ (ناوەند، چاوەرێ بكەن بزانن (یەككگرتوو) با دیلێكی حوكمی تاقی نەكراوی پێیەو رەتی نەكەنەوە.

دەسەلاتی ئیسلام مێژوویەكە بۆ خۆی. مێژوویەكە لە حوكمو سەپاندنی شەرعو یاسای ئیسلامی. ئەم مێژووە، لەناو (٧٦)ولاتدا، لەناو سەدان نەتەوەو گەلو كەمینەو چینو گروپدا، تاقیكراوەتەوە (١٤٠٠) سالیش لەقۆناغی

جۆراوجۆری کۆمەڵایەتیو سیاسیشدا تاقیکراوەتەوە. لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا، لە سایەی بازرگانیدا، لە هەلومەرجی سەرمایەداریدا، لەناو ڕژێمی پاشایەتیو کۆماریدا، لەناو عەرەبو نا عەرەبدا، دەسەڵاتی ئیسلام تاقیکراوەتەوە. ئەحکامو دەقی قورئانیو حەدیسی نەگۆڕدراوی هەیە ، تازە تازە کاك ئەبو بەکر ئەیەوێ بەدیلێکی خۆیان بکاتە نموونەی حوکمرانێکی هاوچەرخ، هەتا خەڵك شایەتمانی بۆ بهێنن.

هەر حوکمو حوکمرانیەك، کاك ئەبوبەکر وەکو بەرنامەی ئیسلامی سیاسی بیکاتە نموونەی خەباتو کۆششی خۆیو ڕێکخستنەکەی، مادام حوکمی ئیسلامییە، (لەبیری ئیخوان المسلمین وەرگیرابێ) ئیتر مەعلومە حوکمەکە چۆن حوکم ئەکا. چونکە فەیلەسوفەکانی ئیخوان (حەسەن البناو سەید قوتب) ساغیان کردۆتەوە چ حوکمێکی شەرعیو شمولی ئیسلامی بینا ئەکەن. بۆیە زۆر جێی خۆیەتی، پێش ئەوەی کارەساتەکانی وەکو جەزائیرو ناو فەلەستینو ئەفغانستانو کوشتارەکانی ناو میسرو لوبنان، چەند پات ببنەوە، جێی خۆیەتی پێشوەخت بە کاك (ئەبوبەکر) بگوترێ: حوکمەکەتان مەترسیەکی گەورەیە لەسەر پێشکەوتنو ئازادی.

ئەگەر کاك ئەبوبەکر توانی مێژووی دەسەڵاتە خوێنڕێژەکانی ئیسلامی سیاسی ڕەت بکاتەوە. ئەگەر توانی بەرنامەو بۆچونی ئیخوانەکان لەسەر دەسەڵات، حوکم، دیموکراسی، ئازادی، ژن، کۆمەڵ، نەتەوە، عەلمانیەتو شارستانیەت، ڕەت بکاتەوە، ئەوسا هەقی خۆشیەتی گوێی لێبگیرێ. بەڵام بەبێ ئەو ڕەخنانەو بەبێ هەڵوێستێکی تەنویری ڕاستەقینە لەژێر پەردەی ئیسلامو هێمنیو شارستانیدا، بیەوێ بەخشکەیی ئاگر بەربداتە بونیادەکانمان، بێگومان هەقە وەڵامی بەجێ بدرێتەوە. مە ترسیەکانیشی بخرێتە بەرچاو. دەست خەرۆش نەکرێت بە قسەی هێمنو نەرمەبڕی!

### – شەڕی کام مردوو

(تەجریداتی (ذهن) یو دروستکردنی یوتوپیاش لە ئەندێشەی نوخبەیەك دا با نیاز پاكو دڵسۆزیش بێت هەڵویستەکە ڕزگار ناکات. خۆمان دەبینین ناوچەکە بۆتە گۆڕستانی دەیان دروشمی ڕەنگاو ڕەنگی ئەم چاخە. بۆیە ئەگەر هوشیار نەبین دەکەوینە شەڕی مردووەکان.. دەکەوینە ململانێی زەمەنە بەسەر چووەکان).

لێرەدا کاکە بەکر ئەیەوێ بڵێ: هەرچی فکرێك دژی کەلەپوری ئیسلام بێ، دیموکراسی یان هەر بیروباوەڕێکی تر بێ، چارەنووسی نەمانە. ناوچەکەش لای ئەو بۆتە گۆرستانی دەیان دروشمی رەنگاو رەنگی ئەم چاخە.

دەپرسین: ئەو دروشمانەی رەنگاو رەنگن‌و ئێستا لە گۆرستانی ئیسلامی سیاسیدا سەری هەمیشەییان بێ بەردی ئەلحەدیش ناوەتەوە، بۆچی توانییان بۆ ماوەیەکی زۆر ئیسلامە سیاسیەکەی کاکە (ئەبو بەکر) پاشە کشە پێبکەن کە وا سەرلەنوێ خەریکە ببوژێتەوە؟

ئایە؛ ئیسلام‌و ئیسلامی سیاسی زیاتر لە (١٤٠٠)ساڵ حوکمیان نەگرتە دەست، ئەی چۆن ئاڵا هەڵگرانی دروشمە رەنگاو رەنگەکان، یان هەندێکیان توانیان پاشەکشەی پێبکەن؟

ئێستاش.. لەو دروشمانە، هەندێکیان وا دیارە ماوون‌و کاریگەریشن، بۆیە ئاوا کاك ئەبو بەکر بانگی مەرگی ئەمانیش ئەدا.

سەیرە، نوسەرێکی ئیسلامی سیاسی مەرگی دەسەڵاتی (١٤٠٠) ساڵەی خۆی بیر ئەباتەوە، بەڵام مەرگی چەند ساڵەی دەسەڵاتی بیروباوەری تر زەق ئەکات. ئەمە جگە لەوەی کاك ئەبو بەکر هەقە بزانێ کەوا: هەموو ئەو بیروباوەرانەی لەپانتایی فکری ئیسلامدا، لەناو دەوڵەت‌و میللەتانی ئیسلامیدا، ئەوەتەی سەریان هەڵداوەو پەرەیان سەندوەو گەیشتبنە هەر ئاستێك، بێگومان لەسەر حسابی مەرگی بیرو باوەرە هەڵەکانی ئیسلامی‌و دەسەڵاتی ئیسلامی سیاسی لەکۆنەوە هەتا ئێستا، ئەو بیرو باوەرانە دروست بون‌و درێژەشیان کێشاوە.بۆیە ئەگەر خاتری کاك ئەبو بەگر بگرم، ئەڵێم: ئەگەر یەك دروشم لەو دروشمە رەنگاو رەنگانەشی مابن (کە زۆرتریش ماوون) تەنانەت ئەو دروشمەش لەسەر جەستەی مرداری دروشمێکی ئیسلامی سیاسی ماوە.

دیموکراتیخوازو عەلمانیەکان، شەری مردووەکان ناکەن، وەکو کاك ئەبو بەکر بەو موتڵەقیە باسی ئەکا. بەڵکو ئیسلامە سیاسیەکانن ئەیانەوێ مردوو زیندوو بکەنەوە.

دیموکراتخوازەکانیش.. هێشتا (زەمەنی بەسەرچویان نییە) هەتا بێ‌ئاگا شەری بکەن. زەمەنی بەسەر چوو، زەمەنی ئیسلامیە سیاسیەکانە کە دەمێکە کەوتونەتە ململانێ لەگەڵیا. دیموکراسی بەسەر نەچووە، عەلمانیەت بەسەر نەچووە، هەتا بکەوینە شەری زەمەنی بەسەرچویان. جارێ دەیان وڵاتی

ئیسلامی هەیە نە دیموکراسیو نە عەلمانیەتی دیووە، چ جای زەمەنی بەسەر چوبێ. بەڵام ئەو وڵاتە موسوڵمانانە زیاترلە (١٤٠٠)ساڵ زەمەنی ئیسلامیان دیووە.ئەگەر مەبن شەری زەمەنی بەسەر چوو بکەن، ئەوانەن کە زەمەنو زەمانە بەختی تەختی حوکمی تاقیکردونەتەوە. نەك ئەوانەی هێشتا پاشماوەکانی زەمەنە بەسەر چوەکانی ئیسلامی سیاسی نەیهێشتووە، بەختی دیموکراسیو عەلمانیەت تاقی بکەنەوە.

## ئەی لەکام چاخداین؟!

(زۆر گرنگە لە کاتی لێدوانو مامەڵەکردن لەگەڵ چەمكو رێبازو تێزەکانداو بانگەشەکردن بۆیان یاخود رەتکردنەوەیان. چاك ئەوەمان لەبیر بێت لە ئەوروپای چاخی رۆشنگەریو سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمدا نازین. بەڵکو وەك وتمان گۆران رویداوە. گۆرانی قوڵو کاریگەریش رویانداوە. بە پلەی یەکەم لە خودی خۆرئاوادا تێزەکانی سەردەمی رۆشنگەریی تا راددەیەکی باش بووە بە بەشێ لە کەلەپووری خۆرئاواو کەوتۆتە بەر رەخنەی رەخنەگرانو لەچوارچێوەی مێژوییەکەی خۆیدا دەخوێندرێتەوە).

لێرەدا، کاکە بەکر، پێی لێهەڵبریووەو بە خەستی باس لە ئاڵوگۆرێکی قوڵ ئەکا. لەو وایە گۆرانکاریەکان ئەوەندە قوڵ بوون، تەنانەت لە چاخی رۆشنگەریو سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمدا نازین. پێی وایە سیحری گۆرانە قوڵەکانی ئوروپایەو مادام سەردەمی رۆشنگەری (تنویر) نەماوە، ئیتر نۆرەی هاتنەوە مەیدانی فیکری ئیسلامی ئەو هاتۆتەوە. دڵیشی بەوە خۆشە کە تا رادەیەکی باش لە (خۆرئاوا)دا رۆشنگەی بوەتە بەشێکی کەلەپورو رەخنەی توندی لەسەرە.

گەر وردی ئەو قسانە ببین، ئیتر بەسە تێبگەین کام ئەبو بەکر سادەیە لە بیرکردنەوەدا. بگرە نە لە خۆرئاواو نە لە رەخنەکانی خۆرئاواو نە لە ئاڵوگۆرەکانیان تێگەیشتووە.

**برام، ئەبو بەکر!**

ئەگەر ئەوروپا لەسەدەی نۆزدەو بیستەمدا چەقی ببەستایە، بێگومان ئێستا نەئەبووە خاوەن سیستەمی نوێی جیهانو عەولمە. خۆرئاوا، لەژێر فشاری بیروراکانی دەرەوەدا، رەخنەی لە رابوردوو نەگرتووە، بەڵکو زەرورەتو

پێشکەوتنی ئاڵوگۆڕەکان رەخنەی لەناویاندا خولّقاندووە. لای ئەوان ڕۆشنگەری لە قۆناغێکدا قەتیس نەماوە. ئەوان دۆگم نین، ئەوان ئاشقی رمبازێنی چاخەکانی ناوەراست نین. ئەوان هەمیشە کاژی کۆنیان بە رەخنە لە خۆ گرتن فڕێ ئەدەن‌و بۆ هەر قۆناغێك بە بیرو بەرنامەو نەخشەی نوێیان هەبوەو هەیە.

کاتێك کە بیری ڕۆشنگەریش سەری هەڵدا، مەسیحیەکان (وەکو ئیسلامیە سیاسیەکانی کۆن‌و نوێ) نەك گاڵتە بەڵکو گاڵەیان پێ‌ئەکردن. بەڵام ڕۆشنگەری بردیەوە. ئێستاش مەخابن ئاڵای ڕۆشنگەری نوێ هەر لەسەر دەستی ئەوانە.

ئەگەر لە سەدەی حەڤدە بەدواوە، ئاڵای ڕۆشنگەری بەسەر زینی ئەسپ‌و دواتر شەمەندەفەرو کەشتی‌و سەیارەو ئامێری بوخاردا ئەشەکایەوە، ئێستا ئاڵای ڕۆشنگەری نوێی خۆرئاوا لەسەر مانگە دەستکردەکانیان‌و لەناو تۆڕی ئەنتەرنێت‌و سەتەلایتەکانی هەموو کونجێکی ئەم جیهانە دەشەکێنەوە. کاك ئەبوبەکریش، وەکو (مامە سۆفیەکان)ی جاران، خۆی‌و هاوڕێکانی بەئاڵای شەکاوەی بەردانی ریش‌و بە حجابی زۆرەملێی ژنانیان، ئەیانەوێ ببنە جێ‌نشینی نەمانی چاخی ڕۆشنگەری سەدەی نۆزدەهەم.

کاکە ئەبو بەکرا!

دڵت بەوە خۆش نەبێ ڕۆشنگەری رەخنەی لێگیراوە، بەڵکو ئەبوایە دڵت بەوە تەنگ بوایە. چونکە ڕۆشنگەری بە چەمکە دێرینەکەی، ئیتر بۆ ئۆروپا کۆن بووە. ئەوان بیر لە بیری نوێ ئەکەنەوە، خۆ وەکو ئیسلامی سیاسی ناگەڕێنەوە بۆ سەردەمی پێش ڕۆشنگەری. ئەوان پێش ئەکەوون بۆ سەردەمی دوای ڕۆشنگەری. خۆیان بۆ هەزارەی سێهەم ئامادە ئەکەن. ئەو هەزارە سێهەمەی لە دەهەکانی یەکەمدا، بێگومان ئیسلامی سیاسیش وەکو مەسیحیەتی سیاسی، دەکاتەوە مولّکی تاکە کەس‌و لەناو گیانی ئەوانەی، ئازادن باوەریان پێی هەبێ، جێگیری ئەکا.

## ئەی چ دەسەڵاتێك؟ تێ‌ناگەم

(دەسەڵات دەسەڵاتی گەل‌و بەتایبەت رەنجدەران‌و ڕۆشنبیرانی شۆڕشگێڕو خێرو بێری وڵات بۆ هەمووان‌و یەکسانی کاڵای باڵای کۆمەڵگا. بەڵکو دوای دەیان ساڵ لە ئەزموونی دەوڵەتە مودێرن‌و سکیولەرستەکانی ناوچەکەدا دەژین.

لە سەردەمێکدا دەژین کە دەیان ساڵ تاڵاوی ژێرسایەی (أستبداد)ی ئەو دەسەڵاتانەمان چەشتووە کە لەسەر دارو پەردوی دەوڵەتی عوسمانی

دروستبوون‌و نوخبەیەك دایمەزراندوون‌و بەڕێوەی بردوون كە بەردەوام چاوی لەخۆرئاواو شێوە ژیان‌و بیركردنەوەی ئەوبووە. لەسەردەمێكدا دەژین كە بەڵێنەكانی بەدیهێنانی دیموكراسی‌و ئازادی‌و پەرەپێدان‌و خۆشگوزەرانی‌و پێشكەوتن نەك لەسەر دەستی ئەو نوخبانە بەوجۆرەی پێویستەو مافەكانی مرۆڤ فەراهەم دەكات نەهاتنە دی بەڵكو ئێستا زۆربەی هەرە زۆری ئەو ڕژێمانە بەدەست قەیرانێكی قووڵی شەرعیەتەوە دەناڵێنن).

لێرە بەدواوە نوسەر كەوتۆتە شمشێری نوسین. ڕاست‌و چەپی فتكردووە. ئەیەوێ وای پیشانبدا كە: لە ڕۆژهەڵاتیش دا، دوای دارمانی عوسمانیەكان، دەسەڵاتی ڕەنجدەران‌و ڕۆشنبیرانی شۆڕشگێڕ هاتونەتە دی‌و تێكیش شكاوون. جگە لەمە، وای باس ئەكا گوایە حكومەتەكانی ناوچەكە (سكیولارستن — عەلمانین).

جارێ، یەمەنی دیموكراتی لێدەركەین، هیچ حكومەتێكی ڕۆژهەڵاتی موسوڵمان، لافی حكومەتی ڕەنجدەران‌و ڕۆشنبیرانی شۆڕشگێڕیان لێنەداوە، لەمەدا غەدری كردووە، ئەگەر حكومەتەكانی تری ڕۆژهەڵات، بە حكومەتەكانی ڕۆژهەڵاتی ئۆروپاو چین‌و ڤێتنام شوبهاندبێ.

حكومەتەكانی تریش، لەراستیا گەورەترین گیروگرفت لەوەدایە كە هیچیان نە دیموكراسین‌و نە عەلمانی ڕاستەقینە. بەڵكو بە پێچەوانەوە، زۆر جار دوژمنی ئەو چەمكانەشن. كاكە ئەبوبەكر خۆی بە هەڵە نەبا، یا وا نەزانێ ئەو حكومەتانە دوا نمونەكانی حكومەتە دیموكراسی‌و عەلمانیەكانن. قەناعەتی ئەگەر هەڵەی ئاوا بكەنە بنەمای بۆچونەكانیان، بۆ پرۆژە بەدیلەكانی فكرو سیاسیان، دوچاری كارەساتی گەورە ئەبن. چونكە ڕێرەوی پێشكەوتن‌و ئاڵوگۆڕەكان لەناو ئەم گەل‌و دەوڵەتانەش بەرە بەرە، بەرەو دیموكراسیەت‌و عەلمانیەت ئەڕوا. ئیسلامە سیاسیەكانیش، بە حسابی خۆیان دوای هەرەسی ئۆروپای ڕۆژهەڵات، خۆیان بۆ ژیانەوەی حوكمی دێرینەی ئیسلامی ئامادە كردووەو پێیان وایە ئیتر دیموكراسیەت‌و عەلمانیەت كۆتایی هاتووە، ئەم حسابە، حسابێكە كورتی هێناوە. چونكە دیموكراسیەت‌و عەلمانیەت لەمەو دوا، بە شێوەو شێوازێكی نوێی گونجاو، لە هەلومەرجی نوێی جیهاندا، بە مەبەستی ڕاستەقینەیی نۆرەیان دێتە پێش. چونكە هەرچی لەمەوبەرە، دەسەڵاتدارەكانی سەر بە (خۆرئاوا) ئەگەر بە شێوەیەك كەوتبنە ژێر كاریگەری بیری خۆر ئاواش، بەڵام لەناو كۆمەڵ‌و ژیانی

کۆمەڵایەتیدا، نە زەمینەی مادی هێنانەدی سیستەمی دیموکراسی هەبوو، نە جیێی فراوانی خاوەن سەرمایەو پیشەسازیش لەناو کۆمەڵەکاندا، بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە هەبوو. لەمەودوا ئاڵوگۆڕە ئابوریو سیاسیو کۆمەڵایەتیەکانی جیهان، ئەو پێویستیانە ئەرەخسێنن، شەپۆلەکانی گۆڕانکاریش یەك لە دوای یەك شەپۆل ئەدەن. بۆیە، بە راستی مەترسیەکی گەورە لەو جۆرە تێزانەی (یەکگرتوو) سەبارەت بە ئەمانی سیستەمەکانی دیموکراسیو عەلمانیەت، لەداهاتوودا پێش بینی ئەکرێ.

ئەگەر روداوەکان بەرەو چڕیو قوڵبونی بۆچونە جیاوازەکان بڕواو، دەوڵەتە ئیقلیمیەکان بەم شێوەیەی ئێستایان بمێننەوەو، بتوانن تەحەکوم لەچارەنووسی سیاسیو باری کۆمەڵایەتیمان بکەن، رەنگە، عەقڵیەتی لەم چەشنەی (یەکگرتوو) کارەساتی گەورەی لێبکەوێتەوە. چونکە لە کوردستاندا، جارێ رێگایەکی دوورودرێژی رزگاری — دیموکراسی ماوە. هێشتا هێزەکانی کوردایەتی تازە لەباشوری کوردستاندا، لە شاخ هاتونەتە خوارەوەو خەریکی راپەراندنی ئەرکەکانی شارستانین، ئا لەم سەرەتای رێگەی بەدی هێنانی دیموکراسیدا، (یەکگرتوەکان) رێگە بەم هێزانە ئەگرنو خۆیان بەهێزتر ئەکەن بۆ بەدی هێنانی ئەو باوەرەی هەیانە، گوایە: نۆرەی ئەوان هاتۆتەوە پێش ئیتر ئەبێ گوێمان لەزەنگی خەتەرناکی ئەنجامی رێگە گرتنی (یەکگرتوو) ببێ. ناکۆکیەکان زۆر قوڵن، بڕوانن:

(دیموکراتیخوازو عەلمانیەکان پێیان وایە سەرەتای رێگای ئەزمونی دیموکراسیو عەلمانیەتە. بە پێچەوانەشەوە، ئیسلامیە سیاسیەکان (تێکڕا) پێیان وایە ئەو جۆرە رژێمانە گەیشتونەتە بنبەستو بەدەستی قەیرانی قوڵەوە ئەناڵێن)ن.

لەناو ئەم دووبۆچونەدا، مەگەر بەناچاری، ئەگینا خاڵی یەکگرتنو یەکانگیری بەدی ناکرێ. دەستەبەر چییە ناکۆکیەکان دیسان، بە شێوەیەکی تر، خەتەرناکتر، نەتەقنەوە.

ئەوانە، جگە لەوەی مەسەلەیەکی وردتر لە ناوەخنی بۆچونی ئیسلامی سیاسیدا هەیە، ئەویش ئەمەیە:

ئیسلامیە سیاسیەکانی کۆن‌و نوێش، یەکێك لە هۆیە کاریگەرەکانی دژایەتی کردنی حکومەتەکانی رابوردوو، ئەوە بوو کە ئەو حکومەتانە گوایە هەم دیموکراسی‌و هەم سەر بە خۆرئاوابوون. ئەمە لە کاتێکدا، راستە سەر بە خۆرئاوا بوون، بەڵام دیموکراسی نەبوون. ئێستا، هیچ لەو دوو مەسەلەیە لەکوردستاندا نەگۆڕاوە، مەسەلەی دیموکراسی بۆتە پرنسیپێکی چارەنوسساز. دۆستایەتی ڕۆژئاواش، ئاشکرا باس ئەکرێ. بەمەش: دیموکراسیەت لە حکومەتەکانی پێشوو زیاتر بۆتە ئامانج. کەواتە: ئیسلامیەکانیش زیاتر دەکەونە دژایەتی دیموکراسی‌و ئاڵا هەڵگرانی دیموکراسیش. دۆستایەتی ڕۆژئاواش بێ تەمو مژ خراوەتە بەرنامەوە. ئەمیش ناکۆکیەکان لە جاران زیاتر (ئەگەر ئیسلامیەکان راست بکەن) ئاڵۆزتر ئەکا. قوڵبونی تەواوی ئەو ناکۆکیانە لە سۆنگەی بیروباوەری ئیسلامیەکاندا، تەقینەوەیەکی چاوەروان کراوی قوڵیشی لێ‌ئەکرێ. (خوا رەحم بکا!)

ئەمێنێتەوە بڵێین: حاڵ وابروا ناکۆکیەکان وەکو ئێستا خاو نامێننەوە. ئیتر قبوڵ ئەکرێت. لەسەریشی بڕۆن، ئەشتەقێتەوە. ئەمە پێش بینی مەنتقی لێکدانەوەی ناکۆکیەکانە. لە بەرامبەر ئەم ناکۆکی‌و ئەگەری تەقینەوەی ناکۆکیەکاندا، بێ لایەنی پاساوی نییە. دیموکراتیخوازەکان پێویستە لەژێر هیچ پەردەیەکی تایبەتی‌و گشتیدا، خۆیان لەم ناکۆکیانە نەدزنەوە. ڕێگاکان روونن: ڕێگەی دیموکراسی‌و ڕێگرانی ڕێگەی دیموکراسی. سەرپشکی هەڵبژاردنی یەکێکیانن. نە ئیسلامیەکان‌و نە دیموکراتخوازەکان، هەق نییە خەڵك چەواشە بکەن. پێش‌وەختیش دیموکراتیخواز فریا بکەوون، واز لە خەم ساردیان بهێنن، رەنگە بتوانن پێش لە تەقینەوەیەکی تری زیانبەخش بگرن. یان ڕێگاکە بە ڕێگرانی دیموکراتی بەر بدەن.

پێش کۆتایی هێنان بەم پەرەگرافە، نامانەوێ باز بەسەر دووخاڵی تری پەرەگرافەکەدا بدەین، ئەویش ئەمانەن:

**یەکەم:** هەموو ئەو حکومەتانەی، بەناوی رەنجدەران‌و ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕ دامەزراون‌و روخان، لە سێ چارەکە سەدەی حوکمیاندا، توانییان هەزار قات خزمەتی خەڵکی خۆیان لە هەموو حکومەتە ئیسلامیە کۆن‌و نوێکان بکەن. هەر زۆر زۆریش لەو حکومەتانە پێش کەوتوتر بوون. ئەوەی روخاندنی ئەبونی دیموکراسی‌و نەهێنانە دی پێویستیەکانی

دیموکراسیو ئازادی بوو. نەك تەنگو چەڵەمەی ژیانو خۆراكو پۆشاك
**دووەم:** دارو پەردوی دەوڵەتی عوسمانیش کە کاکە (ئەبو بەکر) باسی ئەکا.
دارو پەردوی ئیسلامو گەورەترین خەلیفەکانی موسوڵمانان بووە.
دەوڵەتیش نەبوو بەڵکو ئیمپراتۆریەت بوو. گەیشتبووە ئەورووپاش.
هۆیەکانی روخانیشی ئاشکرایە، چونکە نەیان توانی دیاردەو روداوە
نوێکانی جیهان دەرك پێبکەن. سووربون لەسەر پایەگاکانی حوکمی
ئیسلامو خەلیفایەتی. نەیان توانی کەڵك لەپێشکەوتنەکان وەربگرن.
هەتا توانییان بەناوی ئیسلامەوە دژایەتی رۆژئاوایان کردو دێرین خواز
بون. کاتێك ویستیشیان بچنە باوەشی رۆژئاوا، کاریان لەکارترازابوو.

لە کۆتایشدا ئەڵێین: کاکی نوسەر باسی حکومەتە پاشکۆکانی خۆرئاوای کردووە، بەڵام خۆی لە حکومەتە ئیسلامیەکانی خۆرئاوایی لەناوچەکەدا نەداوە. کاکە ئەبو بەکر باش دڵنیایە کە حکومەتە ئیسلامیەکانی خۆرهەڵاتی — خۆرئاوایی) زیاترن لە حکومەتە نادیموکراتیو ناعەلمانیەکانی خۆرهەڵاتی سەربەخۆرئاوا. ئێستاش لە دورگەی عەرەبدان لە پاکستانو بەنغلادیش هەروا ماوەتەوە، ئیتر بۆچی نوسەر هەر شەر بە حکومەتەکانی تر ئەفرۆشێ.

## دەستی لە خوێندا سوور

- نووسەر ئازادیخوازیەکەی گەیاندۆتە دژایەتی ئیمپریالیزم. خۆرئاوای داشۆریوە، مێژووی رەش کردووەتەوەوە.

(خۆرئاوای سەرمایەداریش کە دەستی بە خوێنی گەلانی رۆژهەڵات سوورە، خاوەنی دۆسیەیەکی رەشی دەیان ساڵە سەدان ساڵەی چەوساندنەوەو دوژمنایەتیکردنی گەلانی ناوچەکەو تاڵانکردنیانە.

داگیرکەری وڵاتانو تاڵانکەری خێرو بێریان بوونو بکوژی رۆڵەکانی گەلانو سەرکوتکەری شۆرشو راپەرینەکانیان بووە. هەروەها یارمەتی دەری بەردەوامی ئەو رژێمانە بووە کە لەرێی زەبرو زەنگەوە خۆیان بەسەرچارەنووسو (مقدرات)ی گەلەکانیاندا سەپاندووە).

خۆرئاوا، بە جەنگەکانی سەدان ساڵەدا، بە تایبەتی لە جەنگی خاچ پەرستەکانو جەنگی یەکەمو دوەمدا، هەر بەقەد ئەو جەنگانە خوێنیان رشتووە کە خەلیفەکانی ئیسلامیو دەسەڵات دارەکانی ئیمپراتۆریەتەکانی ئیسلام بەرامبەر گەلانو میللەتان رشتویانە.

دەسەڵاتەکان، ئەوەتەی هەن هەتا ئێستا، لە پێناو پاراستنی دەسەڵاتو بەرژەوەندیەکاندا، دریغیان لە کوشتو کوشتار نەکردووە. هەر لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامیدا بووە، لەکاتی راپەرینی زنجیەکاندا، زیاتر لەنێو ملیۆنیان لێکوشتون.

لەکاتی فتوحاتی ئیسلامیدا، هەر میللەتێك بەرەنگاری لە خۆی کردبێ، جگە لەکوشتو کوشتاری هەزاران، (ئەنفال) یش بە پێی ئایەتی قورئان کراوون. ئەنفالیش کوشتنی ئەوانەی تەسلیم بە لەشکری ئیسلام نەبوون، لەگەڵ حەڵاڵ کردنی ماڵو ژنو کچو غولامی خەڵکەکە.

لەسەردەمی خەلیفەکانەوە، بەڵکو لەسەردەمی پێغەمبەرەوە، کام هۆزو کام میللەتو کام هەرێم، بە ئارەزوو بونەتە ئیسلام. یان لە ژێر هەرەشە یاخود لەژێر زەبری کوشتارو داگیرکردن بووە. قورئان بە راشکاوی بانگەشەی هێزو دیسپلینو ترساندنی دوژمنەکانی ئەکا. (واعدو لهم ما أستطعتم من قوة ومن رباط الخيال ترهبون به عدوالله وعدوكم).

هێز کۆکردنەوە، ترساندنی دوژمنی خواو دوژمنانی سەردەم دارانی ئیسلام، کاتێك دەکەوێتە ئارای جێبەجێکردن، چی لێدێ.

سوپاسالارێکی ئیسلامی، سوپایەکی ئەدرێتێ. ئەنێردرێ بۆ (فتح)ی ولاتێك. پێی ئەوترێ: تۆ نوێنەری خەلیفەو عەلەمداری ئیسلامو سەرکردەیەکی (خير أمة أخرجت للناس)ی، کە هەموو ئەو پەیامانە، کردەی ئیسلامن. سوپاسالارێکی ئاوا بە سوپایەکی پۆشتەو پەرداخەوە، گریمان ئەنێردرێبۆ (فتح)ی کوردستان. سوپاکە بۆ سەرخستنی پەیامی خواو پەیمانی پەیامبەرو پایەی شەریعەت، پێك هاتووە، سوپاکە، بکوژن لەسەر هەقن. بکوژرێن ئەچنە بەهەشت. چییان دەست بکەوێ، لە ماڵو ژنو کچو نێرینەی جوانیش حەڵاڵیانە. وای دائەنێم، (١٤٠٠)ساڵ لەمەوبەر، بابایەکی قورەیشی، یان ئەوسی، یان خەزرەجی، یان غەساسنەیی، یان بوحتەری، یان نبهانی، یان عەنسی، یان جەزامی،..تاد

هەر بابایەك لە باباکانی بیابان نشینەکان، کە رەشو سیمای رەگەزێکی دورگەی عەرەبیان هەبووە (ئێستاش مرۆڤێکی جوانو سپیو سورفن لە دوورگەی عەرەبدا نییە)، گریمان سوپا سالارو بە سوپایەکەوە نێردراوەتە کوردستان، بێگومان ئەو سوپا سالارەو سوپاکەی، عەقلیەتی مەزنخوازیو پیرۆزی ئیسلامو سەرکەوتن بەهەر نرخێك بووە، دەکاتە رێبازیانو سەرخستنی

نەخشەکانیان لە کوردستاندا. لە کوردستان یان لەناو هەر میللەتێکی تردا بەرەنگاری کرابن، هەڵبەتە قەتلوعامیان ئەکەن. هەزاران کەسیان کوشتبێ، حەڵاڵ بووە. یەك کەسیشیان لێکوژرابێ دەست بەجێ کراوەتە شەهیدو روحیانەتەکەی رەوانەی بەهەشت کراوە. ئەمە جگە لەوەی بەپێی سورەتی (ئەنفال)یش، ماڵو ژنو منالێ، حەڵاڵیان بووە. کاتێك رەش تاڵەیە سوپا سالارو سوپایەکی پۆشتەی گۆش کراو بۆ سەرکەوتنی ئیسلامی پیرۆزو دەست خستنی دەستکەوت، لەناو دەستکەوتەکانیشدا، ژنو کچو نێرینەی جوان جوانیش حەڵاڵ بووە، دیارە، بۆ ماڵو کچە جوانو سپیو سورەکانی کوێستانەکانی کوردستان، بەراستی سوپای ئیسلام، شەریان کردووەو پیاویان کوشتووە، ئیسلامیشیان لەپاڵدا سەپاندووە. بروانن، لە سەردەمی (عضد الدولە)دا چی رویداوە:

(ساڵی (٩٨٠/٣٧٠)سوپایەك بۆ سەر کوردەکانی هەکاری نێردرا. کوردەکان گەمارۆدران. بەمانە بەڵێن درا ئەگەر خۆیان بدەن بەدەستەوە گیانیان ئەپارێزرێ. کوردەکان باوەریان کردە گفتەکانیانو خۆیان دابەدەستەوە. بەڵام فەرماندەی سوپای هێرش بەرەکە هەموویانی بە درێژایی پێنج فرسەخی نێوان جادەی مەلاتیەو موسڵ، بەدار هەڵواسی) (*).

ئەمە نمونەی جوامێری سوپاسالارێکی سوپای ئیسلامییە لەکاتی فتوحاتی مەڵبەندەکانی کوردستاندا. نەك هەر لە کاتی شەردا، بەڵکو لە کاتی تەسلیم بونیش دا، ئەویش لەسەر گفتی سوپاسالارەکە، کە بێگومان گفتەکە بەناوی خواو قورئانو پێغەمبەریشەوە دراوە، ئینجا وەکو کۆیلە راپەریوەکانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی کە هەمویان هەڵواسین، ئەم سوپا سالارەی ئیسلامیش، کوردەکانی تێکرا لەنێوان مەلاتیەو موسڵدا، کە مەودایەکی زۆر دوورودرێژە، جەنگاوەرە کوردەکانی هەڵواسیووە. زانراویشە سوپای ئیسلام چی بەرامبەر پەرستگاو ئاتشگای زەردەشتیەکانی شارەزوورو هەورامان کردووە. هەزارانی کوشتنو سوتاندوون. هەزاران ژنە کوردیشیان بە ئەنفال بردوون.

کاکە ئەبو بەکر، وەکو هەنگی لە هەنگستانی مێژووی چەرخی خۆرئاوای سەرمایەداری دزیبێتەوە، قەڵەمەکەی لەسەر داگرتونو بە خوێن رێژی گەلانی

---

* بروانە لاپەرە (٥٥)، کرد در دائرە المعارف اسلام، ترجمة: أسماعیل فتاح قاضی. أنتشارات صلاح الدین أیوبی.

ڕۆژهەڵات ناو زەدی کردوون. ئێمە نکۆڵی لەو سیاسەتە ئیمپریالیستە ناکەین کە دەرهەق گەلان کراوە. تاوانەکانیشیان ئێستاش مایەی نەفرەتو شەرمەزارین بۆیان، بەڵام کوشتو کوشتار لە ڕۆژهەڵاتدا بەرامبەر بە گەلان، هەر ئیمپریالیزم نەیکردووە، ئیسلامو عەرەبو حکومەتە ئیسلامیەکانی ئەم سەردەمەش، تورکو فارسیش، درێغیان نەکردووەو نایکەن. ئەگەر تەنها بۆ جارێکیش، نوسەر ئامازەی بۆ کوشتارگاکانی ئیسلامی سیاسی بکردایەو ڕەخنەی لێبگرتنایە، قسەکەی قابیلی وەڵامدانەوە نەئەبوو.

- ( چۆن ڕەخنە گرتنێك؟ )

(حەزدەکەم ئەوە بڵێم کە لێرەدا زۆر باسی تێزو فکری بەرامبەر واتە (ئیسلامی) ناکەم لەبەر ئەوە نیە کە بڕوام بە ڕەخنەلێگرتنی نییە. بەڵکو هەر لەهەمانکاتدا دەبێت ڕوبکرێتە ڕوناکبیری سەر بە مەرجەعیەتی فکری ئیسلامیش، ئەمیش نەچێت چەمكو تێگەیشتنەکان لە قوڵایی مێژودا دەربێنێو بەو دەلالەتە مێژوییانەی هەڵی گرتووە وا بزانێ دەبێت جارێکی تر لە ژیانی کۆمەڵایەتیو فکری ئێمەدا بەهەمان ئەو ڕەنگدانەوانەی هەیبووە کاربکاتو کاتو شوێنو ژینگەو گۆڕانەکان بخاتە دەرەوەی پڕۆژەکەی خۆیەوە).

لەکۆتایی پێشەکیەکەدا، نوسەر ئەیەوێ خۆی بە نوێخوازی ئیسلام بنوێنێو قسە لە ڕوناکبیریەکی نوێ ئەکا. بەڵام بۆ دژایەتی کردنی عەلمانیەت.

ڕوناکبیری نوێ، بە قسە نییە. پەیوەندی بەسەرچاوەی ئەو بڕواو فەلسەفەیەوە هەیە کە بیری نوێی لێ‌هەڵئەهێنجێ، ناکرێ لە فەلسەفەو بیرێکی دێرینە، ڕوناکبیریەکی مۆدێرنیزم، یان نوێ، بەبێ‌ئەوەی بنچینەکانی ئەو بیرو فەلسەفەیە، قابیلی گۆڕانو دەقەکانی قابیلی لێکدانەوەی جیاواز بێ، دابهێندرێ.

هەر فەلسەفەیەك، ئاینو مەزهەبێك، بیروباوەرو ئایدلۆجیەتێك، دەقەکانی بکاتە یاسای نەگۆڕ، یان بۆچونی چەسپیو، یاخود پێوانەی شمولی، هەرگیز ناتوانێ لەسەردەم هەلومەرجێکی سەراپا گۆردراودا، خۆی وەکو پێویستە بگۆڕێ.

گۆڕانو ئاڵوگۆڕی سیستەمی فەلسەفەو بیروراو مەزهەب، دیناماکیەتێکی زیندووی ئەوێ. گۆران، پرۆسەیەکی ئۆرگانیکە لەگەڵ دیاردەکانی دەوروبەریا. ناکرێ لەناو بۆتەی دەقی ئاسمانیو سونەتی نەگۆڕدراوی پەیامبەریا، نوێگەریەتی ئەوتۆ بخولقێ، بگونجێ لەگەڵ گۆڕانکاریەکانداو بسازێ لەگەڵ ژێرخانو سەرخانی قۆناغێکی سەراپا جیاواز، لە سەرخانو سەرخانی قۆناغی دێرینەو پێشینە.

کاکە ئەبوبەکر، ئەیەوێ بەرواڵەت نوێگەری بکاتە دەسکەلای خۆی‌و ناوەڕۆکیش کوت‌و مت وەکو خۆی، بەبێ ئەوەی بشوێرێ تەنانەت توخنیشی بکەوێ، بیسەپێنێتەوە بەسەر کۆمەڵ دا.

**(عەلمانیەت لە روانگەی نوسەرەوە)**

نووسەر، بۆ ساغ کردنەوەی مەبەستەکانی، سەرەتا هەوڵیداوە هەندێ بڕگەو رستە بەدڵی خۆی بژار بکاو بیکاتە پێناسەی عەلمانیەت. هەتا خوێنەر ئەو بڕگانە بکاتە بنەمای تێگەیشتنی لە عەلمانیەت. بە تایبەتی سەرچاوە لەسەر عەلمانیەت کەم هەیە. ئەوەی هەشە بە زمانەکانی بێگانەیە. یەکێك لەو پەرەگرافانەی نەقڵی کردووە، ئەمەی خوارەوەیە.

**(بنەڕەتی بێ بنەما)**

(عەلمانیەت دەرکەوتنی لە بنەڕەتدا پەیوەستە بە جیاکردنەوەی دامەزراوە ئاینی‌و زەمەنیەکان کە ئەمەش لە ڕوویەکی ترەوە ئەوە دەگەیەنێت ئەم زاراوە باری مێژویی خۆی هەیە. پەیوەستییەکی زۆر بەهێزی بەو ژینگەوە هەیە کە لێوەیەوە هاتووە. واتا لەدایك بووی بارو دۆخێکی تایبەتییەو پەیوەستە بە بیری سیاسی ڕۆژئاواوە. کە لە سایەی ئەو ژینگەداو لە چوارچێوەی زنجیرەیەکی مێژوویی‌و دیاری کراودا گەشەی کردووە)

ئەم پەراگرافە لە ڕێڕەوی لێکدانەوەی سیاسی زاراوەکەو مێژووی سەرهەڵدانیا، هێندەی پەیوەندی بە ئۆروپاوە هەیە، راستە. بەڵام ئایە پێش ئەو بۆچونە، بۆچونی تری پەیوەست بە عەلمانیەت‌و سەرچاوەی عەلمانیەت‌و چەمکی راستەقینەی عەلمانیەتەوە، هەیە یان نەء؟ وەڵامی پرسیارێکی ئاوەها بنەماو بنەڕەتی راستەقینەی عەلمانیەت رون ئەکاتەوە. نەك لایەنێکی سیاسی مەسەلەکە باسبکرێ‌و بنچینەی پرنسیپی مەسەلەکەش فەرامۆش بکرێ. ئاشکراشە، کەوا زۆر جار مەسەلە سیاسیەکانی پەیوەندی دار بەهەندێ چەمکی وەکو دیموکراسی، عەلمانی، مەدەنی، رۆشنگەری‌و عەقلانی، زۆرتر پەیوەندیان بە دەسەڵات‌و حوکمڕانیەوەهەیە، نەك بە مەسەلە مەعریفیەکانی ئەو زاراوانە. مەسەلە مەعریفیەکان، پەلوپۆی زانستیانەو چاوکی فەلسەفی قوڵتریان هەیە.

كاك ئەبو بەكر، زۆرتر مەبەستی بووە مەسەلە سیاسیەكانی عەلمانیەت بكاتە پێوانەی هەڵسەنگاندنەكانی.

عەلمانیەت، وەكو هەموو چەمكێكی تری زانستی، گەوهەری مەعرفی خۆی هەیە. گەوهەرە مەعرفیەكە لە تەفسیرە سیاسیەكەی گرنگترە.

گەوهەری مەعریفی عەلمانیەت، لەوەدایە كە سەرەتا لە سەردەمی رینسانسدا، بایەخێكی زۆر ئەدرایە مرۆڤ و حوكمەكانی ئەقڵ و ئەقڵانیەتو رزگاركردنی ئەقڵ لە هەموو كاریگەرییەكانی ئایینیو ئەفسانەییەكان. بەمەش ئەویسترا، مل كەچی مرۆڤ بۆ حاكمیەتی موتڵەقی خواوەند، بگۆڕنەوە بۆ ملكەچی خودی مرۆڤ ، بۆ حاكمیەتی عەقڵو دیاردە عەقڵانیەكان. ئەم بۆچونانە بەرەبەرە بڵاودەبویەوەو لەناو فەلسەفە، ئەدەب، سیاسەتو تەنانەت شیعریشدا، رەنگی ئەدایەوە، جامە درێژیەكەی (دانتی) بەناوی (كۆمیدیای خواوەند)ەوە، لەسەر بنجی ئەو بیرورا مەعرفیەی ئەقڵو سەرفرازی مرۆڤ لە كاریگەرە ئەفسانەییەكانو حاكمیەتی موتڵەقی ئاینی، داهێنراوە. لەم مەسەلە مەعریفیانەوە، چەمكەكان گوێزرانەوە بۆ ناو سیاسەتو دەسەڵاتو حوكمرانی دونیاییو جیاكردنەوەی دەسەڵات لە ئاین. وا دیارە كاكی نوسەر بە مەبەستی خۆی لەم لایەنە مەعریفیەی عەقڵو عەقڵانیەتی عەلمانیەت لاداوە، چونكە زانیویەتی ئەو مەسەلەیە سەراپا دژی بیروراكانی خۆیەتی. لەبەرئەوەی ئەمەش مەسەلەیەكی گرنگە وا چاكە چەمكێكی ئەو مەسەلە مەعریفیەی سەرفرازی ئەقڵ لە تێزی دەسەڵاتی (موتڵەقی خواوەند) كە هەم مەسیحیەكانو هەم ئیسلامە سیاسیەكان، باوەریان پێیەتی، باسبكەین.

سەرفرازی عەقڵ، یان سەربەخۆیی عەقڵ، لە روانگەی مەعرفیەوە دوولایەنی ئۆرگانیكی لێك دانەبراوی وەكو جەستەو، وەكو عەقڵ سەربەخۆیی هەیە. لەلایەكی تریشەوە، مرۆڤ وەكو بونێكی ئەخلاقیش لەبریاردان سەرفرازبێ. واتە:

مرۆڤ هەم وەكو بونێكی ئەخلاقیو هەم وەكو عەقڵ، خاوەن چارەنووسی سەربەخۆیی بریاری خۆی بێ. ئەمەش چی ئەگەیەنێ، دیارە ئەوە ئەگەیەنێ كە:

لە رووی مەعریفەوە، عەقڵو ئەخلاقی مرۆڤ پابەندی ئاینو مەزهەبو حوكمە موتڵەقەكان نابن. چونكە ئاشكرایە، سەربەخۆیی عەقڵ، وا ئەكا پێوەرەكانی عەقڵ بریاردەربن، نەك پێوەری سەپێنراوی تر. هیچ شتێكی تر، هیچ ئامرازێك،

سەرچاوەیەك، نابنە سەرچاوەی خستنە گەڕی عەقڵو مەعریفەی عەقلانی. بەم پێیەش، عەقڵ تەنها لە ڕووی تێزو بیردۆزیەوە سەربەخۆ نابێ، بەڵكو لە ڕووی پراكتیكیشەوە، سەربەخۆ ئەبێ. كە عەقڵو كە ئەخلاقی مرۆڤیش سەربەخۆ بوون، ئەو كاتە حوكمەكانی عەقڵ لەسەر گەردوون واقعیانە ئەبێو بنەماكانی حوكمی ئەخلاقیش لەسەر دزیو كوشتن، درۆ، تاوان، عەدالەتو مرۆڤایەتی، ڕاستو دروست ئەبێ.

ئەم مەسەلانەو زۆر لێكدانەوەی تریش، پەیوەندیان بەسەرەتاكانی مەسەلە مەعریفیەكانی مرۆڤ و عەقڵی مرۆڤەوە هەیە، كە زەمینە خۆشكەری بریارە سیاسیەكانی عەلمانیەتو جوێكردنەوەی دینو دەسەڵاتە. كاك ئەبو بەكر خۆی لەو مەسەلانە تەواو لاداوە. خۆی بەستۆتەوە بە لێكدانەوەی سیاسی عەلمانیەتەوە. هەوڵیشی داوە مەسەلەكان وا باس بكا كە عەلمانیەت تەنها پەیوەندی بە ئۆروپای مەسیحیەت هەیەو بەس. لەكاتێكدا مەسەلەكە وانییە. تەنانەت ئەگەر عەلمانیەت مەسەلەیەكی سیاسی ئۆروپایی بێو دەرهاویشتەی ناكۆكیەكانی مەزهەبەكانی مەسیحیەتو چینی شۆڕشگێڕی بورجوازیش بێ، لەو سەردەمەدا، دیسان پرۆسەیەكە مادام پەیوەندی بە حوكمەوە هەیەو حوكمیش لەولاتانی ڕۆهەڵاتیش دا هەیە، ئەمیش وەكو باقی مەسەلەكانی تری ژیان، قابیلی سود لێوەرگرتنە. قابیلی ئەوەیە كە لای ئێمەش جێبەجێ بكرێ. ئەمە ئەگەر عەلمانیەت مەسەلەی سیاسی رووتیش بێ. چ جای مەسەلەیەكی مەعریفی بێو مەعریفەكەش بۆ مرۆڤ و ڕزگاری عەقڵی مرۆڤ ، سەرەنجامی بەكۆیلەكردنی مرۆڤو دەستەمۆكردنی كوێرانەی عەقڵی مرۆڤ، هاتبێتە ئاراوە.

ئەگەر مەسەلەكە دەسەڵاتو سیاسەت بێ، دەسەڵاتو سیاسەت لای ئێمەش هەیە، خۆ مەسەلەكە پەیوەندی بەسەربەخۆیی مرۆڤ و سەرفرازی عەقڵیەوە هەبێ، دیارە میللەتانی وەكو ئێمەش هەر لە مرۆڤ پێك هاتوین. سەربەخۆش نەبوین. عەقڵیشمان لەسەردەمی كۆیلەیەتیەوە بۆ سەردەمی ئیسلامو هەتا ئێستاش، لێ زەوت كراوە، بۆیە، ئێمەش بۆمان هەیە عەلمانیەت، یان هەر مەسەلەیەكی تری مەعریفیو سیاسیو مرۆیی، سود لێوەربگرن. هەروەكو چۆن سود لە دیموكراسیەتو زانستو زانیاری، لە ماتماتیك، پزیشك، لێزەرو ئەنتەرنێت وەرئەگرین، كێ ئەڵێ ساڵەهای تر، سود لە كۆپی كردنی مرۆڤ و ئاژەڵیش وەرناگیرێت كە ئێستا بەپێی شەرع گوناحە؟!

- (یەك یان چەندین ئەفسانەی ئاینی؟)

(خەرافەو ئەفسانەو شتی پڕو پوچ پانتاییەکی فراوانی لە عەقڵو بیرکردنەوەی مرۆڤی ئەورووپیدا داگیرکردووەو پیاوانی ئاینی کردوویانە بەئامرازی وڕکردنو کۆنترۆڵ کردنی توێژە بێبەشو جەماوەرە ڕەشو ڕووتەکە).

ئاخۆ.. کاك ئەبوبەکر کە ئەم دێڕانەی نوسیووە، لەواتای خەرافەو ئەفسانەیَ ئایینی وردبۆتەوە. گەر وردیش نەبۆتەوە، بێگومان ناتوانێ ئەو مەسەلانە وا بەئاسانی تەنها بکاتە ماڵ لەسەر بیرکردنەوەی مرۆڤی ئۆروپاییو پیاوانی ئاینیان.

من لە کاکە ئەبوبەکر ئەپرسم: ئایە ئاجوجو ماجوجو شێوە وێناندانەیان لەسەرگوزشتەکانی ئیسلامیدا، کە چۆننو چۆن دێنو چی ئەکەن، ئەمە ئەفسانەو خورافات نیە؟

- ئایە سەرگوزەشتەی ڕاوەستانی ئەرز لەسەر شاخی گایەكو گاکەش لەسەر پشتی ماسیەك وەستابێ، ئەفسانە نییە؟
- ئایە هەر کەسێك لەسەر شانی چەپی چل پەریو لەسەر شانی ڕاستی چلی تر چاودێری ئەکەن، ئەفسانە نییە؟
- ئایە گوایە ئیمامی عەلی لەگەڵ پێغەمبەردا جارێکیان پیاسەیان کردوەو بەردێك لەسەر ڕێیان بووە، ئیمامی عەلی دەستی داوەتە بەردەکە زۆرزۆر قورس بووە، بەردەکەش بچوك بووە، پێغەمبەر پێی وتووە ئەوە گۆی زەوی بووە هەڵت گرتووە. ئەمە ئەفسانە نییە؟
- موبالەغەکردن لە باسکردنی دۆزەخو ئاگرەکەیو قرچەقرچی سوتاندنی دۆزەخیەکان، خورافات نییە؟
- باسکردنی کەراماتو موعجیزەی مەشایخانو خەیاڵو ئەفسانە دروست کردن لەسەریان چییە؟
- گوایە شێخ عەبدوالقادر بۆ هاناو هاواری ژنە موسوڵمانێك لەکاتی نوێژدا لە بەغاوە قوب قابەکەی هەڵدابێ لە هیندستان بەر ئەو زەللامە کەوتبێ کە پەلاماری ژنەکەی داوە، ئەمە ئەوپەڕی خورافات نییە؟ بۆچی موشەکی قارەییش بەو خێراییە لەبەغاوە ئەگاتە هیندستان؟
- ئایە خدری زیندە ئەفسانە نییە، خێوو جنۆکە ئەفسانە نین؟

ئەوانە نموونەی هەر زۆر کەمن‌و هەزارن نمونەی تری ئەفسانەو خورافات‌و درۆو دەلەسەی پڕوپوچ هەن، لەعەقڵ‌و بیرکردنەوەی میللەتانی موسوڵمان‌و میللەتانی تریشدا، کە خەڵکی پێ (وڕنەکەن)و بەهەر شێوەیەك بەرژەوەندیان بخوازێ، پیاوە ئاینیەکان عەقڵ‌و جەستەیان دەستەمۆ ئەکەن.

ئەفسانەو خورافیات، ترس‌و بیم‌و تۆقاندن، هەموو جۆرە داستان‌و سەرگوزەشتەو بەسەرهاتێکی ناعەقلانی، لەناو ئاین‌و مەزهەب‌و بڕواکاندا، بۆ تێك دانی رزگاری عەقڵی مرۆڤ و سەرفرازی جەستەی مرۆڤ و سەربەخۆیی ئەخلاقی مرۆڤە.

راستە ئەو جۆرە (خەرافەو ئەفسانەو شتی پڕوپوچ پانتاییەکی فراوانی لە عەقڵ‌و بیرکردنەوەی مرۆڤی ئۆروپایی داگیرکردبوو (ئێستا زۆر کەم بۆتەوە) بەڵام هەق وابوو، برای نووسەر، دانی پیا بنایە کە لە سەردەمی رینسانس بەدواوە، شۆرشە رۆشنگەریەکان‌و دیوکراسی‌و عەلمانیەت، بە بەربڵاوی دژی ئەو مەسەلانە خەبات کراوەو بەرەبەرە پانتاییان بەرتەسك کراوە. سەدان فەیلەسوف‌و بیرمەند، هەزاران نوسەرو داهێنەر، ملیۆنەها تێکۆشەر، ئاڵای خەباتیان دژی ئەو بیرورا پڕوپوچانە بەرز راگرتووە. قوربانیەکی زۆریشیان داوە، بێگومان لەناو ئیسلامیش دا بیرمەندو زاناو دانای گەورە هەڵکەوتون. قوربانیش دراوە. راستیەکی زۆریش دەرخراوە. بەڵام لە راستیا، ئاینی ئیسلام لەبەرئەوەی هەر کەسەری هەڵداوە کراوەتە ئاینی ئەم‌و ئەو دونیا، کراوەتە ئاینی دەسەڵات‌و شەریعەت‌و حوکمرانی، حوکمی سەر ئەرز کراوەتە حوکمی یەزدانی، بۆیە، زۆر کەمتر لە ئۆروپا، نوێگەری‌و رۆشنگەری‌و ئازادی بیرورا، لەسایەی ئیسلام‌و دەسەڵاتی ئیسلامدا، سەریان هەڵداوە. کەمترین بیرمەندیش وێراویەتی توخنی خوای گەورە بکەوێ. لەکاتێکدا لەئۆروپا لایەنی کەم، لەسەدەی هەژدەهەمەوە، نوسەرو فەیلەسوفی گەورەیە سەربەستی بیروڕای خۆیان لەسەر بونی خواو عیساو موسا دەربڕیووە.

ئێستاش لەناو وڵاتە ئیسلامیەکاندا، هیچ کەسێك ناوێرێ توخنی موقەدەساتی ئیسلام بکەوێ، چونکە فەتوای کوشتنی لە لایەن رێکخراوە تیرۆریستەکانی ئیسلامەوە، دەرئەچێ. هەر لەم چەند ساڵەدا لە لوبناندا، چەندین بیرمەند کرانە قوربانی رقی کۆنەپەرستی ئیسلامی سیاسی.

- (ئازادی ئیسلامیەکانی خۆرئاوا)

.(بە پێچەوانەی ئەو تێزەی مارکسیزمەوە کە پێی وابوو تا کۆمەڵگایەك زیاتر بەرەو پیشەسازیو پێشکەوتنی تەکنەلۆژی بچێت بەو ئەندازەیە باوەڕ بەخوا بوونو ئاین دەپوکێتەوە زیاتر گەشە دەکاتو پاشماوەکانی بەها بەرزەکانی مەسیحیەت کاری خۆیان دەکەنو ئیسلامیش لە ئایندەی خۆرئاوادا شوێنێکی بەرچاوی دەبێتو ئەرکێکی مەزن ڕادەپەڕێنێ کە هەر لە ئێستاوە پێشەنگی ئەوە لە میانەی بوونی سەدان مەڵبەندی ئیسلامیو وەدەرکەوتنی جالیەیەکی ئیسلامی بەرچاوو بەردەوام موسوڵمانبوون لەناو خۆرئاواییەکاندا وەدەرکەوتووە).

کاك ئەبو بەکر ئەیەوێ مارکیزمو زانستو دیاردەی تایبەتیو هەندێ حاڵەتی دەروونی لەم هەلومەرجەدا، تێکەڵاو بکاو بیشیکاتە ڕێسای حوکمی موتڵەق.

پیاو نازانێ نوسەر چەند لە فەلسەفەی مارکیزم ئەزانێو چەندیش قوڵە لە تێگەیشتنی. بەم پەرەگرافەدا ئەگەرحوکمی لەسەر بدەین، ئەتوانین بڵێین: ئاگای لە فەلسەفەکە...کەمە!

کاتێك فەیلەسوفێکی وەکو مارکس، کە باسی پێشکەوتنی پیشەسازیو پەیوەندی دیالیکتیکی پێشکەوتنەکە، بە مەسەلە ئاینیەکانەوە ئەکا، ئەم باسکردنە وەکو مەسەلەیەکی تیۆری – فەلسەفی ئەکاتە بناغەی زانستی میتۆدەکەی. نایەت وردەکاری هەلومەرجی نالەباری سیاسی بۆ قۆناغێك یان دۆخێك، تێهەڵکێشێتە ناو بنچینەی تیۆریەوە.

کاری ئاوا زۆرتر بۆ مەسەلەی سیاسی ئەشێ، نەك لە کاتی دارشتنی تێزی تیۆریدا. کاتێکیش باس هاتبێتە سەر باسی ئاینیو مەزهەبی، مارکسو ئینگلس تەمو مژ لە قسەکانیاندا نەبووە، کە بەهیچ شێوەیەك قبوڵیان نەبووە. تەنانەت مارکس ئاینی بە تریاکی گەلانیش زانیووە.

ئەگەر وردتر بروانینە تێزەکەی مارکسو ئینگلس دەربارەی پەیوەندی پیشەسازیو ئاین، سەرەرای ئەوەی مەسیحیەت لە ئۆروپادا ئەوسا بەهێز بووە، بەڵام لەوساوە هەتا ئێستا، وردتر سەیری ڕەهەندەکانی پێشکەوتن بکەین، ئەبینین بەراستی پیشەسازی هەتا پێش کەوتبێ، جگە لەوەی بە یاساو کردەوە عەلمانیەت چەسپیو ئاینی لە دەوڵەت جیاکرایەوە، لەناو خەڵکیشدا، وەکو

سەدەکانی پێش پیشەسازی، ئایین ئەو کاریگەرییەی لە هەموو بارێکەوە نەماوە. گەرچی خەڵك ئەوپەڕی ئازادیشن لە باوەڕی ئاینیاندا، ئەو بایەخ دانەی ماویشە، مەسەلەیەکی شەخسی‌و ئازادی عەقیدەیی تاکە کەسییە. نەشبۆتە کۆتی ئازادی‌و سەربەستی خەڵك.

ئێستاش.. هەلومەرجێکی تایبەتی لەدوای ئاڵوگۆڕە جیهانیەکان‌و نەمانی ئۆروپای رۆژهەلات هاتۆتەپێش، ئەم هەلومەرجە کاریگەری لەسەر باوەڕو مەسەلە روحیەکان هەیە. ئەمە جگە لەوەی مرۆڤ هێشتا ڕێرەوێکی زۆر دوورودرێژی زانستی‌و زانیاری، لەم گەردونەدا، سەبارەت بە نهێنیەکانی گەردون‌و ژیان، لەبەر دەمیدا ماوە. هەتا نهێنیش لەگەردوندا بمێنێ، مەسەلە روحیەکانیش کاریگەر ئەمێنن. پێبەپێی دۆزینەوەی نهێنیەکان، بەتایبەتی نهێنیە گەورەکان‌و داهێنانی زانستی‌و زانیاری نوێ، سەبارەت بە گەردون، بە مەسەلە بایەلۆجیاکانیشەوە، مرۆڤ لە دڵە راوکێی روحی ئاسودەتر ئەبێ. دوپاتی ئەکەینەوە، ئەم ڕێرەوە زۆر دورو درێژە، رەنگە چەند سەدەیەکی تریش بخایەنێ. هەتا نهێنیەك لەم گەردونەدا بمێنێ، ترس لە ناخی مرۆڤ نابڕێتەوە. هەتا ترسیش لەناخی مرۆڤ بمێنێ، مرۆڤ زۆر جار شۆڕ ئەبێتەوە بۆ ناخی خۆی‌و مەسەلە رۆحیەکانی. ترس‌و ترساندنی مرۆڤ، لە رووی دەرونیەوە، کارێکی راستەوخۆ ئەکاتە سەر عەقڵ‌و جەستەی مرۆڤ. هەتا مرۆڤ لە ژێر کاریگەری ترس‌و تۆقاندندا بیر بکاتەوە، ناتوانێ ئازادانە بیربکاتەوەو عەقڵێ سەرفراز نابێ. ناتوانێ قەناعەتەکانی خۆی بەدڵی خۆی بڵێ. ئەم مەسەلەیە لە ژیانی سیاسی‌و لە ژیانی کۆمەلایەتی‌و لە باوەڕە رۆحیەکانیش دا، بە شێوەی جۆراوجۆر لەسەر عەقڵی مرۆڤ و لەناو کۆمەڵدا، رەنگ ئەدەنەوە.

لەژیانی سیاسیدا، مرۆڤ کە ترسا، نەك ناتوانێ بڕیارو بەرنامەو هەڵوێستەکانی خۆی دەربڕێ، بەڵکو زۆر جار ناتوانێ پێشنیازیش بخاتە روو. لەژیانی کۆمەلایەتیشدا، کە مرۆڤ ترسا، هەموو حەزو ئارەزووەکانی ئازادانە مومارەسە ناکا. لەمەسەلە رۆحیەکانیشدا هەر وایە.

لەو باوەڕەداین، ئەگەر ئاینە ئاسمانیەکان‌و مەزهەبەکان، زەبرو زەنگیان نەکردایەتە ئامرازی مل کەچ پێکردنی خەڵك‌و باس لە دۆزەخ‌و کوشتن‌و ئاخر زەمان، لە ئارای ئاینەکاندا نەبوایە، مرۆڤ بە موتڵەقی سەر پشك‌و ئازاد بوایە لەباری ئاینیەوە، لەوباوەڕەداین خەڵکێکی زۆر کەمتر باوەڕیان بە ئاین ئەهێنا.

یان لایەنی کەم ئاین تێکەڵاو بەدەسەڵات نەدەکراو دەسەڵاتیش نەئەبووە مایەی پاڵەپەستۆ خستنە سەر باوەڕپێهێنانی خەڵك. ئەگەر دەسەڵاتو شمشێرو زەبرو زەنگ نەبوایە، رەنگبوو هەر لەناو دورگەی عەرەبیدا، پێغەمبەر نەیتوانیایە سەرجەم قورشیەکانیش بکاتە ئیسلام، چ جای ئیسلام بگەیەننە هیندستانو ئیسپانیا.(*)

سەبارەت بەوەی ئیسلام لە خۆرئاوادا، لە ئایندەدا، شوێنێکی بەرچاوی دەبێو، ئەرکێکی مەزن رائەپەڕێنێ. پێشەکی با قسەکە لەتەمومژی دەربرین دەربکەین. ئەگەر مەسەلەکە ئەو جالییە ئیسلامیە زۆرە بێ، کە لەئەمریکاو ئۆروپادا هەن، پێش هەموو شتێك هەقە ئەمە بگەڕێنینەوە بۆ شانازی ئازادی لەئۆروپادا. هەروا بۆ ئەو هەستە مرۆڤایەتیەی تێکەڵاوی یاسا عەلمانیەکانی ئۆروپا بووە، ئەگەر ئازادی نەبوایەو ئەگەر عەلمانیەت زاخاوی هەستی مرۆڤایەتی نەدرایە، چۆن ئێستا بە ملیۆنەها ئیسلامی لە ئۆروپادا نیشتەجێ ئەبوونو بە ئارەزووی خۆشیان لە سێکسەوە بۆ تێکۆشانی ئیسلامی سیاسی ئازاد ئەبوون؟ کاکە ئەبو بەکر نایەوێ خۆی لە قەرەی ئەم راستییە بدا، چونکە راستیەکە لە خزمەتکردنی موسوڵمانو ئیسلامی سیاسی توندرەویشدا، هێندە شانازیە بۆ دیموکراسیو ئازادیو عەلمانیەتی (خۆرئاوا) کە دەوڵەتە ئیسلامیو ئیسلامیە سیاسیەکانی قەرزار کردووە.

لەناو دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا، نەك مەسیحیەکان بەپێی یاسا بە پەناندە، وەرناگیرێن، بەڵکو ئەگەر رۆژنامە نوسەکانیش، سەر لەوڵاتە ئیسلامیەکان بدەن، سەدان گیرو گازیان بۆ دروست ئەکەن. چ جای بۆ ئەوەی وەکو ئیسلامیەکان ئۆروپادا ئازاد بن، دیموکراسیو عەلمانیەت، ئازایەتیو لەخۆ دڵنیابونو لەخۆرابینینی ئەوێ. دەوڵەتو نەتەوەیەك، لەشارستانیەتو لەیاساو لەبونیادە کۆمەڵایەتیو رۆشنبیریەکانی دڵنیا نەبێ، ناتوانێ دیموکراسیو عەلمانیو ئازادبێ. سەدان بیانوی ئایینی ئەدۆزێتەوە بۆ خۆ دورخستنەوە لە دیموکراسیو عەلمانیەت، هەروەکو کاك ئەبو بەکر لەم باسەدا چەندین جار لەم بیانوانە ئەهێنێتەوە.

---

* هەتا مردنی پێغەمبەریش، کەمترین خەڵکی عەرەب کرابونە موسڵمان. (تێبینی دوای چاپ)

بۆچی دەوڵەتە عەلمانیەکان، لەملیۆنەها ئیسلامی ناترسن. ئەوپەری ئازادیان داونەتێ. بەلاّم دەوڵەتە ئیسلامیەکان ئامادە نین ئازاری بەیەك گروپی مەسیحی سیاسیش بۆ هەڵسورانی سیاسی‌و عەقیدەیی پێچەوانەی ئیسلام بدەن؟ هۆی ئەمە تەنها ئەگەڕێتەوە بۆ باوەڕ بون بە ئازادی‌و لەخۆرابینینی خۆرئاوا؛ لەرۆژهەلاّتیش دا، نە ئازادی هەیەو نە لەخۆشیان رائەبینن. خۆرئاوای عەلمانی لەخۆی بترسێ‌و لە چالاکیەکانی ئیسلامیەکان بیمێکی هەبێ، نەك ئەتوانێ چالاکیان لێ قەدەغە بکا، بەڵکو ئەشتوانێ لەولاّتەکە وەدەریشیان نێ. کاکە ئەبوبەکر نەك لەم راستیانە خۆی لائەدا، بەڵکو لەو راستیەش خۆی لائەدا کە زۆربەی سەرکردەکانی گروپەکانی ئیسلامی سیاسی، لەولاّتی خۆیاندا کە ئیسلامین، هەڵهاتون، لە ئۆروپادا پەنا دراوون. خۆی لەم راستیەش لائەدا کە رۆژانە، تەلەفزیۆنەکانی جیهان ئەو سەرکردە ئیسلامیە هەڵهاتوانەی ولاّتانی ئیسلامی، لە ئۆروپای عەلمانیدا، بە ریشی درێژو کراسی ئاینیەوە، پیشان ئەدرێن.سەرەراش (ئوسامە بن لادن) لە باتی ئەوەی دژی نەبوونی ئازادی ولاّتە ئیسلامیەکان چالاکی بنوێنێ، دژی ئەمریکاو رۆژئاوا کاری ناجوامێری ئەنجام ئەدا. سەرەراش، هێشتا سەرکردە توندرەوەکانی ئیسلامی، لەئۆروپا دەرناکرێن!!

سەبارەت بە گەلانی ئیسلامیش، لەئەلبانی نشینەکانی کۆسۆفۆو هەرەسەکۆفینی، ئەمانە لە سەردەمی عوسمانیەکانەوە ئیسلام تێکەلاّوی کێشمە کێشی ئاینی‌و رەگەزنامەکانیان بوو. مەسەلەکە ئیسلامی سیاسی رووت نییە، بەڵکو خواستی رزگاری مللی‌و دیموکراسی‌و ئاینیشە.

دوای هەرەسی رۆژهەلاّتی ئۆروپاش، ئەو هەستە وەکو دەرەنجامی هەلومەرجەکە بوژایەوە. مەودایەکی تریش درێژە ئەکێشێ. بەلاّم لەدوا ئەنجامدا، عەلمانیەت‌و دیموکراسی زاڵ ئەبێتەوە بە سەریاندا. چونکە لەناو شارستانی دیموکراسی ئۆروپادا، ناکرێ گەلێك بە سیستەمی سەلەفی بژی. زۆرجار لە مێژوودا، لەناو ئۆروپاییەکانیشدا، ئەم کێشە ئاینیانە لە نێوان مەزهەبەکاندا تەقیونەتەوەو ساڵەهاش ئاوێتەی هەستی نیشتمانی‌و نەتەوەیی بوون، بەلاّم لە دوا ئەنجامدا، هەر چونەتەوە ناو قالّبە دیموکراسی‌و عەلمانیەکە.

دەمێنێتەوە بڵێین:

ئەلبانی نشینەکانی کۆسۆفۆ، ئیسلامین. ئەوەتانێ دوچاری شەری رەگەز پەرستانە بوون‌و زیاتر لەملیۆنێکیان ئاوارە کراوون. ئەپرسین: چەند ولاّتی

ئیسلامی سوپای بۆ هانای ئەو موسوڵمانە لێقەومانە نارد؟ چەند فڕۆکەی ئیسلامی لەئاسمانی کۆسۆڤۆدا بەرگری لە موسوڵمانەکان ئەکا؟ چەند موجاهیدی ئیسلامی چووە ریزی سوپای رزگاری کۆسۆڤۆ؟ جگە لە بەیان دەرکردن و لێکدانەوەو هەڵوێست فرۆشتن، هێزەکانی ئیسلامی سیاسی بەرهەڵستکارو دەوڵەتە ئیسلامیەکانیش چییان کردووە بۆ موسوڵمانەکانی کۆسۆڤۆ. ئەو برە کۆمەکەی لەوڵاتە عەرەبیە ئیسلامیەکانیشەوە نێردراوە بۆ ئەوێ، هەر هەموو بایی یەك سەعات مەسروفاتی عەسکەری ناتۆ نابێ.

ئەم بەتەنگەوەنەچونە بەڵگەی چییە، بەڵگەی ئەوەیە کە تێزەکانی ئیسلامی سیاسی دەربارەی ڕاچەنینی ئیسلامی راست بوایە، کە دوو دەهە زیاترە باسی لێوە ئەکەن، هەڵبەتە ئێستا بزوتنەوەیەکی بەرینی ئیسلامی ئەخولقاو لەرووداوەکانی وەکو کۆسۆڤۆدا، ڕۆڵێکی چارەنوسسازیان ئەگێرا. ڕاچەنینی ئیسلامی، ئەبێ ڕاچەنینی هەناوی بزوتنەوەیەکی مێژوو کردی پانتایی فکرو کۆمەڵەکانی ئیسلامی بگرێتەوە، نەك لێرەو لەوێ گروپ و حیزبی سیاسی ئیسلامی دروست بکرێن و بکرێنە راچەنینی ئیسلامی.

خولقانی بزوتنەوەی چینەکان، گەلان و بیروباوەڕو ئاینەکان، هێندەی پەیوەستە بە باری بابەتیەوە، هێندە پەیوەندی نییە بە دۆخی خۆییەوە. باری بابەتی هەموو بزوتنەوەیەکیش، ناوەرۆکە بزوتنەوەکەی قەیرانە ئابوریەکان و ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و بەدیلە سیاسیەکان ئەیخولقێنن. نەك سۆزو ئارەزووی سیاسی، یان ئایدیۆلۆجی، یاخود مەزهەبی.

لەچەرخی نۆزدەدا، بزوتنەوە خۆرسکیەکانی کرێکاران و خەباتە خۆییەکانی سەندیکاکان، سۆشیالیستەکانیان راکێشایە ناو بزوتنەوەیەکی بەرینی ئۆپۆزسیۆنی کرێکاری، مارکس و ئینگلس و لینین و سەرکردە کرێکاریەکان، بزوتنەوەکەیان لەرووی بابەتیەوە نەخولقان. بەڵکو خولقانی بزوتنەوەکە ڕێبازی سوسیالیزمی زانستی خەمڵاند.

خەباتی رزگاریخوازی گەلان، لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە بۆ کۆتایی جەنگی ساردیش، هەلومەرجێکی بابەتی خولقاندنی. هەر بۆیە سەنگەری رزگاری گەلان بەرادەیەك ئاوێتە بوو، کە سەدان هەزار جەنگاوەری چین، روسیا، ڤێتنام، لاوس، کوباو کەمبودیا، بەهانای یەکترەوە ئەچون و دەیان هەزار قوربانیشیان

لەپێناوی یەکتر ئەدا. کاتێك جەنگی ناوخۆی ئیسپانیا قەوما، لە خۆرا هەزاران هەزار کەس نەچونە ڕیزی کۆماریخوازەکانی ئیسپانیا. هەلومەرجی جیهانی ئەو جۆرە بزوتنەوە مێژوو کردانە ئەخولقێنیّ، نەك بریارو ئارەزووی سیاسی ئەمو ئەو لایەنە.

بۆیە، هەموو ئەو تێزانە لە مەڕ راچەنینی ئیسلامی (الصحوة الأسلامية) قەبەکردنی دیاردەی حیزبایەتی ئیسلامیە سیاسیەکانە ، ژیان تەسکیەی ناکا بەراستی ببنە بزوتنەوەیەکی بابەتی مێژووکردی راچەنینو راپەرینی ئیسلامی لەسەر ئاستی جیهان. تەنانەت لەسەر ئاستی وڵاتە عەرەبیەکانیشدا، ئەم جۆرە تێزانە، بەشێکە لەو توندرەوایەتیەی لایەنەکانی ئیسلامی سیاسی پەیرەوی لێئەکەن. ئەو ئاستە سیاسیەی بزوتنەوەکەشی پێگەیشتووە، رەنگە بەتوندرەوێتی لەباری بەرێ.

- ( عەلمانیەت هەبووە )

(لەبەر ئەوەی عەلمانیەت لە جیهانی سێیەمدا هەنگاوێك بوو بەرەو دواوە نەك بەرەو پێشەوە ئەمەش وای لە زۆربەی توێژەرەوان کردووە کە بێنە سەر ئەو باوەڕەی عەلمانیەتو دیموکراسیەت دووشتی بەیەکەوە بەستراونین. چونکە پرۆسەی دیموراتیزەکردنی ئەم وڵاتانە گەر لەباریش نەچووبێت بەتەواوی ئەوا توشی چەندەها شێوانو بزرکان هاتووەو لە تەنگەژەیەکی قوڵدا دەژیەت. سەرهەڵدانی بزاڤێکی بەربڵاوی ئیسلامیش لەوڵاتە ئیسلامیەکاندا دیسانەوە بەڵگەیەکی ترە لەسەر سنورداربوونی ئەزمونی عەلمانیەت وەك پرۆژەیەك بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵاتو مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگا لەسەرەوە بۆ خوارەوە)

لەم پەرەگرافەدا، نوسەر دوو مەبەستی هەیە:

یەکەم: جیاکردنەوەی عەلمانیەتو دیموکراسیەت.

دووەم: پاشەکشەی عەلمانیەتو پێشەکشەی ئیسلامیەت.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم، عەلمانیەتو دیموکراسیەت، ئایە پێکەوە یان بەجیا ئەکرێ جێبەجێ بکرێن. ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە باس بکرێ، چونکە مەبەست لە جیاکردنەوەیان، مەبەستێکە بۆ دوژمنایەتی کردنی هەردووکیان. بەڵام بە قۆناغ.

عەلمانیەت، زادەی پێویستیەکانی شۆڕشی دیموکراسی بووە. واتە: مامانی عەلمانیەت، سیستەمی دیموکراسییە. ئەگەر دیموکراسی نەبوایە، عەلمانیەتیش نەئەبوو. عەلمانیەتیش نەبوایە، سیستەمی دیموکراتیش سەرنەئەخرا.

دیموکراسی، دەستەبەری ئازادی ئەکاو عەلمانیەتیش، سەربەخۆیی عەقل دابین ئەکا. عەقڵ سەربەخۆ نەبێ، لەکاریگەریە نادیارەکان رزگاری نەبێو ئازادیو دیموکراسی هیچ بەهایەکیان تەنانەت لەناو هۆڵەکانی پەرلەمانیشدا نامێنێ. نەخوازەڵڵا لەناو خەڵکدا. یاخود بۆ ئازادی تاکەکانی کۆمەڵ.

دیموکراسیو ئازادی بۆ پراکتیزە کردنی بریارو بەرنامەو بەهرەکانی عەقڵە. کە عەقڵ لەناو کەللەی مرۆڤ دا، لەترسی پاسەوانە ترسێنەرەکانی ئازادی عەقڵ، یان لەژێر هەیمەنەتی ئاین، مەزهەب، ئەفسانە، خورافیات، شەرعو ئەحکامی شەرعی، عەقڵ کۆنترۆڵی ئاراستەی تایبەتی کرا، ئیتر بە چ شێوەیەك دیموکراسیو ئازادی سیاسی ئەتوانێ تواناو بەهرەی عەقڵ بگۆڕێ بۆ عەقڵانیەتو عەقڵانیەتیش بخاتە خزمەتی پێشکەوتنی کۆمەڵو ژیانی کۆمەڵایەتی؟!

دیموکراسی، ئازادی هەموو هاوڵاتیەك، بێ جیاوازی رەگەزو مەزهەبو ئاینو نەتەوە، دابین ئەکا. عەلمانیەتیش تایفەگەری، عەشرەتگەری، یەك ئاینو یەك مەزهەب سەپاندن، رەت ئەکاتەوە

دیموکراسی ئازادی دابین ئەکاو عەلمانیەتیش عەقڵانیەتی تاك لەهەموو جۆرە داسەپاندنێك ئەبەستێتەوە بەرێرەوی پێشکەوتن. بۆیە، لەرووی تیۆریو پرنسیپەوە، ناکرێ عەلمانیەتو دیموکراتیەت تەلاق بدرێن.

ئەگەر بشمانەوێ قسە لەدیموکراسیەتیش بکەین، کە کاکە ئەبوبەکر لەنوسینەکەیداو لە کۆرو کۆبونەوەکانیش، قبوڵێتی. جێی خۆیەتی بپرسین چ جۆرە دیموکراتیەکی قبوڵە. ئایە دیموکراتیەتی تەنها لە رووی سیاسیەوە قبوڵە؟ ئایە لە رووی ئابوریەوە قبوڵێتی؟ یان لە رووی ناوەرۆكو شێوەو جێبەجێکردنی هەموو لایەنەکانی دیموکراسی؟ گەر نوسەر تەنها لە دیموکراسی لایەنە سیاسیەکەی پەیرەو ئەکاو لایەنەکانی ئابوریو کۆمەڵایەتی رەت ئەکاتەوە، بێگومان دیموکراسی ئاوا، لەناو کۆمەڵدا قەت نابێتە سیستەمێکی دیموکراسی راستەقینە. دیموکراسی کاتێك لێی دڵنیا ئەبین کە بە قەناعەتەوە شۆڕبکرێتەوە بۆناو کۆمەڵو ژیانی کۆمەڵایەتیو بشکرێتە رێسای دروست کردنی رای گشتی،

کاتێکیش دیموکراسی وای لێدێ، کە هیچ ئاینو مەزهەبو عەقیدەیەکی تایبەتی، یان شمولی، نەکرێتە پێوەری دارشتنی دەستوری وڵات.

دیموکراسی بۆ هەموو ئاینەکان، مەزهەبەکان، چینەکان، گەلەکان، حیزبو رەگەزو فەلسەفەکانە. هەموو جۆرە بیرو باوەرو ڕێبازێکی شمولی، یان تاک رەهەندی، یاخود تاکرەوی، لەگەڵ پرنسیپە راستەقینەکانی دیموکراسیەتدا، ناگونجێ.

هێندەی بشزانین، کاکە ئەبوبەکر، لە یەککرتووە توند رەوو دۆگمەکانە. جگە لەقورئانو سوننەتی پێغەمبەرو شەریعەتەکانی ئیسلام، هیچی تری پێ راست نییە. گەرچی بەسەر زارەکی دیموکراسی قبوڵە، هەرچیەکیشی پێ راست بێ تەنها لە چوار چێوەی ئاینی ئیسلامو سەرکەوتنی باوەری مەزهەبی خۆی پێی راستە. بۆیە دڵنیاین، نەك هەر عەلمانیەت، بەڵکو دیموکراسیەتی راستەقینەشی قبوڵ نییە. چونکە ئەگەر دیموکراسیەتی راستەقینەی قبوڵ بێ، دەبێ واز لە باوەری شمولی بهێنێ. لەحاڵەتی واشدا، پاساوی بوونی حیزبی ئیسلامی بۆ ڕێکخستنەکەی نامێنێ. چونکە لەڕۆژهەڵاتدا، ئیسلام وەکو عەقیدەو پەیرەو لێکردنی لەلایەن خەڵکەوە، بچوکترین گرفتی نییە. ئەوەی لایەنە ئیسلامیەکانی کردۆتە حیزبی سیاسی پێویستی ئازادی عەقیدەو ئاین نییە. بەڵکو مەسەلەکە سەرخستنی بیری "حاکمیەتی خواوەندە" لەسەر ئەرز. ئەو حاکمیەتە خواوەندیەی لە قورئانیشدا شێوەی حوکمو دەستوری حوکمرانیەتی لە هیچ دەقێکی ئاینیدا، باسنەکراوە.

حیزبەکانی ئیسلامی سیاسی، ناتوانن بڵێن چەوساندنەوەی ئاین لەسەر ئیسلام، یان لەسەر مەزهەبو تەریقەتەکانی ئاینی ئیسلام لە رۆژهەڵاتدا هەیە، باوەر ناکەین لەسەر عیبادەتی خواو رۆژوگرتنو نویژی جەماعەتو سوننەتی پێغەمبەر، یەك زیندانی لەسەرانسەری رۆژهەڵاتدا هەبێ. مەسەلەکە حیزبایەتیو ئایدلۆجیەتی جیاوازی ئیسلامیە سیاسیەکانە بۆ حکومەتی دێرینە خوازی شمولی. شمولیەتێك جگە لە ئیسلامگەری، ئازادی سیاسی حیزبێکی تر لەسەر حوکمو لە پێناوی حوکمرانیدا، قەدەغە ئەکا.

**( دەسەڵاتی ئاینیو زەمەنی ئیسلامی )**

(گەرسەیری تەنانەت مێژووی موسڵمانانیش بکەین ئیشکالیەتی ململانێی نێوان دەسەڵاتی ئاینیو زەمەنی هەست پێ ناکەینو ئەم شتە بەگیانو ناوەڕۆکی ئیسلامو واقیعی مێژوویی قەڵەمڕەوە کەشی نامۆیە. دیسان ئەوە

ڕەتناكەمــەوە كــە لێــرەو لــەوێ لەمێــژوودا فەرمانڕەوایــەك‌و یــستبێتی جــۆرێ لەپیرۆزی بـەخۆی بدات بـەڵام ئـەوە نەبەچاوی ڕەزامەندی‌یـەوە سـەیری كراوە نەبوشەتە دیاردەو داموو دەزگـای لەسـەر بنیـات بنـرێ. دەسەڵات لەئیـسلامدا دەسەڵاتێكی مەدەنی یە نەك دینی‌و ثیوكراتی بەو مانایەی لە فەرهەنگی خۆرئاوا داوە دەردەكەوێت.

نوســەر، ئەیــەوێ قەناعــەت بــە خوێنــەر بكــا گوایــە، هــیچ گیروگازێــك (ئیـشكالیەتێك) لـەنێوان دەسـەڵاتی ئـاینی بـۆ زەمـان‌و زەمینـە جیاوازەكـان، لـەئاینی ئیـسلامدا، نییـە. بـەڵام بـۆ ئـەوەی خـۆی لـەو ڕەخنانـە دەربـاز بكـا لەمێژووی ئیسلامدا ململانێی دەسەڵات لەزەمان‌و زەمینە جیاوازەكانـدا هـەبووە، ئەڵێ: (لێرەو لەوێ لەمێژوودا فەرمانرەوایەك ویستبێتی جۆرێ لەپیرۆزی بـەخۆی بدات) واتە: پێش‌وەخت زانیویـەتی ململانـێ هـەبووە، گرفتـی نێـوان دەسـەڵات‌و دیاردە زەمەنیەكان هەبووە، پێشێلكاریش هەبووە. مەسەلەكەش لێرەو لـەوێ، یان فەرمانرەوایەك‌و دوان‌و دەو بیستیش نییە. بەسـەدانە. سـەدان فـەرمانرەوای گەورەو بچوك لە زەمانی خولەفای راشدینەوە بـۆ دەسـەڵاتی ئەفغانیـەكان، نـەك (جۆرێ لە پیرۆزی) بەڵكو هەموو جۆرە پیرۆزیەك دراوەتە فەرمانرەواو دەسەڵاتە ناوچەییەكانیش.

كاكـە ئـەبو بـەكر، ئەگـەر بیویـستایە شـتێكی بـچوكی مێـژووی ئیـسلام بشارێتەوە، رەنگبو بۆی بچێتە سەر. بەڵام بیـەوێ گـەورەترین كێـشەی مێـژووی دەسەڵاتی ئیسلام، كە نەگونجاوە لەگەڵ گرفتەكانی زەمەنیدا، بـشارێتەوە، بـۆی ناچێتە سەر، ئارایـشت كردنـی مێـژوو، ئەگـەر مێژووەكـە داخـراویش بـێ لەسـەر خۆی،تیرۆر كردنی ئاشكرای لۆژیك‌ومەعریفەیە، بەهەموو پەلوپۆیەكی مەعریفە.

نوسەر، باش ئەزانێ، لەدوای مردنی پێغەمبەرەوە، خولەفای راشـدین لەسـەر خواو پێغەمبـەرو سـونەتی پێغەمبـەر،ناكۆك نـەبون. تەنانـەت لەسـەر مەلائیكـەو نوێژو حەج‌و پێغەمبەرەكانی تریش ناكۆك نـەبون. ئـەوەی لەسـەری نـاكۆك بـون دەسەڵاتە زەمینەكەیە.

یەكەمین ناكۆكی قوڵ، زیانبەخش‌و كاریگەری ناو هاوەڵانی پێغەمبەر، لەسـەر خەلافــەت بــووە. خەلافــەت بــۆ مەســەلە ئانیــەكان‌و دەســەڵاتە ئیــسلامییە زەمەنیەكەی سەرەتای حوكمرانی ئیـسلام. هـەر كـە (ئەبوبـەكری سـدیق) كرایـە خەلیفەی موسوڵمانان، ناكۆكی نێوان خۆی‌و پـەیرەوانی، لەگـەڵ بەشـێكی بـەنی

هاشم تەقیەوە، کە ئەمان ئەیانویست (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) ببێتە خەلیفە. دوای ئەمە، شەڕو شۆڕو هەڵگەڕانەوەش لەسەر دەسەڵاتی خەلیفەی نوێ دەستی پێکرد. چونکە هەندێ هۆزی موسوڵمان کە لە مەدینەدا ئەژیان، بەڵام دوای مردنی پێغەمبەر بە دەسەڵاتی زەمەنی (ئەبو بەکر) رازی نەبوون. دوای ئەوە، لەزەمانی (عومەری کوری خەتاب)و (عوسمانی کوڕی عەفان)دا. بە شێوەیەکی دژوارو خوێناوی ناکۆکیەکانی دەسەلاتخوازی دژی ئیمام عەلی تەقیەوە، کە ئیمامێکی ئێجگار لێهاتوش بوو. وردەوردە ئیتر لە رووی تیۆریشەوە، لەسەر مەسەلەکانی خەلافەت و ئیمامەت، ناکۆکی دروست بوو. هەر لە سەر ئەم بنەما تیۆریانەی ئیسلامیش لەسەر خەلافەت (الخوارج) وەکو نۆبەرەی رەوتێکی رێکخراوی جیاوازی ناو دونیای ئیسلام، دروست بوو.

لەکۆبونەوەی (سەقیف)شدا، لەسەر جێنشینی پێغەمبەرو خەلافەتی ئیسلام و بایەخی هۆزەکان، ناکۆکی قوڵ هەبوو، بە تایبەتی لە نێوان (الأنصار)و (المهاجرین)دا. ئەبوبەکر وەکو قوریشیەك (نەك وەکو خەلیفەیەکی موسوڵمان) سوور بوو لەسەر ئەوەی تایفەی قورەیش ببنە برپرەی پشتی خەلافەت. لەکۆبونەوەکەدا (ئەبو بەکر) کرایە خەلیفە. بەڵام (سعد بن عبادە)ی ئەنساری، لەدڵەوە نەك رازی نەبوو، بەڵکو نوێژی لەگەڵ نەکردن و بۆ حەجیش لەگەڵیاندا نەئەچوو.

سەرەنجامی خەلافەتی ئەبوبەکر، لەسەر ئەو ناکۆکیەی لە نێوان باوەڕی ئاینی و دەسەڵاتی زەمەنیدا پەیدا بوو، بە مردنی یەکەمین خەلیفەی خولەفای راشدین کۆتایی هات. قسەش هەیە گوایە ئەبو بەکر دەرمان خوارد کرابێ.

دوای ئەبو بەکر، گەرچی لە زەمانی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتابدا، ناکۆکیەکان لەسەر خەلیفە عومەر (نەك لەسەر دەسەڵاتی زەمەنی وەکو پرنسیپ)خاو بویەوە، بەڵام لە ژێرەوە لەناو هۆزو تیرەو باڵەکاندا، رق و قین جۆشی ئەخوارد. هەتا سەرەنجام خەلیفەی دووەمی موسوڵمانیش، بە زەبری خەنجەر شەهید کرا.

سێهەمین خەلیفەش (عوسمان) ئەو ناکۆکیانەی لە خەلافەتی عومەردا هەتا رادەیەکی زۆر خەفەکرابوون، دیسان قوڵ بونەوە. بەڵام لە نێوان موریدەکانی (عەلی کوری ئەبو تالیب)و عوسماندا، ئەمە جگە لەوەی لەهەر (١١) ویلایەتەکەی ئەوسای ئیسلام، وردەوردە بشێوی و ئاژاوە لەسەر دەسەڵات نشونمایان ئەکرد.

بەتایبەتی کاردانەوەو نارەزایی بەرامبەر دەسەڵاتی فراوانی قوریشیەکان هەتا ئەهات بەرەو تەقینەوە نزیك ئەکەوتەوە. هەتا کار گەیشتە سەر ئەوەی داوا لەخودی خەلیفە کرا، واز لە خەلافەت بهێنێ. هۆیەکی تری قوڵبونی ناکۆکیەکان ئەو تەخشان و پەخشان پێکردنەی (بیت المال)بوولەلایەن خەلیفە عوسمانەوە. لەمیسر، عێراق، کوفە، لەناو هۆزو تیرەکاندا هەڵگەڕانەوەو تەنانەت تەزویرکردنی بریارو نامەی خەلیفەو ئەمیرەکانیش دەستی پێکرد. هەتا کار گەیشتە ئەوەی یاخیەکانی میسر هەڵیان کوتایەسەر (مەدینە)و ماڵی خەلیفەشیان گەمارۆدا. هەمووشی لەسەر دەسەڵاتی زەمەنی لەولایەتەکانی ئیسلامدا. گەمارۆدانی ماڵەکە توندتر کراو کاریان گەیاندە رادەی قەدەغەکردنی هاتوچۆکردنی خەلیفەو لەبەرچاوی خەڵکیش جنێوی زۆر ناشیرینیان پێئەدا. بەمەش نەوەستا، پەلاماری ماڵەکەیان داو لەکاتی، رۆژوداو لەگەرمەی قورئان خوێندندا، بەر خەنجەرو شمشێریان دا. خوێنی رژایە سەر لاپەڕەکانی قورئان. تەنانەت مێژوونوسان دەیگێڕنەوە، کە لەو روداوەدا هەزاران ئافرەت ئەتك کراون.

زەمانی خەلافەتی (عەلی) بە زەمانی (الفتنە الکبری) لەسەر دەسەڵاتی زەمەنی ناوبانگی هەیە. شەڕو شۆڕەکان، کوشتارو خوێن رشتنەکان، ئاشکران. هەتا گەیشتە رادەی کوشتنی خەلیفە عەلی. بەمەش سێهەمین خەلیفەی موسوڵمانان لەسەر دەسەڵاتی زەمەنی، دەکوژرێ. واتە: لەچوار خەلیفەی خولەفای راشدین، کە پێغەمبەر کردوونی بە جێنشینی خۆی بۆ کاروباری (ئاینی‌و دنیایی) لەسەر دەسەڵاتی ئاینی‌و زەمەنی سیاسیان کوژراوون، نەك (ئیشکالیەتی مل ملانێ) نەبووە لەناویاندا (وەکو کاك ئەبو بەکر ئەیڵێ) بەڵکو ئەوپەڕی رق ، کوشتن، تیرۆر، پیلان، شەری ناوخۆ هەڵگەرانەوە تاوان‌و دزی لەناو خۆیان‌و هۆزو تیرەو کەسوکاریشیاندا هەبووە. ئەمەش حاڵی جێنشینەکانی پێغەمبەرو دەست نیشانکردوەکانی خۆی بوبێ، دوای ئەمان ئیتر خراپترو خوێناویتر بووە. بێگومان ئەو خەلیفانە، لەمزگەوت‌و خوتبەو تەنانەت لەکاتی کوشتن‌و گیانەڵلایش دا، قسەی باشیان کردووە. بۆ ئاین‌و باوەربون بەخواو پێغەمبەر، یەك لە یەك دڵسۆزتر بوون. بەڵام لەسەر جێنشینی‌و دەسەڵاتی زەمەنی، لەناو خۆیان‌و دەوروبەریاندا، نەك (ململانێ) بەڵکو فیتنەو کوشت‌و کوشتاریش هەبووە. کەچی کاکە ئەبوبەکر، وا بە ئاسانی ئەیەوێ مێژووی ئیسلام، بکاتە مێژووی یۆتوبیای ئایین‌و بێبەری بکا لە ناکۆکی‌و ململانێ لەسەر دەسەڵات.

به چ عەقلێك، دەسەڵاتی سەرەتای ئیسلام، لەناو دەیان هۆزو تیرە، لەناو چەندین هەرێمی جیاواز، لەناو سیستەمی دەرەبەگایەتیو سەدان دەرەبەگدا، بکرێتە دەسەڵاتێکی بێ مل ملانێ لە نێوان ئاینو دەسەڵاتی زەمەنیدا؟ ئەمە تێگەیشتنێکە، یان باوەڕێکە، هیچ بایەخێك بۆ کۆمەڵناسی، بۆ بەرژەوەندی جیاواز، بۆ سروشتو چاوچنۆکی مرۆڤ، بۆ تەنگوچەڵەمەکانی سەرەتای دەسەڵاتی ئیسلام، دانانێ. ئەو هەموو کێشەو گیروگرفتانە، کە بەشێکی زۆر هی سەردەمی جاهلین، چۆن وا بە ئاسانی بەدەرکەوتنی ئیسلام پاکتاوکراوون؟

لە کاك ئەبوبەکر وایە، لە کوردستاندا کەس شارەزای مێژوو نییە، کەس ئاگای لەراستیەکان نییە. ئەم برایە وا دێتە بەرچاو، کە لەدوای دەسەڵاتی خولەفای راشدینەوە، نێردرابێ بۆ کوردستانو ئەوکاتەش هەڵبەتە کەس لەکوردستاندا ئاگای لەشەڕو شۆڕەکانی ناو خەلیفەکان نەبووە،خوتبەی بۆ خەڵك دابێ کە ئیسلام ئەمنو عەدالەتی مرۆڤایەتی ئەبەخشێتەوە. پێم وایە راستیەکانی بوتایە زۆر باشتر بوو لەوەی بیانشارێتەوە. پاساوی سیاسیو کۆمەلایەتیو مەزهەبی زۆرە، شەڕوشۆڕەکانی پێ لێکبدرێتەوە. سەرەنجامی مەنتیقیشی لێوە دەست بهێندرێ. بەڵام ئارایشت کردنی مێژوو، بەو کەرەسە فکریانەی یەککگرتوو، کارێکە ئەگەر خولەفای راشدنیش زیندوو ببنەوە، بۆیان ناچێتە سەر، چ جای بۆکاك ئەبوبەکر، لەم سەردەمەدا کە هەزاران سەرچاوە لەسەر ئەو مێژووە هەیە. جا کەسێك، یان رێکخستنێکی ئیسلامی، لەگەڵ مێژوویەکی نوسراودا ئاوابێ، ئاخۆ لەگەڵ ئێستاو لەناو خەڵکی نەخوێنەوارو لەکۆروکۆبونەوە تایبەتیەکانیدا، چۆن راستگۆ ئەبن؟

## ( لێبوردن یان سەرکوتکردن )

( لێبوردەییو کراوەیی ئیسلام بەرامبەر ئاینەکانی تر لەئاستێکدایە دوژمنەکانیشی ناتوانن دانی پێدا نەنێن. ئەو تەعەدودیەتە ئاینییەی کۆمەڵگای ئیسلامی بەخۆیەوە بینیوە تەنانەت لەو سەردەمانەشدا کە سیستمی سیاسی بەگوێرەی پێوەری بەهاو بنەما ئیسلامیەکان لایداوە ئەو تەعەدودیەتە پارێزراوە. بوونی حاڵەتێ لێرەو لەوێ ئەم هێڵە گشتییە ناخاتە ژێر پرسیارەوە ئیسلام بەرێسای زێرینی (لهم مالناوعلیهم ماعلینا) لەگەڵ خاوەن ئاینەکانی تردا جوڵاوەتەوە).

کاکە ئەبو بەکر، ئەیەوێ ئیسلامیەکان بەدڵ فراوانو لێبردوو، هەروا دەسەڵاتی ئیسلام بە کراوەو ئازادی دابین کەر پیشانبدا. کەوانییە!

ئیسلام، لەبەرئەوەی لەگەڵ پەیدابوونی، خۆی بە دەسەڵاتی رۆحیو دونیایی دەرخستووە، هەرزوو حسابی بۆ بەرژەوەندییە ئابوریەکانو کێشە سیاسیەکانو پایە کۆمەڵایەتیەکان کردووە. سیاسەتی بنەرەتی ئیسلام، بۆ چەسپاندنی دەسەڵات، (جهاد)و (فتوحات)بووە. واتە: لەناو هۆزی قورەیشەوە، بۆ هۆزو تیرەکانی تری عەرەب، لە زەمانی پێغەمبەرەوە هەتا ئێستاش، بنچینەی چەسپاندنی دەسەڵاتی ئیسلام دروستکردنی هێزو بەکارهێنانی زەبرو زەنگ بووە. تەنانەت قورئانی پیرۆزیش ئەمەی نەشاردۆتەوە.

بەکارهێنانی دەسەڵاتو زەبرو زەنگیش، بەرامبەر ئەو هەموو هۆزو خەڵكو میللەتانە، لەو ئانو کاتانەدا، تەنها ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەم ئاینە، تەنانەت لەناو قوریشدا، کە هۆزو خزمو کەسوکاری خودی پێغەمبەریش بووە، بەوەعزو قسەو ئامۆژگاری، خەڵك بەڵکو نزیکترین خەڵکی پێغەمبەریش، باوەڕیان پێنەهێناوە. واتە باوەری تریان هەبووە، بۆیە باوەریان بە ئاینی ئیسلام نەهێناوە. کاتێك، لەناو مەکەو مەدینەدا، لەناو دورگەی عەرەبیو دەوروبەریدا، لە دیاری تری عەرەبدا، باوەری تر هەبوبێو بە ئاسانی باوەریان بە ئاینی ئیسلام نەهێنابێ، ئیسلامیش مرازی پێنەهێنابن، بە لەشکرو داگیرکەرانو کوشتنو سەرپێشۆرکردن، قەناعەتی پێکردون، کەواتە: ئەو لێبوردنو کراوەییەی ئیسلامیەکان بەوشێوەیە نییە کە کاك ئەبو بەکر باسی ئەکا. سیاسەتی ئیسلامی هەر لە سەرەتاوە، ئاوا بووە: یان تەسلیم بە یان بە زۆر مل کەچت ئەکەین. لەباشترین حاڵەتیشدا، کاتێك بەشەرو کوشتار میللەتان، یان مەزهەبەکانو ئاینەکانی تر تەسلیم نەبوبن، بەزەکات وەرگرتنو باجو سەرانە سەندن، بۆ ماوەیەك وازیان لێهێناوون.

ئەگەر بشمانەوێ بگەڕێنەوە بۆ ئایەتەکانی قورئانو بەوردی لەدەقەوە، روانگەی ئیسلام لەسەر باوەری تر هەڵبسەنگێنن، دەبینن نەك لەسەر قەناعەت، بەڵکو لەسەر دووپەیامە ئاسمانیەکەی پێش قورئانیش (تەوراتو ئینجیل) ئەو ئازادیو لێبوردنو کراوەییە، نییە، کە کاکە ئەبوبەکر باسی ئەکا. بۆ نموونە:

(وقولوا آمنا بالذی أنزل إلینا وأنزل إلیکم وإلهنا وإلهاکم واحد ونحن له مسلمون) — العنکبوت.

ئەم ئایەتە بە جوانی ئەیسەلمێنێ کە جگە لە قورئان، پەیامی ئاسمانی تر دابەزیوەو خوای هەموو لایەکیش هەریەکەو دانی پێ ئەنرێ. بەڵام لە ئایەتێکی تردا، هەست بەوە ئەکرێ فەزلی ئیسلامو قورئان بدرێ بەسەر ئاینەکانی ترو بەسەر تەوراتو ئینجیلدا، لە سورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ:

(إن الدین عند اللة الاسلام وما أختلف الذین أوتوا الکتاب الا بعدما جا وهم العلم بغیاً منهم یکفر بأیات الله فإن الله سریع الحساب).

ئەم ئایەتە بە روونی قورئانو ئیسلام بەسەر ئاینەکانی تردا فەرزئەکا. بەئەحکامی ئایەتەکەشدا، ئەبێ مەسیحیو جولەکە دوای پەیدا بوونی ئیسلام ملکەچ بکەن بۆ ئاینی ئیسلام. کەوابێ: ئەگەر بەوردی بڕوانێتە رابوردوو، ئەسەلمێ کە: بە ئایەت، بە شەرعو بەلەشکر کێشی، لە زەمانی پێغەمبەرو خولەفاکاندا، ئەوپەڕی هەوڵ دراوە تەنها ئاینی ئیسلامو دەسەڵاتی ئیسلام لەسەر ئەرزدا بسەپێندرێ، لەهەر لایەك ئەم سیاسەتە سەربکەوێ، چەسپاندویانەو کردویانە بە حەڵاڵی خۆیان. لەهەر شوێنێکیشدا بەرەنگاری هەربوبێ، یان تەنگوچەڵەمەکان رێگەیان نەدابێ، سازش کراوەو چاو نەك لەئاینەکان، بەڵکو لەمەزهەبو باوەرەکانی تریش پۆشراوە. ئەگینا، ئەگەر ئیسلام باوەری بە ئاینە ئاسمانیەکانی تر هەبوو، یان بروای بە ئازادی مەزهەبو بڕواکانی تر بوبێ، بۆچی لە شکریان ئەکاتە سەرو بە زەبری کوشتنو برینو ناموس زەوت کردنیش، سەریان پێشۆڕئەکا. بروانن لە ساڵی (٥٣)ی کۆچیدا،کە هێشتا حوکم بەدەست خولەفای راشدین بووە، سوپایەك بە سەرکردایەتی سوپا سالاری ئیسلام (عبدالله بن زیاد) ئەنێردرێ بۆ داگیرکردنی بوخاری (تورکمانستان)ی لە شاری (بیکندا)، لەشکرەکە گەمارۆ ئەدرێ. لە کشانەوەدا، بەم دەستکەوتانە ئەکشێنەوە: لەکاتی گەرانەوەیاندا، موسوڵمانەکان کەنزو چەكو جلو بەرگو کەرەسەی ئاڵتونو زیویان هێنایەوە.

هەتا ئێرەش، زۆر سەرسورهێنەر نییە، دوای ئەوە بزانن چییان کردووە: (ئەم پەلامار دەرانە لە کاتی کشانەوەیاندا هەموو ئەو ناوچانەی پیاتێپەڕبون، وێران کرد، تەنانەت دارو درەختەکانیشیان هەڵئەکێشا). واتە لە شکرەکەی عبدالله) لەکاتی تێك شکانیاندا. ئەم رەفتارانە وای کردووە شاژنە بوخاری رازی ببێ سەرانەو باج بدا. ساڵانە یەك ملیۆن (درهم) یان لێسەندووە، سەرەراش وازیان لێ نەهێناوەو دوای سێ ساڵ جارێکی تر بەسوپاسالاری (سعید بن عثمان)

هەڵیان کوتاوەتە سەریان. دیسان بە سازش‌و سەرانە سەندن‌و بارمتـە گرتنـی پیاوە ماقوڵەکان شەڕ رائەگیرێ. جارێکی تریش پەلاماردان دەست پێ‌ئەکاتـەوە، ئەمجارە تاوانـەکان بـەم شێوەیە لەسـەر دەسـتی (ورقـە بـن نـصر) لـە زەمـانی (حەجاج)و بە فەرماندەیی (قتبە بـن مـسلم)سالی (٨٦)کۆچـی سەرگوزەشـتەکە ئاوای لێدێ:

(هەواڵ بۆ قوتەیبـە هـات کـە خـەڵکی (بیکنـد) خروشـاون‌و وەرەقـەی کـوری نەسـریان کـە فـەرمانرەوایان بـووە، کوشـتووە. لـە راسـتیدا عـەرەب خۆیـان کارەساتەکەیان بەسەر خۆیاندا هێنا. ئەوترێ کە ورەقە چەندین ئافرەتی جوانی بردبوە ماڵەوە، باوکیان لەسەر ئەم ئابڕوبردنـەی خێزانەکـەی، خـۆی نـەگرتووەو تاوانبارەکەی کوشتووە. مەسەلەکە هەرچیەك بوبێ، ئـەو کـارە قوتەیبـەی تـورە کرد، لەوانەشە کاتێك تـورە ئـەبێ سنوری بـۆ نیـە، بەپەلـە گەرایـەوە شـارەکەو بڕیاریدا تالانی بکەن‌و بیسوتێنن‌و بالغەکانیان بکوژن )[*]

ئایـە دەسـەلاتێکی سیاسـی — ئیـسلامی، دڵـی فـراوان بـێ، لێبـوردو بـێ، کراوەبێ، ئاوا رەفتار ئەکا، نموونەی دڕندەترین رەفتاری دەسەلاتە (ئەو کارانـە) یان دڵفراوانی؟

نازانێت چۆن ئەشێ باوەر بەوەبکرێ کۆچەرییەکان (بـەدوو) ئـەو سـەردەمە، هەروا بە ئاسانی بوبنە دڵفراوان‌و دادپەروەرو لێبـوردوو بەرامبـەر ئاینـەکانی تـرو باوەرەکانی تر. ئەمـە پێـچەوانەی مـەنتیقی پەرەسـەندنی کۆمەڵایەتییە، گـۆران کارێکی ئاوا ئاسان بوایە، دەمێك بوو بەشەریەت هـیچ جـۆرە تەنگوچـەڵەمەیەکی نەئەما.

ئەگەر دڵفراوانی‌و لێبوردن‌و کراوەیی، هـەروا زوو لـە سـەرەتای سـەرهەڵدانی ئاینی ئیسلامەوە ببوایـە بـە نـەریت‌و بـاوەرو کەسایەتی موسـوڵمانەکان، ئـەبوو لەوساوە هەتا ئێستا بچوکترین گرفتی سیاسـی‌و دونیـایی لـەناو موسـوڵمانەکاندا نەبوایـە. چـونکە ئاینێـك کـە سـەری هەڵـدابێ، یـان لەسـەرەتای حوکمرانیـدا، توانیبێتی، قوڵ کاریکاتە سەر کۆمەڵ‌و ئـەو دڵفراونیـەو ئـەو لێبـوردن‌و کراوەییـە لـەناو دەسـەلاتدارانیا، بەرامبـەر بـیرورای ئـاین‌و مەزهەبـەکان بـچێنێ، هـەقبوو لەوساوە هەتا ئێستا نەتەوەی ئیسلام(!) ببوایە بە نەتەوەیەکی بێ‌گرفـت لـەناو

---

[*] تأريخ بخاری منذ أقدم العصورحتى العصر الحاضر، تأليف: أرميوس خامبری. ترجمة: الدكتور أحمد محمود الساداتي، بروانە لاپەرەکانی (٥٨–٦٢)

خۆیدا. کەچی نەک لەناو سەرجەم نەتەوە موسوڵمانەکاندا ئەمە نەهاتۆتە دی، بگرە لەناو نەتەوەی زمانی قورئانیشدا، ئەو نموونەیە نەهاتۆتە دی کاکە ئەبوبەکر باسی ئەکا. ئێستا لەناو عەرەبدا نەک لێبوردنو دڵفراوانی کەمە، بەڵکو لەناو لایەنەکانی ئیسلامی سیاسیشدا، بەدی ناکرێ.

## ( حەڵاڵو حەرامو ئازادی )

( ئیسلام تەنها بیروباوەڕێک نیە لەوپەڕدانی شوێنێکەوتووانیدا بێت، بەڵکو سیستمێکی فراوانی ڕەوشتیو کۆمەڵایەتییەو خاوەنی سیستمو کەلەپورێکی مەزنی قانونیشە. ئاراستەو ڕێنوێنیەکانی بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆڤو کۆمەڵگا دەگرێتەوە. سیستمێکی حەرامو حەڵاڵی هەیە لەژیاندا کاردەکات, بیروباوەڕداری لێی دەخوازێت کە لەژیانی ڕۆژانەیدا پابەندی ئەحکامو ڕێسا ئیسلامییەکان بێت. هەربۆیە ئازادی بیروباوەڕ بۆ باوەڕدارێکی موسڵمان بێ ئازادی ژیان بردنە سەر بەگوێرەی ناوەڕۆکی ئەوبیرو باوەڕە زۆرمانای نیە. بەمجۆرە ئیسلام تێکەڵاو بەفەرهەنگی ڕۆژانەی خەڵك بووە. بەڵام دەسەڵاتێکی عەلمانی دەیەوێت تەرزێکی تر لەژیان بسەپێنێ ڕەواجی پێ بدات بۆ نموونە ئافرەتێکی موسڵمان لەسەرنانی سەرپۆش بەئەرکێکی ئیسلامی خۆی دەزانێ بەڵام لەهەندێ شوێن بۆ نموونە وەکو تورکیاو تونس دەسەڵاتەکە ناهێڵێ بەو جۆرە بچێتە ناوحەرەمی زانکۆو تەنانەت لە تونس ناهێڵن لەنەخۆشخانەش بێتەچارەسەرکردن).

لەم بۆچونەدا کاکە ئەبو بەکر پانتایی عەقیدەی ئیسلام فراوان ئەکا. لەویژدانەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ حوکمو یاساو شەرع.

جارێ لەقورئاندا، مەسەلەی حوکمو شێوەی حوکمو یاسای دیاریکراوی حوکم لە هیچ دەقێکدا، بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵاتو دەسەڵاتداریتی، بە ڕۆشنی نەهاتووە. هەموو مەسەلەکانی شەرعو یاسایی، زاناو خەلیفەو موجتەهدەکانی ئیسلام، وردەوردە دایان ڕشتوون. هەروا، بەرە بەرەش ئاینی ئیسلام بۆتە خاوەن سیستەمو کەلەپوری دەسەڵاتداریتی تایبەتی خۆی. واتە: ملیۆنەها ساڵ مرۆڤو مرۆڤایەتی بێ ئاینەکان ژیاوون، پاشان ئاینەکان کە (دواتریان ئاینی ئیسلامە) هاتونەتە ئارا. ئێستاش زۆربەی بەشەریەت موسوڵمان نین. ئەو ڕەوشو کەلەپورو یاسایەی ئیسلامیش لەناو خەڵکدا بڵاوی کردۆتەوە، ڕێنوێنی

ئاراستەیین. وەکو داهێنراوون، هەلومەرجێك، قۆناغێكو پێداویستیەك ئەو یاساو نەریتەی چەسپاندووە، بۆی هەیە هەلومەرجی تر بێتـە پێشەوە، بەشـێکی زۆری ئەو کەلەپورە بگۆڕێ. چونکە، کەلەپورەکـە، کەلـەپورێکی داهێنـراوی پێویـستی حوکمرانی بووە، بۆ ڕێکخستن‌و گۆڕینی ئەو کۆمەڵانـە، کەلەپورەکـەو یاسایەکان داڕێژراوون کە بە زەبری شمشێر بەشێکی زۆری کۆمەڵـەکان تەسلیم بـە ئیسلام بوون. بەشێکی زۆری خەڵکی عەقیدەیەکیش بـە زەبـری شمـشێر تەسـلیم بـوبن‌و بوبنە ئیسلام، هەڵبەتـە بەشـێوەی جۆراوجـۆر پێویـستیان بـە یاسـاو سیـستەم‌و دەسەڵات ئەبێ. هەر لـەناو ئـەو چـوار چێوەیەشـدا، لەبـەر ڕۆشـنایی ئاینەکانـدا، حـەڵاڵ‌و حـەرام تێکـەڵاوی بوارەکـانی سیاسـی کۆمەڵایـەتی‌و ئـابوری کـراوە، تەنانەت دوای ماوەیەکی زۆرو دوای جۆرەها ئایەت، ئینجا حەڵاڵ کردنـی هەنـدێ شت‌و حەرام کردنی هەندێکی تر، لەدەقەکاندا ڕەنگیان داوەتـەوە. ئـەویش دوای ئەوەی لە پیادەکردنی ئەحکامەکانی قورئاندا گیروگرفتی خواردن‌و خواردنەوە بۆ مومارەسـەی ئیـسلامی هاتۆتــە پـێش. ئـەو حـەڵاڵ‌و حەرامـە، سـەرەنجامی گیروگرفتە کۆمەڵایەتیەکان‌و پێویـستیەکانی باشـتر پـەیرەولێکردنی بنـچینەکانی ئایین (نوێژ، ڕۆژو، ڕەوشت، سۆزو دەسـت پـاکی ..تـاد) نـەك لـە ئەزەلـەوە ئـەو کەلەپورە لەناو ئادەمیزاددابوبێ، کە ئیسلام ئێستا نوێنەرایەتی ئـەکا. یـان ئـەو نەریت‌و کەلەپورە ئیسلامیەی هەیە، بەشێك نەبووە لە غەریزەو خووی مرۆڤ، یان بەشێك نەبووە لە پێکهاتەی میثویۆلۆژی ئادەمیزاد. زانستەکانی ئینتـەرپۆلۆجیاو سۆسـیۆلۆجیا، هــەزاران جـۆرە یاسـاو نـەریت‌و کەلـەپوری ئادەمیزادیـان پـێش ئاینەکان دیاری کردووەو دوای ئـەوەش، بەشـێکی ڕەوشـت‌و نـەریتی جیـاواز لـە ئاینەکان، بەهیچ یـەکێ لـە ئاینـە ئاسمانیـەکان لەناونـەبراوە. حـەڵاڵ‌و حـەرامی ئیـسلامیش نـەیتوانیووە بەشـەریەت بخاتـە ئـەو چوارچـێوەیە کـە بـەدەر لـەوە سەرپشکی‌و ئازادی بڕیاری تر نەمابن. نەخێر، لەناو زۆربەی بەشەریەتدا، هـەموو ئەو مەسەلانە ئیسلام بەحەرامی ئەزانێ، بنەبڕ نـەکراوەو ئـەوەی بـە حەڵاڵیـشی ئەزانێ، پەیڕەو نەکراوە.

سەیرەکە لەوەدایە کـاکی نوسـەر قسەی نـاکۆك‌و بۆچـونی دژ بەیـەك ئاوێتـە ئەکاو ئەیکاتە ڕاستیەکی ئایینی بەتاڵ کراو لەناکۆکی. لەکاتێکدا واش نییە.

کاك ئەبو بەکر ئەڵێ:

(هەر بۆیە ئازادی بیرو باوەڕدارێکی موسوڵمان بێ ئازادی ژیـان بردنـە سـەر) بهێڵی ژێردوا دێر هی ئێمەیە.

لەسەر ئەم رستە ناکۆکانە، پێویستە سەرنج لەم خاڵانە بدرێ:

١- مرۆڤ هەر کە لەدایك ئەبێ بەبێ راوێژ پێکردنی ئەکرێتە موسوڵمان. بەوەش ئازادی بیروباوەر هەڵبژاردن بۆ مرۆڤی موسڵمان ئەبێتە دژوارترین مەسەلە. چونکە کاتێك مرۆڤ گەورە ئەبێ پابەندی ئاین‌و بیروباوەرێکە رێگەنادا هیچ ئاین‌و بیروباوەرێکی تر پێچەوانەی ئیسلام پەسەند بکەیت.

٢- کە بویتە موسڵمان، ئیتر ئازادی ژیان بردنە سەر سنوردار ئەکرێ. هەرگیز ناتوانی بە ئارەزوو ژیان ببەیتەسەر. چونکە موسوڵمانیت. چونکە لە کۆمەڵێکی ئیسلامیدای. ئیتر ئازادی ژیان بردنە سەر بەوپێیە رێگەی هەیە، کە ئیسلام بە (حەڵاڵ)ی بزانێ‌و (حەرام) نەبێ.

٣- کە نوسەر ئەڵێ: ژیان بردنە سەر بە گوێرەی ناوەرۆکی بیروباوەری ئیمانداریکی موسڵمان، روونە کە (گوێرەی) ئیسلام، گوێ راکێشانی لەسەر هەموو شتێك هەیە.

کاکە بەکر بە دەستێك ئازادیمان ئەداتێ، لە پشتیشەوە دوو دەستی داناوە ئازادیەکەمان لێ بسەننەوە.

کە ئەشلێ: دەسەڵاتی عەلمانی دەیەوێت تەرزێکی تر لە ژیان بسەپێنێ رەواج پێبدات بۆ نموونە ئافرەتێکی موسڵمان لەسەرنانی سەرپۆش بە ئەرکێکی ئیسلامی خۆی دەزانێ بەڵام لە هەندێ شوێن بۆ نموونە وەکو تورکیاو تونس دەسەڵاتەکە ناهێڵێ بەو جۆرە بچێتە ناو حەرەمی زانکۆ...تاد

سەبارەت بەم قسانە، جارێ پێمان وا نییە ئافرەت بە ئارەزوو حیجاب لەسەر بکەن (لایەنی کەم بەشی هەرە زۆریان). حجاب لەسەرکردن لەکۆنەوە هەتا ئێستا کراوەتە نەریتێکی ئیسلامی‌و حاڵەتێکی دەرونیش بۆ ئافرەت دروستکراوە، کە ناچاری پۆشینی حیجابی ئەکەن. ناراستەوخۆیان راستەوخۆ، دیکتاتۆریەتی دەروونی بەکار یەت بەرامبەر بە ئافرەت، ئەگەر حیجاب پۆشین بەشێك بوایە لە کەسایەتی مەعنەوی ئافرەت‌و بکرایەتە نەریتێك لە نەریتەکانی قورئان، ئەبوایە لە چەندین ئایەتدا باسبکرایە. هەروەکو چۆن زیاتر لە (١٦٠)جار لەسەرەتای ئیسلامیشدا، باسی (الشرك - بت پەرستەکان ئەکا) ئافرەتیش نیوەی کۆمەڵ بون ئەبوایە بۆ حیجاب زۆر بایەخیان پێبدرایە لەئایەتەکانی قورئاندا.

حیجاب پـێ پۆشـینی ئـافرەت، یەکێکـە لەوەسـیلەکانی شـێوە حـوکمی کۆمەڵایـەتی ئیسلام. هۆیەکەشـی زۆرتـر ئەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو گێروگرفتانـەی (سێکس) لە زەمانی جاهیلیەکان‌و سەرەتای ئیسلام لەناو خەڵکدا ئەیخوڵقاند. بۆ ئەوەی ئافرەت کەمتر سەرنجی پیاو راکێشێ‌و جۆرێك لە دامرکاندنی ئالۆشی ژن‌و پیاو بهێنرێتـە دی، حیجابیـان بـە ئـافرەت پۆشـی هـەتا هـیچ شـوێنێکی هەسـت بزوێنی دیار نـەبێ. سـەرەڕاش، ئـەو کاتـەش نـەیانتوانی بـە تـەواوەتی نێرومـێ کۆنترۆڵ بکەن. بەتایبەتی پیاو، کە پیاو دەسەڵاتداری کۆمەڵایەتی بـوو، ئیـسلام بۆ شەڕو لەشکر کێشی زۆر پێویستی بەپیاو بوو، ڕێگەیان دا بەشێوەی شـەرعی پیاو پێکەوە چوار ژنـی هـەبێ. چـل کـەنیزەکیش. تەنانـەت (هـەتیو) راگـرتنیش نەدەغەنـەکرا، بەتایبـەتی هـەتیوی بـەدیل گـیراو. بـەڵکو لـەو دنیـاش بـەڵێنی (نێرینـە !) دراوەتـە بەهەشـتیەکان (الحـواری‌والغلمـان) حـەواری فریـشتەن‌و غیلمانیش (نێرینەن! !)

پێغەمبەر بەسەریەکەوە، هەشـت ژنـی هێنـاوە، دوای وەفـاتی خەدیجـە ئـەم ژنانەشی هێناوە:

١- سعودة بنت زمعه منی بنی عامر
٢- عائشة بنت ابي بەکر [*]
٣- جوبرية بنت الحارث سيد بنی المصطلق
٤- حفية بنت حيی سيد بنی النضير
٥- أم سلمة
٦- حفصة بن عمر
٧- زينب بنت جحش

ئـەو ژنانەشـی دوای تەمـەنی (٥٠)سـاڵە هێنـاوە. ئاشکراشـە کـە خولـەفاو سەحابەکانی پێغەمبەر هەریەکە چەند ژنێکیان هێنـاوەو دەیـان کەنیزەکیشیان هـەبووە. ژنـە ئـەنفال کراوەکـانی فتوحـاتی ئیـسلامیش (بەکوردستانیـشەوە) سەحابەکان سەرپشك بون لە هەڵبژاردنی جوان‌و باشەکانیان.

---

عائشەی بەشەش ساڵی مارەکردووە. کە گواستوشیەتیەوە هەر لە کۆڵان لەگەڵ منداڵان یاری کردووە. کە پێغەمبـەر گەراوەتـەوە ماڵـەوە، منداڵەکان خۆیـان شـاردۆتەوە. بروانـە: تـأريخ الأسلام (السياسیءالدينیءالثقافیءالأجتماعی)، تأليف: الدکتۆر حسن أبراهيم حسن. الجزء الأول/١٩٦٤.

چۆن ئەکرێ، ئاینێك ئاوا ڕێگەی ژن هێنانی دابێ، ئاوا بواری کەنیزەیەك ڕاگرتنی بۆ پیاوان ڕەخساندبێ، بەوشێوەیە سەیری ژن بکا، هەتیوراگرتنیشی بەئاسایی زانیبێ، کەچی مەسەلەی حیجاب پۆشینی ئافرەتان لای ئاینەکە بکەینە مەسەلەیەکی پیرۆز. حیجاب پۆشین مەسەلەیەکی پیرۆز نییە. بەڵکو شێوەیەکە لە شێوەکانی چارەسەرکردنی کێشەی پەیوەندیەکانی ژن و پیاو. کچ و کوڕ. بۆ دوورکەوتنەوە لە دەیان گیروگرفت کە ئیسلام لە زەمانی جاهیلیەتەوە بۆی مابووەوە.

ئەو نەریت و ڕەفتارانەی کە لەجاهیلیەت و سەردەمی کۆیلەیەتی و پێشتریش لەنێوان ژن و پیاودا، کوڕوکچ دا هەبوون، سەرەڕای ئەوەی ئیسلام هەندێ کۆت و یاسای خستنە سەر، بەڵام بەجارێ نەیتوانی بنەبری بکا. تەنانەت لەدوای بەهێزبونی دەسەڵاتی خەلیفەکان و لەسایەی حوکمرانی ئەمەوی و عەباسیەکاندا، ڕابواردن و کەنیزەك و نێرینە ڕاگرتنیش بڵاوو باو بووە. هیچ گوێیەك بەو یاساو کۆتانە نەدراوە کە قورئان و ئیسلام و پێغەمبەر داینـاوون بۆ ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سێکسی:

- ئەمین، لەسەردەمی دەسەڵاتداریکی خۆیدا: ڕەسمیەتی دا بە نێربازی و بەپێی یاسایەك ئەو دەریهێنا خاوەن کۆیلە بۆیان هەبوو مومارەسەی سێکس لەگەڵ کۆیلەی نێرینە بکەن.
- (یمیای کوری ئەکثەم) کە قازی شەرعی (بەسرە) و خاوەنی چەند داتراو بوو لەسەر شەریعەت و لقەکانی فیقهی ئیسلام، خاوەنی پێنج سەد-کۆیلەی نێرینە بووە و لەگەڵ هەموشیان مومارەسەی سێکسی کردووە.
- خەلیفە (متەوەکیل، (حەرەمسەرای) چوار هەزار کەنیزەکی هەبووە. جارێکیش یەکێك لە سەرکردەکانی (دووسەد غولام و کەنیزەیەکی پێشکەش کردووە *.

لە هەموو ئەوانەش خراپترو نامرۆڤانەتر، بەشی زۆری کۆیلەکانیان خەساندۆتەوە. هەتا هەم ژیانیان لەبەرچاو بخەن و تەنها ڕازی بن بە کۆیلەیەتی ژیان. هەم لەگەڵ یەکتر ڕانەبوێرن و خاوەن کۆیلە بەتەنها لەگەڵیان ڕابوێرێ.

---

* بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٥)

- کەچی کاکەنوسەر، ئەو هەموو مەسەلانە فەرامۆش ئەکاو باسی حیجابو ڕێگەپێنەدانی لەهەندێ شوێن دا ئەکا. ئەگەر لەهەموو ئەو ڕاستیانە گەڕێین کە لەمێژووی دەسەڵاتدارانی ئیسلامیدا هەبووە، هەقە لەکاکە ئەبوبەکر بپرسین: ئەی بۆچی حکومەتە ئیسلامیەکان بەزۆر حیجاب بەئافرەت ئەپۆشنو ئەسەپێننەسەریان، کەچی باسی ئەو حکومەتانە ناکەیت. تەنانەت باسی حکومەتی تازەی ئەفغانستانی تاڵەبانیش ناکەی کەنەك حیجابو چادوری سەپاندۆتە سەر ئافرەت، بەڵکو چونە دائیرەو تێکەڵاو بوونی ناو کۆمەڵیشی لێ حەرام کردوون!
- ئازادی حیجاب پۆشین لای کاك بەکر بەرگری لێئەکرێ، بەڵام ئازادیەکانی تری ئافرەت حسابی بۆ ناکرێ. چونکە حیجاب پۆشین لەبەرژەوەندی ئەو عەقڵیەتەیە کە مرۆڤ ئازادیو سەربەستیو عەقڵی ئازادی نەمێنێ..

- (کام سیستەم ستەمە؟!)

(زۆر ئەستەمە لەناو وڵاتە ئیسلامیەکاندا، عەلمانیەتو دیموکراسیەت پێکەوە هەڵبکەن. چونکە عەلمانیەت ناچارکردنی خەڵکە بۆ ئەوەی پێچەوانەی بیروباوەڕیان بژین).

جارێ وشەی (ئەستەم) بەکارهێنان جۆرێکە لە داسەپاندنی دەسەڵاتی سیاسیو ئاینی. بەتایبەتی بەرامبەر ئەو مەسەلە فکریانەی جیاوازی فکریان لەسەرە. (ئەستەم) وشەیەکە بۆ قبوڵ نەکردنی بیروڕای دژ بەرامبەر چەوسێنەران لە سیاسەتدا بەکارئەهێنن. هەتا گوێ لەڕای بەرامبەر نەگرێت.

هەر مەسەلەیك پەیوەندی بە فکر، سیستەمی ژیان، دەسەڵاتو فەلسەفەوە هەبێ، قابیلی مشتومڕو گفتوگۆ، هەروا قبوڵکردنو نەکردن، یان قەناعەت پێکردنو نەکردنە. کە گوترا (ئەستەم) ئیتر نەك دەرگاکانی گفتو گۆ، بەڵکو شانەکانی بیرکردنەوەی مێشێکیش کەڵکیان نامێنێ.

سەبارەت بەوەی لەوڵاتە ئیسلامیەکانیش دا (عەلمانیەتو دیموکراسیەت).. (ئەستەمە، هەڵبکەن. ئەگەر (ئەستە)مەکەی لێلابەرین، ئەتوانین دیالۆگێکی لەسەر بکەین.

ئەگەر مەسەلەکە ئەوەبێ کە ئیسلام وەکو کەلەپور، نەریت، ڕەوشتو یاسا لەناو خەڵکدا بڵاوبۆتەوە، بۆیە دیموکراسیو عەلمانیەت (ئەستەمە) پێکەوە

هه‌ڵبکه‌ن. خۆ مه‌سیحیه‌ت‌و جوله‌که‌ش له‌ناو خه‌ڵکی خۆیاندا هه‌ڵکردنیان بۆته نه‌ریت‌و خووره‌وشت‌و یاساو که‌له‌پوریش؛ ته‌نانه‌ت عه‌قیده‌کانی بوزی‌و هیندۆسی‌و باقی باوه‌ره‌کانی تریش له ژاپۆن‌و هیندستان‌و کۆریاو گه‌لێ له‌ولاتانی تر، هه‌مان شته. ئێستاش که عه‌لمانیه‌ت له‌و ولاتانه‌دا له‌ده‌ستوردا په‌سه‌ند کراوه، کاریگه‌ری باوه‌رو مه‌زهه‌ب‌و عه‌قیده دێرینه‌کانیان قوڵه له‌سه‌ریان. هیچ پیاوێکی ئایینی‌و زانایه‌کی ئیسلامی ئه‌و پێشوازییه‌ی لێ‌ناکرێ که له (پاپا)ی مه‌سیحیه‌کان ئه‌کرێ.

پاشان، چۆن ئه‌کرێ دیموکراسی راسته‌قینه‌ت قبوڵ بێ، به‌لام عه‌لمانیه‌تت قبوڵ نه‌بێ؟ پێم وایه، قبوڵ نه‌کردنی عه‌لمانیه‌ت‌و دابڕینی له دیموکراسیه‌ت، دژایه‌تی کردنی خودی دیموکراسیه‌ته، به‌ناو قبوڵ کردنی دیموکراسیه‌ته‌وه. ناکرێ سیسته‌مێکی دیموکراسی ناعه‌لمانی هه‌بێ‌و ناشکرێ سیسته‌مێکی عه‌لمانی نادیموکراتیش سه‌ربخرێ. پێشتر له‌سه‌ر ئه‌م په‌یوه‌ندیه دیالکتیکیه قسه‌مان کرد. ئه‌وه‌ی لێره‌دا پێویستی به رونکردنه‌وه‌یه، ئه‌وه‌یه که: کاك ئه‌بو به‌کر عه‌لمانیه‌ت له‌سه‌ر ئیسلامی سیاسی به مه‌ترسی ئه‌زانێ، نه‌ك دیموکراسیه‌ت. ئه‌مانه پێیان وایه ئه‌توانن لێکدانه‌وه‌ی جیاواز بۆ چۆنیه‌تی جێبه‌جێکردنی دیموکراسیه‌ت‌و شێوه‌ی حوکمه دیموکراسی بکه‌ن، به‌لام عه‌لمانیه‌ت سه‌باره‌ت به جوێکردنه‌وه‌ی دنیاو ده‌وڵه‌ت، لێکدانه‌وه‌ی جیاوازو مانۆرو یاری کردن به‌چه‌مکه‌کان قبوڵ ناکا. بۆیه دیموکراتیه‌تیشیان قبوڵه چونکه هێشتا له‌سه‌ر حوکم نین. دوای هاتنه سه‌ر حوکم، کارێکی ئه‌وتۆ ئه‌که‌ن دیموکراسی به‌ته‌واوه‌تی له‌ناوه‌رۆکی سه‌رده‌م به‌تاڵ ئه‌که‌ن‌و به ئاقارێکی ناحیزبیدا حوکم ئه‌که‌ن.

هه‌روه‌کو (حه‌سه‌ن به‌نا) فره حیزبی‌و حیزبایه‌تی جۆراوجۆری له (حیزبی خوا) قبوڵ نییه.

ئه‌مانه، دیموکراسیه‌تیان بۆیه قبوڵه هه‌تا بتوانن فرسه‌ت بدۆزنه‌وه‌و حوکم بگرنه ده‌ست. بۆ چه‌واشه‌کردنی خه‌ڵك قبوڵیانه.

قبوڵیانه، به حسابی خۆیان ئیسلام به جۆرێ رۆچۆته ناو خه‌ڵك بۆته که‌له‌پوری چاره‌نوسسازیان. که ئیسلامیش به‌و شێوه‌یه ببێته که‌له‌پوری زۆربه‌ی خه‌ڵك، زۆربه‌ی خه‌ڵکیش بۆ هه‌ڵبژاردنی دیموکراسیه‌ت چاره‌نووسی حیزبه‌کان دیاری بکات.

## کەواتە: حیزبە ئیسلامیە کاریگەرەکە دەرئەچێ

ئەمان، وای لێك ئەدەنەوە مادام دیموکراسیەت دەسەلاتی ئیرادەی گەل بێ‌و زربەی هەرە زۆری گەلیش موسوڵمان بێ، کەواتە: هیچ کێشەیەکیان لەکاتی یموکراسی سیاسی بۆ دەرچون لەهەڵبژاردن نامێنێ. بەمەش ئەوپەڕی هەوڵ ەدەن دیموکراسیەت لەمانا ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و یاساییەکەی دوور بخەنەوە. ـونکە زەرەریانە، تایبەتی بنچینەیەکی گرنگی دیموکراسیەت هەڵبژاردنی ەستورو یاسای دەستوری هەمیشەییە. ئیسلامیەکان باڵادەستێتی یاسا ەگێڕنەوە بۆ شەریعەت. دەستورو یاسای هەڵبژێراو لە شەرعی ئیسلامدا بوونی یە. لە هەندێ ئەحکامەکانی شەریعیشدا، کە لەسەر بنچی دەقی قورئانی زنراوە، لێك دانەوەی جیاواز بەهیچ شێوەیەك رێگەی نادرێ.

هەروا، لە دیموکراتیەتدا، ئیسلامیەکان لەگەڵ ئازادیە گشتیەکاندان. لەگەڵ زادییە تایبەتیەکاندا ناگونجێن. ئازادی تاك بەمانای ئازادی عەقڵ‌و دادوەری ـەقلانی لای ئیسلامیەکان، پێچەوانەی ئیسلام‌و شەریعەتی خوایە. هەربۆیە معتزل)ەکان سەرکوت کران، چونکە ئەیانویست عەقڵانی بن. یەککرتوەکان ێك‌و رەوان لەگەڵ بیروڕای رێبەری گشتی (الأخوان المسلمین)دام لەمەر یموکراسیەت کە ئەڵێ:

(بەڵێ لەگەڵ دیموکراتیەتداین کە هەڵبژاردنی ئازادانەی پاك ئەگەیەنێ، کە ـەل لەرێگەیەوە لێپرسراوەتی‌و ئەنجومەنە میللیەکان هەڵئەبژێرێ کە پرسینەوەو چاودێری گشت لێپرسراوەکانی ئەکا. ئێمە لەگەڵ فرەلایەنی‌و ـاڵوگۆڕکردنی دەسەلاتین بەشێوە راستیەکەی کە پێکەوەنانی حیزبەکان‌و ـازادی کار لەبەرامبەر حیزبەکاندا ئەگەیەنێ، بێ‌دەست تێوەردان لەلایەن ەسەلاتەوە، یان بەبێ ئابلۆقەو دەست بەسەراگرتن لەلایەن دەسەلاتەوە)*

ئەگەر ئەم چاوپێکەوتنە بەوردی لێك بدەینەوە، ئەبینین بەرێز (مستەفا ەشهور) تەنها لایەنی سیاسی دیموکراسیەتی قبوڵەو کەم‌و زۆر توخنی لایەنە زمەلایەتی‌و فەلسەفی‌و ئازادییە تایبەتی‌و عەقلانیەکەی دیموکراسی نەکەوتووە.

---

* بروانە چاوپێکەوتنی رێبەری گشتی (الأخوان المسلمین – مصطفی مشهور) مجلة الدعوة/ ژمارە (٦١)

ئەمەش پەیوەندی بە ئیمان و ئاینی سەرجەم پەیرەوانی ئیخوانەکانە، بەرامبە
دیموکراسیەت و چۆنیەتی دەسەلاتی حوکمیان، ئەگەر حوکم لەهەر ولاتێکد
بگرنە دەست.کە باسیش لە فرەلایەنی ئەکا، بە پێچەوانەی (حەسەن البنا
لەبەرئەوەیە ئەم سەردەمە ئەبێ مانۆڕی دیموکراسی فراوانتر بکەن، چونک
کەس لێیان قبوڵ ناکا. هەربۆیە ، ئەوانە عەلمانیەتیش رەت ئەکەنەوە, زۆریش
دژی عەلمانیەتن. چونکە ئەگەر لە مەسەلە سیاسیەکانی دیموکراسیەت زیاد
باوەڕ بەدیموکراسیەت بهێنێ، ئیتر هیچ کۆسپێك لەبەردەمیاندا بۆ قبوڵ کردنی
عەلمانیەتیش نامێنێ. کە هەرگیز ئەمە ناکەن، لە پێناوی ئەمەش ، دیموکراسی
لە ناوەرۆکەکەی دائەماڵن و تەنها چوارچێوە سیاسیەکەی ئەسەلمێنن. ئەمەش
خەتەرێکی گەورەیە لەسەر پرۆسەی دیموکراسی. بەدەنەمێت چاندنی رێگا
دیموکراسی راستەقینەیە، کە لە نان و کاتی گونجاودا، ئەیتەقێننەوە.

جگە لە هەموو ئەو مەسەلانەی پەیوەندیەکی ئۆرگانیکیان بە دیموکراسیەو
هەیە، پێویستە ئەوەش بخەینە بەرچاو، کە لە (ئەبوبەکر) وایە، عەلمانیە
لەئۆروپادا بێ گیروگرفت و دەست بەجێ چەسپێندراوە. مەسەلەکە بەو ئاسانیی
نەبووە، کە نوسەر ئەیەوێ لە خوێنەر بگەیەنێ. لەپەنا ئەم ئاسان و ساکا
کردنەی بەدی هێنانی عەلمانیەت لە ئۆروپادا، نووسەر مەبەستێکی شاردراوەشی
هەیە، ئەویش ئەمەیە کە:

کاك ئەبو بەکر، لە پێشدا کە باسی ئەوەی کردووە، ئیسلام بۆتە کەلەپور
رەوشت و یاسای ژیانی موسوڵمانان، بۆیە عەلمانیەت لەناو میللەتانی ئیسلامید
قابیلی قبوڵ نییە. بە پێچەوانەشەوە، ئەیەوێ بڵێ: مەسیحیەت ئەو کاریگەرییە
لەناو ئۆروپادا نییە کە ئیسلام لەناو میللەتانی موسڵماندا هەیەتی، بۆیە لەئۆروپ
عەلمانیەت جێبەجێکراوە و لەناو میللەتانی ئێمەدا جێبەجێناکرێ. دیارە ئە
مەبەستە ناراستەوخۆیەش لە هەردوو حاڵەتدا، بۆ ئۆروپا و بۆ لای خۆشما
وانییە.

لەئۆروپادا، کاتێك رۆشنگەری و بیری نوێ فشاریان ئەخستە سە
دەسەلاتدارە ئاینیەکانی چاخی ناوەڕاست، بەهەموو توانایەکیان بەرەنگاریا
کرد. مێژوونوسان قسە لەکوشتنی (٥)ملیۆن دیموکراسی و ئازادیخواز و روناکب
ئەکەن. ئەمە جگەلەوەی بلیمەت و هەڵکەوتوەکانی زانست و فکری ئەو سەردەمە
دوچاری کوشتن و راوەدوونان و سوتاندن هاتن. پرۆسەکە هەروا ساکار نەبووە

کە عەلمانیەت بەئاسانی جێبەجێکرابێ‌و بەئاسانی وەرگیرابێ. لەسەردەمی رینسانسەوە (سەدەی شانزەهەم) عەقلانیەت‌و عەلمانیەت چەکەریان کردو لەپێناویاندا بەگەرمی خەبات کرا، هێشتا ساڵی (١٧٥٧) یاسای لەسێدارەدانی دژەکانی ئایینی لەفەرەنسادا، پەسەندکرا. ناکۆکی‌و مل ملانێ لەسەر عەلمانیەت هەتا ئەهات قوڵتر ئەبوو، لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا، لەبواری پەروەردەدا، هەتا رادەیەك پەسەند کرا. ئەویش لەسەردەمی (ناپلیون بونابرت) کە بەرامبەر قەشەکان دەسەڵاتێکی گەورەی ئەنواند. هەتا ساڵی (١٨٨٥) لەفەرەنسادا، دەسەڵاتی ئاینی پاشەکشەی کردو ئاین‌و دەوڵەت لێك جوێکرانەوە. ئەمەش نەکرایە یاساو دەستور، هەتا ساڵی (١٩٢٤). ئیتر لەوە بەدواوە واتە: دوای زیاتر لە چوار سەدە لە خەباتی عەلمانیەکان دین‌و دەوڵەت بەرەسمی جیاکرانەوە. لەئیتالیادا ساڵی (١٩٤٧) عەلمانیەت پەسەند کراو (١٩٧٦)، دوای بەزینی حیزبی دیموکرات مەسیحی لەهەڵبژاردندا، لەئیسپانیادا، عەلمانیەت بەتەواوەتی چەسپێندرا.

مەسەلەی عەلمانیەت‌و کاریگەری مەسیحیەت لەئۆروپادا، پرۆسەیەکی راگوزەرو بێگرفت نەبووە، هەتا کاك (ئەبوبەکر) وای پیشانبدا گوایە مەسیحیەت زوو مەیدانی بۆ عەلمانیەت چۆڵ کردووە. بەڵام عەلمانیەت بەرامبەر ئیسلام هەرگیز سەرناکەوێ. نەخێر لە ئۆروپادا خەباتی عەلمانیەکان بەسەختی قۆناغەکانی بری‌و لەناو میللەتانی موسوڵمانیش دا، سەرەرای ئەوەی سەدەیەك زیاتر رۆشنگەرانی ئیسلامی‌و عەلمانی‌و عەقلانی خەبات لەو پێناوەدا ئەکەن، بەڵام بەهۆی لاوازی زەمینەی مادی‌و شارستانیەکانی پێکەوە بەدی هێنانی دیموکراسیەت‌و عەلمانیەت، هێشتا رێگەیەکی درێژو دژوار لەبەردەم بەدی هێنانی ئەو ئامانجانەدا ماوە. ئەمە سەرەرای ئەوەی کە لە چەندین وڵاتی عەرەبیدا؛ میسر سوریا، عێراق، جەزائیر، تونس‌و لوبنان، هەتا رادەیەك عەلمانیەت ئاخنراوەتە ناو دەستورەکانیان، بەڵام هێشتا رێگای بەدیهێنانی عەلمانیەت، دژوارو دورودرێژە. رەنگە هەلومەرجی نوێی ئابوری، سیاسی، روناکبیری‌و.. عەولەمە، یارمەتیەکی کاریگەری چاکتر پێگەیشتن‌و هێنانە دی پێکەوەی دیموکراسیەت‌و عەلمانیەت بدەن.

## لە ترسی گەل یان کۆنە پەرستی؟

(عەلمانیـــەت وەك وتمـــان لـــەوولاتێکی ئیـــسلامی دا زۆر کـــەم لەگـــەڵ دیموکراسیەتێکی ڕاستەقینەو ناوەڕۆکدا هەڵدەکات.. چونکە هیـچ دەوڵـەتێکی عـــەلمانی جورئـــەتی ئـــەوەی نیـــە جـــۆری سیـــستمی سیاســـی‌و یاســـایی‌و مومارەسەکردنی دەسەلات بەجێ بێڵـێ بـۆ گـەل چـونکە دەزانێـت پـرۆژەی ئـەو پرۆژەی نوخبەیەکی دابڕاوەو گەل دەنـگ بـۆ پـرۆژە ئیـسلامییەکەو بیروبـاوەڕو ناسنامەی خۆی دەدات).

لێرەشدا، نوسەر جیاکردنەوەی دیموکراسیەت‌و عەلمانیـەت ئەکاتـەوە چـەقی باسەکەی. زۆریشی لا مەبەستە دیموکراسیەت لـە عەلمانیـەت دابـبڕێ. قـسەکانی کاك (ئەبوبەکر) ئەشێ وەکـو بۆچـونێك حسابی بـۆ بکـرێ. نـەك وەکـو تێزێکـی بەڵگەنەویـــست. ئـــەوەی هـــەتا ئێـــستا ســـەلمێندراوە، ئەوەیـــە کـــە لەوڵاتـــە ئیـسلامیەکاندا، لەبەرئـەوەی سیـستەمی دیموکراسـی ڕاسـتەقینە نـەبووە، بۆیـە عەلمانیەتیش وەکو پێویستە نییە، نەك لەبەرئەوەی دیموکراسـیەت‌و عەلمانیـەت پێکەوە هەڵناکەن.

کاتێك لەناو کۆمەڵێکدا، زەمینەی مادی هاتنە دی دیموکراسـی خـۆش نـەبێ، بێگومان نە ڕژێمەکەی دیموکراسی ئـەبێ‌و نەعەلمانیـەتیش بەراسـتی دەهێنرێتـە کاری.

سـەبارەت بـەوەی هـیچ دەوڵـەتێکی عـەلمانیش جورئـەتی ئـەوەیان نـەبێ دەســەلات بـۆ گـەل جـێبێڵێ. هۆیەکـەی دیـسان ئەگەڕێتـەوە بـۆ نـەبوونی دیموکراسیەت‌و سیستەمی دیموکراسی.نـەبوونی زەمینـەی مـادی بـەدی هێنـانی دیموکراسی، قوڵترین گرفتی دیموکراسیە. یـەکێك لـە هۆیـەکانی خـۆش نـەبوونی زەمینەی مادی‌و مەعنەوی دیموکراسیەتیش، مومارەسەی هەڵەی عەقیدەی ئاینە لەلایەن ئیسلامییە گۆشەگیرو لایەنە سیاسیە ئیسلامیەکانەوە. نـەك لەبەرئـەوەی خودی پرۆژەی عەلمانیەت، پرۆژەی نوخبەیـەکی دابـڕاوە لەگـەل کـە بـە حـساب ناسـنامەکەی ئیـسلامییە، هـەروەکو کاکـە ئەبوبـەکر ئەیـەوێ بـاوەڕ بـە خوێنـەر بهێنێ.

هەرگیز نکوڵی لەوە ناکرێ کە ئـاینی ئیـسلام، وەکـو عەقیـدەی مـرۆڤ، وەکـو خواپەرستی، لای خەڵك ڕۆچۆتە ڕۆحیان. بەڵام عەلمانیەت نەك دژی ئاین نییـە،

بەڵكو دەستەبەری ئازادی عەقیدەشە. عەلمانیەت كفرو هەڵگەرانەوە لە ئاینەكان نـەبوەو نییـە، بـەڵكو بـە پێـچەوانەوە، ئـازادی ئاینییـەكان تێكـەڵاوی یاسـاو دەستوری هەمیشەیی ئەكاو ئیتر قابیلی پێشێل كردنیش نابێ لەلایەن دەسەڵاتو حیزبو گروپ روناكبیریەكانیشەوە.

لەراستیا، ئیسلامیەكان، پـێش ئـەوەی بێنـە سـەر حـوكم لـە رێگـەی خـراپ مامەڵـەكردن بـە چۆنیەتی پەرستنی خـواو پەیامـەكانی خـوا بـۆ مـرۆڤ، هـەروا، بەهۆی تێكەڵاو كردنی شەرعو سوننەتی پێغەمبـەر بەبەرنامـە سیاسیەكانیەوە، بونەتـە هـۆی كێـشەو سـەر ئێـشە بـۆ موسـوڵمانانو كۆمەڵـە ئیـسلامیەكان. دیكتاتۆریەتی ئایدیۆلۆژیەت ئەسەپێننە سەر باوەرو عـەقڵو ئـازادی عەقڵانیـەت. وا ئەكەن مرۆڤ نەتوانێ دوور لە كاریگـەری پروپاگەنـدەكانی ئیـسلامیەكانو ئـەو ترسو بیمەی (١٤٠٠)ساڵ لەمەوبەر، بۆ سەردەمی جاهلیەتو جەهالەتی دورگـەی عەرەب، كراوەتە ئامرازی دابین كردنی سەركێشی جەهالـەت، هـەوڵ ئـەدەن لـەم سەردەمەشـدا، بـەناوی دڵـسۆزی بـۆ ئیـسلامو گەرانـەوە بـۆ سـەردەمی بـەرایی ئیسلام، هەورەكو سەردەمی جەهالەت خەڵك بتۆقێنن. بڕواننە (سەید قوتب) لـە كتابی (معالم فی الطریق)دا ئەڵێ چی:

لە سەرەتادا تەواوی موسوڵمانان لە جیهانـدا ئەهاوێتـە نـاو جاهلیـەتو ئـەڵێ (جیهان سەرجەم ئەمرۆ لەناو جاهلیەتدا ئەژی) ئەمەش بەوە پاساو ئەداتەوە كـە حاكمیەت بوونی نییەو ئەڵێ (ئەم جاهلیەتە لەسەر بنەمای پەلاماردانی سولتانی خوا لەسەر ئەرز پێـك هـاتووە تایبـەت خواوەنـدێك كـە حاكمیەتـە، حاكمیەتەكـە ئەگێرێتەوە بۆ ئادەمیزاد)*

ئەمـە پـەیامی راستـەقینەی (ئیخـوان المـسلمین)ەكانـە لەگـەڵ خـەڵك. ئابـەو چەشنە لەناو كۆمەڵدا خەڵك ئەتۆقێنن. وا لە خەڵك ئەكـەن، جگـە لـە دەسـەڵاتی خوا بە هیچ دەسەڵاتێكی تـر رازی نـەبن، بـەڵكو هـەموو دەسـەڵاتێكی تـر بـەكفر بـزانن. خـەڵكیش كـە ئـەو قـسانە ببیـستێو هوشـیاری نـەبێ، هەڵبەتـە دژی حاكمیەتی عەلمانیو لەگەڵ (حاكمیەتی خـوا)دا ئـەبێ. ئەمـە لەكاتێكدا هـەرگیز لەقورئاندا، بەم شێوەیەی پـەیرەوانی (حاكمیـەت بـۆ خوایە)، سورن لەسـەری، ئایینی ئیسلام بۆ سەپاندنی حوكم، بەبێ لەبەرچاوگرتنی گۆرانی زەمانـەو ژیـان،

---

* بروانە لاپەرە (٣١٤)ی جذور الفتنة فی الفرق الأسلامیة اللواء حسن الصادق

موسڵمانی رانەسپاردووە. لە راستیا هەموو ئایەتە (مکیە)کان کە هەتا پێغەمبەر لەمەکەدا بوو، سەرجەمیان باسی سیاسەتیان تیا نییەو پەیامی سیاسیان نەسپاردووە. باسی (حاکمیەت بۆ خواو) تەنانەت بۆ (پێغەمبەر)یشیان تیا نییە. دوای ئەوە لەناو (مەکە)دا، پێغەمبەرو پەیرەوانی، دوچاری گێچەڵی قورەیشییەکان (کە هۆزی خودی پێغەمبەرن) هاتنو ئەمانیش ناچار بوون (مکە)جێبهێڵن، بۆ (مەدینە) هیجرەتیان کرد، لە ئایەتە (مەدەنیە)کاندا، بە حوکمی ئەو هەلومەرجە نوێیەی هیجرەتو ژیانی ناو مەککە، راسپاردەی گشتی چۆنیەتی ئیدارەکردن هەیە.

ئەگەر (خواوەند) بەو شێوەیە ئیسلامی پابەندی سەپاندنی (حوکمڕانێتی خوایی) لەسەر ئەرز کردبێ، ئەی بۆچی لە ئاینە ئاسمانیەکانی ترو کیتابەکانی تری ئاسمانیدا، خەڵکی ئەو ئاینەی بۆ حوکمڕانێکی سەر ئەرزی خوایی رانەسپاردووە. بۆ لە مەسیحیەتدا شتی وا بەدی ناکرێ. بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەبینرێ. دوورکەوتنەوە لە دەسەڵات ئامۆژگاریەکانی مەسیحە. بۆچی پێشتر لەکیتابە ئاسمانیەکانی تردا گوێ ناداتە حوکمی سەر ئەرزی خۆی، تەنانەت هەتا لە ئایەتە (مکیە)کانیشدا بەلایدا نەرۆیشتووە، بەڵام دوای هیجرەت، راسپاردەی گشتی ئەسەپێ بۆ ئیدارەکردن؟

پاشان، مەعقولە خوا یەك جۆر حوکمو ئەحکامی شەرعو شەریعەت، دەقاو دەق، دەق دەق بۆ هەموو زەمانو هەموو ئانو کاتێك، بێ رەچاوکردنی گۆڕانکاریەکانی زەمانە، بسەپێنێتە سەر ئادەمیزادو کۆمەڵە جیاوازەکانی بەشەریەت، بەسەر هەموو ئەو نەتەوە جیاوازو، گەلە جیاوازو، رەگەزە جیاوازو نیشتمان جیاوازو، نەریتو کەلەپورە جیاوازە. ئاخۆ کاری ئاوا، لە خوا، یان تەنها لە مرۆڤی گۆشەگیر ئەوەشێتەوە.

سروشتیش ئاوا نەخولقاوە، چ جای بۆ ئادەمیزاد. لە پانتایی جوگرافیای سروشتدا، هەر مەڵبەندێكو خاسیەتی خۆی هەیە. ئۆروپا، ئەمریکا، ئەفریقیا، ئاسیا، هیندستانو رۆژهەڵات، بەشێوەیەکی گشتی جیاوازنو لەناو هەر وڵاتێکیشدا، جۆرێك لە جیاوازی هەیە. بەردەوامیش گۆڕانکاری لە کەشو هەواو پێکهاتەی جیۆلۆجیدا روونەدات. چ جای بۆ مرۆڤ کە مرۆڤ بریتییە لە گۆشتو هەست. بریتییە لە خودودەوروبەر، هەستی مرۆڤ بە ساتە کات لە گۆڕاندایە، نەك

ـە ساڵ یان بەسەدە، یان هـەزارەی یەکـەم یـان دووەم. چـۆن ئـەکرێ مـرۆڤ کـە
ـەسـتی هەیـەو بەرژەوەنـدی گـۆردراوی هەیـە. کۆمـەڵیش کـە دیـاردەی نـوێو
ـەردەوام گۆرانکاری هەیە، یەك رێسای شەریعەتی بسەپێنرێتە سەر.

## - تورکیای ئێستاو تورکیای عوسمانی

(لەوڵاتێکی وەکو تورکیادا کە بەیەکەم وڵاتی سکیلۆلەرستی رۆژهـەڵات دادە
ـرێـت کـە بەشـێوەیەکی رەسمـی جـاری عەلمانیـەتی دابـێو شـەری لـەپێناودا
کردبێـت. دەسـەڵاتی مـەدەنیو دامـەزراوە دیموکراسـیەکانی وەکـو پـەرلـەمانو
حکومەتو حیزبـەکان تـەنها بەرواڵـەت جڵـەوی دەسـەڵاتیان بەدەسـتە. ئـەگینا
ـەراستیدا سوپا دروستکەری بریاری سیاسیو دیاری کەری چارەنووسی وڵاتە).

لەم دەقەدا، کاکە ئەبو بەکر باسی تورکیا ئـەکا. کـە عەلمانیـەو دیموکراسـی
ـییەو حوکم بەدەست سوپاوەیە. ئێمە لەسەر ئەم قسەیە زۆر نـارۆین. هـەرگیزو
ـەرگیزیش بـەرگری لـە تورکیـا ناکـەین. راسـتە تورکیـا لـەزۆر رەوەوە
ـادیموکراسییە، بەتایبەتی لەچارەسـەرکردنی کێـشەی میللـەتانو رەفتـار کـردن
ـەگەڵ بەرهەڵستکارەسیاسیەکاندا. راستیشە سوپا لە ژێرەوە حوکمرانە. جگە لە
ـەموو ئەوانـەش، بـە ئەقڵیـەتی شـۆڤێنیزم تـورك گـۆش کـراون. هێنـدەی
ـاسـیۆنالیزمی دەمـارگیر باڵادەسـتە، هێنـدە دیموکراتیخـواز تەنانـەت لـەناو
ـەتەوەی تورکیاشدا، نییە. بەڵام ئەپرسین: ئەم حکومەتە (عەلمانیە !)ی تورکیـا
ـدوای چ حکومەتێك هاتۆتە سەرکار؟

ئایە، لـەدوای ئیمپراتۆریـەتێکی ئیسلامی شـەش سـەدە حـوکمران نەهاتۆتـە
سـەرکار؟ شـەش سـەدەی رەبـەق عوسمانیـەکان حـوکمی ئیسلامیان کـردووە.
ـەواوی رۆژهـەڵاتو بەشـێکی ئۆروپـاو ئەفریقیاشـیان داگیرکردبـوو. ئەمانـە نـەك
ـەیانتوانی نموونەی حوکمێکی باش بن، بەڵکو مێـژوو شـەرمەزارە لـە ئاسـتیاندا.
ئەوەندە تاوانیان کردووە، ئەوەندە ناجوامێربوون، ئەوەنـدە بەدرەوشـت بـوون،
ئەوەندە خوێنرێژ بوون، ئەوەندە کۆنەپەرست بوون، مرۆڤ کە مێژووی دەسەڵاتی
سیاسیو رەفتاری کۆمەڵایەتیان ئەخوێنێتەوە، شـەرم ئـەکا کـە لـە ناسنامەشـدا
موسڵمانە.

هـۆی سـەرەکی ئـەو نموونـە حوکمـەی عوسمانیـەکان، پابەندییانـ بەدێرینـەخوازیو پێشینەی حـوکمرانی ئیسلام. کـوتو مـت ئەیانویـست دەق شەریعەتی ئیسلامی لە هەموو سەدەیەکو لەناو هەموو دۆخێکو بەرامبەر تـەواو دیاردە گۆردراوەکان، بسەپێنن. بۆیـە ئـاوا شکستیان خـوارد کـە ئێـستا حزبـ سیاسیە ئیسلامیەکان بەشەرمەوە باسیان ئەکەنو ناشوێرن لەبەر عەلمانیـەکان رەخنەیان لێبگرن.

تاقیکردنـەوەی حـوکمی سیاسـی عوسمـانی ئەوەنـدە درێوبـوو بـە ئاسـانـ لەهەلومەرجی جەنگی یەکەمی جیهاندالەناوبرا. نەك گەلانی موسڵمانی تر، بـەڵك نەتەوەی تورکیش، لەدەسەڵاتە ئیسلامیەکە هەڵگەڕایەوە.

پێمان وایە، حکومەتی ئێستای تورکیـای عـەلمانی نادیموکراسـی، سـەرەرا هـەموو خراپـەو تـاوانو کـردەوە ناپەسـەندەکانی، ئەگـەر بـە پێوانـەی بـەراور هەڵیبـسەنگێننو لەگـەڵ عوسمانیەکانـدا بـەراوردی بکـەین، پێمـان وایـە ئـەما پێشکەوتوترن. یـان ئـەمان زیـاتر کەوتونەتـە ژێرکاریگـەری پێشکەوتن. ئەگـە دەسەڵاتی ئیسلامی عوسمـانی لەشـەش سـەد سـاڵدا حـوکمڕانێکی بـاش بوایـە هەڵبەتە ئێستا حکومەتێکی عەلمانی ئاوا ناتەواو لە تورکیـادا حـوکمی نەئـەکرد پێشمان وانییە تورکیا بـە حکومـەتێکی ئیـسلامی بچێتەوەسەر رەوت. تەنانـە حیزبی (رفاه)ی جارانو (فەزیلە)ی ئێـستاش، ئـەم راسـتییە ئـەزانن کـە تورکی ناچـێتەوە چوارچـێوە ئیـسلامیەکەی جـاران. بۆیـە، حیزبێکـی ئیـسلامیی عەلمانیەتیشیان قبوڵە! دیـارە ئـەمیش هـەتا ئـەو کاتـە مەترسیەکانیان لەسـە نامێنێ. دوای ئەوە بێگومان ئاوا نامێنن.

## - پرۆژەی نوخبەو پرۆژەی ئیسلام

(ئـیرادەی گـەل لـەژێر زۆرلێکـردن (اکـراه) دا دەردەچـێو رێـزی لێ بگـیرێ رێگای بدرێت گوزارشت لەناسنامەو بیروباوەڕو ویـژدانو هـزری خـۆی بکـات ئـە کاتە ئەگەر دەسەڵاتێکی عەلمانیشی هەڵبژارد گرنگ نیە چونکە دەیـان جـار لـە دەسەڵاتە عەلمانیەی ئێستا باشـتر دەبێـت چـونکە لەڕوویەکـەوە پـرۆژە کـە لـ پرۆژەی نوخبە دەردەچێو بنکە جەماوەریەکە پشتیوانی لـێدەکاتو گەر هەمو

یشی نەبێ بەشێکی بەرچاو لە گەل پشتیوانی لێ دەکات لەڕوویەکی تریشەوە بۆیەکەم جار لەم وڵاتانەدا عەلمانیەت و دیموکراسی بەیەکەوە هەڵدەکەن!!)

لەم پەرەگرافەدا، کاکە (ئەبوبەکر) ئەیەوێ وای پیشانبدا کە عەلمانیەکان نوخبەیەکی دابڕاوی خۆسەپێنەرن. کە لە راستییا وانییە.

جارێ هەموو ئەو حکومەتانەی بە نیوە چڵێ عەلمانی و نیمچە دیموکراتین، خۆیان یان رابەرانی پێش خۆیان بە تێکۆشان دژی کۆلۆنیالیزم هاتونەتە سەر کار، لە (میسر، تونس، جەزائیر، لوبنان، سوریا، تورکیا، عێراق ١٩٥٨، تاد) زۆربەی هەرە زۆری خەڵکیش لەگەڵیاندا بووە. تەنانەت لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشە بۆرژوازیەکان بەسەر کۆلۆنیالیزم لە (عێراق و سوریا)دا، نەک عەلمانیەکان، بەڵکو حیزبە کۆمۆنیستەکانیش لەناو خەڵکدا باڵادەست بوون. لە ئێرانی ئێستای دەسەڵاتی ولایەتی فقهدا، حیزبی تودەی کۆمۆنیست بەسەر شەقامی سیاسیدا زاڵبوو.

زۆرینەی خەڵك ئەکەونە دوای ئەو پێشەنگە کە لە قۆناغێکی دیاریکراودا ئەتوانێ نوێنەرایەتی هەڵوێست و هەست و بەرژەوەندیەکانیان، دژی دوژمنەکانیان بکا.

مەسەلەکە وانییە کە عەلمانیەکان نوخبەیەکی دابڕاون و گەلیان لەگەڵدا نەبووە، ناش زانرێ تەنانەت ئەم حکومەتانەش ئەگەر دیموکراسی تەواو بدەن، ئایا زۆربەی گەل لەگەڵ عەلمانیی یان ئیسلامیدا ئەبێ. حوکمی ئاوا تەنها لەکاتی هەڵبژاردنێکی پاکی دیموکراسیدا ئەزانرێ.لە جەزائیردا، راستە ئیسلامیەکان دەرچوون، بەڵام رێگەیان نەدان، هەقیش بوو رێگە بدرابان، بەڵام وادیارە حیزبە عەلمانیەکانی جەزائیر پێشوەخت زانیویانە ئەو ئیسلامییە توندرەوانە، چ درندەیەکن، بۆیە ناچار سەنگەریان لێگرتن.

ئەو ئیسلامیانە گەر لەسەرحوکم بان، ئاخۆ چییان بە عەلمانیەکان بکردایە، ئێستا بەرامبەر منالی سەر بیشکە ئاوان کە حوکمران نین، جا وەرە حوکمران بن.

رەنگە بگوترێ: لەبەرئەوەی رێگەیان نەدراوە بێنە سەر حوکم، بۆیە ئاوا توندن و رەفتاری ئاوا ئەکەن. پێمان وایە کاردانەوەی سیاسی و عەسکەری هیچ

لایەك، ناگاتە ئەو رادە توندوتیژو خوێنرێژییە، ئەگەر لە ناوەرۆکدا ئەو لایەنە باوەڕیبەو کارو کردەوانە نەبێ. چۆن نەبێ لەبەرامبەر کارێکی خراپدا، کاردانەوە هەزار قات خراپتربێ.

ئێستا کە هەلومەرجی دوای هەرەسی سۆڤیەت‌و تەنگو چەڵەمەی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەکان، ئیسلامیەکانی لەچەند وڵاتێکدا بوژاندۆتەوە، ئەمە بەو مانایە نییە ئیسلامی سیاسی نوێنەری تەواوی موسوڵمانانی وڵاتی خۆیانن. ملیۆنەها موسڵمان هەن، نەك هەر لە گەڵیاندا نین، بەڵکو دژیشیانن، سەرەراش، با بێین‌و سیاسەتی راستەقینەی ئەم ئیسلامییە سیاسیانە بەرامبەر عەلمانیەکان، هەروا، دەوڵەتە ئیسلامیەکان بەرامبەر حیزبە دیموکراسی‌و عەلمانیەکان هەڵبسەنگێنین؛ لەجیهاندا چوار نموونەی حوکمرانی ئیسلامی دەهێنینەوە ئەمانەن:

١- مەملەکەتی عەرەبستانی سعودی: ئەم حکومەتە، حکومەتێکی سوننی (وەهابی) ئیسلامییە، حەرەمی دوو پێغەمبەری تیایە. زۆریش لە رۆژئاواو ئەمریکا نزیکن. بەڵام کەمترین بواری دیموکراسی نادەن. هەر زۆر دوژمنی عەلمانیەکانیشن، بە هەموو حساباتێکی سیاسیشیان پابەندی حوکمی خوایی‌و شەریعەتی ئیسلامیین. دەستوریشیان ئیسلامییە.

٢- ئەفغانستان: پێش تالیبان‌و پاش ئەوان، پێشتر حکومەتێکی سوننەو شیعە مەزهەبەکانی تێکەڵەی ئیسلامی بوون. ئێستاش سوننیی. نەك عەلمانیان قبوڵ نییە، بەڵکو دوژمنی خوێنە خۆریانن.

٣- کۆماری ئیسلامی ئێران: سیستەمێکی شیعە مەزهەبن. زۆر پێشکەوتوتریشن لەسعودیەو ئەفغانستان. ئەوەتانێ کاتێ بەرەو ئازادی زیاترو مەدەنیەت هەنگاو ئەنێین، ئینجا باوەریان بە عەلمانیەت نییەو رێگەشی نادەن.

٤- وڵاتانی کەنداوی فارسیش، کە دەستوریان ئیسلامییە،سەرجەمیان دژی عەلمانیەتن. یەك حیزبی عەلمانی ئازاد لەناویاندا نییە.

بە پێچەوانەشەوە، هەموو دەوڵەتە نیمچە عەلمانی‌و نیوە چڵ دیموکراسی،

زۆرو کەم ڕێگەیان بە ئیسلامی سیاسی داوە ئازادی سیاسیان هەبێ. چالاکی سیاسی بنوێنن. لە هەڵبژتردندا بەشدار بن. مەگەر کاری تیرۆریستی بکەن. وەکو میسر ئەویش هەمویان نەء.

لەوەزیاتر، حکومەتە عەلمانیەکانی سەرحوکمو حیزبە موعاریزەکانی عەلمانی، هیچیان لەبەرنامەو دەستوردا دژی ئاینو عەقیدەکان نین، کەچی ئیسلامیە سیاسیەکانی حوکمرانو حوکم کراو، هەر هەموویان دژی عەلمانیەتن. مەگەر بەناچاری لەتورکیاو هیندستاندا، هەتا رادەیەك قبوڵیان بێ. وەکو تر، زۆربەی هەرە زۆری ئیسلامیەکان زۆر دژو دوژمنی عەلمانیەکانن، بەیەکگرتووی ئیسلامیشەوە، کە کاك ئەبوبەکر لەم وتارەدا نەیشاردۆتەوە.

ژیانیش کەمی ڕۆیشتووە، بەڵام هەر زۆر زۆری بەبەرەوە ماوە. دەرئەکەوێ ئەم تەڵەمشکێنەیە لە دوارۆژدا چ لایەك ئەیباتەوە. ئەم کەفو کوڵەی ئیسلامیەکانیش ئەنیشێتەوە، خواستە راستەقینە پێشکەوتوەکان هەر ئەبنەوە چارەی خەڵك.

### - لە ئێستاوە دژایەتی دیموکراسی کردن

(گەر خەباتمان بۆ دیموکراسیو دژایەتی کردنی ئەو هێزانە بووکە ئامادە نین گەل ببێتە سەرچاوەی شەرعیەتی دەسەلاتی سیاسی ئەو کاتە زۆربەی زۆری هێزە کاریگەرەکانی کۆمەڵگا بە ئینتیمای سیاسی جیاوازیانەوە لەسەر بنچینەیەکی پتەوی هاوبەش کۆدەبنەوەو خەباتی هاوکۆیی بۆ ئایندەیەکی گەشو پرشنگدار دەکەنە ستراتیژی کارکردنیان)

بۆ دژایەتی کردنی هەرلایەك ئامادە نەبن گەل ببێتە سەرچاوەی شەرعیەت، هەموو پێکەوە هەقە خەباتی هاوبەش بکەن. بەڵام کاکە ئەبو بەکر دیموکراسی هەر بەو مەرامە ئەزانێ کە بیکاتە ئامرازی هاتنەسەر حوکم. نەك بۆبەدی هێنانی ناوەرۆکی راستەقینەی دیموکراسی کە مرۆڤ تیایدا بونو عەقڵی ئازاد ئەکرێ. ئەمە لە لایەك، لەلایەکی ترەوە، شایەنی باسە بڵێین: خۆ لە کوردستاندا ساڵی (١٩٩٢) دیموکراسی تەواو هەبوو. لە (٩٩٪)گەلیش کە (سەرچاوەیشەرعیەتی دەسەڵاتی سیاسی)یە بەشداریان لە هەڵبژاردنەکە کرد، تەنانەت بزوتنەوەی

ئیسلامی کوردستانیش بەشداری کرد. بەڵام ئەو کاتە (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان) دروست نەبووبوو. باشە، ساڵی (١٩٩٢) دیموکراسی هەبووە. هەڵبژاردن کراوە. سەرچاوەی گەل بۆ دیاری کردنی نوێنەرەکانی گەل نەخراوەتە ژێر فشاری سیاسی و مەزهەبی و رۆحی. جاری دەستورێکی عەلمانیش لە پەرلەماندا دژی ئیسلامی سیاسی پەسەند نەکراوە، دژایەتی ئیسلام و ئیسلامەکان نەک نەکرا، بەڵکو ئیسلامیەکان دژایەتی حکومەتە هەڵبژێردراوەکەیان ئەکردو گەیاندیانە رادەی شەروشۆرِیش. ئەی کەواتە: برایانی یەکگرتوو بۆچی دامەزراوون؟

که هەڵبژاردنی دیموکراسی بوبێ، که دژایەتی ئیسلام نەکرابێ، هێشتا تەواو دەستوری عەلمانی پەسەند نەکرابێ، مزگەوتەکان تەواویان ئاوەدان کرابنەوە و زیادیش کرابن. تەنانەت یەك موسڵمانیش لەسەر ئاینی ئیسلام زیندانی نەکرابێ و نەچەوسابێتەوە، ئەی یەکگرتوو بۆ دامەزرا؟ ئەی بزوتنەوەی راپەرینی ئیسلامی بۆ دامەزرا؟

ئێستاش که دامەزراوون، سەیر ئەوەیە لە سایەی ئەو ئازادیەدا هاتونەتە کایە که شۆڕش و راپەرینی کوردستان بەڕێبەرایەتی عەلمانیەکان هێناویەتە دی کەچی ئەوان دژایەتی عەلمانیەکان ئەکەن.

ئێوە کە دروستبونتان، پاساوی مەزهەبی و سیاسی و ئایدیۆلۆجی نەبێ هاتونەتە سەر ئازادی بەدی هێنراو، ئیتر بە چ هەقێکەوە کەوتونەتە دژایەتی عەلمانیەکان، لەکاتێکدا عەلمانیەکان دژایەتی ئێوەیان نەکردووە، بەڵکو ئازادییان بەخشیوەتە ئێوە. ئەم دژایەتی کردنەتان بۆ عەلمانیەکان لەژێر پەردەی دیموکراسیدا، ئایە کاسەیەکی ژێر کاسەیە؟

بێگومان نەخێر

(والسلام علی من أتبع الهدی)

## ئەنفال و ..

## ئایدیۆلۆژیەتی (بعث) (+)

ئـــەنفال وێنەیـــەک لـــە پەیوەنـــدی کـــوردو ناســـیونالیزمی عـــەرەبی بەرجەستەدەکات, کە دەیەوێت هەموو تەباییەکان و لێکچوونەکان بکاتـەوە بە دژایەتی و دوژمنایەتی..

ئەنفال پرۆژەیەکە بۆ دامەزرانـدنی دوژمنایەتی لەنێوان عـەرەب و کـورددا بەسـەر هـەموو بنـەماکانی کـەلتوورو ئـایین و سیاسـەت. هـەر لێـرەوە وەکـو پرسێکی نەتەوەیی پێویستە خوێندنەوەی قووڵی بۆ ئەنجام بدرێت..

خوێندنـــەوە بـــۆ هـــەموو خواســـتە ســـتراتیژیەکانی ناونـــانی عەمـــەلیاتی بەرفراوانی کوردکوژی لەلایەن بەعسەوە بە ئەنفال.

(۱)

### تراژیدیای ئەنفال

ئەنفال.. دوای روداوەکانی جەنگی دوەمـی جیهـان, گـەورەترین مەرگەسـاتی مرۆڤایەتیە رژێمی عێراق لـە باشوری کوردسـتاندا, دژی گـەلی کوردسـتان سـاڵی (۱۹۸۸ – ۱۹۸۹) ئەنجامیـدا. ئاکـام لـە کوردسـتاندا, (۱۸۲) هـەزار مـرۆڤ , ژن و پیاوو منالّ و لاو, بونە قوربانی رقی خوێناوی بەعسـی عێـراق. بـەڵام بەداخـەوە, ئەم مەرگەساتە تراژیدییە, نەك هەروەکو پێویستە لە کاتی خۆیدا هەڵوێستی رای گشتی نەهەژانـدو کاردانـەوەی لای نەتـەوە یـەکگرتوەکان و, وڵاتـە گـەورەو گچکەکانی رۆژئاواو رۆژهـەڵاتی ئـەم جیهانـە نەخولقانـد, بـەڵکو زۆربـەی وڵاتـانی جیهان, بەتایبەتی سۆڤیەت, چین, کوبا, کۆریا, فەرەنسا, یوگسلافیا, تاد, دوای ئەنفالـەکان و کیمیابـارانی هەڵەبجـەش, هەڵپـەی پەیوەندیـەکی ئـابوری پتـەوترو

---

+ لە ژمارە (۲)ی گۆڤاری (روانگەو رەخنە) لەساڵی (۲۰۰۰)دا بڵاوکراوەتەوە.

سیاسەتێکی بەتینتر بون لەگەڵ رژێمی عێراق. پێمان وایە، ئەم جۆرە سیاسەتەی ئەو رژێمانەو، بێدەنگی هەموو رژێمەکانی تر بەرامبەر مەرگەساتی ئەنفال؛ هەروا، پاساو هێنانەوەی بێجێی زۆربەی وڵاتە عەرەبیەکان*، خۆی لەخۆیدا جۆرێکە لە تاوان یان لە داپۆشینی تاوان. داپۆشینی تاوانیش لە پاسادا، هاوبەشیکردنی تاوانە بەشێوەو شێوازێکی دیکە.

لە دوای راپەرینەوە، دەیان تەن بەڵگەنامەی بەڵگەنەویست لەسەر تاوانەکانی ئەنفال و هەڵەبجە دەست کەوتن. بەشی باشی ئەو بەڵگەنامانە گەیەندراونەتە ئەمریکاو رۆژئاوا؛ لێکۆڵینەوەشیان لەسەر کراوە؛ کەچی ئەو لێکۆڵینەوانە، سەرەڕای ئەوەی لەسەر تاوانەکانی بەعس ساغیشکراونەتەوە، هێشتا وەکو پێویستە بڵاونەکراونەتەوەو نەدراونەتە دادگا نێودەوڵەتی و دەزگاکانی یاسایی و مرۆیی جیهانی.

لەراستیا، وەنەبێ هێزە سیاسیەکانی گەلەکەشمان ئیشی پێویستیان، یان بەرنامەو پرۆژەی کاریگەریان، لەسەر ئەنفال و هەڵەبجە کردبێ. نەخێر. ئەوەی هێزە کوردستانیەکانیش کردویانە، هەر زۆر کەمتر بووە لە قووڵایی مەرگەساتەکە؛ بۆ نموونە، دەوڵەتی کوێیت، لەکاتی داگیرکردنی لەلایەن رژێمی عێراقەوە، هەر زۆر کەمتر لە کارەساتی ئەنفال بەسەر گەلەکەیدا هات. کەچی لەدوای رزگارکردنی کوێیت، بە بەرنامەیەکی چاک و چالاکانە، رژێمی عێراق لەسەر تاوانەکانی دەرهەق بەوڵاتی کوێیت، قانگ داوە. سەرجەم (٦٠٠) دیلیان هەیە، وایان کردووە کە عێراق لە ناوەندە جیهانیەکاندا لەسەر دیلەکان، هەڵوێستی زۆر لاوازبێ، هەرچی زیان و زەرەرێکی گیانی و مادیشیان لێکەوتبێ، فشاریان خستە سەر نەتەوە یەکگرتوەکان و بڕیاری بژاردنی زیان و قوربانیەکانیان پێ دان.

راستە کوێیت وڵاتەو لە نەتەوە یەکگرتوەکانیشە، لەوەش گرنگتر، وڵاتێکی خاوەن نەوتی بە سامانیشە، بەڵام نەوت و سامانیش ئەگەر باش کاریان لەسەر نەکرێ، ئەگەر پرۆژەو بەرنامەی گونجاو دانەنرێ، تەنهاو تەنها بە دەوڵەمەندی لەسەر هیچ روداوێك سەرکەوتن بەدەست نایەت.

گەلی کوردستان، ئەگەر گرفتی ئەوەی هەبوو کە دەوڵەت و یەکێك نەبوو لەدەوڵەتەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان، بەڵام لەدوای کۆتایی جەنگی ساردو

---

* تەنها سوریاو لیبیا دژی ئەنفال و هەڵەبجە ناڕەزاییان دەربڕی.

داگیرکردنی کوێیتو کۆچی گەورەی کوردەوە, کێشەی ئەوەی نەما دەنگی خۆی بگەیەنێتە رای گشتی جیهان. ئەسڵەن رای گشتی جیهان دژی رژێم ووژاو پشتیوانی کوردی بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو کرد. تەنانەت لەناو رای گشتیو میدیاکانی جیهاندا, پشتیوانی کورد زیاتر بوو لە پشتیوانی کوێیت. بگرە کوێیت زۆرتر لەلایەن دەوڵەتانەوە پشتیوانی کرا. کەمتر لە کورد, لەلایەن رای گشتی جیهانەوە, بەهانایەوە هاتن.

(٢)

## مێژووی ئەنفال

هیچ روداوێکی گەورەو گچکە, لەخۆڕا سەرهەڵنادا. بێگومان هەموو روداوێك هۆو هۆکاری هەیە. بەتایبەتی روداوە گەورەو چارەنوسسازەکان هۆی ئابوری, کۆمەلایەتی, ئاینی, فەلسەفیو ئەخلاقیشیان هەن. کاتێك تێکڕا هۆیەکان کارلێك دەکەنو ژینگەی جۆش خواردنیان دەرەخسێ, ئیتر دەبنە زادەی تەقینەوەی روداوی چاوەڕوانو چاوەڕواننەکراو.

ئەنفالیش.. وەکو یەکێك لە گەورەترین روداوەکانی عێراقو کوردستان, لەخۆڕا, سەری هەڵنەهێناوە. هەڵبەتە, پێشەکیەکی ئابوری, سیاسی, کۆمەلایەتیو فەلسەفیی هەبووە. بۆئەوەی بشتوانین ئەم راستییە سەبارەت بەهۆو هۆکاری روداوێکی وەکو ئەنفال, زانستیانە ساغبکەینەوە, وا چاکە ئاوڕێك لە چاوگی وشەی (ئەنفال) بدەینەوە. هەتا لە ژێللاوە, راستیەکان بخەینە روو.

ئەنفال: وشەیەکی سەرومڕ عەرەبیەو بێگومان, پێش داهاتنی ئیسلام, لەناو عەرەبی دەوارنشینو خێڵی کۆچەریو سوارچاکی عەرەبدا, پڕاوە. وشەکە, زۆرتر پەیوەندی بە تێڕوانانی جەنگو جەنگێنو دەستکەوتەکانی جەنگاوەری جەنگەوە, هەیە. وشەیەکە, بۆ ماندانی جەنگاوەر لە جەنگدا , لە رێگەی (هەڵمەتو دەستکەوت)ەوە, رسکاوە. (انفال) لە قورئاندا بۆ حەلاڵ کردنی جەنگی (فتوحات)و کوشتنی خێڵە بە ئیسلام نەبوەکانو ئەقوامی ناعەرەبو دەست بەسەراگرتنی سەروماڵیان, بەکارهاتووە.

(ئەنفال): وشەیەکی عەرەبی کۆیە, چاوگەکەی (نفل)ە. (نفل)یش واتا: دەستکەوت. بەخشین. بەخشینی زۆرتر لە بەشی کەسێك[١]. زۆر ناوداری مێژووی

---

[١] المنجد – الطبعة السابعةءالعشرون ص (٨٢٧و٨٢٨).

ئیسلامیش هەن، لەوانە: ابن الوکیع، محەمەدی کوڕی عەمر، موسەنا، یونسو ئەحمەدی کوڕی ئیسحاق.. تاد)[٢] لە خەڵکانی پێش خۆیانی بە چەند بەرەبابێك دەگێڕنەوە کە (ئەنفال) بریتی بوو لە: کۆیلەی نێرو مێ؛ دیلو کەلوپەل؛ تیرو رم، شمشێر، ئەسپو ماین.. تاد.

هەشن دەڵێن: ئەنفال ئەو دەستکەوتو سامانو سەروماڵەیە کە موسڵمان بە زەبرو هێز لە بتپەرستەکانیان سەندون.

لە قورئانیشدا، ئەنفال سورەتی هەشتەمەو لە دوای شەڕی (بەدر)ەوە، هێنراوەتە ئاراوە. لەسەر سورەتی (ئەنفال)، سەرگوزشتەی جۆراوجۆر هەیە. بۆ نمونە، (عوبادەی کوڕی صمت) لەم بارەوە دەڵێ: (دوای تێکشکانی بتپەرستەکان لە شەڕی (بەدر) دا، هەندێك لە مسوڵمانەکان نیشتنەسەریان، موسڵمانانیش چوار دەوری پێغەمبەریان گرت نەکا هیچی لێبێ؛ بەشێکی دیکەی سوپای موسڵمانان دەستکەوتەکانیان گلێرکردبوەوە.

دوژمنە راونەرەکان کە گەڕانەوە، گوتبویان دەبێ دەستکەوتەکان بۆ ئێمە بێ، چونکە ئێمە دوژمنمان بەزاند[٣]. ئەوانەی پێغەمبەریشیان پاراستبوو، گوتبویان لەبەرئەوەی پێغەمبەرمان پاراستووە، دەستکەوت بە مافی خۆمان دەزانین. ئەوانەی دەستکەوتەکانیشیان دەستکەتبوو، پێیان دادەگرت کە مادام خۆیان دەستکەوتەکانیان کۆکردبوەوە، تەنها مافی خۆیانە بیانبەن.

لەم کەینوبەینەدا لەسەر دەسکەوتو تالانی، ئایەتی یەکەمی سورەتی ئەنفال بەم شێوەیە کێشەکان یەکالا دەکاتەوە: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَنْفَالِ قُلْ الأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ (الأنفال:١)

لێکدانەوەی زانستیانەی وشەی (ئەنفال) لێرەدا دەریدەخا کە جەنگاوەرەکانی بەرایی سوپای ئیسلامو لەشکرکێشیان بۆ ناوچەکانی ناوەوەو دەرەوەی دوورگەی عەرەب، چەند بە تەماحی (سەروماڵ) هەڵمەتیان بردووە هەتا (دەستکەوت) یان دەستبکەوێ. تەنانەت بە خودی پێغەمبەر (د.خ)

---

[٢] جامع البيان عن تأويل أي القران – تاليف أبي جعفر محمد بن جرير الطبري المتوفي سنة ٣١٠ ه – الجزء التاسع الطبعة الثانية ١٣٧٣ ه – ١٩٥٤ م شركاء مطبعة مصطفى البابي الجلبي ص ١٧١ء مابعدها.

[٣] الجامع لأحكام القران – لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصارى القرطبي – المجلد الرابع – دار احياء التراث العربي – بيروت، لبنان، ١٩٦٥.

چارەسەرنەکراوە, بە پشت بەستن بە سورەتی قورئان توانیویەتی کێشەکانی دەستکەوت ببڕێنێتەوە. واتە: هەڵەیەکی گەورەیە وابزانرێ سەرەتای شەڕەکانی سوپاو جەنگاوەرەکانی لەشکری ئیسلام, بۆ دەرەوەی روبەری یەکەمین قەڵمڕەوی ناو دورگەی عەرەب, تەنهاوتەنها لەبەرئەوە بوبێ کە ئاینی ئیسلام کودەتایەکی ئاینی, مەزهەبی, فەلسەفیی‌و عەقیدەیی سەرکەوتوو بوبێ بەسەر ئاین, مەزهەب, عەقیدەو فەلسەفەکانی تری ئەو زەمان‌و زەمینەیەی بەشەریەت؛ هەر لەبەرئەمەش گوایە, بە هاتنی ئیسلام, مرۆڤ لە حاڵەتی کوێرەوەریەوە گۆڕدراوە بۆ حاڵەتی شارستانیەتی ئیسلامی, بۆیە, موسڵمان راپەڕیوەو ئەو هەموو سەرکەوتنانەی لەبەرامبەر ئەقوامی دەرەوەی قەڵمڕەوی عەرەب هێناوەتەدی. بۆچونی ئاوا, نە ئەوساو نە ئێستاش, زانستی نەبوەو بۆ بەرایی‌و مێژووی دەسەڵاتی ئیسلام پیاهەڵدان‌و پێ‌لێ‌هەڵبڕینی تیایە.

ئەگەر مەسەلەکان, تەنهاو تەنها مەسەلەی ئیسلامی‌و رۆحی‌و سەرکەوتنی لۆژیکەکانی ئیسلام بوایە بەسەر ئاین‌و باوەڕە باوەکانی سەردەمی خۆیدا؛ ئەگەر هیچ گرفت‌و کێشەیەکی راستەقینە رێگری سەرخستنی لۆژیکی ئیسلام نەبوایە؛ ئەگەر پەرەسەندنی ئیسلام‌و بڵاوکردنەوەی ئاوەها ئاسان‌و ئاسایی بوایە, نە پێویستی بە لەشکرکێشی دەکردو کە لەشکرکێش کراوە, پێویستی بەو شەرعیەتەی قورئان‌و شەرعی ئیسلام نەدەکرد کە بە کرۆکی ئەنفال, سوپای ئیسلام هانبدەن بۆ (فتوحات)و لە (فتوحات)یشدا, پاساو بۆ ئەو هەموو کوشت‌و کوشتار، تاڵان‌و بڕۆ، کەنیزەك‌و غولام فڕاندنە, نەدەهێنرایەوە. ئەوانە, جگە لەوەی پێش ئیسلام‌و دوای ئیسلام, تەنانەت بۆ سەدەی نۆزدەهەمیش, تاڵان‌و رێگری‌و هەڵمەت بردنەسەر قافڵەو کاروانی بازرگانی, لەناو خێڵە دەوارنشینە عەرەبەکاندا, هەر هەبووە. ئەمە راستیەکی مێژووییە کە پێغەمبەر (د.خ)باش زانیویەتی‌و قورئانیش جوانی لە سورەتی (ئەنفال) دا, بەرجەستەی کردووە. هەربۆیە, بەهۆی (ئەنفال)ەوە, هەڵمەت‌و هێرشی سوپای ئیسلام فراوانتر بوو. لەبەر کوشتار، تاڵان، فڕاندنی ئافرەت، غولامی میللەتان‌و خێڵەکانی ناوخۆی عەرەب, نەك لە بەرایی ئیسلامدا, بەڵکو چەندین دەهە دوای ئەوەش, بەرەنگاری لەناو ئەقوام‌و خێڵەکانی ئەو سەردەمە لەبەرامبەر سوپای ئیسلام, زۆر هەبووە. بەتایبەتی لەناو ئێرانیەکان, مەسیحیەکان, کوردەکان, هەروا لە ئۆروپاو باقی مەڵبەندەکانی تری جیهاندا. ئەمە جگە لەوەی پاشانیش, لە سەردەمی عەباسی‌و

ئەمەویەکانیشدا, کێشەی گەورە لەنێوان دەسەڵاتدارانو ئەقوامی ژێردەستەدا, رویداوە.

پێمان وایە, ئەگەر (ئەنفال)و نەخشە ئابوریەکانی تری ئیسلام، لە زەکاتو باج سەپاندن نەبوایە, سوپای پەلاماردەری ئیسلام تەنها لەبەر مەسەلە رۆحیو ئایینیەکان, لەو هەموو هێرشو پەلاماردانانەدا, سەرنەدەکەوت.

## (٣)
## بەعسو مێژووی ئیسلام

یەکێك لە دروشمە بنچینەییەکانی بەعس, کە بە درێژایی مێژووی دامەزراندنی بەرزی کردۆتەوە (أمة عربية واحدة — ذات رسالة خالدة — نەتەوەی یەکگرتوی عەرەب — خاوەن پەیامێکی نەمر)ە. ئەم دروشمە, کە سەردەقی دروشمەکانی حیزبی بەعسە, هەرچی چۆنی لێك بدرێتەوە, بیروڕای تەسکی ناسیۆنالیستی لێدادەچۆڕێ. لەلایەکەوە, بیری نەژادپەرستی عەرەب بەو دروشمە بەهێزدەکا؛ لەلایەکی دیکەوە, ئیسلام دەکاتە پەیامی پیرۆزی عەرەبو میللەتانی دیکەش دەکاتە ملکەچی ئەو پەیامە. ئەمە لەکاتێکدا, بەدرێژایی مێژوو، عەرەب نەتەوەیەکی یەکگرتووی خاوەن دەوڵەتێکی دڵخوازی یەکگرتووی عەرەبی نەبووە. ئیسلامیش, ئەگەر بە زەبری لەشکرکێشی نەبوایە, تەنانەت لەناو تەواوی عەرەب خۆیدا, بڵاونەدەبویەوە. سەرەڕای ئەوەی بە زەبری سوپاش ئیسلام بڵاوکراوەتەوە, ئینجا چەندین میللەت هەن نەژادو زمانو قەبارەی خۆیان پاراستووە. لەکۆنەوە هەتا ئێستا, ناکۆکیو کەلێنێکی شارستانی, کولتوری, کەلەپوری, زمانەوانی,و هەستی ناسیۆنالیستی گەورە لەنێوان عەرەبو ئەو میللەتانەدا, هەبوەو هەیە.

حیزبی بەعس, لە جیهانبینیەکی تەسکەوە سەیری مێژوی عەرەبو میللەتانی تر, هەروا سەیری ئیسلامو ئاینو مەزهەبەکانی تر, دەکا. هەربۆیە ئەو دروشمەی بەرزکردۆتەوە. دەنا یەکگرتنی هەموو نەتەوەیەك مافی رەوای دیموکراسییە. بەڵام نەك لەسەر حسابی نەتەوەو گەلانی دیکە.

بەعس.. پێی وایە لە بەرایی ئیسلامەوە, هەر قەومێك بەرەنگاری لە خۆی کردبێ, یان بە خواهشت سوپای ئیسلامی پێشوازی نەکردبێ, یاوەکو شارستانیەت, مێژوو, زمان, کولتورو باوەڕەکانی خۆی پاراستبێ, ئەو میللەتانە

ئێکرا بەعس بە (شعوبی) یان دەزانێ. (شعوبی!) ش خراپترین ناتۆرەی بەعسە کە دەیداتە پاڵ ئەو میللەتانەی لە بەرامبەر شاڵاوی شۆڤێنیستانەی عەرەب لە بەرایی ئیسلامەوە هەتا ئێستا، خۆیان پاراستووە. بەعس ریزەکانی خۆیو سوپای عێراقو لایەنگرانی لەناو نەتەوەی عەرەبدا، بە رقێکی ئەستور بەرامبەر (شعوبی)ەت، پەروەردە کردوەو دەکا. بەعس ئاوا (شعوبیەت) لێك دەداتەوە: ((بزوتنەوەی گەلانی ناعەرەبە. هەوڵیدا لە شارستانیەتو دەوڵەتی نەتەوەی عەرەب، بدا، ململانێیەکی شارستانیو روناکبیریو ئاینی فراوانی ئاشکراکرد. کەوابێ، بزوتنەوەی دەستەیەکی دیاریکراو یان چینێکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو ەوڵێکە خەڵکی جیا جیا بۆ پەرچدانەوەی کولتوری هەڵچوی عەرەب داویانە، ەمەش، هەڵوێستێکی رەگەزپەرستانەیان دژی نەتەوەی عەرەبو شارستانیەتو کولتورەکەی پێکهێناوە)).

هەر بەعس پێیان وایە گوایە: ((سەرەڕای ئەوەی شعوبیەت لە شوێنی جیاجیای نیشتمانی عەرەبو ئەندەلوسدا، چالاك بووە، بەڵام بێگومان چڕتر ەعێراقدا چالاکتر بووە، ئێرانیشی کردۆتە بنەمای ئاراستەو جموجوڵو اخیبوونە ئاشکراکانی))[٤]. ئەوە سیاسەتو باوەڕی مێژوویی بەعسە لە عێراقو اوچەکەدا بەرامبەر گەلان.

جگە لە ئاینی ئیسلامی، لە سەرهەڵدانی ئیسلامەوە هەتا ئێستا، هەموو اینو باوەڕێکی دیکەی ناو فارس، کورد، ئازەریو تەواوی میللەتانی تر لە ێژوودا، بە (مەجوسیەت)و (زیندیقیەت) ناوزەدکردووە. ئەمەشی کردۆتە ەقیدەی ئیسلامی بەرامبەر هەموو ئاینو باوەڕێکی تر، کە پێش یان پاش یسلام، هەبوون. ئەمە لەکاتێکدا، هەر لەبەر بیری تەسکی ناسیۆنالیستی ەرەبی خۆیان، لەم جۆرە تومەتەی (زندقیەت)و (مەجوسیەت) نادەنە پاڵ اوەڕو ئەفسانەو عەقیدەکانی سۆمەریەکان، یان بابلیەکان، یاوەکو ەرعونیەکان. لەبەرئەوەی ئەمانە پێش ئیسلام لەسەر زەمینی ئێستای وڵاتە ەرەبیەکاندا، بون.

---

المنهاج الثقافي المركزي / صفحة (٢٨٦) حزب البعث العربي الاشتراكي / القيادة القومية/ مكتب الثقافةءالاعلام الكتاب الاول (الخاص بالمؤيدين) ١٩٩٠.

ئاشکراشە کە هەرچی چۆنێك ئایینێکی وەکو زەردەشتیەت لەگەڵ ئەو ئاینانەدا بەراورد بکرێ, لە زۆر رووەوە قابیلی بەراوردکردنیش نین. زەردەشتیەت لەباری ریفۆرم، روانینی بۆ مرۆڤ ، ئافرەتو دادپەروەریەوە, بەپێی پێوانەکانی زەمانو زەمینەی خۆیان, پێشکەوتوتر بووە لەوان.

(٤)

## ئۆباڵی ئەنفال

شۆڕبونەوە بە باوەڕی مێژوویی بەعس لەمەڕ عەرەبو ئیسلامو ئامادەیی ئەو باوەڕە، لە بەرنامەو ئایدیۆلۆژیەتی ئێستای بەعسدا, ئاخۆ چ ئاکامێکمان بداتە دەست؟

- ئایە دەشێ؛ حیزبێك باوەڕی نەتەوەیی ئاواو بڕوای ئایینیشی بەوشێوەیە بێ, چاوەڕێی رێبازو خزمەتی دیموکراسی لێبکرێ؟
- ئایە دەشێ؛ خوێندنەوەی مێژوو لە پێکهاتەی ئایدیۆلۆژیدا، دابڕدرێ لە بەرنامەو نەخشە ی ئێستاو ئایندەی حیزبێك؟
- ئایە دەشێ؛ پەروەردەی مێژوویی حیزبێك بەو رقە بێ, بەڵام هەڵسوڕانی ئێستای ئارامو هێمن بێ؟
- ئایە دەشێ؛ حیزبێك بەو باوەڕو بڕوا نەتەوەیی‌و ئیسلامیەوە, دەوڵەتێکی وەکو عێراقو سوپایەکی بکەوێتە دەست, بیانخاتە خزمەتی مرۆڤایەتیو پشتیوانی چارەنوسی گەلانەوە؟

ئەو پرسیارانەو پرسیارگەلێکی دیکە, هەرچی چۆنی تاوتوێ بکرێت ئەمسەروئەوسەریان لێك بدرێتەوە, ئەنجامێکی ترسناك ساغ دەکەنەوە. ئەویش دوپاتکردنەوەی خەتەرناکتری تاوانەکانی داگیرکردن، تاڵان بردن، کوشتن مەرگەسات دەرهەق بە گەلانو بە هەموو ئازادیو دیموکراتخوازێك.

هەڵەیەکی گەورەیە هەبن وابزانن تاوانی مەرگەساتی ئەنفال, یان کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو ناوچەکانی تری کوردستان, لەبەر ئێران یان کاردانەوەی بێبەرامبەر دۆستایەتیکردنی ئێران لەکاتی شەڕی (عێراق — ئێران) دا. ئەمە بۆچونێکی زۆر ناڕاستە. تەنانەت هەندێ لایەن کەوا دەڵێین, رەچاوی بنەچەی بەعسیان نەکردووە. بەڵکو وەکو کاردانەوەی سیاسی بەرامبەر بیروڕای جیاواز هێزی جیاواز, هەن وا دەڵێن. ئەگینا بەعسێك کە وتەزای مێژوویی ئاوابێ

بەرنامەکەی رۆشن بێ؛ سیاسەتەکانی ئاشکرابێ، ئیتر چ پێویست دەکا لەبەرامبەر مەرگەساتی وەکو ئەنفال دا، پەل و پۆی لێکدانەوەی بێ بناغەی زانستی بهاوێژرێ.

بۆ نموونە.. ئەگەر ئەو گریمانە بە راست بزانرێ کە گوایە لەبەر جەنگی (عێراق – ئێران)و سەرەنجامەکانی، رژێمی عێراق تاوانی ئەنفالی ئەنجامدابێ، ئەدی هەقە بپرسین: لە راپەڕیندا، خەڵکی باشوری عێراق و ناوچە شیعە نشین و پەرستگاکانی (عباس)و (ابو الفضل) ی کەربەلاو نەجەف، چ رێوانیەکیان (دلیل) بۆ سوپای ئێران کردبوو، کە بەو شێوەیە قەتلوعامی کردن؟

ئەی کوێیت.. چ گوناهێکیان هەبوو ئاوا پەلاماردران و کرانە پەندی (امة عربية واحدة – ذات رسالة خالدة) ئەگەر کورد لەبەرئەوەی کوردە، لەبەرئەوەی زمان و کولتورو جلوبەرگی جیاوازە، خۆ کوێیتیەکان و راپەڕیوانی خوارووی عێراق، عەرەب بون. خۆ ئیسلامی راستەقینەش بون. خۆ دشداشەیان لەبەرو عەگاڵیشیان لەسەر بوو. ئەدی بۆچی ئەو کارەساتانەی بەسەردا هێنان؟

کرۆکی مەسەلەکە ئەوەیە کە حیزبی بەعسی دەسەڵاتدار، رەگی فەلسەفەی خۆی لە سەروەرێتی نەتەوەی عەرەب و سەردارێتی ئیسلام و باڵادەستێتی سەرکردایەتی خۆیدا، بەسەر هەموو میللەتانی دونیای عەرەب و لەناو هەموو هێزەکانی عەرەب و کوردو میللەتانی ناوچەکەدا، دەبینێ، بۆیە، بەو رقەی بەرامبەر (شعوبیەت)و (مەجوسیەت)و (زندیقیەت) هەیەتی، کە مەبەستی گەلان و باوەڕەکانی ترە، هەر ئەو رقەی ئاوێتەی ئایدیۆلۆژیەتی مەزنخوازی و دەسەڵاتدارێتی و ئامانجە دورونزیکەکانی بەعس کردووە؛ ئەمەش وای کردووە کە بەعس هاتە سەرکار، کار بۆ سەپاندنی ئەو ئامانجانەی بکا کە لە ئاوێنەی باوەڕەکانی مێژووی عەرەب و ئیسلام دا، رەنگیداوەتەوە. بە هاتنەسەر حوکم لە عێراقدا، بەعس ساڵی (١٩٦٣) بە تیرۆرو کوشت و کوشتار کەوتەکار، بەڵام دوای ساڵێك شکستی خوارد. بۆیە، ساڵی (١٩٦٨) کە هاتەوە سەر حوکم، سەرەتا نەرم جوڵا، هەتا وردەوردە لە روی ئابوریەوە خۆی گرت و لە رووی سیاسیشەوە سەقامگیر بوو، پەیوەندی ناوچەیی و نێونەتەوەییەکانی خۆی قایم کرد. لە رووی عەسکەریەوە خۆی بە چەشنێ تۆکمە کرد کە ساڵی (١٩٦٨) کودەتای کرد، لەناو تەواوی دەزگاکانی سەربازی عێراقدا (١٠٠–١٥٠) ئەندامیان هەبووە. بەڵام ساڵی (١٩٧٦) ئاماری ئەندامانیان گەیشتۆتە (١٠٠٠و١٠) دە هەزارو لایەنگرانیان

گەیشتۆتە (٠٠٠و٥٠٠) پێنج سەد هەزار. سەیر ئەوەیە ساڵی (١٩٨١) ئەندامانیان (١٥) هەزار زیادی کردووەو سەرجەم بە لایەنگرانیانەوە, بونەتە (٠٠٠و٥٠٠و١) ملیۆنو نیویێك کەس. ئەم ژمارەیەش کاتێك باوەڕی پێدەکرێ کە بزانرێ عێراق ساڵی (١٩٨١) (٢٤) ملیار دۆلار داهاتی بووە, کەچی (١و١٥) ملیاری خەرجی بەرنامەی سەربازی کردووە. واتە: لە (١٤٥٪) ی داهاتی عێراق لە ڕێژەی داهاتی نەوت, بۆ داوودەزگا سەربازیەکانی عێراق سەرف کراوە*.

لە هەموو رویەکەوە رژێمی بەعس لە خۆی راپەرمووە بکەوێتە سەپاندنی مەرامەکانی, بەتایبەتی لەرووی عەسکەریەوە, ئینجا نەخشەکانی جێبەجێکرد. ئیدی لەساڵی (١٩٧٠)ەوە, لە کوردستاندا, بەتایبەتی لە کەرکوك، ژەنگار, خانەقین, ناو فەیلیەکان, جەلەولاو مەندەلی, عین زالەو.. تاد دەستیپێکرد. بەرە بەرە سیاسەتی تەعریبو تەبعیسو هەروا, تەهجیریش, کرانە پێناوی نەگۆڕی رژێمی عێراق.

لە دوای ساڵی (١٩٧٥)ەوە, کە توانیان شۆڕشی کوردستان دابمرکێننو سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانیش بەرەنگاری نەکرد, ئیتر لەوەبەدواوە, مەرامی شۆڤێنیەتی رژێم زۆر ئاشکرا بوو. واتە:

لەدوای (٦/ی ئازاری/ ١٩٧٥) کە رێکەوتننامەی جەزائیر لەنێوان (سەدام – شا) دا, مۆرکرا, کە شۆڕشی کوردستان نەمابوو. دەیان هەزار کورد بە لێشاو تەسلیم دەبونەوە. (بارزانی) رایگەیاند چیکە هەقی بەسەر شۆڕشەوە نەماوەو پارتی دیموکراتی کوردستانیش بڵاوەیان لێکرد؛ یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش هێشتا دانەمەزرابوو؛ هیچ هێزێکی تری کوردستانی ئاڵای بەرەنگاری بەرزنەکردبووەوە, هیچ مەترسیەك لەسەر رژێم نەمابوو, سەرەڕای ئەمەش, دەست بەجێ رژێم کەوتە تەهجیرو تەعریبی دێهاتو شارۆچکەکانی کوردستان. هەر ئەمەش وایکرد, دوای دوو مانگ, کۆتایی مانگی (٥) ی ساڵی (١٩٧٥) پەلە لە دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بکرێ, یەك ساڵیش دوای دامەزراندن, شۆڕش بەرپا بکرێتەوە.

---

* بۆ سەرژمێرەکان بڕوانە لاپەڕە (٢٣٢)و (٢٤٠) لە کتێبی (الدولة, المجتمع المدنيءالتحول الديمقراطي في العراق / فالح عبدالجبار). اصدارات مرکز ابن خلدون بالاشتراك مع دار الامين للنشروالتوزيع.

## (٥)
## ئەنفالو .. روداوە نوێکان

کە شۆڕشی کوردستان بەرپاکرایەوە, هەموو هێزە کوردستانیەکان بە راگرتنی سیاسەتی تەهجیرو تەعریبو تەبعیس, رازی بوون گفتوگۆ بکەنو شەڕ رابگرن. رژێم بەمەش رازی نەبوو. بەڵکو سورتر بوو لەسەر نەخشە شۆڤێنیەکانی. لە ماوەی (١٩٧٥) بۆ ساڵی (١٩٨٠) پێش بەرپابونی جەنگی (عێراق – ئێران) رژێم تەواوی دێهاتی خانەقینو ژەنگارو مەندەلیو نەفەتخانەو دەوروبەری کەرکوکی لە کورد بەتاڵ کردو, لە شوێنی کورد, عەرەبی نیشتەجێکرد. جگە لەوەی بە دەیان ئۆردوگای زۆرەملێی بۆ کۆکردنەوەی جوتیاران, دروستکرد. ئەمە لەکاتێکدا شۆڕشی کوردستان هەتا ئەوکاتە نەك هیچ مەترسیەکی بۆ سەر رژێم نەبوو, بەڵکو ئامادەی هەموو جۆرە گفتوگۆیەکیش, هەتا رادەی رێککەوتن لەسەر لایەنی کەمی مافەکانی کورد, بوو. نەك لایەنێك بەڵکو هەموو لایەنەکانی ناو شۆڕشەکەش ئامادەبون. بەلام رژێم لەبەرئەوەی مەرامو بەرنامەی تواندنەوەی بوونی کوردی هەبوو, بۆیە بە دەستکەوتی نیوەچڵیش ئامادەی رێکەوتن نەبوو لەگەڵ شۆڕشی کوردستاندا.

کە جەنگیشی دژی ئێران هەلایساند, بە هەموو حوکمێك دەبوو لەگەڵ شۆڕشی کوردستاندا رێك بکەوێ, بەلام لە مانۆڕی گفتوگۆ بەولاوە (کە بەعس ناوبانگی لە مانۆڕو تاکتیکدا هەیە) ئامادەی هیچی دیکە نەبوو. چونکە دەیزانی رێکەوتنی سیاسی کێشەی سیاسی کورد بایەخدار دەکا. بۆیە, جگەلەوەی ناوبەناو لەژێرەوە, ئاشکراش ساڵی (١٩٨٤) گفتوگۆی دەکرد. بەلام رێکەوتنی نۆرنەکرد. لە پەناشەوە, سەرقاڵی نەخشەو مەرامەکانی بوو.

لە گفتو گۆی ساڵی (١٩٧٤) دا, لە دوا چاوپێکەوتنی (ئیدریس بارزانی) رەحمەتیدا, (سەدام حسێن) گوتبووی: رێك بکەوین باشە. ئەگینا ئەوەی چاوەڕوانی ناکەن دێتەدیو هیچیشتان دەست ناکەوێ. ئەمە هەڕەشەیەکی دیلۆماسی بووە. بەلام تومەزە هەر ئەوکاتە رێکەوتننامەیەکی وەکو جەزائیر لەمێشکی (سەدام) دا بووە. کە لە شەڕو شۆڕشدا دەرەقەتی کورد نەهات, سازشی لەگەڵ رژێمی شادا کردو دەستی لە بەشێکی زێی عەرەبو سنورێکی ئاشی عێراق بۆ ئێران هەڵگرت, تەنها بۆئەوەی شۆڕشی کوردستان بفەوتێنێ.

واتە: رقی لە کورد زیاتر لە رژێمی (شا) بووە. ئامادە بووە (شا) رازی بکا، بەڵام ئامادە نەبوو کورد رازی بکا!

کە ئاگری شەڕی (عێراق – ئێران) یش گەرم داهات، لە مفاوەزاتی (١٩٨٤) دا، دوای (١٠) ساڵ لەو کۆبونەوەیەی (سەدام) لەگەڵ ئیدریسدا، دیسان (سەدام) بەوەفدی وتوێژکەری یەکێتی نیشتمانی کوردستانی گوت: (کاتی خۆی ساڵی ١٩٧٤ بە ئیدریسم گوت، رێك بکەوین باشە، ئەگینا ئەوەی ئێستا دەستتان دەکەوێ، دوای شەڕ دەستتان ناکەوێ. بە ئێوەش دەڵێمەوە؛ رێك بکەوین باشە، ئەگینا سەرەنجامی باشترتان لە بزوتنەوەی مەلا مستەفا دەست ناکەوێ)*.

ئەگەر بۆ شۆڕشی ئەیلول‌و بارزانی، رێکەوتننامەی جەزائیر لە ژێرسەری سەرانی عێراقدا بوبێ. دەزکەوت بۆ شۆڕشی نوێ‌و (ی.ن.ك)، کیمیاباران‌و ئەنفالی بەدەستەوە بووە.

ئەم نمونانە، (١٩٧٤) لەگەڵ شۆڕشی ئەیلول، (١٩٨٤) لەگەڵ شۆڕشی نوێ. پاشان، لە دوای راپەڕینیش لەگەڵ (بەرەی کوردستانی)، هەتا ئەم رۆژگارەش، سەرەڕای کێشەکانی ناوخۆو دەرەوەی رژێم، هەر هەمووی دەریدەخەن کە بەعس، بە حوکمی باوەڕی ناسیۆنالیستی‌و بڕوای ئیسلامی‌و رێبازی ئایدۆلۆژیی، ئامادەیە لەگەڵ هەموو رژێمێك رێك بکەوێ، هەموو چەکێك بەکاربهێنێ، ئەنفال بکا، بەڵام ئامادە نییە جگە لە نەخشەی خۆی هیچ جۆرە مافێکی دیموکراسی بە گەلی کوردستان، رەوا ببینێ. ئەمەش ناسنامەی راستەقینەی ئایدیۆلۆژیەتی بەعسی عێراقە. بۆیە، هەڵەیەکی گەورەیە، تراژیدیای ئەنفال، جگە لەوەی بەشێوەیەکی سەرەکی زادەی گەوهەری ئایدیۆلۆژیەتی بەعسە، بە هیچی دیکە بزانرێ. ئەگەر فاکتەرێکی جەنگی، یان سیاسیش رۆڵیان لە رووداوەکاندا گێڕابێ، هەر لە رێگەی گەوهەری بەعسەوە فاکتەرەکان کاریگەریان هەبووە.

بۆیە.. یەکەمین حوکم لەسەر بەعس ئەگەر بدرێ‌و مەحکەمەی راستەقینەی بەعس، ئەگەر بکرێ، هەقوایە لەسەر گەوهەری ئایدیۆلۆژی بەعس پێ دابگیرێ. پاشان لەسەر چۆنیەتی ئەنجامدانی نەخشەو بڕیاردەرانی نەخشەکان.

---

* خۆم لەوەفدەکەدا بومو گوێم لەو قسانە بوو.

دەسەڵاتو حیزبێك، گەر هەتا مۆخی نوقمی دوژمنایەتی گەلێکی دیکە نەبێ، گەر سوپاو خەڵکی خۆی بە ئەقڵیەتی جینۆساید، لە باری نەتەوەیی، سیاسی، فەلسەفیی و رۆحیەوە، گۆش نەکردبێ و نەشزانێ سیاسەتی جینۆسایدی لەسەر هەموو ئاستەکاندا، بۆ دەچێتەسەر، هەرگیز زاتی جێبەجێکردنی نەخشەی وەکو ئەنفالەکانی نابێ. باشترین بەڵگەش، ئەوەیە کە دوای داگیرکردنی کوێیت،و پەلاماری ئەمریکاو دەوڵەتانی دیکە، بۆ سەر سوپای عێراق، خۆ عێراق ئەو چەکە کوشندانەی هەبوو کە لە کوردستانو دژی ئێران بەکاریدەهێنانو دەشیزانی قەدەغەن، بەڵام لەبەرئەوەی ئەمریکاو رۆژئاوا لە جەنگی دووەمی کەنداودا دابەزیبوونە مەیدان، ئەوانیش چەکی کوشندەتریان هەبوو، بۆیە هەر نەیوێرا توخنی دەبۆی چەکی کیمیاوی و کوشندەی تر بکەوێ. چ جای بەکاریان بهێنێ. بەڵام بەرامبەر بەکورد بەئاسانی بەکاریهێنان. چونکە گەلی کوردستان بەبێکەسو دەوڵەتانی دونیاش بەپشتیوانی خۆی دەزانێ.

ئێستاش، دوای تێپەربونی چەندین تاقیکردنەوە، لەساڵی (١٩٧٥)ەوە بۆ ئەمساڵ (٢٠٠٠-٢٠٠١)، دوای ئەو هەموو تاوانە لە کوردستانو ناوچەکەشدا، دەپرسین: ئایە رژێم دەرسی لە رابوردوو وەرگرتووە؟ ئایە دەستی لە سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی هەڵگرتووە؟ هەڵبەتە نەخێر. رۆژانە، دەرکردنی خێزانی کورد لە ناوچە هێشتا رزگارنەکراوەکانی کوردستان، بەردەوام سەپاندنی تەعریبو تەهجیرو تەبعیس، هێنانی عەرەبو بە زۆرەملێ نیشتەجێکردنیان لە کوردستاندا، ئەمانەو سەدان رووداوی ناڵەباری دیکە، سەرجەمیان دەیسەلمێنن کە رژێم، گەوهەری نەگۆڕاوە. ئایدیۆلۆژیەتی وەکو خۆیەتی. ئێستاش بۆی بلوێ بەشێوەو شێوازی دیکە، ئەنفالو ئەنفالی دیکە، دوپاتو چەند پات دەکاتەوە.

جیهان بگۆڕێ یان نەگۆڕێ. رووداوەکان بگۆڕێنو نەگۆڕێن. بەرنامەی پاکتاوی رەگەزی بەعس، نەگۆڕەو نەگۆڕ. ئەم بەرنامە نەگۆڕەی ئێستا، رەگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ رابوردوو. بۆ مێژووی کۆن. بۆ بەرنامەی مێژوویی ناسیۆنالیستی بیر تەسکی عەرەب. بۆ ستراتیژی بەعس. بۆ: (أمة عربية واحدة – ذات رسالة خالدة)ی بەعسی عێراق.

## دیالۆگی ئەقڵی ئازادو
## داوەرییەکی سەلەفیانە [+]

ڕۆژی هەینی (٢٠ / ٩ / ٢٠٠٢) لە ژمارە (٤٠٦) ی ڕۆژنامەی یەکگرتوو، زمانحاڵی یەکگرتووی ئیسلامی، لەلاپەڕەی (ڕامیاری)و لە ستونی (تیشك) دا کاك (ئەبوبەکر عەلی)، لەسەر مونازەرەیەکی مامۆستا (ڕەئوف محەمەد)و بەندە، شەوی (١١|١٠ / ٩ / ٢٠٠٢) ی بەرنامەی (گفتوگۆی سێشەممە)ی تازەداهێنراوی کاکە (توانا ئەحمەد) ستونێکی درێژی لەژێر ناونیشانی (پاشماوەکانی ئەقڵیەتی دادگاییکردن لەسەردەمی ئاشتبوونەوەی نیشتمانیدا) نوسیووەو تیایدا، بیروبۆچونی خۆی لەسەر مونازەرەکە، دەربڕیووە. بەڵام دەربڕینێکی ئەوتۆ، مەگەر هەر لە نوسەرێکی ئیسلامگەرا بوەشێتەوە، بوێرێ، ڕاستیەکان ئاوا بشێوێنێ، جا بۆئەوەی ئەو ڕاستیانەی شێواندونی، بەشێواوی نەمێننەوە، پێمان باشبوو وەڵامی بدەینەوە.

### (١)
### کام ئەقلیەتو چ دادگاییکردنێك ؟!

هەر بیرمەندێکی هوشیار بەرنامەکەی دیبێ، دەزانێ تەوەری مونازەرەکە لەسەر ڕوداوی (١١)ی سپتامبەر بوو. کاتێك بەرنامەیەکیش، دوو کەسایەتی لە دوو حیزبی جیاواز دەهێنێتە سەر شاشەی تەلەفزیۆن، مەبەستێتی دوو بۆچونی هەردوو کەسایەتیەکە، لە دوو ڕوانگەی جیاوازەوە، پێشکەش بکا. کەوابێ: شتێکی زۆر ئاساییە هەر لایەك هەوڵبدا ڕاستی بۆچونی خۆی دەربخا، هەروا، لەناو بازنەی ململانێ سیاسیەکانی ئێستای گۆڕەپانەکەشدا، هەرلایەك هەوڵبدا، هەڵە، یان کەموکورتی لایەنەکەی بەرامبەر دەربخا. ئەوەی لایەنی کەمی تێگەیشتنی لە ڕێسای دیالۆگ هەبێ، لەم مەسەلە تێدەگا. ئەوەی شارەزایی یان زانیاریشی لەسەر ئەم چەشنە مونازەرانە نەبێ، بێگومان، مونازەرەیەکی ئاوا

---

[+] لەگۆڤاری (ڕوانگەو ڕەخنە) ژمارە (٨) لەساڵی (٢٠٠٣) دا بڵاوکراوەتەوە.

بە(پاشماوەی ئەقڵیـەتی دادگـاییکردن) دەزانـێ. بۆئـەوەی نوسـەرو خوێنـەر لـە مونـازەرە وردتـر بـن‌و باشـتر لـەوە شـارەزا بـن کـە بۆچـی مونـازەرە دەکرێتـە (ئەقڵیەتی دادگاییکردن)،وا چاکە لە خودی ناونیشانەکەوە, وەڵام بدەینەوە.

پێش هەموو شتێك, پێویستە بۆ خوێنەری رونبکەینەوە کەوا (لێپرسراوێکی)، (لایەنێکی سیاسی بەرامبەر — کە منم — هەروەکو نوسەر گوتویەتی) دورونزیك, ئاگام لە تەوەری گفتوگۆکان نەبووە: نەشم زانیووە کاکە (توانا) چـی دەپرسـێ‌و چی ناپرسـێ, تەنانـەت بەیانیەکـەی کـە بـۆ شـەو بەرنامەکـە پێشکەش دەکرا, بەتەلەفۆن لێم پرسی: تـەوەرەکان لەسـەر چـین؟ لەوەڵامـدا هـەر هێنـدەی گـوت کەوا: تۆ پێویستیت بە زانینی تەوەر نییە. من لای خۆمەوە ئـەم وەڵامـەم وا بـۆ لێکدایەوە کە وەکو رۆژنامەنوسـێك, وای پـێ‌باشـە لـەپڕ پرسـیارمان لێبکـا هـەتا بەرنامەکەی بەچێژتر بێ. کەوابێ: ئەم بەرنامەیە, بـۆ مـن (لێپرسـراوێکی لایـەنی سیاسی بەرامبەر)یش, هەروەکو کەسێکی داوەت کراوی ئاسایی حساب دەکـرێ. نەك بەرنامەیەکی پێشتر نەخشەبۆکێشراو. راستی‌و ناڕاستی ئـەم قـسانەش کـاك (توانا)و ئامادەکارانی بەرنامەکە دەیزانن.

( ٢ )

## مونـازەرە چی یە؟

وشەی (نَظَـر)و (نـاظَر)و (منـاظَرَة)و (تَنـاظَرَة) ئـەم وشـانە, کـە چـاوگەکەیان (نَظَـر) هـەر هـەموو (دیقـەت)و (چـاوتێبڕین)و (لەبەرامبـەر وەسـتان)و (رامـان)و (چاودێری) دەگرنەوە. کە لـەم چاوگەیەشـەوە, وشـەی (منـاظرة) پێکـدەهێنرێ, دوو هێڵی لێك جیاواز دەگەیەنێ. کەوابێ: کاتێك دوو کەسایەتی, لەپـشتی مێـزی بەرنامەیەك, بە دوو فەلسەفەی جیـاواز بـۆ گفتوگـۆ لەسـەر روداوێـك دادەنیشن, بێگومـان دەبـێ هـەردووکیان هێڵـە جیاوازەکانیـان بخەنـەڕو.. ئـەگینا بۆچـی بەرامبەر دانراوون‌و لەبەرچی یـەك جـۆر پرسـیار لـە هـەردووکیان دەکـرێ؟ بۆیـە بەرامبــەر یــەك دانــراوون بــۆ ئــەوەی جیــاوازی بۆچــونەکانیان لەمەحــەکی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان بدرێ. پاشان, بینەر حوکم لەسەر راستی‌و ناڕاسـتی, یان باش‌و مامنـاوەنجی وەڵامـەکان بـدا. ئەگـەر وانـەبێ, چ پێویـست دەکـا, دوو کەسایەتی جیاواز, لەسەر یەك بابەتی دیاریکراو, بخرێنە مشتومڕەوە.

که واتای راستەقینەی (مونازەرە) ئەمەبێو لە دونیاشدا هەر بەم چەشنە پەیڕەو کرابێ, ئیتر بۆچی نوسەر لای خوێنەر مونازەرە بە (دادگاییکردن) دەگۆڕێ؟ ئەگەر وابێ, کەوابێ, تەلەفزیۆنی یەکگرتوو, هەرکەسێکی بردبێتە سەر شاشەی خۆی, بۆ دادگاییکردن بووە, نەك بۆ زانینی بیری جیاواز لەسەر رووداوێك یان بابەتێك. چونکە ئاشکرایە تەلەفزیۆنی یەکگرتوو تەلەفزیۆنێکی سرف حیزبی ئیسلامگەرایە.

دەبێ هۆی چی بێ نوسەر (مونازەرە) بە (دادگایی کردن) بگۆڕێ؟ بێگومان هۆیەکەی ئەوەیە کە نوسەر لەبەرئەوەی سیاسیەکی ئیسلامگەرایەو ئیسلامگەراش ئەوەتەی هەن, لەبەرایی دەسەڵاتی ئیسلامەوە, لەوساوە دەسەڵاتی ئیسلامی سەپێنراوە, هەتا ئێستا, تەنها یەك تێکستی دەسەڵات لایان پیرۆزەو باقی تێکستەکانیان لا دژی ئاینە, بۆیە, لە جیهانبینی ئیسلامگەراییەوە, دادگاییکردن بۆتە نەریتو کراوەتە بەشێکی پیرۆزی یادەوەری ئیسلامیو شوێنەوارێکی کاریگەری لەناویاندا جێهێشتووە, لەبەرئەمەشە, ئیسلامگەرایەك, لەناو هەر حیزبێکی سیاسی ئیسلامیدا بێ, ناتوانێ خۆی لەو هەژمونی تاقە دەسەڵاتی ئیسلامی رزگار بکا, ئەگەر جاروباریش لەژێر دەمامکی میانەڕەویشدا, خۆی بشارێتەوە, بەخۆی بزانێ یان نەزانێ, لە هەستەوە یان لە نەستەوە بێ, دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی چۆن بتوانێ پەنا بۆ دادگاو دادگاییکردنی بەرامبەرەکان بەرێ. هەربۆیە, لای نوسەر, مونازەرە, کە یەکێکە لە جوانترین کەناڵەکانی دیموکراتی, دادگاییکردنە. چونکە جگە لە حەڵاڵ کردنی دادگایی بەرامبەر, لە یادەوەری مێژوویی, ئەو و ئەوانەی وەکو ئەوون, شتێکی دیکە جێی نەبۆتەوە.

گەر کەسێك لایەنی کەم باوەڕی بە ئازادیو دیموکراتی هەبێ, چۆن دەتوانێ (مونازەرە)یەکی سیاسی, لەسەر تەلەفزیۆنی (ی.ن.ك) کە ئێستا بەشی زۆری کوردستانو هەندێ ناوچەی سنوریش دەیبینن, بە دادگاییکردنی لەقەڵەم بدا؟ ئایە کێ بە مامۆستا (رەئووف محەمەد) ی مەکتەبی سیاسی یەکگرتووی گوتووە, لە مونازەرەکەدا, وا بڵێ, یان نابێ وا نەڵێی؟ مامۆستا, وەك نوێنەری یەکگرتوی ئیسلامی, ئەوپەڕی ئازاد بووە چۆن قسە دەکاو چۆنیش وەڵام دەداتەوە, ئیتر دادگاییکردنی چی؟ دادگایی ئەوەیە هێڵێکی دیاریکراو بۆ نوێنەری یەکگرتوو راکێشرابێو نەیوێرابێ لەهێڵەکە لابدا.

(٣)
## داتـاشينى كام دوژمنى نـاوخۆ؟

لە پەرەگرافى يەكەمى نوسينەكەيدا نوسەر دەڵێ:

**[ چەندين ساڵ شـەڕو بـارگرژى لەكوردسـتـاندا بمانـەوێو نەمانـەوێ ئـاسـەوارى فكـرىو سايكۆلۆژىو سياسى خراپى لەدواى خۆى بەجێهێشتووە، كە ئەركى هەموو هێزەكـانو تێكـڕاى ناوەندەكانى كۆمەڵگاشە نەخشەبكێشن بۆ ئیشكردنێكى جدى لەسەر پاككردنەوەى كۆمەڵگاى كوردسـتـان لـە ژەهـرى ئـەو پاشماوانـە. ئـەو رۆشنبيرييە نەخۆشـەى فـەزاى شـەڕو نـاكۆكيـە خوێنـاويـەكان بەرهـەمى هێنـابوو ميكـانيزمى كـاركردنى بەشـێوەيەكى گـشتى بريتـى بـووە لەوێنەى دوژمن داتـاشين لەبەرامبەرى فكرىو سياسىو گومـان دروسـتكردن بـەدەورى ئـامـانجو مەبەستەكانيداو دروستكردنى دەمارگيرى سياسى كوێرانە ]**.

ئـەم پەرەگرافـە، لەوشـەى يەكەميـەوە هـەتا دوا وشـەى، لايـەنى كـەمى لێكدانەوەى زانستى تيا رەچاونەكراوە. بچوكترين ديقەت كە خوێنـەر هەسـت بـە هەستێكى نيشتمانى بكا، لە پەرەگرافەكەدا نابينرێ.

نوسـەر.. دەيـەوێ پيـشانى بـدا كـەوا لايەنـەكانى شـەڕى نـاوخۆ، هـەموو هاوچەشنن؛ هەموو لايەكيان (شەڕو بارگرژى)يان لەناو كوردستاندا خوڵقانـدووە؛ هەموشيان ئاسـەوارى فكـرىو سـايكۆلۆژىو سياسـى خراپيـان لـەدواى خۆيـان جێهێشتووە. بۆئەوەى خـۆىو حيزبەكەشـى بـە دڵسـۆزترين لايـەنى كوردسـتان پيشانبدا، دەڵێ:

**[ ئـەركى هـەموو هێزەكـانو تێكـڕاى ناوەنـدەكانى كۆمەڵگاشـە نەخشەبكێـشن بـۆ ئیشكردنێكى جدى لەسەر پاككردنەوەى كۆمەڵگاى كوردستان لە ژەهرى ئەو پاشماوانە ]** .

بـەم دێـڕە، دەويـسترێ بگـوترێ، هێـزە شـەركەڕەكان تێكـڕا (ژەهـر)يـان بڵاوكردۆتـەوەو پاشماوەكەشى ماوە.

لەبەرامبەر دەقێكى ئاوا، تەنها دەڵێين؛ مادام شەڕى ناوخۆ ئەمەيە كە نوسەر باسى كردووە، دەپرسين، ئەى كاتێك حيزبەكەى نوسەر، لە نالەبارترين رۆژگارى شەڕى ناوخۆدا، قبوڵى كرد وەزارەتێك لە كابينەى حكومـەتى پـارتى وەربگـرێ، ئايە نەترسا وەزيرەكەىو حيزبەكەى لەو ژەهرەى شەڕى نـاوخۆ هەڵبمـژێ؟ كـێ هەيە نەزانێ كە يەكگرتووى ئيسلامى لە گەرمەى شەڕى ناوخۆدا، بـەهۆى شـەڕى ناوخۆ، هـەم تـوانى تەنگوچـەڵەمەى خـەڵك بقۆزێتـەوەو هـەم سـودى لـە شـەڕى ناوخۆ وەردەگرتو هەم وەزارەتێكيشى حەڵاڵ كرد!

پاشان، کام (ڕۆشنبیری نەخۆش) کە (فەزای شەڕو ناکۆکیە خوێناویەکان بەرهەمی هێنابوو)، مەبەستت کامە ڕۆشنبیرییە؟ ئەو ڕۆشنبیریەی لەگەرمەی شەڕی ناوخۆدا، ئازادی فراوانتری دەبەخشی؟ یان ئەو ڕۆشنبیریەی بەرگری لە دەستکەوتەکانی دیموکراسی دەکرد؟ یاخود ئەو ڕۆشنبیرەی بەهۆی شەڕی ناوخۆوە، ئامادەنەبوو خەبات دژی بیروڕاکانی سەدەکانی ناوەڕاست فەرامۆش بکاو، هەر لە گەرمەی شەڕی ناوخۆشدا، ئازادیو ئازادی ئەقڵو مەدەنیەتی کردە ئامانجێکی گرنگی خۆی؟

مەبەست کام ڕۆشنبیری نەخۆشە؟ هەقوایە ڕۆشن بکرێتەوە، هەتا خوێنەر بزانێ کە جۆرەها ڕۆشنبیر هەیەو لەناو ئەم ڕۆشنبیرانە، ڕۆشنبیری دیموکراتی هەیە، ڕۆشنبیری کۆنەپەرستو کۆنەپارێز هەیە؛ ڕۆشنبیری سەلەفیو ڕۆشنبیری گەڕانەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاستیش هەیە؛ هەڵبەتە، ڕۆشنبیری تریش هەن جیاواز لە هەموو ئەو ڕۆشنبیرانە بیردەکەنەوە. ئەم ڕۆشنبیرانە هەموو لە شەڕی ناوخۆدا هەبون. هەبون حیزبیان هەبوو؛ هەشیانە گۆڤارو ڕۆژنامە دەردەکەن؛ هەشن بێلایەن. دەمانەوێ بزانین نوسەر کامیان بە ژاراوی دەزانێ؟

وێنەی دوژمن داتاشین یانی چی؟ نوسەر دەیەوێ بە چ لایەك بڵێ وێنەی دوژمنی داتاشیووە؟ یان بە چ نوسەرێك؟ تۆ بڵێی نوسەر وا تێگەیشتبێ دوژمنی خۆمان نەناسیبێو بەهەڵەدا چوبینو لەبری دوژمنی ڕاستەقینە، وێنەی دوژمنێکی ترمان داتاشیبێ؟ بۆخۆمان دوژمنمان کەم بوو هەتا وێنەی دوژمن بتاشین؟!

لە هەموو قۆناغەکانی خەباتدا دوژمنەکانی ئێمە دیاربون. هەربۆیە، لە ساڵی (١٩٧٦)وە، ئەوکاتەی چوار ساڵ دەبوو حیزبەکەی نوسەر لەبەر مەترسی هەلومەرجەکە، خۆی هەڵپەساردبوو، ئێمە زانیمان دوژمنمان کێنو ڕێگای بەرەنگاریشمان لێ هەڵە نەبوو. دوابەدوای ئەوە، هەتا ڕاپەڕین سەرکەوتو هەتا بڕیاری هەڵبژاردنو حکومەتی هەرێمیش درا، بگرە هەتا ئەوکاتەی حیزبەکەی نوسەر (١٩٩٤) بەرەسمی خۆی ڕاگەیاند، ئەوساش کە شەڕی ناوخۆشمان بەناچاری دوچاربوو، دیسان زانیمان ئەرکی سەرەکیمان چییەو دەشمانزانی چۆن ماسی لە ئاوی لێڵی شەڕی ناوخۆدا ڕاودەکرێ، بۆیە، نە دوژمنە سەرەکیەکەو نە دژایەتیە لاوەکیەکانی دیموکراسیمان، فەرامۆش نەکرد. پێشمان وایە، لە هەموو شەڕەکاندا، هیچ لایەك ڕەحمی پێنەکردینو

لەهەڵبژاردنەکانیـشدا, بـۆ بردنـەوەی هەڵبـژاردنی پەرلـەمان, یـان نوێنەرایـەتی خوێنـدکاران, یـاخود شـارەوانیەکان, ئەوپـەڕی هەوڵـدرا (بـەرە) ی دەسـەڵاتو بردنەوە لە (ژێر قاچـی دەسـەڵاتی دیمـوکراتی) مـان رابکێشریّ, دوای ماوەیـەك بێبـاکیو خەمـساردی بەرامبـەر ئیـسلامگەراکان, تایبـەت بەرامبـەر یـەکگرتوو, هەموو لایەك زانی یەکگرتوو لەژێرەوەبرە, هەلی شەڕی نـاوخۆ دەقۆزێتـەوە, بۆیـە بیرکردنـەوەی هەمەلایەنـەو راپەڕانـدنی تـەواوی ئەرکـەکانی دیموکراسـی لـەباری سیاسی, مەعریفی, ئەقڵانیو ئازادی ئەقڵەوە, جێگەی خەمساردیو بێباکیەکـەی سـاڵانی گەرمـەی شـەڕی نـاوخۆی گرتـەوە. لەوسـاوە سیاسـەتی راستەقینەی هەموولایـەك, لـەباری ململانـێ سـەرەکیو لاوەکـیو ژێرەکـی سـاغکرایەوەو لەبەرامبەر هەریەکە, بە چەکی جۆراوجۆری بەرەنگاری, بەرگریمان لە دەسەڵاتو پرۆسـەی دیموکراسـیو لـە چـۆنیەتی بردنـەوەی شـەڕی نمونـەییو هێنانـەدی مەدەنیەتـدا دەکـرد, بۆیـە, کاروانمـان گەیانـدە رادەیـەك لـە سۆسـیال ئینتەرناسـیۆنال دا بەچـاودێر وەربگیرێـینو لـە دوا کۆبونـەوەی پەرلـەمانی ئۆروپاشـدا, دان بـە ئەزمونـە دیمـوکراتیو هەوڵـە مەدەنیـەکانمان بنـرێ. ئەگـەر وێنەی دوژمنمان هەتا سەر لـێ چەواشە ببوایە, (هەڵبەتـە ئێمـەش ناچـاردەبوین خۆمان لەکۆڕی خـەبات هەڵپەسـێرین هـەتا هـەلمان بـۆ دەرەخسێ!!) هـەرگیز نەدەگەیشتینە ئەم رۆژەی وا خەریکە, لەبەرامبەر دوژمنی سەرەکیشدا کە رژێمی عێراقـە, پێـشبینیەکانمان, کـە جیـاواز بـوو لـە لێکدانـەوەی هـەموو لایەنـە سیاسیەکانی تر, دێتەدیو نزیك دەکەوینەوە لە عێراقێکی دیموکراتی پەرلـەمانی فیدراڵی. ئیتر نازانین نوسەر مەبەستی داتاشینی کـام دوژمنـە, لەبەرامبـەر کـام فکرو کام سیاسەتو, باس لە چ گومانێك بەدەوری ئامـانجو مەبەسـت دەکـا؟ لـە درێژەی بۆچونەکانیدا, دەڵێ:

**[ دەبێت پاشماوەی ئـەو عەقڵیـەتو بیرکردنـەوە وەك جەسـتەیەکی نـامۆو مۆتەکەیـەك سەیربکرێتو بەهەموو لایەك نابلۆقە بدرێت تـاکو دەکرێت بەبەشـێ لـە کەلـەپوری مێـژوو و جێگـای پێـچوڵ دەکرێـت بـۆ رۆشـنبیریو کلتـورێکی تـری فکـریو سیاسـی کـە رەنگدانـەوەی پێداویستیەکانی چەسپاندنو بەخەڵکیکردنی ئاشتیو وەدیهێنانی چوارچێوەیەکی نیشتمانی فـراوان بێـت بـۆ خـەباتی سـەرجەم هێزەکـانی سـەرگۆڕەپانەکـەو بەتایبـەتیش هێـزە زیندووەکان].**

لەروانگەی یەکگرتووەوە، شەڕی ناوخۆ بەشێوەیەکو لە روانگەی یەکێتیو پارتیش بەشێوەی جیاواز لێکدەدرێتەوە، حیزبەکانی تریش بەشێوەی جیاجیا. ئەوەی لامان مەبەستە لەو دێڕانە قسەیان لەسەر بکەین، ئەوەیە نوسەر بانگمان دەکا (پاشماوەی ئەقلیەت) ی شەڕی ناوخۆ، وەکو (جەستەیەکی نامۆو مۆتەکەیەك) ئابلۆقە بدەینو بیکەینە بەشێکی (کەلەپوری مێژوو).. هەتا (رۆشنبیریو کلتورێکی تر فکریو سیاسی کە رەنگدانەوەی پێداویستیەکانی چەسپاندنیو.. تاد) ئەم بانگکردنە، بانگکردنێکە دەهێنێ قسەی زۆری لەسەر بکرێ، هەتا مەرامە سەرەکیەکەی نوسەرو بەرنامەی سیاسی حیزبەکەی، لەپشت ئەم بانگەوە بزانرێ.

ئەگەر کەلەپوری شەڕی ناوخۆی هەر وڵاتو نەتەوەیەك بخوێنینەوە، مێژوونوسان، لایەنی چاکەو خراپەی ئەو کەلەپورەیان جیاکردۆتەوە، لەناو ئەو کەلەپورانەدا، بەرگری لە نیشتمان، لە شۆڕش، لە دیموکراتیو حکومەتی هەڵبژێردراو هەیە، هەشە لەناو کەلەپورەکاندا پیلانی شۆڕشی چەواشەو مەترسیو خیانەتە. مێژوونوسێك کە بە میتۆدی زانستی مێژووی ئەو گەلو دەوڵەتو نەتەوانە بنوسێ، خۆ نایەت چاکەو خراپە، ئازادیخوازیو خۆفرۆشی، بخاتە ناو یەك تای کەلەپوری مێژووەوە:

- مێژوونوسانی ئەمریکا، لە شەڕی ناوخۆدا، لە یەك روانگەوە سەیری شەڕی ناوخۆیان نەکردووەو (شمالی)و (جنوبی)، لەناو یەك تای تەرازودا نین.
- مێژوونوسانی بریتانیا، لەشەڕی ناوخۆدا، لەیەك روانگەوە سەیری پەرلەمانخواز، دیموکراتخوازەکان، ئاڵاهەڵگرانی پاشایەتیو کۆنەپەرستیان نەکردووە.
- مێژونوسانی ئیسپانیا، لەشەڕی ناوخۆدا، لەیەك روانگەوە سەیری کۆماریخوازانو فلانژستەکانیان (تاقمی پیاوکوژی فرانکۆ)یان نەکردووە.
- مێژوونوسانی ئەڵمانیا، لەشەڕی ناوخۆدا، لەیەك روانگەوە سەیری تێکۆشانی رزگاریو دیموکراتیو پاشایەتیان، نەکردووە.
- مێژونوسانی فەرەنسا، لەشەڕی ناوخۆدا، لەیەك روانگەوە سەیری کۆنەپەرستانو شۆڕشگێڕو پێشکەوتنخوازانیان نەکردووە.
- مێژوونوسانی چین، لەشەڕی ناوخۆدا، لەیەك روانگەوە سەیری شۆڕشگێڕانو (کۆمینتانگ)یان نەکردووە.

دەتوانین وڵات بەوڵات، نەتەوە بە نەتەوە، کۆمەڵ بە کۆمەڵ، سەدان نمونەی جیاوازی بۆچوون‌و چاکەو خراپەی شەڕە ناوخۆکان بهێنینەوە، کە سەرەنجام، مێژوو، هەر لایەنی پێشکەوتوی بەراست زانی. سەرەڕاش، واز لە نمونەکانی مێژووی نوێ دەهێنین‌و لەگەڵ نوسەردا، ئەو نمونانە دەهێنینەوە کە خۆی‌و هاوڕێبازەکانی، وەکو کەلەپوری ئیسلام‌و دەسەڵاتی ئیسلامی، شانازی پێوەدەکەن. دەپرسین: ئەگەر کەلەپوری شەڕی ناوخۆ هەموو (نامۆو مۆتەکەیە)، ئەگەر شەڕی ناوخۆ هەقە (ئابلۆقە بدرێ)و (جێگەی پێ چۆڵ بکرێ).. دەپرسین: ئەی نوسەر لەسەر مێژووی شەڕی ناوخۆی دەسەڵاتدارانی ئیسلامی لەسەردەمی خولەفای راشدینەوە هەتا ئێستا دەڵێ چی؟

- لە چوار خەلیفەی موسڵمانان، کە پێغەمبەر بە جێنشینی خۆی دایناوون، سیانیان لە ئاشوب‌و شەڕێ ناوخۆدا، کوژراوون.
- زۆری نەخایاند، ئومەویەکان هاتنە ئاراو چونە سەر مەکەو تۆڵەی خۆیان‌و هۆزەکەیان، بە سوکایەتیپێکردنی کەعبەو موقەدەساتی ئیسلام، سەندەوە.
- پاشان کەعەباسیەکان دروست بوون، لەگەڵ ئومەویەکاندا، سەدان ساڵ شەڕو شۆڕیان بوو.
- هەر لە سەردەمی ئیسلامدا، خواریج هەبوو کە شەڕی ناوخۆیان کرد دژی ئیمامی عەلی. پاشان یەزیدی کوڕی معاویە، دژی ئیمامی حوسێن‌و کوشتارگای عاشورا.
- ئینجا، سەدان یاخیبوون، تایفە، تاقم، فەلسەفەو فێرگەی جیاواز، کە بەشی زۆری شەڕێ ناوخۆیان لێکەوتەوەو ملیۆنەها خەڵکی تیاچون.

ئەمانە تێکڕا، بەشێکن لە مێژووی ئیسلام‌و دەسەڵاتی ئیسلامی، وەکو کەلەپوری مێژووی کۆنینە. لەوکاتەشەوە ئۆروپا سەرگەرمی رینیسانس بوو، وڵاتانی ئیسلامی جۆرێکی تر شەڕی ناوخۆیان هەڵایساند؛ عوسمانی‌و سەفەویەکان سەدان ساڵ خوێنی یەکتریان بەناوی شیعەگەریی‌و سونیگەریی دەخوارد. سەدان هەزار کەسیان کردە قوربانی رقی مەزهەب‌و قەڵمڕەوەکانیان. سەرەنجام، هیچ لایەکیشیان نەیانتوانی نوێنەرایەتی موسڵمانانی جیهان هەتاسەر مسۆگەر بکەن. ئێستا ناکرێ هەموو ئەو مێژووە کە سەدان هەزار قوربانیشی تیادراوەو غەدری گەورەو کەموێنەی کوشتنی ئەسحابە، پیاوچاکان، ناوداران، ئەتك کردنی نەیاران، سەربڕینی هەزاران هەزار دیل، بەتاڵان بردنی

ژنـان، کـچانو بەکۆیلـەکردنی هـەزاران کـەس لـەو شـەڕانە ئەنجامـدراون, نـاکرێ
ئێـستا بـە یـەك چـاو تەماشـای چـاکەو خراپـەو لایەنـەکانی ئـەو شـەڕانە بکـرێ
تەنانەت زۆرجار خەلیفەو سـوڵتانو دەسـەڵاتدارانی ئیـسلامی غـەدری گـەورەیان
کردووە. هەر لە کوردەواریدا سەدان نمونەی غەدری شەڕوشۆڕ هەیە. هـیچ نـەبێ
بەرامبـەر یەزیدیو کاکەیی.

(٤)

## پڕوپاگەندەو دیماگۆگیەت !

لــە بەشـێکی قــسەکانیا, نوســەر مێزگردەکــە بەئاڕاسـتـەی (میکـانیزمی
پڕوپاگەندەی سلبیو دیماگۆجیەتی) جۆراوجۆر لەقەڵەم دەدا.. دەڵێ:

**[ بەکورتی دەتوانین بڵێین مێزگردەکە نیشکردن بـە میکانیزمەکانی پڕوپاگەندەیەکی سـلبیو دیماگۆجیـەتی جۆراوجـۆری تێـدابوو کـە لێـرەدا ئاماژەیـەکی خێـرا بەهەنـدێکیا دەکەین]**.

(پڕوپاگەنـدەی سـلبی)و (دیماگۆجیـەت) دوو مەسـەلەن نوسـەر بـەزۆر لـە
ستونەکەیدا جێـی کردونەتـەوەو خۆزگـە دەمزانـی لـە نـاخی خۆیـا نوسـەر لـە
گەوهەری دیماگۆگیەت وردبۆتەوەو بەتەواوەتی دڵنیابووە لـەو حوکمـەی؟ هـەر
ئایە مەبەستی لە (پڕوپاگەندەی سلبی) چییە؟

جـارێ.. دیماگۆگیـەت.. لـە گەوهـەردا بەرزکردنـەوەی دروشمـی بریقـەدار
بەڵێنپێـدانی خەڵکـە بـۆ چەواشـەکردنی خـەڵك. دەپرسـین: لـەو مێزگـردەدا,
دروشمێك بەرزکرایەوەو چ بەڵێنێك بەخەڵك درا؟ بێگومان هیچ.

ئەسڵی مێزگردەکە, کێبەرکێی دوو بۆچونی جیاواز بـوو، لەسـەر روداوەکـەی
(١١)ی سپتامبەر. لەراستیا نە مامۆستا رەئوف محەمەد دروشمـی بـەرزکردەوە
نـە منـیش هـیچ گفتـێکم دا. پاشـان (ی.ن.ك) نەیشاردۆتەوە کـەوا: لـەم شـەڕە
فراوانـەدا دژی تـیرۆر, خـۆی لـە سـەنگەری دژایـەتیکردنی تـیرۆردا دەبینێتـەوە
هێزێـك بەراشـکاوی سـەنگەری خـۆی دیاریکردبـێ, ئـیتر چ پێویـستیەکی بـە
پڕوپاگەندەی سلبیو دیماگۆگیەتە؟ لەراستیا:

- ئـەو هێزانـەی سیاسـەتی نـاو حیزبەکـەیان جۆرێـكو سیاسـەتی گـشتیان جـۆرێکی تـرو سیاسـەتی ئیقلیمیـان پێـچاوپێچو سیاسـەتی دەرەکیـشیان مەگەر خوا سەری لـێدەربکا, ئەو حیزبانە دیماگۆگین.

- ئەو حیزبانە دیماگۆگین کە قاچێکیان لەولاتانی دورگەی عەرەبیو دەستێکیان لەولاتێکی تری خەلیجیو هۆشیان لە شوێنێکی ترو بەرژەوەندیان لە بێهەڵوێستیو بێدەنگیە بەرامبەر تاوانو بەرامبەر کارەساتو خۆهەڵپەساردنە لەکاتی مەرگەساتەکانی کۆندا.

دیماگۆگیەت بۆکەسێكو هێزێك نییە لەناو کێشەی سیاسی گەلەکەیو گرفتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵەکەیو پێویستی دیموکراسی سەردەمەکەی، بەرنامەی دوورونزیکی سیاسی دانابێ. بەڵکو دیماگۆگیەت ئەوەیە، لەم دونیایە بۆ گرفتە دونیاییەکانی فەلسەفەو، بۆ ئایندە روانگەت نەبێ، بەناچاری پەنا بۆ خوابەریتو خیتابی سەدەکانی ناوەڕاست هەڵبژێریتو بەپاڵی سەلەفیەت، رەوڕەوەی مێژوو بۆ دێرینەخوازی بەرێتەدواوە.

ئاخر خواو ئایینی ئیسلام چ پێویستیەکیان بە ئیسلامی سیاسیو حیزبی ئیسلامی هەیە، ئەگەر دیماگۆگیەت نەبێ بەناوی خواو ئیسلامەوە؟

گەورەترین دیماگۆگیەت لەوەدایە بەناوی خواو بەناوی ئیسلامو بەناوی پێغەمبەرەوە، خەڵك هەبنو سیاسەت بکەن بۆ دەسەڵات.

ئاخرین کەس ئەو کەسانەن کە لەدوای راپەڕین هاتونەتە مەیدانی سیاسەتو حیزبی سیاسیان دروستکردووە، ئەمانە ئاخرین کەسن بتوانن تومەتی دیماگۆگیەت بدەنەپاڵ کەسێك، یان هێزێکی سیاسی کە لە رۆژگارە سەختەکاندا بەرگرییان لە گەلەکەیان کرد. لە رۆژگاری سەرکەوتنیشدا، بە داڕشتنی پرۆژەی دیموکراسی لە خەبات نەوەستان.

ئێمە خەباتمان کردوەو دەکەین. ئێمە کە شۆڕش هەرەسی هێنا، هەرەسمان نەهێنا؛ کە شۆڕشیشمان کرد، بەرگەمان گرت؛ کە کارەساتیان بەسەرداسەپاندین، نەڕوخاین؛ کە کیمیاباران کراین، هەڵنەهاتین؛ کە ئەنفالیش کراین، هەراسان نەبوین؛ هیچ تەنگانەیەکی سیاسی وای لێنەکردین حیزبەکەمان هەڵپەسێرین (وەکو یەکگرتوو) بەڵکو لە رۆژگاری شومی تەنگانەدا ئاڵای شۆڕشمان بەرزکردەوە. نە لە رابوردومان‌دا دەتوانرێ سیاسەتی دیماگۆگی لەسەرمان دیاریبکرێو نە ئێستاش پێویستیمان بە دیماگۆگیەتی دینیو دونیایی هەیە. ئەوەین کە هەین. ئەوە نین کە لەگەڵ معاویە نان بخۆینو لەپشتی عەلیش نوێژ بکەین. ئەگەر هەڵەشمان کردبێ، کەموکوڕیشمان هەبێ، لێکدانەوەی ناڕاستیشمان بوبێ، کێشمەکێشی لاوەکیمان زاڵکردبێ، هەموو سەرەنجامی

خەبات و سەختى راپەڕاندنى ئەركەكان بووە. لە راپەڕاندنى ئەركى سەختى وادا
ناشێ هەڵەنەكرێ و كەموكوڕى نەبێ. گەر ئێمەش ساڵى (١٩٧٢) وازمان لـ
خەبات وەكو يەكگرتوو هێنابا, بێگومان ئێستا هەڵەمان لە ساڵى (١٩٩٤)و
دەستێدەكرد, هەروەكو يەكگرتوو مێژووى دامەزراندنەوەى لەوساوە دەستى
پێكردووە. لەناو بۆتەى كارو خەباتدا هەڵە تەنانەت هەڵدێرانى سياسى
عەسكەريش رويداوەو روشدەدا. ئەمە خەوشێكى گەورە نييە ئەگەر بێتو
بەچاوى رەخنەو پياچونەوەى رابوردوو هەڵبسەنگێندرێ. خەوشى گەورە ئەوەيا
هێزێكى وەكو يەكگرتوو لەساڵى (١٩٧٢)وە هەتا ساڵى (١٩٩٤) بيستو دو
ساڵى رەبەق خۆى تەجميدكردبێ و ئەو روداوە سەختو ناخۆش و كارەساتان
بەسەر كوردو كوردستاندا هاتبێ, ئێستا هەروەكو هيچ روينەدابێ ئاوا سەيرى
رابوردوو بكەن. ئەمە خەوشى گەورەيە، كە ناكرێ يەكگرتوو بەسانايى ئە
رابوردووە بەسەر نەوەى ئێستا تێپەڕينێ و بەروداوێكى ئاسايى لەقەڵەمى بدا.

(٥)

## ئەمريكاو عێراق و ئيسلامگەراكان

نوسەر.. بەشێوەيەكى سەير سياسەتى ئەمريكاو ئيسلامگەراو رژێمى عێراق
باسدەكا. لەو وايە كە مادام ئەمريكا دژى رژێمى عێراقە, ئيتر هەقى بەسەر هێز
ئيسلامگەراكانەوە نييە. نەك هەر هێندە, بەڵكو واى دەنوێنێ گوايە (هێز
ئيسلاميەكان ئامادەن بەيارمەتى ئەمريكا هەوڵى گۆڕينى دەسەلات بدەن
لەبەغدا).

جارێ نوسەر تەنها بۆى هەيە بەناوى (يەكگرتوو)ەوە قسە بكا. نەك هەمو
هێزە ئيسلاميەكان. چونكە مەعلومە سەرجەم هێزە ئيسلاميەكان چونيەك
سەيرى ئەمريكا ناكەن. كۆمەڵى ئيسلامى هەڵوێستى سلبيە بەرامبەر ئەمريكا
رۆژئاوا. بزوتنەوەى ئيسلامى خۆى بەهاوپێناوى ئەمريكا نازانێ. (انصا
الاسلام)يش ئاشكران كە (القاعيدە)ن. هەتا ئێستاش بەرەيەكى ئيسلامى لەنێوا
هێزە ئيسلامگەراكانيش نييە هەتا بڵێين, نوسەر بەناوى هەموويانەوە قسەدەكا
دوور نييە لەم روداوانەو لەو ئەگەرانەى گۆڕانكارى كە چاوەڕوان دەكرێ
(بەرەيەكى ئيسلامى) دروستبكرێ و پشتيوانى وڵاتێكى ئيقليميش دابينبكرێ
بۆئەوەى هەندێك هێزى ئيسلامگەراى چەكدار، لە قەيرانى دژەتيرۆر دەربازبكرێ

ـەناو هاوکێـشە سياسـيەکانی ئاينـدەی گۆڕانکاريـشدا, هێـزە ئيـسلامگەراکان بـەهێزتر ئامـادەبکرێن بـۆ ململانـێو بەرهەڵـستيکردن. هـەروەکو ئەزمونەکـەی باکوری لوبنان.(*)

گـەر بێينەسـەر سياسـەتی يـەکگرتووش بەرامبـەر ئـەمريکا, ئـەمانيش بەڕاشکاوی رايان نەگەياندووە کە بەيارمـەتی ئـەمريکا دەيانـەوێ عێـراق بگـۆڕن. بەڵکو لەمێزگردەکەشدا, مامۆستا رەئووف محەمەد, کە نوێنـەری يـەکگرتوو بـوو (ئەنـدامی مەکتـەبی سياسيشيانە) قسەکانی پێـچەوانەی سياسـەتی ئـەمريکای دەنواند. تەنانەت ئامادەنـەبوو (تاليبـان)و (القاعيـدە)ش لەسـەر روداوی (١١) ی سپتامبەر کوتو مـت تاوانبـار بکـا. پێـیٚ وابـوو کـاری گـەورەی وايـان لەدەست نايەت. ئيتر نازانين نوسـەر ئـەم سياسـەتەی يـەکگرتوی چۆن داڕشـتووە؟ ئايـە سياسـەتێکی تازەبڕيارلێدراويانـە؟ يـاخود تاکتيکـە؟ يـان بۆدەربازبونيانـە لـەو هەڵمەتە هەمەلايەنەی دەکرێتەسەر هێزە ئيسلامگەراکان بـە سعوديەشـەوە؛ بـە هێزە ميانەڕەوەکانيشەوە؟!

شـەڕيش دژی هێـزە ئيـسلامگەراکان, پێمـان وايـە لەدوائەنجامـدا, بەوەناوەستێت هێزە ئيسلامگەرا چەکدارو تيرۆريستەکان تـەفروتونابکرێن (کـە بێگومانين تەفروتونادەکرێن).

بـەڵێ.. شـەڕی دژی تـيرۆر رەهەنـدی زۆرە, يـەکێك لـە رەهەنـدەکانی سەرچـاوەی ئەندێـشەی تـيرۆرە. بڕيـاری شـەڕ, بەتايبـەتی ئـەو جـۆرە شـەڕو شـەڕەنگێزيەی هێزە ئيسلامگەرا تيرۆريستەکان, لە بنەچـەدا دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەندێشە. جۆری ئەندێشە بڕياری شەڕ يان ئاشتی دەدا.

کاتێـك ئەندێـشەيەك, تـەنها دەقێکـی پـيرۆزی نـەگۆڕدراوی هـەبێ, خيتابـە سياسيەکەشـی رەنگدانـەوەی دەقـە نەگۆڕدراوەکـەی بـێ, ئاينـدەش هـەر گەڕانەوەی دەقو دەق بۆ ناو دەسەلاتی دەقەکەبێ, ئاخۆ ئەندێشەی ئاوا, ببێتـە ئەندێـشەی سـەرەکی هـەر هێزێکـی سياسـی تونـد يـان ميانـەڕەو, ئـاخۆ لەدواسـەرەنجامدا هێـزی ئەندێـشەی ئـەم دەقانـە, دەگەنـە کـوێ؟ ئاشـکرايە هێزەکـانی ئـەم ئەندێـشانە, زوو يـان درەنـگ, لەگـەڵ گيـانی سـەردەمدا,

* ئەم پێشبينيانە.. لەدوای روخاندنی سەدام، دەرکەوت، راستن. نمونەش، مەجلسی ئەعلای ئيسلامی عێراقە. (تێبينی دوای چاپ)

روبەڕوودەبنەوە. لە ڕوبەڕووبونەوەشدا، یان دەبێ ئەندێشە بگۆڕن، یاخود دەبێ شەڕ هەڵبگیرسێننو ئازادی سەرکوت بکەنو بکەونە تیرۆرکردن.

نوسەر.. کاتێك بەناوی تەواوی ئیسلامیەکان قسەدەکا، دەزانین لایەنی کە، لەباری ئەندێشەوە دەیەوێ پێمان بڵێ گەرچی ڕێبازمان جیاوازە، بەلام سەرچاوەی ئەندێشەی ئیسلامیمان یەکە. هەڵبەتە لە دوائەنجامدا، ئە سەرچاوەیەی ئەندێشەیە، بە ڕەوتی جیاوازیەوە، بەنۆرە ڕووبەڕووی تەقینەوەی ناکۆکیەکان دەبێتەوە. پێشتر توندەکانو نەرمڕەوەکانیشیان.. دواتر!

لەرابوردودا، بوار زۆر بوو، ئیسلامگەرا نەرمڕەوەکان مانۆری جۆراوجۆر بکەن. بەلام پێمان وایە لەدوای (١١)ی سپتامبەر، ڕوداوەکان بەو ئاڕاستەیەد دەڕۆن کە بواری مانۆری سیاسی لەبەردەم هێزە ئیسلامگەرا نەرمڕەوەکان نەمێنێ. دەبێ ئیتر خۆیان ساغبەکەنەوە. ساغبونەوەشیان لەسەر ئاستی جیهان، لەسەر ئاستی وڵات بەوڵاتی ڕۆژهەڵاتیش ڕەنگی سیاسی دەداتەوە. ساغبونەوەیەك تەنها بەلای دیموکراسیو ئازادی ڕاستەقینەدا، دەشکێتەوە.(*)

## (٦)
## شەڕی ناوخۆو نەتەوە

نوسەر.. دەیەوێ لە چەند پەرەگرافێکدا، مێژگردەکە وا باس بکا کە شێوەی ئاخاوتنەکان گەڕانەوە بووە بۆ لۆژیکی شەڕی ناوخۆ. لەپاڵ گوتنی ئەم قسانە، دەشیەوێ وای پیشانبدا، گوایە، لەهەموو لایەك زیاتر پەرۆشی ئاشتییە. تەنانەت پێی وایە، ئەو لۆژیکە لە (بنەڕەتەوە مانا بۆ نەتەوەی کورد ناهێڵێ).

لەهەموو ئەدەبیاتی (یەککرتوو)دا، دوورونزیك لێکدانەوەیەکی زانستی بۆ شەڕی ناوخۆی کوردستان نادۆزرێتەوە. هەمیشە لە نوسراوەکانیاندا، ئەم حیزبە تێکەڵەیەك لە بۆچونی سیاسی گشتیو سۆزی ئیسلامی تایبەتی لەسەر شەڕی ناوخۆ پێشکەش دەکا. بەم کارەش، خۆی لە یەکالاکردنەوەی هەڵوێستی ڕۆشن دەدزێتەوە. ئەمە لەکاتێکدا، ئەرکی سەرشانی حیزبە سیاسیەکان ئەوەیە

---

* جیابونەوەی لیستی یەککرتوو لەلیستی هاوپەیمانی کوردستان، سەرەتای سیاسی ساغکردنەوەی ئیسلامگەرا میانڕەوەکانە بۆ دژایەتی دیموکراسی. (تێبینی دوای چاپ)

ەکێشەی چارەنوسسازدا، هەڵوێستمان ڕۆشن بێ. بەهەق بڵێین هەق و بەناهەقیش بڵێین ناهەق. برای نوسەر، لە باسکردنی شەڕی ناوخۆدا، لە هەردوو جەژنەکە بووە. نەوەکو ئیسلامیەکی راستەقینە قسەدەکاو، نەوەکو سیاسیەکی ریالیستی دەدوێ.

ئەگەر ئیسلامیەت و پێوانەی ئیسلامی بۆ هەڵسەنگاندنی شەڕێ ناوخۆ بەکاردێنێ، بەدرێژایی مێژووی ئیسلامیەکان لەشەڕی ناوخۆی هێزە جیاوازەکاندا، نەیانتوانیووە هەموولایەک رازیبکەن. بەڵکو لادەرو هەڵگەڕاوەکانیان لەدەسەڵاتی ئیسلامی قەلاچۆکردووە؛ لەسەردەمی تیرۆرکردنی خولەفای راشدینەوە ئەمە دەسەلمێنێ کەوا تیرۆر پێش زایین و لەساڵی کۆچییەوە، لەناو ئاینەکانیشدا هەر هەبووە. مێژوو وامان پێدەڵێ، هەتا دەگاتە سەر (خوارج) و ئومەویەکان و هەڵگەڕانەوە بەردەوامەکانی تایفەو تاقمە جیاوازەکانی ناو قەڵەمڕەوەکانی ئیسلام. تەنانەت ئێستاش سوننی بۆچونی شیعەکان و شیعەکانیش بۆچونی سونیەکانیان لەسەر وەسیەتی پێغەمبەرو خەلیفایەتی موسڵمانان قبوڵ نییە.

سەبارەت بە مەسەلەی لە (بنەڕەتەوە) نەهێشتنی مانای (نەتەوە)ی کوردیش، لەمەیاندا نوسەر بەڕاستی دیماگۆگیە. لە دەقی ئەم پەرەگرافەدا، بزانن چی دەڵێ:

**[ جارێکی تر گەڕانەوەیە بۆ لۆژیکی سەردەمی شەڕی ناوخۆ لەخوێندنەوەی روداوە جیهانی و هەرێمایەتیەکاندا. کە بریتی بوو لە خوێندنەوەی ئەو رووداوانە لە میانەو لەبەر تیشکی ململانێ ناوخۆکانی نێوان تەوژمە فکری و سیاسیەکانی ناوخۆ نەک گەلی کوردستان و بەرامبەرەکانی کە ئەوەش هەر لە بنەڕەتەوە مانای نەتەوەی بۆ کورد ناهێڵێتەوە.. ].**

جارێ لەگەرمەی شەڕێ ناوخۆدا، روداوە جیهانیەکان هەر بەپێوانەی جیهانگیری دەخوێندرانەوە. ئێستاش بەهەمان پێوانەی جیهانگیری دەخوێندرێنەوە. تایبەتمەندی ئێمە تەنها لەوەدابوو کە هەمیشە گوتومانە رژێمی عێراق دەبێ بگۆردرێ، ئینجا مافی فیدرالی دەستەبەردەبێ. ئەم جیاوازیەشمان لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە: پەرەسەندنی جیهانگیری لە رۆژهەڵاتدا، رژێمە دیکتاتۆرەکان رادەماڵێ. لەپێشەوەیاندا رژێمی عێراق، چونکە تاوانەکان لەسەری بونەتە ماڵ.(*)

* ئەم بۆچونەش هاتەدی، سەدام گۆڕدرا، نۆرەی سوریاش هاتووە. (تێبینی دوای چاپ)

هیچ لایەکیش لەشەڕی ناوخۆدا نەیگوتووە مادام شەڕی ناوخۆ هەیە, ئیتر روداوە جیهانیەکان فەرامۆش بکرێ. هەموولایەکیش دەزانێ ئەو پەیوەندییە جیهانیەی سەرکردایەتی سیاسی کورد، بە ناوەندەکانی سیاسی نێونەتەوەیی لە رۆژئاواو ئەمریکادا, رۆڵێکی بەرچاوی لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا هەبوو.

کورد.. لەم بارودۆخەدا, پێچەوانەی هێزە ئیسلامگەراکان, ورد لەروداوەکانی جیهان تێگەیشتوەو بەپاساوی فەلسەفیو ئایدیۆلۆژیو عەقیدەییدا, خۆی لە ئالۆگۆڕەکان تەریك ناکا. ئەوە هێزە ئیسلامگەرا چەقبەستوەکانن بەرواڵەت خۆیان مت کردووەو لەباری ستراتیژیشەوە, بەتوندڕەو و میانەڕەویانەوە, دەیانەوێ لەسەردەمی جیهانگیریدا, سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی بگێڕنەوە.. ئائەمەیە ئەندێشەی گەڕانەوە بۆ خەتەرناکترین سەردەمی شەڕی ناوخۆ. شەڕی پێشکەوتنو کۆنەپەرستی. شەڕی روناکیو تاریکی:

ئەوانەی بەلۆژیکی شەڕی ناوخۆ (نەك بەرژەوەندی گەلانیان) روداوەکان لێکدەدەنەوە, ئەوانەن کە منالّی سەر بێشکە لە جەزائیردا دەکوژن؛ ئەوانەن کە ئەفغانستانیان هەڵدێرا؛ ئەوانەن (خێڵی حەمە) خەڵتانی خوێن دەکەن؛ ئەوانەن پەروەردەو پێشکەوتنی خەڵك بەئەندێشەی سەدەکانی ناوەڕاست دەشێوێنن.

خوێندنەوەی روداوەکان بەلۆژیكو تەوژمی شەڕی ناوخۆ, سەرچاوە مەرە خەتەرناکەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەندێشەی چەقبەستوو, بۆ خیتابی دەقی نەگۆڕدراو, بۆئەو سیاسەتو عەقیدەیەی نوزەی ئازادی دەبڕێو پرشنگی ئازادی ویژدان خامۆش دەکات.

مرۆڤ و کۆمەڵ کە نەتوانن ئازادانە بیربکەنەوەو ویژدانیان لە لێکدانەوەی تێکستە پیرۆزو تێزە سەپێنراوەکان ئازادبێ, وردەوردە بێگومان شەڕی ناوخۆی نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی، شار بە شار، گروپ بە گروپو تاك بە تاکی ناوخۆ دەقەومێنن.

لەئۆروپادا کە دەقە پیرۆزەکان, ئازادییان زەوت دەکرد, هەمیشە شەڕی ناوخۆ لەناویاندا دەقەوما. بەڵام کە دیموکراتی سەرکەوتو ئازادی بیرو ئازادی ویژدان بۆ رەخنەگرتن لە هەموو بیرو دەقو ئەندێشە سەپێنراوەکان دەستەبەرکرا, هەنگینێ, لەبری شەڕی ناوخۆ, لەبری کوشتنی زاناو داناو بیرمەندو, راوەدوونانو کوشتارگای ناوخۆ, لەباتی ئەو تاوانانە, ئازادی رۆشنگەریان هێنایەدیو پاشان مەدەنیەتیان خوڵقاندو جیهانیان گەیاندە مۆدێرنێتە.

ئێستاش لە رۆژئاوادا، تەنانەت لەوڵاتە تازەدامەزراوەكانیشدا، شـەڕێ نـاوخۆ لەهەر لایەك، لە بریتانیا، ئۆروپای رۆژهەڵات، ئاسیای مەركەزی، بـاكوری ئاسـیا، لە هیندستان‌و بەنگلادش‌و پاكستان،.. هەروا لەناو وڵاتانی عەرەبیشدا، تەنانـەت لـەناو فەلەستینیـشدا، بەرپرسـیارێتی شـەڕی نـاوخۆ بەشـی زۆری لەئەسـتۆی ئیـسلامیەكان‌و مەسـیحیەكان‌و جولەكـەكان‌و مەزهـەب‌و عەقیـدە جێماوەكـانن لەسـەردەمی مۆدێرنێتـەو لـە شۆڕشـی دیمـوكراتی. نەتـەوەو خـەباتی رزگـاری نەتەوەییش، زادەی سەركەوتنی سەردەمی مۆدێرنێتەیە.

هێـزە ئیـسلامگەراكان، رێگـرن لـە خـەملینی پێكهاتـەی (نەتـەوە). بـەڵكو پرۆسەی پەرەسـەندنی نەتـەوەو پێگەیشتنی پێچەوانەی بنچینەكانی ئیسلام‌و ئیسلامگەراكانە. بۆیە، هیچ هێزێكی ئیسلامگەرا ناتوانێ لافی خەباتی نەتەوایەتی لێبـدا. ناشـتوانێ بـەناوی (نەتـەوە)وە، كـاڵا فكریـەكانی بخاتـە نـاو كایـە سیاسـیەكانەوە. هـەموو ئـەو شـەڕە ناوخۆیانـەش لـەناو وڵاتـانی عەرەبیـدا ئیـسلامگەراكان قەوماندویانـە، بۆتـە مایـەی دواكـەوتنی نەتـەوەی عـەرەب‌و نەتەوەی عەرەبی خستۆتە ژێر پرسیاری نالـەباری ئـابوری‌و سیاسـیەوە. بگـرە، ئەم هێزە ئیسلامگەرانە، ئێستا دیوارێكی تاریك لەبەردەم پێشكەوتنی نەتـەوەی عـەرەب بـۆ چـونەناو دونیـای مۆدێرنێتـە، هەڵدەچـنن. تەنانـەت لـەناو فەلەستینیەكانیشدا، یان دەبێ دەست لە رەوتی تیرۆرو داسەپاندنی ئەندێشەی سەدەكانی ناوەڕاست هـەڵبگرن، یـان ئیـسلامگەراكان دەبنـە مایـەی كارەساتی گەورەی گـەلی فەلەسـتین. دیـارە ئـەمجارەش فەلەسـتین، لـەناو بـاری نالـەباری نەتـەوەی عەرەبـدا، بەرگـەی كارەسـاتی سیاسـی‌و عەسـكەری نـاگرن. چـونكە نەتەوەی عەرەب لەدۆخێكی خراپی رۆچـوندایە. ئیـسلامگەراكانیش نـەك نـاتوانن شكستی نەتـەوەی عـەرەب بـۆ رزگـاری فەلەسـتین، یـەكێتی نەتـەوەی عـەرەب، بینای دیموكراتی، كۆمەڵی مـەدەنی رابگـرن‌و ئاڕاسـتەكانی پاشەكشەی عـەرەب بەرەو چـاكە بگـۆڕن، نـەك ئـەم ئەركـە مێژوویيانـەیان پێ‌ئـەنجام نـادرێ، بـەڵكو لەهـەر وڵاتێكـی عەرەبیـدا، هێزێكـی ئیـسلامگەرا پەرەبسەنێ، یـان بـەهێزببێ، یـاخود كاریگـەربێ، ئـەو هێـزە دەبێتـە مایـەی پـتر دواكـەوتنی عـەرەب‌و زیـاتر جێمـانی لـە كـاروانی شارسـتانیەتی سـەردەم. جێمـانی ئێسـتاش سـەبارەت بـە گەلان، لەسەردەمی جیهانگیریدا، مەترسـیدارترە لـە جێمـانی رابـوردوو، چـونكە پێشكەوتنەكانی ئێستا هێندە خێرایە، هێندە هەمەلایەن‌و فراوانە، هـەر نەتـەوەو

گەلو کۆمەڵێك, دەهەیەك یان دوو دەهە دوابکەوێ, هێند بەجێدەمێنێ لە پێشکەوتن, نەك ئاسان نییە دواکەوتنەکەی لەئایندەدا پارسەنگ بداتەوە, بەڵکو دوور نییە دواکەوتنەکە دوچاری شەڕێکی خەتەرناکی ناوخۆشیان بکا. ئەویش هەر لەسەر دەستی هێزە سەلەفییە دواکەوتوەکان. چونکە دواکەوتن لەژێر کاریگەری ئایدیۆلۆژیاو عەقیدەو فەلسەفە, رقو کینەی کۆمەڵایەتی — عەقیدەیی دەخولقێنێ. ئاسانیش نییە ئەو رقو کینە عەقیدەییە, لەماوەیەکی کەمدا بنەبڕبکرێ.

(٧)

## (القاعیدە)و یەکگرتوو

لەم پەرەگرافەدا نوسەر دەڵێ:

**[ رەتکردنەوەی یەکگرتوو بۆ فکرو شێوازی کارکردنی (القاعدة)و هاوشێوەکانی لە (١١)ی سێپتەمبەرەوە دەست پێناکاتو هی پێش ئەوکاتەو ساتەوەختی دروستبوونی یەکگرتووە, چونکە ئەو پێش ئەوەی رووداوێکی دیاریکراو ئیدانەکات ئەو شێوە ژیانەو نمونە ئیسلامییە رەتدەکاتەوە کە ئەوان تەرحی دەکەن ].**

لەراستیا, لە رووی سیاسیەوە, لە رەوشی کارکردنو شێوەی هەڵسوڕانی حیزبییەوە, بگرە لەپێکهاتەی حیزبایەتیشدا, یەکگرتوو جیاوازە لە (القاعیدە), واتە (نهج)ی یەکگرتوو لە هی (القاعیدە) جیایە. ئەمە ئاشکرایە. بەڵام.. دەتوانین قسە لەسەر گەلێك بۆچونی هاوبەشی (منهج)ی هێزە ئیسلامگەراکان بکەین.

ئیسلامگەرا سونیەکان، لە دەقپەرستیو لە مێژووی ئیسلامو خواپەرستیدا, هاومەنهەجن. بێگومان یەکگرتوو, یان تالیبانو قاعیدەو تیرۆریستێکی خواپەرستی ئیسلامی, لە گەلێ روەوە لەمارکسیەك, عەلمانیەك, مەسیحیەك, جولەکەیەك, بتپەرستێك, هیندۆسیەك, بوزیەك, کۆنفۆشیۆسێك, زەردەشتیەك, کاکەییەك, یەزیدیەكو مولحیدێك لەخۆی نزیکتر دەزانێ. بۆ؟ چونکە خواپەرستە ئیسلامیەکە لە (نهج)دا نزیکە لێی, ئەوانی تر, زۆرو کەم لە (نهج)دا دوورن لێی. هەندێکیشیان سەراپا دژیشیانن.

مەسەلەی گرنگ لە بەرنامەی هێزە سیاسیەکانی ئیسلامگەرا یان عەلمانی, پێش رەوتو رەوشی سیاسی, تەنانەت پێش (نهج)ی سیاسیو ئایدیۆلۆژی, قسەکردنە لەسەر (منهج). پێشوەخت (منهج) دورنمای ستراتیژی هەموو

حیزبێکـە. نـەك (نهـج). چـۆن لەیـەك وڵاتـدا چـەند هێزێکـی مارکسی (نهـج)ی مارکـسیزمیان قبوڵـە, بـەڵام (مـنهج) ی جیـاوازی سیاسـیان هەیـە. ئیسلامگەراکانیش ئـاوان. ئەگـەر خواپەرستـیو قورئـانو سوننەتو کەلـەپوری ئیسلام نەبا, (یەکگرتوو) ناوی لەخۆی نەدەنا (یەکگرتووی ئیسلامی). رەنگبـوو ناوی (یەکگرتووی دیموکراتی) یان (یەکگرتووی نەتەوەیی) بوایە.

هەر ئەو (منهج)ە هاوبەشەیە وایکردووە یەکگرتوو نەتوانێ کارەسـاتی (١١)ی سپتامبەر بخاتە ئەستۆی راستەوخۆی تالیبانو القاعیدە. تەنانەت تاوانی (خێڵـی حەمە)ش, هەتارادەیەك بەتەمومژاوی بەبێ ناوهێنانی (جندالاسلام) ئیدانەبکات.

یەکگرتوو (نهج)ی هاوبـەش دەیانبەستێتەوە بـە (شـەرع)ی هاوبەشیش. لـە شەرعی ئیسلامدا, قورسە هێزە ئیسلامیەکان ئیدانەی موسڵمان یان شەڕی هێزی ئیسلامگەرا بکەن. یەکگرتوو ناتوانن بە (القاعیدە) یان (تالیبان) یاخود بە (جند الاسلام) بڵێن, موسڵمان نین. چونکە ئـەوان هێـزی (عـەلمانی) تـەکفیر ناکـەن, چ جای بۆ ئیسلامیی. تەکفیرنەکردنی عەلمانیەکانیش لەوەوە هـاتووە کـە (کـافر) شـەڕکردنی حەڵاڵـە. بـەڵکو ئـەرکی پـیرۆزی ئیسلامیـشە. ﴿ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدْ الْكُفَّارَوالْمُنَافِقِينَا وغْلُظْ عَلَيْهِمْ ومَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ (سورة التوبة آية – ٧٣). یـەکگرتوو لـەم هاوسـەنگیەی هێـزە عەلمانیـەکانو لاسـەنگیەی خۆیـانو عەلمانیەکانـدا, خۆیـان لـە قـەرەی (تکفـیر) نـادەن. چـونکە خەڵکەکـەیانو ئیسلامیەکانی تر، دوایی داوای باجی (تەکفیر)ەکەشیان لێدەکەن. ئێستا خۆیـان لەم ئەرکە شەرعییە دەبوێرن. هـەروا, لەبەرامبـەر ئیسلامگەرا تیرۆریستەکانیش راستەوخۆ پێیان ناڵێن گومڕا, یان هەڵگەڕاوە لـە ئیسلام. چونکە گـەر ئەمـەیان کرد، دەبێ شەڕیشیان رابگەیەنن.

گەر دیقەت بدەین, نوسـەریش نـەیتوانیووە (القاعیـدە)و هاوشـێوەکانیان بـە ئیسلامی لەقەڵەم نـەدا. ئـەمیش رێـكو رەوان گوتویـەتی: یـەکگرتوو ئـەو شـێوە ژیانەو نمونە ئیسلامییە رەتدەکاتەوە کە ئەوان تەرحی دەکەن.

ئەم قسانە رایدەگەیەنن کەوا: ئەوان نمونەیـەکی ئیسلامین بـەڵام نمونەیـەکی جیاوازن لـە یـەکگرتوو. کەواتـە: ئایـە ئـەو قـسەیەمان راسـت دەرنەچـوو کـە لـە مێزگردەکەو لە مونازەرەکەشدا گوتومانە کە یەکگرتوو (نهج)ێکی جیاوازی هەیـە لەگەڵ (القاعدة) بەڵام (منهج)ی جیاواز نییە.

## (٨)
## گۆڕان و ئیسلامگەراکان

لە مونـازەرەی مامۆسـتا رەئـووف محەمـەدو ئێمـە لـە شـەوی (١١) ی سـپتامبەری ئەمـسالّدا, قـسە هاتەسـەر ئـەوەی ئەگـەر بێـتو ئیـسلامگەراکان سیاسەت‌و ستراتیژی خۆیـان لەگـەڵ گۆڕانکاریەکانـدا نـەگونجێنن‌و سیـستەمێکی دیموکراتی عەلمانی قبوڵ نەکەن‌و پێ‌لەسەر سیـستەمێکی ئیـسلامی دابگـرن, لـە گۆڕانکاریەکانـدا دەبنـە هەڕەشـە لەسـەر هـەلی ئاینـدەی کـورد. ئـەم مەسـەلەیە ئێـستاش دوپـات دەکەینـەوە. بـەڵام نوسـەر بـەئارەزووی خـۆی ئـەو قـسەیەی دارِشتۆتەوەو گوتویەتی:

**[ لێپرسراوەکەی بەرامبەر لە دوایەمین قسەیدا ئیسلامییەکانی کوردستانی بـەو هەڕەشـە لەقەڵەمـدا کـە دەتـوانن لەسـاتەوەختی گـۆڕان لـە عێراقـدا نـەهێڵن کـورد بگـات بـە ئامانجەکانی. کـە ئەمـەش چەواشـەکردنێکی ئاشکرای بینـەری کـوردە لەمـەڕ ئـەو هەڕەشـە راسـتەقینە نـاوخۆیی‌و هەرێمایەتیانـەی هەڕەشـە لـە ئێـستاو ئاینـدەی کـورد دەکـەن. بە پێچەوانەوە ئیسلامییەکان بەگشتی جگە لە (انـصار الاسـلام) کـە مەسـەلەی کـورد ئەوانـە جێگای بایەخیان نیە –و بەتـایبەتیش یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان بەشێکن لە هێزو وزە کوردیەکـە بـۆ رووبەڕووبوونـەوەی هەڕەشـەکان. خۆیـان وا پێناسـە کـردووە بەشـێکن لـە موعـارەزەی کـوردی, ئـەم مەسـەلە بـۆ یـەکگرتوو دیـدێکی سـتراتیژیە تەنانـەت گـەر فکـری توندڕەویش تـاڕادەیەك کێشە بێت فکـری ئیـسلا مخوازانەو مەدەنیانـەی یـەکگرتوو دەتوانێـت دەورێکی گەورە ببینێ بۆ کەمکردنەوەو ئابلوقەدانی دیاردەکە لەڕووی فکریەوە ].**

ئێمـە دەپرسـین؛ گـەر رژێـم گـۆڕدرا, لـەکاتی گۆڕانەکـەش گـەر بێـتو هێـزە ئیسلامگەراکان لـەناو عێـراق‌و کوردسـتاندا سوربن لەسـەر سیـستەمی ئیـسلامی خۆیان, یان بەرپەرچی سیستەمی دیموکراتی عەلمانی بدەنەوە, سـەرەنجام چـی رودەدا؟ ئایە ئەم جۆرە بۆچونانە نابنە مایـەی تەقینـەوەی گـەورەترین نـاکۆکی کە دوورنییە شەڕێکی ناوخۆی ناوەختیش بتەقێنێتەوە؟ ئایە لەدونیای ناکۆکییـە سیاسـی‌و فەلـسەفیەکاندا, دوو جەمـسەری نـاکۆك, لـە هەلومـەرجی گـۆڕدراوی سیاسیدا, کاتێـك سـووردەبن لەسـەر سـتراتیژی جیـاواز, چ مەترسـیەك بـۆ سـەر

گۆڕانکاریەکە پەیدادەکا؟ بەتایبەتی لەگەرمەی گۆڕانکاریو سەرکەوتنەکاندا خەڵك بەچەشنێ دەوروژێنو دەهەژێن، ئیدی بەشێوەیەکی خۆرسکی بڕیاری سیاسی جێبەجێ دەکەن. ڕەنگە ڕوداوێکی بچوك شەڕێکی فراوانی کۆنترۆڵنەکراوی لێبکەوێتەوە. بەتایبەتی جەمسەرێکی ناکۆکیەکان هێزە ئیسلامگەرا عەقیدەییەکان بن. شەڕیناوخۆ هەر لەم جۆرە ناکۆکیانەوە دەستیپێکردووە. شەڕ، لە بیرو ئەندێشەی جیاوازەوە، زەمینەی خۆش دەکرێ.(*)

یەکێك لە گەورەترین کێشە سیاسیەکانی یەکگرتوو، دژایەتیکردنیانە بۆ عەلمانیەت. ئەوان دیموکراسی سیاسی قبوڵ دەکەن، بەڵام عەلمانیەت ڕەتدەکەنەوە. دەستوری ئایندەی عێراقیش بێگومان عەلمانی مەدەنی دەبێ. هەر ئێستا پرۆژەی دەستوری کوردستانو عێراق کە لەلایەن خولی گواستنەوەی پەرلەمانەوە گەلاڵەکراوون، دەستوری عەلمانیو مەدەنی بون؛ دەسەڵاتەکان لێك جیاکراونەتەوە؛ دینی ڕەسمی دەوڵەت دیارینەکراوە؛ تەواوی مافەکانی ژنان بەرامبەر پیاو، سەلمێندراوە؛ دین کراوەتە عەقیدەی شەخسی.. تاد.

یەکگرتوو.. هەروا هەموو هێزە ئیسلامگەراکانی دیکەش، لەدوا سەرەنجامدا دەبێ بچنە ناو چوارچێوەی ئەم دەستورەوە. ڕێگەی مانۆڕیان نامێنێ، هەتا لەدەوری دەستورەکەدا بسوڕێنەوە.

هەڕەشە ناوخۆییو ئیقلیمییەکانیش.. ڕۆژانە لەسەر ئەم مەسەلانە پێشترو ئێستاش قسەکراوەو دەکرێ. هەموو هێزە سیاسیەکان، چەند ساڵێکیشە قسە لەسەر ئەم مەسەلانە دەکەن. ئێستاش قسە بەردەوامە. ئەوەتانێ کێشەکانی یەکێتیو پارتیش بەشێوەیەکی گونجاو، دەرهەق بەم هەلومەرجە چارەسەرکراوە. ئەم مەسەلانە ڕۆشنن. نوسەرو یەکگرتوو،و هێزە ئیسلامگەراکانیش، ئەم ڕاستییە دەزانن کە زۆر قسە لەسەر کێشە ئیقلیمیو ناوخۆییەکان کراوە؛ مەترسیەکانیشیان خراونەتەڕوو؛ لەگەڵ زلهێزەکانیشدا باسکراوون. بەڵام ئەوەی قسەی زۆر کەم لەسەرکراوە، مەترسی سیاسەتی ئیسلامگەراکانە لەعێراقو کوردستاندا. بەڵێ، لەسەر ئەم مەترسیانە قسەی زۆر

---

* ئەم پێشبینیەش هاتۆتەدی. ئەوەتانێ شەڕی ناوخۆی سونیگەراو شیعەگەراو عەلمانیەکان، بەتیرۆری هەزاران کەس، لەعێراقدا ڕۆژانە ڕودەدا. (تێبینی دوای چاپ)

کەم کراوە. نوسەر باش ئەم راستییە دەزانێ. بەڵام لەهەمان کاتدا دەشزانێ پێشوەخت قسەکردن لەسەر مەترسیی بۆچونی ئیسلامگەراکان چەند بە زیانی ئەو هێزانە دەشکێتەوە, بۆیە, نوسەر هەوڵدەدا ئاراستەی دیالۆگ لەسەر خۆیان لابەرێ‌و بیباتەوە سەر شەڕی ناوخۆو مەترسی ئیقلیمی لەسەر کورد. راستیەکەشی ئەوەیە دەبێ هەموو مەترسیەکان, وەکو خۆیان, بەپێی جیاوازی کاریگەری, باسبکرێن. وردیش لێکبدرێنەوە. بۆئەوەی نە ئێستاو نە لەئایندەش, خەڵك چەواشە نەکرێن, یاخود خەڵك لەپڕ نەکەونە سەر تەقینەوەی ناکۆکیە پێشتر باسنەکراوەکان.

یەکێك لە گیروگرفتە زیانبەخشەکانی سیاسەتی کوردیی, پێشبینی نەکردن بووە بۆ تەقینەوەی کێشە مەترسیدارەکانی هێزە سیاسی‌و ناکۆکییەسیاسیەکانی ناوخۆ. یان ناکۆکیەکانیان خەفەکردووە, یاخود سەرکوت کردووە, بەڵام گۆڕانکاریەکان ئەو ئەقڵیەتەیان جێهێشت. ڕۆژگاریش ناگەڕێتەوە دواوەو مێژووش دوپات نابێتەوە.

لەدوای راپەڕینیش, خەمساردی بەرامبەر ئیسلامگەراو فەرامۆشکردنی نەخشەو پیلانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و عەقیدەییان, زیانێکی زۆری لە ئەزمونی دیموکراتی, باری کۆمەڵایەتی, ئاراستە جیاوازەکانی ئازادی‌و دیموکرات دا. نوسەر دەیەوێ ئەو نانەی ژەندویەتییە رۆنی خەمساردی هێزە عەلمانیەکان‌و لەکاتی شەڕی ناوخۆدا بەچەوری قوتیانداوە, دەیەوێ, لەهەلومەرجێکی تریشدا, پاروو بەوشکی قوت نەداو دیسان پارو بەهەڵەی عەلمانیەکان چەوربکاتەوە. بۆیە, ئاراستەی دیالۆگ, لەبری باسکردنی هەمەلایەنەی مەترسییە فکریەکانی ناوخۆ, تەنهاو تەنها دیالۆگ دەبەستێتەوە بە شەڕی ناوخۆو فشاری ئیقلیمی.

(٩)

## تەلەفۆن‌و نەفەسی مێزگرد

لەشەشەمین خاڵی نوسینەکەیدا, نوسەر قسەلەسەر قۆرغکردنی تەلەفۆنەکان لە مێزگردەکەدا دەکا. ئەمەیان پەیوەندی بەمنەوە نییە. بەڵام دڵنیام هیچ نەخشەیەك لەئارادا نەبووە. چونکە ئەوانەی ژمارە تەلەفۆنیان داناوە خۆ نەیانگوتووە ئێمە یەککرتوین هەتا رێیان لێگیرابێ. ئەمە گەڕکردنە بە مێزگردەکە. بینەریش لەبیرێتی کەوا پرسیارو رەخنەی جیاوازیش لەهەردوولا کران.

سەبارەت بە خاڵی (٧) ی نوسەریش کە نەفەسی ئێمە نەفەسی دادگاییکردن بووە. چونکە دیکۆمێنتمان لەگەڵ خۆماندا هێناوە.

ئەوەی لە چەند ساڵی رابردودا, مێزگردەکانی ناو تەلەفزیۆن‌و هۆڵەکانی دیبێ. کە یەکەمین مێزگردیش لەسەر تەلەفزیۆن‌و لەناو هۆڵدا بەرامبەر ئیسلامگەراکان, کۆمۆنیستی کارگەری, نوسەری بێلایەن, هێزەکانی تریش, ئێمە سازمان داوون‌و لەسەر ئەم مێزگردانەش دوچاری مشتومڕی زۆر هاتوین. تەنانەت لەناو حیزبەکەی خۆشماندا. یەکێك لەوانە نوسەر خۆشی بووە کە مونازەرەمان لەگەڵ کردووە. ئەگەر هەرکەسێك ئێمەی دیبێ لەو مونازەرەو مێزگردانەدا, دەزانێ لەهەمویاندا کتێب‌و بەڵگەنامەمان هێناوە. ئەمەش لەبەر دادگاییکردنی هیچ کەس‌و هیچ لایەك نەبووە, بەڵکو بۆ سەلماندن‌و پێسەلماندنی بەرامبەرو بینەرو ئامادەبوان بووە.

هەموو لایەکمان دەزانین چاپەمەنی کوردیی زۆر نییە. بەڵگەنامەکانیش لەبەردەستی زۆربەدا نییە. لەرووبەڕووبونەوەی مونازەرەو مێزگردا, ناکرێ تەنها پشت بە یادەوەری خۆت‌و خەڵك ببەستی. بەڵکو زۆر گرنگە بەڵگە بدەیتەدەستەوە. چەند جارێك بە ئۆڤەرهێتیش بەڵگەمان خستۆتە سەر شاشە بۆ ئامادەبوان. ئەمە رێگایەکی زانستی دیالۆگە. کەسیش لەبەرامبەر, یان لە هیچ لایەکی قەدەغەنەکردووە، بەڵگەنامە بۆ پشتیوانی بۆچونەکانی بهێنێتەوە.

ئەسڵی مەسەلەکەش ئەوەیە کە هەندێك هێز, لەوانە هێزە ئیسلامگەراکان, لە مونازەرەو مێزگرد دەسڵەمێنەوە. چونکە لە رووبەڕووبونەوەی تەلەفزیۆن‌و ناو هۆڵەکان, راستیەکان راستەوخۆ بۆ خەڵك ساغ دەبنەوە. ئەمە لەکاتێکدا, یەکگرتوو, یان هەر هێزێکی ئۆپۆزسیۆن, لە کاری نهێنیدا, لەناو ماڵان‌و منالان‌و گۆشەی مزگەوتەکاندا, دەتوانن بەیەك ئاراستەی رۆحی کاربکەنە سەر خەڵکێکی دیاریکراو. بەڵام لە رووبەڕووبونەوەدا, هەموو قسەیەك مشتومڕی لەسەر دەکرێ. قسە بێ رەخنە تێناپەڕێ. گرنگی دیموکراتی‌و ئازادی لەوەدایە, بیرو فەلسەفەو بۆچون هەڵدەسەنگێندرێ‌و تەنها لە کولەکەدا بانگ نادرێ. دەستبەجێش, لەمونازەرەو دیالۆگی رووبەڕوی مێزگردەکاندا, دەبێ توانای لێکدانەوە, وەڵامدانەوە, سەلماندنەوە, بەرپەرچدانەوە, بەڵگەهێنانەوە هەبێ. چونکە بینەرو ئامادەبوان یەکسەر حوکم لەسەر راستی‌و ناڕاستی قسەکان، بەپێی سەلماندن‌و نەسەلماندنیان دەدەن. حوکمی مونازەرەو مێزگرد, حوکمی

ساتەوەختە. حوکمی تیژپەڕە. زۆرجار رای گشتی لەسەر هەڵبژاردنی پەرلەمانو سەرۆکایەتی وڵاتان, بە مونازەرەیەکی تەلەفزیۆنی دەگۆڕێ.

هیچ کەسێك, لەسەرئەوە عەیبدار نابێ بەڵگەنامەی لە مێزگرددا هێناوە, بەڵکو لەسەرئەوە گومان دەخرێتە سەر بۆچونەکانی، کە نەتوانێ زانستیانە قسە بکاو قسەکانی بە لۆژیکی سەردەم بسەلمێنێ.

کاکی نوسەر گلەیی چی دەکا لەسەر بەڵگە؟ بۆچی بەڵگەنامە دەکاتە بەڵگەی دادگاییکردن؟ مەسەلەکە وەکو هەڵمەتی پروپاگەندەی هەڵبژاردنیش نەبوو, وەکو نوسەر وای دەنوێنێ, بەڵکو مێزگردەکە لەسەر روداوێکی چارەنوسسازی جیهانی بوو, کە شتێکی بەڵگەنەویستە دیدی یەکێتیو دیدی یەکگرتوو, لە زۆر روەوە جیاوازە لەسەر روداوەکە. هەرلایەکیش بەپێی باوەڕی خۆی دەیەوێ لەناو خەڵکدا راستی بۆچونەکان دەربخا. ئەمە ئیتر نە دادگاییکردنەو نە هیچ شتێکی تر. بەڵام نوسەر گەر ئەنجامی مێزگردەکەی بۆخۆیان بەدڵ نییە. ئەمەیان شتێکی دیکەیە. تازە بەنوسینی ئەم ستونەش, باری سەنگەو لاری بۆچونەکانی یەکگرتوو لەسەر (١١)ی سپتامبەر, راست ناکرێتەوە, چونکە لەبنچینەدا بارەکە خوارە. بۆچونی یەکگرتوو، لەبەرئەوەی پێچەوانەی (منهج)ی هاوبەش نەکەوێتەوەو پێچەوانەی شەرعی هاوبەشی ئیسلام سەبارەت بە موسوڵمانان نەشکێتەوە, بۆچونیان لەسەر (١١)ی سپتامبەرو رادەی بەرپرساریێتی (القاعیدە) لە روداوەکە, هەڵەی دیاری تیا کراوە. لە مێزگردیشدا, ئەو هەڵانە جێی خۆیەتی باس بکرێن.

(١٠)

## زمانی یەکپارچەیی دیالۆگ !

لەکۆتایی ستونەکەی نوسەردا, کە هەموو کاردانەوەیە لەسەر مێزگردەکەو سەرەنجامەکەی, بەم شێوەیە لە هەلومەرجی ئێستاو دیالۆگو یەکپارچەیی تێگەیشتووە:

**[ لەکۆتاییدا دەڵێم کێشەی سەرەکی ئەم وڵاتە لە چەندین ساڵی رابوردودا کێشەی ناکۆکی نێوان دو پارتە دەسەڵاتدارەکە بووە. ئێستاش هێزە کوردیەکان لەسەر زۆربەی پرسەکانی تایبەت بە عێراق و کوردستان هاوبیروڕان. ئەم جۆرە نەفەس و گوتارە**

**بەسەرچووەش خزمەت بـە ئێـستاو ئایندەی هـەرێم ناکـات. تاکـە ڕێگـای ڕاست لەبـەردەمی ڕێکخـستنی پەیوەندییــە ناوخۆییەکانیــشدا زمــانی دیــالۆگ و ئرخانــدنی ڕۆڵــی یــەکترو ڕەواندنــەوەی هــەموو گومــان و ڕاڕاییەکــە کــە ژیــان بــە یەکپارچــەیی خــەڵك و هێزەکــانی دەگەیەنێت] .**

جارێ.. کێشەی یەکێتی و پارتی، ڕاستە کێشەیەکی سـەرەکی بـووە. هێشتا شوێنەوارەکانی کێشەکانیش ماوە، بەڵام لـە چـەند سـاڵی ڕابوردودا، ئـەم وڵاتـە تەنها گیرۆدەی ئەم کێشەیە نەبووە. بەڵکو چەند سـاڵێك کێـشەی هەرەسـەرەکی وڵات، گەمارۆی ئابوری و برسێتی و نەبونی بوو. هـەر ئـەم کێـشەیەش لـە سـاڵانی (١٩٩٤) کـە سـاڵی دامەزرانـدنی یـەکگرتووی ئیـسلامییە، هـەتا سـاڵی (١٩٩٧) ماوەیەکی گرنگی پەرەسەندنی یەکگرتوو بـوو، لـەناو بەشـێکی خەڵکدا. ئـەویش پەرەسەندنێك کە یەکگرتوو بەپارەی مۆڵی وڵاتانی دۆستی (کە هێشتا حکومەتی هەرێم نازانێ ئەو پارەیە مانگانە چەند بووەو چۆن هێنـراوەو چ لایـەك بـەنهێنی پێی داوون) بەو پارەیە یەکگرتوو، قەیرانی گەمارۆی ئابوری قۆزتـەوەو سەنگێکی بۆخۆی پەیداکرد. ئەو سەنگەی هـەیـەتی بەبەرنامەیـەکی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و خزمـەتگوزاری لـەو ئاستـەنگە ئابوریيـەدا بـۆ سـوککردنی بـاری گرانـی خەڵکـە برسیەکە، بەدینەهێناوە. بەڵکو بەقۆزتنەوەی ئاستەنگی نەبونی خەڵك، خەڵکیان ناچارکرد بچنە ڕیزیانـەوە. سیاسـەتێکی سـەیرە، هێزێـك بـەناوی ئیـسلامیەوە، پارەی بێگانە وەربگرێ و خەڵکی برسی و ڕەجاڵی پێ لە خشتەبەرێ.

یەکگرتوو، زۆرجـار ڕەخنـەی لەسـەر دەسـەڵاتەکانی کوردسـتان ئەوەیـە کـە دەسەڵات بۆ دامەزراندنی خەڵك و کۆکردنـەوەیان لـە دەوری خۆیـان، بـەکاردێنن. کەچی خۆیان دەسەڵاتیان نییە، بەڵام بە پـارەی دەسـەڵاتەکانی تـر، دەسـەڵاتی ڕۆحی لەناو خەڵکدا پەیدا دەکەن. گەر یەکێتی و پارتی فـشاری دەسـەڵات بکەنـە کەناڵی ڕێکخستنی خەڵك، هەڵەیەکە دژی دیموکراسی. دیارە یـەکگرتوو یان هـەر هێزێکی تریش بەهۆی پارەو موچەو یارمەتیەوە، لەکاتی برسێتیدا خـەڵك بکەنـە ئەندامی خۆیان، ئەمیش هەڵەی دووزەردێنەی سەلەفییە. بـەڵکو کـارێکی دور لـە گیانی شارستانیشە.

بەڵێ.. لە چەند ساڵی ڕابوردودا، ئەو کێشانەش سـەبارەت بـە ژیـان و بـژێوی خەڵك، کێشەی سەرەکی بون. نەك هەر کێشەی سیاسی یەکێتی و پارتی.

ئێستا کە ئاشتبونەوە هاتۆتەدی. باری گوزەرانی خەڵکیش باشتر بووە. ئومێدێکی گەورەش بە ئەگەری گۆڕانکاری رژێم پەیدابووە. ئا لەم کاتەدا نوسەر دەڵێ:

**[ تاکە رێگای راست لەبەردەمی رێکخستنی پەیوەندییە ناوخۆییەکانیشدا زمانی دیالۆگو نرخاندنی رۆڵی یەکترو رەواندنەوەی هەموو گومانو ڕاڕاییەکە کە زیان بە یەکپارچەیی خەڵكو هێزەکانی دەگەیەنێت ].**

ئاخۆ نوسەر دەبێ چ زمانێکی دیالۆگی مەبەست بێ: ئەو زمانە دیالۆگەی هەڵەی یەکتر باس نەکەین؛ کەموکوڕی یەکتر نەخەینەڕوو؛ مشتومڕ لەسەر فەلسەفەو بۆچونەکان بکوژین؛ زمانی رەخنە قەدەغە بکەین؛ ناکۆکیەکان داپۆشین؟ نوسەر.. مەبەستی ئەم دیالۆگەیە کە هیچ چەشنە جوانیو ئازادیەکی تیا نییە. وڵاتو هێز زۆرن لەوجۆرە دیالۆگە دەکەنو بەوجۆرەش رێز لە یەکتر دەگرن، کە نوسەر بانگەوازی بۆدەکا. بەڵام ئەو وڵاتانە، لەچاو وڵاتە دیموکراتیو ئازادیبەخشەکان، ژیان تیایاندا ساردوسڕ دەگوزەرێ، چەوساندنەوەش هەتا بیناقاقایە. ژنانیش رەشپۆشن.

زمانی دیالۆگ، پێش هەموو شتێك زمانی کردنەوەی دەرگای جیاوازیەکانە؛ کە دەرگای جیاوازیەکانیش کرایەوە، ئیتر رەخنەگرتن لە هەموو شتێك، تەنانەت بە ئازادی ویژدانو رەخنەلێگرتنی تێکستە پیرۆزەکانیشەوە، دەبێ دەستەبەربکرێ. زمانی دیالۆگو رێزلەیەکترگرتن، ناکاتە قڕوقپکردن لەسەر بۆچونی یەکترو هەڵەی یەکتر باسنەکردن.

پاشان.. دیالۆگ.. واتای دروستکردنی پرسیاری نوێو گەڕانە بەدوای وەڵامی نوێدا. دیالۆگ پرسیاری ئامادەکراوی سەپێنراو نییە. دیالۆگ قبوڵکردنی وەڵامی رەهاش نیە. هیچ شتێك لەدیالۆگدا، رەهاو سەپێنراو نییە. هەموو شتێك لە دیالۆگدا، قابیلی دیالۆگە. کە هەموو شتێکیش قابیلی دیالۆگ بێ، کەواتە گومان پەیداکرن لەسەر بۆچونو پرسیارکردن لەسەر بۆچونو رەخنەلێگرتنی بۆچونیش، ئەرکێکی گرنگی دیالۆگە. نەك وەك نوسەر دەڵێ: رەواندنەوەی هەموو گومانو ڕاڕاییەك کە زیان بە یەکپارچەیی خەڵكو هێزەکانی دەگەیەنێت. دەبێ بزانین گومان تا گومان هەیە. گومان هەیە باشەو هەشە خراپە.

بەپێچەوانەوە, نەبونی پرسیارو نەورووژاندنی گومانی رەوا, زیان بە یەکپارچەیی هێزەکان‌و خەڵك دەگەیەنێت. گومان.. سەرەتای پرسیارکردنە. پرسیارکردنیش دەرگای رەخنە دەخاتە سەر پشت. کە دەرگای رەخنەش ئازادانە کەوتە سە رگازی پشت, ئینجا راستیەکان باشتر دەردەکەن‌و هیچ کەسێك، هێزێك، دەسەڵاتێك، ئاین، مەزهەب‌و عەقیدەیەك, ئیتر ناتوانێ راستیەکان مۆنۆپۆڵ‌و ئەقڵەکان کلۆم بکا.

یەکپارچەیی خەڵك‌و هێزەکان, لە حیزبێکەوە بۆ حیزبێکی تر, لە هێزێکەوە بۆ هێزێکی تر, لە فەلسەفەیەکەوە بۆ فەلسەفەیەکی تر, جیاوازە.

یەکپارچەیی خەڵك‌و هێزە دیموکراتە هاوچەرخەکان, جیاوازە لە یەکپارچەیی خەڵك‌و هێزەکانی سەدەکانی ناوەڕاست. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا, لەناو ئاینەکاندا, لەسایەی دەسەڵاتە ثیوکراتی‌و ئورستوکراتەکاندا, گومانیان دەکوشت‌و پرسیاریان دەخنکاندو رەخنەیان بەتاوان دەزانی. بەڵام لەم سەردەمەدا وا نییە؟ پێچەوانەیە. یەکپارچەیی خەڵك لەم سەردەمە, بە دەستەبەرکردنی تەواوی ئازادیەکانە. بە دەرخستنی جیاوازیەکانە. بە رەخنەلێگرتنی کەموکوڕیەکانە.

لەو وڵاتانەدا کە ئازادیەکی تەواو هەیە, رەخنەیەکی هەمەلایەنەو جیاوازی بۆچەندوچونیش هەیە, لەهەمانکاتدا یەکپارچەیی خەڵك‌و هێزەکان زۆر بەهێزترە لەو وڵاتانەی هیچ ئازادیەکیان تیا نییەو، دەرگاکانی رەخنەیان داخستووە. کۆنگرێسی ئەمریکاو هێزە سیاسیەکانی لەسەر (١١) سپتامبەر یەك دەنگ‌و یەك هەڵوێست بون. رۆژانەش لەو وڵاتەدا هەزاران گومان‌و سەدان هەزار رەخنەو بۆچونی جیاواز دەکەوێتە ناو میدیاکانەوە. کەچی لەسەر مەسەلە چارەنوسسازەکانیان یەکپارچەو یەك هەڵوێستیشن. بەپێچەوانەشەوە, کاتێك ئازادی‌و دیموکراتی لەئەمریکادا نەبوو, لە سەدەی هەژدەدا, شەڕی ناوخۆی خوێناوی‌و کوشتنی دەیان هەزار کەس کەوتە ناویان.

نوسەر داوای دیالۆگ دەکا, بەڵام پەستیشە لە دیالۆگی مێزگردی (گفتوگۆی سێشەممە) کە بەبەڵگەنامە بۆچونی هەڵەی یەککگرتوو لەسەر (١١)ی سپتامبەر رەخنەی لێگیراوە. ئەمە چۆن دیالۆگێکە لەسەر بەڵگەو رەخنە پەست بن.

رەخنەش لەسەر سیاسەت، نەخوازەڵڵا بگاتە سەر تێکستە پیرۆزەکان و ئازادی ویژدان، ئاخۆ بگاتە حاڵەتی وا نوسەرو هاوڕێبازەکانی دەبێ بڵێین چی؟

لەکۆتاییشدا، دەڵێین: تازە ئەو رۆژگارە بەسەرچوو گومانی رەوا بەناوی ئاینەوە نەهێڵین؛ ئەو سەردەمە بەسەرچوو، پرسیاری راست بەناوی یەکپارچەییەوە خەفەبکەین؛ ئەو سەردەمە بەسەرچوو بەناوی یەکێتی هێزەکانەوە رەخنە بکوژین. ئەو سەردەمە تەواو.. بەڵکو بەرێوەین بۆ گومانی زیاترو پرسیاری گرنگترو رەخنەی کاریگەرتر لەسەر هەموو شتەکان.. ئەوەی هەیەو نییە، هێڵە سورەکان تێکڕا دەبەزن. دڵنیاین، ئازادی بیر پەرەدەسەنێ بۆ ئازادی ویژدان. کە ئازادی ویژدانیش هاتەئاراوە، ئیتر دەرگاو پەنجەرە داخراوەکانی رەخنە لەسەر دەقە چەقەبەستوەکان، تێکڕا دەکرێنەوە، تەنها ئەوکاتە رەخنە بەهەموو رەهەندەکانی بڵاودەبێتەوە.. هەر ئەوکاتەش، زۆر گرنگە بەڵگە بۆ رەخنەکان، باشتریش لەئێستا، بخرێنەڕوو.

## وەڵامی.. وەڵامەکانی بەرپرسێکی یەکگرتوو[+]

### لەیەکەم ژمارەی رۆژنامەی (ئاوێنە)دا

لــەژمارە (١)ی (٢٠٠٦/١/٣)ی رۆژنامــەی (ئاوێنــە)دا، وێــرای پیرۆزبــایی دەرچواندنی رۆژنامەکە، چاوپێکەوتنێك لەتـەك بـەرێز (مامۆستا عـەلی محەمـەد) ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکگرتووی ئیسلامی ساز کراوە، تیایدا وەڵامـی (٢٢) پرسیاری (دانا ئەسعەد) دراوەتەوە. سەرجەم پرسیارەکان پەیوەندیان بەرِوداوی پــەلاماردانی بارەگاکــانی یــەکگرتووی ئیــسلامی لەناوچــەکانی بادینــان‌و هەڵبژاردنەوە هەیە. جگە لەو مەسەلانە، وەڵامەکانی مامۆستا عەلی محەمەد پـەلی بۆ زۆر مەسەلەی سیاسی‌و مێژوویی یەکگرتوو، هـەروا، لەروانگـەی ئـەم حزبـەوە لەکوردســتاندا هاویــشتووە. بۆیــە، وەڵامدانــەوەی چــەند وەڵامدانەوەیــەکی مامۆسـتای نـاوبراو، بـەگرنگ دەزانـین. بـەهیوا، خوێنـەری وشـیاریش بتـوانن راستیەکان لەم جۆرە شـەن‌و کـەو کردنانـەدا، باشـتر بـزانن. ئەگـەر بەشداریش لەشەن‌و کەو کردنەکەدا بکەن، خەرمان بەرەکەت!

(١)

### هەروا زوو .. یەکگرتوو

دانـا.. سـەرەتا (١٠) پرسـیار لەمیوانەکـەی لەسـەر پـەلاماردانی یـەکگرتوو لــەبادینان دەکــاو بەشــێوەی جۆراوجــۆر وەڵام دەدرێتــەوە، تــەنها وەڵامــی پرسیارێکی ئەو رووداوە، بەش بـەحاڵی خۆمـان، مایـەی رامانـە، کـە (دانـا) لێـی دەپرسێ:

---

[+] لەژمارە (٦١ ، ٦٢ ، ٦٣ ، ٦٤) ی رۆژنامەی (چاودێر) لەساڵی (٢٠٠٦)دا بڵاوکراوەتەوە.

**بەدوای ئەو رووداوەدا سەرۆکی حکومەتی هەرێم/ ئیدارەی هەولێر لەلێدوانێکدا رایگەیاند یەکگرتووی ئیسلامی هاوپەیمانی ئێمەیە. ئێوە دەڵێن چی؟**

لەم وەڵامەدا.. وادیارە یەکگرتووی ئیسلامی لەسەر مەسەلەی هاوپەیمانی راچڵەکیونو متمانەیان بەپارتی نەماوە. بەڵام سیاسەتی ناچاریان لەگەڵ دەگرنە بەر. بۆیە (م. عەلی) دەڵێ:

**رەنگە لەخۆی بپرسن باشتر بێت، گەر هاوپەیمانی وابێت دیارە ئەمە پێناسەیەکی تازەیە بۆ ئەو وشەیە، لەروویەکی ترەوە دەکرێت بەدەربرینی نییەت پاکی تەماشا بکرێتو بەمەبەستی دڵنەوایی بووبێتو هەوڵێك بێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.**

لەسەر ئەو وەڵامە، پێویستە ئەوە بڵێین: راستە روداوەکە بەرامبەر یەکگرتوو نارەواو دژە دیموکراسی بوو، بەڵام جێی خۆشیەتی بپرسین کە: ئایە، لەو جۆرە رووداوە، بەڵکو خراپتریش، لەکوردستاندا رووی نەداوە. بێگومان روداوی خراپتریش، نەك بەرامبەر حزبێك، بەڵکو بەرامبەر چارەنوسی سیاسی کوردستانیش، چەندین جار لەدەهەی رابردوودا کەیەکگرتووش سەریهەڵدا بوو، روویداو روویانداوە، یەکگرتووش لەهاوکێشەکاندا بوون، بەڵام هەڵوێستی لەم جۆرەیان نەبووە کەبەرامبەر حزبەکەی خۆیان نواندیان. زیاتریش لەوە، ئەگەر یەکگرتوو، پێش روداوی ٣١ی ئاب، جۆرێك لەبێلایەنی سیاسی لەنێوان یەکێتیو پارتیدا پاراستبێ، ئەوا دوای ئەوە ئاشکرا چووە ناو حکومەتی پارتییەوە. خۆ ئەگەر لەوەش زیاتر نمونە بهێنینەوە، یەکگرتوو لەبەرامبەر روداوەکانی (جوند الاسلامو ئەنسار الاسلام)یش کەسەرکردەی کوردو هێزی پێشمەرگەیان دەکوشت، هەڵوێستێکی ئەوتۆیان لەئاستی رووداوە خوێناویەکان دەرنەبڕی. لەم قسانەدا مەبەستمانە بڵێین:

یەکگرتووی ئیسلامی، لەناو پرۆسەیەکی سیاسیداو لەبەرامبەر رووداوێکدا کەبەرامبەر خۆی روویداوە، هەروا زوو رادەچڵەکێ. کەچی بەدرێژایی مێژوو، لەسەرەتای حەفتاکانەوە خۆیان تەجمید کردووە، لەبەرامبەر هیچ کارەساتو روداوێکی خەتەرناك، کەموزۆر، لەباری سیاسییەوە نەجوڵاوون (پاشان دێینەوە سەر ئەم راستییە).

سەبارەت بەوەی کەبۆچی یەکگرتوو، لەهەڵبژاردنی پێشوودا، لەگەڵ لیستی هاوپەیمانی کوردستاندا بوو، کەچی لەم هەڵبژاردنەدا سەربەخۆ بەشداربوو، (دانا)ی رۆژنامەنوس وەڵامێکی درێژ وەردەگرێتەوە، ناچار کۆپلە کۆپلەی ئاماژە پێ دەکەین، ئینجا وەڵامی دەدەینەوە. (م. عەلی) دەڵێ:

**لەبەر ئەوەی یەکێ لەئەرکەکانی ئەندامانی پەرلەمانی رابردوودا نوسینەوەی دەستور بوو بەباشمان نەزانی بەجیا دابەزین لەبەرئەوەی کورد لەو قۆناغە یەکپارچەیی پێویست بوو تا لەنوسینەوەی دەستوردامافەکانی میللەتی کورد بچەسپێنێت، گەر جیاش بووینایە هەر دەبوو دواتر یەکمان بگرتایە چونکە بەرژەوەندی میللەتەکەمان وای دەخواست، بۆیە هەر لەسەرەتاوە بەیەك لیست بەشداربووین، بەهەمان شێوە لەرا پرسی دەستوردا بارودۆخەکە وای دەخواست کەبەیەك لیست دابەزین. بەلام دوای ئەوەی دەستور نوسرایەوە زۆربەی زۆری داوا رەواکانی گەلی کورد لەدەستوری هەمیشەیی عێراقدا جێگیر بوو، بەلامانەوە ئاسایی بوو بەجیا بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەین.**

لەم وەڵامە واتێدەگەین کە (م. عەلی) پێیوایە لەبەر دەستورو مافەکانی گەلی کورد، یەکپارچەیی کوردستان پێویست بووە. دوای ئەوە ئیتر پێویستی بەیەکپارچەیی نەماوە، بۆیە یەکگرتوو بەلیستی سەربەخۆ دابەزیوەتە مەیدانی هەڵبژاردن. بەرۆشنی دەڵێ (کورد لەو قۆناغە یەکپارچەیی پێویست بووە).

ئەم تێگەیشتنە سیاسییە بۆ یەکپارچەیی گەلێك، کە تازە تێدەکۆشێ مافە دیموکراسیەکانی لەدەستوردا دەستەبەر بکات، چەندین هەڵەی سیاسی تیایە. وەکو:

یەکەم: قۆناغ.. لەفەرهەنگی سیاسیدا، ماوەیەکی سیاسی دوورو درێژە. ئەرکی جۆراوجۆر لەقۆناغەکاندا هەیە. یەکێك لەو ئەرکانە، نوسینی دەستورو چەسپاندنی مافە یاساییەکانە.

دووەم: مافی فیدراڵی.. گریمان وەکو (م. عەلی) دەڵێ، (زۆربەی هەرە زۆری) داوا رەواکانی کوردیشی تیا جێگیر بووبێ، ئاخۆ لەقۆناغی رزگاریو دیموکراسی گەلێکی ژێر دەستەدا، کەبەشێکی مافە دیموکراسیەکانی لەسیستەمی فیدراڵدا دێتە دی، ئیدی قۆناغی رزگاری گەلێکی ئاوا، ئەرکەکانی تەواو دەبێ؟ بێگومان نەخێر. ئەمە لەکاتێکدا گەر بێتو تەواو مافە فیدراڵەکانیش بێنە دی. چ جای بۆ بەدی هێنانی بەشێکی ئەو مافانە، وەکو ئەمەی کوردستانو عێراق، کەتەنانەت وەکو فیدراڵیەکەی سودانیش نییە!

سێیەم: وەکو (م. عەلی) دەڵێ، نەك زۆربەی زۆری داوا رەواکانی کورد لەدەستورو، لەم قۆناغەدا نەهاتونەتە دی، بەڵکو لەم دەستورەدا بەهەزار حاڵ بەشێکی مافە رەواکانی هاتونەتە دی. بەشێکی بەرچاویشی بەتەواوەتی رەتکرانەوە. ئەمە جگەلەوەی هێشتا (٥٢) کێشەی چارەسەرنەکراو، بەهەڵپەسێردراوی ماونەتەوەو بریار وایە لەدوای

هەڵبژاردنی پەرلەمان، قسەیان دەربارە بکرێ، کەبەشێکی زۆری ئەو کێشانە ئەوانەن کەچ لەسەر ئاستی عێراقو چ بۆ کوردستان، پەیوەندییان بەمەسەلە دیموکراسیو نەتەوەییەکانی کوردەوە هەیە. ئیدی چۆن چۆنی لەم (قۆناغەدا! !) زۆربەی زۆری داواکانی کورد هاتونەتە دیو ئیتر یەکپارچەیی کورد پێویست نەما.

(م. عەلی) کەبەو شێوەیە سەیری قۆناغی سیاسیو یەکپارچەیی گەلی کورد دەکا، ئەمە بێ تەمومژ دیسەلمێنێ کەوا رەهەندی سیاسی یەکگرتوو، بۆ مەسەلە نەتەوەییەکان، چەند کورت بینی تیایەو، چەندیش مەسەلە دیموکراسیەکان، لای یەکگرتوو، ئەرکێکی تاکتیکییە. گەر وانەبا، نەدەبا، یەکگرتوویەکی سیاسی – ئیسلامی کەخۆیان بەهێزێکی میانرەوی مەدەینخواز دەزانن‌و دوورن لەرادیکاڵیەتی سیاسی، هەروا زوو باز بدەن بەسەر قۆناغی سیاسی گەلێکی رزگاریخوازداو، لەخۆشیان رابیینن لەدوای کەمتر لەساڵێك لەهاوپەیمانی سیاسی بێنە دەرو بشلێن: یەکپارچەیی کۆتایی هات، بۆیە سەربەخۆ دابەزیوین.

بەڵێ.. لەروانگەی یەکگرتووەوە یەکپارچەیی سیاسی بەچەسپاندنی بەشێکی مافە سیاسیەکانمان (نەك زۆربەی زۆری) لەدەستوردا کۆتایی هاتووە، بەڵام خەبات کردنیان بۆ هێنانە کایەی حکومەتێکی ئیسلامی (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەری شکست خواردووی رۆژگار بەسەرچوودا، هێشتا کۆتایی نەهاتووە. ئا ئەمەیە تێگەیشتنی راستەقینەی یەکگرتووی ئیسلامی، بۆ کێشەی نەتەوایەتیو مەسەلە دیموکراسیەکان.

(٢)

## چەق پێ بەستنی واقیع!!

لەبەشێکی دیکەی هەمان وەڵامی (م. عەلی)دا، دیدێکی رادیکاڵانە دەردەبڕێو لەپێستی میانرەوی دەچێتە دەرێو دەڵێ:

**لەلایەکی ترەوە، بەمەزەندەی ئێمە واقیعی سیاسی کوردستان بوویەوە واقیعێکی چەقبەستوو دۆگما بەجۆرێك کەدەنگدەر هیچ گرنگییەکی لەدەنگەکەی خۆی نەدەبینی.**

هەقوایە بزانین ئەم مەزەندەیەی یەکگرتوو بەچ پێوانەیەکی سیاسی مەزەندە کراوە؟ یاخود بەچ میتۆدێك پرۆسە سیاسیەکە خوێندراوەتەوە؟ کەئاوا بەئاسانی دەیانەوێ (واقیعی چەقبەستووی دۆگما) بەلیستێکی سەربەخۆ، بگۆرن.

جـارێ.. بـا (واقیعـی چەقبەسـتووی دۆگمـا) هـەروەکو (م. عـەلی) بـەکاری هێناوە، هەڵبسەنگێنین، ئینجا بێینە سەر ئەوەی داخۆ بەراستی یـەکگرتوو، بـەم لێکترازاندنـەی یەکپارچـەیی ریـزی لیـستی هاوپـەیمانی، دەتوانـێ ئـەو واقیعـە سیاسییە چەق بەستووە بگۆرێ.

واقیـع.. لـەبوونی چـەندین حـزبو ململانێـی حزبایەتیـدا، هـەروا لەسـایەی جیاوازی رێبازی حوکمڕانیدا، هـەرگیز چـەق نابەسـتێ. بـەڵکو واقیعـی سیاسـیو حوکمڕانی ئاوەهـا، هەمیـشە دەگـۆرێ. پاشـان، چـۆن دەشـێ واقیعێـك لەچـینی جیاوازو ژیانی کۆمەڵایەتی پڕ لەکێشمەکێشی چینایەتیو سیاسـیو روناکبیری، جیاواز پێك هاتبێ، ئاوا بەئاسـانی چـەقی پـێ ببەسـترێ. تەنانـەت ئەگـەر تاکـە حزبی سیاسیش لەئارادا نەبێ، واقیع چەق نابەستێ. بەڵکو لـەباری زانـستییەوە، لەدواکەوتوترین کۆمەڵەکانی دونیاشدا، ناشـێ بـەرەهایی باسـی واقیعێکـی چـەق بەستوو بکرێ. تەنانـەت خێڵـە هـەرە دواکـەوتوەکانی ئـەفریقاش، واقیعەکـەیان چەقی نەبەستوەو بەئاستەمیش بێ، هەر دەگۆڕێن.

ئەگەر لەمەسـەلە تیۆرییـەکانی رەتکردنـەوەی واقیعـی چەقبەسـتووی دۆگمـا گـەرێینو بمانـەوێ فەلـسەفەیەك، یـان ئایدۆلۆژیـەتێك، یـاوەکو ئایدیایـەکی تـاقیکراوەی رۆژگـار، بـۆ چـەق پـێ بەسـتنی واقیعـی کۆمەڵایـەتی، بەنمونـە بهێنینـەوە، نمونـەی ئاوهـا تـەنها نمونـەی ئایینـە سەپێنراوەکانە کەبەدرێـژایی مێژوو، نەك هەر ئاینی ئیسلام، بەڵکو تەواوی ئاینەکان، هەرچی توانـای ئـایینیو کاریگەری رۆحی خۆیانە، خستویانەتە کار بۆ چەق پێ بەستنی ژیـانو قـەتیس هێشتنەوەی کۆمـەڵ لەمەسـەلە رۆحیـە میتافیزیکیەکانـدا، بـەڵام هـیچ ئاینێـك، نەپێش زایینو نەدوایساڵی کۆچیش، چەقی ژیانی کۆمەڵایـەتی هـیچ کۆمـەڵێکی پێ نەبەستراوە. بەڵکو ئەوە ئاینـەکان بـوون، ناچـار کـراوون چـەقی بەسـتراویان بکەنەوەو دەگەڵ گۆرانکاریـەکان بکـەوون. بۆیـە، نـەدەبوو (م. عـەلی) کـەخۆیو حزبەکەی باش بـاش مێـژووی دەسـەڵاتی سـەپێنراوی ئیـسلام دەزانـن، دەبوایـە بیزانیبا، ئەندێشەی چەق بەسـتووی ئیـسلام، بەشمـشێرە لـەخوێن ژەنراوەکـانی دەسەڵاتەکانیانیـشەوە، نـەیانتوانیبێ ژیـان لـەقاڵبی چەقبەسـتووی سـەلەفیەتدا بپەستێوون، ئەوا لەم سەردەمەدا، هەرگیز یەکێتیو پارتی کاری وایـان لەدەسـت نایەت. بەڵکو ناکۆکیەکانی یـەکێتیو پـارتی، بەشـێکی بەرچـاوی، دەبنـە مایـەی گۆرانکاری، نەك چـەق بەسـتنو دۆگمـا ! ! بۆپـشتیوانی کردنـی بۆچـونەکانی (م. عەلی) ئەم نمونە سیاسییە دەهێنێتەوە:

**باشترين نموونەش هەڵبژاردنى پەرلەمانى كوردستانە كەيەك ساڵە نەيتوانى حكومەت يەكبخاتەوەو ئێستاشى لەگەڵدا بێت هەموو بەرنامەكان لەمەكتەبى سياسى يەكێتى و پارتييەوە دادەنرێت و پەرلەمان تەنها موافەقەت و دەست هەڵبڕينى لەسەرە.**

لەوەڵامدانەوەى ئەم پەرەگرافەدا، دەڵێين: خۆزيا.. حكومەتى كوردستان هەر دابەش نەكرابا. كەدابەش كرا، بريا زووتر يەكخرابا، بەڵام رۆژگار دەرى خست كەنەبە (خۆزيا) حكومەت دەچێتە رێوەو نەبە (بريا)ش يەك دەخرێتەوە. ئەوە راستەقينەيى دۆخى سياسى كوردستانەو كوردستانيش بەلێكترازاندنى يەكپارچەيى ليستى هاوپەيمانى كوردستان، لەلايەن يەكگرتووى ئيسلامييەوە، وەرچەرخانى گەورە بەخۆيەوە نابينێ. بەڵكو لێكترازانەكە، كەمێك زياترى دەشێوێنێ. ئەم هەڵوێستەى يەكگرتوو لەخۆ رابينينێكى بێ ئەندازەى سەبارەت بەتواناى يەكگرتوو، تيايە.

دەربارەى ئەوەش كەمەكتەبى سياسى يەكێتى و پارتى بەرنامەكان دادەرێژن و، ئەندامانى پەرلەمان تەنها دەست هەڵبڕينيان لەسەرە، بەشێوەيەكى گشتى لاريمان لەم مەسەلەيە نييە. هەژموونى پارتى و يەكێتى لەسەر ليستەكانى پەرلەمان، نكوڵى لێناكرێ. بەڵام دەپرسين:

- ئايە ئەندامانى يەكگرتوو لەپەرلەماندا، هەر يەكگرتوو كانديدى نەكردوون؟
- ئەى يەكگرتوو، ئەو ئەندامانەى بەپێى ئاراستە سياسييەكەى خۆى هەڵناسورێنێ؟
- با بەديوێكى تريشدا لێكى بدەينەوە، كە ئايە، لەو ساڵەى هەڵبژاردنى پەرلەماندا كەپەرلەمانى كوردستان نەيتوانيوە هەردوو حكومەتەكە يەك بخاتەوە، ئەدى نوێنەرانى يەكگرتووش هەتا ئێستا بەمە رازى نەبوون؟
- ئايە لەگەڵ باقى ئەندامانى پەرلەماندا دۆخەكەيان نەگۆزەراندووەو هەڵوێستێكى جوامێرانەتريان لەپەرلەماندا، نواندووە؟
- ياخود ئايە خودى يەكگرتوو، لەدەرەوەى پەرلەماندا، لەبەرامبەر يەكنەخستنى حكومەتەكانى كوردستان، هەڵوێستێكى سياسى لێبڕاويان هەبووە؟

كەهيچى ئەوانە لەكوردستان و لەناو پەرلەماندا رووى نەدابێ، يەكگرتووش و ئەندامانى پەرلەمانيان، لێبڕاو هيچ جياوازييەكيان لەگەڵ حزبەكانى ديكەو ئەندامەكانيان نەبووبێ، ئەدى چۆن چۆنى يەكگرتوو مەسەلە سياسيەكانى لێك داوەتەوە، سەرەنجاميش واى پێ باش بووبێ بۆ هەڵبژاردنى ئەمجارەى

بەرلـەمانی عێـراق، واز لەیەکپارچـەیی لیـستی هاوپـەیمانی کوردسـتان بێنـێ و سەربەخۆ دابەزێتە مەیدانی هەڵبژاردن؟ بۆچی لەسەرەتای دامەزراندنیانەوە هەتا دوای راپـەڕین و لـەناو پەرلـەمانی کوردسـتان و بـۆ کوردسـتان و یەکخـستنەوەی حکومەتەکانی کوردستان، یەکگرتوو ئەو هەموو پشوو درێژییـەی هـەبوو، کەچـی بۆ هەڵبـژاردنی پەرلـەمانی عێـراق، کەوتـە هەناسـەبڕکێ؟ کەئـەوە هەڵوێـست و سیاسەتی یەکگرتوو بێ، ئیتر چۆن جیابونەوەیان لەلیستی هاوپەیمانی بـۆ ئـەوە دەگێڕنـەوە کەگوایـە دەیانـەوێ (واقیعـی چەقبەسـتووی دۆگمـا)ی کوردسـتان بگۆڕن؟!

(٣)

## هەڵچوونی وەڵامدانەوە

(م. عـەلی) لەوەڵامدانـەوەدا، هێمنـی خـۆی و میـانڕەوی حزبەکـەی فـەرامۆش دەکاو، کەمێك هەڵدەچێ و لەپەرەگرافێکی دیکـەدا، کاردانـەوە دەگەیەنێتـە ئـەم ئەنجومەی خوارەوە:

**پرۆسـەی هەڵبـژاردن بوویـووە مایـەی بۆگـەنکردنی واقیعـی سیاسـی و لەبیرچوونەوەی ئالیـاتی دیموکراسی، ئێمە رژێمی پێشووی بەعسمان بـەهاوکاری هاوپـەیمانان رووخانـد لەبەرئـەوەی بـڕوای بەئالوگۆڕی دەسـەڵات نـەبوو، کەچـی ئێـستا ئێمـەش سـەرلەنوێ بەشـێوەیەکی تـر ئـەوە دووبـارە دەکەینەوە لەکوردستاندا.**

جـارێ دەمـەوێ لـەوە تێبگـەم کەپرۆسـەی هەڵبـژاردن، ئەگـەر پرۆسـەی هەڵبژاردنی راستەقینە بێ، چۆن دەبێتە مایەی بۆگـەنکردنی واقیعـی سیاسـی؟! بەخێر با نیوەی پرۆسـەی هەڵبژاردنەکـەش دیموکراسـی بـێ، ئـاخر چـۆن چـۆنی واقیع بۆگەن پێ دەکا؟!

دیسان دەبێ بڵێین: یەکگرتوو خوێندنەوەیەکی ئایدیالیستی بـۆ واقیـع هەیـە، بۆ؟ چونکە لەلایەکەوە زوو قۆناغ دەبڕێ و، هاوپەیمانی تێك دەداو، یەکپارچـەیی دەشێوێنێ؛ لەم لاشەوە، هەروا بەئاسانی واقیعی سیاسـی چـەق پـێ دەبەسـتێ. هـەر لەدرێـژەی ئـەو خوێندنەوەیـەدا، ئـەوەتانێ (م. عـەلی) بـە (پرۆسـەی هەڵبژاردن). (واقیع)یش (بۆگەن پێ دەکا).

ئێستا ئەگەر بەرووداوی دیکە واقیعی بۆگـەن پـێ کردبا، پاسـاوی سیاسـی دەبوو، بـەڵام بەپرۆسـەی هەڵبـژاردن بۆگـەن پێکردنـی واقیـع، کوتومـت وردنەبوونەوەیـە لەپرۆسـەی هەڵبـژاردن، کەلەهـەمان کاتـدا، وردنەبونەوەیـە

لەپرنسيپى ديموكراسى، كەديارە كاريگەرى ديموكراسى لەسەر واقيع كاريگەرييەكى رەها نييە، بەلكو كاريگەرييەكى رێژەييە. ئەم ورد نەبوونە لەپرۆسەى كاريگەرى رێژەيى ديموكراسى، وا لە (م. عەلى) دەكا بشلێ لەبيرچونەوەى ئاليەتى ديموكراسى هەبووە.

سەيرە.. تۆ بلێى كۆمەڵ تێكرا، يەك هەستو يەك هەڵوێستيان هەبێ لاى (م. عەلى) كەئاوا تێكڕا حوكمى لەبيرچونەوەى ئاليەتى ديموكراسى لەسەر داوێ چۆن دەشێ لەناو كۆمەڵێكى فرەچين‌و فرە رێبازو پڕ لەكێشمەكێش بەرژەوەنديدا، بگوترێ: ئاليەتى ديموكراسى لەبيرچۆتەوە. ئەمەفەرامۆشكردنى زانستى سياسەت‌و لەقاڵبدانى تەواوى كۆمەڵ‌و ژيانى كۆمەلايەتييە لەيەك بۆتەى سياسيدا. رەنگە، هەڵبژاردنى وا هەبێ ئاليەتى ديموكراسى كاڵ ببێتەوە. يا كەم بايەخ ببێ، بەلام هەرگيز ئاليەتەكە بەتەواوەتى بير ناچێتەوە. سەيرتر لە بۆچونە، بۆچونێكى ديكەى (م. عەلى)يە كە ئەزمونى كوردستان‌و دەسەلاتى بەعس لێكدەچوێنێ.

ئەم لێكچواندنەى ئەزموونى كوردستان بەرۆژگارى بەعس، كاردانەوەيەكى توندى سياسييە، نەك راستى. ئێمە دەزانين ئەم وەلامە زۆر تر (ناڵێين هەمووى) پارتى ديموكراتى كورستان دەگرێتەوە. بەلام ئەمەش غەدرە. بەڵام غەدرە لەزانستى بەراووردكاريدا پارتى بەبەعس ناچوێندرێ. ئەمە جگەلەوەى بۆ هێزێكى وەكو يەككگرتوو، كەيەكەمين جارە دوچارى روداوى نالەبار دەبێ‌و، رووداوەكەشدا، كەمترين زيانى بووەو تەنها دوو شەهيديشى داوە، هەق نييە زۆر هەڵبچێ‌و كاردانەوەى توندى ئاوا بگەيەنێتە ئەوە، كەئەزموونى ئێستا سەردەمى بەعس لێك بچوێنێ. ئەمەيان.. هەڵە بەهەڵە چارەسەركردنە.

ئەگەر يەككگرتووى ئيسلامى.. لەبەرامبەر يەك رووداو، كە كەمترين قوربانى زيانى داوە، هەق بەخۆى دەدا ئاوا توند بێ، ئەى كەواتە، بەدرێژايى ساڵەها رابردوو، بۆچى بۆ تەنها جارێكيش لەرووداوەكانداو لەبەرامبەر تاوانەكاندا، بە ئەو هەمگە قوربانى‌و شەهيدو ماڵوێرانييە، بۆچى هەڵوێستێكى توندى ئاوا نەنواند؟! بۆچيش هەميشە داواى لەيەكێتى‌و پارتى دەكرد قوربانى‌و كێشە نێوانيان فەرامۆش بكەن‌و رێك بكەونەوە؟!

بەش بەحاڵى خۆم.. چەند بەناهەقى دەزانم يەككگرتوو لەبادينان پەلاماردراوە، لەوە زياتر ئەم هەڵوێستە بەنارەواتر دەزانم ئەندامێكى مەكتەب

سیاسی یەکگرتوو، ئاوا تورە ببێو ئەزموونی کوردستان بچوێنێ بەرۆژگاری فاشیەتی حوکمڕانی بەعس!!

لەدرێژەی ئەم وەڵامەدا (م. عەلی) دەیەوێ جیابونەوەیان بەگۆرانکاری ڕەوتی دیموکراسیو دەنگو دەنگدان لەقەڵەم بداو دەڵێ:

**دەنگدەر لەوڵاتی ئێمەدا وای لێهاتبوو منەتی بەهەڵبژاردن نەبێتو لەبەرامبەریشدا حزبەکان منەتیان بەدەنگدەر نەبێت.**

جارێ با ئەوە باس بکەین کەبۆچی (دەنگدەر = هاولاتی)و حزبەکان لەیەك جیاکراونەتەوە. ئەمە، وەکو ئەوە وایە حزبەکان لەناو خەڵکدا نەبنو بەکۆمەڵ نامۆ بن. حزب، لەخەڵك پێکهاتووەو بەشێکی جیانەکراوەی خەڵکیشە. زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی حزبەکانیش هاولاتی دەنگدەرن. دەنگدەرێکیشن بەهەستی بەرپرسیارێتی لەریزی حزبەکاندان. ئەرکیشیانە بریارە حزبیەکان جێبەجێ بکەن. واتا: ئەندامانی حزبەکان جگەلە ئەرکی دەنگدان لەهەموو هەڵبژاردنێکدا، وەکو هاولاتی، کەحزبەکەیان بەشداری تیا دەکەن، رۆژانە ئەرکی زۆریکەش بۆ گەلو کۆمەڵو کوردستانەکەیان جێبەجێ دەکەن. هەروەکو یەکگرتووش ئەندامەکانی ئەرکە حزبییەکەیان، لەنوێژکردنو حیجاب لەسەرنانی کچان، لەمنداڵییەوە، هەتا دەگاتە باقی کارو ئەرکە حزبیەکانیان رادەپەرێنن. کەوابێ: هەڵەیە بەو شێوە میکانیکییە حزبەکانو دەنگدەر لێك دابرردرێ.

سەبارەت بەدەنگدەری دەرەوەی حزبەکانیش، مەسەلەیەکی ئاساییە بەشێکی هاولاتی، لەهەڵبژاردنێکدا بەجۆش بنو لەهەڵبژاردنی دیکەدا، ئەو جۆشەیان ساردبێتەوە. رەنگە روداوێك، قەیرانێك، بەسەرهاتێك، کارەساتێك، یان تەنگوچەڵەمەی کۆمەلایەتی، تەنانەت جاری واش هەیە، لێدوانی بەرپرسێك بەدڵی رای گشتی نەبێو کاریگەری نالەباری لەسەر باری دەروونی خەڵك دەبێو بەشێکی دەنگدەریش سارد دەکاتەوە.

پرۆسەی دەنگدانو بریاری دەنگدەر، لەناو هیچ کۆمەڵێکدا پرۆسەو بریاری نەگۆر نییە، هەتا لەکوردستاندا بکرێتە پرۆسەیەکی نەگۆر. ئەوەشمان بیر نەچێ، هەموو جارێك هەڵبژاردن چارەنوسی هەموو خەڵکی پێوە نەبەستراوە. هەندێکجار چارەنوسی دەسەلاتو حزبو کاندیدەکان زۆرتر پەیوەستی هەڵبژاردنە. لەم پێودانگەوە، پێچەوانەی بۆچونەکانی (م. عەلی) هەمیشە حزبەکان منەتی دەنگدەر دەزانن، بەلام هەردەم دەنگدەران منەتی حزبەکانو

تەنانەت هەڵبژارنیش نازانن. ڕۆژئاواش نمونەی هەرە دیاری ئەم ڕاستیانەیە، کەزۆر لەمێژە ڕای گشتیو دەنگدەرانی ڕۆژئاوا، حزبەکانیان، ئەوپەری هەوڵی ڕاکێشانی زۆرترین دەنگدەر دەدەن. بەڵام دەنگدەران جاری وا هەیە بەقسەیان دەکەنو جاری واش هەیە لێیان هەڵدەگەڕێنەوە. کەوابێ:

کێشەی حزبەکانو دەنگدەر، کێشەی منەت کردنو منەت نەکردنی حزبەکان دەنگدەر نییە، بەڵکو کێشەیەکی سیاسیو کۆمەڵایەتیو تەنانەت سایکۆلۆژیشە ئیدی نازانین (م. عەلی) چۆن چۆنی باسی ئەوەی کردووە گوایە نەدەنگدەر نەحزبەکان، منەتیان بەرامبەر یەکدی نەماوە؟ کاتێکیش کێشەیەك، کێشەیەکی بابەتی نەبێ، کەواتا، باس لێوەکردنی کێشەی ئاوەها، یان بەگومان دروست کراوە، یاخود بۆ گومرایی کردنی ڕای گشتییە، هەتا پاساو بۆ بڕیاری هەڵەی سیاسی بهۆنرێتەوە.

هەمیشە بەشێك لەدامەزرێنەرانی حزبە نهێنیەکان، هەتا ڕاستیەکانیان دەردەکەون، دەتوانن بەئارەزووی خۆیان ئارایشتی مێژووی خەباتی حزبەکانیان بکەنو ڕای گشتی فریو بدەن. بەتایبەتی ئەو حزبانەی سیاسەتی نەزۆکیان لەنا ڕوداوەکاندا گرتبێتە بەرو پەرێزی ڕابردوویان، پاك نەبێت. ئەم جۆرە ڕابردووەی حزبە هەڵوێست نەزۆکەکان، بەردەوام دەبێتە گرێ کوێرەی ئەندێشەی سەرکردایەتیەکانیان. بەتایبەتی کاتێك بەرامبەر چەند حزبێکی تێکۆشە دەبنەوە، کەڕابردوویان پڕ بێت لەقوربانیو خزمەتو هەڵوێستی جوامێران لەکاتی تەنگانە. زۆرجاریش بۆ داپۆشینی گرێ کوێرەی سەرکردایەتی ئەم جۆر حزبانە، هەوڵدەدەن کەموکوڕی بەرامبەرەکانیان زلتر بکەنو پاکێتی خۆیان بێگەرد دەربخەن. بەڵام ئەم جۆرە سیاسەتانە، هەتا سەر بەرگەی تینی ڕاستیەکان ناگرنو سەرەنجام، لاپەرەکان یەکە یەکە دەردەکەونو بەووردیش دەخوێنرێنەوە. سەرکردایەتی یەکگرتووی ئیسلامی، ئەگەر هەتا ئێست توانیبێتی لێفەی هەتیوان بەمێژووی خۆیدا بدات، ئەوا ئێستا، وردە ورد لێفەکەیان لەسەر لادەبرێو چیکە سیاسەتی ڕابردوو پۆشین، بۆ جوانتر کردنی ئێستایان، دادیان نادات. لەبەشی دووەمی ئەم وتارەدا، م. عەلی لەوەڵامەکانیدا بواری داوە، ئێمەش دەست بەرین بۆ چمکێکی لێفەی هەتیوانو لەدوو توێی وەڵامەکاندا، بەئەسپایی هەڵیدەینەوە.

## بەڵێنی خزمەتگوزاری

بەشێکی دیکەی درێژەی قسەکانی (م. عەلی) بۆ ئەو پاساوانەی یەکگرتوو، بۆ جیابونەوەیان لەلیستی هاوپەیمانی کوردستان دەیهۆننەوە، ئەوەیە گوایە:

**ئەم کارەی ئێمە وای کردووە کەیەکێتیو پارتی بکەونە خۆیانو کۆمەڵێك وەعدو خزمەتگوزاری پێشکەش بەهاوڵاتیان بکەن.**

یەکێتیو پارتی.. لەهەڵبژاردنە هاوبەشەکەی تریشو پێش ئەوەش، کەبەجیا هەڵبژاردنیان کردووە، بەردەوام لەکاتی هەڵبژاردندا کەوتونەتە خۆیان. لەهەڵبژاردنی پێشوودا، پارتیو یەکێتی لەسەر ئەنجومەنی پارێزگاکان کەوتنە خۆیان. هیچ حزبێك نییە هەڵبژاردن پەیوەندی بەدەسەڵاتیەوە هەبێ، لەکاتی هەڵبژاردندا نەکەوێتە خۆی. تەنانەت ئەو حزبانەی پێش هەڵبژاردن، راپرسیەکان دەریدەخەن شانسی دەرچونیشیان نییە، هەموو هەوڵێکی خۆیان دەدەن بۆ دەرچوون. ئەمەیان کارێکی بەڵگە نەویستی سیاسیو تەنانەت چارەنوسسازی حزبە دەسەڵاتخوازەکانە، کەوابێ لەمەیاندا، یەکگرتوو هەبووبێ، یان نەبووبێ (هەروەکو چۆن لەهەڵبژاردنی ١٩٩٢ بەم ناوەی ئێستای نەبوو) یەکێتیو پارتی، یان هەر حزبێکی دیکە، بۆ هەڵبژاردن دەکەونە خۆیان. هەڵبەتە، حزبێکی لیستی هاوپەیمان لەلیستەکە دەرچوبێ، حسابی رادەی کاریگەری ئەو حزبە لەسەر رێژەی دەنگدەران، هەر دەکرێ. قسەکەمان لەسەر ئەوەیە کەیەکێتیو پارتی، تەنها لەبەر جیابونەوەی یەکگرتوو نەکەوتونەتە خۆیان. بەڵکو هەڵبژاردن خۆی لەخۆیدا، بەرنامەسازیو هەڵسورانی سیاسیو جەماوەری دەوێ. بەتایبەتی هەڵبژاردنێکی لەم جۆرەی ئاستی عێراق کەرێژەی دەنگو سەنگی لیستەکان، بۆ چارەنوسی گەلەکەمان لەعێراق، ناوچەکە، جیهانو ناوچە تەعریب کراوەکان، زۆر گرنگ بوو. مەسەلەکە هەر کوردستان نەبوو، هەتا یەکگرتوو هەڵسورانی یەکێتیو پارتی بگێرێتەوە بۆ جیابونەوەیان لەلیستی هاوپەیمانی.

دەربارەی وەعدو خزمەتگوزارییش کەدیسان بەقسەی (م. عەلی) لەبەر جیابونەوەی یەکگرتوو، یەکێتیو پارتی بەڵێنیان بەخەڵك داوە. ئەمەشیان وانییە. خزمەتگوزاری دەمێکە هەیە؛ ئاماری خزمەتەکانی تەواوی وەزارەتەکانی حکومەتەکانی سلێمانیو هەولێر، دەری دەخەن کەلایەنی کەم لەدەهەی رابردووەوە، خزمەتگوزاری بەردەوام هەبووە. باشترین بەڵگەش ئەوەیە کەلەهەموو بارێکەوە، کوردستان گۆرانکاری بەرچاوی بەخۆیەوە دیووە. تەنانەت

لەناوچە تازە ئازادكراوەكانیشدا، لەدوای روخاندنی سەدامەوە خزمەتگوزاری پێشكەش كراوە. تەنها ئیدارەی سلێمانی لەپارێزگای كەركوكدا، بەپێی سوپاسنامەیەكی ئەنجومەنی پارێزگای كەركوك بڕی (١٢٤,٢١٤,٠٠٠,٠٠٠) سەدو بیستو چوار ملیارو دوو سەدو چواردە ملیۆن دیناری خستۆتە خزمەتی كەركوكەوە. لە (٣) ساڵی رابردوودا، تەنها ئیدارەی سلێمانی زیاتر لە (٢) ملیار دۆلار پارەی لەپرۆژە خزمەتگوزارییەكانو ئاوەدان كردنەوەو بەرزكردنەوەی موچەی خەڵكدا سەرف كردووە.

ئەو ئامارانە، دەیسەلمێنن كەپێش جیابونەوەی یەكگرتووی ئیسلامی لەلیستی هاوپەیمانی، نەك وەعدی پەتی، بەڵكو بەكردەوەش خزمەتگوزاری هەبووە. بۆ بەدیهێنانی ئەو خزمەتگوزاریانەش، ئەگەر رۆڵی خەڵكو رێكخراوە دیموكراتیەكانو پەرۆشی حزبە دەسەڵاتدارەكان، كەموزۆر كاریگەرییان هەبووبێ، ئەوا نەیەككگرتوو، نەحزبە ئیسلامگەراكانی دیكە، لەباری پەرەپێدانی دیموكراسیو پەرەسەندنی ئازادیو ئاوەدانییەوە، كاریگەرییەكی جەماوەری ئەوتۆیان لەسەر دەسەڵات بۆ زیاتر كردنی خزمەتگوزاری نەبووە. هەموانیش دەزانین كەبزووتنەوەی ئیسلامی پێش جیابونەوەیانو دوای جیابونەوەشیان، قەزای هەڵەبجەیان هەتا نزیكی سەید سادق كۆنترۆڵ كردبوو، پارەشیان هەبوو، پارەشیان لەسنورەوە بۆ دەهات، گومرگیشیان دەست بەسەرا گرتبوو، بەڵام لە (٨) ساڵی دەسەڵاتیان لەو ناوچانەدا، گوڵێكیان لەباخچەیەكدا نەچاند. بەڵكو هەموو باخچەو سەیرانگاكانی ئەو ناوچەیە، لەسایەی دەسەڵاتی ئەواندا وشك بونەوە. ئەمە جگەلەوەی نەشەقامو نەشۆستەو نەخوێندنگەیەكیان دروست كرد. یەكگرتووش.. جگەلە دروستكردنی مزگەوتو نوێژخانە بەپارەی بێگانە، كامەیە خزمەتە گشتیەكانی تریان لەكوردستاندا. نیوەی ئەو پارەیەی لەدروستكردنی مزگەوتدا سەرفیان كردوون، نەخۆشخانەو خوێندنگەیان پێ دروست كردبا، ئێستا كەمترین ئاستەنگ لەو بارەوە لەكوردستاندا دەما. دەیان مزگەوتی دروستكراوی وایان هەیە، لە مانگێكدا (١٠٠) كەس نوێژی تیا ناكەن. ئەگەر ئەو مزگەوتانەیان بكردایەتە باخچەی ساوایان، ساڵانە سەدان ژیكەڵەی تیا پەروەردە دەكرا. جگەلەو مەسەلانەی باسمانكردن، یەكگرتوو لەناو هێزە ئیسلامگەراكاندا، كارێكی زۆر نابەجێ دەكات بەوەی پارەیەكی بێشومار بەناوی گەلی كوردستانو تەواوی هێزە ئیسلامگەراكانەوە، كۆدەكاتەوەو دەسێنێو بەتاقی تەنهاش بۆ

حزبەکەی خۆیانو ئەو مزگەوتانەی لەسەر جادەکان، وەکو پێشانگای یەکگرتوو، دروستیان دەکەن، سەرفی دەکەن. بۆ راستیو ناراستی ئەم قسانەش باشامـاژە بەبۆچونی یەکێك لەشارەزاکانی ئەو راستیانە لەسەر یەکگرتوو بکەین، ئەویش بەرێز (ئەیوب نعمەت)ە، ئەندامی مەکتەبی سیاسی کۆمەڵی ئیسلامییەو بەناوی (صالح حکیم) ناميلکەیەکی بەناوی (هۆشیارکردنەوەی هۆشیاری) دەرکردووەو لەلاپەرە (١٦)دا، دەڵێ: لاپەرە (١٦)، خاڵی (دە).

یەکگرتووی ئیسلامی، بەناوی گەلی کوردستانەوەو بەناوی تەواوی موسڵمانانەوە، پارە لەدەرەوەی وڵات کۆبکاتەوەو تەنها بۆ ئەندامانو لایەنگری خۆی سەرفیان بکات، ئاخۆ حزبی ئاوا دەسەڵاتی بکەوێتە دەست، چۆن لەگەڵ کۆمەڵو نەیارەکانیدا هەڵبسورێ؟!

## یەکگرتوو .. هاوکارە!!

کاکە دانا ئەسعەد.. لەدرێژەی پرسیارەکانیدا، دەپرسێ:

**بەرای بەرێزتان بەشداربوونی یەکگرتووی ئیسلامی بەلیستێکی سەربەخۆ لەهەڵبژاردنەکان نابێتە کەمبونەوەو پەرتو بڵاوبونی دەنگی کورد لە پەرلەمانی عێراقیدا؟**

لەوەڵامی ئەم پرسیارە هەستیارە گرنگەدا (م. عەلی) دەڵێ:

**ئێمە وای نابینین، وەك یەکگرتووی ئیسلامی هەر لەسەرەتاوە بەیانمان دەرکردو ئاماژەمان بەوە کرد کەلەبریارە ستراتیژیو چارەنوسسازەکانی میللەتی کورددا، هەر هاوکار دەبین.**

لەوەناچێ (م. عەلی) تاووتوێیەکی باشی وەڵامەکانی کردبێ. ئەگینا ئاوا تێ نەدەکەوت. بێ تەمومژ هەڵوێستی یەکگرتوو رۆشن دەکاتەوەو باسی ئەوە دەکا کەلەسەر (بڕیارە ستراتیجیو چارەنوسسازەکانی میللەتی کورددا هەر هاوکار دەبین).

پێشینان دەڵێن، کورد بدوێنە شەرعی خۆی دەکات. لەم وەڵامەشدا (م. عەلی) سیاسەتی یەکگرتووی شەرع کردووە. بەرێزی راشکاوە لەوەی کەلەبریارە ستراتیژیو چارەنوسسازەکانی کورددا، یەکگرتوو هاوکارن. لەسیاسەتدا، ئاشکرایە کەهێزێکی لاوەکی، یان هێزێکی نامۆ، یاخود لایەنێکی خێرخواز کەخۆیان هیچ رۆڵێکی کاریگەریان لەناو میللەتدا نەبێ، تەنها دەتوانن هاوکاری بکەن، هاوکارو هاوکاری سنورێکی تەسکی دیاری کراوی هەیە. ئەو هێزانەی

تەنها هاوکاری لەخۆیان رادەبینن، هێزگەلێکی بنەرەتیو سەنگینی ناو گەلان نین. ئەمانە هێزێکی کۆمەڵایەتی لاوازن. لاوازن لەرووی جەماوەرییەوە، هەروەکو چۆن لاوازیشن لەدیدی سیاسیو جیهانبینی فەلسەفیشەوە. ئەمە جگەلەوەی هێزە هاوکارەکان، نەهێزەکەیانو نەفەلسەفەکەیان، لەو ئاستەدا نابینن لەبری ئەوەی تەنها رۆڵی هاوکاری ببینن، بتوانن تێکەڵاوی پرۆسەی سیاسی چارەنوسساز بنو بەرپرسیارێتی میللەت هەڵبگرن. کەوابێ، هۆیە راستەقینەکانی ئەم سیاسەتی هاوکارییەی یەکگرتوو، چییە، لەبۆ ستراتیژی کوردستان؟

یەکگرتووی ئیسلامی.. لەبەرئەوەی رەگەزەکانی لەناو (إخوان المسلمین)دایەو ئیخوانیش مێژووەکەیان بەتاڵە لەهەڵوێستو سیاسەتی پشتیوانی لێکردنی چارەنوسی کورد، بەڵکو لەرۆژگاری کارەساتیشدا بچوکترین دەنگیان بەرامبەر تاوانەکان هەڵنەبریوە، تەنانەت ئیخوان موسلمینی جیهانی پشتیوانی رژێمی سەدامیشیان لەکاتی جەنگی عێراق – ئێراندا دەکرد. بۆیە، ئەو رەگەزانەی یەکگرتوو لەناو ئیخوانەکاندا، شایەنی ئەوە نییە شانازی پێوە بکەن. جگەلەم رەگەزانەی یەکگرتوو لەناو ئیخواندا، مێژووی (٣٠) ساڵەی خۆشیان لەسەرەتای حەفتاکانەوە، لاپەرە بەلاپەرەی هەڵبدرێتەوە، سەرکردەکانی یەکگرتوو لەباری سیاسیو بەرگری لێکردنی کوردستانەوە، تەنانەت ناتوانن ئاماژە بەیەك سەربەرزی سیاسی خۆیان بکەن. بەڵکو هەردەم سەری خۆیان لەئاست کارەساتو تاوانەکانی بەعس، کز کردووە. هێزێکی ئاوا کەرەگەزەکانی لەباری سیاسیو رێکخراوەییەوە سیسو مێژووەکەشی شەرمۆك بێ، هەڵبەتە هێزی ئاوا هەر دەتوانێ لەناو سەنگەرەکانی خەباتی چارەنوسسازی گەلەکەماندا، تەنها لەپەراوێزەوە هاوکار بێ. نەك هاوکاروانی خەباتو خزمەتو فیداکاری بێ. بەدیوێکی دیکەشدا ئەم (هاوکار)ە، تاووتوێ بکرێ، ئەوە دەسەلمێنێ کەیەکگرتوو، لەبەر ئەوەی رەگەزەکانیان هەر لەناو (ئیخوان)دایە، ئیخوانەکانیش کێشەی ستراتیژی نەتەوەی کوردستان بەکێشەیەکی ستراتیژی دیموکراسی نازانن، بۆیە یەکگرتووش تەنها دەوێرێ ئاوا باسی سیاسەتی خۆی بکات کەلە سیاسیەتە چارەنوسسازەکاندا (هاوکار)ی کوردن. ئەمەش سیاسەتی نەشیش بسوتێو نە کەباب!!

## میزاج .. یان چارەنوس؟

(م. عەلی) بۆ ئـەوەی پینـەی جیابونەوەکـەیان لەلیـستی هاوپـەیمانی بکـات، خـۆیو حزبەکـەی لـەدەرگاوە چـونەتەدەرو لەپـەنجـەرەوە سـەرەتاتکێ لەگـەڵ گەلەکەمانو هێزەکانی دەکەن. لەپەنجەرەشەوە ئاوا خۆیمان پیشان دەدا:

**پێمانوایە ئەو میزاج تێکچونەی راگەیاندنی پارتیو یەکێتی پەیوەندی بەمەسەلەی میللەتی کوردەوە نییە، بەڵکو تـەنها تەفسیرمان ئەوەیەکە وایانـدەزانی ئیمە مونافەسەی ئـەوان دەکـەینو لەکورسییەکان دەپچرین.**

میـزاج تێکـچونی چـی؟ مەسـەلەکە میـزاج نییـە. مەسـەلەکە سیاسـەتەو سیاسەتەکەش بـۆ یـەکێتیو پـارتی بەرپرسـیارێتی مێژووییـە، وەکـو دوو هێـزی چارەنوسـسازی نـەك (هاوکـار! !). کاتێـك دوو هێـزی چارەنوسـسان، کەهێـشتا بەشـێکی باشـی سـتراتیجەکان ماویـەتی بـەدی بێـت، رووبـەرووی هەڵبـژاردنێکی چارەنوسسازی سیاسیو یاسایی لەپایتـەختی وڵاتێکدا دەبنـەوە، کەبـەزۆرەملێ چارەسەریان بەستراوەتە پایتەختەکەی، بێگومان دوو هێزی ئـاوا، لەهەڵبژاردنـدا هەزارو یەك حساب بۆ یەك کورسی ئەو پەرلەمانە دەکەن، کەچاودێری جێبـەجێ کردنی دەستور دەکاو لەبەر رۆشنایی دەستوری پەسەند کراویشدا، یاسـای نـوێ بۆ ئەو وڵاتە دادەرێژێ. پەرلەمانی ئاواو دەستورو یاسای ئاوا، بـەڵێ سـتراتیژن، بەڵێ چارەنوسسازن. هەر دەشبێ ئەو دوو هێـزە حـسابی وردی بـۆ بکـەن. نـەك هێزێکی وەکو یەکگرتوو کەناوێرێ دەست بۆ رەگەزە فکریـەکانی لـەناو ئیخوانـدا بـەرێ، هـەروا، ناشـوێرێ ئـاوڕ لەمێـژووی سیاسـی خـۆی لـەرۆژگاری میحنـەتی کوردسـتاندا، بداتـەوە. هەربۆیـە، ئێـستاش خـۆی بـە (هاوکـار)ی سـتراتیژی میللەتەکـە دەزانـێ، نـەك بەشـدارێکی کاریگـەر لەبـەدی هێنـانی سـتراتیژەکەدا. تەنانەت پێشی وایە تازە یەکپارچەیی هێزە کوردستانیەکان پێویست نییە.

یـەکێتیو پـارتی، سـەرەرای کـەموکوریو کەمتەرخـەمیو کێـشەکانو ناکۆکیـەکانو پێـشینەی شـەری نـاوخۆش، هێـشتا دوو هێـزی بەرپرسـیاری چارەنوسـی گەلەکـەمانن. ئـەمان دەزانـن، لەسـەر ئاسـتی عێـراقو ناوچـەکەو جیهانـدا، هـەموو رابردوویـانو ئاینـدەی گەلەکـەمان، بەسـتراوە بەهەڵبـژاردنو رێژەی ئـەو دەنگانـەی لەهەڵبژاردنـدا لیـستی هاوپـەیمانی کوردسـتان دەیهێنـێ. بۆیـە، زۆر بـەوردی حـسابیان بـۆ هەڵبژاردنەکـە دەکـردو کورسـی بەکورسـی،

بەئەنـدامانی پێـشووی پەرلەمانـدا چـوونەوە. حـزب بـەحزبیش لەلیـستی هاوپەیمانیـدا، ریزکرانـەوە. پـێ دەچـێ یـەکگرتووش بـۆ ئەقڵیـەتی تەسـکی حزبایەتی، هەروای کردبێ، بۆیە بڕیاری لیستی سەربەخۆی داو بەو رێژەیەش رازی نەبوو کەبۆیان دانابوو. کاتێك یەکگرتووش داوای کورسی زۆرتر دەکا، ئـەم داوایـە، ئـیتر لەچوارچێوەی سـتراتیژی نەتەوایـەتی دەچـێتە دەرەوەو گیـانی تەسکی حزبایەتی بەسەر ئەو ستراتیژەدا، زاڵدەکرێ.

ئەگـەر چارەنوسـی نەتەوایـەتی زاڵبوایـە بەسـەر یـەکگرتوودا، ئـاوا لەسـەر جیابوونـەوە سـور نـەدەبوون. هـەروەکو خۆشیان دەڵێن: شورای حزبەکەیان، پێش دیاری کردنی ژمارەی کورسیەکانیش، بڕیاریان داوە بەجیا دابەزنە مەیدانی هەڵبژاردن. رەنگە ئەم قسەیە راست بێ. بەڵام ئـەوەش راستە ئەگـەر هاتبـاو یـەکگرتوو کورسـییەکی زۆری لەلیـستی هاوپـەیمانی دەسـت کـەوتبا، بێگومـان لەهاوپەیمانی جیانەدەبوونەوە.

مەسـەلەکە.. بەراسـتی مـەزاج نییـە. مەسـەلەکە سیاسـەتەو سیاسـەتەکەش چارەنوسە. چارەنوسی نەتەوەیەك بووبێ، یان چارەنوسی نەتەوەو دەسەڵاتێك. لەهەردوو حاڵەتدا، هەڵبژاردن ویستگەیەکی سیاسی مەترسیدار بوو. بەتایبـەتی ئەم جارە لیستی سوننیگەراو بەشێکی کۆنە بەعسیەکانیش کەوتبوونـە خۆیـان. ئیتر چۆن (م. عەلی) جەخت لەسـەر ئـەوە دەکات (راگەیانـدنی پارتیو یـەکێتی پەیوەندی بەمەسـەلەی میللـەتی کـوردەوە نییـە). نـەخێر، کوتومـت مەسـەلەکە پەیوەنـدی بەمیللـەتی کـوردو لـەناو کوردیـشدا بـەزۆری پەیوەنـدی بەیـەکێتیو پارتییەوە هەیە. چونکە ئەم دوو هێزە بەرپرسیارن، (هاوکار!) نین.

لەدرێـــژەی هـــەمان قـــسەو باســـدا، (م. عـــەلی) ئـــەوە رەت دەکاتـــەوە کەلەکوردسـتان پـچرابنو خۆیـان هـەر بەکوردسـتانی بـەم شـێوەیەی خـوارەوە دەزانێ: (تەنها تەفسیرمان ........ تاد هەتا دەبچڕین)

بـەڵێ.. رێكو رەوان ئێـوە مـادام لەلیـستی هاوپـەیمانی کوردسـتان دابـڕان، کەوتنە مونافەسە، هەر ئێوەی یەکگرتووش دژی یەکێتیو پارتی دەسـتتان کـرد بەهەڵمـەتی پروپاگەنـدە. دروشمـەکانتان، قـسەکانتان، بنـچینەی سیاسـەتی جیابونـەوەتان لەلیـستی هاوپـەیمانی، هـەر هـەموو هەڵمـەت کـردن بـووە دژی یەکێتیو پارتیو دەسەڵاتەکانیان. باشـترین نمونـەش بـۆ سـەلماندنی هەڵمـەتی یەکگرتوو دژی لیستی هاوپـەیمانی، تاقانـە پۆسـتەرەکەی یـەکگرتووە، کەبـەرێز

سکرتێری یەکگرتوو، لەگەڵ پیاوانی ئاینیدا تەوقـە دەکـات، لەسـەر پۆستـەرەکە باسـی گەنـدەڵیو حکومـەتی پـارتیو یـەکێتی دەکـەن. قابیلـە ئـەم پۆستـەرە وەڵامدانـەوەی رەخنـەکانی یـەکێتیو پـارتی بووبـێ؟! نـەخێر. پۆسـتـەری هەڵبژاردن، هەموو حزبێك، بەوردی بیری لێدەکاتەوە، ئینجا پەسەندی دەکـات. پۆسـتـەریش، بەتایبـەتی ئەگـەر تاقـە پۆسـتـەرێكو پۆسـتـەری سـەرەکی بوبـێ، ناونیشانی بەرجەستەکراوی بەرنامەی هەڵبژاردنی حزبەکەیـە. یـەکگرتوو، تـایتڵی پۆستەرەکەی بەوێنەو نوسینەوە هاواری دژایەتی کردنی یەکێتیو پارتی دەکرد. ئیتر چۆن چـۆنی یـەکگرتوو مونافەسـەی نـەکردوونو هـەوڵی نـەداوە کورسییان لێببچڕێ؟!

## دێوەزمەی تێکدان

(م. عەلی).. ئەوەی لەو ماوەیەدا لەناخیانـدا پـەنگی خواردبـوو، هـەوڵی داوە لەم چاوپێکەوتنەدا، بەشێکی زۆری هەڵڕێژێو مـشتێکی تـری هەڵڕێژراوەکەشـی، ئەمەی خوارەوەیە:

**دوو هەفتە لـەوەو پـێش لەلایـەن سـەرکردایەتیەکانی پـارتیو یـەکێتیو قـاعیدەکانیشیانەوە وەسفی یەکگرتوو دەکرا بەوەی کەحیزبێکی نەتـەوەیی و دیفـاع لەمافـە نەتەوەییـەکانی گـەلی کـورد دەکات، کوێرا خێرا ئێمە بووینە ئەو دێوەزمەیەی وەزعی کورد تێکدەدەین؟**

شتێکی سروشتییە دوو هەفتـە یـان دوو مـانگ لەوەوبـەر، هێزێکـی سیاسـی، هەڵوێستێکی باشی نواندبێو (هاوکـار)یـەکی باشـی لیسـتی هاوپـەیمانی کردبـێ، وەسف کرابێ. سەیر ئەوەیە لەسەر هەڵوێستێکی بـاش وەسـف نـەکرێ. هەربـەو شـێوەیەش، ئـەنجامێکی چـاوەڕوانکراوی دونیـای ململانێـی سیاسـەتو دەسـەڵاتخوازییە، هـەمان هێـزی هەڵوێـست بـاش، لەچـەند هێزێکـی هاوپـەیمان هەڵبگەڕێتەوەو لەسەر ئەمەش، بکەونـە وێـزەی (بەتایبـەتی ئـەو هێـزە خۆشـی کەوتبێتە پڕوپاگەندە دژی هێـزە سـەرەکیەکان). پیاهەڵـدان، یـان رەخنـەگرتن، یـاخود نـاکۆکی تیـژ کـردن، سـەرەنجامێکی چـاوەڕوانکراوی دونیـای ناکۆکییـە سیاسـیەکانە. لەبەرئـەوەی یـەکگرتوو بەتاڵـە لـەرابردوو، بۆیـە، تەنانـەت سـەر لەگەمە سیاسیەکانیش دەرناکات. وا دەزانێ دونیای ناکۆکییە سیاسیەکان، هـەر لەسـەر یـەك ریـتمو لەسـەر یـەك ئـاواز مامەڵـەی لەگـەڵ دەکـرێ. ئـەم جـۆرە چاوەڕوانییە لەدونیای سیاسەتدا، نەك لەناو دوو یان چەند حزبێك مەحاڵە، بەڵکو لەناو هەناوی تاقە حزبێکیشدا، دژوارە.

لەگەرمەی ئەو رەخنانەی، لەوەڵامی رەخنەکانی یەکگرتوودا، یەکێتی یان پارتی گرتویانە، نەشکوتراوە یەکگرتووی ئیسلامی دێوەزمەیەو دۆخی کورد تێك دەدا. نازانین (م. عەلی) ئەم قسانەی لەکوێ هێناوە. نەئەدەبیاتی رەسمی یەکێتیو نەپارتیش قسەی لەوجۆرەیان نەکردووە. هەرگیزیش لەناو هەردوو لایەنەکەدا چاوەروان نەکراوە یەکگرتوو زیاتر لە (٥) کورسی بهێنێ، هەتا بەدێوەزمەی هەڵبژاردنیان بزانن.

ئەم بۆچونانە، گەورەترکردنی قەبارەی یەکگرتووە، زیاتر لەو قەبارەیەی هەیەتی؛ هەڵبەتە، ئەم قەبارەیەش، وەنەبێ بەشایستەیی خۆیان پێکیان هێنابێ، بەڵکو لەئەنجامی شەری ناوخۆو قەیرانە ئابوریەکانو سیاسەتی خەمساردیو بێباکی یەکێتیو پارتی بەرامبەر ئیسلامگەراکان، یەکگرتوو یان لایەنەکانی دیکە، ئەو قەبارەیەیان قەبە بووە. بۆ سەلماندنی ئەم راستییەش، با هانا بۆ ئەو بەڵگەنامانە بەرین کەسەرەتاکانی سەرهەڵدانی ئەم رەوتە ئیسلامگەرایانە، دەخەنە روو. وەکو: "مەسەلەی گەورەبوونو بەرفراوانبوونی یەکگرتوو ئێمە گومانمان لەوەدا نییە کەپارەو پولی دەرەوە کاری سەرەکی هەبووە، چونکە وەك دەزانین زۆرێك لەهەلوێستو بنەماکانی کاری یەکگرتوو بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ دەقەکانی قورئانو سوننە یەك ناگرێتەوەو پاشان لەگەڵ واقعی کوردستاندا ناگونجێت، بەڵام باری هەژاریو نەبوونیو برسێتی کوردستان هەلێکی باش بوو بۆ یەکگرتوو کەچەندین هەل بقۆزێتەوەو هەستو ویژدانی خەڵکی بکرێت، پاشان گەمارۆی ئابوری بەسەر کوردستاندا چاکترین زەمینە بوو بۆ کاریگەر دروست کردنی کۆمەڵێکی زۆر لەهەلپەرستو خاوەن بەرژەوەندییە تایبەتیەکانو بتوانێ بەرژەوەندیەکانیان لەم حاڵەتە نائاساییەدا لەگەڵ یەکگرتوو بپارێزێت، جگە لەمەش گەر یەکگرتوو ئەوەندە خۆی بەگەورەو قەبە دەزانێتو راپەرین بەبچوكو لاواز دەزانێت بۆچی ناتوانێت پرۆژەی یەکبوون قبوڵ بکاتو با راپەرین بتوێنێتەوە" (هوشیار کردنەوەی هوشیاری/ وەڵامی ئۆرگانی نوسینگەی رێکخستنی یەکگرتووی ئیسلامی/ لاپەرە ٢٥/ ساڵح حەکیم).

پێمانوایە، بەم بۆچونانە، باش باش دەردەکەوێ، یەکگرتوو دوای ئەوەی بەرگەی دۆخی سیاسی عێراقی لەخەباتو تێکۆشان نەگرت، وەکو بەشێك لەئیخوان المسلمین، خۆیان خزاندە ناو فرێزەری رۆژگارو نوزەی سیاسیەتیان لەخۆیان بری، لەئێرانیشدا، دوای جەنگی عێراق — ئێرانی، وەکو خۆیان هیچیان پێنەکراوە، چاویان بەرایی نەهاتووە لەناو ئیسلامگەراکاندا، رەوتێکی دیکە ببزوێو دابەزێتە مەیدان.

لەم ئەڵقەیەی وەڵامدانەوەی (م. عەلی)دا، وەڵامەکان بەجوانی دەری دەخەن کەیەکگرتووی ئیسلامی، نەك ئەو حزبە مەدەنیخوازە پشوو درێژە نین وەکو باسیان دەکرد، بەڵکو حزبێکی هەناسەسواری سیاسینو لەیەکەمین رووبەرووبونەوەی روداوێکیشدا، هەر کە لەخۆیان رابینیوە، کەکەمێك هێزی جەماوەرییان لەدەوردا کۆبۆتەوە (هەروەکو ئیخوانەکانی میسر) ئیدی بۆ دەسەڵات بریاری جیابونەوەیان لەلیستی هاوپەیمانی دا. ئەم جیابونەوەیەش هەتا ئێستا یەکگرتوو قسەی زۆری لەسەر کردو پاساوی زۆرتری بۆ هێناوەتەوە، بەڵام م. عەلی پەردەکەی دڕیوەو راستیەکانی گوتووە. پێشمان وایە:

## ئەزموونی تاڵ

یەکێك لەلایەنە باشەکانی ئەم چاوپێکەوتنە، ئەوەیە کە (م. عەلی) بەناوی یەکگرتووەوە، نەك بەناوی خۆیەوە، راستیگەلێکی زۆری یەکگرتووی دەربڕیوە. بەتایبەتی ئەو بیروڕایانەی لەکاتی هەڵبژاردنو هەڵبژاردنی پۆستەکاندا، لەئارادا بوون. با خوێنەر دیقەت بدات (م. عەلی) کەپێشتر دەڵێ ئێمە نەمان ویستووە (مونافەسەی ئەوان بکەینو لەکورسییەکانیان بپچڕین) دیقەت بدرێ چۆن باسی وەزارەتێك دەکات:

**ئێمە ئەزموونی تاڵمان هەیە لەگەڵ پارتیو یەکێتیدا، لەقۆناغی پێشوودا ئێمە شەش کورسیمان هەبوو لە پەرلەماندا، وەعدیان دایێ کورسییەکی وەزاریمان بدەنێ، دواتر پەشیمانبوونەوەو کورسییەکەی ئێمەیان بەخشی بەو سوننە عەرەبەی کەئێمە تۆمەتبار دەکەن بەوەی لەگەڵ نەواندایین.**

لەسەر یەك وەزارەت، مامۆستا دەڵێ: ئەزمونی تاڵ. کەچی پێشتر دەڵێ مونافەسیان لەسەر پچراندنی کورسی ناکەین. گفت پێدانی کورسییەكو پاشگەزبوونەوە لێی، هێندە لەسەر یەکگرتوو کاریگەر بووە، یەکگرتوو چەشنی ئەزموونێکی تاڵ سەیری دەکات. چەند یەکگرتوو هەقیەتی داوای هەقەکانی خۆی لەوەزارەتو پەرلەمان بکات، لەوە زیاتر ناهەقیەتی لەسەر کورسییەك یان چەند ئەندامێکی پەرلەمان، هەڵوێستی توند وەربگرێ. چونکە حزبێك، لەسەر کورسییەك، یان وەزارەتێك، کاردانەوەی ئاوای توند بگەیەنێتە رادەیەك، ئەزمونەکەی تاڵ بکاتو سەرەنجام ئەم مەسەلانەش پاڵی پێوە بنێن لیستەکەی جیابکاتەوە، حزبی ئاوا، بەچ هەقێکەوە ئیتر لافی ئیمانداری لێ دەداو یەکێتیو

پارتیش بەوە تاوانبار دەکات، کەلەبەر شەری دەسەڵات، هەردوو حکومەتەکەی کوردستان یەك ناخەنەوە. خۆیان تەنها لەسەریەك کورسی ئەزموونەکە تاڵ دەکەن، جا وەرە لەسەر نیوەی حکومەتی کوردستان، یان سەراپای کوردستان، ئاخۆ چی بکەن؟!

یەککگرتوو.. بۆی هەبوو لەسەر فکر، ئیمان، فەلسەفە، خیانەتو سیاسەتێکی چارەنوسساز هەڵوێستی توند وەربگرێ. بەڵام لەسەر کورسی، لەم هەلومەرجە هەستیارەشدا، ئەوەی نەدەهێنا ئاوا بکات. بەتایبەتی ئەو دوو سێ کورسییەش، وەنەبێ یەکگرتوو بکاتە حزبی زۆرینەی پەرلەمان، نەخێر، بەم (٥) کورسییەی هێناویشیانە، یەکگرتوو لەسەر چۆنیەتی پێکهێنانی حکومەت، کەمترین کاریگەرییان هەیە!!

## سوننەی عەرەبو سوننەی کورد

دەربارەی ئەو کورسییە پێ نەدراوەی یەکگرتووش کەبەئەزمونێکی تاڵی دەزانن، هەر خۆی (م. عەلی) دەڵێ دراوە بەسوننەی عەرەب رەتیان کردۆتەوە. دەشڵێ بەوەمان تاوانبار دەکەن کەلەگەڵ سوننەی عەرەبداین.

با پێشەکی قسەیەك لەسەر ئەوە بکەین کەئایە یەکگرتوو، وەکو هێزێکی ئیسلامگەرای سوننیگەرا، بۆچی ئەوە بەتۆمەت دەزانێت پێیان گوترابێ سەر بەسوننەی عەرەبن. ئەمە، لەباری سیاسییەوە (تۆمەت بارکردن) نییە. بەڵکو راستییەکی حاشا هەڵنەگرە.

حزبی ئیسلامی عێراقی نوێنەری ئیخوان موسلمینو یەکگرتووش هەمان شێوە. هەموشیان سوننیگەران. قابیلە شیعە یان یەزیدیو کاکەیی بن. ئاشکرایە سوونین. ئیتر بۆچی ئەمە تۆمەتبارکردن بێ.

ئەگەر یەککگرتوو، نزیکی حزبی ئیسلامیو هاوستراتیژیان نەبێ، ئەدی بۆچی رۆژێك لەرۆژان بچوکترین ناکۆکی نێوان حزبی ئیسلامیو یەکگرتووی ئیسلامیمان، لەسەر ئەم هەموو کێشە سیاسیانە، نەبیست؟ شتێکی سروشتیشە یەکگرتوو دۆستی حزبی ئیسلامی عێراقی بێو دانیشی پیابنێ. شتێکی ناسروشتییە ئەم دۆستایەتییە داپۆشێو دۆستایەتیەکە بەتۆمەتبارکردن بزانێ.

یەککگرتوو.. بەقسەی ئیخوانو ئەم تەوژمە سوننیگەرایەی عێراق، بەکارێکی چارەنوسسازی زانیووە سەرەتای هەفتاکان بەقسەیان بکاتو رێکخستنەکانی

(سرپ-تجميد) بکات. بەشێوەیەکی ئەوتۆش پەیوەندی پێشینەکانی یەکگرتوو لەگەڵ ئەواندا پتەو بووە، تەنانەت لەکوردستاندا ئەو هەموو کارەسات‌و مەرگەساتە روویداوە، یەکگرتوو بۆ ئەوەی دڵسۆزی هەتا سەر ئێسکی خۆیان، بۆ سوننیگەراو ئیخوان موسلمینی عێراقی بسەلمێنن، ئەندێشمەندانی پێشووی یەکگرتوو ملکەچی بریارەکانیان بوون‌و ئامادەنەبوون، لەسەر ئەو هەموو تاوانانەی لەکوردستاندا ئەنجام دەدران، لەئاراستەکانی ئیخوان بەموو لابدەن. زیاتر لە (٢٠) ساڵ بەقسەیان کردوون، لایان ئاسایی بووە، کەچی ئێستاو لەهەلومەرجی ئازادیدا، یەکگرتوو، ئەوە بەتۆمەتبارکردن دەزانێ پێیان گوترابێ دۆستی ئەو لایەنەن کە (٢٠) ساڵ زیاتر بۆ خاتری ئەوان، لەرۆژگاری میحنەتی کوردستاندا، پابەندیان بوون. تەنانەت لەسەر بریاری ئیخوانەکان، نەك هەر دژی شۆرشی کوردستان بوون، بەڵکو دژی ئەوەش بوون ئیسلامگەراکانی دیکەش (موجاهید) دروست بکەن‌و خەباتی چەکداری بکەن. هەر بۆ نمونە شارەزایەکی ئیسلامگەرا، ئاوها باسی هەڵوێستی ئەوسای یەکگرتوو لەسەر خەباتی چەکداری دەکا:

" لەمانگی (٥)ی ١٩٨٧ لەکاتێکدا مامۆستا مەلا عوسمان (بەرەحمەت بێت) لەگەڵ رێکخستنی نوێ‌و کۆمەڵێکی زۆر لەهاولاتیانی شاری هەڵەبجەو شارەزوورو هەورامان بەرەو دیوی ئێران رۆیشتن‌و بزووتنەوە ئیعلان کرا، دەست بەجێ مامۆستا (صلاح الدين بهاءالدين) رۆشتە ئیمارات‌و نامەیەکی لەلایەن (نعمان السامرائي) هێنا بۆ ئەوەی رێکخستنی نوێ‌و کۆمەڵێکی زۆر بۆ چەك هەڵگرتن‌و جیهاد هاتبوون ساردیان بکاتەوەو پشتی مامۆستا مەلا عوسمان چۆڵ بکەن، ئۆردوگای سەریاس‌و دزلی‌و جوانرۆو کامێران چاکترین شاهێدن خەتی مامۆستا صلاح چۆن هەولی جدیان دەدا بۆ ساردکردنەوەی پێشمەرگەکان‌و لەباربردنی بزووتنەوە" (**هەمان سەرچاوەی پێشوو/ لاپەرە ١٤-١٥**).

بۆ زیاتر سەلماندنی ئەم بیروراو هەڵوێستانەی رابەری یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان، با بۆچوونی کەسێکی تری شارەزا بهێنینەوە کەدەڵێ: "لەدوای راگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامی، م. صلاح الدين سەفەرێکی ئیماراتی کردو هەندێك لەسەرانی برایانی دیبوو وە بریاری بۆ سەرجەم ئیخوانەکان بە م. مەلا عوسمانیشەوە هێنابوو تا پاشەکشە لەبزووتنەوە بکەن‌و مامۆستاش م. مەلا عەلی لەشوێنی خۆی دابنێ‌و خۆی وردە وردە بێتە دواوە.. لە (کاروانی رێ)دا هاتووە بەگەیشتنی بریارەکە ئیخوان سێ کەرت بوو:

١. م. صلاح‌و هاوبیرانی بەسەر تاخواری بڕیارەکە پابەندو شادومان بوون.
٢. م. صدیق‌و ڕێکخستنی نوێ بڕیارەکە هەورە بروسکەیەکی کوتوپڕ بوو هەڵوێستیانی توشی لەرزە کرد.
٣. م. مەلا عوسمان‌و تاقمێك لەزاناو لاوەکانی تری ئیخوان بێ دەربەستانە بەرپەرچی بڕیارەکەیان دایەوە، تا ئەوەبوو ماموستا وتی: (بسم الله)ی بڕیارەکە لابەن، با ئەوی تری بخەمە ژێر پێم..." **(هاڵە کوك، پوختەی یادەوەریەکانم لەناو بزووتنەوەی راپەرینی ئیسلامی، لەسەر هەڵدان تا تێکشکان/ لاپەرە ٣٠/ نوسینی: هیوا)**

(م. عەلی) ئەو راستیانەی سەرەوە بەکراوەیی باس دەکاو پێشینەی خۆیان‌و ئیخوان‌و حزبی ئیسلامی عێراقی بەرۆشنی بەم شێوەیەی خوارەوە دەخاتە روو:

**بێگومان ئێمە لەحزبی ئیسلامی عێراقی نزیکین، ئەمەش بەحوکمی ئەو خەلفییەتە فیکری‌و پەروەردەییەی لەنێوا نماندا هەیە کە دەچێتەوە سەر ئیخوان موسلمین.**

ئەگەر یەکگرتوو لەحزبی ئیسلامی نزیکەو پێشینەی هەردوولاشیان دەگەرێتەوە سەر ئیخوان موسلمین، ئەی بۆچی باسلێوەکردنی دۆستایەتیان بەتۆمەتبارکردن دەزانێ‌و بەشانازی لەقەڵەم نادات. کەوابێ: پەیوەندی کۆن‌و نوێی یەکگرتوو لەگەڵ حزبی ئیسلامی‌و ئیخوانەکان، تۆمەت نییە، بەڵکو راستییەکەو نکوڵی لێ ناکرێ. جا ئەو پەیوەندییە لەرووی رێکخستنەوە ئاڵوگۆری بەسەردا هاتبێ، ئەمەیان پێویستی سەردەمەکەیە. بەڵام لەگەوهەردا ستراتیژیان نەگۆراوە.

## یەکگرتوو بڕیار نادات!!

کاکە دانا ئەسعەد.. پرسیارێکی هەستیار لە (م. عەلی) دەکات‌و رووبەرووی ئەم دووریانە سیاسیەی دەکاتەوە:

**گەر پرۆسەی سیاسی عێراق، یەکگرتووی ئیسلامی خستە بەردەم دووریانێکەوە، یەکێکیان نەتەوەیی‌و ئەوی تریان ئاینی، یەکگرتوو کامیان هەڵدەبژێرێت؟**

لەوەڵامدا (م. عەلی) لەو دووریانە، ئەم رێیەی خوارەوە هەڵدەبژێرێ:

**ئێمە لەو بڕوایەدا نین شتێکی لەو جۆرە رووبدات، چونکە ئاین بۆ بەختەوەری مرۆڤ هاتووەو هیچ کاتێك لەدژی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤایەتی نییە، بۆیە ئێمە هیچ ناکۆکیەك نابینین لەنێوان داوا رەواکانی میللەتی کوردو نەگۆرەکانی ئیسلامدا، بۆ نمونە دابەشکردنی عێراق شتێك نییە لەدژی نەگۆرەکانی ئیسلام بێت یاخود یەکگرتوویی خاکی عێراق دەقێکی قورئان نییە، بەڵام هەر کاتێك**

**پرۆسە سیاسیەکە ئیمەی خستە بەردەم دووریان و بریارێکی لەو جۆرە ئەو کاتە جەماوەر بریار دەدات و گەر بریارەکەشیان لەبەرژەوەندی میللەتی کورددا بوو.**

سەرەتا (م. عەلی) لەو بروایەدا نییە لەعێراق و کوردستان و لەدونیای سیاسەتدا، شتی لەو جۆرە روبدات. سەیرترین مەسەلە لەسیاسەتدا، ئەوەیە لەو بروایەدا بیت پێشهاتی سیاسی، یان ئەگەرێك لەئەگەرەکانی دونیای سیاسەت، رونەدات یان رونادات. ئەم جۆرە بروایە جگەلە خۆشخەیاڵی سیاسەت، هیچی دیکە نییە. سیاسەتمەدارو بەرپرسی هێزە سیاسیەکان، دەبێ چاوەروانی هەموو روداوێکی سیاسی بکەن. بەروداوی چاوەروان نەکراویشەوە.

سەبارەت بەوەش ئاین بۆ بەختەوەری مرۆڤ هاتووەو دژی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤایەتی نییە. ئەمەشیان.. بەشێوەیەکی رەها تەماشا ناکرێ. ئاین، وەکو هەموو عەقیدەیەکی دیکە، لەیەك روانگەوە سەیر ناکرێ. ئاینی ئیسلامیش هەروا. زۆربەی بەشەرییەت ئیسلامی نین، هەروا، تێروانین بۆ مرۆڤایەتیش، لەئاینێکەوە بۆ ئاینێکی دیکەو لەفەلسەفەیەکەوە بۆ فەلسەفەیەکی دیکە، جیاوازە. ئیسلامییەك کاتێك ئیسلام بەبەختەوەری مرۆڤایەتی دەزانێ، جولەکەیەك و مەسیحیەك کوتومت وای نازانێ. بەڵکو هەندێ جار بەپێچەوانەشی دەزانێ. تەنانەت لەناو خودی ئاینی ئیسلامیشدا، مەزهەب و تەریقەتەکانی ئیسلامی، لەسەر پەیامی سیاسی ئیسلام و ئیجتیهادی ئیسلام، ناکۆکن. بەدرێژایی مێژووش رەوتە جیاوازەکانی ئیسلام بۆ حوکمرانێتی مرۆڤایەتی (نەك بەختەوەری مرۆڤایەتیش) سەدان هەزار مرۆڤیان کردە قوربانی کوشتارگاکانی دەسەڵاتەکانیان. بۆ نمونە:

هەر ئێستا.. یەکگرتووی ئیسلامی و حزبی ئیسلامی عێراقی، کەدۆست و هاو رەگەزیشن، چونیەك سەیری مافی چارەی خۆنوسینی نەتەوەی کورد ناکەن. بەهەمان شێوەش سەیری کوردستانیەتی کەرکوك و خانەقین ناکەن. ئایە حزبی ئیسلامی عێراقی، کەکوردستانیەتی کەرکوك ناسەلمێنن و هەر بەپێچەوانەی ئیماندارێتی هاوبەشی ئیسلامگەراو عێراقیەکانی دەزانن، ئایە ئەم سیاسەتەش، لەلایەن حزبی ئیسلامی عێراقیەوە، بۆ سەپاندنی عێراقچێتی لەسەر کەرکوك، هەر لەخزمەتی مرۆڤایەتی ئیسلامیەکەدایە؟ بێگومان نەخێر. کەوابێ: لەناو خودی ئیسلامی و سوننیگەراکانیشدا، جیاوازی رێبازی سیاسی لەسەر کێشەکان هەیە. چ جای بۆ ئاینە جیاوازو مەزهەبە ناکۆکەکانی ئاینەکان.

سەیر لەوەدایە کە (م. عەلی) سیاسەتو هەڵوێست وەکو قوری سەناعی سەیر دەکاتو حزب، لەبریارو بەرپرسیارێتی مێژوویی دوور دەخاتەوە، بۆیە بەراشکاوی دەڵێ:

**هەر کاتێك پرۆسە سیاسیەکە ئێمەی خستە بەردەم دووریانو بریارێکی لەو جۆرە ئەو کاتە جەماوەر بریار دەدات و گەر بریارەکەشیان لەبەرژەوەندی میللەتی کورددا بوو.**

(م. عەلی) ئۆباڵە سیاسیەکەی هەلومەرجەکە دەخاتە ئەستۆی جەماوەرو یەککرتووی لێ دەربازدەکات. پرسیارەکە رۆشنە، دوو رێگەی دووریانێکی خستۆتە بەردەم یەککرتوو: نەتەوەیی، یان ئاینی.. کەچی (م. عەلی)لەوەلامی دیاریکراوی پرسیارەکە هەڵدێتو لەگەردنی جەماوەری دەئاڵێنێ.

ئەم وەلامە.. دەیسەلمێنێ کەیەککرتوو، بریارو خیتابێکی پێشتر ساغکراوەی سەبارەت بەمەسەلە نەتەوەییەکان نییە، بۆیە، چاوەروانە جەماوەر بریار بۆ حزبەکەی بدەن. ئەمە لەکاتێکدا حزبەکان، بەحساب دەبێ بەشە وشیارەکەی جەماوەربنو پێش وەختیش، هیچ نەبێ، لەسەر مەسەلە چارەنوسسازەکاز بریاروبەرنامەیان هەبێ. ئەگەر یەککرتوو بۆ مەسەلە نەتەوەییەکان، پێش وەخت بریاری نەدابێو بەرنامەی نەبووبێ، ئیتر جیاوازی چییە لەگەڵ گروپێکی خێرخواز، کەتوخنی سیاسەتو چارەنوسی گەل ناکەوون. خۆ یەککرتو دەزگایەکی راپرسی نییە هەتا چاوەروانی رای خەڵك لەسەر مەسەلەیەکو سیاسی زۆر گرنگ، بێ.

گەر دیقەت بدرێ، (م. عەلی) وەنەبێ چارەنوسی بریار کە دەداتە جەماوەر جەماوەر هەر بریارێك بدات بەقسەی دەکەن. نەخێر. دەڵێ: گەر بریار جەماوەر لەبەرژەوەندی میللەتی کورددا بوو، بەقسەی دەکەین.

کەواتا.. (م. عەلی) بریاری جەماوەریشی خستۆتە گومانەوە. نازانێ هەنگینێ، جەماوەر لەنێوان رێگەی نەتەوەو رێگەی ئاین، بریاری راست دەدات یان هەڵە. لەمەیاندا.. (م. عەلی) پاشکەوتێکی سیاسی لەوەلامەکەیدا، بۆ حزبەکەی هێشتۆتەوە، هەتا ئەگەر رووداوی وا روویدا، بەرژەوەندی حزبەکە چۆنی خواست، وا بکات. ووشەی (گەر) لەسیاسەتو لەهەموو مەسەلەیەکی دیکەدا، دوابریار پەسەند کردن نییە. بەڵکو (گەر) دەچێتە خانەی گومان گریمان. ئەمەش، جۆرە مانۆرێکی ئیسلامگەرانەیە بۆ فریودانی خەڵك، گوایە پشت بەرای خەڵك دەبەستن. ئەویش (گەر!) لەبەرژەوەندیاندا، بێت.

## گەندەڵی و ستراتیژ

لەدرێژەی مشتومرەکەدا (م. عەلی) وەڵامی پرسیارێکی سیاسی سەبارەت بەمەسەلە ستراتیژیەکان، کە بەم شێوەیەی خوارەوە لێی دەکرێ دەداتەوە:

**ئەو خاڵە نەگۆڕو ستراتیژیانە چین کەیەکگرتووی ئیسلامی ئامادە نییە دەستبەرداری بێت لەکاتی دروست بوونی هەر هاوپەیمانێتیەکدا؟**

(م. عەلی) کەوەکو بەرپرسێکی سیاسی حزبێکی سیاسی، کە (١٢) ساڵە هەیەو لەمەو بەریش (٢٢) ساڵ خۆی سڕ کردبوو، پێش ئەوەش هەبووە، ئاوا وەڵام دەداتەوە:

**هەر شتێك لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی میللەتی کوردستاندا یەك بگرێتەوە ئێمە لەگەڵیداین. هەروەها مەسەلەی گەندەڵی؛ چونکە ئەم تەوەرەیە تەنها لەبەرژەوەندی ژمارەیەکی کەمی مشە خۆرەو دژی بەرژەوەندییە گشتیەکانی میللەتی کوردە.**

هەر شتێك یانی چی؟ پرسیارەکە لەسەر خاڵی نەگۆڕو ستراتیژە. لەسەر (هەر شتێك!!) نییە. خاڵی نەگۆڕو ستراتیژی، کۆنگرەی حزبەکان دایدەڕێژن. هەربۆیە سەرکردایەتی هیچ حزبێك ناتوانێ (دەستبەرداری بێت) سەرکردەیەکی سیاسی حزبێك، کاتێك پرسیارێکی سیاسی دەربارەی ستراتیژ لێدەکرێ، هەقوایە وەڵامێکی کۆنکرێتی ئەوتۆ بداتەوە، کەهەم ستراتیژی حزبەکەی ڕۆشن بکاتەوەو هەم جیاوازی ئەو ستراتیژە لەگەڵ ستراتیژی لایەنەکانی دیکە دەربخات. نەك وەڵامێکی لاستیکی بداتەوە کەهەموو جۆرە کێشێك هەڵبگرێت. میللەتی کوردستان، بەرژەوەندی دوورو بەرژەوەندی نزیك، هەروا هەزاران تاکتیكو جۆرەها ستراتیژی هەیە. کاتێك (م. عەلی) دەڵێ: هەر شتێك لەبەرژەوەندی کوردستاندا. بەرژەوەندی لەبزنو گوێرەکەیەکەوە هەیە، هەتا دەگاتە یەکخستنەوەی هەر چوار پارچەکەی کوردستان.

لەنیوەی دووەمی وەڵامی ئەم پرسیارەدا، باسی (گەندەڵی) دەکاتو جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە کەگەندەڵی تەنها لەبەرژەوەندی چەند کەسێکدایە.

لەراستیدا، ئەو قسانە لەسەر گەندەڵی، ڕاستن. بەڵام پرسیارەکە کوتومت سیاسییەو لەدوریشەوە پەیوەندی بەئیدارەو گەندەڵییەوە نییە. بەستنەوەی مەسەلەی ستراتیژی سیاسی بەگەندەڵی، ئاشکرا دیارە کەپەیوەندی بەپروپاگەندەی هەڵبژاردنەوە هەیە. لەوەڵامەکەدا (م. عەلی) دەیەوێ بڵێ: گەندەڵیەکە زۆر بووەو چەند مشەخۆرێکیش سودی لێوەر دەگرن، ئێمەش تەحەمولمان نەکردو لەلیستی هاوپەیمانی جیابوینەوە.

ئەم وەڵامە.. هەروەكو سات و سەودای سەردەمی دەرەبەگایەتی وایە، لەكۆندا، دراو نەبووە، بۆیە، شمەك سەربەسەر، یان سەر بەدوو سەری پێكراوە، بۆ نمونە:

مریشكێك و هۆقەیەك رۆن دراوە، دوو مەتر كوتاڵ و كلچێوێك وەرگیراوە. (م. عەلی) بەهەمان شێوە وەڵامی داوەتەوە. ستراتیژی سیاسی و گەندەڵی تێكەڵاو كردووە. لەكاتێكدا، پرسیاری دوای ئەوە لەسەر گەندەڵیشە. لەم پرسیارەدا هاتووە:

**دروشمی یەكگرتوو پێش هەڵبژاردن نەهێشتنی گەندەڵی بوو، ئێوە چۆن دەتوانن گەندەڵی لەناوبەرن؟**

وەڵامی (م. عەلی) تەنها رواڵەتی گەندەڵی دەگرێتەوە و نەیتوانیوە، پرۆژەیەكی بابەتی و زانستی بۆ چۆنیەتی پاكسازی گەندەڵی، پێشكەش بكات. كەدەڵێ:

**ئێمە قەناعەتمان وایە گەندەڵی بریتییە لە مشەخۆرییەك و وەك چەند خانەیەكی نەخۆش لەكۆمەڵگەدا بڵاوبۆتەوەو تەشەنە دەكات. ئیتر چ گەندەڵی ئیداری و مالی بێت و چ گەندەڵی سیاسی بێت، ئێمە قەناعەتمان وایە دەتوانین لەرێی راگەیاندن و چاوپێكەوتن و هەروەها لەرێی ئەو پۆستانەی لەرێی ئیستیحقاقاتی ئینتیخابی خۆمانەوە وەریدەگرین دەتوانین دژە گەندەڵی بەرپا بكەین و چاوپۆشی لێنەكەین.**

گەندەڵی، بەوجۆرە قسانە، نەك چارەسەر ناكرێ، بەڵكو خراپتریش تەشەنە دەسەنێ. ئاخر لەكوێی ئەم دونیایە، لەناو كام دەوڵەت و سیستەمدا، گەندەڵی، بەو شێوەیە قەبەكراوەی یەكگرتوو، یان نەیارانی دیكە، باسی دەكەن، لەكوێ گەندەڵی ئاوا لەناو دەچێ؟

گەندەڵی.. رەگ و ریشەی كۆنی رۆچۆتە ژێرخانی ئابوری، پێكهاتەی دەسەڵات، كلتوری ئیداری و توێژی بیرۆكرات و مشەخۆری كاربەدەست و فەرمانبەرانەوە. تەنانەت لەوڵاتانی دیكەدا، گەندەڵی، بۆتە بەشێكی باندی گەورە گەورە كارتیلاتی ئابورییەوە، لەحاڵەتێكدا گەندەڵی بەو شێوەیەش بێ كەیەكگرتوو باسی لێوە دەكەن، كاری وا، پێویستی بەپرۆژەیەكی سیاسی و ئیداری یاسایی هەمەلایەنە. دەبێ قسە لەسەر: فەلسەفەی حوكم، ژێرخانی ئابوری، تیۆری ئیداری، هێنانی پسپۆر، میكانیزمی كارو كاركردن، تەكنەلۆژیای هاوچەرخ، سیستەمی بانكی، چاودێری دارایی و ئیداری، پەروەردەی خوێندن و كۆرس فێركردن.. تاد.

بەڵێ.. گەندەڵی.. بەو شێوەیە دەیان شێوازی دیکە ریشەکێش دەکرێ، نەک ەدوعای ئیسلامیو ڕۆمانسیەتی عەلمانی.

لە مامۆستا وایە، بەوەزیرێکو دووانی ئیستیحقاقی دەتوانن شۆرشێك دژی ەندەڵی بەرپا بکەن. ئەمەیان هەر مەحاڵە. ئەوە نییە لەوەزارەتەکەی هەولێر ەکگرتوو وەزیریان هەیە، چی پێکراوە. قسە هەیە کەخۆیشی توشی گەندەڵی ووە! بۆ ئەوەی پاساویش بۆ ئەو قسانەی بێنێتەوەو، بەجۆرێکی دی، ێشەکان باس بکاتو هەوڵیش بدات لەخۆیانی دوور بخاتەوە، لەدرێژەی ئەو سانەدا، دەڵێ:

**بەڵام نەوەمان بیر نەچێت کەگۆچانی سیحریمان پێنییە. یەکێتیو پارتی رایانگەیاند کەدژ ەگەندەڵی دەوەستن بەڵام تاکو ئێستا نەیانتوانیوە رێی لێبگرن. کێشەکە لەوەدایە کەبەرپرسێك دزی ەکاتو شانازیش دەکات، بەڵام ئەگەر ئێمە گەندەڵی قێزەون بکەینو لەگەڵ خاوەن قەڵەمو ۆشنبیرو خەڵکی پاكو نەزیهی ناو دامودەزگاکانو ناو حزبەکان شۆرشێك دژ بەگەندەڵی ەرپابکەین.**

جارێ سەبارەت بەیەکێتی، هێندەی بزانین دەیان پۆستی گۆڕیوەو ەندەڵیشی لابردووەو کەوتۆتە لێ پێچینەوە لەزۆر شتی دیکە. هیچ نەبێ لەناو ەکێتیدا، شەفافیەت هەیە. شتەکان باشتر باس کراوون. هەر ئێستا زیاتر لە ٨٠) بەڕێوەبەری گشتیو جێگریانو راوێژکار لەژێر لێکۆڵینەوەدان. لێکۆڵینەوە ەسەر نەوتو بەنزینی دزراو هەیە. لەکۆمپانیاو گرێبەستەکان دەپرسنەوە. ریاریشە.. زیاتر پرسینەوە هەبێو سزاش هەبێ.

لەراستیدا.. لەهیچ دزێکمان نەبیستووە شانازی بەدزێتییەوە بکات. بەڵکو ێشەکە بەپێچەوانەوەیە، دزو گەندەڵ، لەپاڵ هەوڵی ریفۆرمدا خۆیان ەشارنەوەو جار جارەش، خۆیان بەدڵسۆزترینو پاکترین کاربەدەست نیشان ەدەن. ئەمەیان گرفتە، نەك دز شانازی بەدزیەوە بکات.

دوا قسەشمان لەسەر قسەکانی (م. عەلی) ئەوەیە کەشۆرش دژی گەندەڵی.. ەرپا ناکرێ. بەڵکو گەندەڵی بەبەرنامەیەکی درێژ خایەنی چاکسازی چارەسەر ەکرێ. سەیریشە بەلامانەوە، گەندەڵی حەوسەڵەیان لەیەکگرتوو بڕیبێو بڕیاری ۆرشیان دابێ. نازانین بۆچی لەشانسی یەکێتیو پارتی یەکگرتوو حەوسەڵەیان ەماوە. بەڵام لەسەردەمی رژێمدا.. پشوو درێژی حەزرەتی ئەیوبییان هەبوو!!

لەم بەشەدا.. (م. عەلی) بەشێوەیەکی گشتی باسی سیاسەت، کوردایەتی، یمانداری، ئیخوان موسلمینو هەڵوێستە سیاسییە گشتیەکانیان لەسەر

روداوەکان دەکات. وەڵامەکانی، وەڵامی بەرپرسێکی خۆپارێزی ئیسلامگەرای
کەلەباتی شەفافیەت، تەمومژاوی بۆ چونەکانی دەردەبڕێ. دەیەوێ خوێنەر فری
بداو پیشانی دەدا کەلەرابردوویان دەترسن‌و ناشیانەوێ ببەسترێنەو
بەئیخوانەکان. لەوانەش سەیرتر، خۆیان بەلایەنێکی مەدەنیخواز دەزانن، بەڵا
بەتیرۆریستەکان دەڵێن: هێزی بەرەنگارین دژی داگیرکەر. دیارە، یەکگرتو
کەوتونەتە ناو ناکۆکیەکانی سیاسی سەیرەوە، لەناو خۆیاندا بەجۆرێك بی
دەکەنەوەو لەدەرەوەشدا، بەجۆرێکی دیکە. لەنێوان ئیسلامگەرایی‌و دەسەڵات
دونیایی، تەراتێن دەکەن. بەرژەوەندییان لەبارودۆخە گۆردراوەکاندا، چی
بخوازێ، وادەکەن. جارێك ئیسلامیەتەکە تۆخ دەکەن‌و جارێکیش
دونیاخوازییەکە. با لەئاخرین بەشی ئەم وەڵامانەی (م. عەلی)دا، وەڵامەکان
شەن‌و کەو بکەین، هەتا ئەو راستیانەی سەرەوەمان سەبارەت بەیەکگرتوو
ئیسلامی بۆ دەربکەوێ.

## فیدراڵیەت‌و یەکگرتوو

فیدراڵ.. کەهەتا وەڵامدانەوەی پرسیارەکان زیاتر لە (١٥) ساڵ بەسە
پەسەندکردنیدا تێپەریوەو لەبنەچەشدا، تێزی فیدراڵ‌و گوزەر لەئۆتۆنۆمیەوە
ساڵی (١٩٩١–١٩٩٢) مشتومرێکی کەمی لەسەر نەبووە. ئەو کاتە یەکگرتوو
تازە لەفرێزەری (٢٠) ساڵ خۆ (سڕ) کردن، هاتبونە دەرو لەبەرئەوەی لەدۆخ
سیاسیەکەو چارەنوسی راپەرین دڵنیانەبوون، بۆیە، سەرەتا بەناوی (اغاث
اسلامي)یەوە، دابەزینە مەیدان. زۆر موحافیزکارانەو، بەنەخشە ناوی (اغاثة)یا
لەخۆیان نابوو. لەلایەکەوە نەیان دەویست مەسئولیەتی سیاسی رێکخستنێک
نوێ هەڵبگرن، نەکا دۆخە سیاسیەکە تێك بچێ، لەلایەکی دیکەشەوە
دەیانویست بەو رێکخراوە خێرخوازییەوە، پێشەکی بکەونە ناو خەڵك‌و لەدەور
خۆیان بەهۆی کۆمەکەوە کۆیان بکەنەوە. لەمانەش هەستیارتر، ئەوکات
بزووتنەوەی ئیسلامی هێزێکی چەکداری دیاری هەبوو، یەکگرتووش کاتی خۆ
دژیان بووە، لەمانیش سڵیان دەکردەوە. بۆیە، بەناوی (اغاثة)وە کەوتنە گەر
کەمتر توخنی هەڵوێستە سیاسییەکان دەکەوتن. ئەو کاتەش مشتومڕ لەسە
ئۆتۆنۆمی‌و فیدراڵ لەئارادا بوو، ئەمان لەبنەوە خەریکی کنە کردن بوون. کات
هەڵبژاردنیش، هەر بەناوی (اغاثة)وە چوونە ناو لیستی ئیسلامگەراکانەوە
پەیمانیان دابوو کەلەهەڵبژاردندا، هەم دەنگ بەلیستەکەو هەم دەنگیش بە (مە
عوسمان عەبدولعەزیز) کاندیدی ئیسلامیەکان بۆ رابەری کوردستان، بدەن. بەڵا

یەككگرتوو لەژێرەوە فێڵی كردو بەنهێنی پەیمانیان دابووە پارتی كەبۆ رابەر، دەنگ بە (مەسعود بارزانی) دەدەن. ئەمەش، سەرەتای سیاسەتی كوردایەتیان بووە. سیاسەتێكی سێ سەرەیان پەیرەو كردووە:

سەرێكیان: پەیمانیان لەگەڵ بزووتنەوەو رابەرەكەیان بەستووەو پێشێلیان كردووە.

دووەمیشیان: لەژێرەوە لەگەڵ سەرۆكی پارتی رێكەوتونو پاشقولیان لەكاندیدی ئیسلامیەكە، بۆ عەلمانیەت گرتووە.

سێهەمیشیان: بەو هەڵوێستە.. كەلەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی رێكەوتونو دەنگیان بەسەرۆكی پارتی داوە، یەكێتی نیشتمانییان چەواشە كردووەو لەحساباتی هەڵبژاردنی رابەردا، بەهەڵەیان بردوون. بەڵێ.. ئەوە (بسم الله)ی كوردایەتیەكەیان بووە. با بزانین (صدق الله العظیم)كەیان چۆن دەبێ؟!

دوای تێپەرینی (١٤) ساڵ بەسەر ئەو روداوانەو پەسەند كردنی فیدراڵدا، تازە تازە (م. عەلی) لەوەڵامی پرسیارێكی رۆژنامەنوسدا، لەمەر فیدراڵ، كەلێی دەپرسێ:

**لەبارەی فیدرالیەتەوە ئێوە هەڵوێستتان چییە؟**

ئەویش لەوڵامدا، دیسان وەكو بەرپرسێكی نابەرپرسیار لەكێشە سیاسیەكان، ئاوا وەڵام دەداتەوە:

**مادام نوێنەرانی میللەتی كورد لەساڵی ١٩٩٢دا پەسەندیان كردووە، ئێمەش لەم قۆناغەدا پشتگیری لێدەكەین.**

مادام نوێنەرانی میللەتی كورد پەسەندیان كردووە، یانی چی؟ یانی.. ئەگەر ئەو نوێنەرانە، فیدراڵیان پەسەند نەكردبا، یەككگرتوو، بەرنامەی فیدراڵی نە هەبووەو .. نەدەشبوو. ئەمە لەهەمان كاتدا ئەوەش دەگەیەنێ كەیەككگرتوو، لەبنەچەدا بەرنامەی چارەسەری بۆ كێشەی كوردستان هەر نەبووە. ئەگینا دەیگوت: گەرچی ئێمە بەرنامەیەكی دیكەی چارەسەری كێشەی كوردستانمان هەیە، بەڵام مادام نوێنەرانی كورد فیدراڵیان هەڵبژاردووە، ئێمەش پەسەندمانە. كەوای نەگوتووە، سەلماندوویەتی كەئەو كاتەو لەوەوبەریش، لەسەر كێشەی كوردستان، بەرنامەو بریارێكیان هەر نەبووە. سەیرتر لەو قسانەش، دەڵێ: لەم قۆناغەدا ئێمەش پشتگیری لێدەكەین.

ئەم وەڵامە تەمومژاوییە. جارێ كەدەڵێ لەم قۆناغەدا پشتگیری لێ دەكەین، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كەخۆیان بۆ سیاسەتی قۆناغی دیكەی سیاسەت

هه‌لگرتووه. جا ئه‌و قۆناغه چییه، باسی نه‌کردووه. ئه‌گه‌ر قۆناغه‌که‌ی باسکردبا، ده‌مانزانی مه‌به‌ستی چییه. به‌لام که‌باسی نه‌کردووه‌و له‌ته‌مومژدا هێشتوویه‌تیه‌وه‌و یه‌کگرتووش هێزێکی ئیسلامگه‌رایه، که‌واتا، بۆمان هه‌یه ته‌نانه‌ت له‌م پشتگیری کردنه‌ش گومانمان هه‌بێ که‌پشتگیرییه‌کی تاکتیکییه، نه‌ك ستراتیژی، ئاخۆ له‌قۆناغی دیکه‌دا، چ به‌رنامه‌یه‌کیان هه‌یه‌و چ پرۆژه‌یه‌کی سیاسی په‌سه‌ند ده‌که‌ن، ئه‌مه‌یان مه‌گه‌ر خۆیان وه‌لامی بده‌نه‌وه. به‌لام پێش وه‌خت ده‌بێ بزانرێ که‌یه‌کگرتوو، له‌قسه‌ی رابه‌رانی ئیخوان موسلمین ده‌رنه‌چووه‌و ده‌ریش ناچێ. به‌تایبه‌تی له‌مه‌سه‌له ستراتیژیه‌کاندا.

## حه‌لال کردنی (مقاوه‌مه‌ت!!)

یه‌کێك له‌و پرسیاره باشانه‌ی رۆژنامه‌نوس، ئه‌وه‌یه که‌ده‌پرسێ:

**وەك یەکگرتوو کارە توندوتیژیەکانی ناو عێراق بەچی ناو دەبەن؟**

(م. عه‌لی)یش رێك‌و ره‌وان، به‌حوکمی ئه‌رکه ئیسلامیه‌که، که‌تیرۆریسته‌کانیش ئیسلامگه‌ران، ئاوا وه‌لام ده‌داته‌وه:

**ئێمە هیچ توندوتیژییەك بەحەلال نازانین بۆ هیچ کەسێك، تەنها لەبەرامبەر هێزێکی داگیرکەر نەبێت بەلام بەشێوەیەکی رێکخراو**

که‌وابێ.. توندوتیژی، به‌شێوه‌یه‌کی رێکخراو بێ، پشتیوانی لێده‌که‌ن. ئه‌ویش ته‌نها له‌به‌رامبه‌ر هێزێکی داگیرکه‌ر.

ئه‌م وه‌لامه.. گه‌لێ گرێی سیاسی‌و ئایدۆلۆژی ده‌کاته‌وه. به‌لێ.. یه‌کگرتووی ئیسلامی، که‌هه‌میشه لافی ئه‌وه لێده‌دا خه‌باتی مه‌ده‌نیخوازی ده‌کات‌و دووره له‌توندوتیژی‌و میلیشیا دروست کردن، ئه‌وه‌تانێ له‌به‌رامبه‌ر جۆرێك له‌توندوتیژی خه‌ته‌رناکدا، سیاسه‌ت ده‌گۆرێ. ئه‌ویش توندوتیژی تیرۆریستانه به‌رامبه‌ر ئه‌مریکاییه‌کان.

لێره‌وه.. ده‌توانرێ به‌وردی پێکهاته‌ی یه‌کگرتوو، هه‌روا سیاسه‌ت‌و بیرکردنه‌وه‌ی سه‌رکردایه‌تیان، له‌سه‌ر مه‌سه‌له‌گه‌لێکی ستراتیژی بزانرێ. به‌مه‌سه‌له‌ی کوردایه‌تیشه‌وه. چونکه له‌دووتوێی وه‌لامه‌که‌دا، نیه‌تی راسته‌قینه‌ی یه‌کگرتوو، ده‌رکه‌وتووه. (م. عه‌لی) که‌ده‌لێ: به‌رامبه‌ر داگیرکه‌ر توندوتیژی به‌شێوه‌یه‌کی رێکخراو به‌حه‌لال ده‌زانین. له‌م وه‌لامه‌دا، له‌ولاتانی ئیسلامیدا، ئه‌مریکاو ئیسرائیل به‌داگیرکه‌ر ده‌زانێ. ئه‌مه‌ش ستراتیژێکی ئاشکرای ئیخوانه‌کانه. ئه‌گه‌ر وا نه‌با، له‌په‌نجاکانه‌وه که‌ئیخوانه‌کان له‌عێراق‌و کوردستاندا

سەریان هەڵ هێناوە، هەتا سەرەتای نەوەتەکان کەیەکگرتووش سەری هەڵێنا، چ ئیخوانو چ یەکگرتوو، بەرامبەر داگیرکەرانی کوردستانو کێشەی نەتەوەی کورد، هەڵوێستێکیان دەردەبڕی. کەوایان نەکردبێ، ئەوە دەگەیەنێ کەئیخوانو یەکگرتوو، هیچ حکومەتێکی داگیرکەری کوردستان بەداگیرکەر نازانن، هەربۆیە، نەوەکو داگیرکەر دژیان بوونو لەناو شۆرشی گەلی کوردستانیش، نەك بەشدارییان نەکردووە، بەڵکو پشتیوانیشیان نەکردووە. ئەم بیرکردنەوەیە، لەمەر پێناسەی داگیرکەرو حەلاڵ کردنی توندوتیژی بەرامبەریان، بیرکردنەوەیەکی مەترسیدارە. چونکە زاڵکردنی چەمکەکانی کۆسمۆپۆلێتی (سڕینەوەی سنوری نەتەوەیی‌و نیشتمانی) ئیسلامگەراییە بەسەر چەمکەکانی دیکەی ناو نەتەوەو نیشتمانەکان. یەکگرتوویەك کەبەخۆی دەڵێ لەکوردستاندا خەبات دەکات، کەچی هێندەی لای مەبەستە دژی ئەمریکاو ئیسرائیل بێ، چارەکێکی ئەوەش لەمێژووی خۆیدا، دژی داگیرکەرانی کوردستان نییە. هەر لەبەر ئەم باوەرە کۆسمۆپۆلیتییەیە، کەسەرچاوەکەی ئیخوانەکانە، دێتو قێزەونترین جۆری توندوتیژی کەهی تیرۆریستەکانە، دژی ئەمریکا بەحەلاڵ دەزانی. سەیرەکە لەوشەدایە دەشڵێ:

**لەرەهەندێکەوە هێزێکی داگیرکەرن چونکە هێزێکی بیانین‌و لەنەتەوە یەکگرتوەکانیش بەوە ناوزەد کراون، لەرەهەندێکی تریشەوە رزگارکەرن کەهاتوون میللەتی عێراقیان لەدەستی رژێمێکی دیکتاتۆری داپلۆسێنەری زیندە بەچاڵکەری کیمیابارانکەر رزگار کردووە.**

ئەمەیان چەندی بەچەند؟ لەلایەکەوە ئەمریکا عێراقی رزگار کردووەو لەلایەکی ترەوە، حەلاڵە سەربازەکانی بکوژرێ. ئەویش بەدەستی تیرۆریستان. بەراستی.. ئەم سیاسەتە، پرە لەسیفاتی نیفاقی‌و دوو فاقی. نیفاقییە.. چونکە تیرۆریست ماندەداو خۆیشی ناخاتە ژێر ئۆباڵەکەیەوە؛ دوو فاقیشە، لەبەرئەوەی ئەمریکای وەکو رزگارکەر قبوڵە. بەڵام مانەوەی جارێ لەعێراقدا، دەکاتە داگیرکەرو چارەسەریش (مقاومەی رێکخراوە!) بەرامبەریان، هەتا رادەی کوشتنیشیان حەلاڵە.

ئەگەر.. یەکگرتوو، بەراستی قبوڵێتی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی رزگارکەری عێراقن لەو دیکتاتۆرە داپلۆسێنەرو کیمیاباران کەرە، کەوابێ: قبوڵیشیان بووە بەسوپاوە بێتە ناو عێراق. کەواتا: یەکگرتووش سیاسەتی هێنانی ئەمریکای پەسەند کردووە. هەتا ئێرە وایە. بەڵام (م. عەلی) قسەلەسەر دوای نەمانی سەدام دەکاتو دەڵێ: لەبەرئەوەی داگیرکەرە، ئیتر حەلاڵە (مقاومەتیان!) بکرێ. دەپرسین:

- ئەگەر دوژمنایەتی کردنی ئەمریکا حەلاڵە، بۆچی یەکگرتووش چەك هەڵناگرێ؟
- ئەگەر باوەڕیان بەچەك هەڵگرتن نییە، ئەی بۆچی پەیتا پەیتا خۆپیشاندان دژی بوونی هاوپەیمانان لەعێراقدا، ناکەن؟
- خۆ ئەگەر هیچی ئەمانەشیان لەدەست نایەت، ئەی بۆچی لەسایەی عێراقێکی داگیرکراودا، بەشداری هەڵبژاردن دەکەن‌و داوای کورسی حوکمیش دەکەن.. زیاد لەسەنگی خۆشیان؟

پاشان.. نازانین یەکگرتوو، سیاسەتەکەی لەسەر گریمانەی سیاسی بۆ (مقاوەمەت!!) دیاری کردووە، یان لەسەر ئەرزی واقیع‌و روداو. ئەگەر لەسەر ئەرزی واقیع‌و روداوە، ئەوانەی بەتوندوتیژی بەرەنگاری ئەمریکا دەبنەوە، کوا جیاوازییان لەنێوان سەربازی ئەمریکاو منداڵ کردووەو کەی جیاوازی لەنێوان دەبابەو گوڵ دەکەن؟ ئاشکرا.. شانازی بەوەوە دەکەن کەهەموو چەشنە کارێکی عەسکەری، تەنانەت مەدەنیشی لەگەڵ بکوژرێ، حەلاڵە. ئیتر یەکگرتوو.. چۆن چۆنی ئەم کارە توندوتیژانە لێك جوێ‌و حەڵاڵ‌و حەرامیان دیاری دەکات. مەسەلەکە ئاشکرا دیارە کەئەم توندوتیژییەی لەناو عێراقداو جار جارە کوردستانیش دەگرێتەوە، ستراتیژێکە لەسەر ئاستی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هاوئاهەنگە لەگەڵ ئەو سیاسەتە کەئیخوان دژی ئەمریکاو ئیسرائیل بریاری لێداوە.

## تیرۆریستەکان
## تیرۆریست نین!!

پرسیارەکان لەسەر تیرۆرو (مقاوەمەت!)و ئەمریکا (م. عەلی) راکێشاوە بۆ باشتر رۆشنکردنەوەی سیاسەتی یەکگرتوو، سەبارەت بەتیرۆرو تیرۆریستان. سۆزی خۆیان بەرامبەر تیرۆریستان ناشارێتەوە بۆیە، لەوەڵامی پرسیارێکدا کەلێی دەپرسن:

**گەر ناوێك لەو کارە توندوتیژیانەی عێراقبنێین، بەرای ئێوە موقاومەن یاخود کاری تیرۆریستین؟**

ئەم پرسیارە ئاشکرایە کەرۆژنامەنوس دەیەوێ سیاسەتی راستەقینەی یەکگرتوو دەربخا لەسەر روداوی تیرۆر. ناچار (م. عەلی) بەم شێوەیە باوەری راستەقینەی یەکگرتوو دەدرکێنێ:

**هەرچی بەرامبەر بە پۆلیسی عێراقی‌و خەڵکی مەدەنی دەکرێت، کاری تیرۆریستین، بەڵام ئەوەی بەرامبەر بەهێزەکانی ئەمریکا دەکرێت بەکارێکی تیرۆریستی نازانین لەهەمان کاتدا**

**بەموقاوەمەیەکی زۆر راستەقینەی نازانین چونکە ئەنجامی نییە، دەکرێت موقاوەمە بەشێوەیەکی سیاسی بکرێت. بەشێوەیەکی گشتی ئەو کەسانەی دەست دەپارێزن لەخەڵکی مەدەنیو پۆلیسی عێراقیو خەڵکی بێتاوان ناکوژنو تەنها دەیانەوێت موقاوەمەی داگیرکەر بکەن، گەر بەموقاوەمەی نەزانین، ئەوە بەتیرۆریشی نازانین.**

ئەوەی.. بەرامبەر.. ئەمریکا دەکرێ، تیرۆر نییەو مقاوەتیش نییە. کردەیەکی توندوتیژی خۆکوژی بەردەوام، ئەگەر بەتیرۆر نەزانرێ، خۆی لەخۆیدا پشتیوانی کردنیانە. با مۆری مقاوەتیشی پێوە نەنرێ. گرنگ ئەوەیە ئێستا هێزە تیرۆریستەکانو تیرۆریستێك، کاتێك وەلامێکی ئاوا لەمەکتەبی سیاسی یەکگرتوو دەخوێنێتەوە، ئیتر تێدەگات، کارە عەسکەرییەکانی لای یەکگرتوو، تیرۆرو تاوان نییە. لەهەمان کاتدا، لەوەش تێدەگەن یەکگرتوو بەناچاری دانی پیا نانێن کە(مقاوەمەتە ! !). گرنگ ئەوەیە زەرقاویو هاوکارەکانی، لەعێراقدا، کاتێك دەروانننە دادگای یەکگرتوو، دادوەرەکە تاوانی تیرۆری نەداونەتە پاڵ. کەتاوانیشیان نەدرێتە پاڵ، حوکم نادرێن، کەحوکمیش نەدرانو بەردەوامیش بن لەکارو کردەی تیرۆریستی، ئەمە چی دەگەیەنێ؟ بێگومان ئەوە دەگەیەنێ کەئەو کارو کردانە، لەشەرعی ئیسلامەوە حەلاڵنو حەلاڵیش لای ئیسلامگەراکان زۆر گرنگترە لەوەی پێیان بڵێی مقاوەت یان نا.

(م. عەلی) پۆلیسو ئەمریکی لەعێراقدا، جیاکردۆتەوە. کوشتنی پۆلیسی پێ تیرۆرە، بەلام کوشتنی ئەمریکایی پێ رەوایە. پێشتریش دەڵێ: ئەمریکاییەکان سەدامیان روخاندو عێراقیان رزگارکرد.

مرۆ.. لەم تێکەڵو پێکەڵییەی سیاسەتی یەکگرتوو، جاری وا هەیە سەری سوڕدەمێنێ. ئەمریکاییەکان، کەدوژمنەکەی روخاندووین، کوشتنیان حەلاڵە. پۆلیسەکان، کەهەر ئەمریکاییەکان پێکیان هێنانو مەشقیان دەدەنو تەنانەت سەرکردایەتی عەمەلیاتە عەسکەریەکانیشیان دەکەن، کوشتنیان تیرۆرە. تەنها مەگەر یەکگرتوو ئەم دوو هێزە، لەمەیدانی شەردا، لێك جیا بکاتەوەو ئەمریکاییەکان بە (مقاوەمەت! !) بەکوشت بداو پۆلیسەکانیش رزگار بکات. چونکە یەکگرتوو، تاقیکردنەوەی عەسکەریان زۆرە ! !

تێ ناگەین، ئەم جیاکردنەوەیەی دوو هێز لەیەك سەنگەرداو لەناو یەك بزووتنەوەی دژە تیرۆرو پارێزەری دەسەلاتدا، تێ ناگەین لەکاتی شەرو تیرۆرو خۆکوژیدا، چۆن چۆنی لەیەك جیا دەکرێنەوە؟! لەراستیدا، وەلامەکانی (م.عەلی) بەشێوەیەك تێکەو لێکەیە، ئیتر دەردەکەوێ یەکگرتووی ئیسلامی لەناو خۆیاندا، چەند بەناچاری هاتونەتە ناو پرۆسە سیاسییەکەی عێراقو چەندیش ناچار تر بەشداری هەڵبژاردنەکانیان کردووە. دیارە، ئەمانیش خۆیان

بۆ هەلومەرجى تێکشاکانى هاوپەیمانان هەڵگرتووە، هەتا دواى ئەوە، لەبەر رۆشنایى روداوەکانو ریزبەستنى لایەنە سیاسیەکانى عێراق، بەتایبەت سونیگەراکان، دوا سیاسەتى ئیسلامگەرایى خۆیان لەعێراقو ناوچەکەو کوردستانیشدا، دیارى بکەن.

## بۆچى شەرمە لەگەڵ ئیخوان بن ؟

هەمیشە.. پەیوەندى هێزە سیاسیەکان، چ لەناوچەیەکداو چ لەسەر ئاستى جیهاندا، دیاردەیەکى سیاسى ئاسایى بووە. ئەگەر ئەو پەیوەندییە، بەپێى پێویستو بەبریارى باوەر پێکراوى حزبە سیاسیەکان، لەگەڵ ناوەندى سیاسى جیهانى یان ناوچەیى، هاتبێتە ئاراوە. زۆربەى رێبازە فکرىو سیاسیەکانیش، لەجیهاندا، هاورێبازو هاو فەلسەفەو هاوئایینو مەزهەبیان هەبووە. چ چەپەکانو چ ناسیۆنالیستەکان، چ هێزە ئاینیەکان. ئەو هێزانەى پەیوەندیەکى پتەوى فکرىو سیاسیشیان لەگەڵ ناوەندە سیاسیەکان هەبێ، شانازى پێوە دەکەن، نەك شەرمەزارى. لەناو هێزە ئیسلامگەراکاندا، ئیخوان موسلمین، لەهەموو رەوتە ئیسلامگەراکانى دیکە زیاترو تۆکمەتر پەیوەندى نێونەتەوەییان هەیە. گومانیشى تیا نییە کەحزبى ئیسلامى عێراقو یەکگرتووى ئیسلامى لەکوردستاندا، دوو لقى ئیخوانەکانو بەپشتیوانى ئەوانیش، ئەم دوو لایەنە هەڵدەسورێن. ئەوەى جێگەى سەرسورمانە ئەوەیە کەیەکگرتوو، ماوەیەکە خۆى لەو پەیوەندییە دەدزێتەوەو هۆى ئەمە چییە، گرنگە بزانرێ. (م. عەلى) لەوەلامى پرسیارى (دانا ئەسعەد)دا، لەسەر پەیوەندییان بەئیخوان، دیسان لەو پەیوەندییەى لەگەڵ ئیخوان هەیانە، خۆى نادا بەدەستەوەو پرسیارەکە ئاوایە:

**باس لەوە دەکرێت یەکگرتووى ئیسلامى کوردستان باڵێکى ئیخوان موسلمینە، ئێوە دەڵێن چى؟**

(م. عەلى)یش.. هەروەکو لەم وڵاتەدا هیچ زانیارییەك لەسەر ئیخوانو پەیوەندییان بەیەکگرتووەوە نەبێ، لەو پرسیارە خۆى ئاوا دەرباز دەکات:

**ئێمە لەرابردوودا ئیخوان موسلمین بووین، بەڵام ئێستا باڵێکى ئەوان نین. کاتێك باروذۆخەکەى لێهات ئیخوان موسلمین رێکخستنەکانى لەعێراقدا وەستاند، ئێمە لەناوچەى کوردستاندا بەردەوام بووین لەرێکخستنەکانى خۆمان، بەڵام نەك بەناوى ئیخوان موسلمینەوە بەڵکو هەر بەناوى دینداریيەوەو رژێمێکى سیاسیمان گرتبوە بەرکەدژ بەبریارو ئیرادەى حزبى بەعس وەستابووین**

کێ هەیە، باوەر بەم قسانە بکات؟ مەعقولە یەکگرتوو جاران سەر بەئیخوان بووبن و ئێستا دابرابن. لەسەر چیش، گوایە لەسەر ئەوەی کەئیخوان رێکخستنەکانی لەسەردەمی رژێمدا وەستاندووە.

ئەم قسانە، بەڵگەیان پێویستە، ئاسان نییە بریارێکی مێژوویی ئاوا بەبێ بەڵگە بەسەر خوێنەردا تێپەرێ، چونکە، بەڵگە زۆرن لەیەکگرتوو، بەقسەی ئیخوانیان کردووەو خۆیان ساڵی (١٩٧٢) تەجمید کردووە. یەکگرتوو خۆیشی دانی بەم راستیەدا ناوە. باشترین بەڵگەش ئەوەیە کەیەکگرتوو ساڵی (١٩٩٤) سەریان هەڵهێنایەوە. لەوەو بەر، وەکو سیاسەت نوزەشیان نەدەهات. بەڵام (م. عەلی) دەیەوێ رابردووی یەکگرتوو ئارایشت بکاتو بڵێ: لەسەر کورد، بەقسەی ئیخوانمان نەکردووە. بەڵام لەبەرئەوەی لەناو کوردستاندا، ئەمانە هیچ جموجوڵێکیان نەبووە، ئەمەش بەوە پینە دەکات کە: بەناوی دینداریيەوە رێرەوێکی سیاسیمان گرتبووە بەر کەدژ بەبریارو ئیرادەی حزبی بەعس وەستابووین.

ئەم پاساوە وەکو بڵقی سەرئاو وایە، کەبەرگەی فیتکێك ناگرێ، ئاخر کێ هەیە باوەر بەقسەی وا بکات کەیەکگرتووی ئیسلامی، لەلایەکەوە، بریاری ئیخوانیان پێ خراپ بووە بۆ راوەستانی رێکخستنەکانیان، کەچی خۆشیان رێرەوێکی دینداریيان گرتبێتە بەر. رێرەوی دینداری یانی چی؟ ئەگەر بریارە سیاسیيەکەی ئیخوانتان پێ خراپ بووە، ئەدی بۆچی لەبەرامبەردا خۆشتان کاردانەوەی سیاسیتان نەبووەو کاردانەوەی ئیمانداریتان هەڵبژاردووە. جا ئیمانداری.. کەی کاردانەوەی سیاسییە بەرامبەر بریارێکی سیاسی خراپ. قابیلە ئیخوان ئیمانداری بەهەڵگەرانەوە لەبریاری سیاسی خۆیان بزانن؟! پاشان با بزانین ئیمانداری یانی چی. ئەگەر ئیمانداری نوێژو رۆژوو رێو شوێنەکانی دیکەی ئیسلامەتییە. جا کوا لەعێراقدا هەرگیز ئیمانداری ئاوەها قەدەغە بووە. گریمان یەکگرتوو ئیمانداریيەکی سیاسیانەی لەکوردستاندا داهێناوە. کەوابێ جێی خۆیەتی بپرسین کە:

یەکگرتوو.. ئەم ئیمانداره سیاسییەی، کەوەکو کاردانەوە بەرامبەر بریاری ئیخوان هەڵبژاردووە، بەم سیاسەتە، لەرۆژگاری شومی کوردستاندا، چی کردووەو چ هەڵوێستێکی بەرامبەر کارەساتەکانی کوردستان هەبووە؟ بێگومان هیچ. کەواش بێ .. ئەوە چ ئیماندارییەکی سیاسییە کەلەبەرامبەر گەلو

نیشتماندا (٢٠) ساڵ زیاتر هەر بێدەنگی هەڵبژێردرابێ. ئیمانێکی سیاسی بۆ سیاسەتی بەرگری کردنی گەل نەبووبێ، کەواتا: هەر لەخزمەتی بریاری ئیخوانەکاندا بووە، کەئەوکاتە نەیان ویستووە دژی بەعس هیچ بکەن.

سەیرەکە لەوەدایە کە (م. عەلی) لەدرێژەی ئەو قسانەدا دەڵێ:

**بۆ نمونە ئێمە لەگەنجەکانمان حەرام کردبوو عەسکەری و مەشقی هاوینەو کۆمەکی شەرەکانی بەعس بکەن. بۆیە دەڵێین ئێمە ئیخوان موسلمین بووین بەلام ئێستا یەکگرتووین بەتەواوی مواسەفاتی کوردستانیبوونەوە**

حەرام کردنی چوونە عەسکەری.. ئەویش بۆ قادسیەی سەدام، نەك لەبەر شۆڕشی کوردستان، ئەم حەرام کردنە هیچ شانازییەکی سیاسی تیا نییە. چونکە لەگەرمەی شەری عێراق – ئێراندا، بەدەیان هەزار کەس فیرار بوون، بەبێ ئەوەی زانیبێتیان یەکگرتوو حەرامی کردووە. تەنانەت ناوی یەکگرتووشیان نەبیستبوو.

لێرەدا.. پرسیارێکی گرنگ دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە کەوا: لەشۆڕشی ئەیلولدا (١٩٦١) ئیخوانەکان هەبوون. بۆچی لەسەر ئەو تاوانانەی سوپای عێراق لەکوردستاندا ئەنجامیان دەدا، نە رابەرانی ئیخوان لەمیسرو نە ئیخوانەکانی عێراقو کوردستان، حەرامیان نەکرد شەر دژی کوردستان بکرێ. ئەمە لەکاتێکدا، مەرجەعی باڵای شیعە سەماحەتی (موحسین الحکیم) (١٩٦٣) فەتوای حەرامکردنی شەری دژی کوردستان دا. با بڵێین، لەشۆڕشی ئەیلولدا، ئیخوان بەهێز نەبوون هەتا هەڵوێستی وا بنوێنن. ئەی بۆچی لەم شۆڕشەدا (١٩٧٦) حەرامیان نەکرد خەڵك بچێتە عەسکەریو هەڵبکوتێتە سەر کوردستان. بۆ شەری کوردستان رەوا بووە؟ بۆ بەرگری خەڵکی کوردستان نارەوا بووە؟

## کوری سەدام و کوری کورد

کاتێك.. حزبێك مێژوویەکی شەرمۆكو رابردوویەکی لەرزۆکی هەبوو، ئەو حزبەو سەرکردەکانی، هەر جارێك بەشێوەیەك هەڵەکانی رابردوویان پینە دەکەنو سودیشی نییە. یەکگرتووی ئیسلامیش لەو حزبانەیە باسی هەرچییەکی لێ دەپرسی، تەنها باسی رابردووی لێ مەپرسە. چونکە رابردوویەك ئەوەندە بەیارە، بەهیچ گاجووتێك ناکێڵدرێ. (م. عەلی) بۆ ئەوەی لەم چاوپێکەوتنەدا دوا پینەی سیاسی لەو رابردووە بدات، لەدوا پەرەگرافی قسەکانیدا، ئەو قسانەی کەهەرگیز نەدەبوو بیانکا، کردونی. فەرمون بزانن یەکگرتوو بۆچی بەشداری شۆڕشی

گەلەکەمانی لەمەترسیدارترین هەلومەرجی سیاسی مان و نەمانی کوردو کوردستاندا، نەکردووە. ئەم سەرکردەیەی یەککگرتوو، بەم شێوەیە بەرگری لەو رابردووە دەکات:

**ئێمە پێش راپەرینی ١٩٩١ دینداربووین و دینداریمان دەکرد بەلام دوای راپەرین کوردایەتیشمان کرد. تاکە هۆکار بۆ ئەوەی ئێمە نەچووینە شاخ و چەکمان هەڵنەگرتووە ئەوە بووە کەئەو کەسەی شەڕی دەکرد کوری سەدام حسێن نەبووە، بەڵکو کوری فەقیرێکی هەژار بووەو بەزۆر نێردراوە بۆ شەر.**

دیسان.. دینداری و دینداری کردن. گەر بێ ئاگایەك لەمەسەلەی دینداری کورد ئەم قسانە بخوێنێتەوە، وا دەزانێ لەم کوردەواریەدا تەنها یەککگرتوو دینداریان کردووە. لەپاڵ ئەم دینداریەدا، تاکە هۆکار بۆ نەچونە ریزی شۆرشی بەرەنگاری لەکوردستاندا، لای یەککگرتوو، ئەوەیە کە (ئەو کەسانەی شەریان کردووە کوری سەدام نەبوون بەڵکو کوری فەقیرو هەژار بوون و بەزۆر نێردرا بوون بۆ شەر)..

ئای لەم وەلامە چەند سەیرو چەند هەڵگێرانەوەی راستیەکانیشە. چەندیش ئازاردانی ویژدانی هەموو تێکۆشەرو ئازادیخوازو دڵسۆزانی کوردستانە. ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی، (١٥) ساڵ خەباتی پێشمەرگایەتی، لەروانگەی یەککگرتووەوە، تەنها لەوەدا قەتیس دەکاتەوە کەمادام چەك هەلگرەکان کوری سەدام نەبوون و کوری فەقیرو هەژار بوون، ئیتر یەککگرتووش لەبەر هەستی مرۆیی و بۆ ئەوەی کوری هەژار نەکوژن، نەچونەتە دەرەوەو چەکیان بۆیە هەڵنەگرتووە.

جارێ.. ئەم بۆچونە، هەموو هێزە سیاسیەکانی کوردستان کەلەشۆرشدا بوو، دەکاتە هێزی چەکداری فەقیرو هەژار کوژ، چونکە ئەوانەی سەدام ناردونی، کوری خۆی نەبوون، ئەمە پاساوێکە دڵنیام قەواعیدی یەککگرتووش باوەری پێناکەن. چونکە یەککگرتووش دەزانن کەسوپای عێراق هەر هەژار نەبوون. بەڵکو سوپایەکی مەشق پێکراوی بەفەلسەفەی فاشیەت گۆشکراوی بەعس بوون. دەیان هەزار ئەفسەرو پلەی جیاوازیان هەبوو. دەیان هەزار فرۆکەو زرێپۆش و ئامێری جەنگیی کوشندەی دیکەیان، وەکو چەکی کیمیایی و موشەکی (زەمین بەزەمین)و تۆپی دوور هاوێژی جۆراوجۆریان هەبوو. بەهەموو ئەو چەکانەش، رۆڵەی کوردیان دەکوشت و کوردستانیان کاول دەکرد. هەتا گەیاندیانە کارەساتی هەڵەبجەو مەرگەساتی ئەنفال.

(م. عەلی) بۆ پینەکردنی هەڵەی رابردووی یەکگرتوو، کە هیچ هەڵوێستێکی کوردانەو کوردایەتیان نەبووە، هەموو ئەو راستیانە فەرامۆش دەکاو روداوەکانی کوردستان دەگوشێتە گۆشەی نەکوشتنی (کوری فەقیرو هەژار! !).

ئایدۆلۆژیەتو عەقیدە.. زۆرجار، سەرکردایەتی حزبەکان دوچاری بەستەڵەکی بیرکردنەوەی ئەوتۆ دەکەنو بەناچاری بیروبۆچونی وایان پێ دەردەبرن، کەخوێنەواری ئاساییش دەری نابڕێ. من باوەر ناکەم (م. عەلی ) نەیزانیبێ سوپای عێراق (ئەگەر هەمووشی فەقیرو هەژار بووبن! !) کەهاتونەتە سەر کوردستان، تەرو وشکیان سوتاندووەو سیاسەتی سوتماکی کوردستانیان سەپاندووە. قوربانیەکانی کوردستانیش.. زۆربەیان (فەقیرو هەژار) بوون. ئەمە جگەلەوەی، کێشەی کورد، تەنها کێشەی کوشتن نییە. بەڵکو کێشەیەکی سیاسی نەتەوەیەکی گەورەی رۆژهەڵاتی ناوەراستە، کەبزووتنەوە ئازادیخوازییەی دوو سەدەیە مێژوو کردە، کوردایەتی پێش سەدامو پێش شۆرشی نوێش هەبووە. ئیتر بۆچی یەکگرتوو، قسە لەفەقیرو هەژار دەکەن. بۆچیش باسی دینداری پێش راپەرینو دوای راپەرین دەکەن. ئەم هەموو پینەو پاساوە، هەر هەمووی بۆ ئەوەیە بڵێین: لەرابردوودا هەڵەمان نەکردووە. دەی حزبێکی سیاسی هەڵەی زەقو رەقی ئاوا دابپۆشێ، ئیتر بزانرێ باقی سیاسەتەکانی چۆن چۆنی دادەرێژێ؟!

لەکۆتاییشدا دەڵێین: زۆر گرنگە لەمەودوا، میدیای کوردی، شەفاف لەگەڵ هەموو حزبەکان قسە بکەنو کراوەش لەسەر تەواوی هەڵەکان لەگەڵ سەرکردایەتی حزبەکان بدوێین. هەتا بزانرێ سیاسەتو سەنگو بیرکردنەوەی راستەقینەی حزبەکان.. چۆن بووەو چییان کردووە. نەك یەکگرتوو.. بەقسە حەرامی کردبێ خەڵك بچێتە ریزی سوپای عێراق لەقادسیەی سەدامدا.. بەڵام بەکردەوەش.. چەندین سەرکردەو سەدان کادرو هەزاران ئەندامیان، سەربازی جەنگی قادسیە بووبن. من داوا دەکەم لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئەندامانی سەرکردایەتیو کادرو ئەندامانی یەکگرتوو بکرێو بزانرێ، بەئامار، چەندیان سەربازی قادسیەو چەندیان جەیشی شەعبیو چەندیشیان جاشو جاشی سووك بوون!

# عەلمانیەت و سەلەفیەت و..

# ئایندەی دیموکراسی (+)

**شوێن: هۆڵی ڕۆشنبیری سلێمانی**

**کۆڕساز: بەشی وشیاری مەڵبەندی سلێمانی**

**کۆڕگێڕ: مامۆستا ئەحمەد - لەتیفی شێخ عومەر**

**مێژوو: ١٩٩٤/١/١٩**

**هەڤاڵان و میوانە بەڕێزەکان!**

بەناوی هەردوو بەشی ڕاگەیاندن و ڕوناکبیری مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانیەوە بەگەرمی بەخێرهاتنی هەڤاڵی بەڕێز کاک مەلا بەختیارو ئێوەی بەڕێز دەکەین، ئومێدەخوازین سمینارەکەی بەپێزو بەکەڵك بێت. دیسانەوە بەخێرهاتننتان دەکەین.

لە کۆڕی سیاسی فکری ستراتیجی ئەمڕۆماندا، بەدیداری یەکێك لە سیاسەتمەداران و ڕوناکبیرانی ئەمڕۆمان شاد بوینەتەوە کە ئەویش هەڤاڵ "مەلا بەختیار" ئەندامی سەرکردایەتی و لێپرسراوی مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی (ی.ن.ك).

دیارە لەپێناوی درێژەپێدان بەو سەرکەوتنە سیاسیە عەسکەریەی (ی.ن.ك) بەسەر یەکێك لە بزوتنەوە ئیسلامیە ئسولیەکانی جیهاندا، بۆ یەکەم جار

---

+ لەکتێبی (دیموکراسی دوای جەنگی سارد) دا لەساڵی ١٩٩٩ دا بڵاوکراوەتەوە.

لەمێژوودا بەدی هاتووە، پێویستمان بەوە دەبێت كە ئێمە, ئێمەی حزبێكی عەلمانی هەڵمەتێكی فكری سیاسی راگەیاندن بكەین لە دژی ئسولیەت‌و سەلەفیەت كە لەم هەل‌و مەرجەدا زۆر گرنگە كە كۆڕو گفتوگۆو لێدوان بكەین دەربارەی هەردوو چەمكی عەلمانیەت‌و ئایندەی دیموكراسیەت, لە پیادەكردن‌و پەیڕەوكردنیاندا ئەركی دیموكراتخوازان‌و خەڵكی عەلمانی‌و پێشكەوتن خوازە كە بێنە مەیدان، هەربۆیە لەو پێناوەشدا بەشی هوشیاری‌و روناكبیری بە هاوكاری بەشی راگەیاندنی مەڵبەندی رێكخستنی سلێمانی ئەم كۆڕەی سازكرد بۆ هەڤاڵ (مەلا بەختیار).

ئەو بابەت‌و باسانەی ئەمرۆ لەم كۆڕەدا دەخرێنەڕوو، لە كاروانی رۆشنبیری‌و فكری‌و سیاسی كوردیدا نوی‌یەو بابەتێكی زیندوی ئەمڕۆیە, یەكێكە لە پێداویستیە كلتوریەكان، پێویستە چەندین كۆڕ، نوسین، كتێب، مونازەرەو تەوەرەی رۆژنامەیی دەربارەی سازبكرێ، تا ئەو چەمكانە روون بكرێتەوە.

ئەم دەست پێشخەریەی هەڤاڵ "مەلا بەختیار" خستنەسەر پشتی دەروازەیەكە، بەتایبەتی بۆ ئەم بارودۆخە كە سەلەفیەتی ئیسلامی لە جیهاندا لە تەشەنەدایەو، مەترسیدارە بۆ سەر دیموكراسیەت‌و مافی مرۆڤ و ئازادی، بەئازادی ئاینیشەوە؛ بەتایبەتی پەرگیری‌و دەمارگیری ئەم بزوتنەوە سەلەفیە ئیسلامیانە، كە بە هەمووزەو توانایانەوە دژایەتی عەلمانیەت دەكەن‌و حاشا لە بوونی دەكەن‌و خۆشیان بە ئەلتەرناتیڤێك دائەنێن بۆئەو جۆرە حوكم‌و دەسەڵاتە سیاسیەی كە بەحوكمی ئایینی بەرەوای خۆیانی دەزانن.

بە مەبەستی بەرەنگاربونەوەی بزوتنەوەی ئیسلامی ئسولی لە كوردستان داو بەرەودان بە پەیڕەوكردنی عەلمانیەت لە حوكم‌و دەسەڵاتی سیاسی لە كوردستاندا, پیادكردنی دیموكراسەیت‌و پاراستنی مافی مرۆڤ. یەكێتی نیشتمانی كوردستان، وەك بەرگریكەرێك لە ئیرادەو بەرژەوەندی خەڵكی كوردستان‌و، بۆ پاراستن‌و گەشەپێدانی دەسكەوتە مەزنەكانی راپەرینی گەلەكەمان، بۆ بەرەو پێش بردنی مەسەلە سیاسیە چارەنوس سازەكان، بۆ پاراستنی پەرلەمان، حكومەتی هەرێم، بەگژاچونەوەی شەپۆلی تیرۆر، برەوپێدان بە دیموكراسی‌و، دابین كردنی مافی مرۆڤ، لە سەنگەری ئەو راستیە بەلگەنەویستانەوە، بۆ بەرپەچدانەوەی رەفتاری شەڕەنگێزانەی بزوتنەوەی ئیسلامی، یەكێتی نیشتمانی كوردستان كەوتە بەردەم گەورەترین تاقیكردنەوەو بۆ لەدەست نەدانی راستگۆیی خۆی، دەبوایە سەركەوتنی بەدەست بهێنایە، ئەوەبوو

بەپـــشتگیریو هاوکـــاری جەماوەریوشـــیارو دیموکراتخـــوازو، جـــەماوەری ئـازادیخوازو عـەلمانی پێشکەوتن خـواز، تـوانی سـەرکەوتن بەدەست بهێنێت بەسەر هێزێکدا، لە دەرەوەی پەرلەمانو حکومـەتی هـەرێم کـە کۆسـپو لەمپـەر بوون لەبەردەم چەسپاندنی یاساو بە ئاشـکرا لـە بەڵگەنامـەکانی خۆیانـەوە دژی یاسا، مافی مرۆڤ، مافی چارەنوس، رزگاری، ئازادیو دیموکراسی بوون.

هەڵوێـــستی جوامێرانـــەی جـــەماوەرو یـــەکێتی نیـــشتمانی کوردســـتانو بەرهەڵستیکردن لەپێناوی ئەو دروشمو ئامانجانە، کە بزوتنەوە بێ سڵ کردنـەوە دژیان راوەستا، بێ رەچاوکردنی ئـەوەی کـە ئـەو دروشمانـە ئیرادەی گـشتی خەڵکی کوردستان بـوون، بـەری رەنجو خـەباتی پێشمەرگەو خـوێنی شـەهیدان بـوون، ج لـەم رووەوەو بـەم بۆنەیـەوە سوپاسـی جـەماوەرو پیرۆزبـایی ئـەو سەرکەوتنەیان لـێدەکەین، هیواخوازین کە بەردەوام ئاوا خاوەن هەڵوێست بـنو ئازایانـە پشتگیری لەوانـە بکـەن کـەوردو ژیرانـە، بـە هەڵوێـستێکی پێشکەوتن خوازانە، بە رێبازی راستو دروستو گونجاوی چارەنوسسازانە، دەیانەوێ چـەند هـەنگاوێ مەســـەلەی رەوای گەلەکـــەمان بـــەرەوپێش بـــەرنو بەرژەوەندییـــە ستراتیجیەکان لەبەرچاو بگرن، ئاسایشو چارەنوسی خـەڵکی کوردسـتان دابین بکەن.

ئێستاش بفەرموون ئێوەو بەرێز کاك (مەلا بەختیار) بۆ زیاتر تیشك خستنە سـەر ئـەو مەسـەلەیە کـە بریتیەیـە لـە "عەلمانیـەتو سـەلەفیەتو ئاینـدەی دیموکراسی"..

پێش هەموو شتێ، بەخێربێن, سوپاسی بێ پایانی ئەرك کێشانی هاتنتـان بـۆ ئەم کۆڕە دەکەم, هیوادارین ئێمەش بتـوانین, لـەبری ئـەو ئەرکـەی کێشاوتانە کۆڕەکـە بـەپێز کـەین، کـە بـێ گومـانم بەپرسیاری ئازادانەووشـیارانەی ئێـوە کۆڕەکە مەبەستەکانی خـۆی دەپێکـێ, پـێش هەمووشـتێك پـێم خۆشـە کۆڕەکـە بەوە دەست پێ بکەم کەسڵاو نەوازش بۆ گیانی پاکی ئـەو شـەهیدانە بنێـرم کـە خۆیان لەپێناوی نەهێشتنی رێبازی کۆنەپەرستی، چەسپاندنی یاسا، مافی مرۆڤو چارەنووسی میللەتەکەمان بەخشی، بەو خۆبەخشینە توانیمـان یـەکێك لـە هـەرە سەرکەوتنە گەورە دیموکراسی یە پیرۆزەکانی مێژووی نوێی میللەتەکامان تۆمـار بکەین.

ئـەم بابەتـەی کـە بـۆ بەشـی هوشیاریو رۆنـاکبیری مەڵبەنـدی رێکخستنی سـلێمانی هـەڵمان بـژارد, یەکێکـە لەبابەتـە هـەرە بەپێزو پـەلو پۆدارەکـان،

پەیوەندی بە کۆمەڵێ مەسەلەی چارەنوس‌و مرۆڤو کۆمەڵەوە هەیە، هەر لە ئەقڵیەوە، تا ئابووری یەکەی, ژیانە کۆمەڵایەتی یەکەی, شارستانێتی یەکەی، نەتەوەییەتیەکەی، دەوڵەتەکەی, هەتا یاسا, ماف, ئازادی, سەربەستیو هەموو پێویستییەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی. ئەم بابەتەی ئێمە پەیوەندی یەکی ڕاستەوخۆی بەهەموو ئەو بابەتەوە هەیە کە مرۆڤ لەژیانیا ڕووبەڕوی ئەبێتەوە, بۆیە ڕەنگە نەتوانین لەکۆڕێکی ئاوایا هەموو مەسەلەکان یەک بەیەک ڕوون کەینەوە, تەنها دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی سەرەتاکان، یاخود پرنسیپەکانی ئەم بابەتە کە (عەلمانیەتو سەلەفیەتو ئایندەی دیموکراسی)ە، ڕوون بکەینەوە.

خۆتان ئەزانن لە سەردەمێکدا ئەژین سەردەمی دروست بوونی دەیان پرسیاری: ئایدیۆلۆجی, فەلسەفی, تیۆری, کۆمەڵایەتی, شارستانیو ئابووری زۆر زۆر گرنگن لەژیانا, کە لەدوای جەنگی ساردەوە، ئەو پرسیارانە سەبارەت بە هەموو ئەو مەسەلانە، کە بە شێوەیکی تر لە دوای جەنگی یەکەمەوە لەناو خەڵکا چەسپیبوون, لەناو خەڵکا پەیڕەو دەکران. قەناعەتی ملیۆنەها ئینسان بوون، ئێستا لەدوای جەنگی سارد، لەدوای سەرکەوتن‌و دەرکەوتنی کۆمەڵێ چەمکی تازە, دەیان پرسیار لەمەڕ فەلسەفە, لەمەڕ ئابووری, بنچینە تیۆری یەکان, سیاسەت, لەمەڕ ململانێی سیاسەتو دیاردەکانی دنیا، دەیان پرسیار هاتونەتە ئارا کە بە داخێکی زۆرەوە ئەدەبیاتی گۆڤارو ڕۆژنامەو نوسەرو سیاسەتمەدارانی ئێمە، لە سەرەتای بیرلێکردنیان, لە سەرەتای دیراسەکردنی ئەوانەین, لەکاتێکدا میللەتانی تر دوو سەدساڵ زیاترە لە منافەسەی فەلسەفەی قوڵی هەموو پێویستی یەکانی ژیانی کۆمەڵایەتین, ئێمە تازە تازە لەخەوی سەدان ساڵی دواکەوتنی خۆمان ڕادەچەنین‌و تازە بیرلەوە دەکەینەوە مەسەلەی ئەقڵ‌و مەعریفەتو ئایدیۆلۆجیەت, مەسەلەی تیۆری دەبێ چۆن بیری لێ بکەینەوە؟ بەچ شێوەیەک کاری پێ بکەین لەکۆمەڵەکەمان؟ بۆ نمونە: (٢٠٠) ساڵ دەبێ باسی عەلمانیەت دەکرێ لە ئەدەبیاتی سیاسیو لە دامەزراندنی دەوڵەتەکانی دنیا (٢٠٠) ساڵە ئەم مەسەلەیە ڕەگی هەیە, قسەی لەسەر دەکرێ، لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێ, جۆرەها بیرو باوەڕی جیاوازی لەسەرە, من پێم‌وایە ئەگەر باش سەیری ڕۆژنامەو نوسین‌و نوسراوەکانی خۆمان بکەین، ڕەنگە چەند ساڵێك بێ تاکو تەرا باسی ئەوە کرابێ عەلمانیەت چییەو چی نییە..؟

چەند سالێك لەچاو ٢٠٠ سالْ جیاوازییەکی یەکجار گەورەیە، کەئینسان بیری لە گەشەکردن‌و سیاسەتی زانستی کردبێتەوە، لەووڵاتان چۆن‌وا گەشەکراوە، لای ئێمە چۆن نەچۆتە پێشەوە.

پێش ئەوەی بچمە ناو بابەتی باسەکەم، حەز ئەکەم خودی دوو زاراوەکە (عەلمانیەت‌و سەلەفیەت) ڕوون بکەمەوە, ئەم دوو زاراوەیە چی دەگەیەنن,لەبەر ئەوەی ئەگەر هەبێ لێرە چەمکی زانستی ئەو دوو زاراوەیەی لا ڕوون نەبێ, ڕوونی بکەینەوە, ئینجا بچینە ناو باسەکەوە..

لەلای ئێمە واباوە، کە عەلمانیەت لە عیلمەوە هاتووە, لەنوسین‌و نوسراوی ئێمە بەبڕوای من لە مێشکی ئێمەواباوە,وا چەسپیویشە کە عەلمانیەت لە عیلمەوە هاتووە, بەڵام عەلمانیەت تەنها لە عیلمەوە نەهاتووە, بەڵکو لە بنەچەوە لەعالەمەوە هاتووە, یانی زاراوەی عەلمانیەت چاوگەکەی لەعیلمەوە نەهاتووە, لەزانستەوەنەهاتووە, چاوگی لە عالەمەوە هاتووە، واتە: پیتی ـعـی بۆ بکەیتەوە, نەكـعـ نەکەی بشکێنی, یانی لە (عالم) مویەتەوە هاتووە,ووردەووردە تێکەڵاو بە عیلم بووە, ئینجا بووە بە زاراوەیەکی تایبەتی کە بەعەلمانیەتە, عالەمەویەتی چەمکەکان‌و زانستی تێکەڵاو بوون بووە بە دیاردەیەك کەلە دنیا باوی هەیە، ئێمەش بە زۆری لەناو عەرەبەوە نەقلمان کردووە, ئێستا پێی ئەڵێن عەلمانیەت. ئەم عەلمانیەتە بەزاراوەی لاتینی پێی ئەڵێن(لائیك) لائیکیش لە (لیکی) ئینگلیزەوە هاتووە(لیکیش) لەلیکۆتی لاتینی یەوە هاتووە, لیکۆتی لاتینی چاوگی ووشەکەش کەلیکۆتە, مەعناکەی هی خەڵکە, بۆ خەڵك, لەوەوە هاتووە.واتە با دوپاتی کەمەوە: عەلمانیەت لە عیلمەوە نەهاتووە, لە عالەمەوە هاتووە, لە عالمویەت, یانی بەعالم کردنی چەمکە زانستیەکان, تێکەڵاو بەعیلم‌و مەعریفەت بووە, بووە بەزاراوەیەکی بەرجەستەی هەردووووشەکە (عالەمویەت‌و عەلمانیەت) عەلمانیەتیش بەزاراوەی سیاسی لە ئەوروپا, لائیکیش لە لێکۆتی لاتینی یەوە هاتووە, یانی خەڵك ئەگەیەنێ, بۆ خەڵك؛ ئەوە کورتە لێکدانەوەی عەلمانیەتە کە بمانەوێ لەوێیەوە بێینە سەر بابەتەکان؛ سەلەفیەتیش یان(اصولیەتی) سیاسی چاوگی‌ووشەکە گەڕانەوەیە بۆ بناغەی ئیسلام, با بڵێین بۆ صدری ئیسلام, بۆ بناغەی ئیسلام, لەوەوە هاتووە, بەزاراوەی لاتینی پێی ئەوترێ (فۆندامنتالیزم) یانی مەبەستی بەرایی‌و بنەچەی عەرەب، یانی سەرەتای ئیسلام، با بڵێین کاتی خۆی ئەو زاراوەیە یانی ئەصلی ئەو زاراوەیە دەگەڕێتەوە بنەچەی ئیسلامگەری، لەوێوە

هاتووه كه دەكاتە بناغە دارشتنەوەی بنچینەكانی ئاینێك، یان بیروباوەڕێك، ئەساسی مەسەلەكە لەكوێوە هاتووە، گەڕانەوەیە بۆ ئەو ئەساسە. كوتومت دەكاتە دێرینەپەرستی.

هەردوو زاراوەكە، كەپێم خۆش بوو ئەوەی ڕوون نی یە لەلای ڕوون بێتەوە بۆی، من لە عەلمانیەتەوە بۆ مەسەلەكە دەچم شەرحی عەلمانیەتەكەتان بۆ ئەكەم، ئینجا ئەچمەوە سەر دابڕانی لەگەڵ سەلەفیەتی ئیسلامی یەتەكە.

زۆر كەس هەیە بیستویەتی یان خوێندویەتی كە عەلمانیەت ئیلحاد ئەگەیەنێ، وا بڵاو بۆتەوە، ئەو شتە ناڕاستانەی بڵاوبۆتەوە كە گوایە عەلمانیەت دژی ئاین، خواو، یەكتاپەرستی، پێغەمبەر، ئەسحابەكان، قورئان دڕاندنو سوتاندنە، كۆنەپەرستەكان ئەم پڕو پاگەندانە بۆ ئەوە بڵاودەكەنەوە هەتا خەڵك چەواشە بكەنو خەڵك لە دەوری ڕێبازە ناڕاستەكەی خۆیان كۆبكەنەوە، ئەوانەی كە پەنا دەبەنە بەر چەواشەكردنی خەڵك، لە لێكدانەوەی دیاردەیەكی سیاسی گەورە، كەهەموو عالەمی گرتۆتەوە، ئەوە بۆ خۆی بەڵگەی ئەوەیە كە لە مەنتیقی لاوازەوە مەبەستێكی مایكیافیللیانەیان هەیە، بەوەسیلەیەكی خراپ لە پێناوی غایەتێكی خراپ كاردەكەن، ئەگینا هەر ڕێبازێك لە دنیادا لە خۆی دڵنیا بێ، لە بەرنامەی دڵنیا بێ، لە پاشەڕۆژی خۆی دڵنیا بێ، هەقە ئەو ڕێبازەی دایدەڕێژێ لەسەر بنەمایەكی ڕاست دایبڕێژێ، ئەو ڕێبازەی ئەویش دژایەتی دەكاتو بەنەیاری خۆی دەزانێ، هەقەوەكو خۆی بەخەڵكی بناسێنێ، هەتا بتوانێ بڵێ لەبەینی ڕێبازەكان ئەم ڕێبازەی من ڕاست ترین ڕێبازەو لە بەرانبەر ڕێبازێكی تر وەستام، كە ڕێبازێكی ناڕاستە، ڕێبازە ناڕاستەكە ئەمەیە، كەمو كوڕ یەكانی ئەمەیە، لەبەرامبەریا ئەلتەرناتیفێك هەیە ئەوەیە، بەڵام ئەم سەلەفیانەوایان نەكردووە، هەڵساون بە خوارو خێچی، بە چەواشەیی، بە ئاڵۆزكراوی عەلمانیەتیان بردۆتە مێشكی خەڵك، هەتا هەستی ئاینی ئینسانو كۆمەڵ ببزوێننو زەمینەیەك بۆ دژایەتی بیروباوەڕی پێشكەوتنخوازی برەخسێنن، ئێمە كاتێكوا دەڵێین، ئەمە قسەی خۆمان نی یە، بەمەبەستیشوانالێین كە عەلمانیەت كفرو ئیلحاد ناگەیەنێ، ئەگەر ئێمەشوا بڵێین، كەواتە ئێمەش بەجۆرێكی تر خەڵك چەواشە ئەكەین، بەمەبەستی سیاسی، دیسان ئەمەش هەڵەیەكی ترە ئەمانەوێ هەڵەیەكی خراپتری پێ داپۆشین. هەڵەش بەهەڵە چارەسەرناكرێ. بەڵكو هەڵە بەڕاستیو ڕاستگۆیەتی

چارەسـەردەکرێ. لـە ئەسـڵا مەسـەلەکە ئاوایـە, کـە عەلمانیـەت کفـرو ئیلحـاد
اگەیەنێ، بـوونی خـوا ڕەت ناکاتـەوە. بـەڵێ لـەبیرو بـاوەڕی کۆمۆنیزمـدا ئـەوە
ەیـە, کۆمۆنیـستەکان ماتریالیـستین, بەڕاشـکاویش ئـەڵێن ئێمـە باوەڕمـان
ایدیالیستی ئـایینی نییـە, دنیـا بـە مـەتریالیزم ئـەبینن‌و بەتـەواوەتی ڕوونیـشی
ەکەنەوە ماتریالیزم چۆنەو چۆن نیە, قـسەی هاکـەزایی ناکـەن, قـسەی عـیلمو
ەعریفەت‌و فەلسەفەو بەسەلماندنی مێـژوویی‌و ئـابووری دەدوێـن. بـە ڕاشـکاوی
ەڵێن ئێمە بڕوامان بە مەتریالیزم هەیە, باوەڕمـان بـە میثالیـەت‌و باوەڕمـان بـە
وونی خواو ئەو شتانە نیـە.. ئەمـە کۆمۆنیستەکان‌وا دەڵـێن. بـەڵام عەلمانیـەت
زەو مەلزومی کۆمۆنیست نیـە, دەبـێ ئـەو ڕاستیانە وەکـو خـۆی تـێ بگـەین.
ڕاستە کۆمۆنیزم زۆر باوەڕی بە عەلمانیەتە,و پـەیڕەویش لەعەلمانیـەتیش ئـەکا،
ەڵام عەلمانیەت‌و کۆمـۆنیزم تەواوکـەری یـەکتر نـین, باشـترین بەڵگـەش لەسـەر
ەوە سـەرمایەدارە هـەرە گـەورەکانی دنیـاو هـەموو دەوڵـەتانی ئیمپریـالیزم لـە
ەموو دنیا عـەلمانین. زۆریـش دژی کۆمـۆنیزمن. عەلمانیـەتیش لەسـەر دەسـتی
ەلسەفەی بۆرژوازی خولْقاوە. کۆمۆنیستەکان‌وەریان گرتووە.

زۆربەی هەرە زۆری حیزبە گەورەکانی دنیا عەلمانین, حیزبی لیبرالی مەسیحی
ە عالەما، حیزبی سۆسیال مەسیحی لەعالەما عەلمانین, ئەمە دان پیانانیکی زۆر
ەورەیە, کەواتە مەسەلەکە ئەوەنی‌یە کفرو ئیلحاد بێ,کەوەکو کە سـەلەفیەکان
ڕوپاگەنـدەی بـۆ ئەکـەن, ئـەم عەلمانیەتـە لـە قۆنـاغێکی سیاسـی کۆمەڵایـەتی
ابووری نوێوە کە عـیلمو مەعریفـەت تیـا سـەریهەڵداوە، عەلمانیـەت بـەرە بـەرە
ەگەڵ گۆڕانکاریەکانـدا، بـڵاو بۆتـەوە,وردەوردە کەوتۆتـە نـاو ململانـێ لـەناو
یروباوەڕی کۆنەپەرستیاو لەبەرامبەر بیروباوەڕی کاسۆلیکا، ئەوکاتە سـەردەمی
ەسـەڵاتی مەسـیحی یـەت بـووە, سـەرەتای کۆتـایی حـوکمی دەرەبـەگی
ۆنەپەرسـتانە, عەلمانیـەت بـووە بەچوارچـێوەی حـوکمی ئینسان بـە عـەقلی
ینسان, یەعنی عەلمانیەت لەوێوە هاتووە کـەناکرێ ئاینـەکان لەعالـەما لـەدوای
ۆڕانکاریەکانی ژیان، گۆڕانکاری ئابووری،کۆمەڵایـەتی، سیاسـی، ئایـدیۆلۆجی،
یشەسازی‌و گۆڕانکاری قۆناغەکان، نـاکرێ, لـەدوای گۆڕانکـاری یـەکان لـەدوای
ـەرهەڵدانی دیـاردەی تـازە، ژیـان‌وردەوردە بـەرەو دنیـای سـەرمایەداری
ێگیردەبوو، کەلەشارستانیەتی سەرمایەداری‌و عەلمانیەت خولْقا،نەدەکرا دنیای
ەرمایەداری بگێڕیتەوە بۆ حوکمی دینی، کە (٢٠٠٠) ساڵ پێشتر سەریهەڵدابوو.

لەژێر فشاری گۆڕانکاری یەکان، لەژێر فشاری زانستو مەعریفەت، پێویستی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی، نەدەکرا لەقاڵبی کۆنەپەرستی دابمێنێتەوە. لە ژێر کاریگەری بیروباوەڕی عەلمانیەت ئەکرا زانستو مەعریفەت، دەوڵەت، ئابوری، ئینسان، ڕەوشتی مرۆڤ، پیشەسازی، ئەدەبو شارستانیەت هەمووی بەجۆرێك بەرێ بچێ یەکالا بکرێن لەدەسەلاتی ئایینی. ببەسترێتەوە بەداوەریەکانی ئەقڵو ئەقلانیەت. ئیتر دیانەت، خواپەرستی، نوێژ، زکر، تەهلیلە، مزگەوت، تەکیە، خانەقاو ئەو شتانە پتر بخرێنە قاڵبێکەوە کەڕێگە لە گەشە کردنی کۆمەڵایەتی نەگرن. واتا: گرنگی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی، گرنگی چەسپاندنی زانستو مەعریفەت، گرنگی بەرەوپێشەوە بردنی ئازادیو دیموکراسی، گرنگی بایەخدان بە ئەقڵی ئینسان کە بتوانێ زانستیانە تحکوم لەپێویستییە زانستیەکانی کۆمەڵ بکا، کاریکاتە سەر کۆمەڵو شارستانیەتی نوێ؛ دەبوو عەلمانیەتوەکو ڕێبازێك بچەسپێ، عەلمانیەتو مەسەلە ئایینییە ئاسمانیەکان (جولەکە، مەسیحیەت، ئیسلام) لێك یەکالابکرێنەوە. هەریەك حەقی خۆی لەژیانا بدرێتیو پێویستیەکانی لەژیان بخرێنە قاڵبی پێویستی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی، واتا: لێرە قسەمان لەوەیە عەلمانیەت بۆ خۆی لەبنەچەدا نەك دژی خوا نیە، بگرە عەلمانیەت دژی ئیسلامیش سەریهەڵنەداوە؛ بگرە بە پێچەوانەی ڕێبازی ئیسلامیش سەریهەڵنەداوە؛ عەلمانیەت لەبنەچەدا لەبەرامبەر دەسەلاتی ئاینی مەسیحی سەریهەڵداوە، ئەوکاتە مەسیحییەت خۆتان ئەزانن حوکمی هەموو عالەمی ڕۆژئاوای دەکرد. حوکمی ڕۆژئاواش بەبیروباوەڕێکی کۆنەپەرستانەی مەسیحی پاپاوی ئەوتۆ بەڕێوەئەچوو، کە هەموو جۆرە حوکمێکیان، هەموو جۆرە عەقلیەتی سەدەکانی ناوەڕاستیان، کۆسپ بوون لەبەردەم گەشەکردنی کۆمەڵایەتی دا، ئەوکاتە عەلمانیەت لە بەرامبەر مەسیحیەتدا سەریهەڵداوە، یانی مەسیحیەت لە ئیتالیاوە حوکمی ئەکرد، تا جەنگی خاچ پەرستانیش لەسەر ئەوە پەیدا بوو کەتەواوی عالەم بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە؛ کە سەریشی هەڵدا، بەهیچ شێوەیەك هیچ فەیلەسوفێك هیچ عەلمانیەك ڕاستەوخۆ بۆ دژایەتی خوا، قسەی لەعەلمانیەت نەکردووە. یان بۆ ئەوە کە ئیلحاد لەدنیا بلاو بکاتەوە، بەتایبەتی نەهاتە ئارا. ڕەنگە توندڕەوی هەبووبێ لەم کارەیا لەلایەن ئەم نوسەر یا ئەو سیاسیەوە، بەلام سەرچاوەی بیرو باوەڕەکە بەهیچ شێوەیەك لەوەوە نەهاتووە ئیلحادو کوفر بلاو بکرێتەوە.

ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە کە پێویستە سەرنجی بۆ ڕابکێشین، پێویستە بیشی زانین، ئەوە هەزاران دیراساتی لەسەرە، ئەمە قسەیەك نی یە خۆم دام هێنابیۆ بۆ ئەوە بمەوێ مەبەستێکی سیاسی لە کۆڕێکی ئاوادا پێ بپێکم، لەسەر تەلەفزیۆن خەڵك بەجۆرێك چەواشە بکەم، ئەوە سەدان دیراسە هەیە کێ ئەیەوێ ئەو دیراسانە بخوێنێ لامان هەیە. کۆمەڵێ لە دیراسەکان هەیە، ئەگەر ئیسلامیەکیش ئەیەوێ ئەو حەقیقەتە بزانێ ئەتوانین لە باتی دیراسەیەك دەیان دیراسەی زۆر وردو درێژ نەك هەر هی مەسیحی یەکان، نەك هەر هی ئەورووپی یەکان، بگرە هی خودی ئیسلامیەکانیش، کە نوسەری زۆر گەورە گەورەن، توێژەری کۆمەلایەتی زۆر گەورە گەورەن، دەیان کتێبو لێکۆڵینەوەیان هەیە لەسەر ئەو مەسەلەیە، لێکی ئەدەنەوە کە بەهیچ شێوەیەك عەلمانیەت کفرو ئیلحاد ناگەیەنێ، بگرە ئەگەر بێتو ئێمە عەلمانی نەبین کە ئەو توێژەرەوانە هانمان ئەدەن، بەهیچ شێوەیەك ناتوانین گۆڕانکاری قوڵ لەدنیا بهێنینە دی، بتوانین ئێمەش شارستانیەتی گەورە بێنینە دی، ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە کە حەقە بیزانین.

وەرچەرخانی گەورەی عەلمانیەت ئەوکاتە دەست پێ دەکات کە ئیتر بازرگانی لەجیهاندا پەرەیسەند، دەریای سپی ناوەڕاستو ئۆقیانووسی ئەتڵەسی کە پێکەوە بەسترا، ئەمەریکا دۆزرایەوە، ئیتر شارستانیەتی زاڵی بازرگانی بەتەنها لەدەریای سپی ناوەڕاست لە نێوان یۆنانو ڕۆما نەما، بابڵێین تاپۆ کردنی بازرگانیو شارستانیەت لەبەینی یۆنانو ڕۆما دوای ئەوەی کە دەریای سپی ناوەڕاستو ئۆقیانوسی ئەتڵەسی پێکەوەبەسترا، ئەو پاوانکردنەی بازرگانیو زانستو مەعریفەتە لە بەینی ئەو دووولاتە نەما، ئینگلتەرا، هۆڵەندەو ئیسپانیاو فەرەنساش لە ڕۆخی ئۆقیانوسی دەریا تێکەلاوی بازرگانی گەورە بوون، ئەم تێکەلاو بوونی فەرەنساو بەریتانیاو هۆڵەندا لەدوای ئەوەی کە ئۆقیانووسی ئەتلەسیو دەریای سپی ناوەڕاست پێکەوە بەستراو بازرگانی لەبەینی ئەوولاتانە خولاو هەموو کەمالیەتەکان، پێویستی یەکان لە ڕۆژهەلاتو ئاسیاوە ئەهات بۆ ڕۆژئاواو ئەمەریکاو ئەورووپا، ئیتر وردەوردە زانست، مەعریفەت، شارستانیەت، ئەدەبی سیاسی، زانستی ئابوری، هەموو ئەو دەسکەوتانەووردەووردە بلاوئەبوونەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو بازرگانیو پێکەوە بەستنەی دەریای سپی ناوەڕاستو ئۆقیانوسی ئەتلەسیوای لێ هات، کە شارستانیەت لەوولاتانەووردەووردە هاوشانی ڕۆمانو هاوشانی یۆنان گەشەبکاتو تێکەلاویەکی زۆر گەورە بێتە دی.

ئینگلتەرە، ئەگەر سەیری مێژوو بکەین رۆڵی ئێجگار گەورەی هەیە. راستە شۆرشی گەورەی فەرەنسا لەرووی سیاسیەوە کاریگەریەکی زۆر گەورە؛ لەجیهانا هەبووە بیروباوەڕی عەدالەتو یەکسانیو دیموکراسی لە عالەم بڵاوکردەوە, بەڵام ئینگلتەرە بەهۆی سەرکەوتنێکی زۆر گەورەی لە بوار عەسکەریدا لە ساڵی (١٥٨٨) بەسەر ئیستوڵی ئیسپانیا، ئەو سەرکەوتنەوای لێ کرد ئینگلتەرە ببێ بە پێشەنگی چەسپاندنی ڕێبازو دەوڵەتی عەلمانی لەجیهاندا؛ یانی یەك سەرکەتنی عەسکەری لە جیهاندا کە ئیستولی بەریتانی لەساڵی (١٥٨٨) توانی ئیستولی اسپانی تێك بشکێنێ، زاڵ ببێ بەسەر بازرگانی دەریا لەجیهاندا، بەم سەرکەوتنە توانی ئەمەریکاو هەموو ئەورووپای رۆژئاوا هیندستانو هەندێووڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراستیش بەیەکەوە ببەستێ ئینگلتەرە کە لەو جەنگە سەرکەوت توانی ببێ بە پێشەنگی چەسپاندنی زانست مەعریفەتو عەلمانیەت لەجیهاندا، هەموو ئەو بازارانە بە شارستانیەتەکەیانەوە بە ئەدەبیانەوە، بە زانستو ئابوریو بەهەموو ئەو زانستەی تیا سەری هەڵدابوو لە دیدی ئەم سەرکەوتنە عەسکەری یەوە بەشێوەیەك بەیەکەوە بەسترا کە ئێتروەکوووتم, بەتاپۆ زانینی شارستانیەت لە بەینی رۆماو یۆنان نەما شارستانیەت ووردەووردە لەبەینی ئەووڵاتانە بڵاوبۆوە.

گەورەترین دوو دەسکەوتی ئەو سەرکەوتنە عەسکەرییە، دوو راستییە لەبەریتانیا: یەکێکی ئەوەیە توانیان هەژمونی رۆشنگەری، هەژمونی مەسیحیەت لەجیهانگیری پاپایەتی کەم بکەنەوە، کەنیسەی نیشتمانیو ناوچەیی درووست بکەن, ئەم کەنیسەی نیشتمانیو ناوچەییە, بوو بەهۆی ئەوە کە لێکدانەوەی نیشتمانیو لێکدانەوەی نەتەوەییو لێکدانەوەی زانستی لەلایەن کەنیسە ناوچەیەکانەوە، لەلایەن کەنیسە نەتەوایەتی یەکانەوە تۆزێ باشتر, کاریگەرتر با بڵێین کارلێك کراوتر لە گەڵ گۆرانکاری یەکان, کەنیسە ناوچەیەکان توانی یان, موخاتەبەی بەرەو پێشەوە بردنی کۆمەڵ بکەن، خۆیان لەژێر کاریگەری هەژمونی ئەزمونی پاپاویەتو زاڵ بوونی مەسیحی یەتو دەسەلاتی قەیسەرو ئیمپراتۆریەتەکان رزگار بکەن، خۆیانوەکو توێژەرەوەی نوێی ئاینی, کەزۆر ناکۆك نەبێ لەگەڵ عیلمو عەلمانیەتا، بۆووڵاتی خۆیانو ئەووڵاتانەی کە توانیان کەنیسەی ناوچەییو پرۆتستانی دروست بکەن؛ لەلایەکەوە ئاینی گەورەی مەسیحی، لە ژێر کاریگەری پاپاو تشریعی پاپاو بڕیارەکانی پاپا سەرفرازبکەن

کـە ئـەقڵی کۆنەپـەرسـتی سـەدەکانی ناوەڕاسـت زۆرکـاری لـە شارسـتانیەت و پێشکەوتنی کۆمەڵ و لە عیلم و لەعالەمویەت مەفاهیمەکان کردبوو، کە ئەوەی لـێ سەندرایەوە،واتا: کە ئەو تەوقـە شـکێندرا، کـە ئـەو ڕچـەیە شـکێنرا، ئیدی ئـەو هەژمونەی پاپاویەت و مەسیحی یەت لەسەر ئاستی ئەروپا و ئەمەریکا نەما، توانرا کەنیسە نیشتمانی و کەنیسە نەتەوەیی و کەنیسەی ناوچەییەکان دروسـت بکـرێن، ئەو کەنیسانە توانیان پاساو بۆ چەمکی تازەی عـیلم و مەعریفـەت و حکومـەتێکی تـازە بدۆزنـەوە, کاردانـەوەی دینـی و نـاکۆکی دینـی و شـەڕی ئـەهلی لەبـەینی مەسیحییەت، ناسیۆنالیزم، نیشتمان، زانـست و مەعریفـەت تاڕادەیـەکی زۆر خـاو بووەوە, دەوڵەتی عەلمانی ئیتر وردە وردە بناغەکەی دارێژرا, ئەمـە یـەکێك بـوو لـە کـارە گرنگـەکان؛ کـاری دووەمیـان: کـەزۆر گرنگـە دامەزرانـدنی دەوڵـەتی نەتەوەیی، بەوەش  کە ئەو کاریگەرییە نەماو ئەو بازرگانی و ئـەو پەیوەنـدی یـە بازرگـانی و شارسـتانیە بـەهۆی جـەنگو ئەوانـە دروسـت بـوو، ئـیتر قـەوارەی نەتـەوەیی لەقـەوارەی دەرەبـەگ و ئەوانـەوە پاشەکـشێی ئـەکرد، قـەوارەی نەتەوەیی گەورە دروست ئەکرا، دەستوری نەتەوەیی دروست ئەکرا، ئیتر ئابوری نەتەوایەتی، بەرهەمی گشتی،  دوزینەوەی بـازاڕو سـاغ کردنـەوەی کـاڵای تێکـڕا هاتنـە پێشەوە، لـە سـەرەنجامی ئـەوەووردەووردە بناغەیـەك دارێـژرا ئـیتر لـە کـشتوکاڵی بـەهێزەوە بـۆ ئابوریـەکی بـەهێز، هـەروا، سـەرکەوتنی شۆڕشـی بۆرجوازی، ئینجا بۆ سـەرهەڵدانی ڕێنیـسانس (عـصر النهظـە) لـەجیهانا، ئەمانـە کەوتنە ناکۆکی لەگـەڵ ئـەفکاری کۆنەپـەرستێتی هەنـدێ چـەمکەکانی دینـی لـە دنیا،  ئیتر لـەوە بـەدواوە لـە ئـەورووپا, سـەرکەوتنی یـەکجار گـەورە لـە ڕێبـازی عەلمانیەت هاتەدی،و پێشم وایە ئەگەر سـەیری مێـژوو کـەن، ئـەو سـەرکەوتنەی لەسەر ڕێبازی عیلم و مەعریفەت هاتۆتـەدی لـە عالـەما، بۆتـە مایـەی ئـەوەی کـە شارستانیەتی ئەوروپی ئێستا بەو چەشنە بچەسپێ و بەوجۆرە زاڵ بێ کـە ئێـستا هەیە.

لامان سەیر نەبێ لەجەنگی خاچ پەرستەکانەوە، کەیەکەمین جەنگی جیهانی ئەورووپایـە, شارسـتانیەتی ئیـسلامی لـە ڕۆژهـەڵاتا بـاڵا دەسـت بـووە بەسـەر شارستانیەتی ئەورووپا و ڕۆژئاوا, یانی سەیری دنیـا کـەن چـۆن  بـەهۆی بنـچینەو چەمکی تازەوە، کاتێك کە ئەوروپا جەنگی خاچپەرستانی بەناوی ڕزگـار کردنـی ئارامگای پیرۆزی مەسیحەوە کرد، بۆ ئەوەی هەیبەتی پاپاویەت لە عالەما بهێڵن,

ترسی ئەوە نەمێنێت کە ڕێبازی تر بۆڕیان بدا، یاخود ئەلتەرناتیڤێکی تر بەدی بێ‌و بچێتە پێشەوە, ئەو جەنگە خاچ پەرستیە کە دەستی پێ کردووە، شارستانیەتی ئیسلامی ئەوکاتە، لەو زەمان‌وزەمینەیەدا، لەشارستانیەتی ڕۆژئاوا بەهێزتربووە، لەبەرئەوەی لەووڵاتی ئێمەدا ئەو گۆڕانکاریە بازرگانی‌و ئابوریانە، ئەو گۆڕانکاریە شارستانیەیە کە لە ئەوروپا ڕوویداوە، ئەو شارستانیەت‌و مەعریفەتەی لە ئەوروپا هاتە پێشەوە، ئەو زانست‌و عەلمانیەتە لە ئەوروپا چەسپی، بوو بەدەوڵەت، بوو بە یاسا، تێکەڵاو بە زانست بوو، تێکەڵاو بە زانیاری بوو، سەرەڕای تیرۆری ئوروستوکراتە مەسیحیەکان، سەرەڕای هەموو ئەو کوشتنەی کە با بڵێین کە دادگا کانی پشکنین لە ئەوروپا لەسەردەمی ڕێنیسانسا کردیان، چەندین زاناو دانایان کوشت، چەندین زانایان زیندانی کرد,چەندین هەوڵی کۆنە پەرستانەیان دا, سەرەڕای هەموو ئەوانە، لەبەر ئەوەی ڕێبازەکە سەر کەوت، چونکە لەسەر بنەمایەکی زانستی‌و هاوئاهەنگ لەگەڵ گۆڕانکاری‌و پێویستی یەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی سەرکەوت، لە ئەوروپایەك کە پاشکەوتو تر بووە لە شارستانیەتی ئیسلامی، سەرەڕاش ڕێبازی ڕاستی چارەنوس سازی زانست‌و عەلمانیەت توانی شارستانیەتی دواکەوتو زاڵ بکا بەسەر شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتدا, ئێستا بەداخێکی زۆرەوە, پاشکۆی ئەوانین‌و لەپشتی ئەوانەوە تەپەمان دێ! ئێستا لە دەرزی یەکەوە پێویستمان بەوان هەیە کە بۆمان کون کەن، تا ئەگاتە مانگی دەستکرد پێویستمان هەیە ئەوان هەڵی فرێنن بەئاسمانی ئێمەدا، ئەگینا ئاگامان لە تازەترین خەبەری دنیاش نامێنێ، ئەگەر ئێستا مانگەکانی دەستکردی ئەوان‌و (T.V) ی ئەوان‌و زانست‌و مەعریفەتی ئەوان نەبێ، مەگەر دوای ساڵێك ئاگامان لەدیاردەو دەرکەوتە نوێکان هەبێ.

سەیری دنیا، ئەم هەموو گۆڕانکارییە، ئەم هەموو زانست، زانیاری‌و شۆڕشی ڕاگەیاندنە، ئەم هەموو پێشکەوتنە سەرەنجامی چین؟ ئەمانە سەرەنجامی داهێنانی زانستین‌و سەرەنجامی ئازادی‌و عەلمانیەت‌و ئەم هەموو فەلسەفەیەن, مەسەلەی دۆزینەوەی ئەو ڕێبازە ڕاست‌و بناغە زانستیە لەژیانی میللەتان، ئەو ڕێبازە زانستییە بەجۆرێك سەرخرا، میللەتێك، دەسەڵاتێك‌و دەوڵەتێك، بگرە شارستانیەتێکی گەورە، لەقۆناغی دوورودرێژدا بەشێوەیەك ئەگۆڕێ کە دنیا ئەکا بە موڵکی ئەو شارستانیەتە!

بەش بە حالّی رۆژهەلاّت، بەداخێکی زۆرەوە, لەو شارستانیەتە پێشکەوتووترو بالاّدەست تری لەشارستانیەتی ئەوروپا هەبوو، کەچی بەهۆی سوربوون لەسەر چەمکە کۆنەپەرستەکان،کە نەئەگونجان لەگەلّ گۆڕانکاریەکان، بەهۆی سەپاندنی دەسەلاّتی فۆندەمەنتالیزم, (دەسەلاّتی سەلەفیەت) لە دوای (١٤٠٠) سالّ لە بەڕێوە بردنی شارستانیەتو دەسەلاّتی گەورە، ئێستا بەهۆی بیری کۆنەپەرستیەوە کراوینەتە پاشکۆ. لەئەوروپاش, یەك دەولّەت نی یە کە دەولّەتی عەلمانی نەبێ, لە ئەورووپاو ئەمریکا (ئەشتوانم بلّێمووڵاتانی ئێمەش سەرەتای بناغە دارشتنی دەولّەتی عەلمانیە), بۆیە لەهەموو روویەکەوە بالاّدەستن.

سیستەمی عەلمانی یا عالەمویەت، دەستەبەری بەدی هێنانی ئازادیو ئەرکەکانی دیموکراسی یە, ئەگەر ئەو سیستەمە, عەلمانیە لەووڵاتێکدا نەچەسپێ هەرگیزاو هەرگیز لە هیچووڵاتێکدا توانای بەدی هێنانی ئەرکەکانی دیموکراسی نیە، بەمافە نەتەوایەتی یەکانیشەوە, ولاّتێك لە دنیا ئەگەر سیستەمەکەی عەلمانی نەبێ ئیمکاتی بەدی هێنانی ئەرکەکانی دیموکراسی لەو ولاّتانەدا نییە، هەر ناوێکی لێبنرێ، هەر تێزێکی بۆ دابڕێژرێ، هەر لێکدانەوەیەکی بۆ بکرێ، هەرچی چەمك هەیە لە دنیا بۆی دارێژرێ، سیستەم کە سیستەمێکی عەلمانی نەبێ، مەحالّە ئەرکەکانی دیموکراسی تیا بێتە دی، مەحالّە ئازادی یەکانی ئینسان بەدی بێت, مەحالّە مافە نەتەوایەتیەکان، مافە کەمایەتیەکان، مافە پیشەییەکان، مافە دیموکراسیەکان، هەمووی بێنە دی؛ هەروڵاتێك عەلمانی نەبێ، هەر بەووڵاتێکی پاشکەوتوو ئەمێنێتەوە، ولاّتێك ئەبێ بەجۆرەها یاسای مەزهەبیو میتافیزیکی و ئایدیالیستی، بابلّێین جۆرەها عەقیدەو تەریقەتو تەریقەتەکانی تر بەهۆی تێکەلاّوکردنیان بەدەسەلاّتو یاساو بەرژەوەندیەکانەوە، ئەبن بە کۆسپ لەبەردەم گەشەکردنی کۆمەلاّیەتی، گەشە کردنی دەولّەت، گەشەکردنی ئابووری، گەشە کردنی شارستانی، ئەووڵاتانەو (دیموکراسی — عەلمانی) نین، هەر لە تاریکستان ئەژین، ئازادییە راستەقینەکانی تیا نایەنەدی، تایبەت ئازادی ئەقلّو بەئەقلاّنیەت کارکردن کەزۆر گرنگن بۆ پێشکەوتن. کورتیەکەی ولاّتێك عەلمانی نەبێ، دیموکراسیش نابێ، هەر ناوێکی لێ بنێی سەرەنجام ئەووڵاتە بمانەوێو نەمانەوێ ئەبێتەووڵاتێکی دواکەوتوی دیکتاتۆری.

ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە عەلمانیەتو دیموکراسی‌وەکو ڕێباز،وە
سیستەم، دوو پرنسیپی پێکەوە بەستراوی لە یەك جیا نەکراون، بەهی
شێوەیەك ناتوانرێ لەیەك جیا بکرێنەوە, بەهیچ شێوەیەك کەس نیە بتوا
پاساوێك بهێنێتەوە بڵێ ئەو دوو ڕێبازە بەشێوەیەك جیائەکەینەوە ک
دیموکراسی بەدی بهێنێو عەلمانی نەبێ, عەلمانی بین‌و دیموکراسی بەد
نەهێنین، ئەم دوو پرنسیپە بەیەکەوە نەبەسترێن، پەیوەندیان پێکەوە نەبێ
بەهیچ شێوەیەك بەجیا سەرناخرێت. لەم عەلمانیەتەوە کە گرنگە بۆ ئینسان، ب
کۆمەڵ بۆ شارستانیەت، بۆ دەوڵەت، بۆ دەوڵەتی یاسا، بۆ مافی مرۆڤ" ب
دادپەروەری کۆمەڵایەتی، بۆ سەربەستی ژن‌و بۆ ئازادی‌و بۆ یەکسانی ژن‌و پیا
دەتوانین بگەینە کاروانی پێشکەوتنی ژیان.

دێینە سەر مەسەلەی سەلەفیەت کە ڕێبازی ئسولی‌و ئیسلامگەری
چەسپاندن‌و گێڕانەوەمانە بۆ سەردەمی ئەسحابەکان، سەردەمی پێغەمبە
سەرەتای قەڵەمڕەوی ئیسلام‌و گوایە بەوپێیە حوکممان بکەن؛ من پێم خۆش
ئەم بەشە زۆر بەووردی گوێ بگیرێو قسەکانم وەکو خۆی بگێڕینەوە، وەك
خۆشی لەسەریشی بنوسرێ؛ ئەگەر باشی تێنەگەیشتبێ دوایی پرسیار بکا ڕوون
کەینەوە بۆ ئەوەی تەفسیری قسەکانمان بەشێوەیەك نەکەوێتەوە هەرکەسێك
هەر لایەك بەئارەزوو لێکبداتەوە.

بێگومان لێرە خەڵك هەیە ڕەنگە مەسیحی بێت، خەڵك هەیە زۆر خواپەرست
خەڵك هەیە ئیسلامی، خەڵك هەیە ئەوپەڕی ڕێز بۆ عەقیدەی ئینسان‌و ب
باوەڕەکانی ئینسان‌و بۆ مەزهەبی ئینسان دائەنێین, بەڵام باوەڕی خۆشما
حەقی‌وایە ئازادانە باسی بکەین و قسەشی لەسەر بکەین،وەکو خۆیش
تەفسیری بکەین، گوێشی لێ بگیرێ.

وەکو وتمان سەلەفیەت یانی ئیسلامی ئسولی، بەزاراوەی سیاس
فۆندەمەتیالیزم‌واتە: گەڕانەوە بۆ بناغە، لە بناغەوە داڕشتنەوەی چەمکەکا
دێرینەخوازی، یانی ئەم سەلەفیانە، ئەم ئسولی پەیڕەو کەرانە لە دنیایادا ئیس
پێ یان‌وایە هەموو ئەحکامەکانی سەردەمی سەرەتای ئیسلام،و هەموو ئایەت
قورئانی یەکانی ئەو کاتە، کە بۆ زەمان‌و زەمینی خۆی شۆڕشێکی گەورە بوو
گۆڕان‌و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بووە بۆ ئەو کاتە، دینە ئاسمانیەکانی تریش
هەروا شۆڕشی گەورە بوون، لە چاو کۆیلەیەتی‌و کوێرەوەری، ئەو سەردەمە

پێیبیان‌وایە لەوساوە ئیسلام هاتۆتە پێشەوەو ئینسان خراوەتـە ژێـر رکێفیـەوە، گۆڕانکاری لەبنچینەکانیان نابێ بکرێو ئەکرێ لەسـەردەمی مـانگی دەسـتکردو سەتەلایتدا، بە عەقلیەتی دێرینەخوازانە کۆمەڵ بەڕێوەبەرین. هەزارو چـوار سـەد سـاڵ گەڕانـەوەمان بـۆ ئـەحکامی ئـەو کاتـە، بـۆ ئـەو زەمانـە، بـۆ سـەردەمێك کەقەڵەمو کاغەز نەبووە، بۆ سەردەمێك کە تەتەر لەبری فاکس هەبووە!

لـەڕووی رۆحیـەوە، لـەڕووی هەنـدێ بنـچینەو رێبـازەوە، لەسـەر مەسـەلەی مەزهەبی، قسە ناکەین، ناڵێین مەسەلەی مەزهەبیو مەسەلەی خواو خواپەرستی لێـك بدەینـەوە، ئەوانـە بابـەتی باسـەکەمان نـین. هـەموو کەسێك‌وەکو خـۆی، حەق‌وایە لەگەڵ ڕۆحی خۆی، لەگـەڵ خـوای خـۆی، قـسە بکـا، نوێـژ بکـا، بـەڵام ئەحکامی بەڕێوە بردنی دەوڵەت، کۆمـەڵ، ئـابوری، مەعریفـە، بازرگـانی، عـیلمو پیشەسازی، کاتی خۆی، بەپێی زەمانو زەمینەی خـۆی، بـەپێی هـەلو مـەرجی ئەوکاتــە، ئــەحکامی قورئــانو ئــەحکامی جولەکــەو ئــەحکامی مەسـیحی بـۆ بەڕێوەبردنی حوکم شتێکی زۆر سروشتی بووە" ڕاسـت بـووە، چـونکە بەبـەراورد لەگەڵ پێـشینەی خـۆی، ئـەم پێشکەوتو تـرو گۆڕانکـاری هەمەلایەنـەو باشـتری هێناوەتە دی، لەبەر ئەوە خەڵك زۆر تر بەپیری یەوە چووە، حوکمەکەشی قبـوڵ کردووە، ملکەچیشی بوون، دەزگاکانیشی دامەزراندووە، خۆتان دەزانـن سـەدان ساڵە ئەو حوکمانە پـەیڕەو کـراوەو بـەڕێوە چـووە, بـەڵام ئێـستا ژیـان چـووەتە پێشەوە، دنیا هەموو گۆڕاوە، بەهیچ شێوەیەك دنیا ئەگەر ئینسان سەیری خـۆی بکا لەچاو منداڵەکەیا، جیـاوازی عـەقڵی خـۆیو مناڵەکـەی هەیـە, ئەگـەر ئێـستە ژنێك لێرە دانیشتبێ(٧٠)ساڵی تەمـەن بـێ(٥٠)ساڵی تەمـەنبێ(٦٠)سـاڵی تەمـەن بێ, یاپیاوێك کەلەگەڵ منداڵێکیا کە(١٠) ساڵ یا(١٥)یا(٢٠)ساڵی تەمەنـە، ڕەنگـە لـە٧٠٪ ی بڕواکانیـان جیاوازیـان هـەبێ، ئەمـە بـەجۆرێکی تـر بـیر لـە پـانتۆڵو سینەماو ڤیدیۆ ئەکاتـەوە, داكو داپیرەش بـەجۆرێکی‌تر بـیر لەکـەواو فەقیانـەو سوخمە دەکەنەوە. دوو شتی زۆر جیاوازن بیرکردنەوەو کەسایەتیان, جا ئینسان دەبێ ئێستا لەگەڵ خـۆیو مناڵیـاوابێ، خـۆیو منـاڵی جیاوازییـان هـەبێ، ئـاخۆ لەگەڵ (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر جیاوازیەکان ئەبێ چەند بێ؟ ئەوکاتە پێڵاو نـەبووە لەپێ بکرێ، ئێستا مانگی دەستکرد هەیە، ئیتر چۆن ئەبێ هـیچ نـەگۆڕێین، هـیچ گۆڕانێکت لەم ژیانە نەهاتبێتـە دی، لـەڕووی ئـابوری، شارسـتانی, کۆمەلایـەتی، ڕوناکبیری، فەلـسەفیو ئایدۆلۆجیـەوە، لـەڕووی ئـەو هـەموو مەسـەلانەوە دەبـێ

ئێمە نەگۆڕابین، قابیلی ئەوەبین بمانگێڕنەوە بۆ ڕابردوویەکی دێرین کەبەهیچ شێوەیەك زۆربەی ئەو ئەحکامانە، ئەوکاتە، ڕاست بوون، بەڵام لەگەڵ عەقڵی ئێستاو لەکۆمەڵی ئێستاو لەگەڵ پێشکەوتنی ئێستادا ناگونجێن.

وەرن سەیری کەن بیرمەندێك کە ناوی (محمد نور فرەحات)ە چ دەڵێ: دوایش شەرحی ئەکەم ((ان تطبيق الشريعة الاسلامية يعنى لدى منادين بها اليوم امراً من امور ثلاثة اولها مالديه من نصوص قطعية الثبوت والدلال على معاملات بين الناس اليوم, وثانيها نقل احكام الفقهى الاسلامى بحدياتها وصيانا‌تها وترفيعاتها ومعناها ومبناها لتصبح هى القواعد القانونية واجب الاجراء دون النظر الى اختلاف المناخ الاجتماعى الذى صيغ فيه, ان المناخ الاجتماعى فى الزمن الراهن, وثالثها اعادة صياغة المجتمع الاقتصاديه والاجتماعيه ومحضوراته ومباحاته وأوامره ونواهه وسلوكه وعاداته واخلاقه, ليصبح مطابقاً للتصور محدد معناه الشريعة..)) ئەڵێ جێ بە جێ کردنی شەریعەت بۆ ئەوانەی بانگی دەدەن سێ ئەمر ئەگەیەنێ, یەك: هەموو دەقە لێبڕاوەکان، یانی هەمووئەو دەقە نوسراوە لێبڕاوانە کەدەرکراوە بەڵگەی بەڵگە نەویستە بۆ مامەڵەی نێوخەڵك نابێ بگۆڕێ, دووەم هەموو ئەحکامەکانی فقهی ئیسلامی ئەحکامەکان داڕشتنەکەی لق و پۆپەکەی ماناکەی تەلاری داڕشتنەکەی دەبێ ڕێسای یاسای بێ ئەملاوئەولا جێبەجێکراوبن، بەبێ ئەوەی سەیری جیاوازی هەلومەرجی ئەو کاتەی دروست بوونی و هەلومەرجی ئێستای گۆڕاو بکەی, سێ یەمیان داڕشتنەوەی کۆمەڵ یانی داڕشتنەوەی کۆمەڵ بە ئابوورییەکەی، بە کۆمەڵایەتی یەکەی، بابڵێین قەدەغەکراوەکەی یانی ئەوەی عەیبە پەیڕەوی لێ بکەی, یانی هەموو ئەوانەی ڕێگەی پێ دراوە پەیڕەوی لێ بکەی، ئەمرەکانی و ناوەڕۆکەکەی، شێوازی هەڵس و کەوتەکەی، لەگەڵ نەریت و ڕەوشتەکەی، هەر هەمووی دەبێ کوت و مت ئێستاش لەگەڵ ئەحکامی شەریعەتی سەرەتای ئیسلام بگونجێت، ئەمە دەقێکە بیرمەندێکی گەورە گوتوویەتی کە ئیسلامییە سەلەفیەکانی دنیا دەڵێین دەبێ ئاوابێ, ئەم دەقە هەر خۆی لەگەڵ بۆچونی یەکێك لە ئەندتیشمەندەکان کە کارایەکی گەورەی هەیە بەناوی(مصطفى محمود) کتێبێکی هەیە بەناوی (الماركسية والاسلام) تیایا ئاوا ڕاڤەی قورئان ئەکا ئەڵێ:(ان القرأن لم يحدد منهجاً سياسياًءلم يصور دستوراً محدداً) ئەڵێ قورئان ڕێبازێکی سیاسی و دەستورێکی دیاری کراوی دیاری نەکردووە, ئەی دەباشە قورئان ئەمەی دیاری

نەکردبێ، من ئێستا بە چ شێوەیەك شەریعەتێك کە برایەکی حەنەفی یا حەنبەلی یا شافعی تفسیراتو ئیجتهاداتی کردووە، هاتووە کردویەتی بەیاسای دونیایی بۆ ئەوەی بەو دنیام ببەستێ، چۆن خۆمی پێوە ببەستم؟ ئایا خۆمی پێوە ببەستم چیم لێدێ؟ باش ئەکەم، گەشە ئەکەم، ئەگۆڕێم، ڕزگار ئەبم، چەوسانەوە نامێنێ، ئازادی ئینسان نامێنێ، یاخود گەڕانەوە بۆ ئەو سەردەمە کە سەردەمی چاخەکانی ناوەڕاستە, ئەم کابرایەی کە ئەم قەولەی هێناوەتەوە پیاوێکی زۆر بەتواناشە، ئەڵێ: خوا ئەو قورئانەی کە داڕشتووەویستویوتی ڕێگاکانی لێکدانەوەو هەڵهێنجاندنی باوەڕو داڕشتنی ئەحکامو ڕێباز بەپێ ی هەلو مەرجی گۆڕاو دابڕێژرێتەوەو بگۆڕدرێ، بە بێ ئەوەی بتبەستێتەوە بەهیچ شتێکی نەگۆڕ، هەر لە درێژەی باسەکەیا ئەڵێ: نصائح القرأن فی المواضیوع السیاسیة والحکم بأصدار توصیات عامة لها صفة الازلیة) واتە: ڕێنوێنیە گشتیەکانی قورئان صیفەتی ئەزەلییان هەیە، قابلی ئەوە نین نەسخ یان کەی، قابیلی ئەوە نین هەڵیان وەشێنیتەوە، بەڵام ڕاسپاردەی گشتین، لەبەر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی قورئان دیاردە تازەکان لێك بدرێتەوە، بۆیە پێویستە نەریتی تازە بۆ شێوەی حوکمو بەڕێوە بردنی ژیانی کۆمەلایەتی خۆت بیبەی بەڕێوە, ئەمە چەند ناکۆکە لەگەڵ ئەوەی تر، نوسەرێکی تر بابلێین ڕێبەرێکی ناسراوی ترە کەناوی(ڕاشد الغنوشی) یە بەناوبانگە کەیەکێکە لە سەرکردە گەورەکانی ڕێبازی سەلەفیی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست, ئەڵێ:(ان الشریعة عندنا لیست قوالب فوقیة متعالیة جاهزة التطبیق حیث ما اتفق بقدر ماهیة جملة من القیم،القواعد،المبادی العلیا مطلوب تفاعُلـها مع خصوصیات زمننا) قسەیەکی گرنگە، پیاوێکە بۆ خۆشی فۆنتەمۆنتالیزمە، بۆ خۆشی ئیسلامییەکی سەلەفییە، ئەڵێ شەریعەت قالبی لەسەرەوە داڕێژراوی بەرزەفڕی ئامادە کراوی سەپێنراو نی یە کە هەرچی چۆنێ بێ دەبێ جێبەجێی بکەی، ئەڵێ: لەکاتێکدا هێندەی نەریتو ڕێساو پرنسیپی بەرزن، کە دەبێ تەفاعول لەگەڵ تایبەت مەندی یەکانی زەمانی ئێستامان بکا، ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە، بەڕاستی بەشێکە لە چەمکە تازەکان کە دەکرێ لە گەڵ عەلمانیەتا بیگونجێنی، بی بەیتە پێشەوە, کە ئەگەر ئەم قسانە بەراورد بکەین دەبینین ناکۆکیەکی گەورە لە بەینی سەلەفی یەکان خۆیان هەیە، لەلایەکەوە کوتو مت، هەموو شتەکانمان ئەگێڕنەوە بۆ سەردەمی خۆی، کەوەکو عەرزیشم کردن لە سەردەمی خۆیا جائز بووە ئەو حوکمانە جێبەجێ

بیبیّو هیواش هەیە دەڵێ: نەخێر ئەوە بیروڕای ئاینیو ڕاسپاردەی گشتین کە دەکرێ سودیان لێببینرێ، لەبەر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکاندا دیاردەکانی پێ لێك بدەیتەوە، ئەگەر بێتو ئەمانە لێك بدەینەوە، بیبەستینەوە بەوڵاتی خۆمانەوە، چی لێدێت، واتا: ئەو عەلمانیەتو سەلەفیەیەتە هەڵ بسەنگێنینو بیبەستینەوە بەووڵاتی خۆمان، چی لێدێت, ئێستا جیاوازیەکی گەورەمان لەگەڵ ئەوروپا هەیە، ناتوانین لاسایی ئەوروپا بکەینەوە, وەکو ئەوان ناتوانین تەعامول لەگەڵ مەسیحیەت بکەین، وەکو ئەوانیش ناتوانین بە لێبڕاوی عەلمانیەت جێ بەجێ بکەین، بۆ؟ هۆکەشی ئەوە نی یە ئیسلام‌وەکو چەمکی دەوڵەت (نەك‌وەکو ئاین) خراپ یان نەگونجاوە، یاخود عەلمانیەت بۆووڵاتی ئێمە خراپە، یا بەشێکی باشەو بەشێکی خراپە، هۆیەکەی ئەوەیە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیو فکریمان بەشێوەیەك گەشەی کردووە ناتوانین بەلاسایی کردنەوەی ئەوروپا ئەو سەرکەوتنە بەدیبهێنین، کە لە ئەوروپا لەسەر زەمینەیەکی ڕەخساو بەدیان هێنا. چونکە سەرکەوتنی عەلمانیەت لەووڵاتانی ئەوروپا تەنها سەرکەوتنی فەلسەفە نەبووە، سەرکەوتنی ڕێبازێکی سیاسی دابڕاو لە گەشە کردنەکانی تر نەبووە، عەلمانیەت زادەی پێویستیەکانی، تەکنەلۆژی، ئایدیۆلۆجی، ئەدەبی، زانست، مەعریفەو فەلسەفەو هەموو شتەکانی تری ژیان بووە؛ یانی لەوێ ژیان لە هەموو بارەیەکەوە گەشەی کرد, کە گەشەی کرد زادەی یا شیرازەی چنینەوەی هەموو گەشەکردنە فەلسەفی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، یاسا یەکانیووڵاتانی ئەوروپا عەلمانیەت خولقا؛ و چاکی بە یەکەوە چنی، چاکی بەیەکەوە بەست, بوو بەیەك شتی پێکەوە بەستراوی خزمەتکەری یەکتر بەشێوەیەك کە ئەوەتانێ شارستانیەت، زانستو سیستەمو ژیانی ئەوێ چی لێهات.

سەبارەت بەفەلسەفە، ئەتوانم بڵێم ئێستاش بەشێوەیەکی زانستی لە فەلسەفە تێ نە گەیشتوین، زۆربەی خەلکمان لە ٩٥٪ ی خەڵکی ئێمە لە تەواوی مێژووی فەلسەفەو فەلسەفە تێنەگەیشتوین، بیستومانە فەلسەفە، عیلم، مەعریفە، مەدەنیەت, ئازادی، بەلام‌وەرە مێژووی فەلسەفە لێك بدەرەوە، فەلسەفە چییەو فەلسەفەکان چۆن گەشەیان کردووە, هەر فەلسەفەیەك لە قۆناغی خۆیا چەند قازانجی گەیاندووە، چەند میللەتانی خۆی بردۆتە پێشەوە، ئەو فەلسەفەیە لە چ زەمانێك گەیشتە بن بەست، ڕێگای چۆن بۆ فەلسەفەیەکی

خۆش کرد، ئەو فەلسەفانە چۆن بەستراون بەیەك, بەڕاستی لە کۆمەڵی ئێمەدا
ەحکامی فەلـسەفیو لاسـایکردنەوەی فەلـسەفە هەیـە، بـەلاّم بەتـەواوەتی
ێیکـەکانی فەلـسەفە نەچەسپیون، تەنانـەت لـەزانکۆکانا فەلـسەفە ئـەخوێنن،
لاّم ڕەنگە زۆر کەمیانوەکو بابەتی ئەبستمۆلۆجی، بۆ مەعریفەتی ئینـسان، بـۆ
شەکردنی ئینسانو کۆمەڵ، بۆ گەشە کردنی عەقڵو مەنتق، ئیستیفادەیان لـیّ
ردووەو بردوویانەتــە پێـشەوە، زۆربـەی ئـەو تەلەبانـەی کـە لـە زانکـۆدا
ێندویانەتــەوەو شــەهادەی فەلـسەفی یــان هێنــاوە، ڕەنگەوەكوەزیفەیــەك
رسی پیّ بلّێنەوە، بەبیّ ئەوەی لە چۆنیەتی تەفاعول پێکردنـی فەلـسەفەکانو
نگی یەکیّ لە فەلسەفەکانی قۆنـاغی ژیـان، ئیشیان بـۆ کردبـیّ. لـە فەلـسەفە
ــە حاڵمانــە.. لــە ئابوریـدا خۆتـان ئـەزانن لـە چ ئاسـتێکداین، ئێـستاش لـە
ردسـتانا چــوار ئـابوریزانی بـاش نیـە، کـە توێژینــەوەی ئـابوری باشمــان
ێوەیەك بۆ بکات کە بزانین چۆن کەوتوینەتە چوار لایـەنی سـەنتەری ئـابوری
مان، ئێستا ئـابوری ڕۆژهـەلاتی ناوەڕاست چیەو چـی نیـە، توێژینەوەیـەکی
زمان هەیە بۆ ئـابوری، ئێـستاش پـەنا ئەبەینـە بـەر توێـژەرەوەی جیهـان بـۆ
ەی سەر لە ئابوری خۆمان دەرکەین, هەروا چەمکی سۆسیۆلۆژی کە زانـستی
مەڵە، ڕەنگە بەدانسقەش یەك توێژینەوەمان لەسەر سۆسـیۆلۆجی نەنوسـیبیّ،
ەر ئەنترۆپۆلۆحی کە زانستی مرۆڤ ناسینە، هەر هیـچمان لەسـەر نەنوسـیوە،
ەر شارستانیەت، خۆتـان ئـەزانن شارسـتانیەت گـەر هـەشمان بـووبیّ داگـیر
ەکان بەشێوەیەك دزیویانەو سوتاندویانە کە ئێستا پاشماوەکـانی شارسـتانی
مـان لـەم لاو ئـەولا کـۆ ئەکەینـەوە، بەهــەزار حـاڵ بـەرەنجامی لـیّ دەست
خەین،, باقی شتەکانی تر،وەرە سەیری ژیانی کۆمەلاّیـەتیمان بکـەن، سـەیری
ربەسـتی ژن، سـەیری ئەقلّیـەتی پیـاو بەرامبـەر ژن لـەوولاّتی ئێمـە، سـەیری
ڵەتو یاسا، سەیری مافی مرۆڤ، هەمووی پێویستی خزمەتێکی زۆر، پێویستی
کۆششێکی زۆر، پێویستی بە هـەوڵو تەقەلایـەکی زۆر هەیـە کـە دەبـیّ هـەوڵ
ن بۆ ئەوەی بیگەیەنینە ئاستێك کە خەڵکی ئێمە لە فەلسەفەو شارستانیەتو
لمو عەلمانیـەت تـیّ بگـا, مـن بـەش بـە حـاڵی خـۆم شاگەشـکە ئـەمگریّ کـە
لەتەکـەمان لـە بەرامبـەر داگـیر کـردن، لـە بەرهەڵـستی سـەپاندنی عەقلّیـەتی
ەپەرستانە، لەهەوڵی ئازادیخوازانە، درێغی ناکا.

مایەی شانازیە لەکوردستانی بەشی عێراقا، لە کاتێکا ئەبینی چەمکەکان هە
هەمووی لاوازە، سەرەڕاش خەڵکی بە غەریزەی خۆی، بۆ چارەنووسی ڕزگاری
ئازادیو دیموکراسی خۆی، تیێ ئەگا عەلمانیەت لە سەلەفیەت زۆر گرنگترە
زۆربەی هەرە زۆری خەڵك دەنگی بە عەلمانیەت لەهەڵبژاردندا ئەدا, ئەمە یەکێك
لە شانازییەکان، لە سەرکەوتنە گەورەکان، هەقوایە سوودی لێوەربگرین، ئیش
بۆ بکەین بۆ ئەوەی ئەو بەسۆز بەرەو پیر هاتنەی عەلمانیەتە بکەین بە
قەناعەتی ماددی, بە قەناعەتی لۆژیکی، بە قەناعەتی عەقڵانی، بە قەناعەت
فەلسەفی لە ژیانا، پێویستە ئەم تێکەڵاو بە ژیانمان، بە حاڵمان، بە دەولەتمان
بە یاسامان، بە پەیوەندی سیاسیو گۆڕانی سیاسی، چۆنیەتی بەدی هێنان
ئازادییو دیموکراسیمان بکەین, لەبەر ئەوە زۆر زۆرمان ماوە لەو بارەوە، بۆیە
هێشتا عەلمانیەت تەنها چەمکەکەیمان قەرز کردووە، بەبێ ئەوەی لە
خۆمانەوە هەڵقولابێ، بەبێ ئەوەی زادەی پێویستیەکانی سیستەم
بەرەوپێشەوەبردنی کۆمەڵەکەمان بێ، جا ئەمەوەرگرتنە ووریایی، ئاسکو
زیرەکیەکی هەمەلایەنەو چاکی ئەوێ، تا بتوانین ئیشی تیا بکەین، لەسەرەنجام
ئیشکردنەوە عەلمانیەت لەولاتی ئێمە ئەچەسپێ.

لەتەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، لە شیوە قارەی هیندیو زۆربەی هە
زۆریوولاتانی ئاسیا، ناتوانم بلێم کوتومت ولاتێکی عەلمانی هەیە، ژاپۆ
لێدەرچێ، ژاپۆنولاتێکی دەگمەنە لە گەشەکردنی کۆمەڵایەتی لە ئاسیا، هەم
ولاتەکانی دنیا ئەگەر سەیری کەین، کەموکوڕی وا لە ڕێبازی عەلمانیو
تەعامولی عەلمانیو جێبەجێکردنی عەلمانی، لە تفاعولی عەلمانی لەگەڵ کۆمەڵ
هەیە کە ڕێگایەکی دوورو درێژی ماوە بە تەواوەتی خەباتی بۆ بکەین, هەر
ئەمەشە لەلایەکەوە هێشتا ژێر دەستەبن، لەلایەکی دیکەوە گەشەکرد
کۆمەڵایەتی سروشتی مانو چینەکانمان قاڵبی خۆیانوەرنەگرتووە، هە
بناغەی ئابوریمان وەکو خۆی نەبووە، شارستانیەتیمان تێك دراوە، جگەلەو
فەلسەفەیەك لەفەلسەفەکانی ژیانوەکو خۆی جێبەجێ نەبووە لە هن
ئێمەدا. هەر هەموو ئەوانەی کە ئێمەوەرمان گرتووە, بە خوارو خێچی وەرم
گرتووە، لە کۆمۆنیزمەوە تا ئەگا بە لیبرالیزم بە خوارو خێچیو بەلاسای
لاساریی لە ولاتانی ئێمە وەرگیراوە, هەموو ئەوانەیوای لێ کردووە کە ئێم
کۆمەڵی ئێمە ڕوو بەڕووی ئەوە بێتەوە کە کاتێك ئەمانەوێت خەبات بۆ ڕزگار
ئازادی، دیموکراسی مافی چارەنووسی ئێمەی پێوە بەستراوە، ئەوی
عەلمانیەتە.

بەداخێکی زۆرەوە سەردەمەکەمان کەوتۆتە دوو حاڵەتەوە کە ناکۆکن بەیەك: لەلایەکەوە, جەنگی سارد تەواو بووە, جەنگی سارد هەموو قالّبە دارێژراوەکانی کە عـەقڵی خـەڵکیان تیا پەسـتاوتبوو، گـۆڕی، دنیایـەکی ئـازادیو دیموکراسـی هاتۆتـە پێـشەوە" لـە لایـەکی تـرەوە: دنیـای ئـازادیو دیموکراسـی یـە، کـە زۆر گــۆڕانی هێناوەتــە دی، بــەداخێکی زۆرەوە، لــەباتی ئــەوەی ســودێکی زۆری لێوەربگرن, هاو زەمان دوای ئەم گۆڕانکاریانەی دوای جەنگی سارد، لە عالـەما، لــە ڕووی ئــازادیو مــافی چـارەنووس هاتۆتــە دی، دەبیــنین فۆنــدەمینتالیزم سەریهەڵداوەتەوە, بۆئەوەی ئەم هەلومەرجە تێك بدا کە نەتوانن پێویستیەکانی دیموکراسیو پێویستی یەکانی ڕێبـازی زانستیو پێویستی یـەکانی چەسپاندنی دەوڵەتو یاسـاو کلتـوری سـەردەم بچەسپێنین.. واتـا: دوای ئـەوەی ئـەورووپای ڕۆژهەلات، دوای ئەوەی کە سۆڤیەت، دوای ئـەوەی ئـەو چـەمکانەی ئەوکاتـە بـۆ ئەو ڕووداوانـە هـەمووی پێچراوەتەوەو خـەڵك بـە دوای چـەمکی تـازە ئەگـەڕێو جـارێ چـەمکە تازەکـان لەکۆمەڵەکانمانـدا گەڵاڵـە نـەبوون، دەبیـنین لەبەرامبـەر کۆشــشی ئێـستادا پاشمــاوەی ســەلەفیەت بەمـــەرامو بەنەخـــشەو بەرنامـــە دەبوژێندرێتەوەو ئەفکاری ئیسلامی، عەقیدەی ئیـسلامی سیاسـی، قـۆرخکردنی شارستانیەتی ئیسلام، بەپێشەینەیەکی کولتوری ئامادەکراوی ئیسلامیەوە، قوت کراونـەتـەوەو بۆشـاییەکی سیاسـیو کـەلێنی فەلـسەفی پڕبکەنـەوە، توانیویانـە لەولاتی ئێمـەو لـە چـەندین ولاتـی دنیـا کێـشەو گرفتـی بەرچـاو دروسـت بکـەن. کوردستان ئـەوە حاڵەکەیـەتی، جـەزائیر ئـەوە حاڵەکەیـەتی، میـسر ئـەوە حاڵـە کەیەتی، ئەوە ئەفغانستان،وولاتانی تر ئەوە حاڵیانـەو ئـەبینین کـە مشتومڕێکی گـەورەو ململانـێو نـاکۆکی یـەکی گـەورە لـەنێوان ئەمووڵاتانـەی ئێمـەو ئەوانـدا هەیە؛ لێرەوە دێمە سەر ئەوەی ئەرکەکانمان چین:

١/ ئەرکمان ئەوەیە بەشێوەیەکی بابەتی، بەشێوەیەکی لۆژیکی ڕێبازی زانستیو عەلمانیەت، دەوڵەتی لائیكو فەلسەفەی لائیك،وەکو خـۆی بـلاو بکەینـەوەو میللەتەکەمانی پێ پەروەردە بکەین.

٢/ زۆر بە ئاگایانە، بەووریایانە، بەو پەڕی ڕێزگـرتن لـە مەزهەبـەکانو دینـەکانی کوردستان، تعامول لەگەڵ مەسەلەکان بکەین" ئازادی ئەوان، دیموکراسیەتی ئەوان، دابین بکەین، ئەمەی ئەیلێین بەهیچ شـێوەیەك کـە باسـی عەلمانیـەت ئەکەین باسی کفرو لەئاین هەلگـەڕان ناکـەین، پێویستە ئـەوان لـە ئێمـە تـێ بگەنو ئێمەش لەوان تێ بگەین.

٣/ پاشماوەی ئەو هەموو دژایەتی یەی ئێمە لەلایەن سەلەفیەکانەوەو پشتیوانەکانی ئەوانەوە،وەکو خۆی سەیری دەکەین،وەکو پێوستە تێ ی بگەین؛ هەتا بتوانین ئەو پێویستی یەی تێ ی ئەگەین لە بەرامبەریا بەشێوەیەکی ڕێکو پێکو لۆژیکی بەر پەرچی بدەینەوە؛

شەڕ کەدروست بووە. ئەو ڕۆژەی تەقە لە کوردستان دامەزراوە (ی.ن.ك) و سەرکردایەتی(ی.ن.ك) بەهیچ شێوەیەك بڕیارمان نەبووە شەڕی ئەوان بکەین، هەمیشە هەوڵمان بووە کە بە هیچ شێوەیەك شەڕنەبێ، ناکۆکیە سیاسیەکانیشمان لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامیش بەشێوەیەکی باش بەڕێوە بەرین، بگرە بەپێچەوانەوە، بەڕێز مام جەلال باشترین پەیوەندی لەگەڵ مەلا عثمانو مەلا علی هەبووە,هەر لە ئێرانەوە، لەو ساوە سەریان هەڵداوە تا ئێستا. بەڵام مەسەلەکە ئەوە نیە ئێمە شەڕناکەین، مەسەلەکە ئەوە نیە پەیوەندیمان باشە یان باش نیە, مەسەلەکە ئەوەیە ئەوان پەیوەندیان باش نیە لەگەڵ ئێمە, ئەوان بڕوای تریان هەیە, قەناعەتەکە هی ئەوانیش نیە، ئەوانوەریان گرتووە، لە میسرو جەزائیر، ئێرانو لە شتی تروەریان گرتووە، کە پەیڕەوی ئەکەن، ئاخاوتنو گیروگرفتەکانیان، خوتبەکانیان هەمووی لە بەردەستمانن، نامەکانیان هەمووی لە بەردەستمانن، کوردستانی نوێ پەیتا پەیتا لێ ی بڵاو ئەکاتەوە, هەرکەسێك ئەیەوێ بابێ خوتبەکانی مەلا کرێکار، بابێ خوتبەکانی مامۆستا علی باپیر، بابێ خوتبەکانی مەلا علی بزانێ ئەڵێن چی..؟!

بەبێ تەمو مژ ئەڵێن: نە بەدەوڵەتەکەیان، نەبە یاساکانیان، نە بە کاربەدەستانیان، نە بە هیچ کەسێکی ئەوان باوەڕناکەین. نەك ئەوەندەش، بەڵکو بڵێین حیزبەکەی ئێمە لە ئێوە باشترە هێشتا قبوڵمە؛ ئەڵێ هەموویان ئەخەینە ژێر پێمانەوە. بەڵێ، مەلا کرێکار بەڕاشکاوی ئەڵێ ئەیانخەینە ژێر پێڵاو، ئاخر ئەم ژێر پێ یەی تۆ بوو بەچی؟ ژێر پێڵاوەکەت جێگای ئەم هەموو شتەی تیا ئەبێتەوە.. (هۆڵەکە بەچەپڵەو پێکەنینوروژا) مەلاکرێکار هەموو گوێمان لێ بووە لەمزگەوتا خوتبە ئەخوێنێتەوە، ئەیکەنە مینبەری سیاسی، قسەی خۆیان ئەکەن، خوتبەی خۆیان ئەدەن، شتێکیشیان بەدڵ نەبێ، ڕەخنەی توندی لێدەگرن, مەلا کرێکار خوتبەیەکی داوە چەندین جار ئەڵێ ئەیخەمە ژێر پێمەوە, ئەڵێ شێرکۆ بێکەس لە هەر کۆڵانو شوێنێ ئەیگرن بەتەور بیکوژن. من لە سەدامم ئەوە نەبیستووە, ناکرێ ئینسان ئەوەبڵێ؟ جارێکیان نەبێ یەك

شریتی نهێنی سەدام دەست کەوتووە لەسـەر کودەتایـەك پیلانـی لەسـەر بـووە، جارێکیان سەدام قسەیەکی ووتووە،(انگصصهم وصلەوصله).
لەبەرامبـەر ئەمانـەدا چـی بکـەین، ئـەڵێین لەشـکر یـەك بگرێـت، ئـەڵێن یـەك ناگرین, ئەڵێی یاسـاکانمان جێبەجێکـەن، ئـەلێن جێبـەجێی ناکـەین, ئـەڵێین باوەڕتان بەدیموکراسی هەبێ، مامۆستا علی باپیر لـە کوردسـتانی نـوێ ئـەڵێ:— خودی دیموکراسی دەبێ حەقمان بداتێ دژی دیموکراسی بین... من دیموکراسیم کەتۆ دژی دیموکراسیت، دژی منی، من یاساکە دائەڕێژم کـە تـۆ یاسـاکە بخەیتـە ژێر پێ، یانی من ئەخەیتە ژێر پێ؟ من داوای یەکگرتنی لەشکر ئەکەم، کەتۆ یەك نـاگری یـانی تـۆ لەشـکرەکەی مـن تێـك ئـەدەی، مـن دەوڵـەت دائەمـەزرێنم و پەیوەندیم لەگەڵ ئەوروپا هەیە، کە تۆ تکفیری ئەکەی یعنی مـن بـەکافر ئـەزانی، تۆ شکت هەیە منیش شکم هەیـە, کـە بـوو بەشـەڕ ئـیتر ئەبێتـە شـەڕو شـەڕیش چارەنووسی هەردوولامان دیاری ئەکا.
ئێـستا دوای ئـەوەی ئـیتر نـەمانتوانی بەمـشتومڕی سیاسـی، بـە دانیـشتن و گفتوگۆ ئەم کێشەیە لە گەڵ بزوتنەوەی ئیسلامی یەکالا کەینەوە، ئەوان شەڕیان ڕاگەیاند دژمان، سەرەنجامەکەی خۆشبـەختانە ئـەتوانم بڵـێم بـە قوربـانی یـەکی کەم، سەرەڕای شـەهیدی زۆر قارەمـانو کـادری زۆر هەڵکـەوتومان ڕۆیـی، بـەلام هێشتا لە چاو ئەو شەڕەو، لە چاو ئەو پشتیوانی یەو، لـە چـاو ئـەو نەخشەیەی کە لە بەردەستمانەو ئەیزانین چی یە، ئـەتوانم بڵـێم دوو ئەوەنـدەی شـەهیدمان بدایە, هێشتا قوربانی یەکی کەممان داوە, یەکێك لـە کێـشەکانی هـەڵو مـەرجی ئێـستامان لـە کـۆڵ کردۆتـەوە کـە ئـەتوانم بڵـێم نـەك هـەر کێشەیەکمان لـەکۆڵ کردۆتەوە, شەرەفێکی سیاسی گەورەشمان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەدی هێنـا، ئەویش ئەوەیە میللەتێکی گەمارۆدراو بـە دوو گـەمارۆ,وولاتێکـی جـارێ دان پیـا نـەنراو لەلایـەن حکومەتـەکانو نەتـەوە یەکگرتووەکانـەوە،وەکو دەوڵـەتێك, لـە کاتێکدا کە فیشەك لە قاچاخچی ئەکرین، لە کاتێکدا کە مەعاشمان نیە, پارەمان نیە، سەرەڕاش, لەبەرئەوەی چارەنوسی میللەتەکەمان ئەوەندە باش بەسـتراوە بەدیموکراسیەوە, دەزانین دیموکراسیو ئازادی ئەمەندە گرنگـە بـۆ چارەنووسـی ئێمـە، لـەو بـارە نالـەبارەی تیـا ئـەژین، لـە کـەمترین کاتـا خەتـەرترین ڕێبـازی عەسکەری تێـك شـکێنرا, لـەکاتێکا جـەزائیر بـۆ خۆتـان ئـەزانن بـەمیکی (٢٩) و بەدەبابەی(T..76) بەهەموو ئیمکانیاتی عەسکەری خۆی، ئێستەیش نەیتوانیوە

جەزرەبەیەکی عەسکەری لەو بزوتنەوەیە بدا کەخەتەری نەهێڵێ. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە بیرورِا لە ناو میللەتەکەی ئێمەدا بۆ بەدی هێنانی چارەنوسێکی باشتر لە ناو(پ.م) و قارەمانانی میللەتەکەماندا, دووربینییەکی ئەوتۆیە ئەگەر ئێستە بەو حەماسەتە بەرگری نەکەین, بۆ ماوەیەکی کەم بەو توانا کەمە سەرکەوتنی گەورە بەدەست نەیەت, رەنگە توشی کارەساتێکی گەورە بین, ئەمە بەبێ ئەوەی ئێمە رێکیشمان خستبێ, بەبێ ئەوەی بەرنامەیەکی هەمەلایەنەمان بۆ دانابێ,وەکو غەریزە چووە بەناخی ئینسان بە ئینسانی شۆرِشگێرِی ئەم میللەتە کە دەبێ خەتەرەکان لەسەر چارە نوسمان لەناو بچێ, دەبێ بەو حەماسەتە بەرامبەر بە کۆنە پەرستی شەرِ بکەین، هەتا بتوانین سەرکەوتنێکیوا بەدەست بهێنین.

دیموکراسی نەبین, عەلمانی نەبین, مافی مرۆڤ دابین نەکەین, دەوڵەتی یاسا نەچەسپێنین، ئەم دەسکەوتەی هەمانە بۆمان ناپارێزرێ, ئێستاش خۆش بەختانە لە دنیادا نەك مەسەلەی(کورد) بەرەو پاشە کشە ناروا، ئەگەر هەبوون لێرە لە کۆرِی پێراری من لە بیریان بێ، کە وتم چاوەرِێ بکەین لە سالانی ئایندە زیاتر پێش ئەکەوین، من باش لەبیرمە هەر لەم شوێنە ئەو قسەیەم کردووەو فعلاً ئێستە خەریکەوا ئەوقسانە دێتە دی، کە دەمێکە ئەکرێووردەوردە گەلەکەمان لە خەم.. خەمی چارەنووسی ئەرِەخسێ.

سەرۆکی فەرەنساو ئەمەریکا، سەرەکوەزیرانی بەریتانیا، بە تانسۆ چیلەر سەرۆکوەزیرانی تورکیایان گوتووە کە کیانێکی سیاسی بۆ کورد لە تورکیا پێك بێ، ئێوە چی دەکەن؟ چیلەر رەتی کردۆتەوە, بەناوی خۆیيو ئێرانو سوریەشەوە,هەر سێ سەرەك کۆمارەکە پێ ی پێ کەنیون, پێکەنینیش لە عورفی سیاسی مەجلیسی ئاوا, دوو شت ئەگەیەنێ, یەك ئەوە ئەگەیەنێ کەتۆ لە دنیا بێ خەبەری, دووش ئەوە ئەگەیەنێ کەتۆ ناتوانی بەرەنگاری ئەو بریارە بکەی, ئەوە سەرەتایەکە لە مێژووی سیاسی میللەتی ئێمەدا, ئەوە یەکەمین جارە گەورەترین کاربەدەستی دنیا کە چارەنووسی دنیای بە دەستە (سەرۆکی ئەمەریکا) باس لە چارەنووسی میللەتی ئێمە بەرەو قەوارەبردن بکات, جارێکیان ساڵی١٩١٤و ١٩١٥ سەرۆك کۆماری ئەمەریکا لە پرنسیپەکانی (١٤) مادەیی بەناوبانگی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی باسی کوردو ئەرمەنی کردووە، بەبێ ئەوەی بەتەواوەتی بیچەسپێنێ,و لە ئەوەڵین گفتو گۆدا دوای جەنگ

دیزەبەدەرخۆنەشیان کرد، ئەوەی کە باسـی کـوردو ئەرمـەنی تیـا کـراوە, لـەوە بەدواوە هـیچ سـەرۆك کۆمارێـك لـە دنیـا بـەم شـێوەیە باسـی مەسـەلەی کـوردو دەوڵەتی کوردییان نەکردووە لە کوردستانا, سەرەنجام ئەوە ئێستا لـە جیهانـدا ڕۆژنامەکان‌و هەندێ دەوڵەت لە دنیـا لەگـەڵ هاتنـە پێشەوەو خـەریکی تاقیـب‌و دیراسـەی وردن, ئیـسپانیاو ڕوسـیا, هەنـدێ وڵاتـی تـری ئـەورووپا هـەمووی کەوتونەتە تعقیب کردن، پەیوەندی کردن بۆ ئەوەی کە ئەم هەواڵە تازەیە بـزانن چۆنە. هەندێ لەووڵاتانەوتوویانە خۆمـان حـازر ئەکـەین کەلـە ئاینـدەدا لەگـەڵ دەوڵەتی کوردا تعامول بکەین.. ئەمە زۆر گرنگە،ووتویانەوا خۆمان حازر ئەکەین کە لە گەڵ دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستـاندا تعـامول بکـەین، مـن ئێـستاش‌وا ئەزانم زۆر دورە دەوڵەت بۆ کوردستان دروست بکرێ، بەڵام لەبەرنامەدایە فیدراڵ بۆ بەشـەکانی تـری کوردسـتانیش بێتـەدی.واجبێکـی زۆر گـەورەی سـەر شـانی ئێمەیە کە بیری لێ بکەینەوە بەتەواوەتی بەرامبەر بەو دۆخە چی ئەکەین‌و چۆن ئەو گۆڕانکاریانـەی جیهـان لەبەرژەوەنـدی خۆمـان ئەبەینـە پێشەوە, بەڕاسـتی ئەگەر عیلمی‌و عەلمانی نەبین، دیموکراسی نـەبین، بـیر لـەوە نەکەینـەوە ئـازادی ئینسان‌و پێشکەوتن لە کۆمەڵ‌و دەوڵەتی یاسا بچەسپێنین, ئەم سەرکەوتنانە لـە کیـسمان ئەچـن, کـە لـە کیسیـشمان چـوو ئـیتر نـەفرەتی مێـژوو ئێـستاو پاشەڕۆژیشمان لێ ئەکرێ.. زۆر گرنگە لەئـەرکی خۆمـان تـێ بگـەین, لـە چـارە نوسی خۆمان تێ بگەین, تێ بگەین کە عەلمانیەت, مەسـەلەی سـەلەفیەت, دوو شـتی نـاکۆکن. بیروڕاکـانی سـەلەفیەت نـاکۆك لەگـەڵ سـەردەم، هـەلی سەردەمەکەمان دوچاری زیانی نالەبار دەکا.

لە ڕووی سیستەمی سیاسی یـەوە عەلمانیـەت, عـەقڵی ئینسان بۆ لۆجیـك (منطق) بۆ یاسای سروشتی, بۆ یاسا زانستیەکان, بۆ فەلـسەفەکان ئەسـازێ, ئەمان باتە پێشەوە, سەلەفیەت ئەو ڕێبازە کۆنەپەرستیەیە کە نـە ئیسلامیەیە, نە عیلاقەی بە ئیسلامیەتەوە هەیە... تەنها ڕێبـازی هەنـدێ خەڵکـە ئەیانـەوێ خەڵك چەواشە بکەن بەناوی ئیسلامەوە.. بە هیچ شێوەیەك ڕێگە نـادەین ئەوانـە بە تێکدان ئەم هەڵکەوتە گەورەیەمان لە دەسـت بـدەن, کەبـەری ڕەنجـی زیـاتر لە(٢٥٠) هەزار شەهیدی میللەتەکەمانەو کاوڵ بوونی بەشێکی زۆری کوردسـتانە, ئەگەر ئەوان لە ئێمە باشتر بوونایـە، فـەرموو ئـەوە کورسـی یەکـە بـۆ ئـەوان بـا باشتر حـوکم بکـەن.. بـەڵام ڕۆشـنە ئـەڵێن چـی.. ئێمـەش ڕۆشـنە ئـەڵێین چـی,

ڕێگەی ئەوان ناگونجێ لە گەڵ سەردەم، ڕێگەی ئێمەش ئەگونجێ لە گەڵ سەردەم، بۆیە زۆربەی خەڵك لەگەڵ ئێمە ئەبێ، ڕای گشتی جیهانیش لەگەڵ ئێمە ئەبێ، پێموایە سەرکەوتنیش هەر بۆ ئێمەئەبێ... پڕ بەدڵ هیوادارم هەمو لە ئاستی ئەو چەمکە تازانە بین‌و ئیش بکەین بۆ ئەوەی بتوانین سەرکەوتن بەدەست بێنین، من حەزم کرد بەڕاستی لەسەر داوای بەشی هۆشیاری‌و ڕۆشنبیری کۆرێکی ئاوا ببەستین بەهیوای لەمەو دوا بەدراسات‌و لەسەر(T.V)لە چەندین کۆڕو بەچەندین نامە تێ بگەین، بتوانین ئەم دۆخە باشتر لەناو خۆمان بەرینە پێشەوە، زیاتر ڕوونی کەینەوە ئەگەر پرسیارێك شتێك هەبێ باقی شتەکان بۆ ئەوە بەجێ ئەهێڵم‌و.. زۆر سوپاستان ئەکەین.

## پرسیار و وەڵامەکان:

پ: عەلمانیەت‌و کۆمۆنیزم هیچ جیاوازیەکیان نییە، هەر یەکن؟

وەڵامی مەلابەختیار: من وتوومە عەلمانی پێش (کۆمۆنیزم) سەری هەڵداوەو لازم‌و مەلزومی یەکتریش نین، ئەو برادەرە حەزدەکەم بچێ باش دیراسە بکا، ڕۆژێك لە ڕۆژان بیەوێ قسە بکەین بیەوێ بابێ کۆمەڵێ سەرچاوەی بدەمێ، بۆ ئەوەی بۆی ڕوون بکەینەوە عەلمانیەت‌وەکو سیستەمێك کە جیاوازە لە گەڵ سیستەمێکی کۆمۆنیزمی، دوو شتی جیان، ئەگەر چی کۆمۆنیزم دژی عەلمانیەت نەبووە، بگرە زۆر شتی هاوبەشی هەیە لەگەڵ عەلمانیەتدا، من نەم‌ووتووە کۆمۆنیزم زانستی نیە، هەڵە لە مەسەلەکە تێ گەیشتووە، ئەبێ‌وورد تر بێ لە قسەکان، هەموو ئەو چەمکانەی عەلمانی بڵاوی ئەکاتەوە سەربەخۆیە، عەقڵی ئینسان ڕزگار ئەکا بۆ ئەندێشە چاکەکانی خۆی.

+ برادەرێك ئەپرسێ، کەمالیەت‌و عەلمانیەت نەهاتووە بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام بەڵکو بۆ دژایەتی کردنی مەسیحی هاتووە...؟؟

کمالیەت دینی لە دەوڵەت جیا کردۆتەوە، دژایەتی دینی بەهیچ شێوەیەك نەکردووە، نەی‌ووتووە دین قەدەغەیە.. ئەوە هەموو مێژووی کمالیەکان بخوێننەوە.. دینیت بڕۆ بۆ خۆت نوێژی خۆت بکە، بچن ئەستەموڵ‌و ئەنقەرە بگەڕێن بزانن لە تەواوی دنیا ئەوەندە مزگەوت هەیە کە لەوێ هەیە.. دینی‌وەکو دیانەت جیا کردووە لە یاساو بەس، ئەوەی کردووە، نەیشی‌ووتووە دیانەت قەدەغەیە.

ئایا عەلمانیەت هەر کۆمۆنیست نیە, تەنها کۆمۆنیستەکان عەلمانی نین؟
من ئەوپەڕی دژایەتی کردنم بۆ ئەمەریکالایەنگری دەوڵەتی عەلمانی بووم, بەڵگەشم هەیە ئەگەر ئەو برادەرانە لێرەن ئەتوانم پیشانیان بدەم, لە کاتێکدا کە زۆر ناکۆك بووم لەگەڵ ئەو چەمکە تازانەی ئێستا کاتی خۆی، لەگەڵ دەوڵەتی عەلمانی بووین, عەلمانیەت ئەمەریکاو ئەمو ئەو نەهێناوە کاکە پێویستی شارستانی بەشەریەت هێناویتی, چەمکەکە خۆی ئەمەریکیو بەریتانیو فەرەنسی نیە.
بەلام ئەوە مانای‌وانی یە کە هەموو عەلمانیەکان وا ئەڵێن, ئەوە قسەی انجلس, مارکسیش هەر لەو قسانەی زۆرە, هەروەها لینینیش، بەلام عەلمانیەکان وەکو ئەوان نین، عەلمانی شتێکی ترە, کۆمۆنیزمیش شتێکی ترە,وەکو من ئەڵێم یەك سیستەمی سەرمایەداری لەدنیادا نیە عەلمانی نەبێ, حەقی وایە ئەو برادەرانەی لەو نەوعە پرسیارانە ئەکەن لەلێکدانەوەکەم تێگەیشتبن، من ئەڵێم: یەك سیستەمی سەرمایەداری بۆ خاتری ئەوان یەك سیستەمی ئیمپریالی لە دنیا نیە عەلمانی نەبێ.. باشە ئەگەروابێ ئەو سیستەمە ئیمپریالیستی یانە کۆمۆنیستن؟ عەلمانیەت شتێکە، کۆمۆنیست شتێکی ترە,حەز ئەکەم ئەو برادەرانە ئەوە ڕوون بێت لایانو باش بخوێننو باشتر لەو دوو چەمکە تێ بگەنو بلاوی بکەنەوە, سوپاسیان ئەکەم.

+ برادەرێك ئەپرسێ: ئایا پێویستی ئیسلامی سیاسی بزوتنەوەیەکی کۆمەلایەتی دروستی نەکردووە..؟؟

لەڕاستیا ئینسان ناتوانێ بڵێ بەشێك لە پێویستی سیاسی یە, من پێم‌وایە ئەو سەلەفیانە قەناعەتی مەزهەبیشیان‌وایە، قەناعەتی مەزهەبی تێکەلاو بە مەرامی کۆمەلایەتی هاتنە سەر حوکمیان بووە, دەستکەوتی ماددیش لە ژیانا بۆ ئەو مەسەلانە لەڕاستیدا کۆمەڵێ شتە پێکەوە هاتووەو بە هەموو شتەکان ئیسلامی ئسولیان دروست کردووە، بابڵێین تەنها مەرامی سیاسی‌وای لێ نەکردووە,قەناعەتی مەزهەبیشیان‌وایە, هی‌واهەیە بەڕاستی قەناعەتی بەو سەلەفیەتە هەیە.. قەناعەتە لەلای من پڕبە دڵ پێم خۆشە بۆ مەزهەبەکەی‌وەکو مەزهەب‌وابێ, بەلام مەزهەبەکەی نەکا بە بەدیلی هەموو ڕێبازەکانی تر, هەمووما‌ن لەژێر پێ دائەنێت,وەکو ئێمە ئەو لە ژێر پێ نانێین, ئەو لە ژێر دەستیش نانێین..

+ ئایا مەلابەختیار ئامادەیە لێرەدا لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیری بزووتنەوە مونازەرەیە بکات؟؟

من لەگەڵ مامۆستا علی باپیر لە ئێران لە بەرچاوی ١٥-١٦ کەس, ڕەنگە(٧) سەعات قسەم ئاوا کردبێ کە ئێستا لە حزوری ئێوە قسەم کردووە.. ڕەنگە شایەتەکانم هەبن لێرە دانیشتبن, لێرە چیم ووتووە لەوێ زیاترم پێووتووە.. پڕ بەدڵ هیوادارم ئەگەر ئەو مەسەلەی شەڕو شۆڕە نەبوایە نەك لەسەر(T.V) شوێنی ئاوا بگرە لە یاریگای وەکو سلێمانی کە هەزاران کەس بێن و قسەی خۆمان بکەین, ئێمە نەلە قسە, نەلە چەمکەکان, نە لە پێویستی یەکان, دوودڵیمان نی یەکە ئەمە ڕاستە, لەبەرئەوە قسەی خۆمان لە هەموو شوێن و کاتێك و لەگەڵ هەموو کەسێك, ئەکەین..

+ خوشکێ ئەپرسێ ئەو مافانەی ئەورووپا بۆ ژن ئێستا چیە..؟؟

من پێم وایە پرسیارەکە پێچەوانە بکرێتەوە باشترە, بلێ ی ئەو مافانەی ماوە بۆ ژن چی یە؟؟ نازانم جارێ ئەو خوشکە ئەورووپای دیووە یا نەی دیووە؟ ئێستا دەبێ ئینسان بپرسێ ژن لە ئەورووپا مافی ماوە نەیەتە دی.. من پێم وایە لە ئەورووپادا لە٩٠٪ ی مافەکانی ژن هاتۆتەدی , بەشێکی زۆری وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوام دیووە, هەندێ لە یاساکانیشم دەربارەی مافی ژن خوێندۆتەوە, ئاگادارم لە کاروباری خەباتی ژنان و ڕێکخراوە دیموکراتیەکانیان. لە ئەورووپا دووشت نابینی کە ئەچیتە دەرەوە: یەکەم نازانی کێ ژنە, کێ پیاوە هیچ جیاوازی ڕەگەزایەتی لە نێوان ژن و پیاو نیە, دووەم: نازانی کێ دەوڵەمەندەو کێ هەژارە، هەمووی وەکو یەك ڕیز ئەبەستن، ئیشی خۆیان ئەکەن، ڕاستە لە بانق لە معاملە دەوڵەمەند دەوڵەمەندێکی زۆرە، بەڵام لە جیاوازی کۆمەڵایەتیدا، لە ژیانی ئاسایی ئەوە نابینی ژن لە ئەورووپا٩٠٪ ی مافی هاتۆتە دی، مافی یاسایی, مافی کۆمەڵایەتی, مافی سیاسی, مافی ئابووری لە ١٠٪ ی ماوە بێتە دی، جا ئەگەر شتێ زۆر زەق بێ لە ئەورووپا بەنسبەت ژنەوە نەهاتبێتە دی, پێم خۆشە خوشکێك یا برایە هەستێ بڵێ ئەوەیە.

+ خاتوو شەمام ئەڵێ لە موچەیا.

ڕاستە لەهەندێ وڵاتانی ئەورووپا معاشی ژن و پیاو جیاوازی هەیە مەسەلەن پیاو ١٠٠ دیناروەرگرێ ژن بەهۆی حاڵەتی جسمی ٩٠ دیناروەرئەگرێ، ئەو جیاوازیە ماوە، ئەوە یەکێ لە کەموکوڕیەکانە.

بەڵام نیسبەتی بێ کاری لەناو ژناوەکو ئێمە نیـە، ڕاسـتە لـە هەنـدێ کارگـەو کارخانە ئەوانە ئەو جیاوازیە ئەبینین. سەرمایەداری توانای جەسـتەییوەکو کـاڵا سەیر ئەکا. چونکە هەتا توانات هـەبێ، هێـزی کاریشت بـەهێزتر ئـەبێ. بـەهۆی پێشخستنی تەکنەلۆژیاوە ئیتروورد‌ەووردە ئەمەش نامێنێ، کۆمپیۆتـەرو ئاسـتی بەرزی تـەکنیکی، بەرهـەم ئـەهێنێ، نـەك تـەنها هێـزی کـار. واتـا: ئایندەیـەکمان بەپێشەکە زۆرتـر زانـستو ئیـدارەو ئـەقڵ دەبنـە هێـزی کـار، نـەك هێـزی بـازوو بەتەنها.

من ناڵێم ئەگەروولاتێکی کوتومت عەلمانی دامەزرێنین بێ غەلو غەش ئەبێ، نەوەی وا ناکەم، پێموایە ئێمەش بەهەمان دەورو زەمەنو بەهەمان دەوری ژیانی سیاسی تێ ئەپەڕین، کەمو کوڕی مان ئەبی، چەوسانەوەمان تیـا ئـەبێ، دزیمـان تیـا ئـەبێ، تالانمـان تیـا ئـەبێ، بـەڵام سیـستەمی عـەلمانی، بەبـەراورد لەگـەڵ سیستەمەکانی تر بەتایبەتی بە بەراورد لەگەڵ سەلەفییەتا، لە سـەردەمی بـەدی هێنانی زۆر ترین خواستەکانی گەل، ئێستا لە ئەوروپا تەنگو چەڵەمە زۆرە، بـێ کاری هەیـە، چەوسـانەوە هەیـە، بـەڵام بەراورد لەگـەڵ پاکستان، عەرەبستان، سیـستەمی عـەلمانی لـەووڵاتی ئـەوروپا یـەکجار دەسـکەوتی گـەورەی لـە چـاو ئەفغانستانو سودانو پاکستان هێناوەتەدی.

پ: ئایا زاراوەی عەلمانی لە بەرامبەر سەلفیەتا دروست بوو..وە کەی..؟؟

سەلەفیەت پێش عەلمانیەتە، عەلمانیەت لە دوای ئەوەی سەلەفیەت حـوکمی کۆنە پەرستانەی خۆی کرد، سەری هەڵدا، ئەتوانین سـەلەفیەت بگەڕێنینـەوە بـۆ سـەرەتای دروسـت بـوونی ئیـسلام، بـۆ سـەرەتای مەسـیحیەت، بـۆ سـەرەتای جولەکە، بەڵام وردە وردە گۆڕانکاری بەسەرا هاتووە، ناو بەناو سەری هەڵداوە، بەهێز بووە، بەڵام عەلمانیەت سەرەتاکەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازیو دروست بوونی دەوڵەتی سەرمایەداری، بـابڵێین سـەردەمی خەباتی دیموکراسی. پاش سەرکەوتنی سیستەمی دیموکراسی، عەلمانیەت زیـاتر هاتە ئارا، یەکەمین جاریش عەلمانیەت لە بەرامبەر کاسۆلیکا سەنگەری گرت.

پ: ئایا عەلمانیەتو دیموکراسی چۆن لەڕووی چەمکەوە جیا ئەبێتەوە؟

لەیـەك جیـا نابێتـەوە، عەلمانیـەت بنـچینەیەکی تـری سـەرکەوتنی دیموکراسیەتە. زادەی گەشەکردنێتی. ئەوەتەی عـەلمانی هاتۆتـە وڵاتـی ئێمـە،

دیموکراسیش هاتۆته وڵاتی ئێمه.. ئەسڵەن چەمکی دیموکراسی لەوڵاتان نەبوای عەلمانیەتیش نەئەهات, هاوشانی یەکتر هاتونەتە وڵات, بڵاوبوونەتەوە, لە سەرکەوتنی کەمالیەکانەوە چەمکی عەلمانی وەکو دەوڵەت هاتۆتە رۆژهەڵات ناوەڕاست, تا ئەگاتە سەر ئەوەی لەووڵاتی ئێمە لە دوای جەنگی یەکەمی جیها عەلمانی , دوو مەسەلە بەیەکیشەوە بەستراون و پێشموایە کاتێك سیستەمێک دیموکراسی ڕاستەقینە ئەچەسپێ لەووڵاتی ئێمە، کە حکومەتەکە عەلمانی ڕاستەقینە بێ.

پ: ئایا سەرهەڵدانی ترسناکترین نەخۆشی ئایدز لە ئەورووپادا... ئایا ئەو پێشکەوتنە؟؟

ئەگەر بچیتە سەر سەرەتای ئیسلامیش لێك بدەیتەوە ئەگەر ئینسان بە مجردی دیاردەیەك بقۆزێتەوەو حوکمی لەسەر بدا, ئەتوانێ هەموو حکومەتەکا مەحکوم بکا. ئەتوانین بڵێین وردە هەڵەو کێشە هەیە بە دابڕاویوەری بگری دەڵێی حوکمێکی خراپە..یان نەخۆشییەك بکەیتە پێوانە ئیتر میللەتەکە لەبەرچاو ئەخەی.

بۆ نموونە سولحی حودەیبیە، صولحی حودەیبیە بۆ کرا, ئەگەر بە مجرد سەیری سولحەکە کەین سەیری توازنی هێزو سەیری توانای ئیسلامو لەشکر ئیسلامو ئەو شتانە نەکەین, ئەڵێی پێغەمبەر مساوەمەیەکی خراپی کردووە دژی ئیسلام بووە, هەر ئەو کاتە کە سولحی حودەیبیەش توقیع کرا, ڕئیس مفاوەزاتی کافرەکان کە هات دانیشت لەگەڵ پێغەمبەر دانیشت ڕێکەوتننامەکەیان تەوقیع کرد، دوو ساڵ شەڕ ڕابگرن, لە بەینی خۆیاندا (گوێ بگرن ئەمە زۆر مهمە بۆ ئەوەی ئەو برادەرانە باش لە سیاسەتو پێکەوە بەستنی شتەکان بزانن) کاتێك هاتن ڕێکەوتن نامەکەیان مۆر کرد، ڕێکەوتن نامەکە هەمووی تنازول بوو لە ئیسلامەکانەوە بۆ کافرەکان ٨٠٪ ی تەنازول بوو ئیسلامەکان مۆریشیان کرد, پێغەمبەر نووسی (محمد رسول الله)ویستی توقیع کا، کابرای ڕئیس وەفدی مفاوەزاتی کافرەکان دەستی گرت وتی: هێواش، چی ئەکەی؟ جا من تۆ بە(رسول الله) بزانم بۆ شەڕت ئەکەم, ئەبێ بنوسی(محمد عبد الله) ووتی ڕاست ئەکەی, نووسی، ئەگەر نەینوسی با ئەیدۆڕاند، ئەو شەڕە ئەدۆڕاند, دوای ئەوە توندڕەوەکانی ئیسلام دژی ڕێکەوتن نامەکە, دەیانگوت

قورئان‌و خـوا لەپـشتی ئێمەیـە, سـەرئەکەوتین بۆ رێکـەوتن نامەکـەت مـۆرکرد، پێغەمبەر گووتی: نەخێر سەرنەئەکەوتین. پێغەمبـەر دڵنیا بـووە کەژێرئەکـەوتن بۆیە رێکەوتننامەی مۆرکردو قبوڵیشی کـرد پێـی نـەگوترێ (پێغەمبـەر) یەکـەمین نامە بۆ یەکـەمین جـار لـەژیانی پێغەمبەرایەتیـدا بـەناوی خـۆی تـەوقیع کرابـێ، ئەوەیە سازشی کرد, خۆ ئینسان ئەگەر بـە دابـڕاوی سـەیری کـا ئـەوە سازشـە، بەڵام تەرازووی هێز لەوێ ئەوەی‌ویستووە, لەووڵاتی ئێمـەش‌و لـەووڵاتانی تـریش کاتێـك دیاردەیـەك بـە مجـردی بکـرێ بـە پێوانـە بـۆ حـوکم دان لەسـەر هـەموو شتەکان, بەهەڵە سەرەنجام گەڵاڵە دەکرێ. نەخۆشی ئایدزیش تەرازووی کێشانی ئۆروپا نیە.

پ: بەڕێز کاك بەختیار بەڕای ئێوە سـەرهەڵدانی اخـوان المـسلمین لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاستا ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە حکومەتە سەرمایەدارەکان بۆ بەرگری لە کاریگەری شیوعیەت‌و دژی ڕووسیا لە ئێران‌و شـەڕی ئەفغانـستان دروسـتیان کرد...؟؟

قسەیەك لەسەر ئیخوان هەیە، مـن ئـەڵێم قـسەیەك هەیـە، وەکـو خـۆی قـسە ئەکەم, گوایە دەستێك هەبووە لە ئەوەڵەوە لە هاندانی اخـوان المـسلمین دواتـر بـۆ دژایـەتی کۆمـۆنیزم هێنراوەتـە پێـشەوە, چـاو پۆشـی یـەك هـەبووە لـە چـالاکیەکانی سـەلەفیەکان لـەکاتی خۆیـا, لـەکاتی گەرمـەی جـەنگی سـاردو سـەردەمی شـەڕی ئەفغانـستان، ئیخوانـەکان بێگومـان‌ووڵاتی‌وەکو سـۆڤیەت‌و ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیان پێ خەتەر تر بوو, لەبەرئەوە هـەم چاوپۆشـیان لێکـراوەو هەم پشتیوانی کـراوون, هـەم چـەك‌و ئیمکانیـاتیش دابـین کـراوە بـۆ ئـەو حرکـە ئیسلامیانە، ئـەوە بـۆ زەمـانی خـۆی ئاسـایی بـووە، وڵاتێکـی وەکـو ئەمـەریکا، یان‌ووڵاتێکی ڕۆژئاوا لەنێوان دوو ناکۆکیا، دوو جەمسەردا سوود لـە ناکۆکـی‌وەر بگرێ لە بەرژەوەندی سیاسەتی خۆی, ئەوە لە جیهـانی سیاسـەتا شـتێکی نـامۆ نیە, بەڵام ئەم ئـسوڵیانەی کـە ئێـستا هـەن، ئەمانـە شـتێکن خۆیـان بـە پـاکترو خاوێنتر لەوانەش ئەزانن، بۆ نموونە هەموو حرکە ئیـسلامی یـەکانی ئەفغانـستان بە هاوڕێی خۆیان نازانن, بە هاوتای خۆیان نازانن, تەنها ئەوەی حیکمتیـار نـەبێ بە گرنگی ئەزانن, باقی یان بەوە نازانن (هاوسەلەفیەتی) خۆیان بن, ئەمانە هەر هەمووی ڕەت ئەکەنـەوە, نەقشبەندی ڕەت ئەکەنـەوە, قـادری ڕەت ئەکەنـەوە,

مەلاكان، هەرچی شێخ و مشایخە هەمووی ڕەت ئەكەنەوە, هەمووی بە كفرو ئیلحاد ئەزانن، كەس نیە بە باشی بزانن،واتە نالی, مەحوی كە هەموو ژیانیان بە دەروێشیو سۆفیو نەقشی بردۆتە سەر, ئێستا ئەوان پێ یان‌وایە ئیسلامی ڕاستەقینە نین، جا ئەمانە مەلا مەحوی بە كافر بزانن, چۆن مەلا بەخیاری پێ كافر نی یە (پێكەنینو چەپڵە لەهۆڵەكەدا)...؟؟

پ: ئایا ڕژێمی عەلمانی مەرجە دیموكراسی بێ..وە بەپێچەوانەوە... ئایا ڕژێمی عێراقو ئێران عەلمانین...؟؟

و: من پێموانی یە ئەم ڕژێمانە عەلمانی بن, بە پێی پێویستیە شارستانیەكەی, نە ڕژێمی عێراق نە ڕژێمەكانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست, ئەمانە عەلمانی نین چونكەووتم سیستەمی عەلمانی بەئاسانی لەوولاتی ئێمە سەقامگیر نابێ, زەمینەكانی بەدیهێنانی عەلمانی دیموكراسی جارێ ماویەتی، بۆ ئێمەش ماویەتیوەكو كورد دیموكراسیەتو عەلمانیەت پرۆسەیەكی دورودرێژە.

هیچ حكومەتێك لە ئەوروپا ناتوانێ دیموكراسی پێشێل بكا, كێ هەیە بتوانێ ئیرادەی ئینسانو ئازادی ئینسان لە ئەوروپا پێشێل كا؟ بەشێوەیەك كە مەسەلەن حكومەتێكی سەلەفی یا حكومەتێكی كۆنە پەرست یا حكومەتێكی دەرەبەگی یا حكومەتێكی دیكتاتۆری, دەتوانن بە پێی بەرژەوەندیان هەموو جۆرە یاسایەك پێشێل بكەن. لە ئۆروپا شتیوانییە، چونكە دیموكراسی بووە بە بەشێكی كولتوری خەڵكەكە, لای ئێمە ماویەتی ڕەنگە ١٥ ساڵ ٢٠ ساڵ ٢٥ ساڵی تر بتوانین لە دنیای دیموكراسی، لە ڕەوشی دیموكراسی، لە ئەركی دیموكراسی، لە ئەقڵانیەتی دیموكراسی، لە دەسكەوتە شارستانی، ڕوناكبیری، مەدەنی، سیاسی، ئەدەبیو ئابووریەكانی دیموكراسی تێبگەینو لێی دڵنیا بین, لای ئێمە دیموكراسیەت ساڵەهای دیكە بە ئەقڵی حیزبو جۆرەها ئەقڵیەت هەڕەشەی لێدەكرێ. پرۆسەی دیموكراسیەت جارێ سەرەتایەو هەتا لە خەم دەرەخسێ, زۆر زۆری ماوە. دیموكراسیەت لە ئۆروپا ڕێسایە، بۆیە عەلمانیەتیش یاسایە. دیموكراسیەتو عەلمانیەت تەواوكەری ئەكترن.

پ: لەسەردەمی دیموكراسی یا خەڵك لەسەر زیرابا ئەژی؟

و: ئەگەر بتوانین نیوەی ڕۆژئاوا دیموكراسی بەدی بێنین، یاسا بچەسپێنین, بیمەی كۆمەڵایەتیو بیمەی تەندروستی, بیمەی انسانی دابین بكەین, زۆر

سەرکەوتوین, بە(٢٠) ساڵی تر نیوەی ئەرکەکە بەدی بێنین من شوکرم, جا لێرەوە من حەز دەکەم تۆزێ ڕوونی بکەمەوە: دوو سێ دەقیقە ڕوونی ئەکەمەوە زۆر نا, من پێموایە ئێستا لە ئەوروپا تەواوی ئەرکەکانی دیموکراسی نەهاتۆتە دی, ئەم قسەیە بۆیە ئەڵێم چونکە خۆمان تا چەند ساڵێکیش لەمەوبەر قسەکانی لینین و مارکس وا تێ ئەگەیشتین لە ئەوروپادا تەواوی ئەرکەکانی دیموکراسی هاتۆتە دی, ئیتر زەمینە خۆشە بۆ ئەوەی شۆڕشی سۆسیالیزم لەوێ بەرپا بکرێ, دیارە ئەم قسەیە بەمەبەست ئەیکەم لێرە...پێم خۆشە بە دیقەت گوێم لێ بگرن.. دوایش مناقەشەی لەسەر ئەکەین، لە فرسەتێکی ترا, ئەرکی دیموکراسی ماوە بێتە دی بۆیە ١٠٪ مافەکانی ژنیان هێشتا نەهاتۆتە دی, بۆیە خەڵك لەسەر جادە ئەخەون, بۆیە جیاوازی لە بەینی کرێکارو سەرمایەداری گەورە، وەکو موچە زۆرە، جارێ عەدالەتی کۆمەڵایەتی لە سویدا باشترە لە دانیمارك, دانیمارکی باشترە لە بەریتانی, بەریتانی باشترە لە ئەمەریکی, ئەمەریکی خراپترە لە ئەلمانی، ئاوەهایە, بۆیە ئێستا ئەرکەکانی دیموکراسی نەهاتتونەتە دی, جارێ ماویەتی یەکسانی کۆمەڵایەتی بەپێی ڕێبازی سۆشیال دیموکرات بێتەدی, هەیە بڵێ ئەوەوانی یە, دڵنیام لێرە دەیان کەس هەن بڵێن وانیە، من لە ڕوانگەی تیۆریەوە قسەیەکیان لەگەڵ ئەکەم, ئەگەر تەواوی ئەرکەکانی دیموکراسی لەووڵاتانە هاتونەتە دی(١٠٠) ساڵ لەمەوبەر هاتونەتە دی، باشە کاتێك قۆناغێك ئەرکە سیاسی یەکانی بەتەواوەتی بهێنێتە دی, بەپێی پراکتیکی مارکسیزم هاتبێتە دی، کەواتە پەیوەندی یەکانی بەرهەم هێنان، دەبێ ببن بە کۆسپ لەبەردەم هێزی بەرهەم هێنان، لەحاڵەتیواش, باری بابەتی بۆ شۆڕشێکی تر کە سۆشیالیزمە پێویستە برەخسێ.. دوپاتی ئەکەمەوە.. کاتێك تەواوی ئەرکە سیاسی یەکانی یەك قۆناغ بەپێ ی پراکتیکی مارکسیزم بێتە دی,واتە: ئەو قۆناغە گەیشتۆتە بنبەست، پەیوەندی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لەووڵاتانەی تەواوی ئەرکەکانی دیموکراسی یان هێناوەتە دی, دەبن بە کۆسپ لەبەردەم هێزی بەرهەم هێنانیووڵاتانی سەرمایەداری, ئەمە دەبێتە مایەی تەقینەوەی ناکۆکی بنچینەیی لەنێوان کارو سەرمایەدا، ئیتر شۆڕشی سۆشیالیستی لە ڕووی بابەتیەوە, دەخولقێ, من خۆم وا لە مارکسیزم تێ گەیشتووم, لە

سۆشیالیزمی زانستی ئاوا تێ گەیشتووم, ئەگەر هەیە بە شێوەیەکی تر تێ گەیشتووە، یا لەسەر قسەکانم بنوسیّ, یا ئەتوانیّ لە کۆڕێکی ترا مناظرە بکەین..ئەگەروایە تەواوی ئەرکەکانی دیموکراسی هاتونەتە دی، وەکو (١٠٠) سالّ لەمەوبەر مارکس‌و ئەنگلس وتویانە, بۆ لە ڕووی بابەتیەوە شۆڕش بەرەو سۆشیالیزم بەرپا ناکریّ. بۆ(١٠٠) ساڵە شۆڕشی سۆسیالیستی سەرناخریّ, هۆیەکەی چی یە, یا ئەو چەمکانە هەڵەن، یان جاریّ ماویەتی تەواوی ئەرکەکانی دیموکراسی بێتە دی, بۆ ئەوەی بەرەو سۆشیالیزم بڕۆین, چۆن بەرەو سۆشیالیزم ئەڕۆین؟ ئەمڕۆ حوکمی لەسەر نادریّ, قالّبی ئەمڕۆ بۆ سبەینیّ ناخوا,وەکو چۆن سەلەفیەتی ڕابردوو بۆ عەلمانیەت ناخوا, قالّبی تیۆری سۆشیالیستی ئەمڕۆش لە دوای ئەوەی ئەرکەکانی دیموکراسی لە ڕۆژئاوا دێنە دی, دوای ئەوەی لەووڵاتانی ئێمەش ئەرکەکانی دیموکراسی دێنەدی، سۆشیالیزم ئەوکاتە بەچەشنایەتیەکی تر ئەخولقیّ, بۆیە ئەو دیاردانەی ئێوە ئەیبینن هۆیەکانی ئەگەڕێتەوە بۆ بەدی نەهێنانی تەواوی ئەرکەکانی دیموکراسی جاریّ.. چاکە..

ئەوروپای ڕۆژئاوا به (٢٠٠)ساڵە شۆڕشی سەرمایەداری لەویّ سەرکەتووە, هێشتا تەواوی ئەرکەکانی دیموکراسی نەیەتەدی، لەولاّتانی لەمەڕ خۆمان دەبیّ چەندمان مابیّ ئەرکەکانی دیموکراسی بەدی بێنین‌و ئەم دیاردە دزێوانەی خۆمان چارەسەر بکەین.. زۆرمان ماوە, زۆرمان ماوە..!

ئەو دیاردانەو دیاردە خراپەکانی ئێمەش کێشەیەکن ڕووبەڕوومان بۆتەوە چارەسەری بکەین, ئەمە پەیوەندی بە بەدیهێنانی تەواوی ئەرکەکانی دیموکراسی‌و ئینجا لەدوای ئەوەش یەکسانی کۆمەڵایەتیەوە هەیە، کە من پێم‌وایە سۆشیالیزم چارەنوسی بەشەریەتە, نەك سۆشیالیزمی(١٥٠) ساڵ لەمەوبەر, سۆشیالیزم ڕۆژگار لە پاشەڕۆژدا بەشێوەیەك دیاری ئەکا کە بەشێکی لە دەوڵەتەکانی ئەسکەندناف جێبەجیّ بووە,ووردەووردە گەشە ئەکاو لەپاشەڕۆژدا ئەوە پەیڕەو ئەبیّ، ئەوەی پێچەوانەی ئەمە بیر ئەکاتەوە، پێم خۆشە سەفەرێکی ئەوروپا بکا، ئینجا تیّ ئەگا ئەوروپا چۆنەو ئەویش چۆن ئەگۆڕیّ..

،: ئایا ئەتوانین لاسایی ئۆروپا بکەینەوە کە ئەوان مەسیحین‌و ئێمە ئیسلامین؟

: مـن شەرحیشم کـرد، وتم: نـاتوانین لاسـایی ئـەوروپا بکەینـەوە، زەمـەنێك هەوڵێکی زۆری ئەوێ بتوانین عەلمانیەت تێکەڵاو بە چەمکەکانی خۆمان، بە لۆژیك‌و ئەقڵ‌و بۆچونی خۆمانی بکەین، زۆری ئەوێ ئەوە.

،: ئەی بۆچی لە تورکیا دا مافی مرۆڤ پێ شێل ئەکا..؟؟

: تورکیـەش‌وەکو ئێمـە بۆچـونەکانی وەرگرتـووە، ڕەنگـە تورکیـە ئەگـەر ئـاوا سەیری بکەین لەمەسەلەی عەلمانیەت‌و لەهەندێ شتا لەوڵاتانی تر باشتر ئـەو نەریتەی هەبێ، سەرەڕای ئەوە تورکیـە داگیرکـەری کوردسـتانە، بـۆ ئـەوەی هیچ کەسێك نەبێ ڕەخنەم لێ بگرێ، دیموکراسی تـەواو نیـە، ئەمـە هـەمووی لە تورکیا هەیە، سەرەڕاش تورکیـا بـەراورد بکـەین لەگـەڵ هەنـدێ لـەوڵاتانی ناوچەکە، پێم‌وایە هەندێ مسائلی دیموکراسی لەو وڵاتە هەیە لـەوڵاتانی ئێمـە بـەدی نـاکرێ.. هۆیەکـەش ئەگەڕێتـەوە بـۆ هێنـدەی عـەلمانی لـەوێ هەیـە، هێندەش لە مەسـائلی دیموکراسـی جێبـەجێ ئـەکرێ.. مەسـەلەی پەرلـەمان هەڵبژاردن، ئازادی تـاك‌و ڕۆژنامەگـەری، هەنـدێ مەسائل هەیـە باشـتر لـەوێ چۆتە پێشەوە، لەگەڵ ئەوەشا مـن پێشتان ئەکـەوم کـە کوت‌ومت پێـوەری دیموکراسی بەسەر تورکیا جێبەجێ نابێ، زۆریشی ماوە ببێ بە دیموکراسـی ڕاستەقینە.

**ێبینی:** ئەم کۆڕە سەعات (٤)ی ئێوارە دەستی پێکرد بـەڵام سـەعات (١)ی نیـوەڕۆ لەهۆڵەکەدا جێگا نەمابوو. ناچار بڵندگۆ برایە دەرەوەی هۆڵەکـە کـە پـڕ بـوو بـوو لـە ئامـادەبووان. هـەروەها هـەمان کـۆڕ لـە: هـەولێر، شـەقڵاوە، ڕانیـەو دهۆکیش، بەئامادەبوونی جەماوەرێکی بێ شومار پێشکەش کرا.

## ئەركە رۆشنگەریەكان و
## ململانێ فكریەكان[+]

دامنابوو لای ئێوە چوار موحازەرە بڵێم, (یەكێك لەسەر عەقڵانی, یەكێ لەسەر رۆشنگەری, یەكێك لەسەر عیلمانیی, یەكێكیش لەسەر مەدەنیەت) كە زۆ زۆر گرنگە باسی بكەم. بەڵام بەداخەوە وایلێهات كە نەتوانم ئەوانە پێشكەش بكەم, ئێستا ئەمرۆ هەندێ قسە ئەكەین, سبەینێیش ئەگەر بۆمان هەبوو یان دو سبەی نازانم چۆن دەبێ بەیانیەكەی شتێك دەربارەوی عەقڵانی و شتێكیش دەربارەی رۆشنگەری ئەوانەش قسەی لێدەكەین.

من جارێ پیرۆزباییەكی گەرم لە هەمووتان لە مەكتەبی رێكخستنیش ئەكە كە كۆڕێكی ئاواتان سازداوە و تایبەتە بە (ئیسلام گەرایی) ئەوە زۆر زۆر گرنگە ئەگەر كاك بەكر خۆشناو شایەتیم بۆ بدا, ئەم خولە پێشنیازی من بوو. ئەمە لە كۆبونەوەیەك لەگەڵ جەنابی (مام جەلال) و پێشم وایە ئەمە دەبێ لە مەكتەبی رێكخستن لەناو بەشەكانی رێكخستندا بەردەوام كاری بۆ بكرێ. ئێمەش لە مەكتەبی رێكخراوەكان بەرنامە و پرۆژەیەكی ئاوامان هەیە دەمێكە بەشێوەی جۆراوجۆر قسە لەو مەسەلەیەدا دەكەین, زۆریش گرنگە هێزەكانی خۆمان كادرەكانمان پڕ چەك بكەین لە بیروباوەڕە عیلمانیەكان بەرامبەر بە (ئیسلامگەرایی) ئیسلامگەرایی لەباتی (ئیسلامی سیاسی) بەكاریدەهێنم, زۆرتر (ئیسلامگەرایی)ەكەم پێباشترە وەك لە (ئیسلامی سیاسی)ەكە.

من پێم وایە وەكو (ی.ن.ك) كە قەدەرمان وایە ئەبێ پرۆژە گەورەكانی مێژو رابپەڕێنین, ئەو پرۆژانەی كە بە باوباپیرانی ئێمە سەردار و سەركردەكانی ئێمە رانەپەڕێنران, دوژمن نەیهێشت خۆیان لەو ئاستەدا نەبوون, ئێمە ئێستا رووبەرو ئەوەین كە دەبێ ئەو ئەركانە هاوشانی خەباتە سیاسیەكەمان راپەڕێنین. یانی

---

[+] دەقی بەشێكە لە موحازەرەیەك كە لە رۆژی (٢٠٠٠/٩/٢٦) لە پەیمانگای كادیرانی مەكتەبی رێكخستن پێشكەشكراوەو لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری مەدەنیەتدا بڵاوكراوەتەوە.

ئەگەر لە مێژووی میللەتاندا و لەناو خەباتی گۆڕانکاری میللەتاندا لـێکۆڵەرەوە و ئـابوریزان و زانـا و دانـای گـەورە هەڵکـەوتووبن, لەسـەردەمی رێنیسانسەوە تـا شۆڕشی بۆرجوازی, تا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا, پرۆژە گـەورەکان لـە دنیـادا ئەگـەر زانـا و دانـا و فەیلەسـوف و ئەندیشمەندەکان پێـشوەخت رایانپەڕانـد لەبەرامبـەر سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا و داوایـی سەرکردەسـیایەکان توانیبێتیـان خەباتی شۆڕشگێڕانە, دیموکراسیانە بەرپا بکەن و, سیستەمێکی دیموکراسی لەو دنیایـە بهێننـە سـەر کـار, ئـەوا بـە داخێکـی زۆرەوە, قـەدەری ئێمـە وا نـەبوو, چارەنوسـی ئێمـە وا نـەبوو, مێـژووی ئێمـە وانییـە, یـانی ئەگـەر ئێـوە مێـژووی ئـەوروپا بخوێننـەوە, بـە وردی وڵات بـە وڵات هەڵیـسەنگێنن دەبیـنین تەمـەنی سیستمە دیموکراسیەکان لە دنیادا دەگاتە (۲۰۰ تـا ۲٥۰) سـاڵێك, بـەڵام تەمـەنی رێنسانس, تەمەنی ئەوەی کە عەرەب پێی دەڵێت (عصر النهظـة) و خۆمـان پێـی دەڵێین (سەردەمی راچەنین) (٥۰۰) ساڵ زیاترە (۲۰۰ تا ۲٥۰) ساڵ پـێش ئـەوەی شۆڕشی بۆرجوازی سـەرکەوێت, پـێش ئـەوەی شۆڕشـی دیمـوکرای سـەرکەوێت, پـێش ئـەوەی سیـستەمی دیموکراسـی سـەرکەوێت, شۆڕشـی فیکـر, شۆڕشـی مەعریفـە, شۆڕشـی رۆشـنگەری, شۆڕشـی ئـەقڵانی لـە دنیـادا لەسەردەسـتی فەیلەسـوفەکان, لەسـەر دەسـتی ئەندێـشمەندەکان, لەسـەر دەسـتی زاناکـان, داناکان, لە هەموو بارەیەکەوە بەهرەمەنـدە گـەورەکان, لـە هـەموو بارەیەکـەوە شۆڕشـی فیکـر لـە سـەردەمی رۆشـنگەریەوە دەسـتیپێکردووە و ئـەو شۆڕشـە کـارلێکی کـرد لەگـەڵ خەڵکـدا, لەبەرامبـەر دینـدا, لەبەرامبـەر سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا, لەبەرامبـەر دەسـەڵاتی سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا, لەبەرامبـەر سەرفرازکردنی چۆنیەتی ئەقڵ لە هەژموونەکانی سەدەکانی ناوەڕاست.

ئـەم (٥۰۰ تـا ۲٥۰) سـاڵی خـەباتی فیکـری و خـەباتی رۆشـنگەری و خـەباتی ئەقڵانییە و خـەباتی سـەردەمی رێنسانـسە بەڕاسـتی زەمینەیـەکی زۆر گـەورەی سـازدا کـە سـەرکردە شۆڕشـگێڕەکانی دنیـا ئاسـانتر بتـوانن بزوتنەوەیـەکی شۆڕشگێڕانە کۆمەڵ رابەرایەتی بکـەن و سیـستەمێك کـە پێـی ئـەڵێن (فیـوداڵی) لەناوبەرن و سیستەمێکی تازە کە پێی ئەڵێن (دیموکراسـی) بـەدیبهێنن, ئەگـەر ئێمە ئەوروپا لەگەڵ خۆماندا بـەراورد بکـەین, خۆمـان لەگـەڵ ئـەوروپادا بـەراورد بکەین, ئەبینین ئێمـە هیـچی ئـەو شـەڕە فیکریـە چارەنوسـسازانەی لـە مێـژوودا کراوە, لە هیچ یەك لەو شەڕانەدا سەرکەوتنمان بەدەست نەهێناوە.

نالێم نەکراوە, نالێم کەس قسەی لە ئەقلانیەت نەکردووە, کەس قسەی لە ڕۆشنگەری نەکردووە, کەس قسەی لە مەدەنیەت نەکردووە, هەتا رادەیەکی کەمیش کەس قسەی لە عیلمانیەت نەکردوە, هیچی ئەمانە نالێم, ئەلێم قسە کراوە لەسەد (١٠٠) ساڵی رابوردوو ئەتوانم بڵێم لە دەرچوانی رۆژنامەی کوردستانەوە, لەسەر دەستی حیزب و رێکخراوە دیموکراتیەکانەوە, ئینجا لەسەر دەستی رۆشنگەرەکانی کوردەوە, رۆشنگەری مێژوونووس, رۆشنگەری سیاسی, رۆشنگەری ئەدەبی, رۆشنگەری رۆژنامەگەری, لەسەر دەستی ئەوانیشەوە, بەشێوەیەك لەشێوەکان, لەژێر کاریگەری ئاڵوگۆڕو گۆڕانکاریەکانی بیری دنیا, تەنویری دنیا, زۆر شت وتراوە, بەلام ئایە ئێمە وەکو ئەورووپیەکان, وەکو ئینگلیز و وەکو ئیسپانیەکان, وەکو فەرەنسی, وەکو ئەمریکی, وەکو ئیتالیا, ئایا ئێمە خاوەن پرۆژەکانی (رۆشنگەری عیلمانی) گۆڕانکارین؟ ئایا ئێمە توانیومانە بیروبۆچونێکی گەورەمان هەبێ لەبەرامبەر بیرە سەپێنراوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست؟ ئەمەمان بووە یان نەبووە؟ پرۆژەی گەورەمان نەبووە, ئەگەر هەولێش درابێت, پرۆژەیەك خەملێنرابێت, گەلالەبکرێت, ئەو پرۆژانە بەهیچ شێوەیەك نەگەیشتنە ئاکام, بە ناکامی سەریان نایەوە و نەیانتوانی ئامانجە مەعریفیەکانی خۆیان, ئامانجە رۆشنگەریەکانی خۆیان, ئامانجە زانستیەکانی خۆیان, لە مێشکی خەڵکدا و, لەناو بزووتنەوەی کۆمەلایەتی گۆڕانکاریەکانی ژیانا بچەسپێنین, ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە کە پەیوەندی (ئۆرگانیکی) ئەرکە سیاسیەکان لەگەڵ ئەرکە رۆشنگەریەکان کە تایبەتمەندیەتی ئێستای خەباتی ئێمەیە, تێی بگەین, تێی بگەین وەکو بەرپرس تێی بگەین, وەکو کادر تێی بگەین, وەکو حیزب تێی بکەین, وەکو دەسەلات و بشزانین کە چۆن بەیەکەوەیان ئەگونجێنین. چۆن بەیەکەوە کار بۆ راپەڕاندنی هەردوکیان بکەین, یانی ئەگەر لە ئەورووپادا ئێستا دەسەلاتێکی سیاسی بوونێت بەخاوەنی ئەزموونێکی (٢٥٠) ساڵەی دەسەلاتێکی دیموکراسی, لەبەرامبەر ئەو دەسەلاتە دیموکراسیەدا فشاری رای گشتی و روناکبیری سەربەخۆ, فەلسەفەی سەربەخۆ, فەلسەفەی تێپەڕین لە قۆناغی دیموکراسی لە ئەورووپادا, بەشێوەی جۆراوجۆر, قسەی لەسەرکرابێ و بەئەندێشەی تازەی سەربەخۆیی روناکبیری بەرخورد لەگەڵ دیموکراسیە (٢٠٠) ساڵەکەی خۆی بکات, من لە ولاتی خۆما ئەمە نابینم, لە کوردەواریدا ئەمە نابینم, لە کوردستاندا ئەمە نابینم؛ ئەگەر سیاسەتمەدارێك

لـەوێ لەسـەر زەمینەیـەك، لەسـەر بنەمایـەك، لەسـەر بنەچـەیەکی دیموکراسـی بیناکراو (ئۆرگانیزمەکرا) لەناو کۆمەڵەکەی خۆیدا ئەزانێ چی لەگەڵ رای گشتی خۆیدا ئەڵێ، ئەزانێ چی لەگەڵ ئەندێشمەندی خۆیدا ئـەڵێ، ئـەزانێ چی لەگـەڵ رۆژنامەگەری خۆیدا ئەڵێ، ئەزانێ چـی لەگـەڵ روناکبیری سـەربەخۆ و رەخنـەی سـەربەخۆی دەرەوەدا ئـەڵێ، ئـەوە بەڵگـەی ئەوەیـە کـە ئـەم دەسـەڵاتە پێشینەیەکی (٢٠٠ تا ٣٠٠) ساڵەی هەیە، یاسای هەیـە، بنـەمای هەیـە، کولتـوری دەسەڵاتی هەیە، شێوە و شێوازی دەسەڵاتی حوکمڕانی هەیە، لەبەرئەوە ئەبینی لەلایەکـەوە رێـسای دەسـەڵات و دەسـەڵاتداری، کولتـوری دەسـەڵات و دەسـەڵاتداری، یاسـای دەسـەڵات و دەسـەڵاتداری، خزمـەتی دەسـەڵات و، دەسەڵاتداری شتێکە، هەروەها لەبەرامبەر دەسەڵاتیشدا، دەسەڵاتەکانی مەدەنی لە رووی روناکبیرییەوە، لە رووی فەلسەفیەوە، لە رووی کۆمەڵایەتیەوە، لە رووی مەعریفیەوە، لە رووی زۆر شتەوە، دەسەڵاتە مەدەنیەکە شتێکی تـرە؛ لـەولاوە دەسـەڵات ئیـشی خـۆی ئـەکات، لـەملاوە روناکبیریش ئیـشی خـۆی ئـەکات، هـەردووکیان لەیـەکیش جیـاوازبن، زۆریـش لەیـەك جیـاواز بـن، هیـچیان نـاتوانن زەرەرێکی گەورە و چارەنوسساز لەیەك بدەن. یاوەکو یەکدی رەت بکەنەوە.

بەڵام لای ئێمە بەهیچ شێوەیەك وا نییە، نـە دەسـەڵاتە سیاسیەکان لـەخۆی دڵنیابووە، نە روناکبیریەکانیش ئەتوانین بڵێین لە هـیچ شـتێك ناترسـین، نـاتوانین بڵێین لە خەم رەخساوین. هەروا ناشتوانن بڵـێن بەتـەواوەتی لـە بەرپرسـیاریەتی سیاسی دابڕاوین، داشۆراوین، و هەقمان بەسـەر ئـەوەوە نیـە کـە ئایـا دەسـەڵاتم هەیە یان دەسەڵاتم نیە، ئەو دەسەڵاتە باشە یان باش نییە، هیچ وانییـە، ئـەوەی بە مـن ئـەکرێت، وەکـو دەسـەڵاتی سیاسـی ئەوەیـە هـەم دەبێـت خـەبات بکـەم دەسەڵاتە سیاسیەکەم لـە لەناوچـون بپـارێزم و پـەرەی پێبدەم و هـەم دەبێـت کارێك بکەم زەمینەکانی سەرکەوتن و پێشخـستن و قـوڵکردنی گیـانی رونـاکبیری مەعریفی لەناو میللەتەکەما قوڵبکەمەوە، ئەوەی لەسـەر روناکبیرێکیـشە ئەوەیـە چەند ئەرکێتی خـەبات بکـات، بۆئـەوەی گیـانی رونـاکبیری ئاسـتی رونـاکبیری و پێویـستیەکانی رونـاکبیری لـەناو میللـەتی ئێمـە باشـتر و زیـاتر بخولقێنـدرێ، لەهەمان کاتیشدا، ناکرێ بەشێوەیەکی ئەوتۆ لە دەسەڵاتە سیاسیەکەی دابـڕێ کە بڵێی من هیچ هـەقێکم بەسـەر دەسـەڵاتی سیاسـەوە نییـە، تـەنها ئیشی مـن ئەوەیە رەخنەی لـێ بگرم، کەم و کوڕیەکانی دەرخـەم. ئـەم دابڕانـە رەهایـە بـۆ

گەلێکی ژێردەستە هەڵەیەکی گەورەیە کە هەم زیان لە ئەزمونی دیموکراسی و هەم زیان لە روناکبیر دەدا.

لێرەوەیە زۆر بە گرنگی دەزانم کە سەرنجی ئەو راستیە راکێشم کە لای ئێمە نە دەسەڵاتی سیاسی ئەتوانێ خۆی بێباك بکات بەرامبەر بە مەسەلەی روناکبیری، نە روناکبیر ئەتوانێ خۆی بێباك بکات بەرامبەر بە دەسەڵاتی سیاسی، هەردووکیان دوو ئەرکی گەورەی رانەپەڕێندراوی مێژووییان لە ئەستۆدایە، کە دەبێ بەشێوەی جۆراوجۆر، بەڵام هێشتا پێکەوە بەستراوە لەناو یەك بازنەی مێژوودا رابپەڕێنن.

بۆیە لێرەوە ئەڵێم: ئەمەیە کە ئێستا قسە لە هەموو ئەو مەسەلانەی ئەکەین، ئەو مەسەلانەی کە لە ئەوروپادا وەکو وتم (٥٠٠) ساڵ لەمەوبەر قسەی لێکراوە (٣٠٠) ساڵ لەمەوبەر بەتەواوەتی خەملێنراوە و بوە بە رای گشتی جیهانی، بەداخێکی زۆرەوە ئەگەر مێژووی خۆمان ئەخوێنینەوە، ئەگەر لێی وردبینەوە، سەیرئەکەین لێرەولەوێ، لەم رۆژنامە و لەو گۆڤار، لەناو ئەم گروپ و لەناو ئەو حیزبەدا، لەسەر ئەو مەسەلانەی لە ئەوروپا باو بوو، قسەی لەسەر کراوە، بیروڕاش دەربڕاوە، رۆشنیشکراوەتەوە، رەخنەشی لێگراوە. بەڵام هیچیان، پرۆژەیەکی تەواوی سەرکەوتوو نین و ناشتوانین، ئێستا پشت بە مێژوویەکی سەرکەوتوی پرۆژە جیاوازەکانی ئەقڵ و ئەقڵانیەت ببەستین، پشت بە زانست و عیلمانیەت بپەستین، پشت بە پێشینەیەکی مەدەنی و مەدەنیەت ببەستین، هیچی ئەوانە ناتوانین بڵێین پرۆژەیەکی گەورەمان هەیە و ئەم پرۆژەیە هەریەکە لە ئاست خۆی چۆن لە ئەوروپا سەرکەوتنی بەرامبەر دوژمن و کۆسپ و تەگەرەکانی خۆی و نەیارەکانی خۆی بەدەست هێناوە، ناکرێ لەلای ئێمە بڵێین هیچ یەکێك لەو رەوشانەی مێژوو، توانیویەتی سەرکەوتنی گەورەی پرۆژەکانی خۆی لەبەرامبەر دوژمنە گەورەکانی پێش پرۆژەکانی رۆشنگەری، بەدەستهێنابێت.

یەکێك لەو شتانەی کە ئێستاش مشتومڕی لەسەرە، و ئێستاش هەموو حیزبە عیلمانیەکان، هەموو حیزبە چەپەکان، هەموو حیزبە دیموکراسیەکان، جارێك وەکو پێویست لە بەرنامە و ستراتیژی خۆیاندا نەیانچەسپاندووە، مەسەلەی عیلمانیەتە، عیلمانیەت مەسەلەیەکی زۆر گرنگە کە جارێ نەچەسپێندراوە لای ئێمە، جارێ ئەسڵەن وەکو جیهانبینیەکی لێبڕاو، وەکو جیهانبینیەکی رادیکاڵ

هـەتا لـە بەرنامـەی (ی.ن.ك) نـابینی بەرنامەیـەكی عیلمـانی لیبڕاو كـە بـابلێین لەبەرامبەر پرۆژەكان لەبەرامبەر خیتابەكانی دژەكانی عیلمانیەت, ئێمـە خیتـابی عیلمانیەكی لیبڕاوی گەلاڵە كراوی دامەزراومان نییە, تا ئێستا حیزبـەكانی تـریش هەروەكو ئێمە لە ئێمەش خراپترن, لەمێژووشدا هەر وابووە بچن مێژووی حیزبـی شیوعی بخوێننەوە, مێژووی پارتی بخوێننەوە, مێژووی هەموو حیزبەكانی پـێش پـارتی و شـیوعی و دوای پـارتی و شـیوعی بخوێننـەوە, سـەیركەن زەرورەتـی سسیستەمێكی عیلمـانی و پـرۆژە و سـتراتیژی عیلمـانی, تێكـەڵاو بـە مەسـەلە دیموكراسیەكانی لای ئێمە نەكراوە. بۆ؟ لەبـەر دوو هـۆ: هۆیـەكی ئەوەیە لـەلای ئێمە شۆڕشی پیشەسازی بە مانا فراوانەكـەی سـەركەوتنی بەدەست نـەهێناوە, لەلای ئێمە چ وەكو قەوارەی عێراق چ وەكو كورد, وەكو خۆی نەمانتوانیوە لەناو خۆمانا پێویستیەكانی سەركەوتنی شۆڕشێكی پیشەسازی بۆرجوازی گـەورە كـە لە ئەوروپادا, هەبووە لەناو ئێمەدا سەرنەكەوتووە.

دووەمیشی ئەوەیە, كە بەڕاستی لە ولاتێك شۆڕشی بۆرجوازی یاخود با بلێین پیـشەسازی وەكـو شۆڕشـێكی گـەورە سـەركەوتن بەدەسـت نـەهێنێ, بێگومـان سیـستەمی دیموكراسـی و ڕێبـازی دیموكراسـیش لـەناو میللـەتێكی وەكـو ئـەو میللەتانەی كە ناتوانێت شۆڕشـی تەكنـەلۆجیا لەناوخۆیـدا, سـەربخات, ناتوانـێ ڕێبــازە دیموكراســیەكەش لــەناو خۆیــدا بخــەملێنێ و بیكـا بـە مەسـەلەی چارەنوســساز, بۆیــە ئـەبینی هەمیـشە لـە خەباتمانـدا, لـە لـە داڕشـتنی ســتراتیژیەكانمانا بــە درێــژایی ســەد (١٠٠) ســاڵی رابــوردوو هــەم مەســەلەی تەكنەلۆجیا و گۆڕانكـاری مەسـەلەی گـەورە لـە ولاتـی ئێمـە لاواز بـووەوە, هـەم چۆنیەتی بەرخۆدمان لاواز بووە لەگەڵ دیموكراسی, بەڕاستی زۆر زۆر لاواز بووە, ئەگـەر سـەیری مێـژووی سـاڵی (١٩٧٥) كـە مێـژووی دامەزرانـدنی یـەكێتی و لەوەبەدوا شۆڕشیشە, دەبێ زۆری قسە لەسەر بكـەین, و دەبێ قوڵیبكـەین, و پـەلوپۆی پـێ بهـاوین لەگـەڵ هـەموو شـتەكان و تـەكامولی پـێ بكـەین, لەگـەڵ سیستەمی دیموكراسی و مەسەلەی عیلمانیە نە بەڕاسـتی مەسـەلەی عیلمانیـەت مەسەلەیەكی ئێجگار ئێجگار گرنگە.

لە لاوازی كولتوری مێژوویی دیموكراسی ئێمەوە, لە باش پێكـەوە گرێنـەدانی كولتوری دیموكراسی بە مەسەلە عیلمانیەكانی ئێمەوە, سەیرێكـەی تـا ئێـستاش لــە دوای روخانــدنی ئیمپراتۆریــەتی عوسمــانی و لەوەوپێــشیش روخانــدنی

ئیمپراتۆریەتی سەفەوی، وەکو دوو دەسەڵاتی دینی گەورە ئێستاش کاریگەری (ئیسلامگەرایی) لە کوردەواریدا بەهێزە و ئێستاش زەمینەی تۆو وەشاندنی هەرجۆرە حیزبێکی تازەی ئیسلامی بێنینەپێشەوە، زەمینەکانی هێشتا بۆ ئەوان لەبارە و بەئاسانی هێزە تازە (ئیسلامگەراییەکان) دەتوانن هەزاران کەس لەخشتەبەرن، ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە، مەسەلەیەکی گرنگە لە وڵاتی ئێمەدا (١٩١٨) دەوڵەتی عوسمانی نەماوە و دەوڵەتی دینی بە مانای دەوڵەتە دینیەکەی نەماوە و ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا، ئەبینی، حیزبێك لە سێ چوار ساڵدا دروست ئەکرێت رێژەیەکی وا دەهێنێ لە دەنگدان قابیلی باوەڕو قابیلی تەسەور نییە، لەگەڵ حیزبێکی تێکۆشەری قوربانیبەخش کە زۆر لەپێناوی گەل ماندووبووە. بنج و بنەوانی لێکدانەوەی ئەم راستییە ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ئێمە چۆنمان مامەڵە لەگەڵ دیموکراسی کردووە و، چۆنمان بنەماکانی دیموکراسی تۆکمەکردوە و چەندیش پێشمانخستووە، بۆئەوەی رووبەری خەباتی (سیاسی – ئیسلامگەرایی) تەسك تر بکەین، چەندمان تەسك کردەوە؟

ئەوە مەسەلەیەکی گرنگە، من پێم وایە کەممان روبەری دینی و رۆحی ئیسلامگەرایی‌تەسك کردەوە، کەم فشارمان بۆ بیروڕای سەدەکانی ناوەڕاست بردووە، ئێستاش دەرکی خەباتردن و ململانێکردن لەگەڵ بیروڕاکانی سەدەکانی ناوەڕاست لەلای ئێمە زۆر لاوازە، تەنانەت لێپرسراو و کاربەدەستە گەورەکانیش زۆرن خۆیان لە قەرەی ئەرکی وا نادەن. هەربۆیە دەبینی هەژمونەکانی سەدەی ناوەڕاست بەتایبەتی هەژمونگەری ئایینی و لە ئایینەکانیشدا هەژمونگەری ئیسلامی (ئیسلامگەرایی) لای ئێمە زۆر زۆر بەهێزە، بەڕاستی هێندە بەهێزە، حیزبێکی تازە دامەزراو ئەتوانێ سەرنجی هەزاران کەسی موسڵمان بۆ لای خۆی رابکێشێ. لەبەرامبەر ئەمەدا ئێمە چ بکەین؟ چۆن بکەوینە کار؟ چ پرۆژەیەکمان هەبێت؟ ئەمە پرسیارە هەرە گرنگەکانن کە دەبێ بەڕاستی لەسەری بوەستین، بەجدیش لە ریزەکانی (ی.ن.ك) و لە دام و دەزگاکانی ئێمە بەدوای وەڵامەکەدا بگەڕێین، ئەبێ پرسیارە گەورەکان بکەین و بەدوای وەڵامە گەورەکاندا بگەڕێین؛ پێشبینی بکەین.

بۆ ترساندن نایڵێم، من پێم وایە ئیسلامی سیاسی لە وڵاتی ئێمە ٥٠٪ رەنگە زۆر شت هەیە بەسەرمانا بیسەپێنێ، ئەگەر قبوڵیشی نەکەین لەوانەیە شەڕی زۆر قورستر بکات، کە لە هەڵبژاردنی پەرلەماندا، رەوتە ئیسلامگەرایی توانییان پێکرا

(٠٥٪) ی دەنگ بهێنن, دوای ئەوە لە خۆیان راپەڕمون شەرمان بکەن. من دەپرسم, ئەگەر لە (٥٠٪), واتە نیوەی دەنگەکان بهێنن چی دەکەن؟ ئاشکرایە چی دەکەن!

ئێمە دەبێ کارێك بکەین لەباتی ئەوەی شەڕی عەسکەری بێت, پێشئەوەی شەڕی عەسکەری بێت, دەبێت شەڕی مەعریفی بێت, شەڕی فەلسەفە بێت, شەڕی یاسا مەوزوعیەکانی ژیان بێت و شەڕی پرۆژە گەورەکان بێت, کە بەداخەوە بووە بە قەدەرێك لە قەدەری ئێمە, دەبێت ئیش بکەین بۆ ئەو پرۆژەیە, ئەمە مەسەلەیەکە زۆر زۆر گرنگە, حەقی وایە کادیر و هەڤاڵی ئێمە, ئۆرگانەکانی ئێمە, وانەزانن لە شۆڕشدا سەرکەوتنمان بەدەستهێناوە ئیتر بێخەم و خەمسارد دەتوانین دانیشین. ئیتر هەمووشتێکمان بڕیوەتەوە, بەدەسەڵاتی سیاسی کۆتاییمان بە خەباتمان هێنابێ و هیچ پەیامێك و پەیمانی ترمان لەژیاندا نەماوە. نەخێر ئێمە ئێستا ئامانجی گەورەترمان لەسەرشانە, خەباتی شۆڕش ئەرکی تایبەتی هەیە و خەباتی شاریش ئەرکی زۆر زیاتری هەیە. باوەڕتان هەبێ لە دۆڵێکدا بووین بە (٣) سێ کەس ئەچوو بەڕێوە, باشە هەموو ئەو دامودەزگایانەی کە ئێستا ئەیبینیت, هەمووی زیادە بوو بۆ ئەو شۆڕشە, قەد جێگای نەئەبۆوە لەوێ, بە سێ کەس ئیزگەیەکمان هەبوایە, تۆزێ پارەمان هەبوایە, بە چوار نوسەر هەموو ئەو شۆڕشە بەڕێوەئەچوو, خۆ ئێمە هەموومان مەسئولی مەڵبەند بووین, هەموو سلێمانی هەتا ئەگاتە خانەقین و گەرمیان و قەرەداغ و هەتا ئەگاتە ناوچەی هەڵەبجە, مەڵبەندێك بوو من لێی مەسئول بووم, یەکەم مەڵبەند کە دامەزرا من بەڕێوەم بردووە, لەشاخدا ئیشی شاخ چی بوو, هەرگیز ئەرکەکانی وەکو ئێستا قورس نەبون, کەسێك کە ئەزموونی هەبوایە و ئەقڵی بەدونییا بشکایە و بیزانیایە کە چۆن هێزی پێشمەرگە ئیدارە ئەکا و لە مانگێکدا سی – چل شکاتی جوتیاریش ئەهاتە لامان بە ئاقڵی بمانکردایە و تۆزێ ئازوقەمان پەیدا بکردایە بۆ پێشمەرگە و بە نانەسکی ئیشی خۆمان ئەکرد, بەڵام ئێستا وا نییە, لە فەراشێکەوە لە زێرابێکەوە, لە پرۆژەی گەورەوە, لە مووچەشەوە لە خانەنشینەوە, لە راگەیاندنەوە, لە پیشەسازیەوە, لە تاقیگاوە, لەخەستەخانەوە, لە نەخۆشەوە, هەموو ئەو شتانە ئەرکی سەرشانی ئێمەیە تۆ ئەبێ لە هەموو ئەم بوارانەدا ئیش بکەی بۆنەوەی ئاستی میللەتەکەمان, ئاستی مرۆڤەکان و ئەقڵەکانمان, لە ئاستی گۆڕان و گۆڕانکاریەکان ببەینە پێشەوە و ئامادەی بکەیت بۆ شەڕە گەورەکان, ئامادەی بکەی بۆ قبولکردنی بڕیارە

گەورەکان، بڕیارێکمان داوە بڕیاری (٥٩) بۆ گۆڕینی ئەحوالی شەخصی، یاسای ئەحوالی شەخصی (٦) دانە مانگ ئەم گۆڕینی ئەحوالی شەخصیە هێنراوە و براوە، ئایا قبوڵ ئەکرێ، کۆمەڵەکەمان قەبوڵی ئەکات یان نایکات، ئیسلامی قبوڵی ئەکات یان قبوڵی ناکات (چەندین جار ئەم پرۆژەیە دەستکاری کراوە و لێك دراوەتەوە هەتا بەو نیوەچڵیەش تەشریع کراوە، بۆ؟ لەبەرئەوەی روبەڕوی وەرگتنی بڕیاری یاسای ئاوا لەناو وڵاتی ئێمە بەرتەسکە، جارێ چەند یاسا و بڕیاری وا لەبەر دەممانە ماوە بتوانین بەئاسانی بیچەسپێنین، زۆر شتی وا لەبەردەمی ئێمە ماوە جارێ نەمانکردووە.

باشە تۆ ئەبێ ئەمانە بکەی یان نابێ بیکەی؟ ئەبێ دیموکراسیەکی عیلمانی بی و ئەو ئەرکانەی دیموکراسیەت و عیلمانی لە هەموو بارەیەکەوە، لە تۆی ئەوێت رای بپەڕێنی یان نەء؟ ئەگەر دیموکراسیەتمان بۆ رواڵەتی سیاسەتە بۆ رۆژبردنەسەرە، بۆئەوەیە لە فلان لایەن یان فیسار لایەن باشترین، با بزانین، ئەگەر دیموکراسیەتی عیلمانیش مەبدەئە و قۆناغە و ئەرکە و دەبێ رابپەڕێ، دەبێ هەموو شەڕەکانی لەسەر بکەین، ئەگەر نەیکەی خۆ دوژمن لەسەرت ناوەستێ، هیچ لایەك نە خاترمان دەگری و نە تەرحی سیاسیمان دەداتێ. کە مەسەلە هاتە سەر شەڕی چارەنوسساز، شەڕی دەسەلات، دەسەلات خۆی لە خۆیدا دەعبایەکی عەجایەبە، ئەوەی بۆی بکرێ دەسەڵاتی لێوەردەگرێتەوە تۆش پێت بکرێ نابێت دەسەڵات بەیت بە کەس، بەڵام جیاوازیەکانی ئێمە لەگەڵ لایەنەکانی تر لەچیدایە، لەوایەیە کە ئێمە بۆ سەرخستنی پرۆژە گەورەکان، قۆناغی دیموکراسی لە هەر بارەیەکەوە ئەبێت ئەرکەکانی راپەڕێنین. ناکرێ هیچ ئەرکێکی دیموکراسی فەرامۆش بکەین. لایەنی دیکەش هەیە هەموو ئەرکەکان نابینێ. هی واش هەیە، دیموکراسی تەنها بۆئەوە ئەوێ دەسەڵات بگرێتە دەست. پاشان دیموکراسی سەرکوت بکا. شەڕی سەرخستنی دیموکراسی و ئازادی، سەختە. خۆمان بەپێی قەبارەی سەختی شەڕەکە پێویستە ساز و ئامادە بکەین.

سوپاس

# ئازادیو مەدەنیەتو پێگەیاندنی لاوان (+)

سوپاس بۆ ڕێکخراوی ئازادیی لاوان بۆسازدانی ئەم دووکۆڕەیان. سوپاسیش
ۆ ئێوە کەماندووبوون, هیوادارم ئەم کۆڕەو کۆڕەکەی برای خۆشەویستم کاك
ئازاد جندیانی)سودێك بەئێوەی ئازیز بگەیەنێ؛ ڕێگایەك رونتربکات بۆئەوەی
ەپێناوی ئازادی و مەدەنیەتو کاری گەرییان لەسەرپێگەیاندنی لاوان باشتر بێ؛
ۆ ئێوەوئێوەش وەك لاوان, وەکو کادر, وەکو هەڵسوڕاو, لەناو ڕێکخراوی
ئازادیلاوان بتوانن لەناو کۆمەڵێکی دواکەتووی مەدەنیەت بەدی نەهاتووی وەکو
کوردەواری, ئەرکی خۆتان باشتر بەدی بێنن، تەمەنەکانتان زۆر جیاوازە, پیاو
ەزدەکا لەشێوەی قەسەکردن بۆتان لە١٢ساڵەوەی تێدایە تا ٣٠ساڵ...
یوادارم ئەگەر تۆزێ قسەکانم سادەکەم, یان جاریوا هەیە تۆزێك لەسادەتر
ەرەو سەرەوە قسەبکەم, هەموری بۆئەوەیە ئێوەتێبگەن...بەتەمەنی
جیاوازتانەوە کە دانیشتون.

پێش ئەوەی بچمە ناو بابەتەکەم کە کاریگەری ئازادییو مەدەنیەت لەسەر
پێگەیاندنی لاوان چیە؟ پێم باشە روون کردنەوەیەك لەسەر خودی ئازادی, ئینجا
روونکردنەوەیەك لەسەر خودی مەدەنیەت, بدەم, بۆئەوەی ئەو دوودەرگایە,
ەڕووی روناك بیرییەوە, لەڕووی بیروبۆچوونەوە, بکەمەوە, لەودوو دەرگایەوە
بچینە ناوئەوەی کەلاو چۆن ئەکرێ لەدنیای ئازاد, یان لەناو مەدەنیەتدا
پێبگەیەنرێ.

---

(+) کۆڕێك لەهۆڵی دیالۆگی مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکان (٢٠٠١/٨/٦)، لەژمارە(١٢)ی گۆڤاری (مەدەنیەت)دا بڵاوکراوەتەوە.

## ئازادی مافێکی سروشتییه

ئـــازادی مـــافێکی سروشـــتی مرۆڤـــه, کـــه‌هیچ فه‌یله‌ســـوفێك, بیرمه‌نـــدێك, ده‌سه‌ڵاتێك‌و هیچ که‌سێك له‌دنیادا ناتوانێ شانازی به‌وه‌وه‌بکا ئازادی‌به‌خشیبێته مـرۆڤ. زۆرکـه‌س هه‌یـه لـه نوسـه‌ر و لێکۆڵـه‌ر, له‌بیرمه‌نـد و فه‌یله‌سـوف, قسه‌ی له‌ســه‌ر ئــازادی‌کردووه، هه‌نـدێك پێیــان وایــه ئــازادی فه‌لـسه‌فه‌یه‌کی دانـراوه؛ ســـه‌رئه‌نجامی پێویـــستیه‌کانی ژیـــان داهێنـــراوه و به‌ره‌بـــه‌ره ئازادی‌تێکـــه‌ڵاو به‌خواسته‌تایبه‌تی‌و گشتی‌یه‌کانی مرۆڤ‌و کۆمه‌ڵ بووه، ئه‌م بۆچوونه بۆچوونێکی ناڕاسته...یـان به‌شێوه‌یه‌کی تـر روونـی بکه‌مـه‌وه: هـه‌ن پێیـان وایـه ئه‌وه‌تـه‌ی بیرکردنه‌وه‌ی مرۆڤ پێشکه‌وتووه, کرانـه‌وه‌و هه‌سـتی هوشـیارانه‌ی مـرۆڤ ده‌سـتی پێکـردووه, ئه‌مانـه پێیـان وایـه له‌وکاتـه‌وه مـرۆڤ هه‌سـتی کـردووه کـه ئـازادی پێویـسته, له‌وسـاوه بـیری ئـازادی هاتۆتـه پـژاوه. ئه‌مـه بۆچـوونێکی زۆر زۆر ناڕاسـته, بۆچـوونه ڕاسـته‌که‌ی ئه‌وه‌یه کـه‌مرۆڤ ئه‌وه‌تـه‌ی خولقاوه ئازادیـشی له‌گـــه‌ڵاخولقاوه, به‌پێـــچه‌وانه‌شه‌وه, ئه‌وه‌تـــه‌ی مـــرۆڤ بـــیری کردۆتـــه‌وه‌و بیرکردنه‌وه‌کـــه‌ی تێکـــه‌ڵاو بـــه ئامرازه‌کـــانی به‌رهـــه‌مهێنان, په‌یوه‌ندییـــه‌کانی به‌رهـــه‌مهێنان و چه‌وســـێنه‌ر و چه‌وســـاندنه‌وه‌ی ئینـــسان بـــووه.. له‌وســـاوه به‌پێـــچه‌وانه‌وه, پێ‌بـــه‌پێی قوڵبوونـــه‌وه‌ی بیرکردنـــه‌وه‌ی مـــرۆڤ بـــۆ چـــۆنیه‌تی بـــه‌کارهێنانی مـــرۆڤ ئـــازادی به‌رته‌ســـك بـــووه و ئـــازادی لـــه‌ئازادی ئینـــسان سه‌نراوه‌ته‌وه..بۆیه ئه‌وبۆچوونه زۆر ناڕاسته که‌پێی وایه ئه‌وه‌تـه‌ی مـرۆڤ بـیری کردۆته‌وه, مرۆڤ توانیوێتی ئازادی‌به‌دی بێنێ, یان بیر لـه‌ئازادی بکاتـه‌وه؛ پـێش ئـه‌وه‌ی مـرۆڤ بیربکاتـه‌وه لـه‌ئازادی, مـرۆڤ ئـازادبووه له‌ژیانـدا؛ واتالـه‌ژیانی سه‌ره‌تایی‌وه سه‌ره‌تاکانی ژیانی ئاده‌میزاد ئازاد ژیاوه. هیچ له‌مپه‌رێك له‌بـه‌رده‌م ئازادی‌ئینـسان نـه‌بووه؛ نه‌له‌مپـه‌ری کۆمه‌ڵایـه‌تی, نه‌له‌مپـه‌ری سروشـتی, نـه له‌مپـه‌ری ئـابووری, نه‌له‌مپـه‌ری چـینایه‌تی,نه‌له‌مپـه‌ری مه‌زهـه‌بی,نه‌له‌مپـه‌ری فه‌لـسه‌فی. ته‌ماحـه‌کانی ئینـسان به‌رامبـه‌ر چـۆنیه‌تی ده‌سـت به‌سـه‌راگرتنی بچوکترین تاگه‌وره‌ترین شت، هیچی ئه‌و له‌مپه‌رانه هیچیان نه‌بوون.

لـه‌ورۆژه‌وه‌ی بیرکردنـه‌وه لـه مه‌زهـه‌ب, فه‌لـسه‌فه, بیرکردنـه‌وه لـه‌ژیان, بیرکردنـه‌وه له‌ڕێکخـستنی کۆمـه‌ڵ، بیرکردنـه‌وه له‌به‌رهـه‌م هێنـان، بیرکردنـه‌وه له‌به‌کارهێنانی باشتری سروشتی خولقاوه هاتۆته ئارا، له‌ورۆژه‌وه ئیتر چۆنیه‌تی

سنوردانان بۆئازادیش دەستیپێکردووە؛ بەپێچەوانەشەوە, لەدوای هەزاران ساڵ, کاتێك مرۆڤ گەیشتە ئەو باوەڕە, کە ئازادیەکانی لێ زەوتکراوە, دوای ئەوە تێکۆشراوە وردە وردە تەنگ بەچەوسانەوە هەڵبچنرێ, تەنگ بەئەندێشەو بیروڕا خراپەکان هەڵ بچنرێ, لەوساوە وردە وردە ئازادی زەوتکراوەکەی دێرینەی وەرگرتۆتەوە, هەتا گەیشتۆتە ئەو هەلومەرجەی کەئێستا لەدنیای پێشکەوتندا بەشێوەیەکی زۆرفراوان بیر لە ئازادیئەکرێتەوەو لەولاتانی ئێمەشا, وردە وردە خەریکین باشترو کاریگەررتر بیر لە ئازادیئەکەینەوە. کەوابێ: چڕکردنەوەی قسەکانم ئەوەیە ئازادی و مرۆڤ دوانەیەکن پێکەوە لەدایك بوون, لەناویەك منداڵدانی پێویستیەکانی مرۆڤ لەدایك بوون. ئەویش منداڵدانی پێویستی بەئازادیی‌و بەئاسودەیی ژیانی مرۆڤ بووە, کەهیچ جۆرەکاریگەریەکی لەسەر نەبێ. هیچ جۆرە چەوسانەوەیەکی لەسەر نەبێ. هیچ کەسێ بۆی نەبێ مرۆڤ بەکاربێنێ بۆهیچ مەرامێکی خۆی, هیچ مەزهەبێك, هیچ دینێك, لەژێر پەردەی هیچ شتێکا، لەئازادیمرۆڤ شتێ پیرۆزتر نەبێ لەسەر زەوی، ئازادیمرۆڤ ئاوا خوڵقاوە، کورتیەکەی ئازادی یەکێکە لەپێویستیە هەرەچارەنووسسازەکانی مافە سروشتیەکانی مرۆڤ, بەڵام پاشان, یاسا دانراوەکان, مەزهەب و ئاینەکان, پەیوەندی بەرهەمهێنان و موڵکداریتی, ئازادیان لە مرۆڤ زەوتکردوە. ئەگەربێتو مرۆڤ ئازاد نەکەین لەهەموو ئەو کاریگەریانەی رۆژگار لەسەر مرۆڤی دانا، بێگومان مرۆڤ ناتوانێ وەکوخۆی ئازادانە بیربکاتەوە. بڕیاربدا بژی, ئارەزووەکانی, خولیاکانی, خەمەکانی, خواستەکانی بەدی بێنێ.

من ئەم قسانە لەخۆتانەوە ورد دەکەمەوە, ئێستا لەدێرزەمان ئەگەڕێم دێمەسەرخۆتان, یەکە بەیەکە قسە لەگەڵ خۆتان ئەکەم؛ هەموویەکێ لەئێوە کەدانیشتوون, لەکەم تەمەنتان تازۆرترین تەمەنتان کەلێرە دانیشتوون, کێتان هەیە ئێستا لێرە دانیشتبێ, کچ بێ یان کوڕ, ئەگەرخۆی خاوەن دەسەڵاتی خۆی نەبێ, ئێستا بیرلەوەنەکاتەوە کە درەنگ تر بڕوا بۆماڵەوە محاسەبەی ئەکەن, باوەڕناکەم کەستان هەبێ لێرە لەمێشکی خۆیا ئاوا بیرنەکاتەوە. مەگەر ئەوانەی لێرە خۆیان ژنیان هەیەو ترسیان نیەیە, یان کوڕی گەورەی ماڵن کەس دەسەڵاتی بەسەریان ناشکێ, یان ژنی بەدەسەڵاتی ماڵن کەس ناتوانێ بڕیارێکیان بۆبدا، کەمن پێم وایە کەمترین ژن هەیە لەوڵاتی ئێمەدا ژنی دەسەڵاتداری ماڵ بێ, کە کەم کەس هەبێ بتوانێ زاڵ بێ بەسەریا. هەر خۆتان

ئێستا بیربکەنەوە هەموو یەکێ لە ئێوە ترسێك لەدڵیدایە خواخوایەتی ئەم کۆڕە زووتەواوبێ. یاخوا نەگاتە شەو نەکابرۆمەوە کاکم لێم بدا, باوکم لێم بدا, خاڵم لێم بدا, پوورم لێم بدا, لێم تووڕەبێن. هەموو یەکێ لەئێوە شێوەیەك لەشێوەکانی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لەمێشکیا هەیە؛ ئەمەیەك, دووەم: بچنەماڵەوە ئێستا لەماڵەوە چەندلەئازادیئێوە زەوت ئەکرێ, چەند لەئازادیخوێندنەوەی ئێوە زەوت ئەکرێ, زۆرجار بەپێچەوانەشەوە. چەند لەبڕیاری دوور لەخواستو خولیای ئێوە ئەسەپێنرێ بەسەرتانا, نابێ رەفیقی ئەم بی, نابێ بچنە ئەو کۆڵان, نابێ بچێتە ئەم یاری, نابێ بچێتە ئەم مەکتەب, نابێ ئەم دەرس بخوێنێ, ئەبێ ئەم حیجابە والەسەرکەی, ئەبێ ئەم عەبایە بپۆشی, جۆرەها ممنوعەو عەیبەو حەرامە لەدایکەوە بۆباوك, بۆکاكو بۆعەشرەت, بۆدین, بۆ مەزهەب, بۆشێخو بۆ تەریقەتو بۆ کۆڵانو بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی لەناومانا ئەچەسپێنرێ، ئەمە هەمووی ووردکەینەوە زەوت کردنی ئازادیی ئینسانە, هەموو ئەم قسانەی کەئەیکەی بەسادەیی هەمووی جۆرێکە لە زەوتکردنی ئازادیی و بەدرێژایی مێژوو کراوەتە کەلتور, بووە بەنەریت, بووە بەداب, هەڵسووکەوتی ئێمەی کۆتوپەیوەند کردووەو نەی هێشتوە مێشکمان وەکو ئەمانەوێ بیربکاتەوە, جائێستایەك کە سەرەتای هەزارەی سێهەمو ساڵی (٢٠٠١)ە. ئینسان هەبێ ئاوا بژی.دەهەزارساڵ ٢٠هەزارساڵ ٣٠هەزارساڵ بچنە دواوە بزانن ئینسان چۆن ئازادیەکانی لێ زەوت کراوە؟ چۆن کراوە بە کۆیلە؟ چۆن فرۆشراوە؟ چۆن کوژراوە؟ چ جۆرە مەزهەبێك سەپێنراوەتەسەر؟ چ جۆرە ئاینێك سەپێنراوەتەسەری؟ چ جۆرە بتپەرستیەك سەپێنراوەتەسەری؟ چ جۆرە ژیانێکی کۆمەڵایەتی سەپێنراوەتەسەری؟ چۆن لە شوێنی هەڵکەندراوە و براوەتە شوێنی تر؟ بەزۆر و زۆرداری نیشتەجێکراوە؟ لە زستانا چی پێ کراوە؟ لەهاوینا چی پێ کراوە؟ چۆن زراعەتی پێ کراوە؟ چۆن ئەرزی پێ کێڵاوە؟ چۆن کراوەتە ژێر دەستەی ئینسان؟ کراوە بەژێردەستەی پیاوی ئاینی, کراوتە ژێر دەستەی شێخو مەلا, هەموو ئەمانە بخوێنیەوە بەدرێژایی مێژوو، هەریەکێك لەوانە لێك بدەینەوە جۆرێکە لە زەوت کردنی ئازادیی مرۆڤ. ئەم چەوسانەوەیە, ئەم زەوت کردنەی ئازادیی سەبارەت بەمرۆڤ, هەزاران ساڵی وەکو وتم خایاندووە, هەتاگەیشتووە بەقۆناغێك لەقۆناغەکانی ژیان, پێی دەڵێن شۆڕشی دیموکراسی, کە دیموکراسی بووە زەرورەتێك لەزەرورەتەکانی ژیانی میللەتانی

چەوســـاوە, ژیـــانی ئـــەو میللەتانـــەی دەربەگایـــەتی حـــوکمی دەربەگایـــەتی ســـەپاندوویەتی, وردەوردە ئـــیتر کـــەبیر لەدیموکراســـی, بیرلەسیـــستەمی دیموکراسـی, بیرلـەژیانی دیموکراسـی کراوەتـەوە بـۆ ئـەوەی سیـستەمی ژیـانی دەرەبەگایەتی پێ لەناوببرێ, لەپاڵ سیستەمی دیموکراسیەوە بیریش لـەئازادیی کراوەتەوە, ئازادی لەگـەڵ دیموکراسـی, دووخواسـتو دووهێـزی کاریگـەرن, دوو خیتابی تازە و دووپرۆژەی تازەی پێکەوەبەسـتراون هاتونەتـەئاراوە, وردە وردە تێکەڵاو بەبزوتنەوەی سیاسی, تێکەڵاو بەخواستی کۆمەڵایەتی, تێکـەڵاو بـەبیری ئەندێشەمەندان, تێکەڵاو بە کۆمەڵەپێشکەوتووەکان بووەو دیموکراسیو ئـازادیی بونەتـە چـەکی کاریگـەری مرۆڤایـەتی لـەپێناوی کۆتاییپێهێنـانی بەسیـستەمی دەرەبەگایەتی, ژیانی دەرەبەگایەتی بێنـێ وچەوساندنەوەی دەربەگایـەتی هـەم وەکو دەسـەڵاتی سیاسـی, هـەم وەکـو دەسـەڵاتی کۆمەڵایـەتی لەسـەر ئینـسان نەهێڵێ.

دیموکراسی ئەکرێ بڵێی سیستەمە.. رژێمـە, واتـا: ئـەکرێ بڵێـی مـن حـزب دروست ئەکەم سیـستەمێکی دیموکراسـی بەدەسـت بێـنم. شـۆڕش بەرپائەکـەم رژێمێکی دیموکراسی بەدی بێـنم؛ بـەڵام ئـازادیی سیـستەم نیـیە, ئـازادیی رژێـم نییە؛ ناتوانی بڵێی من خەبات ئەکەم بۆئەوەی سیستەمێکی ئازادیی بەدی بێنم, یـان رژێمێکـی ئـازادیی بـەدیبێنم. ئـازادیی ئەوەنـدەی پەیوەنـدی بـەخودی ئینسانەوە هەیە, بەگروپەوە هەیـە, ئەوەنـدە پەیوەنـدی بەسیـستەمەوە نیـیە, دیموکراسیش هەم پەیوەندی بەکۆمەڵەوە هەیە, هـەم پەیوەنـدی بەسیـستەمەوە هەیە, سەیرکە لێـرە گەوهـەرە فەلسـەفیەکەی ئـازادیی بەشێوەیەکی تـر رەنـگ ئەداتـەوە, بەشـێوەیەکی تـر دێتـە پێـشەوە, بەشـێوەیەکی تـر تێکـەڵاو بەپێویستیەکانی مرۆڤ ئەبی...وەك من وتم لەئەوەڵەوە ئازادییو مرۆڤ دوانەیەکی پێکـەوە لـەدایك بـوون, ئـەوەی کەهـەولێر پێـی ئـەڵێ (جـومگـە). ئـافرەت کـە دوومنداڵی ئەبێ بەیەکەوە ئەڵێ جومگن.

## دوانەی ئازادی و مرۆڤ

ئازادی و مرۆڤیش جومگن, مرۆڤ کە لەدایك بوو, لەدوای ئەوەی ئیتر ئازادیش بەچەند دەقیقەیەك لەگەڵیا لەدایك بوو, بە جومگ, لەوێ ئـەڵێم ئـازادیی لەگـەڵ ئینسانا خوڵقاوە, لێرەش دیسانەوە کەسیستەمێك دائەمـەزرێنی, پێـی ئـەڵێی سیستەمی دیموکراسی.. دیسانەوە ئازادیەکە ئەبێت بەشێوەیەکی هۆشیاریانەتر لەگـەڵ دیموکراســی بێتـەئاراوە. هەربیبەیتـەوە سـەر رێـچکە سروشـتیەیەکەی

لەناوچوارچێوەی یاسـایەکی تۆکمـە داڕێژراوبیدەیتـەوە خـەڵك، واتـا: لێـرەش ئازادی, لە سایەی سیستەمی دیموکراتیدا, ئازادانـەتر پـەیڕەودەکرێ لـە باقی ئۆرگانـەکان. کـە ئازادیـت خستەوە نـاو چوارچـێوەی یاسایی تۆکمـەوە, ئـەوە ئـازادی سـنور بۆکێـشراوە, دیـسان بـەنای سیـستەمی دیموکراسـی‌یەوە, رادە بۆئازادیی دادەنـرێ, قاڵب بـۆ ئـازادیی دادەنێـی.بۆیـە لێـرە کەئـەڵێم ئـازادیی‌و دیموکراسـی دوو شـتی پێکـەوە گرێـدارون، بـەڵام سیـستەمی ئـازادیی نی‌یـە, سیستەمی دیموکراسی هەیە، دەبێ دیموکراسی قاڵب ڕێژەکـەی، یاسا ڕێژەکـەی بەوشێوەیەی کەدیموکراسیت ئەوێ لەولاتی خۆتا جێبەجێ کەی, ئەمـە شـتێکی سروشـتیە, هــەموو ئەوانــەی بیریــان لەدیموکراســی کردۆتــەوە، هــەموو بیرمەنـدەکانی کـەبیریان لەدیموکراسـی کردۆتـەوە, جۆرێـك لەسیستەم ڕێـژی جیـاوازی دیموکراسـی لەمێـشکیان هـەبووە، بـەڵام پاشـتر ئەندێـشمەندەکان کەلـەباری ئـازادیی بیریـان کردۆتـەوە، ئازادیـان وەکـو دیموکراسـی نەخستۆتە ناوقـاڵبی قانوونـەوە و بـەقانوون نـەیان تاسـاندووە، ئایـا ئـەم قـسەیەم ئـەوە ئەگەیەنێ ئەوەتەی سیستەمی دیموکراسـی هاتۆتـەدی, ئـازادیش بەوشـێوەیەی کەلەدێر زەمانەوە خۆی خۆرسکی لەدایك بووە, لەدوای سەرکەوتنی دیموکراسـی ئـازادیش گەڕاوەتــەوە بـۆ گەوهــەرە دێرینەکـەی و بەشـێوەیەکی جـوانترو پێشکەوتووتر لـەدوای سـەرکەوتنی دیموکراسـی هێنراوەتـەدی, ئایا وایـە...نـە وانی‌یە, بۆ وانی‌یە؟ چونکە ئەو ئاسـەوارە کۆنینـە, ئاسەوارە کۆنەپەرستەکانی کەبەهـەزاران سـاڵ بـوون بـە کۆسـپ لەبـەردەم ئـازادی‌و بـوون بەمۆتەکـە لـەناو مێشکی ئینـسان بـۆ موومارەسـەنەکردنی ئازادیـەکانی خـۆی, دووژمن‌وکۆسـپ‌و تەگەرەکانی بەردەم ئازادی بەهـەزاران سـاڵی رابـردوو ئەمانـە زۆرن, تـۆ نـاتوانی بەسـەرکەوتنی دیموکراسـی بەپەنجاسـاڵ, سەدسـاڵ‌و دووسەدسـاڵیش جـەخت لەسەر ئەوەبکەی بلێـێ ئـازادی بەئاسـانی ئەگێڕمـەوە بـۆ ئازادیـە سروشـتیەکەی سـەرەتای سـەرهەڵدانی لەگـەڵ مرۆڤـا. نـاتوانی وابلـێ, لـەهیچ وڵاتـی لـەدنیادا وانــەبووە, بەســەرکەوتنی دیموکراســی تــەواوی مافــەکانی ئــازادی دەستەبەرنەکراوە, تا لە وڵاتی ئێمە وابێ, ئێـستاش ئـازادی لـە پێشکەوتووترین وڵاتـی دنیایـا مـشتومڕی لەسـەرە, ئێـستاش هـیچ وڵاتێـك نی‌یـە لـە وڵاتـەکانی ئـەوروپا, پێـشکەوتووترین وڵاتـی ئـەوروپا بەنیـسبەت مـافی مـرۆڤو ئازادیـەوە سویدە, ئینجا ژن لە پیاو موچە کەمتر وەردەگرێ, لـەوێ لەهـەر حـەوت سـانیە ژنێك ئەچەوسێتەوە, لـەوڵاتی سـویدا هـەتارادەی تـاوانی کوشـتنیش. ئێـستاش بەشێکی زۆری وڵاتانی دنیا جارێ کۆسپ‌و تەگەرەیان لەبـەردەم ئـازادی ژن نـەك

ۆمافە سروشتیەکانی خۆی، بگرە بۆ خۆهەڵبژاردن بۆ پەرلەمانەکانی دنیاش کۆسپ و پیوەندیان لەسەر داناوە. ئێستاش کەقسەتان لەگەڵا ئەکەین هیچ پەرلەمانی لەدنیایانیەیە نیوەبەنیوە ژن و پیاوبێ، هیچ پەرلەمانێ لەدنیایا نەگەیشتۆتە رادەی یەکسانی. لەدوای جەنگی دووەمی جیهان بەدواوە ژن تەواوی سەرکووت کردنە یاسایەکانی لەسەر لابرا کەوەکو پیاوماڤی هەبێ هەم خۆی هەڵدەبژێرێ بۆپەرلەمان، هەم خەڵك هەڵبژێرێ بۆ پەرلەمان؛ لەوڵاتێکی پەرەپێشکەوتووی ئەوروپا، کە سویسرایە، لەشتەستەکان بەدواوە ژن تەواوی مافەکانی سیاسی دیموکراسی خۆی وەرگرت بۆنەوەی خۆی کاندید بکا بۆ پەرلەمان، کە سویسرا یەکێکە لەهەرە وڵاتە پێشکەوتووەکانی ئەوروپا. باسی رۆژهەڵات هەرناکەم .. رۆژهەڵات وڵاتی دوژمنایەتی ئینسانن. لێوان لێو لەئیهانەکردنی ئینسان، ئینسان لەرۆژهەڵاتدا جارێ ئینسان نیە. بەهەموو چەمکەکانی ئازادی، بەهەموو چەمکەکانی دیموکراسی ئەگەر لەئەوروپا (٢٠٪) چەوسانەوەمابێ لەسەر مرۆڤ، لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستا (٩٥٪) چەوسانەوە لەسەر مرۆڤ ماوە (٩٥٪) ئازادیەکانی مرۆڤ زەوت دەکرێ. دووجۆر چەوسانەوەش خەتەرناکترین چەوسانەوەن لەسەر مرۆڤ. چەوسانەوەی کۆمەڵایەتی و چەوسانەوەی ئاینی؛ چەوسانەوەی کۆمەڵایەتی و ئاینی خەتەرناکترین دووچەسانەوەن کەبەشی زۆری ئازادیەکانی مرۆڤیان زەوت کردووە هاوشانی ئەمەش جۆری سیستەمەکانی ئێمە، سیستەمی سەرکوت کەرو سیستەمی نادیموکراسیوبگرە زۆرجار سیستەمی دوژمنی دیموکراسیشن؛ ئەم سیستەمانەی کە ئێمە بەرێوەئەبەن.

## لاوان و مەدەنیەت

ئەمە سەبارەت بە ئازادی، سەبارەت بەمەدەنی هەر ئەو شۆڕشەی کەبۆم باس کردن بەناوی شۆڕشی دیموکراسیەوە، لەسایەی شۆڕشی دیموکراسیانەدا، وردە وردە دەسکەوتە ئازادیەکان خەریکن دێنەدی، ئەم شۆڕشە کە سەرکەوت، کەدەرەبەگایەتی شکاند، کەوردە وردە ئازادی بووبە بەشێك لەپێویستیە چارەنووس سازەکانی دیموکراسی، پرسیارێك لەلای خەڵك دروست بوو، لەلای بیرمەندەکانی دروست بوو، لەلای فەیلەسوفەکان دروست بوو، ئەویش ئەوەیە: ئەوە دەسەڵاتی دەرەبەگایەتیمان لەناوبرد. دەسەڵاتی دیموکراسیان هێنایە سەرکار. دەرەبەگ ووردو خاش کرا، بۆرجوزای بوو بەحاکم، باشە؟ کام دەسەڵات لەدەسەڵاتەکانی دیموکراسی بیگرین لەچاو زۆربەی خەڵك کەمایەتین؛

ئەم کەمایەتیە بۆچی بۆی هەبێ زۆربەی هەرەزۆری رەهای خەڵك بەڕێوەبەرێ تەواوی دەسەڵاتداریتی بەسەر زۆربەی خەڵکا هەبێ، بەڵام خەڵك هیچ جۆر دەسەڵاتێکی نەبێ؟ ئەمە پرسیارێکی زۆر رەوایە؟ حەقی خۆیەتی دووسەد ساڵ لەمەوبەر ئاوا بیری لێ کراوەتەوە، کەبۆچی دەسەڵاتدار تەواوی مافەکانی سەپاندنی دەسەڵاتەکانی خۆی هەبێ، بەڵام خەڵك کەشۆڕشی کردووەو رژێمی دەرەبەگایەتی لەناوبردووەو سیستەمی دیموکراسی بەدیهێناوە، بۆچی هەموو ئەم دەسەڵاتانە بدا بەدەسەڵاتدار، خۆی بێدەسەڵات بمێنێتەوە؟ چاوەڕێش بکات دەسەلات لەرێگای دەسەلات داریتی خۆیەوە چەند خێری ئازادی پێ ئەکا مافی پێ ببەخشێ، ئازادبێ یان ئازادنەبێ؟ ئەمە پرسیارێکی تازەبوو لەسایەی سیستەمی دیموکراسی، پێویستی بەوەلامی تازە ئەکرد، لەوەلامدا دوای لێکدانەوەی کۆمەڵ، دوای لێکدانەوەی مافەکانی مرۆڤ، دەرکەوت لەبەینی خێزانو دەسەڵاتدا، بۆشایەکی گەورەهەیە، ئەم بۆشاییە بەچی پڕبکرێتەوە ملیۆنەهائینسان هەیە لەگەڵ دەسەلات نییەو ئەیەوێت خزمەت بکا، ئەیەوێ تواناکانی پێشکەش بکا، ئەیەوێ پێش بکەوێ، ئەیەوێ دەسەڵاتی مەدەنی هەبێ، ئەیەوێ زۆرتر لەومافانەی بەدیبێت، کە حکومەتەکان خێری پێ ئەکەن یان حکومەتەکان پێی رەوا ئەبینن، چ بکەن بۆئەوەی بتوانن ئەو بۆشاییە لەبەینی مرۆڤو خێزانو دەسەلات پڕبکەنەوەو لێك دابڕانەکە نەهێڵن بیرکردنەوەی تازە بێتە ئارا، هەڵسوکەوتو هەڵسوڕانی تازە بێتە ئارا، زەمینە بڕەخسێنرێ، جگە لەتواناکانی دەسەلات، جگە لەحکومەکانی پشت مێزی دەسەلات، بۆ دەسەلات داریتی خەڵك، خەڵکیش دەسەڵاتی خۆی هەبێ بە بەڕێوەبردنی خەڵكو رێکخستنی تواناکانی خۆی، چ بکرێ بۆئەمە، بەرەڵایی گوێ پێنەدان، هەڵ هاتن، نائومێدی، رەش بینی، وازهێنان، خۆکوشتن گەڕانەوە بۆدین، گەڕانەوە بۆ رۆح، گەڕانەوە بۆ غەیبییەت، ئایە ئەمانە چارەسەرن؟ مرۆڤ هەموو ئەوانەی تاقی کردۆتەوە، لە هەزاران ساڵی رابردوودا هەموو تاقیکردبووەوە ،ئەمانە هیچی دادی مرۆڤی نەدابوو، نەگەڕانەوە بۆ ئاین نە بتپەرستی، نەهەموو ئەو عەقیدەو مەزهەبانەی کەهەبوون، نەخۆکوشتن نەهەڵ هاتن. هیچی ئەورێگەیانە، لە هەزاران ساڵی رابردوودا دادی مرۆڤیان نەدابوو، وازیانێکی تازەش بەڕێوەیە کەپێی ئەڵێن دیموکراسی و دیموکراسی لەسیستەمی پێشوو، لەژیانی پێشوو باشتر، بوار ئەدا بە مرۆڤ، بوارئەدا بەکۆمەڵ، تواناکانی خۆی بخاتە خزمەتی کۆمەڵو خزمەتی مرۆڤەوە، ئە

پرسیارە نوێیە بۆچارەسەرکردنی گرفتە تازەکانو چۆنیەتی دەسەڵات پێ بەخشینی مرۆڤەکان. گروپەکان. تواناو داهێنانەکان، ئەم پرسیارە نوێیە دوای مشتومڕێکی زۆر، بە بیرکردنەوەی مەدەنی، بەدەسەڵاتی مەدەنی، بەکۆمەڵی مەدەنی وەڵام درایەوەو مەدەنیەتو کۆمەڵەی مەدەنیو مافەکانی مەدەنیو دەسەڵاتە مەدەنیەکان، باشترین ڕێگا، باشترین کەناڵن، باشترین لۆکاڵی بەدی هێنانی دەسەڵاتە خەڵکیەکانی خەڵك بوولەبەرامبەر دەسەڵاتە سیاسیەکانی سیاسەتمەدارەکان؛ واتە: مەدەنیەت ئەو دەسەڵاتەیە کە بەدەر لە دەسەڵاتی سیاسی، دەسەڵات ئەبەخشێتە خەڵك بۆئەوەی تەواوی تواناکانی مرۆڤ ڕێك بخرێ، ئاراستەبکرێ، تەوزیف بکرێ و دەستەبەری مافە ئازادیەکانی مرۆڤ، ئازادیەکانی وەکو هاوڵاتیەك باشتربکرێ لەناو کۆمەڵا، بەبێ ئەوەی دەسەڵات توانای تەجاوزکردنی هەبێ بۆمافی مرۆڤو مافی گروپو مافی تواناو مافی ئازادیەکانی ئینسان، ئەم بۆشاییە گەورەیە لەبەینی مرۆڤو خێزانێك لەگەڵ دەسەڵاتەکە لەئەوروپادا بەدەسەڵاتی مەدەنی هەتا ڕادەیەکی زۆر پڕکرایەوەو ئەوەتەی دەسەڵاتی مەدەنی، لەسەدەی حەڤدەهەمەوە قسەی تیاکراوە و لەسەدەی هەژدەهەمەوە چەسپێنراوە، تائێستا کەدەسەڵاتی مەدەنی هێنراوەتەدی، بەشێکی زۆری مافەکانی مرۆڤ بەدەر لەو مافانەی ڕژێمەکان بە ڕەوا یان ناڕەوایان زانیوە، بەشێکی زۆری مرۆڤو مافەکانی مرۆڤە بێمافەکان، مرۆڤە ئازادەکان، بەشێکی زۆری هێنراوەتە دی، ئەمە شێوەیەکە لەشێزەکانی دەسەڵات، بەڵام دەسەڵاتێك نەبەسوپا ئەپارێزێ، نەبەزیندان، ئەم دەسەڵاتە کتومت وەکو دەسەڵاتی یاسایی حکومەتەکان وایە.

لە حکومەتەکان دەستووردا ئەنرێ، بەشێك لە حکومەتەکان دەستوری هەڵبژێردراوی هەمیشەییان هەیە، کەمیللەت هەڵی بژاردووە، هیچ حکومەتێك بۆی نیە دەسکاری بکا؛ بەشێك لەحکومەتەکان دەستوری کاتیان هەیە، کە حکومەتێك ئینقلابێك ئەکا بەئارەزووی خۆی دەستورەکە ئەگۆڕێو ئەڵێ ئەمە قانوونە و میللەت ئەبێ ملکەچی بێ، بەشێك لە حکومەتەکانی دەستوریشی نیە، ئێستا بەریتانیا دەستوری پەسەندکراوی نییە. هەمووجارێ پەرلەمان کە دائەنیشێ قانوونێك دائەڕێژێ ئەم قانوونە ئەچێتەسەر قانوونەکەیترو قانوون بەقانوونی داڕێژراوی پەرلەمان وڵاتەکە بەڕێوەئەچێت، ئەم دەستورانە، دەستوری کاتی، دەستوری دائیم، لەگەڵ ئەو قانوونانەی کەپەرلەمانەکان هەڵی ئەبژێرێ.

ئێستا کوردستانی خۆشمان دەستوری نیەیە, یان قانوونی حکومەت جێبەجێ ئەکەین, یان ئەوقانوونانەی کە پەرلەمان دای رشتووە جێبەجێی ئەکەین, یان بەپێی پێویست یاسا گەلاڵەدەکرێ, زۆر لەو ولآتانەی کەتازە سەرکەوتوون لەئەورووپای رۆژهەلآت جاریٚ دەستوریان نیەیە, وەك ئێمە بەرێوەئەچن, لە دەسەلآتی سیاسیدا ئەو قانوونەی کەبڤەیە تەجاوزی بکەی لەدەسەلآتە مەدەنیەکانا وانیەیە, ئێستا بۆنموونە لەم ماوەیە لاوان‌و کۆمەڵەی خوێندکاران کۆنگرەیان بەست، لەناو لاوان‌و خوێندکارانا پەیرەو پرۆگرام هەیە، کۆنگرە هاتووە دانیشتووە حاکم نەهات، ئاسایش نەهات، کەس نەهات بچێ چاودێریان بکا، شەش سەد، حەوت سەد کەس دانیشتبوون بەئارەزووی خۆیان بیریان لێ کردۆتەوە ئەم پەیرەوو پرۆگرامە باشە یان خراپە.بەئارەزووی خۆیان گۆڕییان, دەست کاریان کرد، هیچ بەندێکی قانوونی دەستوریش نەیتوانی بلێ مەیگۆڕە, هیچ بەندێکی قانوونی، نەئەو قانوونەی حکومەتی عێراقی کەبەشێکی پەیرەو دەکەین، نەئەو یاسایانەی کەپەرلەمان دای رشتووە, تائێستا هیچی ئەوانە لەبەرچاوی ئێمەو لەبەردەستی ئێمە لەکۆنگرەکانی خوێندکاران‌و لاوان نەبوویلێ بابەگۆڕینی ئەم پەیرەوە ئەوبەندە, ئەو پرۆگرامە, ئەم ستراتیجە, بەو تەکتیکە, پێچەوانەی فلآنە یاسایە, فلآنە بەندە، باوەڕناکەم کەس لەم دووکۆنگرەیە بیری لێ کردبێتەوە؛ بەئارەزووی خۆیان پەیرەوپرۆگرامێکی تریان دانا. تەنها بۆ هەڵبژاردن حاکم هات چاودێری کردن, کەهەڵبژاردنێکی ئازادبکەن، گزی تیا نەکەن, تەنها بۆئەوە حاکم لەرێکخراوە دیموکراتیەکان دێت چاودێرییان ئەکا

چاوناں لییە، ئەمە نموونەیەکی زیندووە کەخۆتان تیایدا ژیاون، ئێوە خۆتان لاوانن, لێرە دانیشتون, بەشێکتان لەکۆنگرەکەبوون، ئەگەر دەسەلآتی مەدەنی بەپێی دەسەلآتی یاسایی حکومەتەکان بچێ بەڕێوە و رێکخراوە دیموکراتیەکانیش بەبێ موافەقەتی مەحکەمە پەیرەو پرۆگرامی خۆیان دانەنێن، ئەوان تەسدیقی نەکەن, بۆیان نەبێ پەیرەوی بکەن, ئەوکاتە دەسەلآتەکانی ئێوە هەمووی ئەبەسترێتەوەو ئازادی دارشتن‌و گۆڕین‌و گۆڕان کاری بۆئێوە نامێنێت, ئەمە جیاوازەکانی دەسەلآتی مەدەنیە لەگەل دەسەلآتێکی دەستوری حکومی، دەسەلآتی رێکخراوەکانیش کەم نین, تەنها کۆمەڵەی خوێندکاران چل هەزار ئەندامی هەیە پەیرەوپرۆگرامیش دائەنێت؛ ئەم دەسەلآتە دەسەلآتی خێڵ

و خوێن نىيه، خەڵك سزا ئەدا، خـەڵك دەرئـەكا, خـەڵك يارمـەتى ئـەدات، خـەڵك نەقلّ ئەكا، خەڵك بەرزئەكاتەوە، خەڵك دائەنىّ، خەڵك بۆقبولّ وەرئـەگرىّ، خـەڵك قبولّ ناكا، ئەنوسىّ، زەخت ئەكا، خواست بەدى ئەهێنىّ، باس لەكچ ئەكا، بـاس لـەكوڕ ئـەكا، بـاس لەخوێنـدنى تێكـەڵاو ئـەكات, ئەمـە هـەمووى دەسـەڵاتە، خۆشتێكى كەم نىيە، بەڵام دەسەڵاتێك نىيـە كـەكۆتو بەندكرابى بەياسـايەكى حكومى ئەوتۆ تۆ ئازاد نەبى لە دەسـتكارىكردنى. گـۆڕينى دەسـەڵاتى مـەدەنى نەرم و نيانيەكەى لەوايە, بەبىّ ئەوەى بگەڕێيتەوە بۆ شتێكى تر, خۆت ئـەتوانى لە چوارچێوەى مافە سروشتىيەكانى خۆتا, لـە چوارچـێوەى مافـە ياسـاييەكانى خۆتـا, دەسـەڵاتەكانى خـۆت بگـۆڕى، پێـشىبخەى، كـەم بكـەى، زيادبكـەى، فشاربەى و فشارنەبەى، مافە ئازاديەكانت بەوشێوەى كەدڵخوازى خۆتە خەباتى بۆبكـەى, دەسـەڵاتى مـەدەنى يەكێكـە لـەگرنگترين دەسـەڵاتەكانى كۆمـەڵ, لـەگرنگترين دەسـەڵاتەكانى مـرۆڤ, لـەگرنگترين دەسەڵاتەكانى هـاوڵاتى, كاتێـك كەمەدەنيەت لەناو كۆمەڵدا هاتەدى, ئيتر هـاوڵاتى ئـەبێت بەهاوڵاتيـەكى تـەواوى ئەو دەوڵەتە و مافەكانى هاوڵاتى ئەو هاوڵاتيە ئەپارێزىّ؛ كەس نـاتوانىّ پێـشێلى بكا، عەشرەت نـاتوانىّ پێشێلى بكـا، بنەماڵـە نـاتوانىّ پێـشێلى بكـا، دەسـەڵات ناتوانىّ پێشێلى بكا, هەموو كەس و گروپێك ئەتوانى ببى بەخاوەن دەسـەڵاتێكى ئـەوتۆ, وردە وردە وەكـو هاوڵاتيـەكى ئاسـودەو ئـازاد ژيـانى بەرێتەسـەر, بەپێـچەوانەشەوە, وڵاتێـك كەديموراسـىو مەدەنيـەتو ئـازادى تيانـەبىّ, هەموجۆرە دەسەڵاتەكان دەسـەڵاتيان بەسـەر تاكـەكانى كۆمـەڵو كۆمەڵـەكانى كۆمەڵا ئەشكىّ؛ كاتێكيش لەوڵاتێكدا ئـەڵێى ديموكراسـىو ئـازادىو مەدەنيـەت هەيە، ئيتر ئەو وڵاتە عەشيرەتو خێڵو شێخو مـەلا لـە كۆمەڵەكەيدا باڵادەست نابن، ئەو دەسەڵاتانە ئێستا لەئەوروپا نەماوون. هيچ شـێخێك دەسـەڵاتى نىيـە، هيچ قەشەيەك ناتوانىّ بەهاوڵاتىيەك بڵىّ ئەمە وابكەو ئەوە وامەكە, تاك بۆخـۆى ئازادى دينى خۆى هەيە.

## کەنیسە و ئازادی

لەبەرامبەر گەورەترین کەنیسەی ئەوروپا ئازادی هەیە، بەئازادی دڵداری ئەکەی، بەئازادی هەڵئەپەڕی، بەئازادی مەی ئەخۆیتەوە، بەئازادی سەرخۆش ئەبیت، بەئازادی ئەخەوی، بەئازادی جلت درێژە، کورتە، سەرت رووتە، سەرت رووت نییە، چی ئەکەی لەبەرامبەر گەورەترین کەنیسە کەگەورەترین قەشەشی تیایە، یەك کەس بۆی نییە بڵێ کاکە ئەمە کەنیسەیە بۆ وانەکەی، چویتە ناوکەنیسەش دائەنیشی، بەدڵی خۆت دائەنیشی، بەدڵخوازی خۆت دائەنیشی، کابرای قەشە ئامۆژگاریت ئەکا، بەقسەت کرد باشە، بەقسەت نەکرد بەهیچ جۆری ناتوانێ قسەیەکی بەرزونزمت بەرامبەر بکا، چونکە وەکو هاوڵاتییە، مافی ئەوەی نییە مافی هاوڵاتی زەوت کات،ئەویش هاوڵاتییە لەبەرامبەر قانوونا، گەورەترین قەشە هاوڵاتییە لەبەرامبەر قانونا؛ تۆش هاوڵاتییەکی لەبەرامبەر قانونا؛ وەکولای ئێمە نییە شێخێك دائەنیشێ لەتەکیەکەی سێهەزار کەس حەیو حوی بۆ بکا، کەسیش ناتوانێ بکۆکێ بەرامبەری، بەئارەزووی خۆی تەعدای لێ ئەکا، بەئارەزووی خۆی سزای با، ئەمە ئەنواعی چەوسانەوەیە جارێ لەناو ئێمەدا ماوە، ئازادیش چ ئازادی مەزهەب چ ئازادی عەقیدە بەزۆری زۆرداری نیە، بەزۆریش خەڵك بخەیتە سەر رێگایەك بێگومان ئەو ئیسنانە بەناچاری ئەچێتە سەر ئەورێگایە رۆژێك لەرۆژان وازی لێ ئەهێنێ، دەرەتانێکی تری هەبێت هەڵ ئەگەڕێتەوە لێی، ئەمە سروشتی ژیانە، بەپێچەوانەی ئەو بیروبۆچوونانەی وانەزانن، لە وڵاتی ئێمە خەڵك زۆرتر خواپەرستە، لەوڵاتە دیموکراتی و ئازادیو مەدەنیەکانا خەڵك زۆر لەخوا هەڵگەڕاوەتەوە، بەپێچەوانەوە، لەوییا مەسائیلی خواپەرستیو ئازادی عەقیدە زۆرترە لەلای ئێمە، زۆرزیاترە لەلای ئێمە، بۆئاگاداریتان کەخەڵك لەوێ ئەوپەڕی ئازادە.

ئەتوانم بڵێم خەڵکێکی ئێجگار زۆر بەزۆرو زۆرداری لەجنسیەکەی نوسراوە موسڵمان کەمترین خەڵکیش موسڵمانی عەیار (٢٤)ن بەشێکی زۆری بە رواڵەت موسڵمانن، ئەسڵەن لەوێ کەئەڵێ باوەڕم بەخوایە راست ئەکا، کە ئازادی خۆشی پیادەئەکا راست ئەکا؛ ئێستە وڵاتێکی وەکو ژاپۆن خۆ ئیسلام نین، مەسیحی نین، ئەوانە سەدان خوایان هەیە، یەك خوایان نییە، ژاپۆنیەکان بوزین، هەندێکیان کۆنفۆشیوسین، دوو دینیان هەیە، بوزیەت و کۆنفۆشیوسی لەبوزیەت

دا هەزاران خوا هەیە, خوای ئاو هەیە, خوای هەتاو هەیە, خوای ئاسمان هەیە, خوای خۆشی, خوای جوانی هەیە, هەرچی خوا هەیە هەمووشی ئەپەرستن بۆ ئاگاداریتان, ئایە بەو هەموو خوایە, ژاپۆنیەکان ئالۆزن, ناریکۆپێکن. مەسەلەی رۆحی و دونیایان ناکۆکە؟ نەخێر. کەم میللەت هەیە لە دنیایا گونجانێکی تەواو مەسەلەی رۆحی‌و لەمەسەلەی دنیایی وەکو خەڵکی ژاپۆن هەبێ, ناکۆکی لەنێوان قەناعەتی رۆحی‌و قەناعەتی دنیایی لەناو ژاپۆنیەکان کەمە و ئەمە گەورەترین کاریگەری پێشکەوتنی ژاپۆنە بەسەرهەموو جیهانا, ئێستا لەرووی ئابووری‌و لەرووی تەکنەلۆجی‌یەوە, لێکۆڵەرەوەکان, ئابوری‌ناس‌و کۆمەڵ ناسەکانی دنیا کەئەچن لێ ئەکۆڵنەوە، ژاپۆن بۆتوانی لەجەنگی دووەمی جیهان بەدواوە تائێستا ببێ بەپێشکەوتووترین وڵاتی پیشەسازی‌و دەوڵەمەندترین وڵاتی پیشەسازی لە تەکنەلۆجیا؟ هۆی ئەمە ئەیگێرینەوە بۆئەوەی باوەڕی رۆحی ئینسانی ژاپۆنی لەگەڵ قەناعەتی مادی‌و دنیایی‌و ئینسانی, ناکۆکی لەنێوانیانا نی‌یە، بەپێچەوانەوە ئێمە هەموومان بەزۆری زۆرداری سیخ ناخین بەخواپەرستی, سیخ ناخین بەوەی هەریەك رێگای دینی بپەرستین, ئینجا لەناخمانا هەزاران جۆرە رارایی بەرامبەر بەوقەناعەتانە هەیە کەسەپێنراوەتەسەرمان, هەموو ئینسانێك لەئێمە بریتیە لەکۆمەڵێك ناکۆکی لەناخی خۆیا، بە رواڵەت ملیۆنەها موسڵمان هەیە, پێغەمبەری مەزن, قورئانی پیرۆز لەسەردەمیان ناکەوێ, بەلام ناخی بخوێنەوە حەزی لی‌یەتی ئازادتربێ, حەزی لێ نی‌یە مەلاکەی وای پێ بڵێ, حەزی لێ نی‌یە شێخەکەی وای پێ ئەڵێ, حەزی لێ نی‌یە قانوونەکەی وای پێ ئەڵێ, حەزی لێ نی‌یە باوکی بەمشکی‌و جامانەوە حوکمی پێ‌بکا، حەزی لێ نی‌یە دایکی بەپەچەوە جنێوی پێ‌بدات، حەزی لێ‌نیە براکەی نایەڵێ بچێتە دەرەوە, ناخ هەمووی وایە، ئینسان حەزئەکا ئازادبێ، حەزئەکا! جوان بێ, حەزئەکا جلی جوانی هەبێ, سەیارەی باشی هەبێ, بچێتە پێشەوە, بچێتە سەیران مەلەبکات، بچێتە سینەما, بچێتە شانۆ, هەزاران کەس هەیە دەنگی خۆشە لەترسی کەس‌وکاری ناوێرن بڵێ دەنگم خۆشە, هەزاران کەس هەیە ئەتوانێ تەمسیلی باش بکات لەترسی کەس‌وکاری ناوێرێ بڵێ تەمسیلی باش ئەکەم, هەزاران کەس هەیە حەزئەکا بچێ بۆسەیران شەونەیەتەوە لەگەڵ رەفیقەکانی لەترسی کەس‌وکاری‌و نەکاپێی بڵێن دژی دینە, نەکاپێی بڵێن پەنجەیەکی خوار داناوە, هەمووئەو ئازادیانە زەوت کراوە,

بەڕواڵەتیش کەدێتە سەرقسە بۆئەوەی دایکو باوکیو مەلاکەیو مامۆستاکەی, ڕازیکا, وای دەنوێنێ خواپەرستیەکی عەیار بیستوچوارە. بەلاّم بەنهێنی و لە پەنا و پەسێودا, ئەوەی حەزی لێدەکا, دەیکا.

## مێژووی ئیسلام و ئازادی

هەندێك لەحیزبە سیاسیەکانی ئیسلامی لای ئێمە پێی وایە مێژووی ئیسلام مێژووی دەسەلاّتەکانی ئیسلام, خزمەت کردنی ئیسانو ئینسانیەتو خواپەرستیو عەدالەت بووە، ئەسڵو ئەساسی نیە ئەم قسەیە، لەسایەی هیچ نیزام لەنیزامەکانی دنیا لەپێش ئیسلام, لەسەردەمی ئیمپراتۆرەکان, بۆسەردەمی دوای ئیسلام, بۆ سەردەمی ئیمبراتۆرەکان, بۆ ئێستاش هیچ نیزامێك لەنیزامەکان, لەسایەی هەموویاندا مرۆڤ قەتلوعام کراوە. بەدرێژای مێژوو ئەوەی لەمێژووی دەسەلاّتەکانی ئیسلام کراوە قابیلی تەسەورنیە، کەئیسان ئەی خوێنێتەوە خەلیفەکان, سولّتانەکان ئەمیرەکان, چیان کردووە، نەك ئینسانی ئاسایی کەلەسەر ئازادی زمانیان لەمیخ دەرهێناونو بگرە باشترین عولەمایی ئیسلامیش کوژراوە لەسەر بیروباوەڕی خۆی, کە بیروباوەڕی ئیسلامی بووە, کێ هەیە ناوی ئیمامی حەنەفی نەبیستبێ, کەستان نیە نەتان بیستبێ, کێ هەیە ناوی ئیمامی شافعی نەبیستبێ؟ کەس هەیە نەیبیستبێ؟ کێهەیە ناوی ئیمامی حوسێنی نەبیستبێ؟ کێهەیە ناوی ئیمامی حەسەنی نەبیستبێ؟ کێهەیە ناوی ئیمامی جەعفەری صادقی نەبیستبێ؟ کێ هەیە ناوی هەموونەو ئەولیاو زانا ئاینیانەی نەبیستبێ؟ ئێوە ئەزانن هەموو ئەمانە زۆربەیان کوژراوی سەردەستی خەلیفەکانن, ئیمامی حەنەفی لەزیندانا کوژراوە, ئیمامی شافعی بەشی زۆری ساڵانی ژیانی لەزیندابردەسەر. ئیمامی حوسێن ئێستاش کەس نازانێ قەبرەکەی لەکوێیە، ئیمامی عەلی کوژراوە، کوڕەکانیو کوڕەزاکانیان هەموو کوژراون, هەموومتەسەوفەکان کوژراون، هەموونەوانەی تەئویلو تەفسیری جیاوازیان بۆ مێژووی ئیسلام هەبوو کوژراون، هەموقەتلّوعام کراون, سەدان هەزارکەسیان قەتلّوعام کراون، نەك یەك و دوو, سەدان هەزاران کەسیان قەتلّوعام کراون؛ بەڕواڵەتیش عەدالەتو حکومی شوراو لە ئیسلاما هەبووە, لە (٤ ) خەلیفە (٣) خولەفای راشدین کوژراون, هەرچی دوای ئەو خەلیفانە هەرچی ئومەرای ئیسلام, هەرچی خولەفای ئیسلام, عەباسیەکان, ئەمەویەکان, لەدوای ئەوەش فاطمی, شافعی, شیعە, سنە, ئیثا عەشەری, هەرچی هاتووە بەقەتلّو

عام تـەواوبوون، هـیچ جۆرە پـەلاماردانێکیش نـەبووە کەپـەلاماری یـەکیان داوە (بۆئاگاداریتان ئەمە لەمن وەرگرەن ئینشاءالله لەسێ چوارمانگی ئایندە باشترین کتێب لەم بارەیەوە وەرئەگێڕین، عەرەب نوسیوێتی، ئێمە نەمان نوسیوە) هـیچ جۆرەپـەلامارێك لەبـەینی دەسـەلاتەکانی ئیـسلام بەرامبـەر بەدەسـەلاتێکی ترنـەبووە پێـنج تـا دەهـەزار کەسـیان بـەدیلی نەکوشـتبێ، بۆئاگاداریتـان جاریواهەبوو چل دانە ڕۆژ جەلادەکان، خولەفاکان دەهەزار کەسیان ریزکردووە، بەس سەریان پەڕاندوون، دەهەزار ئینسان ریزکراوە دەسیان بەستراوە یەك یـەك هێنـراون بـەس سـەریان پـەڕێنراوە، بـە چـل دانـە ڕۆژ تـەواویان کـر دوون، مـن باوەڕناکەم مەلا و شێخەکان، ئەمە لەمزگەوت باس کەن بۆخەڵك، نەك ئەمە بـاس ناکەن، بگرە ئەمە دائەپۆشنو بەپێچەوانەکەی بەخەڵك ئـەڵێن، ئێمـە ئـەبێ ئـەم حەقیقەتانە هـەمووی بـزانین بۆئـەوەی بـزانین ئازادیمـان چۆن زەوت کـراوەو چ دیموکراسیەتێك لەوڵاتی خۆمان بەدیئەهێنین، گوناحێکی ئێجگار گەورەیە خەڵك هەبێ بەرگری لەوەبکا کە ئەمانە هێزی چەکداریان هـەبێ و بـەو هێـزەش بۆیـان بێنە سەر دەسەڵات. لەژێر پەردەی ئازادی و دیموکراسـی بێنـە سـەر دەسـەڵات؛ بزانـە لەئەفغانستان ژن ئـەتوانێ بڵـێ ژنم، ژنـان خواخوایانـە هەرچـی ژنـە لـە ئەفغانستانا نەمێنن. بەڵکو رزگاریان ببێ، چونکە ژیـانی بۆنـەماوە، نـابێ بـچێتە مەکتەب، نابێ بچێتە خەستەخانە، نابێ بچێتە بازاڕ، نـابێ بـچێتە تەربیـە، نـابێ بچێ شت بکرێ، نابێ لەپەنجەرەوە سەیرکەی، نابێ پەنجەرەیەکی تیابێ، نـابێ تاڵی قژت دیاربێ، نازانم چۆن ئەژی بەم هەموونابێیە؟ هەر قەبر ماوەتەوە بـچنە ناوی، بڕواتان هەبێ ئیسلامیە سـەلەفیە چەکدارەکان دەسـەڵاتیان هـەبێ بـەس قـەبرمان بۆئەهێڵنـەوە، ئەوانـەی کەبەپێـچەوانەی ئەوانـەوە بیرئەکاتـەوە، یـەك ڕێگامان ئەبێ ئەویش ڕێگای قەبرە، یەعنی ئەگەر ئێستا ئـەم دەسـەڵاتە نزیکـی سلێمانی کـەوتن، هەرکەسـە بابـچێ بـۆگردی سـەیوان قـەبری خـۆی هەڵکـەنێ، خۆمان بچینە ناوی باشترە لـەوەی سـەرمان پـەڕێنن بمانخەنـە نـاوی، بـەئازادی بچینە ناوی هەتا لەوکاتـە ئـازادی خۆمـان بپارێزین هـیچ نـەبێ ئـازادی مردنمـان هەبێ.

ئەمە بەنیسبەت دنیای مەدەنیەنو دنیـای ئازادییـەوە، لـەوێ بـەم دووجـۆرە دنیایـە چ جـۆرە تەئـسیرێکیان لەسـەرپێگەیاندنی لاوان هەیـە، غـەیرە لاوشـتان تیایە، من ئەڵێم مەحاڵە مرۆڤ جگە لەدیموکراسیو جگە لەسایەی ئازادی بتـوانێ بە ئاسایی پێبگات، تەنها دیموکراسیو ئازادی ژیانی مەدەنیـە والەئینـسان ئـەکا

بەئاسايى پەروەردەبىێ، پێبگا، هەموو گرىێو گوڵەكان كە بەدرێژايى مێژوو لەناوكۆمەڵا بۆى ماوەتەوە، هەمووگرىێو گوڵەكانى، ئاسەوارەخراپەكانى لەسەرى لابچىێو بشتوانىێ بگاتە ئاستێك، بگاتە قۆناغێك، مومارەسەى خولياو حەزوئارەزوو پێويستىيەكانى ژيانى خۆى بكا، بەبىێ ئازادى مەحاڵە ئينسان ببىێ بەئينسانێكى هاوچەرخ، ببێت بە ئينسانێك بەتەواوەتى خێر بۆ كۆمەڵەكەى بداتەوە، هيچ كۆمەڵێكيش نىيە لەژيانا كە دوچارى چەوسانەوەى وەكو ئێستاى ئێمە ئەبىێ، كەدووچارى دواكەوتنى وەكو ئێستاى ئێمە ئەبىێ، كەدووچارى كاريگەرى بيروراخراپەكان ئەبىێ، لەسەر كۆمەڵ، لەسەر پياو، لەسەر ژن، لەسەر كچ، لەسەر كور، لەسەر منالێ، لەسەر لاو مەحاڵە، ئێمە ئەتوانين بەرنامەى گۆرانكارى قوڵ دارێژين و بيكەين بەئامانجى خۆمان، هەتا ببين بە ولاتێكى پێشكەوتووى ديموكراسى ئازادى هاوچەرخ، خاوەن شارستانى، خاوەن دەسەلاتى مەدەنى بەشى زۆرى خەونو خولياكانمان بێتەدى.

ئەگەر ولاتەكەمان ديموكراسىو ئازاد نەبێت، ئازاديش ئەگەر كەموكورپيشى هەبێت، ئەگەر توندرەوايەتيشى تياهەبىێ، ئەگەر قسەى ئەملاونەولاش ببيستن، بەرامبەر بەدەسەلاتەكەمان، بەرامبەرخۆمان، ئينجا هێشتا بەحەوت ئاو شۆراوەتەوە لەچاو هێزە دواكەوتوەكان، لەبەرئەوە هيچ كەسێك لەوەنيگەران نەبين نوسەرێك لە كۆرێك، كۆبونەوەيەك لەسەر تەلەفيزيۆن كەسێك لە ئازادىو تەجاوزئەكا، بە رەخنە بابيكەن، ئێمە رىێ لەوانە نەگرين باشە، با هەموو كەسىێ بەئازادى قسەبكات، قسەيەك دوان سيان ورده ورده ئەبىێ بە تاقىكردنەوە بۆى، خۆى تىێ ئەگا كام لەقسەكانى راستە، كاميان هەڵەيە، هەڵەى خەڵكى ئازاديخواز ئينجا لەخراپترين بيروباوەرى كۆنەپەرستيەكان باشترە، لەبەرئەوە ئێمە دەبىێ ئيتر دەورانى ئازادى تىێ بگەين، مەشق بكەين، خۆمان وارابێنين بۆى، وكارێك بكەين ببين بەسەرچاوەى پەروەردەكردنو سەرچاوەى ئاراستەكردنو سەرچاوەى پێگەياندنى لاوان لەئايندەيا.

## رابوردوى كوژراو، ئايندەى زيندوو

بەشێكى زۆرى كۆمەڵى ئێستامان، كوژراوين، بەلام ئەگەر لاوانمان پەروەردەبكەين ئايندەمان زيندوونەكەينەوە؛ ئێستا كەمترين مافمان هەيە، بەلام لاوان پەروەردەكەين لەئايندەيا زۆرترين مافمان ئەبێت؛ ئێستا كەسايەتيەكى لاوازمان هەيە، بەلام لاوان پەروەردەبكەين ئەبينە خاوەنى

کەسایەتیەکی گەش‌وجوانی کاریگـەریش لەئاینـدە؛ ئێستا کـەمترین دیموکراسـی شـۆڕبۆتەوەناو کۆمەڵەکـەمان، بـەڵام لاوان پەروەردەکـەین دیموکراسـی ئەچـێتە بنج‌و بنەوانی کۆمەڵەکەمان‌و ئەبێت بەهێزێکی مادی ئـەوتۆ هـەرگیز لێیناترسـین؛ ئێستا، تادەساڵی تریش من ئەتوانم بەنێوە بڵێم، ئەم دیموکراسیەی کـە خـەباتی بۆئەکەین، مەترسیەکی گەورەی لەسەرە، مەترسی لەسەرە نـەك لەسـەر ئـەوەی کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان رۆژێـك لـەرۆژان هەڵئەگەڕێتـەوە لەدیموکراسـی، نـەء یـەکێتی تـازە هەڵناگەڕێتـەوە لـە دیموکراسـی، مەترسـی ئـەوەی لەسـەرە کەجاریٚ دیموکراسی بەوپێیەی کەئەمانەویٚ شۆڕنەبۆتەوە ناوتاك بەتاکی کۆمـەڵ و نەبووە بەبەشێك لەکەسایەتی کوردەواری، نـەبووە بـە کـەلتور لـەناو کۆمەڵدا. نەبووە بە نەریت، دیموکراسی کە بـوو بـە نـەریت و رەوتـی ژیـان ئـەو کاتـە لێـی ناترسـین، بـەڵام دیموکراسـی ئێـستا بـەس دەسـەڵاتە، دەسـەڵاتیش ئـازادی ئەبەخشێ، جاریٚ ئازادی مەدەنی زۆرزۆری ماوە کۆمەڵ رێژبکرێت، کارلێك لەگەڵ تاك بەتاکی کۆمەڵ بکا. زۆرترین رووبەری کۆمەڵی ئێمە بە دنیـای ئـازادی ئاشـنا نـەبوون، دەسـتکەوتی ئـازادی کـەی هـەموو پێکهاتـەی کـوردەواری کـردە پێکهاتەیەکی ئازادی دیموکراسی رێژکراو، ئەوکاتـە دیموکراسـی ئـەبیٚ بـەهێزێکی مادی، کـەهیچ جـۆرە مەترسـیەکی لەسـەرنابیٚ، ئێـستا کۆمەڵەکـەمان پێویـستی بەدیموکراتیەکی تەواوە وەك ئەوروپا، کە دیموکراتیش وەکـو ئۆروپـای لـیٚهات، ئەوکاتـە مەترسـیمان لەسـەری نابـیٚ. ئەوکاتـە یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان لـەرووی سیاسـیەوە توشـی شکـستیش بـیٚ ناترسـین، هـیچ ناترسـین. چـونکە ئەشکێین، هەڵبژاردن ئەدۆڕێن، بەڵام لەبەر زەمینـەی دیموکراسـی لـە وڵاتەکـەمان هەیە، هەرکاتێك خۆمان رێکخستەوە ئەتوانین لەسەر ئـەو زەمینەیـە بـەجوانترین شێوە نوێببینەوە، جارێکی تر، بشیەینەوە سەر کار. بـەڵام ئەگـەر بێتـوو ئێمـە نەمێنین‌و زەمینـەی دیموکراسـی کۆمەڵایـەتی لـەناو وڵاتەکـەمان نـەبیٚ، ئەوکاتـە لەسەرچی شین ئەبیتەوە؟ گـەتۆومان نـەما، کـەتۆوی دیموکراسـی لـە خاکەکـەیا نـەبوو، ئاویـشماندا، بـشی کـێڵین چـی شـین ئەبێتـەوە؟ دەبـیٚ رەگـو ریـشەی دیموکراسی دابکوتێنین، نەترسین لەهیچ پیلانیٚ لەدژی دیموکراسـی. ئەوکاتـە لـە ئازادی و دیموکراتی بەتەواوەتی دڵنیادەبین.

سالی (١٩٨٤) له به‌غدابووین, گفتوگۆمان له‌گه‌ڵ حکومه‌تی عێراقی هه‌بوو, طارق عه‌زیز سه‌رۆکی وه‌فدی عێراق بوو, وه‌فده‌که‌مان جه‌نابی مام جه‌لال سه‌رۆکی بوو،قسه‌مان له‌سه‌ر دیموکراسی کرد, مام جه‌لا ل زۆرباسی ئه‌وه‌ی ئه‌کرد که‌ده‌بێت عێراق ببێت به‌عێراقێکی دیموکراسی، جائێمه دڵنیا ئه‌بین له‌ئۆتۆنۆمی له‌کوردستانا، طاریق عه‌زیز وتی (تۆ عیلاقه‌ت به‌عێراقه‌وه چییه، تۆباسی میله‌ته‌که‌ی خۆت بکه, تۆ له‌باتی خه‌ڵکی عه‌ره‌ب‌و, تورك, بۆباسی دیموکراسی ئه‌که‌یت) مام جه‌لالیش گوتی: تۆ دیموکراسیم بده‌ریٚ له‌عێراق من حکومی زاتیم ناویٚ, وتی دیموکراسی به‌دی بێنه یه‌کێتی نیشتمانی کوردستانیش هه‌ڵئه‌وه‌شێنمه‌وه، پێی گوت: که‌دیموکراسی هه‌بیٚ خه‌می گه‌وره‌مان نامێنیٚ. خه‌بات ئه‌که‌م بۆئه‌وه‌ی دیموکراسی به‌دی بێنم، من حیزبه‌که‌م ئامرازێکه بۆبه‌دی هێنانی دیموکراسی، که دیموکراسی هه‌بوو ئینسانێکی ئازادم له‌ماڵی خۆم, وڵاتی خۆم, دیموکراسی نییه بۆیه ته‌عریبم ئه‌که‌ی, دیموکراسی نییه بۆیه ته‌بعیسم ئه‌که‌ی, دیموکراسی نییه بۆیه ته‌هجیرم ئه‌که‌ی, دیموکراسی نی‌یه بۆیه هه‌موو هه‌ڕه‌شه‌کانم (لیٚ‌ئه‌که‌ی) هه‌ڕه‌شه‌ی نه‌مانم له‌سه‌ره, له‌به‌رئه‌وه‌ی دیموکراسی نییه. به‌ڵیٚ.. ئه‌و قسانه‌ی (مام جه‌لال) هه‌موو راستن. چونکه: گرفتی گه‌وره‌ی نه‌ته‌وه‌کانی وه‌کو ئێمه ئه‌وه‌یه, له چوارچێوه‌ی چه‌ندین وڵاتدا باسی ئۆتۆنۆمی ده‌که‌ین, که دیموکراسی تیا نییه. هه‌رگیزیش ئۆتۆنۆمی به‌بیٚ دیموکراسی نه‌هاتۆته‌دی. نه ده‌شیه‌ته‌دی.

ئێستا وڵاتێکی دیموکراسی وه‌کو سویسرا, دووسیٚ که‌مایه‌تی تیا ئه‌ژی, چونکه دیموکراسی له‌ویٚ زۆره, ئه‌وکه‌مایه‌تیه له‌شوێنێك دایان ناون بیٚ تاقه‌ت ئه‌بن, ئه‌چن بڵاوه بکه‌ن به سویسرادا, حکومه‌ته‌که خۆی کۆیان ئه‌کاته‌وه, ئه‌ڵیٚ وه‌رن مافی چیتان ئه‌ویٚ تابتان ده‌دینیٚ, بۆ ئه‌وه‌ی له‌روی نه‌ته‌وه‌ییه‌وه پێکهاته‌که‌یان نه‌شێویٚ, بۆخۆتان دانیشن لێره، مافه‌کانتان ئه‌گه‌رکه‌مه زۆرترتان ئه‌ده‌ینیٚ, قه‌ومیه‌ته‌که خۆی هیچی ناویٚ حکومه‌ته‌که، چونکه دیکوکراسیه ئه‌ڵیٚ وه‌ره‌باحوکمی زیاترت بده‌میٚ, به‌پێچه‌وانه‌شه‌وه, له‌مه‌کدۆنیا ببینن شه‌ڕوکوشتار له‌سه‌ر ئه‌وه‌یه له(٢٠٪) مه‌کدۆنیا ئه‌لبانی نشینن, داوای ئیداره‌ی خۆیان ئه‌که‌ن, داوای ئه‌وه‌ئه‌که‌ن, زمانی خۆیان ببیٚ به‌زمانێکی ره‌سمی, که‌چی ئه‌چنه‌سه‌ریان

ئـەیان کـوژن، ولاَتێکـی وەکـو سویـسرا لـە(٦٢٪) ئەڵمانیـە لـە(٢٠) فـەرەنـسیـیە لە(١٣٪) ئیطالیە, هەرسـێ زمانەکـەزمانی رەسمیـن لـەوێ, کـە یاسـا دائەڕێـژرێ بەهەرسـێ زمانەکـە دائەڕێـژرێ, بڕیارەکـە ئـەدرێ بەهەرسـێزمانەکەش دابـەش ئەکرێتەسـەر میللەتـەکانیان, ئیطـالیاکـان بـە ئیطـالی ئەیخوێنیتـەوە, فەرەنـسییەکان بەفەرەنـسی ئـەی خوێنێتـەوە, ئەڵمانیەکـەش بەئـەڵمانی ئەیخوێنێتـەوە, زمـانی رەسمـی سویـسری نییـە؛ ولاَتێك هەیـە نـاوی سویـسرایە زمانی رەسمی نییە، تەسـەوربکەن ئـەوەچ ولاَتێکە ئیطـالیـەکان لـە(١٣٪) ە لـە شـوێنێکا دانیـشتون, ئـەڵێن ئێمـە ئامـادەنین جلوبەرگـەی پۆلیـسی سویـسری لەبەرکەین، جلوبەرگی پۆلیـسی دەوڵـەتی ئیطـالیـا لەبەرئەکـەین، یـەعنی ئێـستا لەناوسویسرا ئیطالی نشینەکانی سویسرا پۆلیـسەکانیان جلـی پۆلیـسی ئیطـالـی لەبـەرە، هێنـدە ئـازادن لـەوێ باشـە ئـەم چارەسـەرە باشـە؟ یـان چارەسـەری تەیارەو دەبابەو کوشتنو مردنو قـەتلوعام؟ ئـەو ولاَتـە؛ ئیطـالیـەکان دڵـسۆزی سویسران, ئەڵمانیەکان دڵسۆزی سویسران, فەرەنسیەکان دڵـسۆزی سویـسران و رۆمانی کەمایەتیەکانی تـریش, کـە لـەوێ ئـەژین, هـەمووی دڵـسۆزی سویـسران، هیچیان خیانەت لەسویسرا ناکەن بۆ ئەڵمانیا بۆ ئیطـالیـا بـۆ فەرەنـسا, تائێـستا خائینێکیان نەداوەتە مەحکەمە.

سەیرکەن ئەمـەدنیایی دیموکراسیـە, لای ئێمـەش نەتـەوەی کـورد لـەو چـوار ولاَتەی تیائەژین, ئەوە حاڵمانە کە ئەیبین, بەحساب حکومەتی عێراقـی حکـومی زاتی دابـوینێ, پرۆگرامـی خوێندنەکـە بخوێنـەرەوە, هـەمووی ژاری بەعـسیانەیە دەرخواردی خوێندکاری کوردی دەدەن. هەرچیشتێ ئەخوێنێ ئەبی بە (بەعس) بەبێ ئەوەی بەخۆیبزانێ بەئیرادەی خوا ئەبێ بە(بەعس), بـەڵێ ئەگـەر تۆبتـەوێ تەخـەروج کـەی و بەتـەواوەتی مەنهـەجی خوێنـدنی بـەعس بخـوێنی, بێئـەوەی بەخۆت بزانی ناسیۆنالزمێکی عەرەبی بەعسیت لـێدەرئەچێ. صـەدام قـەولێکی هەبوو (کل عراقي بعثي وان لم ینتمي)ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا بە خوێنـدن و بەرنامـە و پـەروەردە و ئاڕاسـتە, هـەموو عێراقیـەکیان خـستۆتە ژێـر کاریگـەری خۆیانـەوە بـەزۆرداری. ئـەڵێن جارێکیـان سـەندیکای کرێکارانیـان کۆکردۆتـەوە, لەکۆبونەوەیەکا، کابرای مەسئولەکە لێی پرسیوون کـە کـێ بەعـسیە, یەکەیەکـە

هه‌موویان وتویانه ئا, کورێکى خه‌ڵکى سلێمانى تیابووه, وتویانه تۆ به‌عسیت وتویه‌تى من له جه‌ماعه‌تى (وان لم ینتمیم) یه‌عنى‌من به‌عسى نیم به‌ڵام به قه‌ولى صه‌دام به‌عسیم, به‌راستى عێراق به‌و مه‌نهه‌جه‌ى که‌ئێستا ده‌خوێندرێته‌وه, هه‌موو به‌عسى‌بون. ورده ورده ئێستا مه‌نهه‌جه‌که گۆڕاوه, به‌ته‌مابن سه‌رجه‌مى بگۆڕین.

له دنیاى ئازاد وڵات ئاسوده ئه‌بێت, وڵات پێش ئه‌که‌وێ, تواناکان پێش ئه‌که‌وێ, ده‌رفه‌تان ئه‌ره‌خسێ بۆئه‌وه‌ى ئینسان بژى, زیاتر بچێته‌پێشه‌وه, قسه‌یه‌ك له‌کورده‌وارى هه‌یه ئه‌ڵێ: تازه‌خۆمان له‌ده‌ست چوین خوا ئه‌قڵ به‌ئه‌ولاوه‌کانمان با, به‌ڕاستى تا ئێستا نه‌مانتوانیوه نه‌وه‌ى ئازادبین, له‌ده‌ست چووین، مه‌به‌ستم له‌مه به‌رنامه‌ى کار و پرۆژه‌ى ئازادى راسته‌قینه‌یه. ئه‌مه پرۆژه‌ى ئێمه‌یه, هى رێکخراوه‌کانمانه, ده‌سه‌ڵاته‌کانمانه, وه‌زاره‌ته‌کانمانه, حزبه‌کانمانه, ئۆرگانه مه‌ده‌نیه‌کانمانه, ئۆرگانه ئازاده‌کانمانه, ئه‌بێ ئێمه‌ش له‌سه‌ر رووبه‌رى ئازادى خه‌بات بکه‌ین‌و ژیان به‌ره‌و ئازادى ببه‌ین و ئینسان به‌گیانى ئازادیه‌وه په‌روه‌رده‌بکه‌ین.

# ئازادی ئەقڵ و سەرخستنی دیموکراسی (+)

## ڕینیسانس و ئازادی ئەقڵ

زۆر سوپاس بۆ ڕێگەپێدانم. من وەکو میوانی کۆڕەکان قسە ئەکەم, قسەکانیشم بابەتێکی ئامادەکراو نیە, تێکەڵەیەکە لە هەندێ مەسەلەی دیموکراسی و ئازادی ئەقڵ؛ ڕەنگە پێویستیش بکات لە دوا سەرەنجامدا بیبەستمەوە بە هەلومەرجی ئێستا و ئەزمونی ئێستا و ئەو ئەگەرانەی کە لەبەردەم ئەزمونەکەماندا هەیە. لەهۆڵەکەدا بڕیارم دا باسێك پێشکەش بکەم. لەبەر خۆئامادەنەکردنم لە کەموکورییەکانی ببورن. هیوادارم بتوانم سەعاتێك قسەتان بۆ بکەم, پاشان بابەتەکە بە گفتوگۆی ئازادی ئێوە دەوڵەمەندتر بکرێ.

باسەکە گرنگی ئازادی ئەقڵ و سەرخستنی دیموکراتییە، کە باسێکە هەم لەگەڵ دروشمی سەرەکی فێستیڤاڵەکە ئەگونجێت و هەم ئەرکێکی ئێجگار گرنگە بۆ ئێستا و هەم سەراپا پێچەوانەی بۆچوونە ئایدیالیستیەکانیشە, پێچەوانەی هەموو ئەو جۆرە بیروڕا سەلەفیو فەلسەفانەی سەدەکانی ناوەڕاستە، کە ئەقڵ قفڵ ئەدەن, ئەو بیروڕایانەی نایەڵن ئەقڵ ئازاد بێت و ئازادانە لە دونیا و لە پێویستیەکانی دونیا و لە گۆڕان و گۆڕانکاریەکانی دونیا تێبگا؛ بەش بە حاڵی خۆم، ناتوانم ئەو بابەتە کە هەڵەیە بێدەنگ بم بەرامبەریان. هەموو بێدەنگیەك بەرامبەر ئەرکە ڕاستەقینەکانی ئازادی و ئازادکردنی ئەقڵ, بەخزمەتکردنی دوژمنانی ئازادی ئەزانم.

باوەڕم بە دیالێکتیکە, باوەڕم بە گۆڕانە, هەر شتێك ئەقڵم نەیبڕێت باوەڕم پێی نیە, هەر شتێك ئەقڵم بیبڕێت باوەڕم پێیەتی. ئازادی ئەقڵی خۆم لەوەیا ئەبینم ئەقڵی خۆم بخەمەکار, کەس لەباتی ئەقڵی من بیرنەکاتەوە, هەرکەسێك بێت, هەر پایەیەکی کۆمەڵایەتی هەبێت, هەر پایەیەکی ئایینی هەبێت, هەرگیزاوهەرگیز قەبوڵی ناکەم لەباتی من بیربکاتەوە, خۆم خۆمم لەپێناوی خۆم

---

+ کۆڕێك لەفێستیڤاڵی گەلاوێژی نوێ، ٣/٨/٢٠٠٢.

و کۆمەڵ؛ قەناعەتی خۆم، ئەقڵی خۆم، ئەندێشەی خۆم، بۆچوونی خۆم لە هەر شتێك لەم دونیایە هەبێ و نەبێ، ببینم و نەیبینم، بیزانم و نەیزانم، ئەقڵم نەیبڕێ باوەڕی پێناکەم؛ بە ئەقڵی خۆم بیر لە هەموو شتەکان ئەکەمەوە. پێم وابێ ئەمە گەوهەری دیموکراسیە، گەوهەری ئازادیە، گەوهەری سۆسیالیزمە، گەوهەری عەدالەتی کۆمەڵایەتیە. بەبێ ئەمەش هەموو ئەو شتانەی ئەوترێ، جگە لە چەواشەکردنی ئەقڵ هیچ شتێکی تر نییە.

جارێ با ئازادی ئەقڵ لێکبدەینەوە؛ ئازادی ئەقڵ یانی چی؟ ئەقڵ باوەڕ و بیرکردنەوە ئەگرێتەوە، ئەقڵ پێکهاتەیەکی فسیۆلۆژیو بیرکردنەوەیەکی ویژدانیو هوشیاریو کۆمەڵایەتییە، بیرکردنەوەیەکە زمان دەبێتە ئاوێنەی ڕەنگدانەوەی بیرو بڕیارو بڕوای ئەقڵ. یانی کە تۆ ئەڵێی ئەقڵ ئازاد ئەکەم، مەبەستت ئازادی ئەقڵە لە لێکدانەوە و باوەڕی هەڵە کە لەناو کۆمەڵ و لەناو نەریت دا هەیە. خۆ یاساولێ لە مێشکا نیە بە کلاشنکۆفێکەوە وەستابێ نەیەڵێ مێشك بیربکاتەوە، خۆ سەربازێك نەخزاوەتە ناو شانەی مێشکەوە و نەیەڵێ بیربکاتەوە، ئەوەی مێشکی داگیرکردوە، ئەو ئاکارانەیە کە مێشك قبوڵی ناکات و بەپێچەوانەی ئەقڵ و ئەقلانیەت چەواشەیان کردوە، بەپێچەوانەی بیرکردنەوە باوەڕو بیریان خستۆتە مێشکەوە، بەبێئەوەی بەخۆت بزانی فەلسەفەیەك، ڕێگایەك، دنیایەك بیروڕای ڕۆحی و دنیاییان خستۆتە مێشکەوە، بەبێئەوەی ئاگات لێی بێت، لەپڕ لەخۆتەوە ئیسلامیت، مەسیحیت، جولەکەیت، نەقشیت، قادریت، شیعەیت، سونیت، حەنەفیتو شافیعیت، هیچ ئاگایەکیشت لەخۆت نیە؛ ساوا بم، شەش ساڵ بم، دە ساڵ بم، پانزە ساڵ بم، بەبێئەوەی بیروڕایان وەرگرتبم، یەکێك لەو ڕێگایانە ئاخنراوەتە ناو مێشکم. مەبەست لەم قسانە ئەوەیە کە هەموو ئەو شتانە لەمناڵیەوە ئاخنراونەتە مێشکەوە، قابلیی گفتوگۆ و پیاچونەوەن. بێگومان ئەم قسانەم ئەوەناگەیەنێ ئەو بیروبۆچونانە سەراپا ڕەتبکەمەوە، نەخێر، باوەڕم بەو ڕاستیەیە کە هەموو ئەو شتانە ئەبێت مناقەشەی بکەینەوە، هەموو ئەو شتانە قابیلی پیاچونەوە و سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنەوەن، کە بێگومان دوای ئەوەی کە بیروڕای تازە دێتەناومان، دوای ئەوەی هۆشمان دێتەوە هۆشی خۆمانو ئەقڵمان ئازاد دەبێ، سەرلەنوێ حوکم لەسەر باوەڕەکان بدەین، ئەوەی قبوڵمانە لەسەری ئەڕۆین و ئەوەی قبوڵیشمان نییە، وازی لێدێنین.

ئێستا کە خەریکی سیستمی دیموکراتین, خەریکی فەلسەفەی تازەین, خەریکی بیروڕای جیاوازین, خەریکی دنیای مادین, خەریکی مۆدێرنێتەین, خەریکی مەدەنیەتین, خەریکی عەلمانیەتین, خەریکی سەربەستین, خەریکی مەسەلەی ژنین, خەریکین رابردوو لێکئەدەینەوەو هەڵێئەسەنگێنینەوە, دوای ئەمانە هەموو شتەکان قابیلی ئەوەیە پیابچینەوە, لایەنی چاکەی ببینین, لایەنی خراپەی رەت بکەینەوە. دیسان دەیڵێمەوە؛ هەموو ئەو شتانەی کە ئەقڵ نەیبڕێ, ئەقڵ قبوڵی نەکات, ئەقڵ ئازادانە بیری‌لێئەکاتەوە, یان سەپێنرابێتەسەر بیروهۆش, هەقی سروشتی مرۆڤە پیابچێتەوە و لێکی‌بداتەوە و بژاریان بکا. ئازادی ئەقڵ, یانی: گێڕانەوەی ئەقڵ بۆ خودی مرۆڤ و پێدانەوەی داوەری ئەقڵە بۆ حوکمی زانستی‌و سروشتی‌و ئەقلانیەت.

پێش ئاینەکان ئەقڵی مرۆڤ داگیرکراوە, دوای ئاینەکانیش هەروایە, ئێستاش ئاسەوارێکی ئێجگار زۆر داگیرکراوی لەسەر ئەقڵی مرۆڤ ماوە؛ خۆتان ئەزانن ئەگەر هەموو ئەو ئاین و مەزهەب و عەقیدانەی کە ئایدیالیستین، یا میتافیزیکین، یا ئەودیو سروشت لێکئەدەنەوە, لێکبدەیتەوە، تەنها سێ ئاینەکەی ئاسمانی نیە قسەی لە مەسەلە بنچینەییەکانی ژیان‌و ئاین کردبێ. زۆر شت هەیە پێش ئەو ئاینانەش باسکراوە. لەسەردەمی فیرعەونەکان, لەسەردەمی دوای ئەوان, کۆمەڵێك مەسائیل لەسەر وەحدانیەتی دنیا, لەسەر خوا, هەتا لەسەر کۆمەڵێ لەو مەسائیلانەی کە ئێستا زۆر زۆر پیرۆزن لای هەموو ئەو ئاینانە, دوو سێ هەزار ساڵ پێش ئەم ئاینانە قسەیان لەسەرکراوە و هەندێك دەق هەیە زۆر کۆنترن لەئاینەکانیش کەچی زۆر نزیکە لە کۆمەڵێك لەو دەقە پیرۆزانەی کە لەم ئاینانەدا هەیە. ئەمە جگە لەوەی ژیان لەگەڵ گۆڕانکاری رۆژگاردا, بەردەوام دەگۆڕدرێ. بەڵام ئاسەواری هەندێ بیروڕای کۆن هەر ماوە و زۆریش دەمێنێ, ئەوە دوای ئەوەش دەگوێزرێتەوە. ئەمە سەبارەت هەموو ڕوویەکی ژیان وایە. چ دەسەڵاتەکان و چ فەلسەفە و بیروڕاکان. دەسەڵاتی عەشایەری, چ دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی, چ باوکسالاری, چ دایکسالاری, چ مەسائیلی سایکۆلۆجی, چ دوای ئەوە دەسەڵاتی دیموکراتی, هەروا ئایدیۆلۆژیەکان, فەلسەفەکان, هەموو ئەمانە ئەگەر یەکە بە یەکە لێکیان بدەینەوە, لە زەمانی خۆیانا بەشێوەیەك لە شێوەکان هەندێکیان ئاسەواری سلبیان هەیە لەسەر ئەقڵ‌و ئازادی ئەقڵی مرۆڤ , هەندێکیشیان بە چاکە کاریان لەسەر ئەقڵ‌و هۆشی مرۆڤ کردووە.

لەزەمانی میتۆلۆژیاکانەوە بۆ لاهوتیەت, ئینجا بۆ سەردەمی باڵادەستێتی میتافیزیکیەت و پاشان عەقیدە و ئاینەکان, کاریگەری جۆراوجۆر بەدرێژایی مێژوو هەبووە. گەورەترین وەرچەرخان لە مێژووی مرۆڤایەتی بۆ بەئازادکردنی ئەقڵ، لەسەردەمی رێنیسانسەوە دەستپێدەکات, لەوێوە ئیتر ئەتوانین قسە لەسەر ئازادی و جەنگی ئازادی ئەقڵ بکەین. لەوەوبەر, ناتوانین وەکو مەنهەجێکی دوورودرێژی حیزبی, وەکو پرۆژەیەکی تایبەتی ئەم و ئەو فەلسەفانە, لە هیچ خیتابێك بۆ ئازادی ئەقڵ بەتاقی تەنها قسە لەسەر لایەنێك بکەین؛ پێش رینیسانس تەنانەت لەسەردەمی شارستانیەتی یونانیەکانەوە هەوڵ هەیە, قسە هەیە, بیروبۆچونی جیاواز جیاوازییش هەیە, موعتەزلەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی (ئیسلامی) هەن, خەڵکی تریش هەیە. بەڵام هیچی ئەم بیروڕایانە نەبووە بەپرۆژەیەك وەکو رێسایەك لە رێسا نەگۆڕەکانی ژیان؛ بەڵێ لەمێژوودا هەوڵی جیاواز و ئازاد هەبووە, بەڵام خەفەکراوە, نارەزایی بووە و دامرکێنراوەتەوە, لە دوا ئەنجامدا هەموو ئەو فەلسەفە و بۆچون و رێباز و نەریتانە باڵادەست بوون کە بەشێوەیەکی رەها ئەقڵی خەڵکیان قفڵداوە, کە دەسەڵاتێکی گەورەی دنیایی و رۆحییان لەخۆیانا کۆکردۆتەوە. ئەمیش ئایینی ئیسلام و ئاینی مەسیحییە؛ ئایینی مەسیحی ئاوێتەی دەسەڵاتی رۆمی بێزەنتی بوو, ئیسلامیش خۆتان ئەزانن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو دورگەی عەرەبی, هەندۆکەیەك لە ئۆروپاشیان داگیرکرد: لە ئیسپانیا و هەندێك لە هەنگاریا و دەستیشیان گەیشتە هندستان و هەندێك لە وڵاتانی تر؛

دیموکراتی لەسەردەمی رێنیسانس بەدواوە, وەکو بیر و ئەندێشە سەریهەڵدا و زەمینە رەخسانەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فەیلەسوف و رۆشنگەرەکانی سەردەمی رێنیسانس. هەموو ئەو کۆشش و تەقەلایانەی رۆشنگەرەکان, فەیلەسوفەکان, ئەندێشمەندەکان, زانا و داناکانی سەردەمی رێنیسانس هەوڵیان لەسەردا لە کێشەی فەلسەفی, لە کێشەی ئەقڵانی, لۆژیکی, کۆمەڵایەتی, لە کێشەی سایکۆلۆجی و زانستی, هەموو ئەو زانستە مرۆڤایەتی و زانستە سروشتیانەی کە لەبارەی مەسائیلی بنەڕەتی مرۆڤەوە ئاشکرا قسەیان لێکرا, دوو سەد ساڵ پێش سەرکەوتنی شۆڕشی پیشەسازی و دیموکراتی لە ئۆروپای رۆژئاوادا, قسە لەسەر ئەو مەسەلانە کراوە و داوەری لەسەر گرنگترین مەسەلەکانی ژیان، کە گەڕانەوەیە بۆ ئەقڵ, بۆ چۆنێتی ئازادکردنی ئەقڵ,

بینراوەتـەئاراوە. ئـازادکردنی ئـەقڵ لـە بـاوەڕی ڕەهـای نـەبینراو، بـۆ بـاوەڕی زانسـتی بینـراوی گـەردون و ژیـان. حوکمـدان لەسـەر نـەبینراو حـوکمی ڕامانـە، حوکمی جۆراوجۆری ڕوحیـە. بـەڵام حوکمـدان لەسـەر شـتە بینراوەکـان حـوکمی زانستین. حوکمی بەڵگە و سەلماندنە زانستیەکانن.

لە سەردەمی دادگاکانی پشکنینی دەسەڵاتی ئایینی مەسیحیەوە، ناکۆکی لە ئاشـتی نـەهاتووی نێـوان ئـەقڵ و خورافـات، لـەنێوان سـەلماندنی زانسـتیانە و نەسـەلماندنی ئایدیالیستیانە، بەردەوامـە. لەوسـەردەمەوە دادگـای پـەلاماردانی ۆژێـك هەیـە. دادگاکـان، دادگـای پـشکنینی مـاڵ نـەبوون بۆئـەوەی جلوبـەرگ دۆزنەوە، یا خـەنجەرێك بدۆزنـەوە، بـەڵکو دادگـای پـشکنینی ئـەقڵ بـوون، هـەر ـەقڵێك پێـچەوانەی دەسـەڵاتە ڕەهاکـانی مەسـیحی بیریکردبێتـەوە، بـەتاوانکار زانراوە، زانا بوبێ ڕاونراوە، فەیلەسوف بـووە ئەشـکەنجەدراوە، یـان سـوتێنراوە یاخود کـوژراوە. هـەموو ئـەو ڕێگایانـەی لەسـەر دەسـەڵاتی ڕەهـای مەسـیحیەت کاریگەربوون، دوژمنایەتیەکی زۆر کـراون، ئـەو ڕێگایانـەش ڕێگـای ئـەقڵ بـوون، ڕێگای زانستی بوون، ڕێگای فەلسەفە بوون، ئەم ڕێگایانە دوژمنی خوێنـەخۆرەی دەسەڵاتی ئاینی مەسیحی بوون، بۆیە ئابوریزانەکانی ئەوکاتـە کـە بەشـێوەیەکی دنیایی بیریان کردۆتەوە پەلاماردراون.

ئـەم هـەموو تەقەلایانـەی کـە باسمـانکرد، سـەردەمێکی ئێجگـار گـەورەیان ڕەخـسان کـە ئـیتر گەشـەکردنی بازرگـانی بـەرەو مانیفاکتـەر و ئینجـا بـەرەو پیشەسازی، پیشەسازیش بەرەو شۆڕشی گەورەی زانست و دۆزینەوەی کۆمەڵێك ئەحکامەکانی ژیانی کۆمەڵایـەتی، بـەپێی مـەنتقی کۆمەڵایـەتی و هـەڵقوڵاوی نـاو کۆمەڵەوە، ئینجا دۆزینەوەی ڕێگەچارە سیاسیە دنیاییەکانی ئێستا، کـە ڕێگـەی دیموکراتی و کۆمەڵناسی زانستیو زانستە مرۆییـیو سروشـتیەکانە ئەمانـەش بـۆ سەردەمی خۆیـان کۆمـەڵێك ئەندێـشەی تـازەبوون. ئەمانـە هـەمووی زەمینـەیان خۆشـکرد کـە چینێکی تـازە بـەناوی چـینی بـۆرژوازی بتوانـێ ئـەم داهێنانـە بقۆزێتـەوە و بیکاتـە بەرنامـە و پـرۆژەی کـاری خـۆی، بۆئـەوەی دەسـەڵاتی ئوتوکراتیـەت و کاریگـەری ڕەهـای لاواز بکـا و پاشـان سیـستمی دەرەبەگایـەتی لەناوبـەرێ و سیستەمێك بێتـە سـەر تـەخت کـە سیـستمی دیموکراتییـە، دیـارە ئەمەش ژانێکی ئێجگار گەورە بووە، خەباتێکی دوورودرێژ بوو، کە بێگومان وەکـو وتم جگە لە قوربانیەکانی، مەینەتی و چەرمەسـەری ئێجگـار گـەورە و جـەرگ بڕ

بەسەر بەشەریەتدا لەوسەردەمەدا هاتووە, هاوشانی ئەو راستیانە ئەتوانم بڵێ
تاوانی گەورە و کاری خراپیش لەو سەردەمەدا هەر بەناوی شۆڕشەوە
ئەنجامدراوە, لەوانە شەڕی ناوخۆ و غەدری گەورە بەناوی دیموکراتیەوە, بەڵا
سەرەنجام تەوژمی پێویستیە مادیەکانی گۆڕانکاری لە ژیان, نەك لە دەرەوەی
بازنەی دەسەڵاتی ئایین، لەناو چین‌و توێژە تازە سەرهەڵداوەکان بەتەنها, بگرە
لەناو ئاینەکەش, کە دەسەڵاتی ئاینی مەسیحی بووە, ئەو بۆچونە نوێ و شۆڕشر
و ئازادیە رەنگێکی زۆری هەمەلایەنەی داوەتەوەو ریفۆرمیستەکانی ناو ئاینی
مەسیحی لە: ئینگلتەرا, ئیسپانیا, ئیتالیا, ئەڵمانیا و فەرەنسا, دەورێکی
گەورەیان بینی لەوەی کە دەسەڵاتی رەهای ئایین کەم بکەنەوەو بەرەو نەوەی
نوێ و, ئەندێشەی تازەی بهێنن, یانی لە ئەنجامدا دەسەڵاتی ئاینی مەسیحی
نەك نەیتوانی خۆی والێبکات کە کاریگەریە تازەکان کاری تێنەکەن, بگرە
وردەوردە کارگەریەکانی دەرەوەی خۆی کاریان لەناو بازنەی موقەدەساتی
ئاینەکەش کرد. جگەلەوەی روبەرێکی فراوانی رۆشنبیران, رۆشنگەران,
بیرمەندان, زانا, داناو خەڵکی کۆمەلایەتی‌و خەڵکی موسڵیحیان هێنایە ژێر
هەژمونی خۆیان, ئەم نوێگەریە رەنگی لەناو دەسەڵاتی موتڵەقی ئاینی
مەسیحی دایەوە و هەندێك لە قەشەکان، لە بیرمەندانی گەورەگەورەی مەسیحی
لەسەردەمی خۆیا لە دەسەڵاتی موتڵەقی مەسیحی هەڵگەرانەوەو ببوون بە
ئاوارەو دیلی گەورەی ریفۆرم‌و ئازادی و دیموکراسی ئەوکاتە, ئینجا وردەوردە
چونە ناو خەباتی نەتەوایەتی و نیشتمانی خۆیان و لەناو سنوری نیشتمانی
خۆیانا، کێشەی نیشتمانیان لەدەسەڵاتی تۆتالیتاری مەسیحی جیاکردەوە, کە
ئەوکاتە هیچ میللەتێك, هیچ نەتەوەیەك, هیچ گروپێك لە گروپەکانی سەر ئەرز
نەیئەتوانی جگە لە دەسەڵاتی تۆتالیتاری مەسیحی بەشێوەیەکی تر بیربکاتەوە
تەنانەت لەبەرامبەر زمانی زگماکیشدا.

وردەوردە هەموو ئەمانە گۆڕا؛ کیتابە پیرۆزەکان لە زمانی لاتینیەوە بۆ
زمانی زگماکی وەرگێڕدران؛ کەنیسەی نیشتمانی دروستکرا و تێکەڵ بە سیستمی
تازە کرا, تێکەڵاو بە هەڵبژاردن کرا, تێکەڵاو بە بازرگانی کرا, تێکەڵاو بە زانست
کرا, تێکەڵاو بە زانیاری کرا و, ئیتر وردەوردە وایلێهات لەباتی ئەوەی دەسەڵاتی
تۆتالیتاری مەسیحی بەتاقی تەنها حوکم بکا, بەپێچەوانەوە، شکستێکی گەورەی
خوارد و, لە ئەنجامدا وایلێهات کە هەتا هەتایە لە دەسەڵات دوریکەوێتەوە.

ئێستا خۆیان و خوای خۆیان، دەسەڵاتی دنیاو مەسەلەی دنیاییەکەشیان بۆ دیموکراتیەکان و ئازادیخوازەکان و عەلمانیەکان جێهێشت.

دوای ئەم سەرکەوتنانە لەسەردەمی ڕێنیسانسەوە بۆ سەرکەوتنی شۆڕشی دیموکراتی، ئەو زنجیرە سەرکەوتنانە وایکرد کە روخساری هەموو ژیان و گەوهەری سیاسەت و ژیانی کۆمەڵایەتی، بیرکردنەوەی مرۆڤ، هەموویان بگۆڕین و سەرکەوتنەکانی شۆڕشەکانی ئەوروپا بەتایبەتی فەرەنسا، ئینگلتەرە، ئیتالیا، ئیسپانیاو ئەڵمانیا، کاریگەریەکی فراوانیان لە هەموو دنیا هەبوو.

ئەگەر مێژوو زانستیانە بخوێنرێتەوە، دەزانرێ لە دوو سەدەی رابوردودا کاریگەری گۆڕانکاری بەهەموو دونیادا دیارە، تەنانەت لە کوردستانی خۆمان پێش دەرچوونی یەکەمین رۆژنامەی کوردستان کە سەد ساڵیشی تێپەڕاند، سەردەمی میرنشینەکان، شۆڕشی سەردارانی ئەو سەردەمە، هەتا پاشای کۆرەی رەواندوز، سەرکردە ئاینیەکان، شاعیران کە هەندێکیان موتەسەوفیش بوون، بەڵام سەیری ئەحمەدی خانی بکە، سەیری حاجی قادری کۆیی بکە، سەیری نالی بکە، تەنانەت سەیری مەحوی و زمانی پاراوی بکە، سەیری مەلای جەزیری بکە، سەیری مەولانا خالیدی نەقشی بکە، ئەو هزرانەی ئەوان تەرحیان ئەکەن، ئاماژەی نەتەوەییان زۆرە. تەنها نوسینی شیعر بە زمانی کوردی پەتی لەسەردەمی دەسەڵاتی موتڵەقی ئیسلام دا، خۆی لەخۆیا جۆرێك لە یاخیبوون لەو دەسەڵاتە ئیسلامی–عەرەبییەی کە پێشتر هەزار و دوو سەد ساڵ سەپێنراوە و سەپاندنی ئاینەکەش تەنها زمانی عەرەبی لا مەبەست بوە و بەس. زمانەکانی تر، جگە لە زمانی عەرەبی، هیچ کارێکیان پێنەکراوە، وردەوردە هەوڵدراوە زمانەکانی تر نەمێنێت، زۆریش زمان هەیە لەسەردەمی دەسەڵاتی رەهای ئیسلامیا نەماوە و زۆریشمان هەیە لەسەردەمی دەسەڵاتی موتڵەقی مەسیحی، بە زمانی لاتینی کاریگەریەکی ئێجگار سلبیان لەسەرکرا. لە ئەوروپادا کە ریفۆرمخوازەکان لەسەردەمی رینسانسدا زمانی زگماکیان هەڵبژارد، ئەمە شۆڕشێکی گەورەبوو. لە کوردستانیشدا هەروایە، کاتێك شاعیرانمان زمانی عەرەبی قورئان وازلێدێنن و زمانی زگماکی کوردیی هەڵدەبژێرن، ئەمە بەرپەچدانەوەیەکی ناسیۆنالیستی گەورەیە بۆ کولتوورو زمانی عەرەبی. بەبێ ئەوەی رینسانسیش لە کوردستاندا رویدابێ. بەڵام کاریگەری گۆڕانکاری دەوروبەر و جیهان لەم بارەوە بۆ کورد هەبووە. بەتایبەتی کاریگەری لەسەر

ئێران و فارس, لەسەر تورك, ئەمانیش لەسەر کورد هەیانبووە. کەچی دەبینین ئەو میللەتانەی زمانی زگماکیان فەرامۆش کرد, زمانەکانیان بەجاریێ کوژایەوە, هانایان بۆ زمانی تر بردووە. ئێستا ئاسەواری هەندێك لە زمانەکان لە دەوڵەتانی ئەسکەندەنافیا هەر نەماوە, ناچار چون زمانی تریان قەرزکردووە. هەروەها لەرۆژهەلاتیشدا.

## ئەرکەکانی دوای دیموکراسی

دوای سەرکەوتنی سیستمی دیموکراسیو هێنانەدی پێویستیەکانی سەرخستنی سیستمی دیموکراسی لەدەسەلاتو دەستوری دیموکراتی, ژیان بەوە ئاوەستێ و پێویستیەکانی مرۆڤ و کۆمەڵ, خواست و خولیاو پێداویستی تر ئەخولقێنێ. گوتمان: دوو سەدە پێش شۆڕشی دیموکراسی بە بیرو فەلسەفەو زانست زەمینەی سەرخستنی شۆڕشی دیموکراسی رەخسێنراوە. دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکەش, فشاری رای گشتی لە چەسپاندنی ئۆرگانەکانی دیموکراسیدا زۆر گرنگە. گریمان دەستورێکیش دانرێ؛ هەتا ئەگەر بەبێ هەڵبژاردن بێت, کە هیچ دەستورێك لە دەستورەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بە ئیمەشەوە دەستورێکی پەسەندکراوی گەل نییە, بەپێچەوانەوە هیچ دەسەلاتێك لە رۆژئاوادا دەستوری نییە گەل پەسەندی نەکردبێ, تەنها بریتانیا نەبێ دەستوری هەمیشەیی نییە, لە ئۆروپادا دەسەلات ئەگۆڕێ؛ بەلام دەسەلات بۆی نیە دەستور بگۆڕێت, هیچ دەسەلاتێك, هیچ سەرۆکێك, هیچ وەزارەتێك, بۆیان نیە دەستکاری دەستورەکان بکەن, کە لەلای ئێمە ئەو دەستوارانە نیە, باشترین دەستور, باشترین یاسا, باشترین دەسەلاتی سیاسی لە باشترین ولاتی رۆژهەلات و دەوڵەتانی وەکو خۆمان, رژێمەکانی کەی بیانەوێ دەستورەکەی ئەگۆڕن, یان پێشێلی ئەکەن. هەموو ئەو شتانەی پەیوەندن بە دەسەلاتێکی سیاسی دیموکراسیەوە، دەسەلاتەکان بەتاقی تەنها هەموو پێویستیەکانی دیموکراسی دابین ناکەن بۆ خەلك, لە رۆژئاوادا کە دەستور پەسەندکراوی گەلە, ئینجا هەموو دەستکەوتە دیموکراسیەکان تەنها دەسەلات نایانهێنێتەدی. چ جای بۆ رۆژهەلات. هەموو ئەزمونە دیموکراسیەکانی دنیا لە پێشکەوتوترین ولات هەتا دواکەوتوترین ولاتی دیموکراسی سەرجەم ئەرکەکانیان تەنها دەسەلات نایانهێنێتەدی. بەلکو فشاری رای گشتی رۆلی کاریگەری لەهێنانەدی دیموکراسیدا هەیە. بۆنموونە فەرەنسا کە بەهەلە تێگەیشتووین گوایە شۆڕشی

دیموکراسی لەدنیا لەفەرەنسا یەکەم جار سەرکەوتووە, وانیە, ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە, یەکەمین شۆڕش لە دنیادا لە فەرەنسا سەرنەکەوتووە, بەڵکو چەمکە هەرە ئەساسیەکانی دیموکراسی لە فەرەنساوە سەریهەڵداوە, لانکی سەرکەوتنی شۆڕشی دیموکراسی و لانکی هەڵگەڕانەوە لە هەموو عەقیدە کۆنەکانی سەدەی ناوەڕاست, پێش فەرەنسا, لە بریتانیا بەفراوانی دەستپێدەکات" کەنیسەی نیشتمانی یەکەمین جار لە بریتانیا گۆڕدراو لە (پاپا) دابڕا. هەڵگەڕانەوە لە زمانی لاتینی و گەڕانەوە بۆ زمانی زگماکی نەتەوایەتی دیسان یەکەم جار لە بریتانیا سەریهەڵدا* . شۆڕشی فەرەنسا دروشمەکەی, خیتابەکەی, سەرکەوتنی لە زەمانی شۆڕشی فەرەنسا کاریگەریەکی فراوانی هەبوو, فرەگیر بوو, بەڵکو دروشمی شۆڕشی فەرەنسی (ئازادی, یەکسانی, برایەتی) دروشمێکی جیهانگیریش بوو بۆ هەموو میللەتەکانی دنیا. ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا, مێژووی ئۆروپا بخوێننەوە, بریتانیا پێش شۆڕشی فەرەنسا کەوتووە. هەتا ئیسپانیا و ئیتالیا لە چەکەرەکردنی رێنسانس و سەرکەوتنی چەمکەکانی رێنسانس پێش ئینگلتەرەش ئەکەون, ئیتالیا پێش ئینگلتەرەو پێش ئەڵمانیا, پێش فەرەنسا, پێش هەموو ئەوانە ئەکەوێ و ئیسپانیاش دەورێکی گەورەی هەیە کە بەداخەوە لەلای ئێمە نەناسراوە, ئیتالیا لە مەسائیلی هونەری, ئەدەبی, تێکەڵاوکردنی فەلسەفە و شۆڕشی دیموکراسی, دەسەڵاتەکانی رێنسانس لە میرنشینەکانی ئیتالیا دەورێکی ئێجگار گەورەیان بینیوە کە هەست ناکەم نە لە نوسینا, نە لە زۆر دیالۆگەکانی دونیای ئێمەدا ئاوڕی پێویست لەو مەسەلانە درابێتەوە.

دێمەوە سەرئەوەی کە دیموکراسی دوای سەرکەوتنی وەکو دەسەڵات, کە میللەت دەستور پەسەند دەکا و دەسەڵاتە سیاسیەکەی هەڵدەبژێرێ, ئیتر ئایە ئەمە کۆتایی پرۆسیسی دیموکراسییە؟ نەخێر جارێ زۆر زۆری ماوە, هەتا ئێستاش کە قسە لەو مەسەلانە ئەکەین پرۆسیسی دیموکراسی ماویەتی, بۆ بەڵگەش: ئەگەر کاروانی دیموکراسیو بەدیهێنانی ئەرکەکانی هێشتا رێگایەکی دوورودرێژی لەبەردەم نەمابێ و ئەگەر قۆناغی دیموکراسی تەواو بووە, بۆ سۆسیالیزم لەو وڵاتانە دانامەزرێ؟ بەپێی پێشبینی هەموو سۆسیالیستەکانی

---

* لەکاتی گفتوگۆی ئەم بابەتە, بەڕێز (عەلی تەتەر) میوانێکی دهۆکی فێستیڤاڵ, ئاماژەی بەوەدا کە یەکەمین جار لە سویسرا هەوڵی شۆڕشی دیموکراتی دراوە, بەڵام لە چوارچێوەیەکی تەسکدا ماوەتەوە. ئەمەیان راستە. بەڵام شۆڕشی بریتانیا فراوان و کاریگەر بوو.

دنیا، دوای تەواوبونی ئەرکەکانی شۆڕشی بۆرژوازی، دەبوو سۆسیالیزم بێتەدی. کەچی دەبینین، هێشتا پرۆسەی دیموکراسی ڕێگەی درێژی ماوە بیبڕێ. من نامەوێ بڵێم مارکسیەکان، یا سۆسیال دیموکراتیەکان راست دەکەن، ئەمەیان مشتومڕێکی تیۆری قوڵە ئێرە جێگەی نییە. بەلام دەڵێم: ئەگەر دیموکراسی ڕێگایەکی دورودرێژی نەماوە ئیتر ئەم خەباتە هەمەلایەنەی لە ئۆروپادا نەدەویست بۆ دیموکراسی دەدرێ. بێگومان هێشتا ئەرکەکانی دیموکراسی ماون، بۆیە کۆسپەکانی بەردەم بونیتنانی سۆسیالیزمیش لە ئەوروپایا هەرماون. لە ولاتانی ئەسکەندەنافیاش هەرماوە، ولاتەکانی ئەسکەندەناف سوید و فنلندەو دانیمارکو نەرویجە، لەناویاندا سوید لە هەموویان پێشکەوتووترە، کەچی ئێستا لە سوید ژن لە پیاو موچە کەمتر وەرئەگرێت، ژن ۸۰٪ تا ۸۵٪ موچە وەرئەگرێت، پیاو ۱۰۰٪ وەرئەگرێت، لەهەر حەوت چرکەساتێك ژنێك لە سویدا ئەچەوسێتەوە، کلتوری پیاو هێشتا زاڵە، ئەمە پێشکەوتووترین، عادلترین ولاتی سەرمایەداری دیموکراسیە لە دنیایا، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك تەنگوچەڵەمەی گەورەی مناڵ، گەورە، بچوك، نەریتی مرۆڤ و کۆمەڵ هەیە کە لە ئەوروپا ناچێت بەئەقڵیانا، بۆ نموونە شتێك لە سویدا هەیە لەباتی جگەرە ئەیکەنە دەمیان، نازانم چی پێئەڵێن، لەلای خۆمان تووتنێکە ئەیکڕن، ئەیکەنە ژێر لێویان، لە خانەقین پێیئەگوترێ (دەبە) شتێکی دواکەوتووی سەدەکانی ناوەڕاستە. یەکێك لەو هۆیانەی کە ساڵەها نەیانهێشت سوید بچێتە ناو بازاڕی ئۆروپای هاوبەش، ئەو نەریتە دواکەوتووە بوو. هەتا سوید بەڵێنی نەدا بنەبڕی بکا، بڕیاری ئەندامەتی ئۆروپای هاوبەشیان بۆنەدا. بەڵێ لەوێ توتن هەڵمژین عادەتێکی کۆنەپەرستیە، جا وەرە لای ئێمە بیژمێرین سەدەها نەریتی کۆنەپەرستی هەن، لێکیبدەنەوە لەوێ گەشتوونەتە چی و ئێمەش لەکوێین؟ چەند ئەقڵمان جیاوازە، چەند پێوەرەکانمان جیاوازە، چەند ئەقڵمان داگیرکراوە؟

## دیموکراسی و عەلمانیەت و مەدەنیەت

سیستمی دیموکراسی دوو بنچینەی ئێجگار گرنگی دەوێ؛ یەکێکی عەلمانیەتە، ئەوەی تریش مەدەنیەتە. بەبێ ئەو دوو بنچینەیە مەحاڵە قسە لە دیموکراتی بکەیت. بۆ؟ لەبەرئەوەی دەوڵەتە ناعەلمانیەکان دین و دەوڵەت تێکەلاو ئەکەن، کە دین و دەوڵەتیش تێکەلاوبوو، یاساکانیش شەرعین، مەزهەبین، یاساکانی سەردەمی مەسیح، سەردەمی ئیسلام، سەردەمی

کۆنفۆشیوس، سەردەمی بوزیەکان، سەردەمی هیندۆسیەکان دەسەپێندرێن. ئەم هـەموو سـەردەمانە لەمێـژوودا هەریەکـە و یاسـا و ڕێـسای خۆیـان هەیـە، شەریعەتێکی هەیە، دەستورێکی هەیە، دەسەڵاتێکی هەیە، هەر ئایین و مەزهەب و عەقیدەیەك لەوانە نەریتی دەسەڵاتی دینی و ڕۆحی بۆخۆی داناوە، ئەگەر تـۆ دین و دەوڵەت لەیەك جیانەکەیتەوە و دەستورێکی دنیایی لەڕێگای سیستمێکی عەلمانی لەسایەی سیستمی دیموکراسی، دانـەنێی، هـەرگیز نـاتوانی ئـەقڵ ئـازاد بکەیت و ئەقڵیش ئـازاد نـەبێ، مەحاڵـە بتـوانرێ شارسـتانیەتی سـەردەم بنیـات بنرێ.

گەڕانـەوە بـۆ سـەدەکانی ناوەڕاست، کۆمـەڵێك ڕق لەبەرامبـەر پێشکەوتن و مۆدێرنێتـەوە دەوروژێنـێ کـە هـەرگیز لەگـەڵ گۆڕانکاریـەکان ناگونجێـت. چـۆن دەکرێ بەزۆری زۆرداری، بـە تـیرۆر و هەڕەشـە، بـە تۆقانـدنی ڕۆحـی، بـیروڕای سەدەکانی ناوەڕاست بـسەپێنرێتەوەسەر سـەردەمی ئەنتـەرنێت و جیهـانگیری؟ ئەم یاسایە هەزارو چوار سەد سـاڵ هەڵگێڕدرێتـەوە و لەسـەردەمی مۆدێرنێتـە و سەتەلایتدا، لەسەردەمێکا کە ژیان پێشکەوتنەکەی مایەی سەرسوڕمانە، یاسـا و نـەریتی هـەزار و چـوار سـەد سـاڵ لەمەوبـەر بـسەپێنرێتەوە. ئـەم کێـشە چارەسەرنەکراوە، خەمێکی گەورەیە لەمێژووی ئێستا، بێگومان ڕێگـە لەبـەردەم گۆڕانکاری ئایندەگرتنیش، خەمێکی ئێجگار گەورەترە.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان (بیست و حەوت) ساڵە دامـەزراوە (٢٧) سـاڵ بۆ تەمەن چییە؟ کەمتان هەیە (٢٧) تەمەنی نـەبێت، سـەرەڕاش ئێـستا یـەکێتی خەمی ئەوەیەتی لە دوهەمین کۆنگرەوە، بەشـی زۆری بۆچـونەکانی بگـۆڕێ کـە کەمترین شتی عیلاقـەی بـە (٢٧) سـاڵی ڕابردوومانـەوە هـەبێ، دوای (٢٧) سـاڵ تێگەیشتووین هەموو ئەوانەی لە شاخ وتومانە کوت و مت قـابیلی ئـەوە نیـە لـەم گۆڕانکاریانـەدا دەرخـواردی خـەڵکی بـدرێ. ئەگـەر سـەیری بەرنامـەی یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان لـە دووەمـین کـۆنگرە، سـەیری پێکهاتـەی سـەرکردایەتی یــەکێتی و ئۆرگانــەکانی، خیتــابی سیاســی و فەلــسەفی یــەکێتی بکــەن، پەیوەندیـەکی کـەمی بەسـەر سـەرەتای دامەزرانـدنی یـەکێتی نیـشتمانی کوردستانەوە هەیە. (٢٧) ساڵە دامـەزراوە دەبـێ بەرنامەکـەی و سیاسـەتەکەی بگۆڕێ، ئیتر چۆن ئەتوانم بگەڕێمەوە بۆ هەزارو چـوار سـەد سـاڵ لەمەوبـەر، کـە ئەو زەمانە سـەراپا بەسەرچووە. مـن نـاڵێم هیـچی ئـەو زەمانـە قـەبوڵ نـاکرێ،

چونکه کۆمەڵێك شتی هەیە بۆ ئێستاش دەشێت. چۆن لەئەدەبی کلاسیکیا زۆر شت هەیە بۆ ئێستاش ئەشێت, لە فەلسەفەی کۆندا هەیە بۆ ئێستاش دەشێت, لە ئاینەکانیش زۆر شت هەیە بۆ ئێستا دەشێن. بەڵام کاتێك دەویستریّ بەزەبری چەك و چەکداری حیزبی سەلەفی, لەژێر پەردەی جۆراوجۆردا کۆمەڵ بگێردرێتەوە بۆ سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست (نەك ناوەڕاستی سەدەکانی ناوەڕاستیش) ئاتەمەیان کۆنەپەرستی لیّئەتکیّ. بیری ئاوا لەسەر دیموکراتی و ئازادی و مەدەنیەت خەتەرناکە. ئەمە غەدرێکی گەورەیە قبوڵ ناکرێت؛ بۆیە ئادیّ عەلمانیەت لەکوردستاندا دەبێتە مەسەلەیەکی چارەنوسساز.

بۆئەوەی سیستمی دیموکراسیش خۆی ساغ بکاتەوە لەنێوان دەسەڵاتی دنیاییو دەسەڵاتی دینی, پێویستە عەقیدەو نەریتی دینی سەبارەت بە تاکەکەس, مەسەلەیەکە نابێت قەدەغە بکریّ. نە ئێمە نە لە دوای ئێمە نە لەپێش ئێمە بۆمان نیە بێین بە مرۆڤ بڵێین ئەقڵی خۆت بەزۆری زۆرداری بگۆڕە, کاری وا دژی ئازادییە, لەناخەوە ئەیڵێم کە بە زۆری زۆرداری ئەقڵی مرۆڤ بگۆڕی تاوانە. وەکو چۆن باوەڕم بەوە نیە عەقیدەی ئەم دنیای مرۆڤ بەزۆر بگۆڕیّ, باوەڕم بەوەش نیە عەقیدەی ئەو دنیای مرۆڤیش بەزۆر بگۆڕی, عەقیدە و فەلسەفە و ئاین و قەناعەت هەموو ئەو مەسەلانە مرۆڤ لە هەڵبژاردنیان ئازادە, بەلام لەهەمان کاتیش دا بۆت هەیە مشتومڕ لەسەر هەموو شتەکان بکەیت. ناکریّ لەژێر هیچ پەردە و پاساوێکدا رێگەی مشتومڕ و تاوتوێکردنی هەموو مەسەلەکان بگیریّ. بەتایبەتی بە ترس و تیرۆر. وەکو چۆن ئەڵێن رێگە نادەم فەلسەفەی یەك حیزب لەناو یەك دەسەلاتدا هەموو شتێك بێت, هەر بەوشێوەیە رێگەش نادەم فەلسەفەی یەك مەزهەب, فەلسەفەی یەك عەقیدە, یەك تەریقەت لەناو یەك دەسەلات و لەناو یەك ئاین و سیستەمدا بسەپێنرێت. باشترین شت ئەوەیە دەسەڵاتی دینی و دەسەڵاتی دنیایی بۆ بەڕێوەبردنی ژیانو سیستمی دیموکراسی لەسەر پرنسیپی عەلمانیەت دابمەزریّ, کە عەلمانیەتیش چەسپی مرۆ ئازاد ئەبێت تەنانەت لە هەڵبژاردنی مەزهەب و تێرخواردن لە کێشی مەزهەب و ئاینیش, زۆرتر ئاسودە دەبیّ.

ئێستا لەسایەی سیستەمە عەلمانیەکانی ئۆروپا عەلمانیەت ئیلحاد نیە, وەکو هەندێك سەلەفی توندڕەو لەناو هەموو شتەکان تەنها باس لەوە ئەکەن, کە گوایە عەلمانیەت ئیلحادە بۆ ئۆروپا, وانیە, رێز لە ئاینی مەسیحی و مەزهەبەکان و لە

مەسەلە پیرۆزەکان گیراوە. بەڵکو ڕێز لە ئیسلام و موسڵمانەکانیش زۆر دەگیرێ. تەنانەت ڕێژەی خواپەرستی زیادیئەکردبێ کەمی نەکردووە. بەڵام مەسەلەی دین لە ئۆروپا بۆتە مەسەلەی تاکەکەس. دەوڵەتیش سەرقاڵی دونیا و خزمەتەکانی مرۆڤە لەم دونیا. لەبەرئەوە عەلمانیەت و دیموکراتی بەپێی ئەو پروپاگەندەیە کە لێرە دژیان هەیە ڕاست نیە، عەقیدەی مرۆڤ لەگەڵ دینی خۆی، مەزهەبی خۆی پارێزراوە، هیچ هێزێك، هیچ دەسەڵاتێك بۆی نیە ئەو ئازادییە پێشێل بکا. ئەمە بەدەستور دەستەبەرە. بەڵام هەرشتێك باوەڕی پێی سەبێ ئازادە، لەسەر ئازادی عەقیدە و باوەڕبون و نەبون بە خوا، کەس ئاگیری و سزانادرێ. ئەقڵ ئازاد بووە، ناکرێت تۆ ئەقڵی جاهل تێکەڵ ئەقڵی مۆدێرنێتە و عەلمانی بکەیت. تازە ژیان لەوێ بەتەواوەتی سەدەکانی ناوەڕاستی جێهێشتووە. ئەقڵ لە ئۆروپادا تازە بە مەزهەب و خورافیات قفڵ ناکرێتەوە. لە هەمووی خۆشتر ئەوەیە هەموو هێزە ئیسلامیە سیاسیەکان کە دەسەڵاتی عەلمانی ڕەتئەکەنەوە و دەسەڵاتی ئۆروپایان قبوڵ نیە، کەچی سەلەفی وا هەیە ئۆروپا لەوپەڕی پێشکەوتن و مۆدێرنێتەدا بە جەهل و جاهلیەت دەزانێ، لە سەید قوتبەوە بۆ حەسەنی بەناو پەیڕەوەکانیشیان، پێیان وایە سەردەمی دیموکراسی و مۆدێرنێتە سەردەمی جاهلیەتە، سەیری ئەم تراژیدیا و کۆمیدیایە بکەن، چۆن تێکەڵاوکراون، سەید قوتب بە هەموو ئەو ئەقلیەتە ثیوکراتیەتەی (ئەقلی دەسەڵاتی ئایینی ڕەها) هەیەتی، پێی وایە ئۆروپا لەسەردەمی جاهلیەتە، کەچی هەموو هێزە ئیسلامگەراکان (٩٠٪) کە لێیان ئەقەومێت کەسییان ناچن بۆ وڵاتە ئیسلامیەکان، هەڵدێن بۆ ئۆروپا، لەوێ ئەبن بە پەناهەندە و لەسایەی ژیانی ئەوپەڕی ئازادی و سەربەستی ئەوێوە موسڵمانی عەیارە بیستوچوارمان بۆ پەروەردە دەکەن. لەوێ ئازادن کتێبەکانی (سەید قوتب) و (حەسەن بەنا) و مورشیدەکانیان چاپ و بڵاو بکەنەوە. من نامەوێ ناوی کەسیان بهێنم، بەڵام ئەوانەی کە لێرە زۆرترین جنێومان دەدەنێ، جنێو بە فکر و فەلسەفە و مێژوومان ئەدەن، ئەوانە خۆیان لەپەنای مەکە و مەدینەدا ناژین. بەڵکو وڵاتانی ئۆروپایان هەڵبژاردووە بۆ ژیان. کە یەك دو ساڵ جارێکیش دێنەوەو خوتبەی ئاگراوی ئەدەن، شریتەکانیان پڕئەکەن لە جنێو لەباتی مەعریفە و ئەقڵ، مزگەوتەکان پڕئەکەن لە ڕق و کینە، لەباتی لێبوردن و خۆشەویستی، خەڵکانی ئاوا، نە لە (مەکە) ن و نە لە (مەدینە). ئەمانە لە نەرویج و سویدو بریتانیا و

ئەمریکا و ئەڵمانیا و فەرەنسا دەژین. پیاوێك کە لێی ئەقەومێ هەڵیئەتەقێنی بۆ ئۆروپا، کەچی بەپروپاگەندەش ئۆروپا بە کفر و جەهل ئەزانێ. ئەگەر تۆ فعلەن ئەم قسانەت راستە, کەس بە موسڵمان نازانی لەخۆت بەولاوە, ئەگەر ئەشبیت بە پەناهەندە جێگای راستەقینەت نە نەرویجە, نە ئەڵمانیا, نە ئینگلتەرا, نە ئەمریکا, ئەوە کەعبە بچۆ بیست و چوار سەعات عیبادەت بکە, برۆ بۆئەوێ چی ئەکەی لە نەرویج, من نەرویجم بینیوە, رەنگە ئێوە کەم کەستان هەبێت بینیبێتتان, ئۆروپا و ئەمەریکاشم دیوە, ئەو سەلەفیانە کە ئەیانبینی لەولاتانی ئۆروپا ئەگەڕێن, هەمیشە لەبەرخۆمەوە کە دەمبینین, دەم گوت: ئاخر ئەم ریش درێژییەو ئەم دشداشەیەو ئەم عەگالەو ئەم سلوکی ئیسلامیە چی دەکا لەئۆروپا، کە هەموو دیاردەیەکی پێچەوانەی داب و نەریت و شەرعی ئیسلامە؟ لە گازینۆ دائەنیشی لەگەڵ نەریتی ئیسلامدا ناگونجێ, چونکە ژن و کچی ئەوێ لە هاوینا تاقەتی جل لەبەرکردنی درێژیان نییە. ئەچیتە دوکان, ئەچیتە سوپەرمارکێت, ئەچیتە هەرشوێنێك خەڵك بۆ ژیانی خۆی ئەژی, بۆ تۆ ناژی,و گوێ لە نەریتی تۆ ناگرێت؛ بەڕاستی ئوسامە بن لادن زۆر چاکی کردوە چوە بۆ ئەفغانستان, زۆر باشی کردوە لەولاتێکی دواکەوتوی ئاوا دەشێ بیری سەلەفیەت بڵاوبکرێتەوە. نەك لە ولاتێکی پێشکەوتودا, ئەوانە کە ٩٠٪ نەخوێنەوارن, لە سێ ژەمەکە دوو ژەم نانیان دەست ناکەوێت بیخۆن, ئێ ئەوە ئوسامە بن لادن پیاوێکی ئاقڵە لە سعودەوە کۆچ ئەکات بۆ ئەفغانستان, چونکە ئەزانێ سعودیە هەم لەباری ناسیۆنالیستیەوە, بواری تیا نییە لافی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە سعودیە و ولاتانی کەنداو لێبدا, چونکە لەوبارەوە تێریان خواردووە؛ هەم لەباری ژیانی بەرزی مادیەوە کەس گوێی لێناگرێت, دیارە لەباری ئاینیشەوە خەڵکەکە رێبازی ئاینی خۆیان دۆزیوەتەوە. بۆیە ئەو پیاوە چاکی کردوە چووە بۆ ئەفغانستان, ئەچێ بۆ پاکستان, پێشتریش چووبو بۆ سودان, ئەو ناوچانە ئێستا مەیدانی پروپاگەندەی سەلەفیەتن و رەنگە تەراتێنی سەلەفیەکان لەو ولاتانە درێژیش بخایەنێ. ئەمەیان ئاشکرایە بۆچی؟ لەبەر برسێتی و دواکەوتنە. ئەمە جگەلەوەی هەستی ناسیۆنالیزم و پێشکەوتنی مۆدێرنێتە هەر زۆر لاوازە لەو ولاتانە. هەڵبەتە سەرەڕای ئەو راستیانە سەبارەت بە رەواجی ئەندێشەی سەلەفی لەناوچە هەرەدواکەوتووەکاندا, گەر سەلەفیەکان پێیان وابێ دنیا بەخیتابەکانی ئەوان هەڵئەسوڕێ. ئەمە شتێکە ناکرێت باوەڕی پێبکرێت, ناکرێت

باوەڕ بەوە بکرێت لە وڵاتی دواکەوتووەوە، بە خیتابی سەلەفی کۆنەپەرستانەوە، ئۆروپا گوایە نوقمی جەهالەتە و بەئاڕاستەی سەلەفی بگۆڕدرێ. ئەمە خەیاڵ و خورافاتە. ئەم جۆرە سیاسەتە پڕ لە رق و کینەیە، سەرەنجام هەر بۆ کوشتو کوشتارو جەنگی ناوخۆ راتدەکێشێ. لەناو ئەو هەموو کێشمەکێشەدا، لەدوائەنجامدا، تاقە چارەسەر، سیستەمی دیموکراسی و عەلمانیەتە و بەس. سیستمی عەلمانی ئێجگار گرنگە، بەبێ سیستمی عەلمانی مەحاڵە قسە لە سیستەمێکی دیموکراتی بکەیت.

## عەلمانیەت و ئازادی ئەقڵ

پێم خۆشە سەرنجتان بۆ خاڵێکی کورت رابکێشم ئەویش ئەوەیە، ئەگەر ئەدەبیاتی هەموو هێزە ئیسلامیە سیاسیەکان بخوێنیتەوە، کە قسە لە عەلمانیەت ئەکەن، زۆرتر قسە لەسەرئەوە ئەکەن کە: عەلمانیەت دین لە دەسەڵات جیائەکاتەوە و دینیش لەسەردەمی پێغەمبەرەوە لەوساوە شمشێرەکەی هەڵکێشاوە تا ئێستا بەهەقی خۆی دەسەڵاتی گرتۆتەدەست، دەسەڵاتی ئیسلامیش حاکمیەتی خوایە لەسەر ئەرز. جگەلەوەی هیچ دەسەڵاتێك حاکمیەتی خوا نییە. ئەم قسانە چەواشەکردنی راستیەکانە و هەڵگێڕانەوەی فەلسەفەی عەلمانیەتە، عەلمانیەت پێش ئەوەی دین و دەسەڵات لێك جوێ بکاتەوە، پێش ئەوە ئازادکردنی ئەقڵە لە ئاسەوارەکانی رابردوو، گەوهەری عەلمانیەت لە ئازادکردنی ئەقڵ و چەسپاندنی ئەقڵانیەتدایە. بنەڕەتیترین مەسەلە کە ماکی عەلمانیەتە، ئەویش ئازادکردنی ئەقڵە؛ ئەقڵ ئەگەر بەداگیرکراوی لەژێر دەسەڵاتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست مایەوە، ئەگەر ئەقڵ لەناو ئەو هەموو تەمومژە میتافیزیکی و ئایدیالیستی و باوەڕهێنان بە جنۆکە و غەیبیات مایەوە، ئیتر ناتوانرێ ئەقڵ بگێڕدرێتەوە بۆ ئەرکە ئەقڵانیەکان و داوەرە زانستیەکان. شەو و رۆژ بیر لە مەسائیلی رۆحی بکەمەوە، شەو و رۆژ بیر مەسائیلی غەیبی بکەمەوە، شەو و رۆژ بیر لە مەئاسیلی میتافیزیکی بکەمەوە، شەو و رۆژ بیر لە جنۆکەو سزای قرچەقرچی دۆزەخ و هەڵقرچاندن بکەمەوە، ئیتر لەکوێ ئەتوانم توانای خۆم ئازادانە پێشکەشی کۆمەڵەکەم، نەتەوەکەم، پێشکەوتن، زانست و زانیاری بکەم؟ ئەگەر بیشیکەم بەشێکی کەمی توانام بۆ ئەو ئەمێنێتەوە، ئەمە لەکاتێکدا لە وڵاتێکا بیەوێ پێشبکەوێ دەبێت بەشی زۆری تواناکانی خۆی لە رێگای ئەقڵی ئازادەوە بخاتە خزمەتکردنی پێشکەوتن،

زانست, زانیاری و زەمینە مادییە پێویستیەکانی گۆڕان و گۆڕانکاری و چۆنێتی چەسپاندنی دیموکراسی.

پێش هەموو شتێك لە چەمکی عەلمانیەت پێویستە بیر لە چۆنیەتی ئازادکردنی ئەقڵی دواکەوتوو بۆ ئەقڵی پێشکەوتوو بکرێتەوە. دوای ئەوە لە چۆنیەتی جیاکردنەوەی دین لە دەسەڵات؛ هەتا ئەقڵ ئازاد نەبێ, هەرگیز ئازادی راستەقینە نایەتەدی. ئەقڵ لە هەموو مەسەلەکان ئازاد بێت, بە مەسەلە مەزهەبەکانیشەوە, بۆ سیستەمی دیموکراتی زۆر گرنگە. تەنانەت بەبێ سیستەمی عەلمانی و چەسپاندنی بنەماکانی ئازادی ئەقڵ, هیچ میللەتێك ناتوانێ لافی ئازادی راستەقینە لێبدا. عەلمانیەت بەتەواوەتی بچەسپێنە, دین و دەوڵەتیش لەیەك جیابکەرەوە, هەموو ئازادیەکان لەدەستوردا قبوڵ بکە, ئینجا ئەرکی تری دابینکردنی مافەکانی تاك و خەڵك دێتەپێشەوە, کە ئەویش مەدنیەت و مافە مەدنیەکانە. ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە بۆ ئەزموونە دیموکراتیەکان. بەڵام ئەگەر ئەقڵ ئازاد نەکرێ و ئازادانە بیرنەکاتەوە و ئەقڵانیەت لە حوکمدان لەسەر هەموو دیاردە و دەرکەوتەکان بەکارنەیەت, ناکرێ بیر لە ئەرکەکانی تری دیموکراسی بکرێتەوە. چونکە راستەوخۆ پەیوەندی بەئازادکردنی ئەقڵو ئەقڵانیەتەوە هەیە. مرۆڤ کە سەربەخۆیی بیرکردنەوەی نەبوو, ئەقڵی هی خۆی نەبوو, خۆی خۆی بەڕێوە نەبا, دەسەڵاتت نەدایە رێکخراوی هەبێت, سەندیکای هەبێ, گروپی هەبێ, رێکخراوی خۆبەخشی هەبێت, رێکخراوی کۆمەڵایەتی و مافی مرۆڤی ئازادی هەبێ, دەسەڵاتت نەدایە رێکخراوی زانستی, رێکخراوێکی مرۆڤایەتی, رێکخراوێکی ئەدەبی, رێکخراوێکی هونەری, رێکخراوی دیموکراتی هەبێ کە تاك و کۆی کۆمەڵ مەبەستیانە, بەپێی بەرنامەی خۆیان, بەپێی دەستوری خۆیان, بەشداری لە گۆڕان و گۆڕانکاریەکان, بکەن. بەزۆری زۆرداری ئەوەی دەسەڵات بیەوێ بیسەپێنی, هەر حزبێك هاتەسەر حوکم خۆی چۆنی ئەوێ جیهانبینی خۆی بەسەر خەڵکا بسەپێنێ, لەکاتێکدا دەرەتان و جیاوازیەکی گەورە لەنێوان خەڵك و دەسەڵاتدا هەیە, چونکە هەموو خەڵك حزبی نیە, هەموو خەڵکیش لەگەڵ دەسەڵاتا نیە, دە باشە زۆرینەی خەڵك نە لەگەڵ حزبن, نە لەگەڵ دەسەڵاتن, چیان لێئەکەی؟ ئەیانخەیتە دەریاوە؟ ئەیانکوژی؟ قوماتیان ئەکەی؟ بە زۆری زۆرداری ئەیانخەیتە کەنیسەکانەوە؟ هەر ئەبێت لە مزگەوتەکانا بژی؟ هەر ئەبێلە تەکێ و خانەقاکاندا بژی؟ ئایا ناکرێ ئەم مرۆڤە

کـە زۆرینـەی زۆری خـەڵکن بەشێوەیەکی تـر بیربکەنـەوە؟ ئـازاد بـیر بکەنـەوە, بیریلێبکاتەوە, فەلسەفە چییە؟ بیری لێبکاتەوە ژیانی کۆمەڵایەتی چییە؟ بیری لێبکاتـەوە سروشـتو گـەردون چـییە؟ بـیری لێبکاتـەوە زانـستی کیمیـا، فیزیـا، جوگرافیا، گەردون چییە؟ ئەمە چۆن بیری لێئەکاتەوە تۆ ئەگەر ڕێگـەی نـەدەی خاوەن ئەقڵو ئەقڵانیەتی خودی خۆی بێت, من کـە خـۆم نـەبمو هـەر تـۆ بم کـە دەسەڵاتیت, ئاخر ئیتر چۆن بتوانم بیربکەمـەوە؟ چـۆن بتـوانم دابهێـنم؟ مرۆڤـێ نەتوانێ ئازادانە بیربکاتەوە ئەی چـۆن ئـەتوانێ وەکـو خـۆی بیربکاتـەوە؟ چـۆن ئەتوانێ وەکو خۆی ڕێبـازێکی هاوبـەش گەڵاڵـە بکـا؟ گروپێکـی هاوبـەش گەڵاڵـە بکات؟ سەندیکایەکی هاوبـەش گەڵاڵـە بکـا؟ یەکێتییـەکی هاوبـەش گەڵاڵـە بکـا؟ هەموو شتێك کە خۆی باوەڕی پێیـەتی و ئـەوانەی وەك ئەو باوەڕیان بەو شـتـەیە، وەکو یەك بیری لێئەکەنەوە, چوارچێوەیەك بۆ خۆیان دابرێژن؟ دەبێت بنەمایەك هەبێت ئیشی لەسەر بکات, ئەو بنەمایە مەدەنیەتە، مەدەنیەتیش وەکو پرنسیپ دەسـەڵاتەکانی دەرەوەی دەسـەڵاتی بـەرەسمی دەگەیـەنێ. لـەنێوان خێـزان و دەسەڵاتا بۆشاییەکی گەورە هەیە، پێویستە بە دەسەڵاتی مەدەنی پڕ بکرێتەوە, بە چـی پڕئەکرێتـەوە؟ خـۆ نابێـت حزبـی کـارتۆنی دروسـتکەی, خـۆ هـەموومان ئەزانین حزبی کارتۆنی دروستکراوە, هەم لـە کوردستانی دوو دەسـەڵاتی ئێـستا دروسـتکراوە, هـەم لـە سـایەی حکومـەتی یەکگرتوشـدا دروسـتکراوە, حزبـی کارتۆنی وەکو داهۆڵ جلەوەکەی لەدەسـت خـۆی نییـە. مـن بـە چـاوی خـۆم لـە کۆبونەوەیـەکا قـازێکم بـەناوی سـکرتێری حیزبۆکەیەکـەوە بینـی سـەرکەوت بـۆ مینبـەر, خوتبـە بخوێنێتـەوە. لـە کۆنگرەیـەکی حیزبێکـدا؛ مەسئولێك لـە مەسئولەکان دوای کەوتبوو، هەتا پشت مایکرۆفۆنەکە دیاربوو پێیدەڵێ ئـەبێت چی بڵێی, بڕواتـان هـەبێت ئەوکاتانـە دەموچـاوی زەردهەڵگـەڕا نەیئـەزانی چـی بکات, ناچـار چـوە پـشتی مایکرۆفۆنەکـە بۆئـەوەی پارەکـەی لـەکیس نەچێت, ئەوەی ئەو پێی وت، وەکو توتی گوتیەوە. ئەم جۆرە مرۆڤە مومکین نیـە ئەگـەر تـۆ بـەناوی ئـازادی و دیموکراتیـەوە دروسـتیان بکـەیت, بتوانـێ تـا سـەر خـەڵك چەواشـە بکـا, خـەڵك کـە ئـازاد بـوو, ئازادیەکـەی لەوایـە خـۆی بیرئەکاتـەوە و بەرنامەی تایبەتیشی بـۆ ژیـان و هەڵـسوڕانی خـۆی دەبـێ. بەشێکی زۆری ئـەو جلەوانە دەپسێنێ کە هەست و نەست و ویـستی ئـەو جلـەوکێش دەکـەن. ئـەوە مەحەکە بۆ ئازادی، نەك چۆن خەڵکی تر بیری بۆئەکاتەوە. نەك چـۆن بەرنامـەی

بۆ داڕێژرێ, نەك چۆن ئاراستەی ئەکرێ, ئاخر کە من ئاراستەم کرد, ئیتر بۆ بخرێتە ژێر مەسئولیەتەوە؟ بۆ نایهێنمە بن حیزبی دەسەڵاتدار؟ ئەوکاتە کەسیش گلەیت لێناکات.

باشترین دەستەبەر بۆ سەرکەوتن و پێشکەوتن گۆڕانکاریە دیموکراسیەکانە, ئازادی تەواوی دروستکردنی ئۆرگانە مەدەنیەکانە, بەوپێیەی کە خەڵکی ئەیەوێت مەدەنیت هەبێ, هەر رێکخراوێك بەئاماری راستەقینە چەندی هەیە با هەبێ. چەند رێکخراوی وێکچوش هەیە با بمێنێ. ئێمە بە هەڵە لەوە گەیشتووین گەر رێکخراو زۆرتربێت سەرمان لێتێکدەچێت, لەراستیا حزب زۆر بێت سەرمان لێتێك ئەچێت, لەناو هەموو کۆمەڵێکدا شوێنی چەند حیزبێکی رەسەن و راستەقینە دەبێتەوە و بەس. بەڵام لەناو هەمو گەل و کۆمەڵێکدا دەشێ جێگەی هەزاران رێکخراوی دیموکراتی و مەدەنی بکرێتەوە. بۆیە رێکخراو زۆر بێت، سەرمان لێتێك ناچێت, پێویستە ئارەزوەکان, خولیاکان, حەزەکان, خواستە مادیەکان, دەرونیەکان، خواستە پیشەییەکان, ئەوەی لە ناختایە, ئەوەی لە دەرەوەیە, ئەوەی ئارەزووتە, حەزتە, چێژتە, تواناتە, خواستتە, ئازادیتە, سەریەستیتە، بەشێوەی جۆراوجۆر ئەمانە رێك بخرێ و ئاراستە بکرێن. خواست و ئارەزوو زۆر وزەبەندن. هەتا رێکخراوی مەدەنی زۆربێ, زۆر نییە. لەبەریتانیا سێ سەد هەزار رێکخراوی دیموکراسی هەیە, لە ئەمریکادا شەش سەد هەزار رێکخراوی دیموکراتی و مەدەنی هەن. من پار لەیوتۆبوری بوم کە دوەمین شاری گەورەی سویدە, چوار سەد و شەست و دوو رێکخراوی خانەنشینی ئەو شارە هەن. بە هەزاران رێکخراوی بچوك بچوك لەو شارە هەیە دیارە لەوێ رێکخراو پێنج کەس بێت و پەنجا هەزار کەس, هەمویان چونیەك مافی یاسایی کارکردنیان هەیە. هاوکاریش دەکرێن. رێکخراو هەیە, درەختێك لە گەڕەکەکەیدایە, یا لەشەقامەکەیدایە, تەمەنی سەد ساڵە, شارەوانی شارەکەی ئەیەوێت بیبڕێت, ئەچن چەند کەسێکی دڵسۆز رێکخراوێك دروستدەکەن, ئەڵێن رێکخراوی پاراستنی فلان درەخت, یەکسەر یاسا مۆڵەتی ئەداتێ. ناشهێڵن ببڕدرێ.

## ناسیۆنالیزم و عەقیدە و کوشتن

ئێوە شانۆگەریی هارونە رەشید بخوێننەوە. هارونە رەشید لە رۆژێکا بڕیاریداوە هەزاران کەس قەتلوعام بکرێ, بێگومان دەیان هەزاری تریشی کوشتووە, کە ئەنفال لەکوردستاندا کرا سەدوهەشتاودوو هەزار سەرنگون

کراوون. بەڵگەنامەکانمان گرتووە بە دەسـخەتی خۆیـان (یاویشمانە بـە هـەموو ڕێکخراوەکانی مرۆڤدۆست و یاسایی لە دنیادا) ئەڵێ ئەوە پێنج هەزار کەسمان بۆ ناردن بۆ (مجزرە)ی فلان بۆ چەکی کیمیـایی تاقیـان بکەنـەوە. بزانن لـە ئـان و کاتدا هەر پێنج هەزار کەسە لە کورەی کیمیاییدا سوتێنراوون بۆ تاقیکردنەوە. چ فـەرقێك هەیـە لـە نێـوان هـارون رەشـید و هـارون صـەدام دا؟ ئەمـە ئەقلیـەتی ناسیۆنالیستیە کە تێکەڵاو بە عەقیدەی دینی بووە. چونکە کوشتنی بەرامبەر بە حـەڵاڵ ئـەزانێ و بـە مقەدەسیشی ئـەزانێ و پێشی وایـە ئـەو دەسـەڵاتەی کـە هەیـەتی لـە خزمـەتی عەقیـدە, دیـن, ناسـیۆنالیزمی عـەرەبی, دینـی عـەرەبی, محمدی عەرەبی, قورئانی عـەرەبی, حەدیـسی عـەرەبی, خولـەفای عەرەبیدایـە, لەبەرامبەر میللەتانی تردا قودسیەت ئەدا بە قەومەکەی خۆی و مێـژووی ئیـسلام بە خەلیفە و سوڵتانە هـەرە خوێنرێـژەکانی ئیسلامیشەوە, میللـەتانی تـر بچوك دەکاتەوە و ناشکرێ قسە بکەیت. چونکە بەناوی ئیسلامەوەیە. چەند مـانگێکی تر بـەهیوا کتێبێـك چاپ بکـەین بـەناوی (تـأریخ العـراق الـدموي) (بـاقر یاسـین) نووسیویەتی, مێژووی عێراقی لەسەردەمی سۆمەری و بابلیـەوە هـەتا سـەردەمی پاشـایەتی هەڵـسەنگاندوە, مێـژووی هـەموو عێراقـی بـە دەسـەڵاتی ئیـسلامی و عەباسی و هەرچی ئومەرا و خولەفا هەیە, بڕواتان هـەبێت بیخوێننـەوە بـەوردی, ئەو ئامارانە بخوێننەوە کـە بـەناوی شارسـتانیەتەکان, بەناوی ئیسلام, بەناوی خەلیفە, بەناوی عەباسی, بەناوی دین, بـەناوی مەزهـەب, بـەناوی تەریقـەت ئـەو مێژووە خوێناوییـە بخوێننـەوە, بۆتـان دەردەکـەوێ کـە مێـژووی عێـراق لەسـەر دەریای خوێن بونیادنرابێ. ئێوە تەسەور ئەکەن مێژووی ئەم عێراقە کوژراوەکـان لە پێنج و شەش ملیۆن تێپەڕبووە, تەسەوری ئەوە ئەکەن هەشتا هەزار بـە یـەك ڕۆژ کوژراوە, ئەو شـێوە ئەشکەنجانەی لـەو سـەردەمە هـەبووە, ئێـستاش هـیچ حکومەتێك ئەقڵی پێـی نەشکاوە, تکاتـان لێئەکـەم بیخوێننـەوە و, بڕیاریـشمان داوە دوو هـەزار دانـەی لـێ چـاپ بکـەین, پـڕ بـە دڵ هیـوادارین بیخوێننـەوە, بۆئەوەی ئەو هەموو لایەنـە بـەدرۆ بخەینـەوە کـە پێیـان وایـە مێـژووی ئیـسلام, مێژووی نەزاهەت و تەسەوف و عەدالەتی کۆمەڵایـەتی و خزمـەتی مرۆڤـە. مێـژوو وەکو خۆی بخوێننەوە, نەك لەڕوانگەی دەسەڵاتەوە. ئەوەی ئێستا لـە ڕوانگـەی دەسەڵاتی ئیسلامەوە مێژووی وڵاتانی بەئیسلامکراو نوسـراوە، چەواشـەکاریەکی زۆر زۆری تیاکراوە. هەتائێستاش مێژوو ئەوەی گوتراوە نوسـراوە, نـەك ئـەوەی

نەگوتراوە، ئێستا بەشی زۆری روداوەکانی مێژووی نوێ (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) نایڵێ (پارتی) نایڵێ، هەزاران روداو رۆژانە لەم وڵاتەدا روئەدات، بەبێ‌ئەوەی هیچ کەسێ بینوسێ و تەحقیقێکی لەسەر بکات رۆژانە، جا وەرە هەزاران ساڵ لەمەوبەر چی رویداوە، چ هاوار و چ تاوانگەلێکی بێشومار لە مێژودا هەیە کە بەداخەوە هەمووی ئارایش کراوە.

زۆر سەیرە مێژوونوسی وا هەیە ئەڵێ: ئیسلام کە هاتووە بۆ کوردستان کورد بە گوڵ و گوڵزار چووە بەپیریەوە، بەڕاستی پەشمە کەسێك ئاوا مێژوو هەڵبگێڕێتەوە. لەم سەردەماشا ئاوا خەڵك چەواشە بکات، هەرگیزاوهەرگیز لەهیچ شوێنێکی کوردستان نەبوە، لەپێدەشت‌و شاخی کوردستاندا، خەڵك بەگوڵ‌و گوڵزار نەچووە بەدەم پیری فتوحاتی ئیسلامەوە، لە قەتڵوعامی جەولەلاوە، لەشەڕی قادسیەوە هەتا ئەنفالەکانی رژێمی عێراق هەموو دەسەلاتەکانی بەقەساوەت‌و بەداگیرکردن سەپێنراون. هەرگیز کورد بە هەلەکەسەماو چەپکەگوڵەوە پێشوازی لەداگیرکەر نەکردووە. ئەم هەورامانەی کە ئێستا ئێوە ئەیبینین، ئەوکاتە یەك هەورامان بووە، سێ سەد و شەست و چوار ساڵ بەرەنگاری سوپای ئیسلامی کردوە، ئەمەم لە ئینسکلوپیدیای ئیسلامی خۆی وەرگرتووە، کە لە دەوڵەتی جمهوری ئیسلامی ئێران چاپ کراوە و بۆ کوردیش وەرگێڕاوە؛ بچن مێژوو وەکو خۆی بخوێننەوە بزانن قەت شوێن و شارەکان هەبووە بەئاسانی تەسلیم بوبێ؟ چۆن شتی وا ئەکرێ؟ وەرە ئەقڵ و مەنتق بەکاربێنە بگەڕێرەوە بۆ هەوارەکۆنەکان و مێژووی روداوەکان و ئاسەوارەکانی مێژوو بپشکنە، بزانە چۆن دەشێ لە دۆڵی شەهیدان بابایەکی کوردی زەردەشتی لە ئاتشگای خۆما عیبادەت ئەکەم، نە ئاگام لێیەتی خوا بەوشێوەیەی ئیسلام باسی کردوە هەیە، نە ئاگام لێیەتی پێغەمبەرێ هاتۆتە ئەم دنیایە دینی ئیسلام بڵاوبکاتەوە، نە ناوی ئەسحابەم بیستووە، نە ئایەتی قورئانم بیستووە، نە دەشزانم خولەفای راشدین کێن، یەك وشە عەرەبیشم نەزانیووە، گوێم لە بانگی ئاشکرای بیلالی حەبەشی نەبووە، هیچم نەبیستووە، باشە لەماڵی خۆم دانیشتووم، لە شاری خۆم دانیشتووم، لەدێی خۆم دانیشتووم، سوپایەك دێت بە ئالایەکی سەوزەوە ئەڵێ ئەبێت ببی بە موسڵمان، چۆن ئەبێ مقاوەمەت نەکەم؟ بەردیش بیت مقاوەمەت ئەکەیت نەك مرۆڤ، ئەرزم هەبووە، کێڵگەکەم هەبووە، باخم هەبووە، کانیاوم هەبووە، لەو جوانتر بووم،

لەو بەتین تر بووم, بەهەموو شێوەیەك ولاتەكەم لە جەزیرەی عەرەبی جوانتر بوو.

لێكۆڵینەوەكان ساغیانكردۆتەوە كە هەموو فتوحاتی ئیسلامی لە دەرەوەی جەزیرەی عەرەبی بۆ ئابوری بووە, دوای ئەوەی فتوحاتی ئیسلامی لەدابینكردنی سامانێكی زۆر لەدەرەوەدا سەركەوتوە, ئینجا ئابوری جەزیرەی عەرەبی بەهێز بووە, ئینجا خولەفاكان دەوڵەمەندتر بوون.

نكولی لەوەناكرێ كوردیش وەكو میللەتانی تر بەزۆری سوپاو شمشێرەوە كراوەتە موسڵمان, ئەمە راستییەكەو لەدواسەرەنجامدا تەسلیمبوین, بەلام ئەم تەسلیمبونە با نەكرێتە بەشێكی پێكهاتەی كوردو بیرێكی ئامادە بۆ چونە ناو ئیسلام لەسەرەتای هاتنی سوپای ئیسلامدا, ئەمە پێچەوانەی حوكمی مێژووە. چركەساتەكانی مێژوو مەشێوێنن, چەند ناشیرینە چركەساتەكانی مێژوو ئەشێوێنن, چەن ناشیرینە گیانی بەرەنگاری دێرینەی كورد ئەكرێتە قوربانی هەستی ئێستای ئایینی. ئەو گیانە مەشێوێنن. وای مەنوێنن كە كورد بۆئەوە خەڵق كراوە چاوەڕێ بكات داگیركەر بێت داگیری بكات, كەی وایە؟

ماستەرێك لە زانكۆی سلێمانی پەسەندكراوە, هی بەڕێز (شوان عوسمان) رێك پێچەوانەی ئەو بۆچونانەیە كە كورد بە گوڵ و گوڵزار بەرەوپیری فتوحاتی ئیسلامی چوە, هەرئەو قسانە ئەكات كە من ساڵەهایە وتومە, من جارێ نەمخوێندۆتەوە, بەلام ئوستازەكان كە قسەیان بۆ كردوم ئەڵێن هەموو ئەو قسانەی كە تۆ لە كۆڕەكانا كردت، ئەوەتا لە ماستەرنامەدا ساغكراونەتەوە. ئەم قسانەی ئێستام لەمێژووی كورد و ئیسلام قسەی ئێستام نیە, قسەی پێش راپەڕینمە.

لەبەر سەدان كێشەی چارەسەرنەكراوی رابوردوو، لەگەڵ كێشەكانی ئێستا كە بەدەستیان ئەناڵێنین‌و دەروونی ئاڵۆزاندوین, بۆئەوەی كێشەی ئایندەشیانی نەچێتەسەر, وەكو ئەم كێشانەی كە مێژوشمان دەشێوێنن, لەبەر ئەو راستیانە دیموكراسی‌و ئازادی, زۆر گرنگە. گۆڕینی میتۆدی لێكدانەوەكان لە میتۆدی ئاینییەوە بۆ میتۆد و فەلسەفە زانستیەكان, زۆر گرنگە. دەنا سەدان كێشەی رابوردوو وەكو خۆیان دەمێننەوە و هەزارانیشی دەچێتەسەر.

## جیهانگیری و خێرایی گۆڕانکاری کوردەواری

ئێستەش دوبارەی دەکەمەوە، دیموکراسی، عەلمانی، مەدەنیەتو ئازادکردنی ئەقڵ، سێ پرنسیپی پێکەوەبەستراوون. هیچ هێزێکو دەسەلاتێکی دیموکراتی راستەقینە، ناتوانێ لێکیان جیابکاتەوە. کاتێک کە دیموکراتی دێتەئاراوە، ئەوکاتە بە زەرورەت سیستمی عەلمانیشت دێتەپێشەوە، کە سیستمی عەلمانیشت چەسپی، بەزەرورەت ئەبێت مەدەنیەتیش هەبێت، دەشبێ فراوانترین ئازادیش بەخۆیەوە ببینێت، هیچ تەداخولیەتێك پێچەوانەی رێسا گشتیەکانو ئاراستە مەدەنیەکان نەمێنێ. ئەم قسانەش نە دژی ئاینو نە بۆ سڕینەوەی مەزهەبەکانە. بۆ نوسینەوەی مێژووە بەئاراستەی بیناکردنی ئێستا و ئایندە. بۆ دۆزینەوەی نەدۆزراوەکانە لەمێژودا. چونکە بەشی زۆری مێژوی نوسراو، مێژووی نوسراوی سەرکەوتوەکانە. هەموشمان دەبینین کە ئازادییەکی زۆر هەیە کەسیش ناتوانێ بە ئێمە بڵێ ئازادی ئاینو مەزهەبتان زەوت کردووە. بەڵکو کە ئەم قسانە دەکەم، رەخنەی ئەوەمان لەسەرە کە بواری زیاد لەپێویستمان داوەتە هێزە ئیسلامیەکان، ئەمە جگەلەوەی ژمارەی مزگەوتەکانی ئێستا زۆر زیاترە لە زەمانی حکومەت، ژمارەی ئازادی مەزهەبی ئێستا زۆر زیاترە لە زەمانی حکومەت و، هەموو حزبە ئیسلامیەکانی ئێستا کە ئازادن لە زمانی حکومەتدا هەندێکیان خۆیان تەجمید کردبوو، هەندێکیشیان ساڵی ١٩٨٧ – ١٩٨٨ سەرەتای سەرهەڵدانیان بوو، هەندێکیشیان خۆتان ئەزانن لە دوای راپەڕین لەساڵی ١٩٩٤ وە خۆیان راگەیاند.

بچن سەرژمێری مزگەوتەکان بکەن، بچن کەنیسەکانیش بژمێرن. هەتا جولەکەش، خێزانی جولەکە لە ساڵی ١٩٤٧ لەم عێراقەدا هەتا ١٩٩٢ نەیانوێراوە بڵێن جولەکەین، ئێستا هەموویان لە کوردستان بەئاشکرا ئەڵێن جولەکەین و هەندێکیشیان ئەچن سەفەر ئەکەن لە خارج کەسوکارە جولەکەکانیشیان ئەبیننەوە، بۆ یەکەمین جاریش لەمێژوودا هەقە و کاکەیی و یەزیدی سێ مانگ لەمەوبەر کۆڕیان لە هۆڵی مەکتەبی رێکخراوە دیموکراتیەکان بەستو ئازادانە بەرگریان لەخۆیان ئەکرد، خۆشیان وتیان ئەوە یەکەم جارە ئەوەتەی دەسەڵاتی ئیسلامی هەیە تا ئێستا ئێمەی یەزیدی لەگەڵ کاکەیی ئازاد بین، قسە بکەین، قەت نەمانوێراوە قسە بکەین، ئینجا باسی قەتڵو عامەکانی خۆیان کرد کە لە مێژوی دەسەڵاتی ئیسلامیدا بەرامبەریان بۆ لەناوبردنیان کراوە.

کۆتایی قسەکەم ئەبەستمەوە بەوەی کە ئەوە سەردەمێکی گەورەی مێژوویی بووە بۆ ئۆروپـا, ئـەو سـەرکەوتنانە بەدەسـت هـاتووە, پرۆسـیسـێکی مێـژوویی, دەورانێکـی گـەورەی مێـژوویی, ئـاڵوگۆڕی ئـابوری, سیاسـی, کۆمەڵایـەتی, ئـەو سەرکەوتنانە هاتونەتەدەست. مێژووی ئێمەش سەرەڕای شکست و قوربانیـەکی زۆر, بەڵام مێژوویەك نییە بەتاڵ بێ لە شتی جوان. تەنانـەت مێـژووی نوێـشمان, مێژووی خەباتی رزگاری دونیاییە. خەباتمان بۆ دەسەڵاتی دینـی نـەبووە. شـێخ مـەحمود لـەپێناوی کـورد پەیوەنـدی بـە ئینگلیـزەوە هـەبوو, پەیوەنـدی بـە بۆلـشەوی کـافری موتڵەقیـشەوە هـەبوو, بـا دوای ئـەوەش باسـی لـە حزبـەکان ئەکەین, ئەسڵەن لـە تـأریخی ئێمـە بەتایبـەتی لەسـەدەی نۆزدەهـەمو سـەدەی هەژدەهـەم هـەتا ئیماراتــەکانی ئێمــەش هــیچ میرنـشینێك لــە میرنـشینەکانی کوردستان کوت‌ومت میرنشینی ئایینی‌و ثیوکراتی نـەبووە, ئـەردەڵان میرنـشینی دەسەڵاتی ئاینی نەبووە, بۆتان هـەروا سۆران میرنـشینی ئـاینی نـەبووە, بابـان میرنــشینی ئــاینی نــەبووە, بــەڵکو ئــەم میرنــشینانە تۆبــەرەی دەســەڵاتی ناسیۆنالیـستی کـوردیی بـون, پـێش ئـەوەی تـەکامولی ناسیۆنالیـستی بکـەن لـەناوبران. ئەحمـەدی خـانی لەخۆیـەوە باسـی ئـەوە ناکـات کـورد ئەیـەوێ یـەك بگـرێ, دژی عەجـەم و تـورك ئەحمـەدی خـانی لەخۆیـەوە داسـتان ناهۆنێتـەوە. وردەوردە پێکهاتەی ژیان, حاڵـەتی بابـەتی ژیـان وای لێئـەکات ئـەو تۆبەرەیـەی هەسـتی ناسیۆنالیـستی بپـشکوێنێ. شـیعری حـاجی قـادری کـۆیی مانیفێـستی کوردایەتی‌و رزگاریەیە, رونترین پـەیامی سیاسـی ناسیونالیـستی کوردیـیە هـەتا جاری وایە توندڕەوایەتی بەرامبـەر بـە ئەرمەنیـەکانیش کـردوە , پیرمێـرد دەڵـێ: جگە لە جەژنی نەورۆز هیچ جەژنێکی تر نەکەین, هـەتا هـاتووە ئەمانـە هـەمووی کاریگەریان لەسەر خەمڵینی پرۆسەی ناسیۆنالیزمی کوردی هـەبوو. بـۆ نموونـە رۆژنامــەی کوردســتان بخوێندرێتــەوە کــە وەرمــانگێڕاوە بــۆ ســۆرانی, کــە ئەیخوێنێتـەوە سـەیرە بەلاتـەوە, سـەد و چـوار سـاڵ لەمەوبـەر, نموونەیـەك لـە ئەزمونی هەڵبژاردنی شارەوانی ئەڵمانیا باس دەکات, باسی شارستانیەت ئەکات, باسی عیلم ئەکات, باسی مەعریفەت ئەکات, باسی ئازادی ئەکات, باسی زۆر شت ئەکات ئەمە واتای ئەوەتا رەگ و ریشەی کاریگەریەکانی سـەردەمی رینـسانس و مۆدێرنێتـە و پێـشکەوتن و دیموکراسـی لـە دنیایـا ئەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی میرنشین و شاعیرانی کلاسیك. وردەوردە ئێستا بووە بە حاڵەتێکی بابەتی.

جارێكی تر دەورانی ژیان ناگەڕێتەوە بۆ دواوە, هەروەكو سەلەفیەكان بچەقێین یان خۆمان بدەینە دەست قەدەرو ئایندەیەكی نادیاری دوور. نەخێر هەموو كەرەسەكان لەبەردەستمانن, گۆڕانكاریەكی زۆر لەبەردەستمانن, كەناڵی زۆر لەبەردەستمانن, كە بتوانین بەخێراییەكی زیاتر لەوان گۆڕانكاری گەورە بەدیبێنینو خۆشبەختانە گۆڕانكاریەكانیشمان كەوتونەتە سەردەمی جیهانگیری تەواوی ئەو لایەنانەی كە دەیانەوێ كۆسپ لەبەردەم ئاڵوگۆڕی گۆڕانكاری دنیا تەكنەلۆجیای دونیا, پێویستیەكانی دونیای جیهانگیری دانێین, كۆسپە ئایینیو مەزهەبیەكان, هیچیان نە راستنو نە سەریش دەكەوون. ئەمانە وایباسدەكەن كە جیهانگیری هیچ بۆ مەسەلە نەتەوایەتیەكان و فەرهەنگ و كلتوری نەتەوەكان ناهێڵێ. ئەوە چۆن ئەبێ؟ ئەوە مەنتقی ئیسلامی سیاسیو ناسیۆنالیستە گۆشەگیرەكانە. ئەم قسانە پێچەوانەی لۆژیكی دیموكراتی و گەوهەری جیهانگیرییە. چونكە گواستنەوەی سەرمایەو سەرمایەداری بۆ ولاتانی دواكەوتوو, دەوڵەتی دیموكراتی نەتەوەیی دروست ئەكا. نەك شتێك كە نییە لەناویبەرێ. دەشێ كۆمەڵێ كلتوری خۆمان هەیە هەم بیپارێزین, هەم خیتابی دیموكراتیو زانستیو دنیایی بكەین بەپێناوی خۆمان, خۆ مەرج نیە كە ئەڵێی جیهانگیری باش و خراپی قبوڵ بكەیت, زۆر شت هەیە ئەتوانین بیپارێزین. كەسیش نایەوێ زۆرت لێبكات زمانی كوردی بگۆڕی, ئەدەبی كوردی بگۆڕی, بەپێچەوانەوە كە ئەڵێن دیموكراسی بۆ میللەتانی دنیا باشە, خۆ دیموكراسی نایەت بەرامبەرەكەی بسڕێتەوە, بەپێچەوانەوە, رێز لەبەرامبەرەكەی ئەگرێت, هەر عەقیدەیەك بێت لەبەرئەوە ئەم گۆڕانكاریە تازانە شێواز و كەناڵی تازە تازەی داوەتە دەست ئێمە, كە گۆڕان و گۆڕانكاریەكانی لای خۆمان خێراتر كەین. دیارە ئەمە پرۆژەی ئەوێ, ستراتیجی ئەوێ, ئۆرگانی ئەوێ, زانكۆی ئازادی ئەوێ, پێویستیەكانی ئەم سەردەمەی ئەوێت, ئەو بەرنامانەی تا ئێستا هەمانە ١٠٪ ی ئەو پێویستیانە نین كە دەبێت ئەو ئامانجانەی پێ بەدەست بهێنن, پرۆژەی زۆری ئەوێو دەتوانین بیكەینو ئەشتوانم بلێم كاروانمان كەوتۆتە رێ, ئەمە مەسەلەیەكی گرنگە, كاروانمان كەوتۆتە رێ و كۆنەپەرستەكان ئەزانن كاروانمان كەوتۆتەرێ, بۆیە ئەوانیش دوژمنایەتی توندترئەكەن. من نامەوێ بچمە ناو وردەكاریەكانەوە. پێشم وایە لە ئایندەیەكی نزیكدا گۆڕانكاری گەورە لە ولاتی ئێمە روئەدات و, ئەو گۆڕانكاریە گەورەیەش ئەبێتە مایەی لاچونی كێشەی

ێجگار گەورەی سیاسی؛ ئەمڕۆ رۆژێکەو من بە ئێوە ئەڵێم: چاوەڕێی گۆڕانی گەورەی ئەوتۆ بکەن کە هەرگیز لە ژیانتانا نەتانبیستووە, ئەو گۆڕانکاریانە ەڕێوەن, ئەمێنێتەوە سەر ئێمەی کورد, ئەقڵی کورد, توانای کورد, خیتابی کورد, دەسەڵاتی کوردی کوردی, روناکبیری کوردی, ئایە دەرسی خۆمان لە ابردوومان وەرئەگرین؟ ئایە دەرس لە کێشەکانمان, لە شەڕی ناوخۆمانو لە چۆنێتی داڕشتنەوەی بەرنامەیەکی شیاوی خۆمان وەرئەگرین بۆ قۆستنەوەی ەلەکان کە لە ئایندەیەکی نزیکدا روبەڕومان دەبێتەوە؟

بێگومان کەسێك دڵسۆز بێت بۆ نەتەوەکەی, بۆ نیشتمانەکەی, بۆ ئەهیدانی, بۆ ئەنفالەکانی, ئەبێت ئەمە بزانێت جگە لەم ئەرکە, جگە لەم ەربەستیە نابێ بیر لە شتێکی تر بکاتەوە, ناڵێم هەرئەبێ ئایدیۆلۆژیای منی قبوڵ بێت. بەڵام هیچ هێزێك, هیچ گروپێك, هیچ گۆڤارێك لەژێر هەچ پاساوێکدا, گیانی مقاوەمەتو گیانی گوڕمو تەوژمی کوردی, بۆ قۆستنەوەی ئایندە سارد بکاتەوە, خەتەرە, خەتەری بچوك بەقەد خۆی, خەتەری گەورەش بەقەد خۆی کاریگەری هەیە. ئێستا مەسەلەی دەسەڵاتی کوردی, مەسەلەی ناسیونالیزمی کوردی, مەسەلەی دیموکراسی کوردی, مەسەلەی ئاشتی ئێستای کوردی, بۆ ئایندەی نەتەوەی کورد مەسەلەیەکی چارەنووس سازە. لەژێر هیچ پاساوێك دا ئەوە قبوڵ ناکرێت, جگەلەوەی ئەبێ ئەم چارەنوسە بگەیەنیتە ئامانجێکی ئەوتۆ کە بەدڵنیاییەوە لێی دڵنیابین, دوای ئەوە چی ئەکەی بۆ خۆت بیکە. بڕۆ ئەوپەڕی ئازادبە, بەڵام ئێستا بچوکترین هەڵوێستی خراپ, تا هەڵوێستی بۆگەنی وەکو ئەوانەی (جندالاسلام) زەرەری هەیە. لەژێر پەردەی ئازادی, ئازادیەکەمان نابێ لەدەست بدەین, لەژێر پەردەی دیموکراسی, نابێ هەلی گەورەی دیموکراسی لەدەست بدەین, بەڵام ئەمە بەومانایە نییە, دەرگا و پەنجەرەکانی داهێنان و سەربەستی رەخنە دابخەین. بەپێچەوانەوە, دەبێ بیکەینەوە, ئەو قسانەی ئەکراون دەبێت بکرێن. تۆ واز لەوە بێنە ئەچی کتێبێك ئەخوێنیتەوە و دەتەوێ ئەم میللەتە بێئەزمونە, بکەیتە ئەزمونگای کۆپیکراوی ئەو فەلسەفەیە. فەلسەفەی فەیلەسوفێکی شکستخواردوی ئەوروپا ئەفرۆشی بە گەلە بێدەسەڵاتە دیموکراتی و بێبەش لەسەربەخۆیی. تۆ وەرە سەر ئەرکی ژیانی خۆت, کە ئەم ئەزمونە چۆن دەبێ بپارێزرێت, چۆن ژیان بژێنیتەوە, چۆن جوانیەکان بژێنیتەوە و چۆن دڵنیابیت کە جارێکی تر ئەنفالت بەسەردا

نەیەتەوە. ئەوەی کە دەتوانێ ئەمە بکات, ئەوە نەمرە, ئەوەی کە ناتوانێ ئەما
بکا، کەوتۆتـە شـەوارە و هـیچ بـە هـیچ ناکـا, ئـەوەی ئەمێنێتـەوە، ئـەو رەگو
درەختە جوانانـەن کـە رۆئەچـنە نـاخی مێـژوو. کـە رۆئەچـنە نـاخی مـرۆڤ و کـا
رۆئەچـنە نـاخی خولیاکـان. کـە هەڵـەکانی رابـردوو دووبارەناکەنـەوەو باشـتر
کارئەکـەن و, ئایندەیـەکی باشـتر و گەشـاوە بەدەسـت دەهێـنن. ئەمـە پـەیامی
خەمێکی شارسـتانیە لەبەرامبـەر ئـەم پەیامـەدا شـتی پێچەوانە زیـانی زۆرتـرە
بۆنموونە: رۆژنامە و پەخشنامەی جیاوازی ئازاد بەدروشمی جیاجیا دەردەکرێت
گرنگ دەرکردنی گۆڤار و رۆژنامە نییە, گرنگ پەیامی رۆژنامەگەری چییە؟

پڕبەدڵ هیوادارم هەموومان بەوشێوەیەی ئەزانین دیموکراسـی چـەند گرنگـە
خزمەتی دیموکراتی بکەین. بەوشێوەیەی کە پێویـستە ئەقڵـە داگیرکراوەکـان لـە
هـەموو جـۆرە داگیرکـەرێك رزگـار بکـەین. مـن نـە لایـەنگری توندڕەوایـەتی, نـە
لایەنگری پەلەپەلم, نە لایەنگری تەرحکردنی هەنـدێ ئـەفکارم کـە (٥) سـاڵی تـر
لەوانەیە پێویست بێت, لایەنگری ئەوەم بیروباوەڕ لامان روون بێت.. و هەوڵی بۆ
بدەین, لایەنگری ئەوەم خۆشترین خوانو خواردنی پرنسیپی بەتام هـەبێ, بـەڵا
ئەبێ پارو پارو بیخۆیت, ناکرێ چوار پار و بەیەکـەوە قـوت بـدەین, دوایـی بۆت
هەرس ناکرێت.. دڵنیام ئایندەمان سـەرکەوتنی زۆری دیموکراسـی و ئـازادی, بـە
ئازادی ئەقڵەوە ئەبێت. زەمەنی شکستی هەموو ئەو ئەقڵانـە ئـەبێت, کـە ئێـستا
توانایان هەیە خەڵك چەواشە بکەن. هیـوادارم هـەموومان ئـازاد بـین. لەپێـشەوە
ئەقڵمان ئازادبێت.

## (١١)ی سێپتەمبەرو
## کاریگەری لەسەر کوردستان(+)

مامۆستایانی خۆشەویست خوێندکارانی ئازیز! سوپاس بۆ لقی پەیمانگاکانی کۆمەڵەی خوێندکاران لەم ڕۆژانەدا کەڕۆژانی ڕاپەڕینە, داوایان کرد کۆڕێك بۆ نێوەی خوێندکاری ئازیز ببەستین, ڕۆژانێکە مێژووی نوێی گەلەکەمان وەرچەرخانێکی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە, دەساڵ زیاترە ئازادین, دەساڵ زیاترە خەریکی خۆمانو حوکمی خۆمانین, ئەم دەساڵە لەسایەی خوێنی شەهیدەکانمانو جوامێری میللەتەکەمانو ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستانە, کەدڵنیام زۆرتان هەیە لێرە ئەزانن خوێندکارانی کوردستان لە ڕاپەڕیندا دەوری داینەمۆیان هەبوو, دەوری پێشەنگیان هەبوو, ئەگەر سەر ژمێرێك بکرێ لەشەهیدەکانی ڕاپەڕین من دڵنیام لە ٥٠٪ زیاتری خوێندکار دەردەچێت, ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە خوێندکاری کوردستان جگەلەوەی ئەرکی خوێندنو پەروەردەو پێشکەوتنو دابینکردنی ئایندەی لەسەرشانە, لەخەباتی نیشتمانیو لەخەباتی ڕزگاری نەتەوەکەیو لەبەدیهێنانی ئازادی هیچ درێغیەکی نەکردووە. خوێندکار نەك هەر لەڕاپەڕینی ساڵی١٩٩١دا بەڵکو ئەو ڕاپەڕینانەی لەشارو شارۆچکەکانی کوردستاندا بەرپابوون ساڵی(١٩٧٨)لەپێنجوێنو گەلاڵە ڕاپەڕین بەرپابوو؛خوێندکار پێشەنگبوو,ساڵی (١٩٨٢) لەسەرانسەری کوردستاندا هاوشانی جوتیارانی کوردستان, خوێندکاران هەر پێشەنگ بوون. ئەمەش سیمایەکە دیارو گەشە؛ سیمایەکی زۆرجوانە دەربارەی خوێندکاران کەپێم وایە حەقی هەموو خوێندکارێکە شانازی پێوەبکات؛ خوێندکار لەڕیزی ڕێکخراوە خوێندکارییەکاندا بن یان نەبن, ئەم مێژووە بۆ هەموو خوێندکاری کوردستان. ئینتمای هەبێ یان نەبێ, گرنگ ئەوەیە لەمێژوویەکی پڕ لەقوربانیو سەختو

---

+ کۆڕێك لەهۆڵی (هەڵوان) ٢٠٠٢/٣/١١، پاشتر بەنامیلکەیەك بڵاوکراوەتەوە.

دژوار, ناخۆش, نالەبار, کە رژێمی درندەی بەغدا هەرچیەکی لەتوانادابێ بەرامبەرمان بەکاری هێناوە؛ هەرچی جبەخانەی چەکی کۆ کوژە, هەرچی توانای عەسکەری, توانای سیاسی, توانای دارایی, توانای دەوڵەتی, توانای نەوتی, توانای پەیوەندییە دیپلۆماسیەکانی, فرۆکەکانی, زرێپۆشەکانی، چەکە کیمیاویەکانی، ئەرزئەرزەکانی، هەرچی چەکی قورس و سوکی هەبوو لەم کوردستانە بەرامبەر بەکورد بەکاری هێناو ئەتوانم بڵێم لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هیچ میللەتێك بەقەد میللەتی کورد دوژمنەکەی درندە نەبووە ودوژمنەکەی بێ پەروا هەوڵی لەناوبردنی نەداوە, ئینجا کورد وەکو چیاکانی کوردستان سەرکەش هاتە دەر؛ هەروەکو چۆن دەغڵ و دان کە دەبرێ بۆ ئاش, دوای هاڕین سپی ترو جوانتر دێتە دەرەوە, گەلەکەشمان خرایە ناو بەرداشی کیمیاوی, بۆ بەرداشی ئەنفال, بەرداشی وێران کردنی دێهاتەکانی کوردستان, سەرەنجام سپی و سەربەست لەراپەڕین هاتینەدەرەوەو دوژمنەکانمان رسوا بوون. ئەمە شانازییەکی ئێجگار گەورەیە بۆ گەلەکەمان, بۆ نەتەوەکەمان, خوێندکارانی کوردستانیش بەشێکی بەرچاوی ئەم شانازییەی بەردەکەوێ.

ئێستاش لەرووداوێکی ئێجگار چارەنووس سازدا دەژین, روداوی ١١ی سێپتەمبەر هەمووتان بیستووتانە, بەتەلەفیزیۆن فرۆکەکانتان بینیوە کە لەمەرکەزی بازرگانی ئەمەریکا لەمبەر لێی ئەدا لەو بەر دێتە دەرەوە, بینیوتانە کە لەپنتاگۆن ئەدا (پنتاگۆن یەعنی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا) دووشەقی ئەکا لەناوەراستدا. دیسان دوای ئەو بینیتان بەماوەیەکی کەم لەمەرکەزی بازرگانی دووەمیدا وئاگرێکی گەورەی خستەوە. ئەو ئاگرە لەو بینایانە بەرپا نەبوون کەفرۆکەکان لێیاندا, بەڵکو ئاگرێکی سیاسی, ئاگرێکی ئابووری, ئاگرێکی عەسکەری, ئاگرێکی ستراتیجی, ئاگرێکی پرۆژەی نوێی سیاسەتی نێودەوڵەتی لەهەموو دونیا بەربووە و بەهۆی ئەورووداوەوە, دەپرسم: ئایە ئێمەی کورد, ئایا لەکوردا ئێوەی خوێندکاران، مامۆستایان، خوێندنگاکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست چی پەیوەندییەکمان بەم رووداوانەوە هەیە؟ رووداوێك لەئەمریکا رویداوە و لەئەفغانستانەوە بۆی چوون, ئێمە لەکوردستان بۆ خۆمان بشڵەژێنین؟ پرسیارێکە هەقە وەڵامی بەینەوە, ئەگەر پەیوەندیمان پێوەی هەیە, حەقە وەڵامێکی زانستی بدەینەوە, پەیوەندیشمان پێوەی نەبێت فەرامۆشی بکەین و بیسپێرین بەمێژوو, من ئەمەوێ ئەمرۆ لەسەر ئەمە قسەتان بۆ بکەم.

() () ()

- أ -

## (١١) ی سێپتەمبەر یەکەمین روداو نییە

روداوی ١١ی سێپتەمبەر یەکەمین رووداونیە لەدونیادا رووی دابێت، پێش
و، رووداوی زۆرگەورەتر، کوشتو کوشتاری زیاتروماڵوێرانیەکی فراوانتر و
رەرو زییانێکی بێ شومار لەولاتان، لەدونیا، لەرۆژهەڵات، لەئەوروپا،
ئەمریکا، لەجنوبی شەرقی ئاسیا، لەئەمریکای لاتینی، لەئاسیا، لەهەموو
تێك لەوولاتانەی دونیا، پێش ١١ی سێپتەمبەر رووداوی ئێجگار گەورە
یداوە،ملیۆنەها ئینسانیش تیاچووە لەورووداوانە، ملیۆنەها مرۆڤ لەجەنگی
کەمی جیهانیو دووەمی جیهانی تیاچوون؛ لەجەنگی سارد تیاچوون، لەگەڵ
وەشدا نابینی وەکو ١١ ــ سێپتەمبەر کەسەرجەم پێنج هەزار کەسێکی تیا
ژراوە، ئەمریکا وەکو یانزەی سێپتەمبەر دنیای نەهێناوەتە سەر گێروگاز و
اڵوگۆرێکی جیهانگیرو سەراپاگیر، ئەمە بۆ؟ پێش ئەوە رووداوی گەورە
ویداوە وای نەکردووە، ئێستا رووداوێکی بچوکتر لەوانە روودەدات وا دنیا
هەژێنێ پرسیارێکە بۆ؟ ئەو بۆیە وەلام دانەوەی مەسەلەیەکی گرنگە، وەلامی
و بۆیە ئەوەیە هەلو مەرجی ئێستای ولاتە گەورەکانی دنیا، هەلو مەرجی
ستای دەسەلاتدارەکانی دنیا، زۆر جیاوازترە؛ هەلومەرجی جیهانگیرییە، واتا:
وەی بەعەرەبی پێی دەلێن (العولمە) رەنگە زۆرتان بیستبێتان وەبەئینگلیزیو
رەنسی پێی دەڵێن گلۆباڵەزیشن. جیهانگیری واتا: تێپەرین بۆ هەموو کونو
لەبەرەکانی جیهان، تێپەرینی سیاسی، تێ پەرینی ئابووری، تێ پەرینی
توری، تێپەرینی راگەیاندن، تێپەرینی یاسایی، تێپەرینی کومەلایەتی،
تومت جیهانگیری ئەمە ماناکەیەتی، هیچ بەربەستێ، هیچ سنورێك لەبەردەم
وژمەکانی تازەی سەرمایەداری، لەبەردەم تەوژمەکانی تازەی سیاسی دەولەتە
ەورەکانی دونیا، هیچ دەولەتێك ناتوانێت سنوری خۆی داخات و دیوارێك
بەردەم شەپۆلەکانی ئاڵوگۆری جیهانی، دانێ. کەوابێ، هەلومەرجی جیهانی
ر جیاوازە، بۆیە ئەو رووداوەی (١١ ی سێپتەمبەر) دنیای بەم شێوەیە
ژاندووە.

دیوەکـەی تـری روداوەکـە ئەوەیـە ئوسـامە بـن لادن و ئەلقاعیـدە ئایـە ب
ئەمـەیان کـرد؟ ئایـە لەئینـسانیەتی خۆیانـە؟ ئایـە لـەدیموکرات خوازیانـە؟ ئای
ئەمانە جوامێرترین کەسەکانی سەر ئەرزن؟ ئایـە ئەمانـە شۆڕشـگێڕەکانی سـ
ئەرزن؟ ئایا ئەمانە ئەیانەوی عەدالەت لەدنیا بەدی بهێـنن؟ دوپـاتی دەکەمـەو
ئوسامە بن لادن وئەلقاعیدە بۆ ئەمە دەکەن؟ بۆ لە سعودیەوە کـۆچ دەکـەن ب
ئەفغانـستانو لەوێـشەوە ئەچـن لەئـەمریکا لەمەرکـەزی بازرگـانی و وەزارەتـ
بـەرگری ئـەمریکا دەدەن؟ بەلێـدانی ئـەمریکا دەیانـەوێ چـی بکـەن؟ دەیانـەو
عەدالەتی ژیان بەدی بهێنن؟ دەیانەوێ خـۆش بـەختی بـەدی بهێـنن؟ دەیانـەو
پێش کەوتنو شارستانیەت بـەدی بهێـنن؟ دەیانـەوێ هـەژاری لـەدنیادا نـەهێڵن
ئەگەر لەپێناوی ئـەم پرسـیارانەدا, کـە مـن دەیکـەم, چـالاکی دەنوێنن, حـەق
خۆیانـە ئـەوکارەیان کـردووە، ئەگـەر بەپێـچەوانەوەیە, کەواتـە ئێمـەش حـەق
خۆمانە دژی بـین؛ ئایـا لـەپێناوی رێگـە چاکەکانا ئـەم کـاری تیرۆریـە دەکـەن
یابەپێچەوانەوە, لەپێناوی رێگە خراپەکانا ئەم کارە تیرۆریستیە دەکـەن؟ ئێم
بائەمە زۆر وورد نەکەینەوە, بابچینە سەرخوودی وڵاتی ئەفغانستان, ئـەو وڵاتـ
بکەینە نموونە بۆ کاروکردەوەکانی ئەلقاعیدەو ئوسامە بن لادنو مەلاعومەریش

خوێندکاران ئەگەر ئوسامە, ئەگەر مەلا عومەر, ئەگەر خەڵکانێك کەلـەدەوو
ئــەوان کۆبوونــەوە, لەئەفغانــستانا, وڵاتێکــی خــۆش بــەخت, وڵاتێکــی پـ
لەشارسـتانی, وڵاتێکـی پـڕ لـەئازادی, وڵاتێکـی پـڕ لەئاسـوودەیی, وڵاتێـ
لەرەفاهیەت, وڵاتـێ کـە ژنو پیـاو فـەرقی نـەبێت, وڵاتێـك کەجادەیان نـەماب
قیرتاو نەکرابێت, وڵاتـێ کەجێ نـەمابێ کارەبایـان بـۆ نـەبردبێت, وڵاتێـك شـوێ
نەمابێ تەلەفۆنیان بـۆ رانەکێشابێ, وڵاتێـك پیـشەسازی تیایـا گەشـەی کردبـێ
ولاتێك بووبێ بەسەیرانگا بۆ هەموو ئەم دنیایەو وڵاتێك ئاساوارەکانی رابردوویا
تیایا پاراستبێ, بۆ ئەوەی خەڵك وەکو سـەیرانگا بچن سـەیرانیان بکـەن، ئەگـە
لەئەفغانستاندا ئەمەیان دروستکردووە, کەخۆیان حاکم بوون لـەوێ, کەواتـە مـ
ئەڵێم: ئەم حکومەتە هەرەچاکەیەی ئەفغانـستان, ئوسامە بـن لادن ویستویەتم
نمونەکەی بگوازێتەوە بۆئەمەریکاو لە وڵاتـەکانی تـریش بـەدی بێنـێ, بۆیـە ئـە
کارە تیرۆریستیەی کردووە، بـەڵام ئایـە وایـە؟ یـان سـەراپا پێـچەوانەی ئەوەیـ

کەمن ئەیڵێم، لەئەفغانستانا نەك ئازادی، سەربەستی، دیموکراسی، پیشەسازیو پێشکەوتن نەبووە، تەنانەت ریش تاشین قەدەغەبووە، گۆرانی قەدەغـەبووە، ژن لەدایرە دەوام بکات قەدەغە بووە،سەیری تەلەفیزیۆن بکەی قەدەغەبووە، گـوێ لەرادیۆ بگریێ قەدەغەبووەو حیجـاب دابکـەنی ئـەوە تاوانێـك بـووە لێبـوردنی بـۆ نـەبووە. پـانتۆڵ لـەپێ بکـەی قاچـت ئـەبڕن، چـایخانە هەرنـەبووە، لـە وڵاتـە جادەیان نەمابوو سەیارە نەیدەتوانی بەسورعەتی ٦٠کم لێبخورێ؛ ئاسەوارێك کە ٢ هـــەزار ســـاڵ پـــێش ئیـــسلام لـــەویا بـــووە بەبەرچـــاوی خۆتـــان، هـــەموو تەلەفیزیۆنەکانی دنیا نەقڵیان کرد، بەبۆمب تەقاندنەوە، دائیرەیـەك نـەمابوو پـێ بڵێـی دائـیرە، لەهـــەموو ئەفغانـــستاندا ١٠ کۆمپیوتـــەری تێداتـــەبوو، لەهـــەموو ئەفغانـستان یـەك سـینەمای تێدانـەبووە، لەهـەموو ئەفغانـستاندا یـەك یاریگـای تێدانەبووە، یەك یاریگای تێدابوو کردبویان بەمەیدانی ئعیدام کردن، وڵاتێك خۆی ئەمە حاکمەکانی بێت، ئیتر حاکمـەکانی بـەچ شـانازییەکەوە ئـەتوانن بڵـێن ئێمـە وڵاتەکانی دنیا ئەگۆڕین، چ نموونەیەك لەبەردەستیانە هەتا بڵـێن ئێمـە ئـەمریکا دەکەیتـە ئـەو نمونەیـە. ئـاخر بـاوەڕ ناکـەم ئەوانـەی لێـرەدا دانیـشتون کەسـێ ئەمریکای بینیبێ، من ئەمریکام بینیوە، تەسەوەر ناکەن ئەوروپا لەچاو ئـەمریکا دواکەوتوە. مـن لەئـەوروپاوە کەچـووم بـۆ ئـەمریکا وا حەپەسـام. کەلـە تـەواوی دنیایا وڵاتی وا پێشکەوتووی دامەزراوی پڕ لە دەستکەوت نییە، ئاخر ئوسامە بن لادن لەکوێ دەتوانێ بەم عەقڵە نەخۆشەوە بیڕوخـێنێ، کەوابێ ئـەو پرسـیارەی پێشترکردم، ئەم هێرشەی کەئوسامە بـن لادنو ئەلقاعیـدە کردویانـە، هێرشـێکی کونە پەرستییە و هەموو مقاوەمـەتێکی راستە. ئەگـەر مقاوەمـەتی ئـەم هێرشـە تیرۆریستیە تەنها بۆ ئەوەبێت خەڵك بەئازادی ریشی بتاشـێ، حەقـە، ئـیتر بـاقی شتەکان وورد ناکەمەوە، ئاخر مەعقولـە ئینـسان ئـازاد نـەبێ ریشی بتاشـێ، تـۆ ریش بەردەدەیتەوە بەردەرەوە، کەس رێ لەتۆناگرێ، من ریـش ئەتاشم حـەقت چییە بەسەرمەوە، خـۆ تـۆ نمایـندەی خـوا نیت، کـەس لەسـەر ئـەرز نمایـندەی خوانییـە! هـیچ حزبێـك، هـەموو ئەوانـەی لێـرە حزبـی ئیـسلامین، وەکـو ئێمـە ئینسانێکی ئیعتیادین نەمۆری پێغەمبەریان پێیە تا ناسنامەی ئیسلاممان بدەنێ لە سراتەل موستەقیم تێپەڕین، نـە وەکالـەت نامـەی خواشـیان پێیـە تـالێرە مـن بەقسەی بکەم، هـەتا ئـەم خەڵکانـە ئـەبن بەئیـسلامی ئینـسانێکی ئاسـایین، کە

ئەچێتە حزبی ئیسلامی ئیتر دەبێتە موسڵمانی عەیار (٢٤) و خەڵکی تریش ئەکاتە کافر. گەر موسڵمانیت لەئەورویج چی ئەکەیت؟ بۆناچی بۆ مەککە, زۆربەی هەرە زۆری سەرکردەی حزبە ئیسلامیەکان لەئەوروپا پەنانەدەن, بۆناچن لەدەوڵەتە ئیسلامیەکان ببنە پەناندە ئەگەر راست دەکەن‌و دەوڵەتی ئیسلامیان لاگرنگە, زۆربەی هەرە زۆری سەرکردەی هەموو حزبە ئیسلامیەکانی عالەمی عەرەبی لەئەوروپاو ئەمریکان, خۆئێوە ئەزانن ئەوروپاو ئەمریکا کەچ ئازادیەکی تیایە, بەپێی شەرعیش, پیاوی موسڵمان ئەسڵەن نابێ سەیری ئافرەت بکات, باشە خۆ ئافرەت لەئەوروپا وەکو لای ئێمەش نیە, ئەچی لەوێ ئەبی بە پەناندە, بەماڵ‌و منداڵەوە چی دەکەی لەوێ؟ وەرە بچۆ لەپەنای قەبری پێغەمبەر دانیشە ئەگەر راستەکەی موسڵمانی راستەقینەیت. ئەئوسامە بن لادن نەهیچ کەسێك بۆی نیە حوکم لەسەر موسڵمانێتی خەڵك بدا. مرۆڤ خۆی نەبێ ئازاد بێ, ئێمە قسەیەکمان لەسەر ئازادی نییە, لەسەرئەوەیە کێ بۆی هەیە حوکم لەسەر ئەوەبدات کێ موسڵمانەو کێ موسڵمان نیە؟ نەخێر کەس بۆی نییە, تەنها مرۆڤ خۆی دەتوانێ ئەو یەقینەی هەبێ لەئیماندا. یەقینی دەرونی بەدەست کەس نییە لەسەر ئەرز. تەنها لە ویژدانی مرۆڤ خۆیدا ئەو یەقینە دەرونییە هەیە. ئەوانەی کەدانیشتوون پەیڕەوپرۆگرام بۆ حزبەکەی خۆیان دادەنێن بەناوی ئیسلامەوە, ئەوە پەیڕەوپرۆگرام بۆ حزبەکەیانە, ناسنامەی موسڵمانی بوون, عیبادەت‌و تەقوایە. ئەوە حزبێك هەیە وا بیردەکەنەوە ولەلای ئێمەش ئازادە, لەئەوروپا لەهەموو دنیایا هەر ئەو ئازادییە هەیە شتێکی ترنییە لەوەزیاتر, کەوابێ ئەو رووداوە روداوێکی کۆنەپەرستییە, مقاوەمەت کردنیشی کارێکی پێش کەوتن خوازانەیە, مقاوەمەتەکەی نەك کەلەبەرخاتری ئەمریکا, نەمەسەلەکە هەر ئەوە نییە, من مقاوەمەتی تیرۆربکەم, خزمەتی ئەمەریکا ئەکەم مەسەلەکە ئەمە نییە, بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە منیش ئەترسم ئەفغانستانێکی تر لە کوردستاندا دووپاتبێتەوە, لەوە دەترسم بۆ ئەوە مقاوەمەت ئەکەم وڵاتەکەی خۆشم بەدەردی ئەفغانستان نەچێت, ئەمە مەسەلەیەکی زۆر زۆرگرنگە. خوێندکاران دەتانەوێ وڵاتێکی وەکو ئەفغانستان هەبێ, دە لەئێستاوە گەنجەکانتان ریش بەربدەنەوە, دەشتانەوێ وڵاتێکی ئاوا هەبێ هیچ نەبێ ئینسان لەویژدانی خۆیا نابێ ئەورێگایە قبولێ بکا.

- ب -

## کردنەوەی دەروازەی دیپلۆماسیەتی کوردی

**ئامادەبووان..**

بۆ ئەوەی ئێمە ئەو رووداوە تۆزێك هەڵبسەنگێنین، پێم باشە سوکە ئاوڕێك تان پێ لێبەمەوە بەرابردووی خۆتانا. بەرابڕدووی نەتەوەکەتانا.

ئەگەر سەیری رابردوو بکەن، هەموو ئەو هەل و مەرجانەی کەلەجیهانا هەڵکەوتوون، هەل و مەرجی جەنگی یەکەمی جیهان، هەل و مەرجی جەنگی دووەمی جیهان، هەل و مەرجی جەنگی ساردی جیهان، هەل و مەرجی داگیرکردنی کوەیت، هەل و مەرجی رووداوی ١١ ی سێپتەمبەر، ئەم رووداوانە ئەگەر هەڵبسەنگێنی و بەرئەنجامێکی لێدەربهێنی، ئەزانی هەل و مەرجی وا لەدنیایا چی کاریگەرییەکی لەسەر وڵاتی تۆ هەیە من ئەمەویّ ئەمەتان بۆ روون بکەمەوە. کەئەو رووداوانە پەیوەندییەکی راستەو خۆیان بەچارەنووسی ئێمەوە هەیە، ئێوە حوکمرانێتی شێخ مەحمودتان بیستووە، هەلومەرجێك هاتە پێشەوە کەپێ دەڵێن هەل و مەرجی جەنگی یەکەمی جهان کەمیللەتەکان داوای حەقی خۆیان بکەن، عەرەب داوا حەقی خۆی کرد، فارس، تورك، ئەرمەن، ئاشوری، فەلەستینی، هەموو داوای حەقی خۆیان کرد، ئێمەش داوای حەقی خۆمان کرد، لە کێ؟ لەوکاتە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی حوکمی دەکردین، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی خۆتان ئەزانن ئیمپراتۆریەتێکی هەرە بەدەسەڵاتی ئەو زەمانە بووە، ئیمپراتۆرێکی فاشلی تێك شکاو، هیچ جۆرە مافێکی سیاسی، مافێکی ئینسانی بۆ هیچ قەومێکی لەقەومییەتەکان رەچاونەئەکرد، بەعەرەب خۆشیەوە وخۆی بەموسڵمان ئەزانیو ماڤی عەرەبی ئەخوارد، کە دینی ئیسلامە دینی عەرەبە بەپێش ئەقوامی تر، ئەم ئیمپراتۆرییەتە وردە وردە لەناوخۆیا گەندەڵ بوو، ئینگلیز هات شەڕی کرد لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا ئیمپراتۆریەتیی عوسمانی بەزی. یەکێك لە هەڵە گەورەکانی شێخ ئەوەبوو کەئینگلیز هاتە عێراق، بەناوی بەرگری لە ئیسلام چوو شەڕی ئینگلیزی کرد لەحەببانیە، ئەمە هەڵەیەکی گەورە بوو کردی، کوردی کۆکردەوە لەحەببانیە بەکوشتی دان بەناوی دیفاع کردن لە دەسەڵاتی ئیسلام، ئەو دەسەڵاتە ئیسلامەش کەلە (١٨٣٦-١٩٢٦) زیاتر لە بیست راپەڕینی کوردی خەڵتانی خوێن کرد، ملیۆنەها کوردیان کوشتبوو زیاتر

لەپەنجاو پێنج میرنشینی کوردی تەفروتونا کردووە, هەر ئەو ئیمپراتۆریتی عوسمانیە لەگەڵ ئیمپراتۆرێتی سەفەویدابوو رێکەوتننامەی چاڵدێرانی لەساڵی (١٥١٤) مۆرکرد و کوردستانیان دابەش کرد؛ شێخ مەحمود بێ ئەوەی ئاورێك لەهەموو ئەو مێژووە بداتەوە, بەناوی دیفاع کردن لەئیسلام ئەچێ شەڕی ئینگلیز دەکات, بەرگەی شەڕەکەشی نەگرت و تێك شکاو هاتەوە کوردستان، بەلام هەل و مەرجێك هاتە پێشەوە کەئیدارەیەك بەکوردستان بدرێت, لەبەرئەوەی شێخ مەحمود پایەدارێکی گەورە و کاریگەربوو, سەرەڕای ئەو هەڵەیەی لەگەڵ تورك دژی بریتانیا, هەر شێخ مەحمودیان کرد بەحاکم لە سلێمانیدا. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تێك شکاوە, تورکەکان خۆیان لێی هەستان, نەك هەرکورد تورك خۆشی لێی هەستا، بەلام شەرتێکی گەورەی عەرەب و تورك لەسەر رێکەوتنامەی سیڤەر کەکوردی دەکردە خاوەن ئیدارەی خۆی, هەردوولا دژی سیڤەر بون. رەنگە لێرە هەبێ ناوی سیڤەربێ لەسلێمانی بیستبێ, زۆر ناوی سیڤەر هەیە, رێکەوتننامەی سیڤەر رێکەوتن نامەیەك بوو کەبەندەکانی (٦٢ـ ٦٣ـ ٦٤ـ ٦٥) هەمووی لەساڵحی کورد بوو, حکومەتێکی لەفیدراڵ گەورەتر بەکورد ئەدرا، بەلام بەداخەوە وردە وردە فشاری عەرەب و تورك و هەندێ هەڵەی کورد خۆشی, بەرژەوەندی نێودەوڵەتی ئەوکاتەی لەگەڵ عەرەب و تورك رێك کەوت نەك لەگەڵ کورد, ئەوەمان لەکیس چوو, جەنگی دووەمی جیهانی سیاسەتی نێودەوڵەتی لە بەرژەوەندی ئێمە نەبوو؛ قازی محمد یەکەمین کۆماریشی راگەیاند دوایی خۆشی شەهیدکرا, کۆمارەکەشمان تەفروتونا کرا, هیچ مافێکی کورد رەچاونەکرا, لەجەنگی ساردا لە تەواوی جەنگی سارد کەلەساڵی (١٩٤٨ ـ ١٩٤٩) دەست پێ دەکات هەتا ١٩٨٩ کەکۆتایی جەنگی ساردە گەورەترین نەهامەتی کورد ئەو ساڵانەیە؛ رۆژهەلات و رۆژئاوای ئەم دنیایە پشتیوانی داگیر کەرەکانی کوردستانیان دەکردو یارمەتیان دەدا, هیچ جۆرە مافێکی کورد نەك رەچاو نەکرا, بگرە راپەڕین و خەبات و تێکۆشان و قوربانییەکانیش تەفروتوناکرا.

کە کوێت داگیرکرا, سەرەتای سیاسەتێکی تازە هاتە پێشەوە, لەدوای داگیرکردنی کوەیتەوە ئێمە تێك شکابووین, بەرەبەرە, لەبەر گۆڕانکاریەکانی جیهان هەستاینەوە, یەکەمین کۆنگرە لەدنیایا بۆ پشتیوانی ئێمە بەسترا بەناوی کۆنگرەی مافی مرۆڤ لەمانگی ١٩٨٩/١٠ لە پاریس بەسترا, لەوکۆنگرەیە کە

ووتنـەوەی کـورد هـەموو تێکـشکابوو, چـەند مەفرەزەیـەکی پـارتی زانیمـان شاخەکاندا مابوون, حکومەتی عێراقـی سـەرکەوتوبوو بەسـەرئێراندا, دۆخێکـی ر زۆر نالـەبارمان هـەبوو, کۆنگرەیـەك لـەپاریس ئەبەسـترێ بـەناوی کـۆنگرەی فی کورد؛ لەوکۆنگرەیە مام جەلال سـەرۆکایەتی وەفـدێك ئـەکا لـە کۆنگرەکـە, هەمان کاتیش حکومەتی عێـراقیش وەفـدێك ئـەنێرێ بەسـەرۆکایەتی (ئەحمـەد هادین) کە ئێستا سەرۆکی مەجلیسی تەشریعی داتاشراوی عیراقیە, کە وەفـدی کومەتی عێراق ئەچێتە ناو کۆنگرە, مام جەلال وەفدەکە ئـەبینێت زۆر زۆر بـێ قەت ئەبێت, دوای راوێژکردن بە وەفدی بەرەی کوردستانی هەڵدەستێت دەڵێ: ەفـدی عێـراق لـەم کۆنگرەیـە بـێ ئێمـە ئەچینە دەرەوە, هـەموو وەفدەکـەی رەی کوردستانیش گفتیئەدەنێ لەگەڵیا بچنە دەرەوە. هەرچەند ئەکـەن قایـل بێت, ئاخری حکومەتی پـاریس لەبـەر رێـزی وەفـدی کـورد وەفـدی حکومـەتی ێراقی دەرئەکا؛ یەکەمین سەرکەوتن لەدنیای دیبلۆماسیەتی کوردییـا کەوەفـدی کومـەتی عێراقـی تیـا رسـوا بکرێـت (١٩٨٩/١٠/١٤) ئـەم کۆنگرەیـە کەبـەناوی ۆنگرەی مافی کورد لەپاریس ئەبەسترێ زۆر مەسەلەیەکی گرنگـە, لـەژیانا کـورد ـەر خواخوای بووە رێگەیبدەن بـچێتە هـۆڵی کۆنگرەکـان, رێگـە نـەدراوە گـوێی ێبگیرێت, رێگەی نەدراوە قسەی خۆی بکات, پێش جەنگی جیهانی یەکەم نەیان ێشتووە لـەکۆنگرەی سـوڵحی پـاریس کـە (عـصبە الامـم) تیـا دروسـتکرا, ەیانهێشت شەریف پاشای رەئیسی وەفدو کورد بچێتە ناو کۆنگرەکەشەوە, هەر ەدورەوە مزەکـەرەی ئەنوسـی؛ کەنەتـەوە یـەککگرتووەکانیش دروسـتکرا بـەهیچ ێوەیەك گوێ لـەکورد نـەگیرا؛ هـەتا کۆمـاری مهابـادیش لەناوچوو, هـەر کـورد ێکەس بوو, لەم کۆنگرەیە نەك گوێ لەکورد گیرا, بەڵام هەلومەرجی جیهانی کـە گـۆڕدرا وەفـدی دەوڵـەتی داگیرکـەری سـەرکەوتوی عێـراقیش لەکۆنگرەکـە ەدەرنـرا؛ ئەمـە نیـشانەیەکی ئێجگـار گـەورەی وەرچـەرخانی سیاسـەتی نێـو ەتەوەییە لەدنیایا بەرامبەر کورد؛ لەوە بەدواوە, ئیتر دەرگای دیبلۆماسیەت بۆ کورد کرایەوە و پێشوازی کورد لەلایـەن ئـەمریکا, بریتانیـا, ئـەڵمانیا, فەرەنسا, ئیتالیا, زۆرێك لەووڵاتـەکان پـشتیوانی کـورد لـە سـاڵی ١٩٨٨-١٩٨٩ وردە وردە دەست پێ دەکات, گوێ لەکورد ئەگیرێ, پشتیوانی کورد ئەکرێ, دەروازەی ئەم سیاسەتە دیپلۆماسییە کوردییەش لە کۆنگرەی پاریسەوە کرایەوە.

دوومانگ لەدوای ئەوە, مانگی (١٢), کۆنگرەی (١٠٠) هەمین ساڵەی سۆسیـ
ئەنتەرناسیۆنال لەدونیا, دەبەسترێ, لەو کۆنگرەیەدا چواربڕیار لـە بەرژەوەنـد
کورد ئەدرێ: بڕیارێکی سیاسی بۆ پشتیوانی کێشەی کـورد, بڕیارێك بـۆ مرۆڤ
کورد, بڕیـارێکیش بـۆ پاراسـتنی کلتـوری کـورد (ئەمـەش مەسـەلەیەکی گرنگ
سۆسیال ئەنتەرناسیۆنال نیوەی دنیا حـوکم ئـەکات لـەمانگی ١٩٨٩/١٢ کۆنگ
ئەبەستن بەبۆنەی (١٠٠) ساڵەی دامەزراندنیەوە چوار بڕیـار لەبەرژەوەنـدی کو
ئەدەن, لەوە بەدواوە ئیتر مەسەلەی کورد دێتە پێشەوە.

## - ج -
## دوای داگیرکردنی کوەیت

خۆش بەحاڵی کورد ئەوکاتە رژێمی عێراق کوەیتی داگیرکرد, ئینجا لێـرە, بـ
ئاگاداریتان ئێوە رەنگە ئەو شتانەی کـە ئێسـتە دەیگێڕمـەوە سـەیری تەمـەنتا
ئەکـەم بـاوەڕ ناکـەم کەسـتان ئـەو کاتـە (١٠و١٢) سـاڵ زیـاتر بێـت (١٩٨٨
١٩٨٩و١٩٩٠) ئەمانەی کەدانیشتوون لەبەرچاوم تاك تاکتان نەبێ (١٣و ١٤) سا
بـووە باقیەکـەی لەوەناچـێ (١٠) سـاڵ زیاتر بووبێـت, مەبەسـتم مامۆسـتاکان
دەرچـووەکان نییـە, مەبەسـتم خوێندکارەکانـە, دیـارە مامۆسـتاکان تەمـەنیا
چەندبووە, بەخۆشمـەوە, کوەیـت کـەداگیرکرا رووداوێکـی ئێجگـار گـرنگ بـوو بـ
کورد, ئێوە ئەزانن هەر چی سـەرکردەو دام‌و دەزگـا هەیـە لـەم دنیایـە, هەرچـ
لێکۆڵەرو فەیلەسوفـو بیرمەند هەیە لە هەموو دنیایا ئـەڵێم, نـەك لەکوردسـتاندا
هیچ کەسێك پێش داگیرکردنی کوەیت پێشبینی داگیرکردنـی کـوەیتی نـەکردبوو
تەنها پیاوێك لەناو ئەم کوردە پێشبینی کردبوو, ئەویش ناوی جەلال تاڵەبانییـە
لەساڵی١٩٨٩ لەپەرلەمانی بەریتانی (مـام جـەلال) یـەك سـاڵ پـێش داگیرکردنـ
کوەیت موحازەرەیەك پێشکەش دەکا, پێشبینی ئـەکا دەوڵـەتی عێـراق کوەیـ
داگیربکات, دیارە باوەڕیان پێ نەکردبوو, وتوبویان ئەمـە مەحاڵـە؛ ئـەم قـسەیـ
بەهیچ شێوەیەك هیچ کەسێك نەچـووبوو بەعـەقڵیا؛ لەفەرەنـساش, بەحکومـەتـ
فەرەنسی وتبوو دڵنیاتـان ئەکـەم حکومـەتی عێراقـی کوەیـت داگـیر ئـەکا, بـۆی
شـەرح کردبـوون بۆچـی, فەرەنـسیەکانیش باوەڕیـان پێنـەکردبوو. حکومـەتـ
عێراقی دوای ئەوەی کوەیتی داگیرکردبوو, فەرەنساییەکان هاتبوون بـۆلای (مـا
جـەلال) وتیـان باشـە دوای ئەمـە چـی روونـەدا؟ ئـەو قـسەیەت هاتـەدی, ئەمـ
مەسەلەیەکی گرنگە کە شتێك لەئارای سیاسەتی دونیادا نـەبوبێ, تـۆ پێشبینـ

بکـەی بزانــی کــەکوەیت داگیرئــەکریّ. کــە کوێیــت داگیرکــرا, لەوەبــەدوا ئــیتر مەسەلەی کورد بەتەواوەتی هاتە پیشەوە.

چۆن هەموو ولآتانی دنیا خەریکی ئەفغانستان بوون, خۆتان بینیتان کارازای کە خاوەن رستوران بوو لەئەمریکا, کە روداوی گەورە هاتەپێشەوە, وتیـان وەرە ببە بەرەئیس وزەرا؛ یـەکێك بـووە لـەمعارەزە, نـاوداریش نـەبووە, ئەمـە دنیـای سیاسەتە کە لە رستورانەوە ئەچیتە پـشتی مێزی رەئیـسی وزەرا.کـە رووداوێـك روودەدات, چارەنووسی میللەتان ئاوهای لیدێت, چارەنووسـی میللـەتان سـەراپا ئەگۆرێت؛ ئێستا ئەو روداوەی (١١)ی سێپتەمبەر لەدوای داگیرکردنی کوەیت, کە بووبەمایـەی راپـەرینی کوردسـتان, بەتەسـەوەری مـن روداوی (١١)یسێپتەمبەر گۆرانێکی گـەورەتر لـە رۆژهـەلآتی ناوەراسـت بـەدی ئـەهێنیّ, پێـشبینی ئـەکریّ (ئێمەش هەروا چاوەروانین) کە لەحکومەتی عێراقی ئەدریّ؛ لیّشی بدریّ ئەمجارە بۆ روخاندنێتی, بۆ ئەوەنییە گورزێکی لیّ بدریّو عاقلّ بکریّ, یـان چـوار تـەیارە بێت دووسیّ (بۆمب) بهاویّ, لیّدان بـۆ ئـەوەیـە حکومـەتی عێراقـی لـە ناوبـەرن, حکومەتێکی تازە بێتە سەرحوکم, ئێمە وەکو کـورد سـورین لەسـەر ئـەوەی ئـەو حکومەتەی دێتەسەر حوکم حکومـەتێکی دیمـوکراتی ئیـتلاف پـەرلـەمانی فیـدرالی فرەلایەنیی بیّ لەمەرکەزی بەغداشا کورد بەشی حوکم رانی هەبیّ.

هـەموو قـسەوباسێکی تـورکو عـەرەب فـارسو دەولـەتانی ناوچـەکە ئەوەیـە ئەلّێن: کورد نابیّ جیابێتەوە؛ الحمدلله بۆ یەکەمین جارە لـەم دنیایـە کـورد وای کردووە هەموو دنیا حسابی بۆ بکا, تائێستا بیّحساب بوین لەدونیا, ئێـستا نـابیّ دەولّەت دابمەزرێنن؛ خۆ ئێمەش نەمان ووتـوە دەولّـەت دادەمـەزرێنین؛ ئێمـەش سیاسـەت ئەکـەین ئاگامـان لەسیاسـەتی دنیـاو بریارەکـانی دەولـەتانی ئـەقلیمی هەیـە, شـتی وامـان نـەوتووە, بـەلآم مـادام نایـەلّن ئێمـە لـەوولآتی خۆمـان سەربەخۆیی وەربگرێن و, مـادام هـەر ئـەبیّ لەدەولّـەتی عێراقـا بمێنین, کەواتـە ئێمـەش لەحکومـەتی مەرکـەزی عێراقـا حـەقی خۆمانمـان ئـەویّ, ئـەمجارەیان دانانیشین لەکوردستانا خەلّکی تـر لەبەغداوە حکوممـان بکا (٥) ملیۆنین ,(٦) ملیۆنین لەسەدا (٢٠و ٣٠و٤٠)ی عێـراقین بەقـەد ئـەوە ئـەبیّ کـورد لەحکومـەتی مەرکەزا حوکمی بـدرێتیّ, دەسەلآتیـشمان بـدرێتیّ لـەویّ, ئینجا جگەلـەوەی لـە فیدرالیش نایەینە خوارەوە؛ واتـا سـەرباری ئـەوەی کـە فیـدرالّی خۆمـان حـەلآلّ ئەکەین, بەشی خۆشمان لەولاوە داوائەکـەین. ئـەمجارەش کـورد مـافی خۆیـەتی

زۆرتری بەربکەوێ، چونکە ئەزمونێکی سەرکەوتومان هەیە و لەبەرامبەر بەعسیشدا کورد زۆرترین قوربانی داوە. کەوابێ: ئامادەبوان لەعێراق ئەدرێ؟ بەپێی هەموو پێشبینیەکان گۆڕانکاری گەورە رووئەیا، مافی خۆمان بەقەد حەقی خۆمان وەرئەگرین وئەم دڵەڕاوکێیەی ئێستا هەیە کە ئایە ئەمێنین‌و نامێنین‌و پشتیوانیمان ئەکرێ‌و ناکرێ، دڵنیاتان ئەکەم لەو دڵەڕاوکێیە رزگارمان ئەبێ. ئەگەر داگیرکردنی کوەیت‌و راپەڕین فیدراڵی لێکەوتبێتەوە؛ لێدانی ئەمجارەی عێراق لەدوای (١١)ی سێپتەمبەر چەسپاندنی فیدرال دەبێ لەکوردستاندا، ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، چونکە ئەگەر لەدەوڵەتی مەرکەزی، یاسای فیدراڵی خۆمان چەسپان، ئیتر خەممان نامێنێ، لەسلێمانی قسەیەك هەیە ئەڵێ لەخەم ئەرەخسێ، لەخەم ئەیرەخسێنن، خۆمان بۆ ئەوە هەڵگرتووە خۆمان لەخەم برەخسێنن ،هەتاهەتایە ئەو میحنەتانەی کەکورد لێی ترساوە لەکۆڵمان بێتەوە؛ ببین بەخاوەن دەسەڵاتی خۆمان و، تەرخان بین بۆئەوەی سەدان بەرامبەر بەئێستا خزمەتی وڵاتی خۆمان‌و خزمەتی ئاوەدانی خۆمان بکەینەوە بەرەو دونیایەکی دیموکراتی و مەدەنی و مۆدێرن.

بێگومان بۆ ئەمەش، دەبێ ئاشتی لەکوردستاندا بەدی بهێنین، دەبێ پەیوەندییەکی باشمان لەگەڵ معارەزەی عێراقیدا هەبێ، دەبێ ماڵی کورد یەك بخەینەوە، نابێ لەسەر ئەوەی ئەم بەندە وایەو پەرلەمان وا نییە، ماڵی کورد بەیەکنەخراوی بهێڵینەوە. شتی گەورەتر گرنگترە لەوەی کەئێستا لەبەردەستمانە، ئەو شتەگەورەترە دەبێ زۆر بەبایەخەوە سەیر بکەین‌و خۆمانی بۆ ئامادەبکەین، قیادەی کوردی بەیەکێتی‌و پارتی‌و حزبەکانی تریشەوە، دەبێ لەئاستی ئاڵوگۆڕو روداوەکاندابن، ئەم ئاڵوگۆڕانە دەبێت بەدیقەت حیسابی بکەین، حیساب بۆ سوریا بکەین، حساب بۆ ئێران بکەین، حساب بۆ تورکیا بکەین، حساب بۆ ئەوروپا بکەین، حساب بۆ دەوروبەری خۆمان بکەین، حساب بۆ سونی‌و بۆ شیعە بکەین، بۆ عیلمانی‌و بۆ ئیسلامی بکەین، بۆ دیموکراتیخواز، بۆ ناسیۆنالیزم بۆ هەموو کەسێ لەو کەسانە حساب بکەین، زۆر بەوردی ئەبێ بەحسابەکانا بچینەوە، نابێ ئەم جارەیان ئەم هەلەی هەڵئەکەوێ لەدەست کورد دەربچێت، ئەم هەلە لەدەستمان دەربچێت ئوبالی لەئەستۆی خۆمانە، شەرمەزاری بۆ خۆمانە، سەرشۆڕی بۆ خۆمانە، وسەرکردایەتی سیاسی تەحەمولی شەرمەزارییەکە ئەکا، هیچ کەسێکی تر تەحەمولی ناکا، ئەگەر جاران

لەسەدا (٩٠)ی ئەمان ووت سیاسەتی دەولی, دەوڵەتانی ئـەقلیم, قبولْمـان ناکـا, ئەمجارەیان هەل‌و مەرجێکی گەورەو پشتیوانی ئێمەهاتۆتە پێشەوە کە ئەتوانین دەرەقەتی فشاری ئەقلیمی بێین, دەرەقەتی بێین ئەگەر بەدیقـەت بـین, ئەگـەر پرۆژەمان هەبێ, ئەگـەر خیتـابی یـەکگرتوو ئاشـتیخوازی راستـەقینەمان هـەبێ, دەرقەتی یەك دەوڵەت, دوو دەوڵەت دێین کەبەربەست بین لەبەردەمی و نـەهێڵین هەلەکە لەباربەرێ، بەڵام خۆمـان رێـك نەخـەینـەوە, نـەك دوو دەوڵـەتی ئـەقلیمی بەڵکو حزبێکی بچوکیش دەتوانێ مشکیلەی گەورەمان بۆ بنێتەوە, تەنانەت هـیچ دەوڵـەتێك دژایەتیـشمان نـەکا, خۆمـان دەبینـە مایـەی سـەرخواردنی ئـەم هەلـە گەورەیە. بـەهیواین هـیچ لایـەك نـەتوانێ کێـشەی گـەورەمان بـۆ بنێتـەوە, هـیچ دەوڵەتێك نەتوانێ بگرە بەس خۆمان بتوانین دەردی سیاسیمان چارەسەر بکەین و, خۆمان ئامادەکەین بۆ ئالوگۆڕی گەورە, بۆ ئەوە هەتاهەتایە کورد بگەیەنینـە قۆناغێك بەتەواوەتی سـەرفرازی بێـت, قۆنـاغی رزگـاری بێـت, قۆنـاغی ئـازادیو بــازاڕی ئــازادو ئــەو پێــشکەوتن‌و ئــالوگۆڕە بێــت کــەئێوە ئێــستە ئــەیبینن لەسلێمانیدا.

– د –

## وەفدی سوید و دیموکراتی لە کوردستاندا

**ئامادەبووان...**

دووهەفتە لەمەوبەر وەفدێکی سویدی هاتبوو بۆئێرە, یەکێتی هونەرمەنـدانی کوردستان بەهاوکاری مەکتەبی رێکخراوە دیموکراتیەکان دەعوەتی کردبوون, بـۆ ئـەوەمان دەعـوەت کردبـوون، کـەبێن لێـرە، محـازەراتی هونـەری, تەشـکیلی, مۆسیقی, مەسرەحی بدەن بەخوێندکارانی پەیمانگای هونەرەجوانەکان‌و کۆلێجی هونەر؛ هاتن ئەوەڵی جار هاتن بۆ سلێمانی هەموو ئەو داموو دەزگایانەی ئێمـەیان دیبـوو, هەنـدێك بەرنامـەی هاوبـەشمان بـۆ دانـابوون, ئـەزانن چـییان وتـووە، ووتویانە: ئێمە هاتین فێرتـان کـەین ، بـەڵام دڵنیاتـان ئەکـەین لێتـان فێربـووین‌و ئاستی ئێـوە لەئاسـتی ئێمـە بـەرزترە, رەنگـە زۆرتـر مەبەسـتیان روحیـەت و پەرۆشـی هونـەر بوبـێ, نـەك لایـەنی تەقـەنی و کەرەسـە و سـتاتیکی. لەگـەڵ ئەوەشدا, سەیری ئەم میدالیە جوانە بکە، دەوڵـەتی سوید هـەزار ساڵ زیـاترە دەوڵەتە, من سویدم بینیوە ئەزانم چی دەوڵەتێکە, هاتوون بۆ ئێرە ئەڵێن لێتـان فێربووین, ئەوە زۆر گرنگە ئەڵێ لێت فێرئەبم, ئەڵێ تابلۆکانی ئێـوە لـەهین ئێمـە

باشتره, مۆسیقای له هین ئێمه بەجۆشتره؛ رۆحی ئێوه زۆر لەهین ئیمه پـاکتره, ئەمانه قسەی ئەوان بووه.

ئـازادی گـەورەترین سـەرمایەی ژیانـه بـۆ دەسـەلاتدارێك کەهـەیبێ, ئـەو روحیەتەی ناو بەهرەمەندانمان زادەی ئـازادی دەستەبەرکراوە. لەسـەر ئەمـەش ئەڕۆین, ئەمڕۆ لەسەر ئەوە ئەڕۆین پەنجا سالّی کەش لەسەر ئەوە ئەڕۆین, ئەمـە مەبادئی ئێمەیە, بیرباوەڕی ئێمەیە, هیچ منەتێکیشی تیا نییە, ئەوکاتەی چـوینە شـاخ, هـەڤالانی ئـەوەلّحار مـەفرەزەمان لـە (١٩٧٦/٦/١٠) لـەبادینان هاتۆتـە دەرەوە, شـەهید ابـراهیم عـەزۆ قیادەی کـردووە. وردە وردە مـەفرەزەکانی تـر ئەوکاتە چـوینە دەرەوە؛ وتمـان ئێمـە ئەگـەر کوردسـتان رزگـار بکـەین ئـازادیو دیموکراسـی لـەولاتی خۆمانـدا بـەدی ئـەهێنین, ئەمـە پـەیمانێك بـووە داومانـە بەمیللەتەکەمان, میللەتەکەمان لـەپێناوی ئـەم پەیامـە هـەزاران هـەزار قوربانی داوە, بێگومـان ئێمـە نـاتوانین ئێستە کـە دەسـەلات بەدەسـتامانەوەیە جگـە لەدیموکراسـی شـتێکی تـر بسەپێنین. لەسـالّی (١٩٧٥ ــ ١٩٧٦) لـە رۆژنامـەی رێبازی نوێ یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا, ستونێك هەیە بەناوی (چیای لالـش) دیقەت لەم قسەیە بدەن ستونێك نوسراوە لەرۆژنامەی رێبازی نوێی سـالّی ١٩٧٦ بـەناوی چیای لالاش, ئەوکاتـە حکومـەت چـووبووە سـەر کۆچـەریەکانی چـیای لالاش دێهاتی وێران کردبوون, ئەو ستونە دەلّێ: حکومەتی عێراقی شاخو دێهاتی ئێمـە وێـران دەکـا, ئەگـەر ئێمـە کوردسـتان ئـازاد کـەین جـوانتری ئـاوەدان دەکەینەوە؛ ئێمە بەو ورەیە چوینە شاخ سالّی ١٩٧٦ وامان وتـووە؛ هـەموو ئـەو شوێنانەی رژێمی عێراق وێرانی کردووە بەراستی جوانترمـان ئـاوەدان کردۆتـەوە, ئەو شوێنانەی سەیری مەکتەبی ئێستاو مەکتەبی زەمانی حکومـەت بکـەن, بچن سەیری خەسـتەخانەی ئێستاوخەستەخانەی زەمـانی حکومـەت بکـەن, سـەیری کارەبای ئێسـتاو زەمـانی حکومـەت بکـەن, بـۆ مـەعلوماتتان کـە راپـەڕین بـووە کارەبای ئێستای سلێمانیمان کەگرتۆتـە دەسـت هـەمان ئـامێری کەسالّی ١٩٥٦ لەسـلێمانی دامـەزراوە سـلێمانی هـەتا راپـەڕینیش چـەن گـەورە بـووە بەهـەمان کەرەسەی کارەبای کۆنی هەبووە, ئێستە هـەموو سـلێمانی کـە پـەنجا بەرامبـەر زیادیکردووە ئەتوانین کارەبا بدەین, سـالّی (١٩٢١ ــ ١٩٩١) حکومـەتی عێراقـی لەهەموو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئێمه (١٥٦) مەکتەبی کردۆتـەوە ئێستا ئێمـە (١٢٧٥) مەکتـەبمان کردۆتـەوە لـەم چـەند سـالەی کەکوردسـتان رزگـاربووە خەسـتەخانەکان چـەندین بەرامبـەر حکومـەتی عێراقـی زیادمـانکردووە, ئـەوە ئازادییەکانیش قسەناکرێ لەهەموو کوردستاندا یەك رۆژنامەی ئازاد نـەبووە یـەك کتێبی ئازاد نەبووە, ئێستا لەناوچـەکانی ژێـر دەسـەلاتی ئێمـە (٣٨) رۆژنامـەی

ئازاد (٥٧) گۆڤاری ئازاد (٩) تەلەفیزیۆنی ئازاد (٢٣) نیزگەی ئازاد لەناوچـەکانی ژێر دەسەڵاتی ئێمەدا هەیە, جاوەرە ئەگەر بتوانین باری ئابووری خۆمـان چاکتر بکەین وکێشەی سیاسی ناوخۆی کوردسـتان کۆتـایی پـێ بێـنین, توانـاو داهـاتی کوردستان بۆ کوردستان تەرخان بکەین, بزانە چی بەسەردێت, ئەم وڵاتە ئـەبێت بەیەکێك لە وڵاتە هەرە جوانە پێشکەوتوەکانی پـڕ لـە ئازادییـەکانی رۆژهـەڵات, کەبێگومان خوێندکارانی کوردستان جارێکی تر ئەیلێم: ئـەتوانین لـەم بارەشـەوە دەورێکـی گـەورە ببیـنین وهـەمووومان ئـەبێ چـاوەڕوانی گۆڕانکـاری بکـەین, بـۆ ئەوەی بتوانین ئەرکی سەرشانی خۆمان بەرانبـەر بەنەتـەوەو نیشتمان‌و خـەڵك‌و خاکی خۆمـان بـەدی بهێـنین, ئەمـە ئـەرکێکی پـیرۆزە, هـیچ ئـەرکێکی تـر لەمـە پیرۆزتر نابێ. هەموومان سەربەرزین لەسایەیەوە, ئەمەی کەبۆتان بەدی هـاتووە لەم خوێندنگایانە هیچ نەبێت لەچاو ئەوەی کەئەبێ بەدی بێت ولەچـاو ئـەوە کـە خزمـەت بکرێـت, لەچـاو ئـەوەی کـەدەبێ سـەربەرزتروو ئاسـودە تـر بژین, لـەم وڵاتەی خۆتانا, حەقی خۆشتانە چـونکە بنەماڵـە نیـە لـەم کوردسـتانە شـەهیدی نەدابێت, ئەنفالی نەیابێت, کیمیایی هەڵنەمژیبێ, ماڵ وێران نـەبووبێ, دەربـەدەر نەبووبێ, ئیختفای نـەکردبێ, سجنی نـەخواردبێ, پێشمەرگەی نـەدابێ, کەواتـە هەموو کەسێك لەو وڵاتە حەقی بەسەر ئەم وولاتەوە هەیـە, هیـوادارم هـەموومان حەقەکانی خۆمان وەربگرین بەسەربەرزی‌و ئازادییەکی تەواو.

- ٥ -

## پرسیارو .. وەڵام

**زۆر سوپاس بۆ کاک بەختیار**

**بەڕێزان ئێستاش هەرکەسێک موداخەلەی هەیە با رەچاوی کات بکات‌و لەبابەتەکە دەرنەچێ‌و بفەرموێ:**

**خوێندکار . اسماعیل:**

**پرسیار:** سـەرەتا دەستخۆشـی لـەکاك مـەلا بـەختیار دەکـەم بـۆ کۆڕەکـەی, هیوای سەرکەوتنیشی بۆ دەخوزام, هیوادارم پەیمانگاکەمان ببێتـە هـۆی ئـەوەی زیاتر لەم جۆرە کۆڕانـەی تیـا بگـیرێ, بـۆ زیـاتر کردنـەوەی مێشکی قوتابیـان‌و خوێندکاران لەبەر ئەوەی پەیمانگاکە ماوەیەکە لـەم جـۆرە کۆڕانـە بـێ بەرییـە؛ زۆربـەی قوتابیـانیش لـەم جـۆرە کارانـە بـێ ئاگـان‌و لەسیاسـەتی دەولـی زۆر ناشارەزان, کۆڕەکەی زۆر بەتام بوو, بەڵام زۆربەداخـەوە ئـەڵێم کۆڕەکـەی زیـاتر باسی وڵاتانی دەوروبەر بوو, یـەکێ لەوانـە ئەفغانـستان, دووەمـیش دراوسـێیەك

مان هه‌یه كه ئه‌ویش هه‌ولێری كوردستانی خۆمانه, كه‌زیاتر په‌یوه‌ست بوو بۆ ئه‌و كه‌كه‌مێك غه‌یبه‌ت‌و باسی ئه‌وانیشی تێدابوو, منیش پرسیارێك ده‌كه‌م كه‌ئایا ئه‌گه‌ر ئوسامه بن لادن‌و جه‌ماعه‌تی ئه‌لقاعده‌و ئه‌فغانستان هه‌وڵ ناده‌ن بۆ دابین كردنی ئاوه‌دانی‌و ئازادی‌و ورزگاریخوازی, منیش پرسیارێك ئه‌كه‌م ئایا ئه‌مریكا هه‌وڵ ده‌دات بۆ ئاوه‌دانی‌و رزگاری خوازی بۆ ولاتان, رێكخراوی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان له‌رۆژی ٢٠٠١/٣/١٠دا قه‌رارێكی ده‌ركردو بڕیارێكی بڵاوكرده‌وه ئه‌گه‌ربێت‌و رێژه‌ی ٤٪ ده‌وڵه‌مه‌نده‌كان ٢٢٥ ده‌وڵه‌تی دابه‌شبكرێت به‌سه‌ر هه‌ژارانی هه‌موو جیهاندا, ئه‌وا یه‌عنی وه‌كو بێ منه‌ت به‌شی هه‌موو هه‌ژاران ئه‌كاو هه‌ژاران پێداویستیه‌كانیان دابین ده‌كرێ له‌رووی خۆراك‌و ئاوی پالێوراوو پێداویستی به‌هه‌موو جۆره‌كانییه‌وه, كه‌ئه‌ویش بڕی ١٣ ملیار دۆلاره جا ئه‌و ١٣ ملیار دۆلاره‌ش خه‌ملێنراوه به‌رێژه‌ی ئه‌و هه‌موو عه‌ترو بۆنه‌ی له‌ئه‌مریكاو ئه‌وروپا مه‌سره‌ف ده‌كرێ.

خاڵێكی تریشم ئه‌وه‌یه به‌راستی ١٩٩٩ هیلاری ژنی كلینتۆن سه‌ردانی ئه‌فغانستانی كرد بۆ زیاتر روونكردنه‌وه‌ی بارودۆخی كێشه‌ی ئافره‌تانی ئه‌فغانستان، له‌رۆژنامه‌ی هه‌مشاریدا له‌هه‌مان ساڵدا بڵاوكرایه‌وه ئه‌م سه‌ردانه‌و وه‌چاوپێكه‌وتنه‌یش, له‌گه‌ڵ هیلاریدا كرابوو, كه وتبووی ژیانی ئافره‌تانی ئه‌فغانستان له‌زه‌مانه‌كانی پێشوو باشتره, خاڵێكی تریشم ئه‌وه‌یه یه‌ك دوو ئیشاره‌ی كرد كاك مه‌لا به‌ختیار وتی كه‌س خه‌لیفه‌ی خوانییه له‌وه ئه‌چێ كاك مه‌لا به‌ختیار له‌من شاره‌زاتر بێ له‌به‌رئه‌و ناوبانگی هه‌یه, كاك مه‌لا به‌ختیار من له‌وه ئه‌چێ هێشتا خوێندكاربم كاك مه‌لا به‌ختیار وتی: كه‌س خه‌لیفه‌ی خوانییه له‌سه‌ر ئه‌رزا خوای گه‌وره ئه‌ڵێ (إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً) من خه‌لیفه‌ی خۆم له‌سه‌ر زه‌ویدا جێ نشین ده‌كه‌م, جائیتر ئه‌وكه‌سه هه‌ركه‌سێ هه‌یه من ئیشاره‌ت به‌و كه‌سه‌ناكه‌م وه‌كه‌سیش ناتوانێ به‌كه‌س بڵێ كافر ئایه‌تێك هه‌یه خوای گه‌وره ئه‌فه‌رمووێ (فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدْ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى) وه‌یه‌كێكه له‌شروته‌كانی لاإله‌إلاالله وه, ئه‌وه‌ی شێخ مه‌حمودی نه‌مریش به‌راستی ئه‌ڵێی من وه‌كو خۆم پێی ناڵێم هه‌ڵه, كه‌ئه‌وه‌ی پێی ئه‌وترێ هه‌ڵه‌ی شێخ مه‌حمودی نه‌مر كه‌به‌ناوی دینه‌وه قسه‌ی كردووه, چونكه به‌راستی گه‌لی كورد مێژوویه‌كی تۆماری دوورو درێژی هه‌یه له‌ناو ئیسلامدا, به‌راستی ئیسلام كه‌كاتێك هاتووه له‌كوردستاندا بڵاوبۆته‌وه, به‌راستی مێژوویه‌كی ته‌واوی تۆمار

کردووه لەناو ئیسلامدا, لەبەرئەوەی ئیسلام یەعنی وەکو کورد بڵێین مێژوویەکی پێشینەی روونی نییە جگە لەئیسلام, هەر بۆنموونە لەئەدەبدا ئێستەش بۆ زۆر بەدەگمەن شعر هەیە کەلەپێش ئیسلامدا وترابێت. زۆر سوپاس بۆ کاک مەلابەختیار.

وەڵام: زۆر سوپاس بۆ کاك اسماعیل تەلەبەیەکی ژیری, رەخنە کانیشی گوێ لێگیرا, بەڵام رەخنەم لەسەر رەخنەکانت هەیە؛ یەکەم من هەر لەئەخیری قسەکەما باسی هەولێرم کرد ناوی هەولێرم نەهێنا لەهەموو کۆڕەکەما, ئەویش پێم وابێ نیو دەقەبوو یەك سەعاتە قسە دەکەم نیو دەقە باسی هەولێرم کرد (٥٥) دەقیقەی عیلاقەی بەهەولێرەوەنەبوو, ئەوە یەك؛ سەبارەت بەئەمریکاو نەتەوە یەکگرتووەکان‌و دەوڵەمەنی لەدنیا, کاکەگیان مەسەلەی دەوڵەمەند بوون لەدنیا مەسەلەیەك نییە بەئارەزووی تۆبێ, بەئارەزووی نەتەوە یەکگرتووەکان بێت, ئەم پارەیە دابەش کاو فەقیری لەدنیا نەهێڵێ, پێغەمبەر خۆی ئەڵێ‌ مادام بەناوی پێغەمبەرەوە قسە ئەکەی, ئەڵێ (خوا چین لەسەر چین ئێوەی دروستکردووەبۆ ئەوەی خزمەتی یەکتری بکەن) چین لەسەر چین یەعنی چینی بالا, چینی خوارتر, چین خوارترو چینی خوارتر وەئەمە ئەرەلییە لەلای ئیسلامدا, بەهیچ شێوەیەك سۆسیالیزم لەئیسلامدا نییە, ئەو عەدالەتە ئیجتماعیەی کەپێی ئەوترێ سۆسیالیزم لەئیسلامدا نیە, بەپێچەوانە ئێمەی عەلمانی, دیموکراتیەکان بەپێچەوانەوە پێمان وایە لەدنیا بەسۆسیالیزم هەر ئەگەین. بەڵام لەزەمان‌و زەمینی‌و خۆی نەك فەقیر بێت یان نەبێت. سۆسیالیزم بەکۆمەك کردنی فەقیر نایەتەدی. بەڵکو بەگۆرینی هێز و پەیوەندی بەرهەمهێنان دێتەدی. پیاوێکی بێ مستەوا کە هیچ نازانێ بێ پارەی بدەیتێ بەپارە وابزانێ ئەبێ بەپیاوێکی زانا و زانای لێ دەردەچێت, ئەم کێشەیە پەیوەندی بەپرۆسەیەکی ئابووری, تەکنەلۆجی و شارستانی دووررودرێژ هەیە, بابەتێك نییە کەسێك نەخوێندەواربێت بەئاسانی بیکەی بە زانا, یا بیکەی بەتەکنسیۆن, یابیکەی بەدکتۆر, ئێستە خۆت ئیمکانی نییە لەبەینی دوو دکتۆرا دکتۆرێکی باش بێت‌و دکتۆرێکی کەمێك خراپ بێت, بچیت بۆلای دکتۆرە خراپەکە, هەرئەوەێ بچیت بۆلای دکتۆرە باشەکە عیلاجت بکات, سەیارەت خراپ بێ ئەچی بۆلای فیتەرێکی زۆرباش, ناچیت بۆلای فیتەرێکی خراپ, ئەمە غەریزەی ئینسانە, خواستی ئینسانە؛ کەلەم ژیانە واهاتووە لەگەڵ ئەوەشا زۆر زۆر

دەوڵەمەند هەیە قبوڵ ناکا ملیار چیە کاکە ملیار هەرهیچ نییە ئەوەی کەتۆ ئەیڵێی ١٣ ملیار ١٣ ملیار بەشی یەك سەعاتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە, یەك دانە سەعات نەك ساڵومانگ. لەیەك دانە سەعاتدا سەدان هەزار سەندویج ئەخورێ لەئەمریکایا, بەس بیرە بەدەیان ملیار دۆلار ئەخورێ لەرۆژێکدا لەئەمریکا, ئەمە مەوزوعێکە کەمیللەتانی وەکو ئێمە دەبێ خەبات بکا بۆ ئەوەی ماف خۆی وەربگرێ و خەبات بکا, کەئەو جیاوازیە لەبەینی دەوڵەمەندی زۆری وڵاتانو فەقیری وڵاتانا وردەوردە کەم بکاتەوە, ئەمەیەك, من تەحەدات ئەکەم کەئەو قسەیەی هیلاری کلنتن بێنیت بەسەرچاوەوە, کاك اسماعیل لەبەر چاووی هەموو ئەوانە ئەگەر هیلاری کلنتن چووبێ بۆ ئەفغانستان وتبێتی ژنی ئەفغانستان زۆر زۆر باشتر لەپێشوو چی ئەڵێیت راستە. ئەمە یەك, دوو: خۆم ئەو سەمەر خانەی کەئێستە رەئیسی وزەرایە لەمانگی ١١ ـ ٤ ساڵیپار لەئیتالیا بینیم, یەکێك بوو لەژنانی معارەزە باسی ئەوەی بۆ کردم کەهیلاری کلنتنی لەچینابینیوە وەکو ژنێکی ئەفغانی لەچینا دیویەتی وەپشتیوانی هیلاری کلنتنی وەرگرتووە بۆ رزگارکردنی ژنانی ئەفغانستان لەو کۆیلەیەتیو میحنەتەی کەتیایە ئەژی, ئاخر هیلاری کلینتن ئەمەنە ساویلکە نییە کە ئیستا ئەندامی مەجلسی سەنای ئەمریکایە وەیەکێکە لەهەرەناودارەکانی دنیا, بچێت قسەیەکی ئەوها بکا, قەت شتی وانەبووە, خوا لەقورئانا ئەوەی وتویەتی (اني جاعل في الارض خليفة) کاك اسماعیل بەمەلائیکەتی وتوە, ئێستە ئاخر کێ مەلائیکەتە مەلا کرێکار مەلائیکەتە, ئوسامەبن لادن مەلائیکەتە, مەلا عومەر مەلائیکەتە, لەدوای پێغەمبەر کەسی تر جێنشینی خوانییە؛ لەدوای وەفاتی پێغەمبەر پێغەمبەر خۆی خەلیفەیەکی دیاریکراوی بۆخۆی دانەناوە. چوار خولەفای راشدین هەبووە سیانی کوژراون, ئەوانیش خولەفای دوای پێغەمبەرن نەك هی خوا, ئەگەر خەلیفەی خوان سیانیان چۆن ئەکوژرێن, لەدوای پێغەمبەر هەمووی ئیشتهاداتو قسەی ئەم خەلیفەو قسەی ئەو خەلیفەو قسەی ئەم عالمی دینییە, نە قسەی قورئان ماوە نەسونەت, لەبەر ئەوە کەس خەلیفە نیە. لەدوای مردنی پێغەمبەر کەجارێ نەیاناشتووە بووە بە کێشەی گەورە لەبەینی خولەفای راشدیندا, لەبەینی ئیمام عەلیو عومەری کوڕی خەتابو عوسمانی کوڕی عەفان و ئەبوبەکری صدیق بوو بە کێشەی گەورە خەریك بوو یەکتر بکوژن. ئێستاش نەبراوەتەوە.

لەسەر ئەوەی کەکورد مێژووی نییە, جگە لەمێژووی ئیسلام, ببورن بەراستی پێم وایە باوەڕناکەم بەهەڵەدا چوویم, من لەتۆ ئەپرسم بەشەرێت چەن ساڵە لەدنیادا هەیە, بپرسە شارستانیەتی میللەتان چەند ساڵە لەدنیادا هەیە, دەسەڵاتی میللەتان چەند ساڵە هەیە, دەوڵەتی ماد چەند ساڵە دروستکراوە,٧٠٠ ساڵ پێش ئیسلام مێژوی زایین هەیە, ١٣٠٠ پێش ئەوەی ئیسلام دەوڵەتی ماد هەبووە, باشە من بەپێچەوانەوە ئەیڵێم و, بەهەموو راشکاویەك دەمەوێ بەجەنابتو هەموو ئامادەبوان بڵێم: من پێم وایە میللەتی کورد میللەتێ بووە بەئارەزوو نەبووە بەئیسلام, بەئەنفالو بەفتوحات کراوە بەئیسلام، مێژوی ئیسلام کە (تەبەری) نووسیویەتی, کە مێژوونووسەکانی ئیسلام نووسیویانە, خۆیان وائەڵێن, من وانالێم, ئیسلام دوای ٤٥٠ ساڵ توانیویەتی کوردستان بەتەواوەتی دابین بکات بۆ خۆی, ئەم هەورامانەی کەئێستە ئەیبینی ٣٦٥ ساڵ مقاوەمەتی ئیسلامی کردووە تەسلیم نەبووە. لەخارجی جەزیرەی عەرەبی تەنانەت لەناو هۆزەکانی قورەیش خۆیا بەبێ فتوحاتو غزوات هیچ عەشیرەتێکی ناو جەزیرەی عەرەبی بەئارەزوو نەبووە بە موسڵمان, چ جای بۆ میللەتانی غەیرە عەرەب. بۆ نموونەپێغەمبەر کەمردووە پێت وایە کەزۆر بەی عەرەب ئیسلام بوون تازەمانی پێغەمبەر؟ نەخێر؛ ئەم قسەیە بەسە پێغەمبەری گەورە هەتا مردووە نەیتوانیوە هەموو عەرەب بکا بەموسڵمان؛ زۆربەی عەرەب اعراب بوون, قورئان ئەڵێ (الأعْرَابُ أشَدُّ كفرًا وَنفَاقا) زۆریەی عەرەب ناموسڵمان بوون (الأعْرَابُ أشَدُّ كفرًا وَنفَاقا) بەزۆربەی عەرەب ئەڵێ, ئەسڵەن کە لەکاتی ئەو ئایەتەدا کورد ناوی ئیسلامی هەر نەبیستبوو.

**خوشكو برایان..**

پێغەمبەری عەرەبو موسڵمانانی نەتوانیوە هەموو عەرەب کە میللەتی خۆی بون خۆی بکاتە موسڵمان, ئیتر چۆن ئەتوانی لەدەروەی نەتەوەکەی خۆی, نەتەوە کانی تربکا بەموسڵمان؛ خۆهەندێ شت هەیە مەنتقە عەقڵ نایبڕێ, ناکرێ منداڵ و گەنجی کوردی پێ چەواشە بکەین, مێژوو ئاوەژوو بنوسرێ. حەقیقەتی کورد ئەوەیە, تاریخی حەقیقەتی فارس ئەوەیە, تاریخ حەقیقی تورك ئەوەیە, ئێمە ئەقوام بووین مقاوەتمان کردووە بەفتوحاتو ئەنفال ئێمە کراوین بە موسڵمان؛ ئێستە ئیسلامین, ناتوانم بڵێم نەو، بەلام بۆ ئاگاداری هەموو ئەوانەی لەدۆڵو شیوەکانی کوردستان پێی دەڵێن کافرو هەموو ئەوانەی کەپێی دەڵێن ئەسحابەو پەرۆیەکی سەوزی لەسەر دانراوە, خەڵك ئەچێ زیارەتی ئەکا

كافره‌كان كورده‌كه‌یه، ئه‌سحابه‌كه‌ش ئه‌وانه‌یه كه‌ كوردستانیان داگیر كردووه. من له‌تۆ ئه‌پرسم كاك ئیسماعیل له‌ویژدانی هه‌مووتان ئه‌پرسم ١٤٢٢ سال له‌مه‌وبه‌ر ته‌له‌فیزیۆن نه‌بووه، رۆژنامه‌ نه‌بووه، فاكس نه‌بووه، بروسكه‌ نه‌بووه، ئیزگه‌ نه‌بووه، كادر نه‌بووه، حیزب نه‌بووه، له‌شكرێك هاتووه‌ به‌هه‌زار به‌ دوو هه‌زار سواره‌ و پیاده‌وه‌ هاتۆته‌ سه‌ر كوردستان‌و وتویه‌تی ئه‌بێت ئێوه‌ هه‌موو ببن به‌موسلمان، من نه‌م بیستووه‌ موسلمان چیه، بێگومان ناكرێ باوه‌ڕی پێبكه‌م و ده‌لێم بگه‌رێره‌وه بۆ دواوه (١٤٢٢) سالْ له‌مه‌وبه‌ر من له‌دۆلی شه‌هیداز دانیشتووم، له‌ قه‌ندیل دانیشتووم، له‌دێهاته‌كانی سلێمانی دانیشتووم، له‌شكرێك هاتووه‌ته‌ سه‌رم، نه‌فاكسم بۆكراوه، نه‌كه‌س ئاگاداری كردوم، نه‌ ئاگام له‌ هیچه، له‌شكرێك هاتووه‌ته‌ سه‌رم ده‌یسه‌پێنێته‌ ئه‌بێ ببیت به‌موسلمان، نه‌مبیستووه‌ پێغه‌مبه‌ر نه‌م بیستووه‌ قورئان، خاكم هه‌یه، ئه‌رزم هه‌یه، ناموسم هه‌یه، شمشێری هێناوه‌ته‌ سه‌ر ملم یان موسلمان به‌ یان ئه‌تكوژم، دیاره‌ مقاوه‌مه‌ت ئه‌كه‌م، ته‌سلیم نابم، هه‌موو میلله‌تێك له‌دنیا وابووه، هیچ میلله‌تێك له‌دنیا نییه‌ مقاوه‌مه‌تی نه‌كردبێت، هه‌تا تێگه‌یشتووه‌ ئیسلام چییه، ئه‌مه‌ حه‌قیقه‌ته؛ ئێسته‌ سعودیه‌ دێته‌ سه‌رمان مه‌لیك فه‌هد به‌هه‌موو توانای سعودیه‌وه‌ دێنه‌ سه‌رماز بێگومان مقاوه‌مه‌ت ئه‌كه‌ین؛ هه‌زار جار بلێ من له‌سه‌ر قه‌بری پێغه‌مبه‌روه‌ هاتوم ئه‌مه‌وێت ئێوه‌ چاك بكه‌م، هه‌ر مقاوه‌مه‌ت ئه‌كه‌م، چۆن خاكی خۆمی ئه‌ده‌می؟ له‌به‌ر ئه‌وه‌ هه‌له‌یه‌كی گه‌وره‌یه‌ وابزانی كورد به‌گول‌و گولزاره‌وه‌ چووه‌ به‌ره‌وپیری ئیسلام قه‌ت شتی وانه‌بووه، هه‌رگیز شتی وانه‌بووه‌ ئێسته‌ش كاكه‌یی و یه‌زیدی هه‌روا مه‌سیحیه‌كانی كوردستان و ناوچه‌كه، ئێسته‌ش ئه‌وانه‌ نه‌بوون به‌ئیسلام، پاشماوه‌ی ئه‌وانه‌ن كه‌نه‌بونه‌ به‌موسلمان وائه‌زانی ئه‌وانه‌ له‌خۆیانه‌وه‌ دروست؟ بوون له‌دوای ئیسلام دروست بوون؟ ئه‌مانه‌ ئه‌وانه‌ن كه‌مقاوه‌مه‌تیان كردو خۆیان پاراست، هه‌موو كورد وه‌كو ئه‌وانه‌ خۆیان پاراست، به‌لام باقی كورده‌كان بوون به‌ئیسلام ئه‌وانه‌ نه‌بوون به‌ئیسلام. كوردیش ته‌سلیم بوو به‌ ئیسلام وه‌كو ئایین، به‌لام خاك و خه‌لك و زمان و داب و نه‌ریتی خۆی هه‌تاڕاده‌یه‌كی باش پاراست.

زۆر سوپاس.

هه‌ربه‌رێزێكی تر موداخه‌له‌ی هه‌یه.

پرسیار: پێشەکی بەخێر هاتنی کاك مەلا بەختیارو سەرجەم میوانە بەرێزەکان دەکەین.

پرسیاری من بۆ کاك مەلا بەختیار تەبیعی لەسەرەتاوە باسی وەزعی ١١ ــ ٩و ئەمانەی کرد, بلێین ئەوەی کەپەیوەندی هەبێ بەئوسامە بن لادنەوە, بەس ئێستا لەهیچ کەنالێکی راگەیاندنەوە غەیری ئەمریکاو بریتانیا نەیان وتووە کە ئوسامە راستەخۆ پەیوەندی بەوەوە هەیە, ئەمە یەکەم خاڵ، خاڵی دووەمیان بلێین باست کرد ئەوەی کەبلێین خەڵکی ئیسلام لەخاریج یا لەملاو ئەولا هەیە, بلێین مەسئولین هەرکەسێ کە ئەچێتە ئەوێ, دیارە خۆتان ئەزانن چاکی تیایەو خراپی تیایە, لەبەر ئەوە ناتوانین بەهەموو کەسێکی بلێین خراپ؛ چونکە ناتوانین بەهەموو کەسێکی ئێرە بلێین چاك, خاڵێکی تریان ئەوەیە باسی عەقیدەت کرد باسی گشتی ئیسلام بۆ ئێرە بلێین بەشمشێر هاتنی راستە بەشمشێر هاتووە, بەس بۆ ملی خەڵکی نەبوو بەڵکو بۆ ملی دەسەڵاتدارەکانی بووە, لەوکاتەی کە رێیان نەداوە ئەودینە تازەیە بچێتە ناو خەڵکەوە, لەبەرئەوەی قورئان ئەچێتە ناو مێشکەوە بۆ نموونە کاتێك کە دینێك بڵاو ئەکرێتەوە ئەگەر قورئان لەخواوە هاتووە, ئەمە دەست کردی خەڵك نییە, خاڵێکی تر ئەوە ئێمە ناتونین دەست نیشانی بکەین کێ کافرەو کێ موسڵمان, کێ ئەوەیە لەبەر ئەوە قورئانمان هەیە, حەدیسمان هەیە, هەردوکیشی پارێزراوە, خوای گەورە بەڵێنی داوە کە تاکۆتایی دنیا بیپارێزێ, لەبەرئەوە نیشانەکانی موسڵمانو نیشانەکانی کافریش لەقورئاندا دیاری کراوە, نیشانەکانی دوورویش دیاریکراوە لەبەرئەوە هەموو کەسێکی موسڵمان دەتوانێت دەستنیشانی بکات کێ کافرەو کێ موسڵمانە سوپاس.

وەڵام: کاك سەلام من پێم وایە ئوسامە بن لادن هەتا شریتەکەی بڵاوکرایەوە گومان هەبوو کە ئەمریکا ئەمەی دروستکردبێ، بەڵام دوای ئەوەی کەشریتەکەی بڵاوکرایەوە, جگە لەهەندێ مجامیعی بچوکی سەلەفی نەبێ کەس گومانی نەماوە کە ئوسامە بن لادنە ,خۆم گوێم لەعولەمای ئیسلامی گەورە گەورە بووە هاتونەتە سەر تەلەفزیۆن وتویانە کەگومان نیە ئوسامە ئەم کارەی کردوە, هەموو دەوڵەتە عەرەبیەکان, هەموو دەوڵەتە موسڵمانیەکان دانیان پیاناوە کەئەو کردویەتی, هیچ کەسێك ئێستە بەرگری لێناکات, ئەمە یەك؛ پێشتر راستە

تـەمو مـژ هـەبوو, گومـان هـەبوو, لەسـەر ئـەوە، بـەلآم تائێـستە دوو شـریتی بلآوکردووەتەوە خۆی دەڵێ من لێیم داوە.

ئـەڵێ مـن بـووم بەئاشـکرا دەڵـێ مـن بـووم هـیچ وەلآمـی نەهێـشتووەتەوە, وەدەڵێ من باوەڕم نەکرد بەم نەوعە زەرەر بگەیەنێو بـەم نەوعـە تەئـسیر بکـا, کارەکە جێگەی گومان نەماوە.

پرسیار: کاك بەختیار راست دەکەی بەس ئـەوە هەنـدێك کـەناڵ وائـەڵێ هـیچ کەناڵێ بەعەلەنیو ئاشکرا تائێستا روون نەبووەتەوە, ئێستە بـۆ نموونـە قـانونو یاسا واهەیە هەتا وەکو لەسەری ساغ نەبێتەوە تاوەنبار نییە؟

وەلآم: دەزانی لە یاسایە ئەدللەی دامغ هەیە. ئینسان کەخۆی وتی منم ئـەوە ئەدلەی دامغە. ئیتر ئەو لاولای تیا نامێنێ جارێ نەگیراوە هەتا قـانونی بەسـەردا تەتبیق بکەن, خۆی لەشریتدا وای وتووە.

(قەینا لەچ کەناڵێکدا بلآوکرایەوە) کەناڵی جـەزەیرە, شکاتیـشی لەسـەرە بـۆ مـەعلوماتت لەسـەرئەوەی دیفـاعی لـە ئەفغانـستان دەکـرد, ئوسـامە رێـك وتـی ئێمەین و, ئێمە تەسورمان نەکرد زیانەکە بەم نەوعە بێت و, بەم نەوعـە کاریگـەر بێـتو, ئـەوە خـارج تەسـەوری ئێمـەبوو, پەیوەنـدی ئوسـامە بـن لادن بـە ئیسرائیلەوە پەیوەندی بەئێمەوە نیە, ئەو برادەرە ئەڵێ ئوسامە بـن لادنو ئـەو روداوە پەیوەندیبەئێمـەوە نیـە, زۆر پەیوەنـدی بەئێمـەوە هەیـە, جـارێ هـەر ئەوەنـدە پەیوەنـدی بـە ئێمـەوە هەیـە کـە جنـد الاسـلام لـەخێڵی حەمـەوە ئـەم کارەسـاتە گەورەیـەیان نایـەوە, ئـەوە پەیوەندییـەکی راسـتەو خـۆ کـە (٤٣) پێشمەرگەمان سـەریان بـڕا (٤٣) پێـشمەرگە سـەریان بـبڕێ ئایـە پەیوەنـدی بەمنەوە نیە (٤٣) پێشمەرگەی تێکۆشەر سەربڕن بەناوی ئەو ئـەفکارەوە, ئایـە پەیوەندی بەئێمەوە نییە؟ مـرۆڤ حەقیقـەت بڵـێ جـوانترە لـەوەی کەبیـەوێ بـۆ باوەڕی دینیو مەزهەبی خۆی خەڵك چەواشە بکـات, حەقیقـەت ئەوەیـە ئوسـامە بن لادن پەیامێکی پێیە, پەیامەکەی ئەوەیە هەرچی وڵاتو دەوڵەتو دەسـەلآتو بیروبـاوەڕی دیموکراسـی هەیـە لـەدنیایا, بـە کفـری ئـەزانێو لـەناوی ئـەبا, بەئێمەشەوە, ئیتر چۆن پەیوەندی بەئێمەوە نیە, ئەوە کەلـە کوردسـتاندا رویـدا یەکێکە لەنموونە بچوکەکانی, بۆیە روداوەکە پەیوەندی پێمانەوە هەیە, ئوسامە

بن لادن بەقەناعەتی تۆ پەیوەندی بەئێمەوە نییە، بەڵام شەڕێك لەدنیا بەرپابوو رۆژهەلاتی ناوەراست هەموو ئەهەژێنێ، ئێمەش لەرۆژهەلاتی ناوەراستدا دەژین، چۆن پەیوەندی بەئێمەوە نییە؟ ئەمە یەك، ئیسلامو لەخارج ژیان، چاكو خراپ، خەلك ئیسلامیەو لەخارج ئەژی چاكی تیایەو خراپی تیایە، پێش هەمووشتێك چاك وخراپی كەچوو بۆ ئەوروپا بۆیە چووەتە ئەورپا لەئەوروپا ئازادی هەیە، لەولاتەكەی خۆیدا ئازادی نییە، ئەگینا بۆ ئەچێ بۆ ئەروپا، فەرمووبزانم ئەگەر چاكی بۆ ئەچی بۆئەورپا خراپیشی بۆ ئەچی بۆ ئەوروپا؟ بەچاكیو خراپی ئەو ئەوروپای هەلبژاردووە، چونكە ئازادی لەولاتی خۆیدا نییە، ئەمەیەك، دووەم لەئەوروپا ژیان بەهیچ شێوەیك لەگەلّ ئەو عەقیدەیە ناگونجێت كەئەوان ئیدعای دەكەن، بەهیچ شێوەیەك لەگەلّ عەقیدەكەی ناگونجێ، كابرایەكی سەلەفی كەپێی وایە ئافرەت چاویشی دەركەوێت گوناهە، لەوێ هەموو كەسێك كەمترین شوێنی داپۆشراوە، عەقیدەكەی قبولّی ناكا لەوێ بژی بۆ ئەچی بۆ ئەوێ. ئەلێ ئیسلام راستەبەشمشێر سەپێنراوە، بەلام شمشێر دژی دەسەلات نەك دژی خەلك؛ پرسیارێكی تری ئەم برادەرە ئەلێ ئیسلام بەشمشێر سەركەوتووە بەلام شمشێر دژی دسەلات بەكارهاتووە نەك دژی خەلك، وەقورئان ئەچێتە مێشكی خەلك، من پێم وایە ئەم قسەیەش مناقەشەیەكی زۆر هەلئەگرێ، داخەكەم كاتەكەمان زۆر كەمە. هەموو ئەو لەشكرانەو سوپایانەی ئیسلام هاتوون شمشێریان كێشاوە هەركەسێك مقاوەمەتی كردبن شمشێریان بەكارهێناوە بەرامبەری، میللەتی كوردیش ئەوكاتە عەقیدەیەكی هەبووە، دیفاعی لەعەقیدەی خۆی كردووە، دوای دەسەلاتی ئەو كاتەی خۆشی كەوتووە، واتا ئێستە دەسەلاتی سیاسی یەكێتی نیشتمانی كوردستان، میللەتەكەمان لەگەلە، هەزاران پیشمەرگەو خەلكمان لەگەلە، ئەو خەلكە چۆن قبولّ ئەكەن ئێمە بكوژن دیفاعمان لێ نەكا، فەرموو بزانم ئێستە دەبابەی حكومەتی عێراقی بێتە سەر پێشمەرگەكان و قەواعدی یەكێتی نیشتمانی كوردستان ئەگوترێ قیروسیا لەسەركردە كانمان با بیانكوژن حەقمان نییە؟ چۆن شتی وائەبێت؟ ناكرێ بلێی دەسەلاتدار ئەكوژمو خەلكەكە ناكوژم، هەمووی وەكو یەك كوژراوە، بەتایبەتی لەو سەردمە دەسەلاتی مەركەزی نەبووە، بەزۆری دەسەلاتی لامەركەزی خێلّ و هۆز و ناوچە و هەرێم هەبووە. خەلك و دەسەلاتی بچوك

بچوکی خەڵکەکە لێك جیانەدەکران. هەرلەم شارەزوورە ئاتەشگای زەردەشتیەکان هەبووە, هەزاران کەس لەناو ئاتەشگاکانی ئێرە سوتێنراوون, ئەوە بچن (تەبەری) بخوێننەوە هەرلێرە، لێرە لەم شارەزورەی خۆمان؛ کێ کافرەو کێ ئیسلامە من قسەی ئەوەم کرد کەقبوڵی ناکەم کەسێك لێرە بەمن بڵێت تۆ کافریت, هیچ لایەك و هیچ کەسێك و هیچ هێزێکی ئیسلامی بە وەکیلی خوا و خەلیفەی پێغەمبەر نازانم, لەقورئاندا نەهاتووە کە: (انا وایاکم علی هدی او فی ضلال مبین) ئێمە یان ئێوەلەسەر ڕێ ڕاست, یان گومرایی, واتا ڕێی ڕاستەکەو گومراش هەیە, گومرا تۆ بۆ محاسەبەی دەکەی, حەقت چیە؟ قورئان خۆی ئەڵێ یان ڕێ ڕاست یان گومرایی قەیناکە بەیەکەوە هەڵکەن, تۆ کێی تا محاسەبە بکەی؟ تادوێنێ هەندێك لەمانەی بونەتە دەمڕاستی ئیسلام, ئەزانین چی بون. کە پێشمەرگەبووین هەندێك لەمانە ئەیانگوت: (صدام) حفظە اللە, کەچی ئێستا محاسەبەی خەڵك ئەکەن, ئەوانەی ئێستا هەندێکیان خۆیان بەمەسئول دەزانن لە ئیسلام بەدەمانچەی ئیستخبارات خۆیان ئەپاراست, چەندجار شۆڕش ویستویەتی سزایان بدا. ئێستا هاتووە محاسەبە ئەکا ئەو ئیسلامەو عەلمانی کافر؛ یەك ڕووبار خوێنمان لەپێناوی ئەم نیشتمانە داوە, کەئازاد بێ, ئەوانیش ئازادبن, کەس بۆی‌نیە بێت محاسەبەی یەکێ بکا لەسەرئەوەی‌کافرە یا کافر نییە, بیکوژێ یان تیرۆری بکا, ئینسان ئازادە لای ئێمە, ئازادە هەموو ئەو خوشکانەی کە لێرە دانیشتوون, ئەوە وڵاتیکە بەدەستمانەوە هیچ بڕیارێکمان نیە بڵێین نابێ ئینسان ئازاد بێ, کەس بۆی نییە خەڵك ناچار بکات حیجاب ببەستێ, تۆ ئازادی حیجاب نابەستی, تۆش ئازادی حیجاب ببەستی, هیچ عیلاقەی نیە تۆئازادی (٢٤) سەعات عیبادەتی خوای خۆت ئەکەی خەڵکیش ئازادە (٢٤) سەعات عیبادەتی‌خوای خۆی ئەکا یان نایکا, بەیانیو دوبەیانی هەریەکێ بەئاگری خۆی ئەسوتێ, خۆبەئاگری تۆ ناسوتێ, ئاگری من تۆش ناسوتێنێ, ئەوە منم چ علاقەی بەتۆوەهەیە, تۆبڕۆ (٢٤)سەعات بۆ خۆت نوێژ بکە, باشە خۆتۆ لەخوا گەورەتر نیت, ئیتر بۆ قبوڵی بکەم تۆ بەم دەمانچەیە کەقەرزت کردووە بەم کلاشنکۆفەی کەئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەت , پێیداویت, ئەتەوێ محاسەبەشم کەی, ئەوە ناکرێ, ئەوە لەلای ئێمە قبوڵ نییە, ئازادی لەلای ئێمە دەستەبەرە, ئازادی بۆ ئیسلامی سیاسی,

ئازادی بۆ عیلمانی, ئازادی بۆ ژن, ئـازادی بـۆ پیـاو, ئـازادی بۆهونەرمەنـد, بچۆ بەرگری لە خۆت بکە, چەند ڕۆژنامەو گۆڤـاری ئیسلامی هەیـە لـە وڵاتـی ئێمـەدا ئەوپەڕی ئازادە, هەموو هەفتەیەك من لە سەر مێزەکەم چوار ڕۆژنامـەو گۆڤـاری ئیسلامی ئەخوێنمەوە, زۆریشم پێخۆشـە هاوسـەنگی ژیـان لـە دەربڕینـی هـەموو بیرو باوەڕەکاندایـە, نـەك مـن بیروبـاوەڕی خـۆم پـسەپێنم بەسـەر تۆیـا, ئێمـە باوەڕمان بەوە نیە, خۆمـان بـسەپێنین, بـەڵام ڕێگـەش بـەوە نـادەین کـە کـەس بسەپێنرێ, ئەمەیە سیاسـەتی ئێمـە حەزنەکـەم زۆر ڕوون بێـت لـەلاتان, ئـەڵێین قبوڵمـان نیـیە کـە کەسـێك هەڵـسێت, خوێنـدکارێك, مامۆسـتایەك, جوتیارێـك, کرێکارێك بەناوی کافرەوەقەراری بۆ بدات, فتوای بۆ بدات و تیرۆری بکات, ئـاخر خۆ خۆت دەزانی لەم سلێمانیە چەند کـەس بـیروڕای لەسـەر ئەوەیـە کـە گوایـە سلێمانی کافرە, ئەمە مـەقبولْ نیـیە, بـچن ڕۆژی جومعـە یـان ڕۆژانـی تـر بـچنە مزگەوتەکان خەڵکی ئەم شارە بکەنە کافر. لـە خۆتـان ئەپرسـم ئێـستا مزگـەوت زۆرترە یـان زەمـانی حکومـەت, لەهـەموو سـلێمانی لـە تـاریخی خۆیـا مزگـەوتی شیعەی بە خۆیەوە نەبینیوە, ئـەوە ئێمـە مزگـەوتی شـیعەمان دروسـت کـردوە, ئەوە کەنیسە, ئەوە مزگەوتەکان, ئـەوە شـارەکان, ئـەوە دێهاتـەکان, کـوا ئێمـە ئازادی نوێژ و ڕۆژو قەدەغە کردوە, ئەسڵەن ئەوەی زەوت نەکرابێ ئـازادی ئاینـە لەلای ئێمە, ئازادی خۆمانمان زەوت کردوە, ئێستا یەکێتی نیشتمانی کوردسـتان بەرانبەرهێزە ئیسلامیەکان ئەندامان و کادرەکانمان بە تەواوی ئازاد نییە, نیوەی ئازادیمان هەیـە بـۆ خۆمـان, خۆمـان لـە کۆبوونەوەکانـدا دائەنیشین سـنووری ئازادیمان بۆ خۆمـان دانـاوە, کـە چـۆن قـسە بکـەین لەسـەر ئیـسلامی سیاسـی, خۆمان ئـازادنین, ئێـوە هـەموو تـان ئـازادن, کـەس بەقـەد ئێـوە ئـازاد نییـە لـە کوردستاندا, وەکەسیش بەقەد ئێوە لـە تـاریخی ئیـسلام ئیـستفادەی نـەکردوە, زۆریش ئاساییە بە لامانەوە, ڕوونە لەلاتان لەلای هـەموو هێـزە سیاسـیەکان لـەو شوێنەی دە سەڵاتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەبێ, پێمان وانیە پەسـەندی بکـەین یـەکێ ئـازادی لێ زەوت بکـرێ ئەگـەر ئازادیبکـەی ئـەو ئینـسانە بـە پێچەوانەی بیرو باوەڕی ئێمەش بێت, هەرنـەبێ ئـازاد بێـت, ئەمەیـە فەلـسەفەی ئێمەوهیچی تر سوپاس.

پرسیار:لەکاتی گۆرینی رژێمی عێراق گەر ئەمریکا حەمید کارزایەکی نامۆ بەعێراق وکوردستانیان هێنایە سەر حوکم دژی کورد جولایەوە, ئەو دەمە هەڵوێستی کورد وINC چی دەبێت؟

وەڵام: کورد, راهاتوین بەرەنگاری, هەر بەرەنگاری ئەکەین, هەر حکومەتێك خراپتر بێت لەم حکومەتە, بەرەنگاری ئەکەین, باشتر بێ لەم حکومەتە باش ئەبین لەگەڵیا, شەرو شۆرِی بەرانبەر بەهیچ حکومەتێ قبوڵ ناکەین, تازە بەرەنگاریمان لەپێناوی مافەکانمان بە شیرەوە خواردوە, تازە سەرمان پێ شۆرِ ناکرێ بەناوی کارزایەکی خراپتر یان لە سەدام خراپتر, ئەوە لای ئێمە ناخوا,هەموشیان کوردیان تاقیکردۆتەوە.

*گەر عێراق وەك ئەفغانستان لێ بدرێت کابرایەکی مەتعەم چی دەسەڵات دەگرێتە, دەست یاخود کەسێکی سیاسی چالاك دەسەڵات دەگرێتە دەست ,یان بەهەمان شێوەی ئەفغانستان؟

– من تەسەورم وایە وڵاتی عێراق وڵاتێکی زیندووە,وڵاتی ئەفغانستان نییە, ئەفغانستان وڵاتێکی دواکەوتووە, لەعێراق قابلیاتی زۆر کەمترە, لە ئەفغانستان ئابووری لاوازترە, لە ئەفغانستان مەسائلی‌کۆنە پەرستی چۆتە ناخو مۆخی خەلکەکە, وڵاتی عێراق وڵاتێکی زیندوە, دەیان هەزار کەفائەت لەعێراقدا هەیە, لەبەر ئەوە من دڵنیام هەر حکومەتێك لە دوای سەدام دایمەزرێ کەفائەت زۆر کۆ ئەبێتەوە لەناویدا و, زۆریش باشتر دەبێت لە ئەفغانستان لەرِوی کەفائەتەوە, لە رووی سیاسیەوە, ئەوە مەسەلەیەکی ترە.

پرسیار: ئایە وەك ئەزانن گۆرانکاری لەسەر سیستەمی عێراق دەکرێت, ئایا بەرنامەی حیزبە کوردیەکان چی دەبێت؟

وەڵام: باسمان کرد؛ ئەبێت هەم لە مەرکەزا حوکمان هەبێت و, هەم لە فیدرال نایەینە خوارەوە, فیدرال ئەبێ بە دەستور, بە یاسا لە وڵاتی عێراقدا بچەسپێ, ئەمە سیاسەتی مەرکەزی ئێمەیە ئێستا.

دوا پرسیار:دەنگو باس هەیە کە دوای رِوخاندنی رژێمی عێراق سەرکردەی عێراق مەسعود بەرزانیە دەبێ باسی ئیختیار کردنی کرابێت.

وەڵام: شتی وا نییە. ئەگەر راستیش بێ, رازین.

# سەردەمو تیرۆرو
# چارەنوسی کوردستان (+)

## پێشکەشکردن

ئازیزان هاتنی کاك (مەلابەختیار) ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆئەوروپامان، بەهەل زانی، کە میوانداری بکەینو کۆڕێکمان بۆبگرێت بەناوی (سەردەمو تیرۆرو چارەنووسی کوردستان).

خوشكوبرایانی خۆشەویست پێم خۆشە ئاماژە بەدوو شت بکەم بۆ گێڕانی ئەم کۆڕە؛ یەکەمیان؛ هەموو کەسێك ئازادە هەر بیروڕایەك، پرسیارێك، شتێك، بۆچونێكو هەر موداخەلەیەکی هەبێت بەوپەڕی ئازادی بیروڕاکانی خۆی دەربڕێت. دووەم؛ هیوادارمو تکام وایە ئەم دەربڕینی بیروڕایە لەچوارچێوەی رسومی کۆڕو سیمنار دەرنەچێت، هیوادارین موداخەلەو پرسیارەکان لەبەرژەوەندی بالآی گەلی کوردستان بێت، نەك شتی لاوەکی، زۆر زۆر سوپاستان دەکەین. فەرموو کاك (مەلابەختیار)؛

پێشەکی زۆر سوپاس بۆئەوەی ئەرکتان کێشاوە لەشوێنی جیاوازەوە هاتوون، ئەم ئێوارەکۆڕە بەیەکەوە مشتومالێکی هەلومەرجی ئێستای کوردستانو ئەرکی سەرشانمان بکەین، هیوادارم بتوانم ئەوەندەی کاتمان هەیە، تیشك بخەمەسەر هەندێ مەسەلەی گرنگ، کە چارەنووسی گەلەکەمانو ئەتوانم بڵێم کە چارەنووسی نەتەوەکەشمانی پێوەبەندە، دیارە یەکەیەکە بەئێوەی ئازیزیش کە لێرە دانیشتوون، لەناو ئەو چارەنووسەدا خۆتان ئەبینەوەو لاتان مەبەستە ئەو چارەنووسە بگات بەئاییندیەکی رۆشنتر لەوەی کە ئێستا تیایا

---

+ کۆڕێك لەشاری هالیبیرنی ئەلمانیا، ٢٠٠٣.

ئـەژین، ئومێـدەوارم کۆڕەکـەتان بـەدڵ بێـتو بتـوانم روونبیکەمـەوە کـە بـەچ قۆناغێکدا تێئەپەڕینو ئەرکمانە لەم قۆناغـە چـی بکـەین، بۆئـەوەی سـەرکەوتوو قۆناغەکە تەواوبکەین، سوپاس بۆئامادەبونتان، سوپاس بۆ کۆمیتەی رێکخستنی ئـەڵمانیاو ئـەو ئازیزانـەی مانـدووبوون بۆسـازدانی ئـەو کـۆڕە، هیـوادارم بتـوانم پاداشـتیان بدەینـەوە بەبۆچـونێك کـە بەلێکدانەوەیـەك بیـسەلمێنێت کـە کێشەکانمان کامانەنو ئەرکەکانمان چین.

پـێش هـەموو شـتێکیش مـن لـە وڵاتـەوە هـاتووم، نـەهاووم لێـرە نـە قـسە لەناکۆکیەکان بکەم، نە برین بکولێنمەوە، ئەوە ئیشی من نیە، پێشم وایـە ئـەوە ئیشی هیچ مەسئولێك نیە کە لە وڵات دێن قەتماغەی برین هەڵبدەنەوە. کێشەمان لەوڵاتدا هەیە، بەڵێ هەمانـە، بۆخۆمـانی بـەجێبهێڵن، ئێـوە رەوەنـدی تاراوگـەی کـورد، ئێـوە لەگـەڵ خۆتانـا کـەم کێـشە بـنو تـا بتـوانین یارمـەتیتان بـدەین، کێشەکانتان کـەم بێـت باشـترە لـەوەی برینـەکانتان بکولێنینـەوە، هیوایـدارین ئێمەش لەناو وڵاتدا بتوانین کێشەکانمان چارەسەر بکـەین، بـەڵام کـەمتری نـەقڵ بکەین بۆ تاراوگە.

قـسەکانم لێکدانـەوەی گـشتییە، هەلومـەرجی سیاسـیەو پێـشم خۆشـە پرسیارەکانتان لەچوارچێوەی باسەکە ئەوپەڕی ئازادبێت، بەڵام دیالۆگێك بکرێ کە بۆ هەستی خۆتان جوان بێت، بۆ پەیوەندیەکانتانو ژیانی خۆتـان بـاش بـێ. بەدڵ هیـوادارم بابەتەکـە زانستیو تێروتەسـەل بـێو رەزامەنـد لەکۆڕەکـە بچنە دەرەوە.

(سـەردەمو تـیرۆرو چارەنووسـی کوردسـتان) سـێ مەسـەلەن بەیەکـەوە بەستراونەتە چارەنووسی کوردستان، گرنگـە ئینـسان هـەم لـە مەسـەلەکە، هـەم لەمەترسـیو خەتـەرناکی تـیرۆر تێبگـاتو بـشزانێت ئێـستا گەلەکـەمانو نیـشتمانەکەمان بـەچ قۆناغێکـدا تێئەپـەڕێتو چیمان کـردووە لەئـەزموونی کوردسـتانی عێـراقو دەبێـت چـی تـر بکـەین بۆئـەوەی بەتـەواوەتی، نەتـەوەو گەلەکـەمان لەخـەم بڕەخـسێت؛ بۆئـەوەی لەروانگەیـەکی گـشتیەوە بچمە نـاو باسەکە، شەنوکەوکردنێکی سەردەم زۆر گرنگـە، دوایئـەوە بێمـە سـەر تـیرۆرو رەگـی تـیرۆرو مەترسـی تـیرۆر، کـارە ناجوامێرەکـانی تیرۆرسـتەکانو ئەشیانبەسـتمەوە بەکوردسـتانو پارتـە سیاسـیەکانو قۆنـاغی سیاسـی ئێـستا سەبارەت بەگەلەکەمان.

## لە چ سەردەمێکداین؟

لەسەردەمی جیهانگیریداین, پـێم وانیـە ئێـوە کـە لـەرۆژئاوان, لەرۆژئاواشدا لەیـەکێك لەولاتـە هەرەگـەورەو گرنگـەکان کـە ئەڵمانیایـە, ئـەژین, پێویـستتان بەوەهەبێت زۆر رونیبکەینەوە, جیهانگیری یانی چی, بەلام لەگەڵ ئەوەشدا مادام لـەکۆڕداینو بۆئـەوەی بابەتەکـە زانـستیبێت, پێویـستە کلاورۆژنەیـەك لەسـەر جیهانگیری بکەینەوە هەتا باشتر بابەتەکە رونبێتەوە.

جیهـانگیری سیـستەمێکی نـوێی جیهانیـە, سیـستەمێکە جیـاواز لەهـەموو سیستەمەکانی تر, جیاواز لەهەموو قۆناغەکانی سیاسـی, ئـابوری, کۆمەلایـەتیو کولتوری رابردووی بەشەریەت؛ پێش جەنگی یەکەم, دوای جەنگی یەکەم, تێـوان جەنگی یەکـەمو جـەنگی دووەم, دوای جـەنگی دووەمو جـەنگی ساردیش؛ ئـەم هەموو سەردەمە هەبووە, کە سەردەمی جیاوازن, سیاسەتی جیاوازو فەلسەفەی جیاوازیان هەبووە؛ بەرژەوەندی جیاواز, سیاسەتی نێودەولـەتی جیـاواز, یاسـای جیاواز, ئینجا چۆنێتی کۆنترۆڵکردنی جیهانو دابینکردنی بەرژەوەندیـە بالاکـانی ولاتە گەورەکانی جیهان, هەروا هەژمونی ولاتە گەورەکانی جیهان, هەموو ئەمانە لەسـەردەمەکانی رابـردوودا مـۆرکی خۆیـان هـەبووە, قۆنـاغو پرۆسـەیەکە هەمووژیانو بەشەریەتو میللەتانی تێکەوتووە, ئیتر پێت باش بووبێـت چـووبێتە نـاوی, پێـت بـاش نـەبووبێت رایانکێـشابێتە نـاوی, ئـەوە ئەحکامـەکانی ولاتـان, ئەحکامــەکانی سیاســەتەکانی نێونەتــەوەیی بــووەو لــەناویا ژیــاوین, میللــەتی واهەبووە لەیەکێك لەو سەردەمانە سەرکەوتوو بووە لـەژیانی سیاسـیدا, میللـەتی واش هەبووە نـەخێر, وەکـو کـوردە بەدبەختەکـەی خۆمـان, کـە خۆتـان ئـەزانن تائێستا هەر عەودالی ئەوەین بتوانین سەرکەوتنی باش بەدەست بهێنین. کەچـی فیدرالیەتیشمان پیرەوا نابینرێ.

جــەنگی یەکــەم, جــەنگی ســەرکەوتنی ولاتــە زلهێزەکـانی دنیـاو دارشـتنی بناغەیـەك بـۆ سیاسـەتی کۆلۆنیالیـستیو بـۆ دابـەشوداگیرکردنی دنیـا بـووە. خۆشتان ئەزانن لەوێدا کـورد تیاچـوو, هەرچـی بـەلێنو پـەیمانێك بەگەلەکـەمان درابوو لەپەیمانی سیڤەرەوە تا ئەگاتە (عصبة الأمم)و ئینجا تۆزێکیش لەپەیمانی لۆزانیش, گفتمـان پێدرابوو, کێشمەکێشی زۆر لـەنێوان میللـەتانی وەکـو ئێمـەو دەولەتانداو بیروبۆچوونی جیاوازیش لـەنێوان زلهێزەکـانی دنیـادا هـەبوو, لەگـەڵ ئەوەشدا هەندێك ولات کە نەیانئەهێنا بکرێن بەدەولەت, کران بەدەولەت, هەندێك

نەتەوە ئەبوو بكرێن بەدەوڵەت نەكران بەدەوڵەت, یەكێك لەوانە نەتەوەی ئێمەی كوردە, لەراستیدا ئەشكرێت بڵێین: هەم دەوڵەتانی گەورە هەڵەی گەورەیان كرد, هەم سەركردایەتی ئەوسای سیاسی كوردستانیش لەزەمانو زەمینەی خۆیا وەكو پێویست دەركی قووڵی سیاسەتی نێونەتەوەییان نەكردبوو؛ نەیانتوانیبوو یاری بەیاریە سیاسیەكانی ئەوكاتە بكەنو كایەكانیان, كایە سیاسیەكانیان, كایە نیشتمانیەكانیان لەگەڵ تەوژمی زاڵو باوی دنیادا باش بخەنەكار. نموونە هەرە بچووكەكەیان هەڵەی (شێخ مەحمود) لەوەوە دەستیپێكرد كە ئینگلیز جەنگی یەكەمی جیهانی بردۆتەوە, پێشەنگی دەوڵەتانی سەرمایەداری جیهان بوو, زۆربەی هەرەزۆری وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو كەنداوی كەوتەژێردەست, چارەنووسی رۆژهەڵاتی دیاریدەكرد, كەچی شێخ مەحمود لەباتی ئەوەی ستراتیژی ئەو قۆناغە لەگەڵ سیاسەتی زاڵی دنیادا بگونجێنێت, وەكو چۆن هەندێك لەوڵاتانی كەنداو و دەوروبەرمان ئەو سیاسەتەیان گرتەبەرو هەتاڕادەیەكی زۆر سەریش كەوتن, بەپێچەوانەوە شێخ لەبەرامبەر بریتانیا چوو لەگەڵ ئۆزدمیر رێك كەوت, ئۆزدەمیرێك كە بەخۆیو دوو دەستەی سەربازی تورك هاتبوون لەرەواندوز دانیشتبوون, هیچ دەسەڵاتێكی نەبوو, نەشیئەتوانی قاچی ئێسترێك بكاتەوە, كەچی شێخی نەمر خۆی بەوانەوە بەستەوەو مانۆڕی لەگەڵ ئەم دەوڵەتانە كرد, هەتا ئینگلیز پێیزانی, ئیتر وردەوردە ئەو سوكە بەڵێنەی كە لەسلێمانیش پێیدرابوو, لێیسەندرایەوەو دووچاری شكستی گەورە هاتین, بێگومان ئەمە بەو مانایە نیە پاساو بۆ سیاسەتی ئینگلیز ئەهێنینەوە, یاخود ئینگلیز چاكی كردووە وا شێخ مەحمودی سەركوت كردوە, یا شێخ مەحمود خەباتی نەكردووە, نەخێر شێخ محمود سەردارێكە جێگەی رێزێكی گەورەیەو یەكێكە لەو سەركردانەی كە چەندین جار راپەڕیوە, گلاوە, هەڵساوەتەوە, كۆڵنەداوەو لەسەر حسابی نەتەوەكەی, هیچ جۆرە پەیمانێكو رێكەوتنێكی داگیركەرانی حەڵاڵ نەكرد, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا, كە ئێستا مێژوو هەڵئەسەنگێنین, وەكو چۆن ئێستا لای خۆمان هەڵە هەیە, لەرابردووش هەڵە هەبووە و لەئایندەشدا هەڵە ئەبێت.

بەبڕوای من سەردەمی جەنگی یەكەمی جیهان گەر خوێندنەوەیەكی باشمان بۆی هەبێت, بۆمان دەردەكەوێت كە كورد هەڵەمان كردووە, بەڵكو لەرابردووشدا هەڵەمان كردووە, پیش شێخ مەحمود, لەسەردەمی میری بۆتان, لەسەردەمی شێخ عەبدوڵڵای نەهری, لەسەردەمی شێخ سەعیدی پیران, هەروەها

لەســەردەمی کۆمــاری مەهابادیــشدا هەڵــەکراوەو لەشۆڕشــی ئــەیلوداو لــەم شۆڕشەشدا هەڵەکراوە, بەڵام جیاوازی هەڵەکانی ئێستا لەگەڵ هەڵەکانی ئەوسا, ئەوەیە هەڵەی ئێستا زاڵ نەبووە بەسەر چارەنوسمانا, بەڵام جاران هەڵـەکراوە, هەڵەکە زاڵبووە بەسەریانا و لەئەنجامدا هەلومەرجێکی هەڵکەوتوو هەڵکەوتبێ, وەکو پێویست نەقۆزراوەتەوەو لەدەستدراوە.

کۆماری مەهابادیش بەهەمان شێوە, هەلومـەرجی جـەنگی دووەمـی جیهـان, هەلومـەرجێکی رەخـساو بـوو لەسـاڵی (١٩٣٨-١٩٣٩) جـەنگ بـەرپابوو, هـەتا (١٩٤٦) لەو هـەموو سـاڵانە قـەڵەمڕەوی شاهەنـشای ئێـران بـچوکترین دەسـەڵاتی لەسەر کوردستان نەمابوو, بەشی‌زۆری شارەکانی کوردسـتان کـەوتبووە دەسـت مۆزەکـانی کـورد, چـەکدارە عەشـایرەکانی کـورد, رونـاکبیران یـاخود پیـاوە هەڵکەوتووەکانی ئەوکاتەی کوردستان بەپێشەوا قازیشەوە زوو هیمەتیان نەکرد, (ژ.ك)یـش خۆپـارێز بـوو, چـەند سـاڵێکی هەلەکـە لەدەسـت درا. شـەش سـاڵ لەگەرمەی جەنگی جیهانیا زۆرە لەدەست بدرێ هەتا لەئاخرین ساڵی جەنگدا کـە جەنگ وەستابوو, کۆنگرەی یاڵتا مۆرکرابوو, کۆنگرەی قاهیرە کرابوو, کۆنگرەی تـارانیش بەسـترابوو, پـەیماننامـەی پـەیمانی ئەتڵەسـی مۆرکرابـوو, کۆنگرەکـانی یاڵتـاو تـاران‌و قـاهیرەو پـەیمانی ئەتڵەسـی, دەوڵەتـە گـەورەکان بـە(ئیتحیـادی سۆڤێت)یـشەوە مۆریـان کردبـوو, کـە ئـەگـەر جـەنگ بوەسـتێت, دەبێـت ئێـران جێبهێڵن‌و هەموو ئـەو وڵاتانـە بـەجێبهێڵن کـە چونەتـە ناویـان‌و یـەککرتنی ئـەو وڵاتانـە بپـارێزن, هـەموو ئەوانـە لەسیاسـەتی نێونەتـەوەیی مۆرکرابـوو, کەچـی لەکۆتایی جەنگدا, یانی جەنگ کۆتایی پێهاتبوو, ئەڵمانیاو ئیتالیا لەشکاندا بـوو, ژاپۆن لەشکاندا بوو, وردەوردە وڵاتانی هاوپـەیمان خۆیـان ئامادەئـەکرد لـەئێران بکشێنەوە, ئالەوکاتەدا ئیتیحادی سۆڤیەتی بۆئەوەی پشکێکی باشتری لەئابوری ئێران بەربکەوێ, هانی راگەیاندنی کۆماری ئازەربایجان‌و کوردستانی دا. هـەردوو کۆمارەکەش کرانە کۆماری سوور, وەکو مێژوونووسـەکان ئەینوسن, ئەوەنـدەی وێنەی ستالین لەکۆماری مـەهاباددا هەڵواسـرابوو, ئەوەنـدە وێنـەی قـازی محمـد نەئەبینرا. کۆمارەکە (١١) مانگی خایاند (٧) ساڵی جەنگ لەوەوپێش کوردسـتان دەسـەڵاتی شاهەنـشای تیانـەبوو, لەدەسـت چـوو, لـەدوای (١١) مـانگ خۆتـان دەزانـن ئیتیحـادی سـۆڤێتی بەبـەڵێنێکی قـەوام سـەڵتەنەی سـەرۆك وەزیرانـی ئەوسـای ئێـران, سـۆڤیەت بڕیـاری کـشانەوەی لەئێرانـدا. ئەمـەش گـورزێکی

گه‌وره‌بوو، ته‌نانه‌ت په‌یمان شكێنیش بوو، ئیتر كۆماری مه‌هابادو ئازه‌ربایجان نه‌یانتوانی یه‌ك سه‌عات به‌ره‌نگاری بكه‌ن، كۆماری ئازه‌ربایجانیش پێش كۆماری مه‌هاباد چۆكی‌دادا، سه‌ركرده‌كان هه‌موو رایانكردو سه‌ركرده‌كانی ئێمه رایان نه‌كردو پێشه‌وا قازی‌و هاورێكانی پیاوی نمونه‌بوون له‌قاره‌مانێتیدا، راسته نه‌یانتوانی مقاوه‌مه‌ت بكه‌ن، به‌ش به‌حالی خۆم ئه‌زانم نه‌یانئه‌توانی مقاوه‌مه‌ت بكه‌ن، به‌لام میلله‌ته‌كه‌ی خۆشیان جێنه‌هێشت‌و بوون به‌شه‌هیدی هه‌ره‌زۆری دره‌وشاوه‌ی مێژووی كوردستان، یانی هه‌لومه‌رجی كۆماری مه‌هابادیش ئه‌گه‌ر دراسه‌یه‌كی بكه‌ین، هه‌لومه‌رجێك بوو له‌راستیا ساڵه‌های باش له‌كیس چوو، رێكه‌وتننامه یا دیكۆمێنتی به‌هێز نه‌بوو له‌نێوان كۆماری كوردستان‌و ئیتیحادی سۆڤیه‌تی كه ئیتیحادی سۆڤیه‌تی ده‌ست له‌گه‌له‌كه‌مان هه‌ڵنه‌گرێ دوای جه‌نگ، هه‌روه‌كو ئه‌ڵمانیای رۆژهه‌لاتی دابڕی‌و پشتیوانی رۆژهه‌لاتی ئۆروپاشی كرد. ئه‌مه جگه‌له‌وه‌ی له‌گه‌ڵ بریتانیاو ئه‌مه‌ریكادا، ره‌نگ بوو ئه‌وكاته مناوه‌ره‌یه‌ك له‌نێوان ئه‌و ده‌وڵه‌تانه‌دا بكرێت‌و كاره‌سات نه‌قه‌ومێ.

كورتییه‌كه‌ی له‌مێژووی ئێمه‌دا هه‌ڵه‌ی زۆركراوه، به‌شۆڕشی ئه‌یلولیشه‌وه، به‌م شۆڕشه‌شه‌وه، فرسه‌تی زۆر له‌ده‌ستدراوه، به‌لام خۆشبه‌ختانه نه‌ته‌وه‌ی كورد ده‌ستی له‌به‌ره‌نگاری هه‌ڵنه‌گرتووه. ته‌نانه‌ت له‌رۆژهه‌لاتیشدا نه‌ته‌وه نییه به‌ئه‌ندازه‌ی كورد شكستیان پێهێنابێ، به‌لام هه‌ر كۆڵی‌نه‌دابێ. ئه‌م هه‌لومه‌رجه هه‌لومه‌رجێكی گۆڕدراوی جیهانه. سه‌رده‌م گۆڕاوه‌و سیاسه‌تی نێونه‌ته‌وه‌یی ئێستا له‌به‌رژه‌وه‌ندی گه‌لانی وه‌كو ئێمه‌یه. ئه‌گه‌ر باشی بخوێنینه‌وه، بێگومان سیاسه‌تی باشیش داده‌ڕێژین‌و سه‌ركه‌وتنی باشیش وه‌ده‌ست دێنین. به‌لام خراپیشی بخوێنینه‌وه، شكست دێنینه‌وه، باش خوێندنه‌وه‌ی سیاسه‌تی نێونه‌ته‌وه‌یی مه‌سه‌له‌یه‌كی زۆر گرنگه. باشترین به‌ڵگه‌ش كه سیاسه‌تی نێونه‌ته‌وه‌یی كاریگه‌ریه‌كی گه‌وره له‌سه‌ر چاره‌نووسی میلله‌تان داده‌نێ، باشترین نمونه چییه؟ ئه‌مه‌ی خواره‌وه‌یه..

## سیاسه‌تی ده‌ره‌وه‌و چاره‌نوسی ناوه‌وه

هه‌میشه له‌مێژوودا شۆڕشه‌كانی كوردستان له‌هه‌ڵچونا بوون، زوو بوون به‌خاوه‌نی ده‌یان هه‌زار پێشمه‌رگه، شارو دێهاتێكی باش رزگاركراوه، به‌لام كه ده‌وڵه‌ته گه‌وره‌كان له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی عوسمانی یه‌كیان گرتووه، له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی شاهه‌نشایی، له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی عێراقی كه یه‌كیان گرتووه، راپه‌ڕینه هه‌ڵچوه‌كانی

ئێمەیان دامرکاندۆتــەوە, هەرکە شۆڕشی ئـەیلول گەیشتە پۆپـەی پێشکەوتن‌و سـەرکەوتنی خـۆی (١٥٠) هــەزار پێـشمەرگەو بـەرگری میللـی لەگـەڵا بـووە, بەیەکـەوە شـارو دێهـات‌و ناوچـەو شـاخی زۆر گەورەشـی ئـازادکردبوو, لەگـەڵ ئەوەشدا سیاسەتی نێونەتەوەیی چونکە دژی کوردو لەگەڵ عێراقدا یەکیانگرت, بـوون بەمایـەی هــەرەس‌و هــەرەس حــەڵاڵ کـردن؛ هەرەسی گـەورەی بێوێنــە لەمێژووی کوردستاندا روویداوە؛ سەیرکەن لەهەڵچوونا, سیاسـەتی نێونەتـەوەیی کە پێچەوانەی چارەنوسی گـەلان ئـەبێت, ئـەتوانێت سـەرکەوتنەکانیش لـەکاتی هەڵچووندا دابمرکێنێتەوەو بشبێتە مایەی کارەسـاتی ئێجگـار گـەورە؛ بەدرێـژایی مێـژوو لەسـەدەی (١٨-١٩ — ٢٠) سیاسـەتی جیهـانی کـە خـراپ بـوو, بەمایـەی شکستی دەیان راپەڕین‌و شۆڕشی نەتەوەکەمان.

لــەم شۆڕشــەدا پێــچەوانەی هــەموو ســەردەمەکان‌و بەپێــچەوانەی هــەموو راپەڕین‌و شۆڕشەکانی دوو سەدەی رابوردوو, دێهاتمان نـەما, کیمیابـاران کـراین, هەڵەبجەمان بەسەردا هات, عێراق‌و ئێرانیش رێککەوتن, وەسـتانی شـەڕی ئێـران عێراق‌و رێکەوتنامەی نێوانیشیان, لەرێکەوتنامەی جەزائیریش خەتەرناکتر بوو بۆ سەر شۆڕشـی گەلەکـەمان, سـەرەنجام هــەزاران پـێشمەرگەش تەسـلیم بونـەوە, چەند پارتیزانێکی ئەوپەڕی قارەمان نەبێت کە تـوانی مقاوەمـەت بکـات, ئاسـان نەبوو هەتا سەرکردەکانیش بتوانن مقاوەمەتێکی باش بکەن, لەگەڵ ئەوەشدا کە دووچاری ئەو شکستە بووین, لەدڵەراوکێدا بووین ئەم شۆڕشەش لەناوبچێت, لـەو دڵەڕاوکێیەی مان‌ونەماندا, سیاسـەتی نێونـەتەوەیی خۆشبەختانە بـەرەو گـۆڕان رۆشــت, لەســاڵی (١٩٨٩)وە جــەنگی ســارد کۆتایی‌هــات, سیـستەمێکی نــوێ لـەجیهان سـەریهەڵدا, ئیتیحـادی سۆڤیەتی‌و ئۆروپـای رۆژهـەڵات هەرەسی‌هێنا, جیهانبینیەکی تازە بۆ جیهان هاتەپێشەوە, ئەم جیهانبینیە جۆرێـك لـە ئومێـدی بـۆ میللـەتانی وەکـو کـورد کەلـەدۆخی هەڵـدێرو لەوپــەڕی نەهامەتیـدا بـوین, سیاسەتی نێونەتەوەیی کە گۆڕا, شکستی پارسـەنگ داینـەوە. ئەمـەش بۆنـەوە دەگەڕێتــەوە کــەوا ســەرەتای خوێندنەوەیــەکی باشمــان هــەبوو بـۆ سیاســەتی جیهــانی, بۆیــە وردەوردە توانیمــان بیقۆزینــەوەو یەکــەمین قۆزتنـــەوەش لەپاریسەوە دەستپێدەکا. ئەگەر باشـتان بیربێـت (١٩٨٩) یەکـەمین کۆنگـرە بـۆ مافی مرۆڤ کە لە پاریس بەسترا, خاتوو دانیال میتران سەرپەرشتی کۆنگرەکـەی ئەکرد, بەناوی کۆنگرەی مافی مرۆڤ, ئەویش نـەك مـافی سیاسـی کـورد, بـەرەی کوردسـتان بەسـەرکردایەتی (مـام جـەلال) لەکۆنگرەکـەدا بەشداریيان کـرد, کـە

چوونە ناو هۆڵی کۆنگرە, پێش ئەوەی کۆنگرەکە دەستپێبکات, وەفدی عێراق بەسەرۆکایەتی (ئەحمەد بەهادین) وەکو نوێنەری بەشێکی تری کورد خۆیکردبوو بەژووردا, وەکو مەجلسی تەشریعی ئەوکاتەی رژێمی عێراق لەکۆنگرەکە بانگهێشت کرابوون, کە وەفدی بەرەی کوردستانی وەفدەکەیان دیبوو, یەکسەر وتبوویان: ئەو وەفدە لەناو هۆڵەکەدا بێت, ئێمە ئەچینەدەرەوە, دانیال میتران هەوڵیدابوو, هەیئەتی رئاسەی کۆنگرە, چەندین کەسایەتی گەورە لەکۆنگرەکە بوون, هەرچەندیان کردبوو, بەڵکو گفتوگۆیەك, بەڵکو ئەملایەك, ئەولایەك, سودی نەبوو, وەفدی کورد سووربوون لەسەر دەرکردنی وەفدی عێراق, بۆ؟ چونکە خوێندنەوەیەك هەبوو بۆ سیاسەتی نێونەتەوەیی, ئاڵوگۆڕێك هەبوو لەسیاسەتی نێونەتەوەییو ئەزانرا ئەمە سەرەتای ئاوڕدانەوەیەکە لەکێشەی میللەتانی وەکو کورد, ناچار سەرۆکایەتی کۆنگرەکە وەفدی حکومەتی عێراقیان دەرکردبوو؛ ئەمە زۆر گرنگ بووە. لەشکستدا, هەزاران پێشمەرکە تەسلیم بۆتەوە, بەلاّم سیاسەتی نێونەتەوەیی کە ئەگۆڕێت, حکومەتی عێراق کە بەهێزترین پەیوەندیشی بەرۆژئاواو رۆژهەلاّتی دنیاوە هەبوو, وەفدەکەی لەکۆنگرەیەکی جیهانیدا دەرئەکرێت, ئەمە کردنەوەی دەرگایەکی تازەبوو, لەسیاسەتی جیهانی سەبارەت بەکوردی شکستخواردوو. هەر دوای ئەوە لە (١٩٨٩/١٢/٢٠) سۆسیال ئینتەرناسیۆنال بەبۆنەی (١٠٠) ساڵ دامەزراندنیەوە, کۆنگرەیەکی بەست, دیسانەوە وەفدە کوردیەکان بانگهێشتکرابوون بۆ کۆنگرەکە (٤) بڕیار لەو کۆنگرەیەدا درا, یەکێکی بڕیاری مافی مرۆڤی کورد, دووەمی ئابوری کورد, سێهەمی کێشەی سیاسی کوردستانو چوارەمیشی سەبارەت بەکلتوری کوردستان, پەسەندکرا؛ ئەمەش ئاماژەیەکی زۆر ئاشکرابوو کە بەڕێوەیە مەسەلەی کورد بچێتە ناو سیاسەتی نێونەتەوەییو لەهەگبەی سیاسەتی نێونەتەوەیی بڕیار هەیەو وردەوردە لەگەڵ ئاڵوگۆڕەکاندا, کە لەرۆژهەلاّتی ناوەڕاست دێتەپێشەوە, مەسەلەی کوردیش حسابی بۆدەکرێ.

هەر لەم زەمانو زەمینەیەدا بوو حکومەتی عێراقیو صەدام گەورەترین هەڵەی ئەنجامدا, بەداگیرکردنی کوەیت, کە کوەیتی داگیرکرد, ئیتر دەرگاکان کرانەوە بۆمان, خۆتان ئەزانن ئیتر کۆنگرەی موعارەزەی عێراقی بەسترا, لەوەبەدوا کوردستان تێکەلاّو بەکۆنگرەکانی تر دەکراو, بانگهێشتو بانگهێشتکاری دەستیپێکرد؛ بانگهێشتی فەرەنسیو بانگهێشتی ئەڵمانیو بانگهێشتی بریتانیو بانگهێشتی ئەمریکی, لەهەموو لایەکەوە دەرگاکان دەکرانەوە.

بەڵێ ئەمە ڕۆژگاری سیاسەتە, پێش ئەوە لەکاتی ئەنفالەکاندا (مام جەلال) چووبوو بۆ ئەمریکا, هەوڵیدابوو لەوەزارەتی دەرەوە کارمەندێکی گەورە ببینێت, نەیانبینیبوو, یەك کارمەندی سادە لەچایخانەیەك بینیبووی, وتبووی ئێمە بەرژەوەندیمان وایە کە تۆ لەم وڵاتە بەرەسمی نەبینین, چونکە زەرەر لە بەرژەوەندی ئێمە دەدەی, لەسەر ئەو چاوپێکەوتنە لابەلایەش, عێراق کردی بەهەڵلا. دوای ئەوە خۆیان هەڵپەیان بوو بێن سەرکردەکانی کورد ببینن و خۆشتان ئەزانن لەدوای داگیرکردنی کوەیت و راپەڕین و پەرلەمانەوە, ئیتر فەرشی سوور بۆ جەنابی (مام جەلال)و بەڕێز (مەسعود بارزانی) دائەخراو وەکو سەرۆکی وڵاتە گەورەکانی دونیا حسابیان بۆئەکردن, فەرشی سوور نیشانەی کەسایەتی یەکەمەو تەنها بۆ سەرۆك وەزیران و سەرۆك کۆمارەکانی دونیا, فەرشی سوور لەبەردەمی کۆشکەکانی دونیادا دائەخرێت, ئەم قسانەم, هەمووی بۆئەوەبوو بڵێم؛

## دوو کێشەی چارەسەرنەکراو

ئەم سەردەمە سەردەمێکی تازە بوو, لەدوای روخانی ئیتیحادی سۆڤیەتەوە دەستیپێکردوە, سەرەتا ناوی لێنرا سیستەمی نوێی جیهان, وردە وردە لەجیهانگیریدا فۆرمیلە کرا, ئێستا جیهانگیری شتێکی تازەیە, دونیا سەراپا بەجۆرێکی تر, بەدیدێکی تر, سەیری جیهانگیری دەکات, جیهانگیری یانی بەپێی شەرحی فەرهەنگی ئۆکسفۆرد, ئەو تەوژمە سیاسی, ئابووری, کلتوری و ئەمنیەیە کە سنوری قەدەغەی وڵاتان نایەڵێ و بەئارەزووی بەرژەوەندی نوێی سەرمایەداری ئابوری دونیاو سیاسەتی نێونەتەوەیی و میدیاکان و کلتوری دونیا, تێکەڵاوئەکات, واتا: جیهانگیری سنوربەزێنە بۆ هەموو پێویستی و پێداویستیەك. لەدەهەی رابوردوشدا, پێشکەوتنی گەورە لەم بارەوە هاتۆتەدی. سیمای جیهان خەریکە دەگۆڕێ. بەڵام لەجیهانگیردا دوو مەسەلە لە (١٥) ساڵی رابردوودا چەسپی, یەکەم ئاڵوێری ئابووری کاڵا تازەکان لەدنیادا, ئەو سنوورانەی هەن ناتوانن ڕێی لێبگرن, جاران حکومەت گرێبەستی لەگەڵ وڵاتێك ببەستایە, بەرهەمی ئەو وڵاتە نەچووە ئەو وڵاتە, گرێبەستی نەکردایە نەئەچوو, ئێستا حکومەتەکانی دونیا گرێبەست بکەن و نەیکەن, بەرهەمی تازەی دونیا دێت و ئەڕوات, هەزاران رێگەی جیا لەرێگەی حکومەتەکان هەیە, جیهانگیری بازاڕی ئاوالاکردووە لەبەردەمی بەرهەم یاخود کاڵا هەرە نوێچەشنەکانی کۆمپانیا تازەکانی دونیا, لەکوردستانی ئێمەشدا ئەبینین و لەهەمو دونیادا

ئەبینین، حکومەتەکان ڕێکیش نەکەوتوون لەگەڵ وڵاتانی پیشەسازی، کەچی بەرهەمی تازە دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو وڵاتانەو بازاڕی کوردستانیش، بازاڕی کۆمپانیا تازەکانی دنیایە؛ یانی سنورە تەلبەنکراوەکانی حکومەتە سەرمایەداریە دواکەوتوەکانی جاران لەبەردەم کۆمپانیاکانی دونیادا نەماوەو خوساوە، کۆسپو تەگەرەیەکیش مابێ لاوەکییە، سەرەکی نییە؛ دووەمین لەمەسەلەی ڕاگەیاندنیشا، ئەبینن سەتەلایتو ئینتەرنێتو ئامێرە نوێکانی ڕاگەیاندن چیئەکەن، چ حکومەتێك ئەتوانێ ئێستا ئاسمانی خۆی بکات بەیاریگایەکی داخراو و نەیەڵێ سەتەلایت نەقڵ بێت بۆ وڵاتەکەی. دواکەوتورین تا ئەگاتە پێشکەوتووترین وڵاتی دونیا، کام وڵات فەندەمەنتالیزمێکی تەواویشە، ناتوانێت بەبەردەوامی شەپۆلەکانی سەتەلایتو ئینتەرنێت رابگرێت، ئەگەر بیرتان بێت لەساڵی (١٩٩٠–١٩٩١) رەفسەنجانی کە ئەوکاتە سەرۆکی ئیسلامی ئێران بوو، وتی: ئەڵێن تەلەفزیۆنێك پەیدابووە هەر لەخۆیەوە دێتەماڵەکانو ئەچێتە ناو تەلەفزیۆنەکان، گوتی: ئێمە باوەڕمان بەمیللەتی موسڵمانی ئێران هەیە کە سەیری تەلەفزیۆنی وا نەکەن. کەچی ئێستا سەدان هەزار سەتەلایت لەسەرانسەری ئێراندا بڵاوبۆتەوە. ئەمە دونیایەکە مەحاڵە لەبەرامبەر تەوژمی میدیاکانی جیهانیدا، بتوانرێ وڵاتان کۆنترۆڵ بکرێ. سیستەمی کۆمپیتەریش لەئێران هەر زۆر بڵاوە. هیچ دامودەزگایەك، هیچ کۆفی ئەنتەرنێتێك نیە دەیانو سەدان کۆمپیوتەری تیانەبێت، هێڵی ئینتەرنێت بەئارەزووی خۆت لەگەڵ هەر کەسێکی هاوڕێی خۆت، لەگەڵ کەسی خۆت، هاوبیری خۆت، سیاسەتی خۆت، بەئینتەرنێت لەگەڵ ئێران قسە بکە، سەدان هەزار کەس بەئینتەرنێت نامە ئەگۆڕێتەوە لەئێراندا، ئەمە دونیای جیهانگیرییە کە ناکرێت ڕێگەی لێبگرینو بڕیاری ڕێگرتنیشی بدەی، مەحاڵە خەڵك بەقسەت بکات، هەروەکو گوتم ئەو دوو مەسەلەیە کۆتاییان هاتووەو چەسپیون، مەسەلەی ئابوریو ڕاگەیاندن.

لەجیهانگیریدا دوو کێشەش تا ئێستا بێچارەسەر ماونەتەوەو ڕووداوی زۆر گەورەی چارەنووسسازیشیان لەدنیادا تەقاندەوە:

١) ئەو کێشە سیاسیو کۆمەڵایەتیانەی لەجەنگی یەکەمەوە بێچارەسەر مانو تا کۆتایی جەنگی ساردیش، هەر درێژەیان کێشا. ئەویش کێشەی سیاسی نەتەوە ژێردەستەکانی وەکو ئێمەو، کۆمەڵە دواکەوتوەکانو حکومەتە تۆتالیتاریەکانی دونیایە، ئەو کێشانە وەکو پێویست بەرنامەی چارەسەرکردنیان لە (١٠–١٥) ساڵی ڕابردوودا بۆ دانەڕێژراوە.

٢) ئاسایيشی جيهانی لەئاستی گەشەکردنی ئابووری جيهاندا, نيە, ئابوريـەکی ئـازاد, بـەڵام ئاسايـيشێکی نيوەچـڵيش, لـەدنيادا, نىيـە. لەبەرئـەوە چارەسەرنەکردنی کێشە سياسيەکانی گـەلانی وەکـو کـوردو درێژەکێشانی تەمـەنی حکومەتـە ديکتـاتۆرو تۆتاليارىـەکانی دونيـا, وايکـردووە خـەڵك برسـیبێت, تەنگوچـەڵەمەی کۆمەڵايـەتی, خێزانـی, تـاكو پـەروەردەيی هەبێتو لەئەنجاميشدا لـەناو گـەلانی ژێردەسـتەو کۆمەڵـە دواکەوتوەکانـدا رەنگبداتەوە, ئەمەش ئەمنی جيهانی, ئـەمنی ناوچـەو ئـەمنی نەتـەوەييش لەهەموو ئەوروپادا, بەئەمريکاشەوە بخاتـە مەترسيەوە, ئـەمريکاو رۆژئـاوا درکـی ئەمــەيان نــەکردبوو, هــەتا لــە (١١)ی ســێپتەمبەردا راچـڵەکينو راچڵەکينێکی ئـەوتۆش کـە ئێـستا ئـەمريکا ئـەڵێت ئـەمريکا لەجـەنگێکی جيهانيدايـە دژی تيرۆريـزم, ئـەمريکا لەجـەنگی يەکـەمی جيهانيـدا جـەنگی رانەگەياند کەچی ئێستا جـەنگی راگەيانـدوە, جـەنگ دژی تـيرۆر لەتـەواوی دونيـادا, هۆيەکەشـی ئەگـەر ورد لێکیبدەيتـەوە, ئەگەڕێتـەوە بۆئـەوە لـە (١٠٠) سـاڵی رابـردوودا غـەدرێکی ئێجگـار گـەورە لەميللـەتانی وەکـو کـورد کـراوەو چاوپۆشـينێکی بێتـامی نامرۆڤانـە لەحکومەتـە ناديموکراتيـەکانو حکومەتە کۆنەپەرستەکان کراوە, بۆيە ئەبينی ئێـستا مەنهـەجی خوێنـدن, مەنهەجێکی سەقەتە, ئابوری ئەو وڵاتانە, ئابوريەکی سەقەتە, پێشکەوتنی کۆمەڵايـەتی, پێـشکەوتنێکی سـەقەتە, ئـەقڵی ئينـسانەکانی ئـەو وڵاتانـە, ئـەقڵێکی سـەقەتەو ناسـازێت لەگـەڵ گۆڕانکاريـەکانی ئـەم سـەردەمە, بەتايبەتی وڵاتانی عەرەبی بونەتە مايەی سەرچاوەی کێشەو گيرگرفتێکـی خەتـەرناك بۆ ئۆروپـاو ئـەمريکاو ئێستا خـەريکی ئـەوەن کـە چارەسـەری بکەن, نمونەتان بۆ بێنينەوە:

## شکستی پرۆژەی ناسيۆناليزمی عەرەبی

چـەندين نمونـە نـەك يـەك نموونـە؛ وڵاتـانی عـەرەبی ئێـستا (٢٨٠) مليـۆن ئينسانی تێپەڕاندووە (٢٨٠) مليۆن ئينسان لەوڵاتانی عەرەبيا ئەژين, دەوڵـەتانی عـەرەبی بـەهێزترين ئـابوری جيهانيـان هەيـە, پاشـەکەوتی نـەوت زۆرە, توانـای ئابوری تريـان زۆر زۆرەو خۆشـتان ئـەزانن کـە (٢١) دەوڵـەتی عـەرەبی لـەدنيادا هەيە زۆربەيان لەدوای جەنگی يەکەمی جيهانيشەوە دامـەزراون؛ ئەبوايـە ئێـستا ئـەم وڵاتانــە لــە (١٠٠) ســاڵی رابــوردوودا بــبن بــە وڵاتــە گــەورەوگرانو

پێشکەوتووەکانی دونیا, بەڵام چۆنن؟ ئێستا با لێکیبدەینەوە چۆنن: هەناردەی وڵاتانی عەرەبی بەتێکڕای لەساڵێکدا بەقەد هەناردەی فنلەندایە, ئەمە یەك, لە (١٠٠) ساڵی رابردوودا چی کتێب چاپکراوەو وەرگێڕدراوە لەوڵاتای عەرەبی‌دا, بەقەد یەك ساڵ کتێبی چاپکراو و وەرگێڕدراوی وڵاتی ئیسپانیایە ئەمە دوو؛ (٢٢) وڵات لەدنیادا ئاوی خواردنەوەیان لەخوار راژەی پێویستیەوەیە (٢٢) وڵات لەدنیادا (١٥)ی وڵاتی عەرەبیە ئەمە سێ, (٤٧٪) وڵاتانی عەرەبی نەخوێندەوارن, لەناو ژناندا (٦٧٪)ی نەخوێندەوارن, لەسعودیە ئێستاش موناقەشە لەسەرئەوەیە ژن بۆی‌هەیە سەیارە لێبخوڕێت یان بۆی نیە؟ لەکوەیتدا بڕیاریانداوە لە (٢٠٠٥)دا یانی ساڵێکی تر ژن بۆی‌هەبێت دەنگ بدات بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان, نەك خۆیشی هەڵبژێرێت بۆ پەرلەمان, (١٥٠) ساڵ لەمەوبەر لەئەوروپا بڕیاری وا دراوە ئەمە چوار. لە (١٩٤٨)وە تائێستا سەرەنجامی شەڕە ناوخۆکان لەسەر کێشەی تایفی, کێشەی ئەتنیکی, کێشەی ناسیۆنالیستی, کێشەی دیموکراتی, کێشەی ئاو, لەسەر کێشەی نەوت‌و کێشەی جوگرافی, لەساڵی (١٩٤٨)وە تائێستا سەرەنجامی شەڕی ناوخۆ (دوو ملیۆن‌و حەوت سەد هەزار) کەس لەوڵاتانی عەرەبی کوژراون (سێ ملیۆن‌و پێنج سەد هەزارێك) ئاوارەکراون, (١٢٦) کێشەی جۆراوجۆر لەناو وڵاتانی عەرەبیدا هەیە ئەمە پێنج, باشە ئەم وڵاتانە, ئەم هەموو کێشانەی تیادا پەنگی‌خواردبێت, ئیتر چۆن رێگەناگرێت لەبەردەم گۆڕان‌و پێشکەوتنەکانیان, بێگومان زۆر رێگەیان لێئەگرێت‌و نایەڵێت بڕیاری ئەقلانی بدەن, لەئەنجامدا ئەو دواکەوتنە بەرامبەر میللەتانی وەکو ئێمە رەنگئەداتەوە, ماقوڵ نیە وڵاتانی عەرەبی خۆیان دژی دیموکراسی بن, بەڵام لەبەرامبەر کوردستاندا پەیڕەوی لەدیموکراتی بکەن. بێگومان بۆ خۆشتان ئەبینن هەڵوێستی رەسمی حکومەتە عەرەبیەکان‌و هەڵوێستی رای گشتی ئەحزاب‌و تەلەفزیۆنەکانی وڵاتانی عەرەبی, هەڵوێستێکی نادیموکراتیە تائێستا, ئەمەش رەنگدانەوەی پەنگخواردنی ئەو تەنگوچەڵەمانەیە کە لەهەناوی کۆمەڵەکانی عەرەبیداو لەهەناوی سیستەمەکانی عەرەبیدا مۆڵیان خواردووە, سەرەنجامیش, خیتاب‌و پرۆژەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی دەتوانین بڵێین: لەباری سیاسی‌و سیستەمی دیموکراسیەوە شکستی خواردووە. ئیتر لەمەودوا دەشبێ باجی هەڵەو تاوانەکانیان لەدژایەتی دیموکراسیدا بدەن. لەمەوە؛ لەم دونیای جیهانگیری‌و سەردەمەوە دێمە سەر تیرۆر.

## تیرۆرو تیرۆریزمی ئیسلامگەرا

تیرۆر پێش هەموو شتێك تیرۆره بەدوو ئاراستە؛ بەدوو مانا؛ تیرۆری جەستەیی‌و تیرۆری ئەقڵ، کوشتنی جەستەی بەرامبەر لەسەر بیروباوەڕ تیرۆره، کوشتنی ئەقڵی بەرامبەر لەسەر ئازادی بیرو ئازادی ویژدان، هەر تیرۆره؛ جەستە بکوژی، ئینسانێکی ئازاد لەناوئەبەی، ئەقڵ بکوژی، ئەقڵێکی ئازاد لەناوئەبەیت، من نەوێرم لەبەردەم مەسئولێکدا، لەبەردەم وەزیرێکدا، لەبەردەم دامودەزگایەکدا، لەبەردەم ئاغاو شێخێکدا، نەوێرم بەئازادی قسەبکەم، بنووسم، رەخنەبگرم، ئەوە هەزاران بیروباوەڕی ئازاد ئەکوژرێ. با جەستەشم نەکوژن، بابەجەستە وەکو قاوغێکی بەتاڵ بژیم، بێم.. بڕۆم.. بخۆم.. بخەوم.. بەڵام نەتوانم قسەبکەم، نەتوانم بنووسم، نەتوانم رەخنەبگرم، نەتوانم مان بگرم، نەتوانم لەهەڵوێستەکاندا ئازاد قسە بکەم، جۆرەها بیری جوان، توانای جوان، ئەقڵی جوان، پرۆژەی جوان، لەمێشکمدایە، بەڵام هەژموونی دەسەڵات ناهێڵی قسە بکەم، کە قسە ئازادانە نەکرا، هەزارەهاو ملیۆنەها بیری ئازاد ئەمرێ‌و ئەڕوا، کۆمەڵ سودیلێوەرناگرێت‌و نیشمان سوودیلێوەرناگرێت، حیزبەکە سوودیلێوەرناگرێت، رێکخراوە دیموکراتیەکان سوودیلێوەرناگرێت، دەزگاکان سوودیلێوەرناگرێت، بەکوشتنی بیری جوان‌و ئازاد، هەموو بوارێکی ژیان لەداهێنان‌و گۆڕانی بەردەوام بێبەش دەکرێ، بۆیە تیرۆری جەستەو تیرۆری بیرو هزر، دوو ئاراستەی زۆر خەتەرناکن، بۆ پێشکەوتن، بۆ ئازادی، بۆ دیموکراسی، بۆ ژیانی مەدەنی.

ئایە تیرۆر کەی سەریهەڵداوە؟ بەتایبەتی تیرۆری ئیسلامگەراکان، لەوبارەیەوە خۆتان ئەزانن لەئەورووپاشدا تیرۆر هەبووە، لەسەردەمی لینیندا تەیاری ناردۆنیەکان باوەڕیان بەتیرۆر هەبوو تەنانەت قەیسەریان کوشت، دوایش تیرۆری ئەحزابی تر هەبووە، ئەمانە هەمووی هەبووە و هەندێك لەئەحزابە رادیکاڵەکانی دنیاش جۆرێك لەتیرۆریان بەکارهێناوە بۆلەناوبردنی دوژمنی خەتەرناك، ئیستخباراتی خەتەرناك، بەڵام ئەم رێگەیە رێچکەیەکی بچوکە بۆ خزمەتکردنی شۆڕش، بۆ خزمەتکردنی راپەڕین.

واز لەمانە ئەهێنم‌و دێمە سەر تیرۆری ئیسلامی، حیزبە سیاسیە ئیسلامگەراکان، (لەگەڵ رێزمدا بۆ ئامادەبوان) حەزئەکەم بەراشکاوی قسەبکەم،

هی وا هەیە عەقیدەی دینی بەهێزە, قەبوڵی ناکا, هی وایە قەبوڵی ئەکات, ئەمە بابەتێکە ئەکرێ موناقەشەی لەسەربکەیت, تۆ ئازادی چەند قەبوڵی ناکەی, منیش ئازادم چەند قسەی لەسەرئەکەم, خۆم ئێستا قسە لەسەر ئازادی ئەکەم, مەعقول نیە ئازادی خۆم زەوت بکەم, لەبەرئەوە بەوپەڕی ئازادی قسەئەکەم.

تیرۆر, ئەم رەشەکوژیەی کە ئێستا لەسەردەستی گروپە تیرۆریستە ئیسلامگەراکان ئەیبینین, زاراوەی ئیسلامگەرام پێباشترە لەئیسلامی سیاسی, ئەوەی عەرەب پێیئەلێن (الأسلامیون) نە ئیسلام, نە ئیسلامی سیاسی, ئیسلامگەرا زاراوەیەکی تازەیە ئێستا لەئەدەبیاتی سیاسیدا بەکاردێت, بەمە جیایئەکەینەوە لەئیسلام, لەموسوڵمان, لەخواپەرستی, بەمانە بڵێین ئیسلامگەراکان. بەڵێ ئیرهابی ئیسلامگەراکان, مەسەلەیەك نیە تازە سەریهەڵدابێت لەناو مێژوی ئیسلام, ئەمە رەگوریشەی ئەگەرێتەوە بۆ سەردەمی خولەفای راشدین؛ لەچوار خولەفای راشدین سیانیان تیرۆرکراوە, لەدوای پێغەمبەرەوە دەست بەجێ ناکۆکی توند لەناو خەلافەتی ئیسلامی دروستبووە, گەیشتۆتە رادەی ئەوەی لەچواریان سیانیان بکوژرێت, چوار ئیمامی گەورەی ئیسلامی, ئیمامی حەنەفی, ئیمامی شافعیو ئیمامی حەمبەلیو ئەمانە یان کوژراون یان زیندانی کراون, خۆتان ئەزانن هەرچواریان لەدوای ئەو کوشتوکوشتارە لەنێوان ئیمامی عەلیو مەعاویەدا, ئینجا مەسەلەی ئیمامی حسینو قەتڵوعامی کەربەلا, هەروا دروستبوونی ئومەویەکانو عەباسیەکان, دواجار قەتڵوعام کەلەنێوانی خۆیان کراوە.

بەدرێژایی (١٤٠٠) ساڵی رابردوو سامناکترین شێوەی تیرۆری جەستەو تیرۆری عەقیدەو تیرۆری ئازادی فکریو ئازادی ویژدانیو کۆمەڵایەتی لەسایەی دەسەڵاتی ئیسلامیدا رویانداوە. یەك ماوەی کەم لەمێژوودا نادۆزرێتەوە کە لەیەکێك لە وڵاتە ئیسلامیەکانداو بەتایبەتی لەعێراقدا, ئەم عێراقەی کە ئێستا ئەڵێن عێراقی یەکگرتوو بووە, ناوەندی شارستانیەت بووە, پێش ئیسلامو دوای ئیسلام, ئەم بۆچونە بەشی زۆری راست نیە.

مێژووی ئەم وڵاتانە بەردەوام وابووە, کەچی مێژوو لەنوسینو خوێندندا تەنها جوانیەکانی باسکراوەو پێیگۆشکراوین. مەنهەجەکانی خوێندن هەمووی هی ناسیۆنالیزمی عەرەبیو مەنهەجی ئیسلام بووە, کە عەرەبو ئیسلامو ئیسلامو عروبە هەرگیز لێك جوداناکرێنەوە. ئەمانە خراپیش بوبن کەچی هەموو ئەو

دەسـەڵاتانەیان لێکـردوین بەدادپـەروەرو سەرکردەکانیـشیان بـەپیاوی نـورانیو پیاوی موقـەدەسو پیـاوی موجاهیـد پێناساندوین, فتوحـاتی ئیسلامی لەسـەر دەسـتی ئەمانـە کـراوە تاوانیـشیان ئەنجامـدابێ وایـان لێکـردوین کـە نـەتوانین دوورونزیك باسیان بکەین, من کە دەڵێم فتوحات, دەمـەوێ ناوەکـە وەکـو خـۆی باسبکەم, ئەگینا بەشی زۆری ئەو فتوحاتانە داگیرکردن بون بەرامبەر نیشتمانو نـەژادەکانی تـر. ئەمانـە موقـەدەس نـینو بۆمـان هەیـە لەمێـژوودا کەسایەتیان بیخوێنینەوە, بزانین چاك بوون یان خراپ بوون؟ کە شتێك کرایە موقەدەس ئیتر هەرناوێری توخنی بکەوی. قودسیەت کـە زیـاد لەسـنور ئـەدرێت بەمەسـەلەیەك, ئیتر دەرگا لەبەردەم بیری جیاواز دائەخرێت. ئەقڵت, چاوت, هەسـتت, هۆشـت, ویژدانت, هەموو شتەکان دائەخرێن, لەکاتێك کە مێژوو ئەخوێنیتـەوە, حـەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی نـەك پیـاوێکی نـورانیو خەلیفـەی موسـڵمانو دادپـەروەر نەبوو, بەڵکو گەورەترین جەلاد بووە, لەشەڕدا هەزاران کەسی بـەدیلی کوشـتوە, ئەوکاتە چەکی کیمیایی نـەبووە, ئـەتۆمی نـەبووە, بەشمـشێر چـۆن توانیویـەتی گـرد لـە کەللەسـەری کـوژراو دروسـت بکـا. شـانازیپێوەکردووە, بـەدەیان کەللەسەری بەکاروان ناردوە بـۆ شام, لەکوشـتنی نەیارەکانـدا نمونـەی وا هەیـە لەسایەی دەسـەڵاتەکانی ئیـسلامیدا, لەمێـژوودا دەگمەنـە لەدڕندایـەتی. خـەلیفە هەیە زۆر بەئاسایی نازناوی کردۆتە (سەفاح), سەفاح یانی خوێنڕێژی بێبەزەیی. تازەش ئەزانین سەفاح کوشتنی رەشوڕوتەکانی خۆشمـانی گرتۆتـەوە, ئێـستاش بڕۆ بۆ هەنـدێك لەشـوێنەکاندا وادەرس دراویـن ئەچـین بـۆ هەنـدێ لەشـوێنەکاندا بەرد ئەخەینە سەر کافرەکان, پەڕۆیـەکی سـەوزیش ئەخەینەسـەر ئەسحابەکان, ئەسحابەکان داگیرکەر بوونو کافرەکانیش بەرەنگارییان لەوڵاتی خۆیان کردووە. هەتا نیشتمانو نەژادو زمانیان نەکرێتە موڵکی عەرەبو تەعریب نەکرێن.

## سامناکی تەعریبی ئیسلامی

بەڵێ تـەعریب لەسـەردەمی فتوحـاتی ئیـسلامیەوە دەسـتپێدەکات, تـەعریب لەسەردەمی بەعسەوە دەستپێناکات, صدام دروشمێکی هەیە (امـة عربیـة واحـدة – ذات رسـالة خالـدة), رسـالة خالـدة یـانی ریـسالەی ئیـسلام, تواندنـەوەی نەژادەکانی تر لەناو عەرەبدا, لەلایەن دەسەڵاتەکانی ئیسلامیەوە, جیهـاد بـووە. تەعریب کاتێك بەئاڕاستەی ئایین کراوە زۆر خەتەرتر بووە لەتـەعریبی ئاڕاسـتەی

ئایدیۆلۆژی. بەتایبەتی لەوسەردەمەدا. من هەندێك نمونەتان بۆئەهێنمەوە، ئێستاش باوباپیرانی ئێمە عەقیدەیان وایە ناوێك لەمناڵ بنرێت لەقورئان‌و حەدیسدا نەبێت گوناهە، ئێستاش کە منالمان ئەبێت کەس‌وکارمان ناوی ئیسلامی بۆهەڵدەبژێرن. دایکم ئەڵێت: رۆڵە گوناهە ناوێکی قورئان‌و ئەسحابەکانی تێبخە. ئەمە کاریگەری عەقیدەیە، مەسەلەکە کاریگەری ئەو عەقیدەیەیە لەسەر ئەو ئینسانە، نەك زەبری لەشکرو سوپا بەتەنها. تێبینی ناوەکانی خۆتان بکەن، لەمنەوە کە ناوم بەختیار نیە، ناوم حیکمەتە، تا ئەگاتە باقیەکەتان، تێبینی بکەن، بزانن چەند ناوی عەرەبیمان هەیە، چەند ناوی تورکیمان هەیە، ئەمە تەعریبە، هەمووی تەعریبە، بەبێ‌ئەوەی خۆمان بزانین تەعریبمان هێناوەو کردومانە بەبەشێك لەکلتورو حاڵەتی سایکۆلۆژی خۆمان، بزانە ئەمە (شەوقی) ئەمە (عەزین) ئەوە (ئیبراهیم جەلال) زۆربەی ناوە کۆنەکان وایە، باشە سەیرکەن بزانن رەنگە (٢٠٪)تان ناوی کوردیتان نەبێت، لێرەدا واز لەناو بێنە، بچۆ بۆ ناوی مانگە کوردیەکان (٢٧٠٠) ساڵ لەمەوبەر مانگە کوردیەکان ناوی کوردی پەتی جوان بوون، (گوڵان، نەورۆز، رێبەندان، جۆزەردان، بانەمەڕ) سەیری ئەم ناوە کوردیە جوانانە بکەن، کە ئیسلام هاتووە مێژوی هیجریان هێناوە، گوڵان بووە بە (ذوالقعدة) نەورۆز بووە بە (ذوالحجة)، ئەمانە، جگە لەگۆڕینی ناوی شوێن‌و هەرێم‌و مەڵبەندو شارو دێهات، تەنانەت هی کانیاوەکان، هی جل‌وبەرگ‌و نەریت‌و کەلەپورو فۆلکلۆریش. ئەمە هەمووی تەعریبە، تەعریبی ئیسلامی عەرەبی‌و عەرەبی‌و ئیسلامی، بەبێ‌ئەوەی هەتائێستاش سەرنجمان لێ‌دابێ‌و دەرسمان لێوەرگرتبێ. زۆر گرنگە سەرنج لەمێژوو بدەیت، ناو و کولتورو زمانی کوردی وەکو رابوردوو بمایەو وردەوردە گەشەی‌بکردایە، ئایە ئێستا کلتوری کورد چ کلتورێکی گەشەکردوو ئەبوو، زمانی کوردی ئەبوو بە چ زمانێکی دەوڵەمەند، بەڵام تەعریب زمان‌و رەوت‌و ئاراستەی کولتورو شارستانیەتیشی گۆڕیوین. بەراستی تەعریب خەتەرناك بووە لەسەر کورد. تەعریبی ئیسلامیش، لەبەرئەوەی تەعریبی عەقیدەییە، خەتەرناکترین شێوەی تەعریب بووە. تایبەت لەوسەردەمەدا کە کوردمیچی نەبووە، دواکەوتوو بوین، تەنها عیشقی خۆرسکی نیشتمان‌و خۆشەویستی نەژادەکەمان هاندەری دڵسۆزی پێشینانمان بووەو بەس. پێشم وایە، ئەو عیشقەمان، سەرەڕای نەبونی سەروەری دەسەڵاتمان، باش پاراستووە، هەربۆیە کورد ماوە.

## تیرۆری دوای گۆڕانکاری

حیزبی بەعسیش هـاتووە تـەعریبی بـەکارهێناوە بەشێوەیەکی تـرو تـەعریب لـەناوەرۆکی ئیـسلامدا هەیـە, پێغەمبـەر ئـەڵێ مـن عـەرەبم لەبـەر سـێ هـۆ خۆشدەوێت؛ یـەك لەبەرئـەوەی قورئـان بەعـەرەبی دابـەزیوە, دوو چـونکە خـۆم عەرەبم, سێ ئەڵێ لەبەرئەوەی لەودونیادا حەشر بەعەرەبی ئـەکرێین, یـانی ئـەم دونیـاو ئەودونیاشـی لێگرتـووین, ئـەڵێ هەرکەسـێك ئیمـانی هـەبێتو بـەزمانی عەرەبی قسەبکات عەرەبە, عومەری کوڕی خەتابیش دەڵێ: (العرب اشـرف الأمـم وخیر من وطـاء الارض بقـدم), دەڵێـت (اشـرف الأمـم) نالێـت (شـریف), شـەریف قەیناکا, بەڵام بۆ لەمن شەریفتر بیـت, بـۆ لـەفارس شـەریفتر بیـت, بـۆ لـە تـورك شـەریفتر بیـت, بـۆ لەئـەقوامی تـر شـەریفتر بیـت, (اشـرف) یـانی کـەس لەئێمـە شەریفتر نیەو کەس لەئێمەش پاکتر نیـیە پێیـنابێتە سەر زەوی, ئەمە لەکاتێکدا تەنانەت لەزەمانی پێغەمبـەرو خولـەفای راشدینیـشدا کـەمترین عـەرەب بوونەتـە موسڵمان؛ بۆئاگاداریتان کـەمترین عـەرەب لەمێژوودا هـەتا سـەردەمی خولـەفای راشـدین لەبـەرایی ئیـسلامەتیدا بـوون بەموسـڵمان, موشـرکین لەگـەڵ ئەعرابـدا ئیسلامیی نەبوون؛ ئەوکاتەش موشرکینو ئەعراب زۆرینەی عەرەب بوون, چـونکە لــەقۆناغی کــوێرەوەری دەوارنــشین بــوون, عــەرەب ئەوکاتــە کــچیان بــووە کوشـتویانە, مـەیخواردنو هـەتیوبازی لەناویانـدا رەوشـتێکی بـاو بـووە, ئـەوە مەسەلەیەك نیـە بوختـانی بۆبکـەم, هـەتا لەقورئانـدا ئـەڵێت لـەودونیادا حۆریو غیلمانمان بۆ ئامـادەکردوون, بۆچـی؟ لەبەرئـەوەی ئـەو رەوشـتو رەفتـارە بـاو بووە لەناو عەرەبدا, غیلمان یانی هەتیو, ئەمەش دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمەکە؛ سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵانەی پێغەمبەر بۆ عـەرەبو ئـەعراب کـە چاکیان بکـاو بیانکا بەنەتەوەی باڵادەست, ئینجا دەبینین لەکۆتایی ژیانیـا پێغەمبـەر بـاوەڕی بەئەعرابو موشرکین نەماوە, ئەگەر ئەوانەی قورئانیان بـاش خوێندۆتـەوە ئـاخر سورەت لەسورەتەکانی قورئان بەبێ (بسم الله) دابەزیوە, کەسـورەتی (توبـة)یـە (بسم الله الرحمن الرحیم)ی تیانیـە بۆچـی؟ لەبەرئـەوەی موشـرکین یـان ئـەعراب بـشبن بەموسـڵمان, بـاوەڕیـان پێنەکـەن, بیـانکوژن, لـە ئایـەتی (٩)ی سـورەتی (تحریم)و دووبارە لەئایەتی (٧٣)ی سورەتی (توبة)دا ئـەڵێ (يَاأَيُّهَـا النَّبِـيُّ جَاهِـدْ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَـنَّمُ وَبِـئْسَ الْمَـصِيرُ) ئـەی پێغەمبـەر شەڕی کافرەکانو موشریکەکان بکەنو قولی خۆتیـان بەسـەر بـسەپێنە, تەسـلیم

بن‌و بشلێن (بسم الله الرحمن الرحيم) قبولّى نەكردووە, كوشتونى, ئێ باشە پێغەمبەر زۆربەی عەرەبی پێنەكرابێتە ئیسلام, ئیتر كوردو میللەتانی وەكو كورد ئەو سەردەمە بۆچی بۆیان نەبێ بەرگری لەنیشتمانەكەیان بكەن؟ بۆ بەرگری لەبیروباوەڕیان بكەن؟ بەرگری لەدینی زردەشتی‌و نەریتی خۆیان بكەن. ئەگەر بەرەنگاریش كراوە ئاخر بۆ كافرو زیندیق بن؟ زۆربەی عەرەبەكە نەبوون بەموسڵمان, ئیتر بۆچی میللەتانی دیكە نەبوبوون بەموسڵمان‌و بەرەنگاریان كردبێ, كافر یان زیندیق بوبن؟ مێژوو ئەڵێت: پێغەمبەر زۆرینەی عەرەبەكەی پێنەكراوە بەموسڵمان, بەلام كورد ئەبێت هەر لەگەڵ لەشكرەكەی ئیمامی عومەر دەركەوت, هەموو تەسلیم بین, ئەم ئەقڵیەتە, ئەم سیستەمی بیركردنەوەیەی ئیسلامییە, بێگومان تێكەلاو بەدەسەلات بووەو زۆربەی دەسەلاتی ئیسلامی دەسەلاتی خۆسەپێنەر بون, هەژمونگەر بوون لەسەر ئەقڵ, كۆمەڵ, كلتور, نەتەوە, لەسەر نەژاد, لەسەر باوەڕو عەقیدەی تر. خۆشتان ئەزانن ئەقوامی زۆر زمانیان نەما, كلتوریان نەما, هەمووی لەناو بۆتەی عەرەب‌و ئیسلامدا توێنرایەوە.

ئەم تیرۆرە كە لەمێژووی ئیسلامدا وابووە؛ بەتیرۆری جەستەو چ تیرۆری نەیارو چ تیرۆری بیرو هۆش‌و عەقیدەی جیاواز, سەلەفیەكانی ئێستای ولاتانی عەرەبی‌و سەلەفیەكانی رۆژهەلات میراتگری هەمان رەوتی تیرۆرن لەدنیادا, خۆشتان ئەزانن كۆنترین حیزبی تیرۆریست‌و حیزبی سەلەفی لەدنیادا (اخوان مسلمين) كە لەساڵی (١٩٢٤) لەمیسردا دروست بووە, ئەم حیزبانە هەمووی لەدایكبووی ئەو قوتابخانەیەن, كە لە (اخوان مسلمين)ەوە دەستپێدەكات؛ ئیتر وردەوردە پەرەیان سەندووە هەتا گەیشتوونەتە ئێستای سەردەمی جیهانگیری, بەوپەڕی توندوتیژی هەوڵئەدەن دوژمنایەتی دیموكراسی بكەن.

ئاخر قسەم لەسەر تیرۆر ئەوەیە كە بۆچی ئەمانە ئێستا بەم شێوە هاریە تیرۆر ئەكەن, خۆكوژی ئەكەن, ئەمە پرسیارێكە؟ بۆچی وەكو جاری جاران ململانێ ناكەن, وەكو جاران هەناسەیان درێژناكەن, لەسیاسەت‌و ململانێدا؟ هۆی چییە؟ هۆكەی ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی دیموكراسی جیهانگیری بەشێوەیەكی خێرا هاتەگۆڕێ, دیموكراسی بلاوئەبێتەوە, بازاڕی ئازاد پەرەدەسەنێ,ئازادی تاك‌و ئازادی ویژدان‌و دەسەلاتی مەدەنیەت گەشەدەكا, ئەمەش وائەكات كەمترین رووبەر لەبەردەم سەلەفیەكانی دونیادا بمێنێتەوە, كەمترین كات‌و ماوە لەبەردەم سەلەفیەكانی دونیادا ماوە بتوانن هێزی خۆیان, هێزی كۆمەلایەتیان, هێزی

مەزهەبییان, هێزی دینیـان, هێـزی سیاسـیان بپـارێزن, لەبەرئـەوە کـە کـەمترین مـاوە لەبەردەمیانـدا مـاوە, هـەوڵ ئـەدەن لـەم مـاوە کەمـەدا کـورت تـرین رێگـا بگرنەبــەر بۆئــەوەی رێگــە لــەرێڕەوی دیموکراســی بگــرن‌و هەڵبیگێڕنــەوە و تەخریبێکی گەورە لەجیهاندا بکەن, ئەزانن لەم (١٠) ساڵەدا ئەگـەر نـەتوانن ئـەم رێـڕەوە رابگــرن, بێگومــان ئـیتر هەتاهەتایـە قیتـاری گۆڕانکـاری تێئەپـەڕێت‌و سـەرکەوتنی یـەکجاری بەدەسـتدێت, لەبـەر ئـەو راسـتیانە, تێکـدان لـە (١١)ی سپتەمبەر و پێش (١١)ی سێپتەمبەر و ئێستا ئامانجی فراوانترو تێکدانی زۆرتـرو رەشەکوژی ئاشکراتری بەخۆیەوە دیووە. نمونەکەیان تاقمی (جندالاسلام) بـون, ئــەم جانەوەرانــە تــاوانی زۆر گــەورەیان بەرامبــەر بــەکورد کــرد, لەبــەیانی دامەزراندنیانـدا ئـەڵێت: یـەکێتیی نیـشتمانیی کوردسـتان لەناوئەبـەین, چـونکە هێزێکی عەلمانییە, ئەمە پەیامێکی ئاشکرای رەشەکوژی بوو. پەیامێك بوو پێش روخاندنی رژێمی عێراق‌و دوای نەمانی تالیبانی ئەفغانستان, دەبوو لەکوردستاندا ئەنجامبـدرێ. هــەروا بەئاسـانی دەیانویـست جڵـەو بگرنەدەسـت‌و لەمەیدانەکـە دەرمان بپەڕێنن, بۆچیش؟ بۆ نمونەیەکی قێزەوەنـی دەسـەڵاتی کۆنەپەرسـتی. ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوان تێکڕا سەلەفیەکان لەزەمانی بەعسدا خۆیـان ماتـدابوو, بەرەنگارییان نەکردووە, لەزەمانی بەعس رێککەوتنامـەی (١١)ی ئـازاری (١٩٧٠) کراوە, نەهاتنەپێشەوە؛ شۆڕشی ئەیلول بەرپاکراو روخاش هەر نەهاتنەپێشەوە؛ تــەعریب کــراین, نەهاتنەپێــشەوە؛ خانــەقین‌و کــەرکوك‌و دەوروبــەری هــەمووی تــەهجیرو تــەعریب کــران, نەهاتنەپێــشەوە؛ ئــەنفال کــراین نەهاتنەپێــشەوە؛ کیمیاباران کراین نەهاتنەپێشەوە؛ شکستی ئەنفالـەکانمان بەسـەرداهات, شـەڕی ئێــران عێــراق بــەرپاکراو. وەســتا نەهاتنەپێــشەوە؛ ســەرکەوتین, راپــەڕینمان ســــەرکەوت, حکومــــەتمان دامەزرانــــد, پەرلــــەمانمان دامەزرانــــد, ئینجــــا هاتوونەتەپێشەوەو ئەڵێن: ئێمـەش هـەین, باشـە بـبن, بـەڵام حـەرامزادە مـەبن, حـەرامزادەیی خراپــە. هێزێــك تــازە دروســت ببێــت‌و شمــشێرێکی ژەنگــاویش هەڵکێـشێ‌و بـشیەوێ لەناویـشمان بـەرێ. ئەمــە زۆر بێویژدانیــە, هــەتا ئەگــەر مەسەلەی کوردو سیاسەتی لێدەرکەیت, نـەك بێویژدانیـە بـەڵکو بەکرێگراویشە. ئەگەر بەکرێگیراو نەبن بە چ هەقێکەوە یەکەم بەیانی دامەزراندنیان ئیبادەکردنی ئێمــە ئــەبێت, هەفتــەی جارێــك (فتوایــەك) دەردەکــەن فــلان بەرپرســی کــافر لەناوئەبەن, ئەمە ئەم بزوتنەوەیە چۆن بـەوان لەناوئەچێت, ئـەم تیرۆریستانە بەداخەوە بەم ئەقڵیەتە, کە بەم مەرامە سیاسی‌و عەسکەریە هـاتن‌و سـەرەنجام

چیان کرد، هەڵەبجە، تەوێڵە، خورماڵ، سیروان‌و بیارەیان کۆنترۆڵ کردبوو، هەڵەبجەیان هەر وێران کردبوو. تەنانەت بارەگاو ماڵێکی جوانیان بۆخۆشیان دروست نەکردبوو. خەڵکی هەڵەبجە رەنگە لێرە دانیشتبن، ئێستا بچێ سەیری هەڵەبجە بکات بزانێ لەدوای لەناوبردنی ئەمانە هەڵەبجە بوژاوەتەوە یان نا؟ (٧) ساڵ حوکمیان کرد، بزانن چیان لەهەڵەبجە کردووە، هەڵەبجەیان هەر داغان کردووە، ئازادی نەبوو، خزمەتگوزاری نەبوو، خوێندن کز بوو، لەتاقیکردنەوەکاندا، بەچەکدارەوە چوونەتە سەر خوێندنگاکان وتویانە منالەکانمان دەرنەچێت بەڕێوەبەرەکە ئەکوژین، بەملیۆن دینارو دۆلاریشیان دەستکەوتووە، هەموویان بۆ شتی تایبەتی خۆیان سەرفکردووە، هیچ خزمەتی خەڵکیان پێنەکردووە.

ئەگەر سەریشبکەون، یا حوکمەتێکی وەکو هەڵەبجە دروست ئەکەن، یا حکومەتێکی وەکو سعودیە دروست ئەکەن یا حکومەتێکی وەکو ئێران دروست ئەکەن، یا حکومەتێکی وەکو تالیبان دروست ئەکەن، خۆ باشتر دروست ناکەن، ئەمانە نمونەکانیانن، هەڵبەتە لەدنیادا هەرە باشەکەیان ئێرانە، بەش بەحاڵی خۆمان نایشارینەوە بەڕاستی حکومەتی ئیسلامی هەر نمونەیەکی بێت قبوڵمان نیە، شەڕی مان‌و نەمانیشی لەسەرئەکەین، ئێرانیش باش دەزانێ کە ئێمە دیموکراسی عەلمانین. ئێستاش لەعێراقدا حکومەتی ئیسلامی دروست بێت، شیعە بێت یا سونی، کەی دروست بوو کوردستان جیائەکەینەوە، ئەزانم ئێستا هەمووتان دوعائەکەن حکومەتێکی وا دروست ببێ هەتا کوردستان جیابێتەوە، ئەمە هەقیقەتی تیرۆریستەکانە، ئایا چارەنووسی ئێمە ئەگاتە کوێ؟

## تیرۆریستان‌و چارەنوسمان

سێهەم بەشی کۆڕەکە (سەردەم – تیرۆر – چارەنووسی ئێمە) چارەنووسی ئێمە ئەگاتە کوێ؟ ئێمە ئازارمان بینیوە بەدەست ئەم تیرۆریستانە و ئاخرین ئازاریش ئەو کارە ناجوامێرو تاوانەیە کە لەهەولێر ئەنجامیاندا؛ لەیەك چرکەساتدا بارەگای یەکێتیی‌و پارتییان تووشی کارەساتی جەرگبڕ کرد، ئەوان پێیان وابوو رەنگە لەو بەرپرسانە زیاتریش پێوەبن‌و بەتەقاندنەوەی هەردوو بارەگاکە پشتی یەکێتیی‌و پارتی ئەشکێنن، من پێم وایە زەرەرێکی زۆرمان کرد، بەڵام لەبەرامبەریشدا گەورەترین سۆزی جیهانی‌و میللی میللەتەکەی خۆمان

وروژاو لــەدەوری ئەزمونەکــە کۆبونــەوەو جــارێکی تــر بەپێــچەوانەی نەخــشە گڵاوەکــانی ئەوانــەوە, ئــەو خۆپیــشاندان‌و ناڕەزاییــەی لــەناو کــوردی تاراوگــەی ئەوروپا, بەرامبەر بەوتاوانانە ئەنجامدرا, مەگەر بەس لەکاتی کارەساتی هەڵەبجە ئەوە ئەنجامدرابێت, کە کورد ئەوکاتە کەمتریش بووە لەئەوروپا, بۆچی؟ چونکە تاوانەکە قێزەون‌و ناجوامێرانە بـوو. لەبەرئـەوەی ئـەم تیرۆریستانە بەشێکن‌لـە تۆڕی تیرۆریزمی جیهانی‌و بەنەخشە دوای روخاندنی تالیبـان قوتکرانـەوە, دەبـێ بزانین ئەمانـە ماوەیـەکی تـریش کوردسـتان سـەرقاڵ ئەکـەن, عێـراق‌و باشـوورو ناوەندی عێراقیش سەرقاڵ ئەکەن, جۆرەها کارەسات‌و کاری نـاجوامێریی تـریش ئەنجام دەدەن. من ناتوانم فاڵ بگرمەوەو بزانم چەند مـانگ یا چـەند سـاڵ شـەڕ لەگەڵ تیرۆریستان ئەخایەنێت؟ بەڵام ئەشزانم بەمانگێك‌و دوو مانگ تـەواونابێت, شـەڕ لەگــەڵ ئەمانــە, لەگــەڵ دوژمنــەکانی دیموکراســی‌و ئــازادی لەمێــژووی شۆڕشــەکانی دیموکراســیدا هــەروابووە, کارەســات‌و قوربــانی زۆر بــووە, هــەتا لەناوبران. دەبێ بۆ ئەم شەڕەش کوردو ئـازادیخوازان سـەنگەر بگرین. نائومێد مــەبن, شــەڕی پــرۆژەی دیموکراســی لەبەرامبــەر پــرۆژەی فۆندەمەنتالیــستی پرۆژەیەکــە ئەخایــەنێت, شــەڕی ســەربازی تیایــە, شــەڕی کۆمەڵایــەتی تیایــە, شەڕی‌کلتوری تیایە, شەڕی سایکۆلۆجی تیایە, شـەڕی پێشکەوتن‌و سەربەسـتی ژن‌و یەکسانی ژن‌و پیاوی تیایە. شەڕی ئـازادی بـیرو ئـازادی ویژدانیـشی تیایـە, هــەموو شــەڕەکانی تیایــە, خۆمــان حازربکــەین بــۆ هــەموو ســەنگەرەکانی ئــەم شەڕانە, بەرامبەر بەم تاوانبارانە بــەهێزبین‌و تێبکۆشـین. خەمـساردی‌و بێباکیی جارانی پارتی‌و یـەکێتیی بەرامبـەر هێـزە ئیسلامگەراکان هـەیانبوو, ئـەبێت ئـەو خەمــساردی‌و بێباکیــە وازلێبێــنین, ئــەبێ پــەیمانێکی بــەهێزتر, پرۆژەیــەکی ئــابووری, خزمــەتگوزاری, یاســایی, مــەدەنی, دیموکراســی‌و ئــازادی باشــتر جێبەجێبکەین. هەموو جۆرە بێباکی‌و خەمـساردیەك دژی تـیرۆرو کۆنەپەرستی لەقازانجی سەلەفیەکانە؛ ئەگەر چالاك‌و بەگوڕتر نەبین, لەبەرامبـەر سـەلەفیەتدا, زەرەری زۆرتـر ئەکـەین چونکە ئەمانـە دەستهەڵناگرن لـەتاوان. چـونکە مـاوەو مەودای کەمیان لەبەردەمدا ماوە. هەربۆیە خێرا خێرا هەڵمەت دەبـەن. وریاشـین بەرامبـەریان. پێـرێ (١٧) کـەسمان لەسلێمانی گرتـوە, هـەر (١٧)یـان خۆیـان

حـازرکردووه, تەقینــەوەی زۆر گەورەبکـەن, چــەند کەسێکیـشیان رایـانکردوە, تۆڕەکە زۆر گەورەبووە, بێگومان ئەم دوو مانگە لەژێر چاودێریدان, ئەمانە لـەژێر چاودێری وردی ئاسایشی ئێمەدان, ئاگادارین, ئەوانـە گـێلن, وائـەزانن ئاگامـان لەئاسایشی خەڵك نییە, وائەزانن ئیش‌وکارێکمـان نیـە تـەنها لـەکۆڕو کۆبنـەوەدا قسەی زل ئەکەین, نـەخێر ئاگامـان لـەزۆر شـت هەیـەو ئاگادارین تـاوانی تـریش بەڕێوەیـە, مـژدەتان ئـەدەینێ کـە رسـوایان ئەکـەین, ئـەو تاوانـەش پوچـەڵ دەکرێتــەوە. ئەوانـە لەدواسـەرەنجامدا, لەدەسـتمان دەرناچـن, جارجـار وەکـو ماسی لەتۆڕدەرئەچن‌و تاوانێك ئەکەن بەرامبەرمان, بـەڵام بـەزۆری پیلانـەکانیان پەك دەخەین. بەتایبەتی خەڵك زۆر هاوکاری ئاسایش‌و پۆلیسن.

ئەزمونی کوردستان, بناغـەی باشـی دارشتووە. ئـەزمونێکی کوردسـتانی‌یەو سروشتێکی تایبەتی لەناو چوارچێوەی گشتیی دیموکراسیدا هەیـە. ئەزمونەکـە لەو بابەتـەی کـە لـە باشـورو ناوەنـدی عێراقـدا هەیـە, نی‌یـە, وێنەیـەك نیـە لـەو حاڵەتەی لەباشور و ناوەندی عێراق هەیە, نە لەبارەی پێکهاتـەی قەومیـەوە, نـە لەباری پێکهاتەی کۆمەڵایەتیەوە, نە لەبارەی پێکهاتەی کلتوریەوە, نە لە خـاك‌و ئـەرزو نیشتمانەوە, لەهیـچی ئەمانـەوە ئـەزمونێك نـین دووبـارەکراوەی باشـورو ناوەنـدی عێـراق بـین, تـازە کوردسـتان رەوتـی تایبـەتی خـۆی دۆزیـەوە. ناشگەڕێتەوە دواوە. لەباری شارستانیەوە, لەباری فکریەوە, لەباری سیاسیەوە, لـەباری خۆئامادەکردنـەوە, لەباشـورو ناوەنـدی عێـراق جیایـە و ئامـادەین بـۆ ئەگەری تریش, ئامادەین بۆ ئەوەی فرسەتی تریش لەکیس نەدەین, وەکـو چـۆن لەبەغدادا بـاش ئامـادەبووین بـۆ دوای روخـانی رژێـم, هـەلی‌تریش بێتەپێشەوە, باش ئامادەین, ئامادەین چ شەڕی ئـەم تیرۆریستانە هـەتا لـەناوبردنیان بکـەین, ئامادەین فرسەتی سیاسی تر بێتەپێشەوە بەچاکی بیقۆزینەوە, ماوەتەوە بڵێین: لەگـەڵ تـیرۆردا هـیچ جـۆرە سازشـێك نیـە, نـە گفتوگۆیـان لەگـەڵ ئەکـەین, نـە لەگەڵیاندا دائەنیشین, ئەشزانین لەکوێوە دێـن, چـی ئەکـەن, چی‌ناکەن, خـەمی ئەوەشتان نەبێت باش باش ئەزانین.

دڵنیابن ئـەزمونی کوردسـتان لەخـەم رەخـسیوە, لەخـەمی ئـەوە مـەبن ئـەم جانەوەرانە بتوانن ئەزمونەکە هەڵبدێرن, یان تووشی کارەساتی چارەنوسسازمان

بکــەن, نــاتوانن وەکــو جەزائیریــشیمان لێبکــەن, وامــان لێنایــەت, وەکــو ئەفغانستانمان هەر لێنایەت, وەکو پاکستان‌و ئەمانەمان لێنایێت, چونکە ئەمانـە لەکوردستاندا, لەناو دەریای خەباتی رزگاریخوازی نەتـەوەیی کـورددا, تـەیارێکی تـەریکی کۆنەپەرسـتی شەمـشەمەکوێرەئاسان, کـەمترین خـەڵکیان لەگەڵدایـەو لەدوای روداوەکانی (١١)ی سپتمبرەوە, دونیا باشتر وشـیاربۆتەوە بەرامبـەریان‌و ئیحتیاتی زۆر باش کراوە بەرامبەریان.

ئـاخر قـسەو کۆتـایی قـسەکەشم ئەوەیـە, جگـە لـەم ئەزمونـەی کـە خۆمـان بۆخامانمـان بینـاکردووە, سـەرکەوتووین‌و پێـشکەوتووین‌و بەشـایەتی دۆسـت‌و دوژمــن توانیومانــە نمونــەی جــوان پێـشکەش بکــەین, ئێـستا هــیچ وەفــدێك, پەرلەمانتارێك, رۆژنامەنووسێك, نایـەت بـۆ کوردسـتان‌و داوانـەکا عێـراق لەسـەر مۆدێلی کوردستان بینابکرێت, ئەمەش شانازییەکی گەورەیـە بۆکـورد؛ کوردێکی بەدبەخت کە بەدرێژایی مێژوو هەر هاڕیوینیان, ئێستا لەدوای ئەو هاڕینـە, وەکـو گەنم چۆن ئەیبەیتە باراش ئەیهاڕیت ئەیهاڕین سپی‌و جوان دێتەدەرەوە, ئێمـەش وا سـپی‌و جـوان هاتوینەتــەدەرەوە, بـەجوانی خۆمـان حـازرکردوە بـۆ شـتی جوانتریش, بـەهیوای.. دوارۆژێکـی جـوانترین بـۆ کوردسـتانی عێـراق‌و نەتـەوەی کورد لەهەموو بەشەکانی کوردستاندا.

## ئاین‌و دەسەڵات

## لەناو نەوە جیاوازەکاندا (+)

ئێوارەی فێستیڤاڵتان باش، ماندوونەبن، زۆر سوپاس بۆ برای ئازیز دکتۆر فەرهاد پیرباڵ کە هەمیشە خەونی جوانی هەیە، یاخی دەبێ لەدەقە چەقبەستووەکان، شتی تازە دەڵێ، زۆر سوپاس بۆ بۆچوونەکانی‌و پێشم وایە خراپی نەوت، زۆر جوان باسی کرد کە لەدژوارترین رۆژگاردا گەنجەکانی ئەو سەردەمە چییان کردووە بۆ نەتەوەکەمان، پێم وابێ بەشێك لەباسەکەی پەیوەندی بەباسەکەی منیشەوە دەبێ، (ئاین‌و دەسەڵات لەناو نەوە جیاوازەکاندا) تاقە تێبینی کە پێویست دەکات لەگەڵ کۆڕەکەمدا بیبەستمەوە لەسەر باسەکەی، دواییش ئەگەر بێتە ئێرە موناقەشەیەك لەنێوان ئێوەو ئێمە بکرێت خراپ نییە، ئەویش ئەوەیە گوایە گەنجی ئەم سەردەمە غەدری لێدەکرێت، ئەوەی ئەم سەردەمە لەسەر هەڵەیەك، کەموکوڕییەك، غەدری لێدەکرێت، من وەڵام نادەمەوە، تەنها ئەوەندە دەڵێم پێم وابێ ئەوەی ئێستاو گەنجی ئێستا ئەوەی کە کردویەتی بەدرێژایی مێژوی کوردو کوردستان نەکراوە، هەمو گەنجەکان‌و نەوەکانی پێشوو تێکشکان، تەنها نەوەکانی ئەم سەردەمە تێکنەشکاوە، لەهیچ پارچەیەکی کوردستان تێکنەشکاوە، ئەگینا ئەگەر تێکبشکاینایە دیار بوو چیمان بەسەردەهات، لەبەرئەوە ئەو پەیامە کە بەردەوامیی مێژویی پەیداکرد لەسەردەستی نەوەی ئێستاو گەنجی ئێستا پەیدای کرد، بۆیە هەمیشە وتومە نەوەی ئێمە نەوەیەکی بەدبەختو بەختەوەرین، بەدبەختین کە هەموو کارەساتەکانمان بینی، ئەنفالمان بینی، کیمیابارانمان بینی، راگوێزانی دێهاتەکانمان بینی، هەموو شتەکانمان بینی، خۆشەویسترین‌و

---

+ کۆڕێکە لەنۆیەمین فێستیڤاڵی گەلاوێژدا لەساڵی (٢٠٠٥)دا پێشکەشکراوە.

جوانترین هاوڕێکانمان شەهید بوون، بەختەوەریشین کە نەشکاین، خۆمان گرت هـەتا گەیاندومانەتـە ئـەم ڕۆژەو دڵنیاشـم زۆری نـەماوە خـەوە هەرەجوانەکـەی نەتەوەکەمان بەدی بێت، ئەم بابەتە زۆر بابەتێکی گرنگە، کە کاک دکتۆر فـەرهاد لاپەڕەیەکی لەسەر پەرۆشـی گـەنجان هەڵدایـەوەو بـەپارەی خۆیـان، بـەگیرفانی خۆیان، بەشەونخونی خۆیان چییان کردووە بۆ نەتەوەکەمان، لەکاتێکدا کـە زۆر زەحمەت بوو شت بکرێت، لەدووتوێی باسەکەمدا ئـەو بابەتـە دەبێ بەبابـەتێکی گرنگ.

## بۆچونی کراوە

ئـاین‌و دەسـەڵات لـەناو نـەوە جیاوازەکانـدا، پـێش ئـەوەی دەسـت بکـەم بەباسەکەم دەمەوێ پەیامێك لێرەوە لەرێگـەی نۆیـەمین فێـستیڤاڵی گەلاوێـژەوە بگەیەنم، بێگومان من قسەکانم ڕون‌وئاشکرایە، دیموکراسیم، علمانیم، چەپم، زۆر بەڕونی قسەدەکەم، موجامەلەی هیچیش ناکەم، نە موجامەلەی ئەوە دەکـەم کـە لەڕوی ئاینیـەوە لـێم عـاجز دەبـێ، نـە موجامەلـەی ئـەوەش دەکـەم کـە لـەڕوی مەزهەبیـەوە لـێم عـاجز دەبـێ، نـە موجامەلـەی ئـەوەش دەکـەم کـە لـەڕوی ئایدیۆلۆژیەوە لێم عاجز دەبێ، ئەوانە بیروباوەڕی خۆیان‌و منیش‌و ئەوانەی وەکو ئێمە بیردەکەنەوە، بیروباوەڕی خۆمان. بەکراوە بۆچونەکانم دەردەبڕم.

لێـرەوە دەمـەوێ ئـەو پەیامـە بگەیـەنم بڵـێم: کۆنەپەرسـتەکانی ناوچـەکە خەیاڵتان خاوە، ئەگەر ویستبێتتان من تیرۆر بکەن، بتانەوێ ئـەقڵی منـی لەگـەڵ تـیرۆر بکـەن، مـن بـەردەوامم لەسـەر پـەیامی خـۆم، بـەردەوامم بەئـەقڵانیتر، بەمەنتقیتر، هەتا ئەورۆژەی لەژیاندا مابم، دەست لەدژایەتیکردنی کۆنەپەرستی هـەڵناگرم، ئەمـە یەکێکـە لەئەرکـە هـەرە پیرۆزەکـانی سەرشـانم، شـان بەشـانی هەموو ئازادیخوازێك ئەمڕۆ لەکوردستان، پێم وایـە سیاسـەت‌و دیموکراسـی بـەبێ دوژمنایـەتیکردن‌و دژایـەتیکردن‌و ریشەکێـشکردنی کۆنەپـەرسـت‌و سـەرخـستنی دیموکراسی هیچ نرخێکـی نیـە، لێـرەوە دێمـە ناوباسـەکەم چـونکە ئـەویش هـەر پەیوەندی بەباسەکەمەوە هەیە، ئاین‌و دەسەڵات لـەناو نـەوە جیاوازەکانـدا، مـن هـەوڵ دەدەم ئاوڕێك لەئاینـەکان، ئاوڕێـك لەدەسـەڵات بدەمـەوەو بیبەسـتمەوە بەرۆڵی ئاین‌و دەسەڵاتەکان لەم سەردەمەدا، ئیشی من ئەمەیە لەم ماوەیـەی کـە قسەدەکەم، ئاین، هەموو ئاینەکان، مەبەستیشم ئاینە ئاسمانیەکانە دیاردەیەکی زەروری ژیانــە لــەزەمان‌و زەمینــەی خۆیــدا ســەریهەڵداوە، زەرورەتــی ژیــانی

کۆمەڵایەتی، ئاستەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی، سیاسی، روناکبیری، ئـابوری و سایکۆلۆژی ئەوکاتە، ئاستەکانی گەشەکردنیان لەدوای تاقیکردنەوەی ئەفسانەو داسـتان و خورافیـاتێکی پـێش ئاینـەکان، هەلومـەرجێکی وای خولقانـدووە کـە ئینسان پەنابەرێ بـۆ چارەسـەری تـر، بـۆ چارەسـەری رۆحیـی تـر، چارەسـەری میتافیزیکی تر، چارەسەری ئایدیالیستی تر، سەرەنجامی حوکمی وەلامـی لاوازی ئەفسانەکان بەدرێژایی مێژوو، لاوازترین وەلامـی ئەفـسانەکان بـۆ پرسـیاری ئـەو زەمان و زەمینەیەی کە بەشەریەت تیایدا ژیاوە، زەروورەتێکی تر لە مامانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی ئابوری و ژیانی فەرهەنگی ئەوکاتـە دروسـتبووە، ئـەو مامانـە پێویـستی بەلـەدایکبوونی ئـاینێکی تـرو رێگاچـارەیەکی تـری رۆحییـە، هـەروا پەیوەندی کۆمەڵایەتی و چۆنێتی بەرێوەبردنی ژیان کردووە، لەناو ئـەم مامانـەی زەروورەتی زەمانی خۆی ئاینـەکان لـەدایك بـوون. یـانی ئـاین لەخۆیـەوە دروسـت نەبووە، بەئاسـانی نـەخولقاوە، بەئاسانی نـەبووە، بـەو حەقیقەتـەی کـە ئێـستا لەدنیادا لانی کەم شەش ملیار ئینسان پەیرەوی ئاینەکان بکەن. پرۆسـەیەك نیـە لەخۆیەوە بەئاسانی سەریهەڵدابێ چ ئاینی جولەکە، چ ئاینی مەسیحی و چ ئـاینی ئیسلام، ئەم ئاینانە بێگومان جیهانبینیان بۆ جیهان، بۆ ئینسان بـۆ کۆمـەڵ، بـۆ دیاردەکانی سروشت بۆ گەردون جیاوازی تیایە، جیاوازی زۆر بنچینەیـشی تیایـە لەراستیدا، خیتابی ئەم ئاینانە، بۆچونی ئـەم ئاینانـە، فەلسەفەی ئـەم ئاینانـەو چۆنێتی پـەیامی ئـەم ئاینانـەو پەیامبـەری ئـەم ئاینانـە، هەرهـەمووی جیـاوازی بنـچینەیی تیایـەو بـەراوردکاری قـوڵی هەیـە، ئـەم ئاینانـە لـەلای ئەندێـشمەندە گەورەکانی لاهوتی لەعالەما ئاینی جولەکە خۆتان دەزانـن نـەیتوانی کـاتی خـۆی تێکـەڵاو بەدەسـەڵا ت بـێ، بۆیـە هـەتا دامەزرانـدنی دەوڵـەتی ئیـسرائیل، وەکـو دەوڵەتی جولەکە، جولەکەکان لەدنیادا پەرش‌وبڵاو بوون، بەڵام توانییان تقوسـی ئاییني و بنچینەکانی ئاینی خۆیان بپارێزن و ئـاین و ئابووریيـان تێکـەڵاو بەیـەك دەکرد، هەربۆیە لەهەرلایەکی ئەم دنیایـە بونایـە بـەهێزترین ئـابوری لەهەرلایـەك جولەکە ژیابێ ئەوان مۆنۆپۆلیان کردووە، بەشێوەیەك لەشێوەکان ئاین کەتیرەی کۆکەرەوەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە رۆحییەکانی ئـەوان بـووەو ئـەو کۆبونەوەیـە لـەدەوری ئـاین و هاوکـاریکردنی یـەکتریان وایکـردووە کـە بتـوانن لەهەرلایـەکی ئـەم دنیایـە بـژین، پەڵەیـەك، دوو پەڵـە، سـێ پەڵـە، لەشـارێك، لەبازاڕێکدا لـەدوو بـازاڕ، لـە سـێ بـازاڕدا، بـەهێزترین ئابوریيـان هـەبێ، ئەمـەش وایکـرد ئـاینی جولەکـە نەتوێتـەوەو وردەوردەش لـەدوای جـەنگی یەکـەم و دوای

جەنگی دووەم، وردەوردە هەر ئاینی جولەکە بووبەهۆی ئەوەی کە دەوڵەتێکی گەورە دروستبکرێت بەناوی دەوڵەتی ئیسرائیلو هەموو دەوڵەتانی عەرەبی تائێستا دەرەقەتی نەهاتوون. یانی ئاینو ئابوری وەکو پاشکەوتێکی گەورەی مێژوویی جولەکە مایەوە هەتا لەیەکێ لەهەلومەرجە جیهانیەکاندا ئەمیش تێکەڵاو بەدەسەڵات بوو، نەك هەر دەسەڵات بگرە ئێستا منزرەکانی جولەکە دەڵێن نەتەوەی جولەکەش هەیە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستداو سەرەنجام ئاینو ئابورییەکی تێکەڵاو بەدرێژایی مێژوو، زەمینەی خۆشکرد کە دەوڵەتێکیش بەناوی دەوڵەتی ئیسرائیل دابمەزرێ، هەقمان بەسەر سیاسیەکانیەوە نیە تا چەند قبوڵمانە؟ تا چەند قبوڵمان نیە؟ خۆتان دەزانن ئێمە زۆربەی هەرەزۆری تێکۆشەرەکانمان تەمەنی خۆمان دژی ئیسرائیلو ئیمپریالیزم برۆدتەسەرو ئێستاش لایەنگری رزگاربوونی فەلەستینینو دەوڵەتی فەلەستینینو پایتەختێکیشی هەبێ کە قودسیش بێ، ئێستاش لایەنگری ئەوەین، بەڵام ئەمە پەیوەندی بەباسەوە هەیە، ئێمە قسەمان لەسەر ئاینو کاریگەری ئاین لەسەر رێڕەوە مێژووییەکان.

## ئاینو سەرخان!

دوای ئەوە کە ئایینی مەسیحی سەریهەڵدا، خۆتان دەزانن مەسیح لەگەڵ ئەوەنەبوو نە دەسەڵاتی هەبێ نە تێکەڵاو بەدەسەڵات بێ، مەسیحو مەسیحیەت خیتاب بوو لەگەڵ تاك، ریفۆرم بوو بۆ تاك، چاکردنی رۆحی ئینسان بوو، ناخی ئینسان بوو، مەسیح هەتا مرد خۆیو موریدە گەورەکانیشی، نە بەرنامەی دەسەڵاتیان هەبوو، نە کودەتایان کردوە، نە هەوڵیشیان دا بچنە هیچ دەسەڵاتێکەوە، قسە بەناوبانگەکەی مەسیح زۆر جوانە کە دەڵێ (ئەوەی بۆ خوایە بۆ خوای بەدێبهێڵن ئەوەی بۆ قەیسەریشە بۆ قەیسەری بەجێبهێڵن) یانی جیاکردنەوەی ئاینو دەسەڵات لەیەکتر، هەروا هەتا لەچوارمێخەکێشراو هەتا دوای ئەوە بەپێی سەرگوزشتەکانی ئاینی مەسیحی مەسیح زیندوودەبێتەوەو دێت لەگەڵ موریدەکانی کۆدەبێتەوە، ئامۆژگاریەکانی بۆ موریدەکانیش هەر هەمان ئامۆژگاری دەبێ کە لەژیانی خۆیدا هەیبوو. دوای ئەوەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی توشی قەیرانێکی گەورەی ئایدیۆلۆژی دەبێت، فەلسەفەی حوکم توشی قەیرانێکی گەورە دەبێ، هانا دەبا بۆ ئاینی مەسیحیو مەسیحیەت دەکات بەئاینی فەرمیی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیو کاری پێدەکاتو ئیش دەکەن بۆئەوەی کە لەهەموو دنیادا مەسیحیەت ببێ بەفەلسەفەیان، ببێ بەئایدیۆلۆژیەتیانو

لەدەوری خۆیان ئەو لێكدابڕانو ئەو سەرلێشێواویە ڕۆحیەی كە لەناو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا دروستبووە هەوڵیاندا ئاین بكەن بەكەتیرەیەك بۆ پێكەوەبەستنەوەی سەرلەنوێی دەسەڵاتی ڕۆمانی لەدنیادا؛ كەوابێ، ئاین زەرورەتێك بووەو هەر بەزەرورەتیش دەسەڵاتەكان هانایان بۆبردووە، دەسەڵاتیش لەژیاندا بەئارەزوو دروست نەبووە، قەیسەرێك، ئیمپراتۆرێك، كەسێك، بەئارەزوو دەسەڵاتی دروست نەكردووە، دەسەڵات زەروریەتی ئابوری، كۆمەڵایەتیو سیاسیەكانی سەردەمەكانی خۆی خولقاندونی، لەدوای تەواوبوونی ژیانی سەرەتای بەشەری، ئیتر پەیوەندیەكانی بەرهەمهێنان بەرەو سیستەمی كۆیلەیی ڕۆشتووەو سیستەمی كۆیلەیەتی وردەوردە دەسەڵاتی دروستكردوەو دەسەڵاتەكە وردەوردە هەتا هاتووە فراوان بووە، ئیتر دەسەڵاتی كۆیلایەتی، دەسەڵاتی فیودالیو دوای دەسەڵاتی سەرمایەداری، هەوڵێكیش درا بۆ دەسەڵاتی سۆسیالیستی شكستی خواردو ئێستاش خەوی سۆسیالیزم لەلای سەدان حزبو ڕێكخراو هەیەو لەلای ملیۆنەها ئینسانی تێكۆشەرو روناكبیر هەیە، یانی دەسەڵات وەكو پێویستیەك لەپێویستیە هەرە چارەنوسسازەكانی بەڕێوەبردنی كۆمەڵو تاكی كۆمەڵو دامودەزگاكانی كۆمەڵو پێویستیەكانی كۆمەڵ لەگەورەوبچوكیەوە، وەكو زەرورەتێك لەزەرورەتەكانی پەیوەندیە كۆمەڵایەتیەكان پەیوەندی بەچینایەتیەكانو زەرورەتە یاساییەكانی ژیان دەسەڵات خولقاوە، دەسەڵات شتێك نەبووە ئارەزوو خولقاندبێتی، زەرورەتێك پاڵپێوەنەری گۆڕانو گەشەكردنەكانی ژیان بووەو پێویستیەكانی ژیان خواستویەتی كە دەبێ دەسەڵاتێك بۆ بەڕێوەبردنی ژیان هەبێ، بۆیە دەسەڵاتیش لەسەردەمی كۆیلەیەتیەوە، لەسەردەمی خێزانەوە بۆ سەردەمی كۆیلەیەتیو لەسەردەمی كۆیلەیەتیشەوە بۆ سەردەمەكانی تر، دەسەڵا تیش وەكو پێویستی خولقاوە، كەوابێ، چ ئاین چ دەسەڵاتە سیاسیەكانی دنیا، شتێك نین فەیلەسوفێك لەفەیلەسوفەكان بەرنامەكەی بۆ داڕشتبێو سەپێنرابێ، شتیش كە نەسەپێنرابێو ئەندێشمەندێك لەئەندێشمەندەكان لەخەیاڵدانی خۆی شتی وای دروست نەكردبێ، كەوابێ ئاینو دەسەڵا ت بۆ زەرورەتێك لەزەرەرەتەكان خولقاندبنی، كەواتە بەردەوامی ژیانیان دەمێنێ، هەتا ئەوكاتەی زەمینەی پێویستیەكانی ئەو دوو مەسەلەیە دەمێنێ لەژیاندا یانی بەبەردەوامی ئاینو دەسەڵات كە خەیاڵدانی كەسێك نەیخولقاندبێ، زەرورەتێك وایكردبێ بخولقێت، كەواشبێ، بەردەوامی مێژوویی خۆیان هەر ئەدۆزنەوە، ئەمانە لەهەموو قۆناغەكان لەقۆناغەكانی ژیان، بەردەوامی خۆیان دەدۆزنەوەو خۆیان لەگەڵ

هەلومەرجەکان دەگونجێنن. من جارێکی تریش ئەم قسەیەم کردوەو دەیڵێمەوە، من ئەو تێزە بێپێزانەم کە پێی وایە ئاین بەشێکە لەسەرخانی ژێرخانی کۆمەڵ، ئەمە بەتێزێکی بێپێز دەزانمو خۆزگە وابوایە، پێشوەخت دەڵێم خۆزگە وابوایە، خۆزگە ئاین رەنگدانەوەی ژێرخان بوایە، چونکە ئەگەر وابێ، ئاینەکان لەکۆتایی ژیانی سەرەتاییو لەسەردەمی کۆیلایەتی کە سەریانهەڵدا، ئەوکاتە ئاینەکان ئەشێ بڵێین سەرخانی ژێرخانی سیستەمی کۆیلایەتی بوون، بەنەمانی سیستەمی کۆیلایەتی دەبوایە لەسیستەمی فیودالیا تەواوبن، ئەگەر لەسیستەمی فیودالیشدا تەواونابن، خۆ دەبو لەسەردەمی سەرمایەداریدا تەوابن، لەسەردەمی سەرمایەداریشدا ماونو بەهێزیشن، لەسیستمەکانی ترو لەسەرخانەکانی تریشدا هەر ماوونو بەهێزیشین، هەتا ئەوەی کە بەناوی سۆسیالیزمەوە دروستکراوە، هەولێشدرا ئاین نەمینێ، ئاین هەر ماوە، بینیمان لەکۆتایی (١٩٩٠)ەوە کە کاتێك ئەوروپای رۆژهەڵات هەرەسی هێنا، سەرلەنوێ چۆن کەنیسەکان، چۆن ئیسلام لەناویاندا سەریهەڵهێنایەوە، دروست بوون لەناویانداو ئێستاش کە زۆربەی دەوڵەتەکان ئاینی رەسمییان نیە، بەڵام ئاین بونێکی کۆمەڵایەتی، فکری، رۆحیو سایکۆلۆژی بەهێزە لەولاتاندا، یەکجار بەهێزیشە، لەلای تاکی ئینسانەکانی ئەو کۆمەڵە، کەوابێ دەبێ بەوجۆرە ئاینەکان مشتومال بکەینەوە کە ئاین وەکو هەموو شتێك، وەکو باقی بوارەکانی روناکبیریو یاسایی کتومت رەنگدانەوەی ژێرخان نیە.

## جیاوازی ئاینو فەلسەفە

مەسائیلی تر هەیە لەژیاندا کە زۆر پێویستی بە لێکدانەوەی بنجوبنەوان هەیە بۆئەوەی بزانین بۆچی ئاین جیاوەازە لەفەلسەفە، بۆچی ئاین جیاوازە لەئایدیۆلۆژیەت، بۆچی جیاوازە لەمەسائیلی پیشەسازی، بۆچی جیاوازە لەهەندێ مەسائیلی ئەدەبی، جیاوازیەکەی لەچیدایەو دەبێ دیاری بکەینو ئایندەش لەبەرچاوبگرین، بزانین ئەم جیاوازیە هەتاکەی دەمێنێو کەی ئاڵوگۆڕی ریشەیی بەسەر ریشەکانی ئاینو کاریگەریەکانی ئاین لەسەر ئینسان دێت، دەسەلاتیش هەروەها هەموو سەردەمێك لەسەردەمەکان دەسەلاتی خۆی هەبووەو دەسەڵاتەکانی گۆڕیوەو توانیویەتی خۆی لەگەڵ واقعەکەدا بگونجێنێ، تاقە جیاوازی کە لەنێوان ئاینەکانو دەسەڵاتدا هەبێ، ئەویش ئەوەیە بەشی زۆری بنچینە سەرەکیەکانی ئاینەکان چەقی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بەستوە

ناگۆڕێ، کفره بیگۆڕی، موقەدەسە، هیچ موجتەهیدێك بۆی نیە بیگۆڕێ، هیچ کەسێك بۆی نیە دەستکاری بکات، دەستکاری بکەیت گوناحت گەیاندوە، کفرت کردووە، تۆ زەندەقیت، تۆ خەتەرناکیت لەسەر ئینسان‌و ئینسانیەت. بۆیە دەستکاری ڤاریزەیەکت لەکتابە پیرۆزەکاندا کردووە، ئەمە بەدرێژایی مێژوو ئاین هەر وابووە، وایان هێشتۆتەوەو تائێستاش هەروای دەپارێزن، دەسەلات وانیە، دەسەلاتی کۆیلەیەتی، دەسەلاتی فیودالی، دەسەلاتی سەرمایەداری شێوەی جۆراوجۆری هەبووەو هەمیشە لەئالوگۆڕو گۆڕانکاریدا بووە، لەوکاتەدا (حامورابی) یاسای داناوە تا ئەمکاتە کە عێراق دەستوری داناوە، هەزاران جۆر ئالوگۆڕ بەسەر یاساکانی جیهان‌و بەسەر ئەقلی یاساڕێژەکانی جیهان هاتووە، بەسەدان جۆر دەستور نوسراوەو گۆڕاوە، بەسەدان یاسا، بەهەزاران جۆر بەندی یاسایی لەدنیادا گۆڕاوە، بەهەزاران شێوە سیستمەکانی دنیا دەستکاری کراون، ئەمەش سروشتێکی زیندوترو دینامیکیترو رێكوپێکترو باشترە بۆ ژیان‌و هەرئەمەش دەگونجێ لەگەڵ مەنتق، لەگەڵ ئەقڵ‌و لەگەڵ پێویستیەکانی گۆڕان‌و گۆڕانکاری، نەك نەیگۆڕی، شتی نەگۆڕ لەهیچ شتێکدا ناتوانێ هاوئاهەنگی گۆڕانکاریەکانی ژیان بچێتە پێشەوەو دوایی کە نەتگۆڕی، نەك ناچێتەپێشەوە، بگرە دەبێ بەکۆسپ لەبەردەم گۆڕان‌و گۆڕانکاری‌و دەبێ بەبەشێك لەژیانی سەلەفی‌و سەلەفیەت. دەبێ بەبەشێك لەکۆنەپارێزی‌و لەکۆنەپەرستی، ئایدیای دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر ئێستا بیسەپێنی، سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر ئێستا بیسەپێنی، کە لەو زەمانەی سەریهەڵداوە هیچ دیاردەیەکی ئێستای تازەنەبووە، بەزۆری زۆرداری دیاردە تازەکانی ئێستا لەقاڵبە کۆنەکانی دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر بدرێ، ئەمە بێگومان لەگەڵ هیچ شتێك لەشتەکانی مەنتق ناگونجێ، لەقسەیەکی مەسیحدا، لەبنچینیەکی ئایینی جولەکەدا لەکاسۆلیکدا، لەشیعەدا، لەسوننەدا، لەهەرشتێك لەشتەکاندا تێکستێك دەردەهێنی، دێڕێك دەردەهێنی، سورەتێك دەردەهێنی، ئایەتێك دەردەهێنی، چەقبەستوەکان دەڵێن: ئەم تێکستە دوو هەزار ساڵ لەمەوپێش مەبەستی پێشکەوتنە تازەکانی ئێستا بووە بۆئەوەی ئەم مەبەستە کە بەئارەزوو لێکیدەداتەوە لەگەڵ ئەم پێشکەوتنی دنیایە بگونجێنێ، ئەمەیان شتێکە بەڕاستی لەگەڵ هیچ لۆژیکێك‌و لایەنی کەمی گۆڕانکاریەکاندا ناگونجێ. دەڵێن جارێکیان مەلا لەمزگەوتێکدا قسەی بۆ جوتیار کردووە، پرسیاری کردووە وتویەتی دەزانن ئەم دنیایە چۆن دروست بووە؟

جوتیارەكانیش وتویانە نەوەڵڵا مامۆستا، وتویەتی ئەم دنیایە لەسەر شاخی گایە، گاكەش لەسەر پشتی ماسیە، ماسیەكە لەناو دەریادا هاتوچۆدەكات، ئەم ماسیە بەحاڵ بجوڵێ گاكە دەكەوێتەخوارەوەو كە گاكە كەوتەخوارەوە ئەرزو ئاسمان هەمووی دەكەوێتەخوارەوە، جوتیارێكیش هەڵیداوەتێ لەولاوەو وتویەتی: مامۆستا ئەم تركەڵەكە قەت سەرناگرێ، ناكرێت تۆ ژیان وا پێكبهێنی، قاڵبەكانی ژیان وا پێكبهێنی كە هەرچیەك كە ئێستاش روودەدات بیخەیتە قاڵبی رابردووەوەو هەرچیەك كە ئێستا بەباشی نازانی بەكفرو ئیلحادو زەندیقی بزانی، ئەمە ناكرێ، ئەمەیان رێك كۆنەپەرستیە، دەرگای ئیجتیهاد قفڵ بدەی، دەرگای تەفسیر قفڵ بدەی، ناویشی بنێی موقەدەسە، بەخوێندنەوەی من هەر تێكستێك بكرێتە موقەدەس، دەرگاو پەنجەرەو كلاورۆژنە لەبەردەم ئینسان، زانا، موجتەهید، مەلای گەورە داخست كە بۆی نیە دەستكاری هیچ شتێك لەو تێكستە موقەدەسانە بكات، بێگومان ئەوكاتە ئەم قودسیەتدانە بەهەموو تێكستەكان وادەكات كوشتن، لەناوبردن، سڕینەوەی بەرامبەرو سەركوتكردنی بەرامبەرو هەرچیەك پێچەوانە دروست دەبێت، هەمووی بەموقەدەس‌و حەلاڵ بزانیت ئەمە یەكجار خەتەرناكە، خەتەرناكە كەس نەوێرێت لاقەی هیچ شتێك بكات بەناوی ئەوەی كە ئەمە موقەدەسە، موقەدەسە بەسەرچاو، من سەرپشكم، حەزدەكەم بڵێم من دژی ئەوەنیم ئاین هەبێت‌و خۆشم بەپیاوێكی مولحید نازانم، بەڵام گفتوگۆكردن‌و دیالۆگكردن‌و هەڵسەنگاندنی هەمووشتێك، بەرەوا دەزانم هەتا ئەورۆژەی قەناعەتی گشتی ئاینەكان لەدنیادا دروست دەبێ‌و قەناعەتێكی یەقینی بۆ دیاردەكانی ژین دروست دەبێت، لەنوقتەی عەدەمەوە بۆ ئەم رۆژەی ئێمە. هەتا تەواوی نهێنیەكان نەدۆزرێنەوە لەسەر گەردوون، ناكرێ تەواوی ژیان لەئاین‌و مەزهەب بەتاڵ بكرێتەوە.

بەش بەحاڵی خۆم بەشێوەیەك لەشێوەكان بونی ئاینەكان لەژیاندا بەپێویست دەزانم، بەڵام ئەمە بەومانایە نیە بەپێویستم زانی ئیتر ئەوەندە موقەدەسە نابێ توخنی بكەوم، ئەمە نابێت كە توخنی نەكەوتی ئەوە مانای ئەوەیە كە كۆمەڵێك كۆسپی كۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابوری، شەخصی، سایكۆلۆژی، رۆحیی لەناخی ئینساندا، لەژیاندا، لەناو كۆمەڵدا، لەناو نەتەوەكاندا كۆسپی گەورەگەورە دەخوڵقێنی‌و تێكستەكانیش دەكەیتە تەلسمێكی دەسكارینەكراو. ئەنجامیش لەباتی پرسیاركردن لەدیاردەكان، گرێكوێرەی

دەرونی‌و رۆحی دروست دەبێ. ئەم گرێکوێرانە نەکەیتەوە ناتوانی هاوئاهەنگ لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا بچیتەپێشەوە، هەزاران دەستکەوتی ژیان هەیە دەبێ ئەم دەستکەوتانە وەربگری‌و بیخەیتە بەرنامەوەو پەرەی پێبدەی، خۆتی پێبگۆڕی‌و بچیتەپێشەوە لەگەڵیا، بۆیە مەسەلە ئاینیەکان لەگەڵ مەسەلە دنیاییەکان، ئاینەکان‌و دەسەڵاتەکان ئەمە مەسەلەیەکە دەبێ بزانین چۆن لەگەڵ نەوەکاندا مامەڵە بکەین، لەگەڵ نەوە جیاوازەکاندا، نەوەی سەردەمی کۆیلەیەتی، نەوەی سەردەمی فیودالی، نەوەی سەردەمی سەرمایەداری، سەرمایەداریش قۆناغەکانی گەشەکردنی زۆری هەیە، قۆناغی سەردەمی شۆڕشی (بوخار) قۆناغی سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی، قۆناغی سەردەمی ئەلکترۆنی، قۆناغی سەردەمی سەتەلایت، ئەنتەرنێت، کۆمپیوتەر، ئەمە هەمووی جیاوازەو جیاوازی ناکرێ هەتا لەسیستەمی سەرمایەداریداو لەسایەی دەسەڵاتی دیموکراسی سەرمایەداریشدا لەبەرچاونەگیرێ. ئێستا لەئەمریکا، لەرۆژئاوا ئاینەکان یا دەسەڵاتەکانیان، دەستورەکان مامەڵەیان لەگەڵ نەوەی ئەنتەرنێت هەمان مامەڵە بێ کە کاتی خۆی لەگەڵ نەوەی پیشەسازی بوخارادا دەیانکرد، یا کاتی خۆی لەگەڵ نەوەی پیشەسازی میکانیك دەیانکرد، کارێکی ناقۆڵا دەبێ. پیشەسازی کە سەرەتا سەریهەڵدا بەبوخار سەریهەڵدا، دوایی بوو بەمیکانیك، دوایی وزەی نەوتی بۆ پەیدا بوو، ئەم قۆناغە جیاوازیانە لەژیانی شۆڕشی پیشەسازیدا تائێستا گەیشتۆتە ئەتۆمی، ئێستا ئەوەتا ژورێکمان بەرامبەر بەئێوە داناوە سێ خەتی ئەنتەرنێت لەحزەبەك بچۆ لەوێ دانیشە قسە لەگەڵ ژنت دەکەی، لەگەڵ دەوڵەتان دەیکەت، لەگەڵ رۆژنامەکان دەیکەت، بەلەحزەیەك پەیوەندییان پێوەدەکەیت، چۆن ئەم لەحزەیە کە هەموو جیهان دەهێنێتە بەردەستت، جیاواز نیە لەگەڵ ئەو لەحزەیەی بە دەساڵیش نەتدەزانی هەواڵی جیهان چییە، ئێستا بەچرکەساتێك هەواڵی هەموو دنیا دەزانی، لەبەرئەوە لەئەوروپا پەروەردەکانیان، ئاڕاستەکانیان، فەلسەفەکانیان، بیروبۆچونەکانیان لەگەڵ ئەو نەوەیە کە مامەڵە لەگەڵ ئەم پێشکەوتنە تەکنەلۆجیایەیە، لای ئێمەش هێشتا بچن سەیری مزگەوتەکانمان بکەن، بچن سەیری حزبە سیاسیەکانمان بکەن، ئەوانەی کە بەناوی دینەوە قسەدەکەن، ئەوە هەموو رۆژنامەو گۆڤارەکانیان هەیە، بەرنامەکانیان لەبەرچاومانە، لایەك دەڵێ خەبات دەکەم سەردەمی عوسمانیەکان بهێنمەوە، لایەك دەڵێ خەبات

دەکەم هی سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان بهێنمەوە، ئەمە تـەواو هـاتو تێپـەڕی، هـەر روبارێـك كۆكەيتـەوە بیبەیتـەوە سـەرەوەو بیڕێـژی، سـەرلەنوێ بەڕێڕەوەکەدا بێتەخوارەوە، وەکو خۆی جارێکی تـر نایەتـەخوارەوە، نـەوەکانو گۆڕانکاریـە کۆمەلایەتیـەکانیش هـەروان. نـەوەی ئێـستا، لەگـەڵ ئـەقڵی ئێـستا، لەگەڵ ئینسانی ئێستا، لەگەڵ ژیانی ئێستا بیگونجێنـە چ پێویـستت بەوەیـە تـۆ حزبـت هـەبێ، بۆئـەوەی خـەڵك ئـاینی هـەبێ، یـا نـەبێ، ئـەم خـوا گەورەیـەو پێغەمبەرو قورئانەو ئەم ئینجیلەو ئەم تەوراتە چ پێویستی بەئینـسانە حزبـی بـۆ دروست بکات، خوا بۆ بچوك دەکەنەوە، سکرتێری ئەم حزبانە لەخوا گـەورەترن، تا قەناعـەت بەئێمـە بکـەن مـن ببم بەسـەلەفی، مەکتـەبی سیاسـی ئـەم حزبانـە لەپێغەمبەر گەورەترن تا قەناعەت بکەن مـن ببـم بەسـەلەفی، رۆژنامـەو گۆڤـاری ئەم حزبانە لەقورئانو لەسونەتی پێغەمبەرو (نهج البلاغة) گـرنگترن تـا قەناعـەت بکەن بەمن ببم بەشیعە، یا بەسوننە، ئەگـەر لەوانـە گـەورەترن بـا بزانم، ئەگـەر گەورەتر نین خۆ ئەوانە هەمووی چاپکراونو نوسـراوە دەیخوێنمـەوە، قەناعـەتم پێ کرد پـەیرەویان لێدەکەم، قەناعەتیشم پێنە کـرد مـن خـۆمو خـۆ تـۆ دوایـی لەباتی من ناسوتێی، من دەسوتێم لەودونیا، نە لەم دنیا مۆری پێغەمبـەرت پێیـە تـا هەویەیـەکم بـدەیتێ، بلێـی ئـەوە هـی موسـلمانی سـەردەمی پێغەمبـەرە، مۆرەکەت لەگیرفان بێ ئـیتر دلنیـابم، نـە لـەودنیاش لەسـەر تەنەکەیـەك لەسـەر سراتەلموسـتەقیم دادەنیـشی ئەنـدامی حزبەکـەت بم نەمپەڕێنیتـەوە، تـۆ لـەم دنیایەدا وەکو منیت، هـەقت هەیـە ئیختیـار بکـەیت یـا نەیکـەیت، لـەودنیاش تـۆ وەکو تاك دەچیتە دیوانی خوا، موحاسەبەت دەکات، نایکات، عـەفوت دەکـات، نایکـات، ئەتـسوتێنێ، ئەتباتـە بەهەشـت تـۆ وەکـو تاکێـك، حزبەکـەت لـەوێ شـەفاعەت بۆ مـن ناکـات تـا مـن ئێـستا ببم بەئەنـدامی حزبەکـەت، ئـەم دنیـاو ئەودنیاش بەهۆی تۆوە مسۆگەر بکەم، لەبەرئەوە بـەش بـەحالی خـۆم پـێم وایـە هەموو ئەم حزبانەی کـە دروسـت بـوون، حزبـە ئیـسلامیەکان، مـن لەکردنـەوەی فێستیڤالێشدا وتم، ئـەم حزبانـە دوو کۆلەگـەیان هەیـە، کۆلەگەیـەکیان پەیوەنـدی بەئاین وەکو چۆن سەریهەلداوە پارێزەری هەمان سەردەمی سەرهەلدانی ئاینو ئەیانەوێ دە سەلاتیان هەبێ بۆیە حزبیان بۆ دەسەلات دامەزراندوە، جگەلەمانە، هەرئێستاش ئیرشاد هەیەو دەچن دەگەڕێن بەدێهاتانداو تەریقەت بلاودەکەنـەوەو دین بلاودەکەنەوە، شتێکی ئاساییەو بۆ دەسەلات نەبووە، پـارە کۆدەکەنـەوە،

هەروا، تەکیە هەیە، خانەقا هەیە، شێخ هەیە، مەلا هەیە، مزگەوت هەیە، هەموو شتێك هەیە، بەڵام ئەم حزبانە پایەیەکیان لەناو ئاینی رابردوودایە، پایەکەی تریشیان لەدەسەڵاتی ئەم سەردەمەدا هەیە، بۆ ئەمە دامەزراون، ئاشکرایشە لەدنیادا جوانترین دەسەڵاتەکانی دنیا دەسەڵاتە دیموکراتیەکانن، باشترین دەسەڵاتی ئیسلامی یا مەزهەبی لەجیهاندا ئێستا کێیە، بیهێنە بۆ کوردستان یەکێ لەم حزبانە جێبەجێی بکات هەرگیز لەم دەسەڵاتەی ئێمە باشتر نابێ بەهەموو کەموکورتیەکانیەوە، مەحاڵە لەم دەسەڵاتەی ئێمە باشتر بێو ناشکرێ دەسەڵات بکەین بەکێڵگەی تەجروبە، ئێستا چوار ساڵ ئەم دەسەڵاتە تەسلیمی کێ بکەین، یەکێك لەحزبەکانی ئیسلامی بۆ چوار ساڵ تاقیان بکەینەوە بزانن چی لەئینسانەکانی کۆمەڵو چی لەئێمەش دەکەن، بێگومان نابوتیان دەکەن، هەموو دەستکەوتەکانی کە تائێستا بەدیهاتوون، هەموو ئەو دەستکوتانە ئەپێچنەوە، بەناوی دیموکراسیو ئازادییەوە بەدیمان هێناون هەموو بنەماکانی سەلەفیەت دەهێننەوەو دەیسەپێنن بەسەرماندا، بۆیە من زۆرم لا مەبەستە سەرلەنوێ بکەوینە دیالۆگ لەگەڵ ئەوەی ئێستا قسە بکەین، مشتومالی خۆمانو دەوروبەرمان بکەینەوە کە ئایا ئێمە ئاینمان پێویستە؟ بەلێ دەڵێم پێویستمانە، ئایا دەسەڵاتمان پێویستە؟ دەڵێم بەڵێ پێویستمانە، بەڵام چۆن؟ بەپێی ئەم سەردەمە پێویستمانە، هەیە دەڵێ نە ئاینم پێویستە نە دەسەڵاتم پێویستە؛ ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە؛ هەشە دەڵێ ئاینم پێویستەو دەسەڵاتم پێویست نیە، ئەمیش هەڵەیە؛ هەیە دەڵێ دەسەڵاتم پێویستەو ئاینم پێویست نیە، ئەمیش هەڵەیە؛ یەکالاکردنەوەی ئاینو دەسەڵات، ئاین بۆ هەموو ئەوانەی پەیرەوی دەکەن، بەوپەڕی ئازادی هەقی خۆیانە، بەڵام ناکرێت، تێکەڵاو بەدەستور بکرێتو دەستور قۆرخ بکات، دەسەڵات دەبێ دەسەڵاتێکی دیموکراسی بێت، دەسەڵاتێکی عەلمانی بێت کە بەداخەوە نەمانتوانی لەعێراق وەکو پێویست هەموو ئەم پەیامە بەدیبهێنینو ئەمەیە خەتەرەکە، خەتەری مانەوەی ئێمە تا ئێستا لەعێراقدا بەشێوەیەك لەشێوەکان، ئەمەیە کە تۆ ناتوانی سەدامیش روخا لەبەرامبەر هەموو ئەوانەی هەژمونێکیان هەیە لەوڵاتی عێراقدا بەناوی شیعەو سونە ناکرێ سیستەمی خۆت، دەستوری خۆت، پێکهاتەی عێراق کە بەپێی خەوە جوانەکانی دیموکراسی بینا بکەین، ناشتوانی ئێستا بڵێین سەربەخۆین، قەناعەتی ئێمە وەکو حزبە سیاسیەکانی ئێستا وایە، خەتەری

ئـەوەی کـە تـۆ تێنەگـەی لـەم وڵاتـە دەبـێ بمێنـیو لەکاتێکـدا دەشمێنیتـەوە، دوژمنـی زۆر سەرسـەختت مـاوە لەسـەر بیروباوەڕەکـەت، دەرك کردنـی ئەمـە مەسەلەیەکی گرنگە، زۆر مەسەلەیەکی گرنگە بەبۆچونی من.

ڕەفزکردنی دەسەڵات لەناو نەتەوەیەك کە جارێك دەسەڵاتی نیە، کـە جارێـك دەوڵەتی نیە، کوردی ئێران دەسـەڵاتی نییـە، کـوردی تورکیـا دەسـەڵاتی نییـە، کوردی سوریا دەسـەڵاتی نییـە، ئـەم ئەزمونـەی ئێمـە جارێ نـاتوانین بیکەینـە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، باشە نەتەوەیەك دەسەڵاتی نەدیوە تۆ پێی بڵێی دەسـەڵا ت پێویست ناکات لەم سەردەمە، جارێ تاممان نەکردووە، با جارێ تامی بکەین، با دە ساڵ ئێمەش دەوڵەتێکمان هەبێ ئینجا بڵـێ پێویـست بەدەسـەڵات ناکـات، هـەروەها بـا جـارێ حزبـەکان پەیامـەکانی خۆیـان بـەدیبهێنن لەسـەر ڕێـڕەوی مێـژوویی خۆیـان بـەردەوام بـن، ئەوکاتـە بڵـێ حزبایـەتی پێویـست نیـە، ئەگـەر حزبایەتی نەبێ کوردی تورکیـا بەچـی ڕزگـاری دەبـێ؟ حزبایـەتی نـەبێ کـوردی ئێران بەچی ڕزگاری دەبێ؟ حزبایەتی نەبێ ئێستا بەچـی دەپارێزرێـت؟ چـۆنی دەپارێزیت، لەبەرامبەر ئیرهاب، لەبەرامبەر شیعە، لەبەرامبەر سوننە، لەبەرامبەر پلانەکانی ناوچەکە، لەبەرامبەر ئەو هەموو دوژمنانەی کە هەبووە، ئـەو پلانانـەی کە دەگێڕدرێ چۆن دەبێ حزبو دەسەڵاتت نـەبێ؟ چـۆن ئـەم وڵاتـە شـڵۆقەمان پـێ بەڕێوەدەچـێ، پێمـان بەڕێوەناچـێ، قاعـدەی ئـابوری بـەهێزمان نـەبووە، قاعدەی سیاسی بەهێزمان نەبووە، کـەلتوری دەسـەڵاتمان نـەبووە، پـەروەردەی دەسەڵاتمان نەبووە، هەرچی شت هـەبووە لەمێـژوودا نـەمان بـووە، داگیرکـەران هـەموو شـتێکیان لـێحەرام کـردوین تـازە تـازە خۆمـان بینادەکـەین، تازەتـازە ڕانەچڵەکێین بۆئەوەی مومارەسەی دەسـەڵاتێك بکـەین، دەسـەڵاتێك جیـاواز بـێ لەدەسەڵاتەکانی تر و پشتیوانین وردە وردە خەوەکانی تریشمان پێ بەدیبهێنین، خەوی زۆرمان ماوە بەدیبهێنین، نـاکرێ ئەمـەی لەدەسـتمانە لەدەسـتی بـدەینو بـچینە خەڵوەتـەوەو وابـزانین لەخەڵوەتـەوە بەخـەوی جـوان دەتـوانین ئامانجـە بەدینەهاتوەکانمان بەدیبهێنین. نـاکرێ، یـانی تـۆ وەرە موناقەشـەیەکی مـەنتقی لەسەر هەمووشتەکان بکەینو پاشان حوکم بدرێ. سەرەنجام هـەر دەبـێ بگـەیتـە ئەو ئەنجامەی کە بەڵێ نە دەتوانی ئێستا بەکاملی نەفی دین بکەی، نەدەشتوانی

بەبێ دەسەڵات ژیانێکی ئاسودەو ئازاد بژیت، چونکە دەسەڵات هێشتا زەروریەتە مێژووییەکەی ماوە لەوڵاتانی ئێمە، لەهیچ وڵاتێکی دیکەی دونیایش زەرورەتی دەسەڵات لەدەست نەچووە. ئەم مەسەلانە دەبێ لەگەڵ نەوەی گۆڕاوی ئێستادا، نەوەی جیاوازی ئێستادا حسابێکی وردتری بۆ بکەین، نەوەی ئێستای ئێمە یا ئەو نەوە تازەیەی کە لەدوای راپەڕین پێگەیشتووەو هۆش دەهێنێ بەبەری خۆیدا، هۆشی کۆمەڵایەتی، هۆشی سیاسی، پرسیاری لا دروست بووە، پێوانەی لا دروست بووە، دەسەڵاتی پێ هەڵئەسەنگێنێ، ئەم نەوەیە نەوەیەکە هەتائێستا هەم ئێمە نەمانتوانیوە وەکو پێویست تێیان بگەیەنین، بە شتە جوانەکانی ئێستا پەروەردەیان بکەین، بەپێویستیەکانی ئێستا، بەسەرکەوتنەکانی ئێستاو بیشیان بەستینەوە بەو خەوە جوانانەی کە دەبێ لەمەولا بەدییان بهێنین، ئێمە نەمانتوانیوەو هەمیش بەڕاستی هەست دەکەین نەیارەکانی دەسەڵاتی کوردستان، دژەکانی دەسەڵاتی ئێمە، پروپاگەندەکان، ئەمانەش بەشێوەیەك لەشێوەکان، کاریگەریان لەسەر نەوەی ئێستا هەیە، ئەم نەوەیە نەوەیەکە پۆستاڵی نەدیوە لەژیانی خۆیدا، نازانێ ناو زیندان چۆنە لەژیانی خۆیدا، نازانێ ئیرهاب چۆن بووە لەزەمانی خۆیدا، نازانێ رژێم چی لەمیللەتی ئێمە کردووە لەزەمانی خۆیدا، دێتەدەرەوە نەوەی ئێستا، هیچ هەویەیەکی لەگیرفاندا نیە، چونکە ناترسێ نە پۆلیس لێ‌دەپرسێ هەویەکەت چییە، نە ئیزنبات لێی دەپرسێ، نە پێشمەرگە لێێ دەپرسێ، نە ئاسایش لێی دەپرسێ، هیچ لێی ناپرسن، بەبێ هەویە دێتەدەرەوەو دەچێتەژوورەوە.

## جیاوازی ژێردەستەیی و ئازادی

هەندێك لەو خەڵکانەی کە لەسەردەمی بەعسدا ئێمە گەنج بوین، یا پیاو بووین، هەمووتان لەبەرچاوتانە، کامتان دەتانوێرا بێنەدەرەوەو دەفتەرخدمەو شەهادە جنسیەو هەویەی دائیرەکەت لەگیرفاندا نەبێ، سێ بۆ چوار ناسنامەت لەگیرفاندا بوو دەهاتیتەدەرەوە دەترسای بیانویەکت هەر پێ‌دەگرن بتبەن‌و هەفتەیەك تێتهەڵبدەن، هەر گەنجێك لەگەنجەکانی ئێمە لەسەردەمی ئێمە ٧٠٪ ی خەوەکانی ئەوەبووە چۆن دەیبەن بۆ عەسکەری؟ عەریف چی لێدەکات لەساحەی عەرەزاتدا؟ خەوی ئێمە وابووە مەکتەبیشت تەواوبکردایە دەیانبردی

بۆ عەسکەری، کێ هەیە لەنەوەی ئێمە خۆی، برای، باوکی، نەگیرابێو مەعاشی نەبڕابێو دەربەدەر نەبوبێ، ئیختفای نەکردبێ، خێزان نیە ئەمەی نەخواردبێ مەگەر خێزانە خائینەکان، کێ هەیە هەڵنەکەنرابێ لەشاری خۆی، دوورنەخرابێتەوە، هەفتەیەك زیندانی نەکرابێ؟ ئەم هۆڵەی کە ئێستا هۆڵی دیالۆگە ئەمە زیندان بووە، رەنگە ئێستا دەیان کەس لێرە دانیشتبن لێرە ئەشکەنجە درابن، هەر لێرە کە ئێستا دانیشتوون، نەوەی ئێمە نەوەی پڕلەزوڵمو ستەمو ناخۆشی بووە، نەوەیەك بووە خواخوامان بووە نەتەوەکەمان هەمووی رانەگوێزن بۆ عەرعەر، نەوەی ئێستاش، خەو بەوەوە دەبینێ هەموو یەکێکیان لەژوری خۆیدا خەتێکی ئەنتەرنێتی هەبێ، مۆبایلی هەبێ، دوو رۆژ جارێك سیمکارتێکی بۆ بکڕدرێ، بەشی زۆری خەوەکانیان دەتوانم بڵێم ئەمەیە، ئەگەر ئەمەی بۆ بوو باشترین حکومەتت هەیە، ئەمەی بۆ نەبوو حکومەتەکەت بەکەڵکی یەك فلس نایەت، دیارە لەپاڵ ئەم قسانەشدا لاو هەیە، بەمەنتق قسەدەکات، نوسەر هەیە بەمەنتق قسەدەکات، بۆچونی جوانی هەیە، لەرۆژنامەکاندا قسەدەکەن، لەتەلەفزیۆنەکان قسەدەکەن، پەرۆشن، رەخنەیان هەیە، بەلگەیان پێیە بەڕاستی، ئەمانە دە ئەوەندەش رەخنە لەحکومەت بگرن هەقی خۆیانە، بەلام کەسێکیش پەیامێکی پێ نیە، لیبراڵ هەتا مۆخی ئێسقانی، لێیدەپرسی فلان شت چۆنە؟ نایزانێ، هی دوێنێی لێدەپرسیت، نایزانێ، هی ئەمڕۆی لێدەپرسیت، نایزانێ، پێشبینی سبەینێ چۆنە، نایزانێ، یانی ون، ون لەهەموو ئەم فەزایەی کە هەیە. ئەمە بابەتێکە دەبێ وردتر بیری لێبکەینەوەو ئیش لەسەرئەوە بکەین کە ئەم دەسەلاتەی کوردستان دەبێ چ فەلسەفەیەکی هەبێ؟ دەبێ چ بنەمایەکی ئابوری هەبێ؟ چ بنەمایەکی کۆمەلایەتی هەبێ؟ چ بنەمایەکی ئیداری مۆدێرنی هەبێ کە بتوانێ خیتابەکانی خۆی، ئاڕاستەکانی خۆی، بیروبۆچونەکانی لەگەڵ ئێستادا بگونجێنێو وابکات خەلك بزانێ نەوەی پێشوو، کە بەش بەحالّی خۆم وادەزانم نەوەی پێشوو بەشی زۆرمان دەیزانین، هێشتا ئەرکی زۆرمان ماوەو هەوڵیش هەیە لەپاڵ دەسەلات، لەپاڵ حزبەکان کە ئەرکە بەدینەهاتوەکان ئەمساڵ یا چەند ساڵی تر بەدیبێ، نەوەی رابردوو باش دەیزانین دەبێ ئیش بکەین، بەلام نەوەی ئێستاش بزانن کە کورد لەخەم نەڕەخساوە، کورد بێدوژمن نیە، ئەزمونەکەمان بێ دوژمن نیە، هێشتا کێشەمان زۆر زۆرە، ئامانجمان زۆرە، هێشتا پلانە نهێنیەکان بەشێوازی جۆراوجۆر لەهەندێ دەوڵەتی ئیقلیمی وا دائەڕێژرێ کە نابێ ئەم ئەزمونە فیدرالّیە

سەربکەوێ، بێگومان بەلێکدانەوە نایلێم بەزانیاری دەیلێم، هێشتا بەحسابی خۆیان هەندێ لەدەوڵەتانی ئیقلیمی بەبەریەوە ماوە کارێك بکەن، هەم عێراق تێكوپێك بدەن‌و کە عێراقیان تێكوپێکدا لەئەنجامدا ئەزمونی فیدراڵیش لەکوردستاندا تێكوپێکتر بدەن.

## رقی خەتەرتری دوژمن

ئەمجارەیان ئەگەر تێك بچین خەتەرترە، چونکە دوژمنەکانمان ئێستا زۆرتر رقیان لێمانە، بەشێك لەدەوڵەتە ئیقلیمیەکان پێیان وایە سەدام لەسەردەستی کورد روخاوەو ئەمریکاو رۆژئاوا کورد هێناونی، ئەمە یەك، دووەم: مەزهەبیەکانی ناوچەکە رقێکی گەورەیان لێمانە، لەبەرئەوەی ئەزمونێکی دیموکراسی علمانی‌و کەلتورێکی تازەمان هێناوەتەکایە کە پێچەوانەی فکری ئەوان، فەلسەفەی ئەوان، مەزهەبی ئەوان، دەسەڵاتی ئایینی ئەوان، ئەمە خەتەرە ئەگەر سەربگرێ، بێگومان وردەوردە تەشەنەدەسێنێ بۆ ناوچەکە، لەبەرئەوە ئەوانیش رقێکی شاراوەی سەیریان هەیە بەرامبەرمان، ئەگەر ئەمجارەیان بۆیان هەڵکەوێ هەڵبکوتنەوەسەرمان رەنگە مەقی پەناهەندەییشمان نەدرێتێ لەدەوروبەرماندا، سێهەم: تاقە چارەسەر کە لەبەردەستماندا ماوە ئەوەیە کە چۆن ئەم دەسەڵاتە بپارێزین‌و لەگەڵ ئاڵوگۆڕەکان دەیبەینەپێشەوەو رێنوێنی نەوەی تازەشمان بکەین لەئایندەی گۆڕانکاریەکان‌و سەرکەوتنەکان ببنە خاوەنی ئاڵوگۆڕەکانی ئایندە.

ئامادەبوانی بەرێز، لاو بەو ئاراستەیەدا هان مەدەن کە لاو هەموو شتێکەو دەتوانێ ئێستاش بگرێتەدەست‌و دەتوانێ ئایندەش دابین بکات. ناکرێ لەهەموو جیهاندا هیچ حکومەتێك لەدنیادا نیە ٢٪یشی پێکهاتەکەی لە لاو بێت، هیچ پەرلەمانێك لەجیهاندا نیە ٣٪ ی پێکهاتەکەی لە لاوان بێت.

لاو هەمیشە شتێك لەدەسەڵات، شتێك لەدامودەزگاکانی دەکەوێتەدەست، بەڵام زۆرتر بەرپرسیارێتی فەلسەفی، بەرپرسیارێتی دیموکراسی، بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی، بەرپرسیارێتی نەتەوەیی، هەموو حکومەتەکان لەدنیادا ئەوەیە کارێك بکەن لاو ئامادەبکەن بتوانێ بەرپرسیارێتی ئایندە باشتر لەنەوەی ئێستا بباتبەرێوە، هەن قسە فرێدەدەنە ناو ئەم لاوانەو سۆزیان دەجولێنن کە گوایە

لاوان خەوەكانتان مردوە، ئامادەییتان لـەناو ئـەم دەسـەڵاتەدا نیـە، گوایـە لاوان هیچ نین لەناو ئەم دەسەڵاتە، دەبێ پەرلەمان نیوەی لە لاوان بێ. وەرە نیـوەی دەسەڵاتی كوردسـتان بـدە بـەلاو، بـەكام باكگراونـد، بـەكام ئـەزمون، وەرە مـن ئێستا لاوەكانی ئێستا دەبـەم لەگـەڵ شـیعەكانی بەغـدا گفتوگـۆ بكـەن، لەگـەڵ سوننەكانی بەغدا گفتوگۆ بكـەن، لەگـەڵ د. جەعفـەری گفتوگـۆ بكـەن، لەگـەڵ دەوڵەتانی ئیقلیمـی گفتوگۆ بكـەن، لەگـەڵ سـەدوپەنجا جـۆر موخابـەراتی دنیـا گفتوگۆ بكەن، بەبێ ئەزمون بیخەیتە بـەردەمی ئـەوان، هـەزار كـڵاوی مەكسیكی دەخەنە سەریان، كڵاوی مەكسیكی زۆر گەورەیە.

ئەمـە بەومانایـە نییـە هـیچ بوارێـك نـادەین، ئێمـە ئیـشمان كـرد، ئێـستا لەدەستوری عێراقدا هەژدە ساڵ بۆی هەیە خۆی هەڵبژێرێ بۆ پەرلـەمان، جـاران سـی بـوو، ئێـستا كردوومانـە بەهەژدەسـاڵ، بەتـەمان ئـەوە لەدەسـتوری كوردستانیش بچەسپێنن، با جوڵانەوەیەكی لاوان تەندروست هەبێ، دوو لاویش‌و چوار لاویش‌و پێنج لاویش دیاری بكەن‌و دەنگی بدەنێ، با پەرلەمانی كوردسـتان سـەد كەسـە پێـنج بـۆ هەشـتی لاو بـێ، بـەڵام پەرلـەمانی لاوان ناتوانـێ ئەركـە سیاسیەكان، ئەركە نیشتمانیەكان‌و ئەركە ئابوریەكان بەدیبهێنێ.

## خەتەری ئاین لەسەر لاو

بەبۆچـونی مـن لـەم هـەموو مەسـەلانە، خەتـەرترین شـت لەكاریگەریـەكانی ئێستای ئەزمونی ئێستا ئاڕاستە ئاینیەكەیە، ئاڕاسـتە مەزهەبیەكەیـە كـە ئێـستا كاریگەری لەسەر لاوی ئێمە هەیە، ئاڕاستە ئاینیەكە لەنەتەوەكـەی دادەبڕێ، لاو بـەكچو كـوڕەوە لەئـەزمونی ئێـستای دایـدەبڕێ‌و دەیبەسـتێتەوە بـەرابردوو، بەشێكی دەكات بەتیرۆریست، بەشێكی دەكات بەسەلەفی، سەلەفیەكەیان ئاگری بـن كـان، ئـەوانی تریـشیان گـڕ بەردەدەنـە هـەموو ئەزمونەكـەمان، بەلاوەكـەی خۆشمانـەوە، ئـەو گەنجانـەی كـە كەوتونەتـە ژێـر كاریگـەری ئیـسلامگەراكان، بەبۆچونی من ئەمە خەتەرترینیانە، باقیەكەیان زۆر زۆر خەتەر نیـە، ئـەوەی كـە كەوتۆتـە ژێـر كاریگـەری حزبێكـی علمـانی زۆر توندڕەو، یـان روناكبیرێكی زۆر توندڕەو، بەهەر تێزێك لە تێزەكانەوە كە هێناویێتی‌و كـە لەگـەڵ ئێـرە ناگونجـێ، من ئەمە زۆر بەخەتەرناك نازانم، بگرە وەكو ئەزمونێك لەئەزمونـەكان، پـێم وابـێ كەڵكیشی دەبێ، ئەمە ئەو تێزانەن كە خەتەرنین لەسەر دیموكراسی، كـە خەتـەر

نین لەسە رعلمانی، کاریگەری سلبیشیان لەسەر ناوەندێك لەناوەندەکان بەقەد ئەو تێزانە هەیە، بەڵام بەقەد بیروبۆچونی هێزە ئیسلامگەراکان بەخەتەریان نازانم، کە ئێستاو رابردوو ئایندەش لەئەقڵی لاوەکان قفلْ دەدات، بگرە منداڵەکانو مێرد منداڵەکانیشمان هەمووی حیجاب دەکەنەسەریانو ئەیانبەنە کونجی مزگەوتەکان، بەشێوەیەکی ئەوتۆ پەروەدەیان دەکن کە هەموو ئەقڵو هۆشیان دەکەن بە رق بەرامبەر بەنەتەوەکەیان، بەرامبەر بەدەسەڵاتەکەیان، ئەسڵەن وایان لەهەندێ گەنجەکان کردووە، وایان پەروەردە کردوون گوایە ئەم حکومەتانەی ئێمەو ئەم یەکێتییو پارتیە هیچمان نەکردووە، هەرهەمووی بۆگەنمان کردوە لەگەندەڵی، هەقی ئەوەیە لەسەر ئەو جادەیە بەردەبارانمان بکەن، ئاخر بەویژدانتان ئەمە ویژدانە، مامۆستا سەلاحەدین بەهادین کە من پێشمەرگە بووم ئەو عەسکەر بووە، باشە عەسکەری قادسیەی سەدام بووە، یانی ئێستا ئەو لەئێمە جوامێرترو تێکۆشەرترو قارەمانترە؟ ئەمە مەعقولە؟ مەعقولە ئەو لەئێمە زیاتر تێبگات میللەت چۆن بەڕێوەدەچێ؟ حکومەت چۆن بەڕێوەدەچێت؟ دڵسۆزتربێ؟ ئەمە مەعقولە؟ وەرن هەموو سەرکردەکانی حزبە ئیسلامیەکان لەناویان هەڵکێشین بزانن مەلاکانیان لەعێراقو کوردستاندا چەندیان سەردەمی خۆی وتویەتی (صدام حسين حفظه الله)؟ چەندیان لەسەردەمی ئەنفالدا توانیویەتی بەرگری لەهەق بکات؟ چەندیان لەسەردەمی هەڵەبجەدا متەقی لێوەهاتووە؟ وەرن هەموویان یەکەیەکە هەڵدەسەنگێنین، ئیتر چۆن مەعقولە ئەم حزبانە بەم ئەقڵیەتە دواکەوتووەی هەیانە بتوانن لەهەموو ئەم هێزانەی کە روبارێك خوێنو شەهیدمان داوە، سەرەڕای ئەوەی کەموکوڕیمان هەیە، گەندەڵی هەیە، بەڵێ هەیە، کێشە هەیە، حکومەتەکەمان یەکینەگرتووە، راستە، خراپیشە یەکینەگرتووە، بەڵام خەباتو فیداکاریو دەستکەوتەکانمان بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەقڵی ئەوان، قیادەی ئەوان، فکری ئەوان، خزمەتەکانی ئەوان، بزانین چەند جیاوازین؟ خراپترین شاری ئێمە لەباشترین شاری ئەوان باشتر بوو کە کاتی خۆی هەموو هێزە ئیسلامیەکان ناوچەی هەڵەبجەیان بەڕێوەدەبرد، خورماڵو سیروانو هەڵەبجەی شەهیدو بیارەو تەوێڵە لەدەست ئەواندا بوو، شەش دانە ساڵ دەبا بەردێکیان خستبێتەسەر بەردێك، دەبا نەمامێکیان چاندبێ، ئەو پارەیەی کە ئەماننارد با نەیاندزیایە، با گومرگەکانی ئەوێ کە لەبەردەستیان بووە نەیاندزیایە.

مەعقولـە ئێستا یـەککگرتوو بـەیانێك دەردەكـات دەڵێت: مـن لەبـەر دوو هـۆ لیـستەكەمان جیابۆتـەوە، دوو هـۆ هۆیـەكیان ئەوەیـە كـە گەنـدەڵیّ هەیـە، دەشیانەویّ گەنـدەڵی لـەم حكومەتـەدا نـەهێڵن. هـۆی دووەمیش ئەوەیـە كـە دەمەویّ دیموكراسی زیندویكەمەوە، یەككگرتوو سـەپارا بـاوەڕی بەدیموكراسـیەت نیە، ئەقڵی قفڵە لەبەرامبەر دیموكراسیدا، من هەموو پرۆگرامەكـەم هەڵبسـەنگێنە لەلام ئاساییە، هـەموو ڕۆژیّ بـڕۆ لەسـەر تەلـەفزیۆن پـەیڕەوپرۆگرامی یـەكێتیی هەڵبسەنگێنە، بەرنامەكانمان هەڵبسەنگێنە، لامان ئاساییە، بەڵام هیچ لایەك بۆی نیـە فاریزەیـەكی قورئـانو سـوننەت هەڵبسەنگێنیّ، ئـەوان قورئـانو سـوننەت بەپرۆگرامی نـەگۆڕیان دەزانـن. گوناحیـشە وشـەیەكی دەسـتكاری بكـریّ. بـەڵام خۆیان بۆیان هەیـە سـەراپا بەرنامـەی لایەنـەكانو مەزهـەبو ئاینـەكانی تـریش، ڕەتبكەنەوە. ئەمە نـاكریّ، ئـەمـە چەواشـەكردنی نـەوەی ئێستایە بەئـەقڵێك كـە بەڕاستی ڕێك ڕەگەكەی لەدوو هەزار ساڵ لەمەوبەرە.

ئێمـــە بەرپرســـیارێتیمانە وەكـــو دەســـەلات، وەكـــو حزبـــی سیاســـی بەرپرسـیارێتیمانە سـاڵ بەسـاڵ باشـتر لـەپار هـەموو ئـەو كەموكوڕیانـە، ئـەو ڕەخنانـەی كـە بابـەتینو مـەنتقینو ڕاسـتن، نـاڵێین هـەمووی بابـەتیو مـەنتقیو ڕاستە، هەیە مەنتقی نیەو بابەتی نیەو ڕاستیش نیە، هەیە بابەتیەو مەنتقیەو ڕاسـتەو دەبێـت لەسـەری بوەسـتین، كـە ئێـستا ئێمـە لیژنـەمان دامەزرانـدووەو لەسـەری وەسـتاوین، لیژنـەی حزبـی، لیژنـەی حكـومی دامەزرانـدووەو لەسـەری وەستاوین و وردەوردە باوەڕناكەم بگاتە سێ مانگی ئاینده ئاڵوگۆڕی زۆر فـراوان لەهەموو دامودەزگاكان بەدی دێت، فراوان لەسەرەوە بۆ خوارەوە، ئێستا هەموو مەسەلەكان لەگۆڕاندایەو هەقیشە بیگۆڕین، نەیگۆڕن خراپەو بیّوەفاییە بەرامبەر بەخوێنی شەهیدەكانمانو هەموو ئەو پەیامە جوانانەی كە ئەیبیستین لەخـەڵكی دڵسۆزو باش، ئەمە هـەقی خۆیـەتی ئـەوە بـەو مانایـە نیـە هـەموو ئـەوەی لێـرە دانیشتوینو لەدەرەوە دانیشتون، ئەوانەی جیاوازن لەهـەموو ئـەو هێزانـەی كـە ناتوانن دیموكراتی بن، ئێمە لەبەرامبەر ئەواندا خۆمان شل بكـەینو مەنتقـەكانی خۆمـان بـدۆڕێنین بۆئـەوەی كـە مـەنتقی لاوازتـر لـەو مەنتقانـەی كـە هەمانـە بەسـەرماندا زاڵ بێـت، ئـەوەی ئێـستا، خیتـابی ئێـستمان، فكـری ئێـستامان، فەلسەفەی ئێستامان، بەڕاستی پێویستی بەتاوتوێكردنی باش هەیە، بەئاڵوگۆڕی بـاش هەیـەو مـن لـەوباوەڕەدام ئەگـەر ئێمـەیش بیكـەین ئاڵوگۆڕەكـانی دنیـا لەبەرژەوەندی ئەم بیروبۆچونانەی كە ئێمە هەمانە.

## ئاڵوگۆڕو نەوەی نوێ

ئاڵوگۆڕی جیهانی، ئاڵوگۆڕی ناوچەیی لەباری ئابوریەوە، لەباری سیاسیەوە، لەباری میدیاكانەوە، هەمووی لەقازانجی ئێمەیە، تازە دنیا ناگەڕێتەوە بۆ دواوە، هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ دواوە، دەكرێ دەیان تاوانی گەورەی تر ئەنجام بدەن. بەڵام رەوڕەوەی مێژوو تازە بەوان ناوەستێ، هیچ حكومەتێك، هیچ حزبێك، هیچ مەزهەبێك، هیچ ئایدیۆلۆژیەتێك، هیچ فەلسەفەیەك، نەگونجێ لەگەڵ ئاڵوگۆڕەكانی ئێستا پێی ناكری رەوڕەوەی ئاڵوگۆڕی ئێستا رابگرێو تازە رۆژهەلاتی ناوەڕاست دەبێ ببێ بەبەشێك لەكەلتورو سیستەمی دیموكراسی دنیا، دەبێ ئاڵوگۆڕەكانی تەكنەلۆژی، ئاڵوگۆڕەكانی پەروەردە، ئاڵوگۆڕەكانی روناكبیری، ئاڵوگۆڕەكانی كۆمەلایەتی، ئابوری، هەتا سایكۆلۆژیو فكری، ئەدەبی، هونەری هەموو ئەو ئاڵوگۆڕانە لەناو رای گشتی، لەناو رۆژنامەكان، لەناو دامودەزگاكان هەرهەمووی وردەوردە كارلێك بكات لەگەڵ ئێستاو چەند ساڵی ئاینده، چەند ساڵی گۆڕانكاری یەكجار گەورەدەبێ، لەناوچەكە، دیارە لەناوچەكە كوردو كوردستان رۆڵێكی یەكجار گەورە دەبینێ، من پێشبینی دەكەم كێشەی كورد ساڵانی ئاینده ببێ بەكێشەی پلە یەكی هەموو رۆژهەلاتی ناوەڕاستو پێشبینی دەكەم هەموو دەوڵەتە گەورەكانی دنیا بۆڕبۆڕێن لەسەر ئەوەوە بكەن كە كورد ببێ بەدۆستیان، بۆچی؟ چونكە گەورەترین نەتەوەین هێشتا مافمان نیە، زۆرترین زەویمان هەیە كە دەسەلاتی نیە، ئابوریەكی یەكجار بەهێزمان هەیە كە بەراوردناكرێت لەگەڵ ئابوری هەندێ لەولاتە لاتەكانی دنیادا، كە ئەگەر كۆمەكی ولاتانی دنیا نەبێ، ئەسڵەن ئەوانە ناتوانن بژین، ئێستا ئەمریكا نەبێ پاكستان ناتوانێ بژی، پێشبینیش دەكرێت لەبیستوپێنج ساڵی ئاییندەدا پاكستان نەمێنێ، هەروەكو دەوڵەتو سیستەم نەمێنێ. پێشبینی دەكرێت ئاو نیوەی بەنگلادش نغرۆ بكات، نیوەكەی تریشی یا لەگەڵ هندستان تێكەلاو ببێ، یا لەگەڵ پاكستان، ئەمە پیشبینی پسپۆڕانی دونیایە، لەگەڵ فەلەستین هەر بەراورد ناكرێین، فەلەستین ئاوی خواردنەوەی نیە، دەبێ بچن ئاو بكڕن بۆئەوەی بیخۆن، لەكوردستان لەهەرلایەك بیر لێدەدەی ئاوی تیایە، باسی نەوتو یەدەگی نەوتی دەرنەهێنراوی كوردستان هەر ناكەم، چەند زورە، زۆرترینی یەدەگی دەرنەهاتوو ئێستا لەنەوتو لەغازو لەگۆگردو لەكۆمەڵێك كانزا لەكوردستاندا هەیە كە جارێ هەر دەستكاری نەكراوە، ئەمە جگە لەوەی هەموو فەلەستین بەزۆری بیخەیتەسەری ناگاتە حەوت ملیۆن ئینسان، نەتەوەی كورد

ئێستا ئەگەر ئامارێکی ورد هەبێ لەچل ملیۆن کەمتر نیە، روبەری کوردستان پەنجا بەرامبەری روبەری فەلەستینە، قەرەداغو گەرمیان بەقەدەر فەلەستینە، لەبەرئەوە شانسێکی یەکجار گەورەمان لەبەردەمدایە بۆ ئاینده، نەتەوەکەمان دەبێ بەیەکێ لەنەتەوە گرنگەکانو ئایندەش دە سالّی تر بێ، پانزە سالّێ تر بێ، ئەم ئایندەیە بۆ نەوەی ئێستای وردەوردە پەروەردەکراو دەمێنێتەوە، بۆ پیرەکانمان نامێنێتەوە، ئەو گەنجانە جێی ئێمە دەگرنەوە کە تا ئێستا لەفەرمانگەکاندا، لەزانکۆکاندا، لەدەرەوەو لەناوەوە ئامادەدەبن بۆ ئاینده، ئایندەیەکی یەکجار گەورەتر، گەشتر، جوانتر، پڕ لەدەستکەوت تر، بەزانیاریشەوە پێتان دەڵێم ئاینده چاوەڕێی نەتەوەکەمانە، بەزانیاریەوە پێتان دەڵێم، ئایندەیەکی یەکجار جوانو گەشتر چاوەڕوانمانە، دڵنیاشبن دێتەدی، ئەو ئایندە تازە یا دەبێ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ببێ بەدیموکراسی، یان ئاوا مەحالّە بمێنێتەوە؛ نەك شەڕێك دەیان شەڕی تر لەسەر ئەمە دەکرێت لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست، چونکە ئەمە ستراتیژێکە پەیوەندی بەستراتیژی جیهانگیریەوە هەیە، پەیوەندی بەچاوی کالّی کوردو ئاوارەیی کوردو دەربەدەری کوردو چەند کوردکوژراوەوە نیە، حەزناکەم ئێوە وابزانن ئێستا لەدەزگاکانی لێکۆڵینەوە ستراتیژی دنیادا ئاماری شەهیدەکانی ئێمەیان لایە، ئەوە بەس لای خۆمان هەیە، لەدەزگاکانی لێکۆڵینەوەی دنیا ئەوە لێکدەدەنەوە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ ئابوری دنیا چەند گرنگە، بۆ سیاسەتی دنیا چەند گرنگە، لەرۆژهەڵاتیشدا کوردو فارسو تورکو عەرەبو ئەرمەنیو ئەمانە دەبێ پێگەیان چی بێ لەم ئالّوگۆڕەدا، قسە لەسەر ئەوە دەکرێت، ئێستا تەرازوی سیاسی، تەرازوی عەسکەری، تەرازوی ئابوری لەدنیادا گۆڕاوە، وا پێویست دەکات کە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ببێ بەدیموکراسی، نەشبێ خەتەرە لەسەر خۆیان، ئەوکاتە ئەزانن چارەسەرکردنی کێشە سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتیەکانی وڵاتی ئێمە، بۆ نەوەی ئێمە چەند گرنگەو گۆڕینی دەسەڵاتەکانیش چەند گرنگە لەوڵاتانی ئێمە، مەسەلە ستراتیژیەکان لێرەیە، بۆیە دەبێ دڵنیابین، من دڵنیاتان دەکەم سەد پەیمانی سیاسیمان لەگەڵ ئەم دەوڵەتانە بەستبێ بەنهێنیو بەئاشکرا ئەگەر بەرژەوەندی ستراتیژی ئەو دەوڵەتانە نەبێ قەد لەئایندەی خۆتان دڵنیا مەبن، بەڵام زۆر دڵنیابن کە بەرژەوندی ستراتیژی لەباری ئابوری، سیاسیەوە، هی جیهانگیریو دەوڵەتە گەورەکانی دنیا لەوەدایە دەبێ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست مسۆگەربکەن، بۆخۆیان، رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەورەترین بازاڕە، گەورەترین خەڵکە هەم بۆ کەرەسەی خاو، هەم بۆ فرۆشتنی کالاّو هەم بۆئەوەی کەمترین

ئەزمە لێرەوە ئەقڵ نەبێ بۆئەوان، لەبەرئەوە ڕۆژهەڵات یەکجار گرنگە، ئەمریکا لەبەرامبەر چین دەوڵەتێکی زەبەلاحەو بەبەریەوەیە زۆریشی بەبەرەوەیە لەبەرامبەر چین، ژاپۆن،و ئەورووپای یەکگرتو، ئەمریکا هیچ چارەیەکی لەبەردەم نامێنێ لەبیستوپێنج ساڵی ئایندە تەنها مسۆگەرکردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەبێ، بازاڕەکانی ئەمریکای باکورو دەوروبەری ئەمریکای لاتینو دەوروبەری هەموو ئەو بازاڕە هیچ بەرهەمی نەداوە تائێستا، ئەوەی کە پێی دەڵێن پەیمانی تافتا، ڕێکەوتنامەی تافتا ئەمریکاو چەند وڵاتێکن لەناوخۆیانا کۆبونەتەوە لەبەرامبەر ئەوروپا، لەبەرامبەر چین، ژاپۆن بەهێز بن، لێکۆڵینەوەی زانستی دەریخست کە ئەو ڕێکەوتنامەیە لەبەرامبەر یەکێتی ئەوروپاو لەبەرامبەر ڕێکەوتنامەکانی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو لەبەرامبەر ئەگەری یەکگرتنی ژاپۆنو چین لەئاییندەدا بۆ کۆنترۆڵکردنی بازاڕو سیاسەتی دنیا، دەرکەوت ئەمریکا بەو بازاڕە تەسکەی کەنەداو مەکسیكو دەوروبەریو بەو هەژمونەشی لەسەر ئەمریکای لاتین هەیەتی ناتوانێ چارەنوسی خۆی دابین بکات، پێشبینیش دەکرێت ئەگەر وانەکەن ئەمریکا لە دە بۆ پانزە ساڵی ئایندە دۆخی ئابوری خراپ دەبێ. ئەمە پێشبینیەکی دراسەکراوە کە ئەمریکا کردویەتی بۆ بەرنامەی خۆی، ئەویش ئەوەیە ئەگەر لە دە بۆ پانزە ساڵی ئایندە گەورەترین بازاڕ بۆخۆی دابین نەکات ئەمریکاش وەکو بەریتانیای جەنگی یەکەمو دووەمی جیهانی لێدێت، دوادەکەوێتو دەکەوێتە دوای ژاپۆن، دوای چین، دوای ئەوروپای یەکگرتو، ئەوروپاش بەرەو یەکگرتنو بازاڕێکی زەبەلاح دەڕوات، ئێستا کە ئێوە دەبینن یەکێتی ئەوروپا فشاردەخاتەسەر تورکیا، ڕەخنە لەحکومەتی ئێران دەگرێت، ئەمە شەڕی ئایندەیە، مافی کورد، مافی کەلتوری کورد، مافی نەتەوەی کورد، مافی مرۆڤ، ئەوروپا دەڵێ تورکیا قبوڵت ناکەم تا دە ساڵی تر تۆ سیستەمەکەت هەمووی چاك نەکەیتەوە، نە یکەی بەدیموکراسی مافی مرۆڤ ڕەچاونەکەی، ئەمە هەمان دە ساڵە بۆ ئەو نەخشەیە کە هەموو وڵاتان بۆ ڕۆژهەڵات هەیانە، لەو دە ساڵەدا کە دەکەوێتە سەردەمی شۆڕشی زانیاریو خێرایی، گۆڕانکاری گەورە گەورە بەدی دێت. سیاسەت هەر ئەوە نیە ئێستا ببینیو بڵێی ڕابردوو چییە؟ ڕابردوو بۆ ئێستاو ئێستا ورد لێکبدەرەوە بۆئەوەی ئایندە جوان بپێکی، ئەم دەسەڵاتانەو ئەم نەوەیەی ئێمە بگوازەرەوە بۆ دە ساڵی ئەو ئاڵوگۆڕەو ئەو سەرکەوتنانەی کە بەڕێوەن، بێگومان خۆتان دەزانن یەکجار سەرکەوتنی گەورە بەدەستەوەیە.

## یان دیموکراسی یان نابوتی

لێرەوەیە جارێکی تر دوپاتی دەکەمەوە، لێرەوەیە یا دەبێ دیموکراسی بێن‌و دەسـەڵاتی دیموکراسـی‌و بـازاڕی ئـازادو مـافی مرۆڤ و مەدەنیـەت سـەربخەین، بۆئەوەی ئایندەمان لەدەست نەچێ، چونکە ئاینـدە تـەنها ئەمـە قبـوڵ دەکـات، یان ئەگەر ئەمە سەرنەخەین‌و پێشی نەخـەین بۆ ئاینـدە، جڵـەومان شـل بکـەین لەبەرامبـەر هێـزە ئیـسلامیەکان بتـوانن لێـرە سـەربکەون، بێگومـان ئێـستامان تێکدەچێ، ئایندەشمان لەدەسـت دەچـێ، رابردوشمـان نـابوت دەکـەن، لـەباتی ئەوەی بەتێکۆشەرو بەخەباتگێڕو رزگاریکەر ناومان بەرن لـەرابردوودا، بۆئـەوەی کە عەیب‌و عارەکانی خۆیان کە لەرابردودا هیچیان نـەکردوە بشارنەوە، ئەوکاتـە دور نیە بەخائینمان لەقەڵـەم بـدەن، لەتێکستەکانی خۆیـان بڵـێن ئەمانـە بـوون ئەقڵی خەڵکیان تێکداو خەڵکیان بەکوشـت داو هەڵەبجـەیان بەسـەر کـورد هێنـا، رەنگە وا باسمان بکەن لەمێژوودا ئەگەر جڵەوی ئەم دەسەڵاتە لەدەست نـەوەی ئێـستاو نـەوەی ئاینـدە دەربچێت‌و بـەو رقـە دژمـان دەوەسـتن، یـەك فرسـەت هاتەپێشەوە، یەکگرتوو پێی وایە لیستی سەربەخۆی هەبێ‌و لێمان دابڕێ لەگەڵ حزبـی ئیـسلامی عێراقـدا رەنگـە ئـەوان لەناوچـەکانی عـەرەب‌و سوننەنـشینا ئەمانیش لەکوردستان بتوانن هێزێکی بـاش لەپەرلـەمانی عێراقـدا دابـین بکـەن، بزانە سەیربکەن چۆن جیابونـەوە لێمـان‌و رایانگەیاند کـە ئـیش بۆچـی دەکـەن، بێگومان ئەمە بێ رێکەوتن نیە لەگەڵ ئیخوان موسلمین‌و حزبی ئیـسلامی عێـراق، جـاری پێـشوو کـە حزبـی ئیـسلامی عێراقـی لەهەڵبـژاردن بەشـداری نـەکردو یـەکگرتوی ئیسلامی نەیـدەتوانی بـەتاقی تـەنیا بەشـداری لەکوردسـتان بکـات قەرەبوی بەشدارینەکردنەکەی حزبی ئیـسلامی عێراقـی بکـات، هاتـە نـاو لیـستی هاوپەیمانی‌و بەو دەنگانەشی رازی بوون کە دامانێ، کەممان پێبدایـە هـەر رازی دەبون، زۆرمان پێبدانایە هەر رازی دەبوون، ئێستاش بەقـەد ئـەوەمان داونـەتێ کە جاری پێشوو پێمان داون، ئینجا رازی نـەبون‌و ئیعلانـی جیابونـەوەیان کـردو لیستێکی تازەیان دابەزاندووەو دەستیـشیان کـردووە بەپروپاگەنـدە، وەکـو وتم لەسەر ئەو بناغەیەی کە گوایە حکومەتەکانی ئێمە گەندەڵن، بۆیە ئەوانـە نایەنـە لیـستی هاوپـەیمانی گوایـە ئەوانـە دەیانـەوێ بزوتنـەوەی دیموکراسـی تـەحریك بکەن.

تـەوجیهاتێکتان بـۆ هـاتووە لـەئیخوان موسـلمینەوە دەڵـێ لەگـەڵ حزبـی ئیـسلامی برابەشـی کـەن، ئێـوە لەکوردسـتان‌و ئـەوان لەعێراقـدا دەنگـەکان ئاشـکرابکەن، حەقیقـەتی مەسـەلەکە ئەمەیـە، مـن دڵنیاتـان دەکـەن ئیخوان

موسلمین بڕیارێکیان بۆ بدەن بڵێن ئەو بڕیارە هەڵەیە، یەکسەر دەرابەکە دادەخەن‌و دەڵێن ئێمە بەشداری ناکەین‌و بەکێ دەڵێن با دەنگیان بدەینێ.

خەتەرەکە ئەمەیە، یاری سیاسی لێرەیە کە تۆ دەبێ بزانی لەنەوەی ئێستاتدا دەسەڵاتەکەت‌و مامەڵەکەت لەگەڵ ئایندە بە چ شێوەیەك دەبەیت بەڕێوە؟ بۆئەوەی ئەو خەونە جوانانەو ئەو هەلە جوانانەو ئەو ئەگەرە جوانانەی کە لەئایندەدا بەڕێوەیەو دڵنیام بەڕێوەیە دەبێ، ئەوانەشمان لەدەست نەچێ‌و هیواداریشین ئەمە پێویست بکات بەدەیان سیمنارو دیالۆگ‌و مێزگردی لەسەربکەین، با موناقەشە لەسەر ئەمانە بکەین، لەسەر گۆڤارەکان، لە تەلەفزیۆن‌و هۆڵەکاندا دیالۆگی لەسەر بکەین. دونیای سیاسەت زۆر زۆر زەرورە هێشتا، بۆیە دەبێ گۆڤارەکان، تەلەفزیۆنەکان، مێزگردەکان، هەموو ئەمانە لەسەر ئەم مەسەلانە موناقەشە بکەین، بۆئەوەی بزانین دەگەینە ئەنجام یان ناگەینە ئەنجام؟ ئایا ئێمە پێویستمان بەدەسەڵات ماوە؟ پێویستمان بەبەرخوردی واقعی‌و مەنتقی لەگەڵ ئاین دەبێ چی بێ؟ دەبێ چۆن ئێستا بپارێزین‌و ئایندە چۆن بپارێزن‌و ئایندە دەبێ چۆن خەباتی بۆ بکەین هەموو ئەم قسانەشمان تەنها بۆ نەوەی ئێستا نیە، زیاتر قسەمان بۆ گەنجمانە بۆ لاومانە، کە بەڕاستی ئەم لاوانە دەبی وا ئامادەبکەین ئەگەر بەنەوەی شێخ مەحمودو عوبیدوڵلای نەهری‌و پێشەوا قازی محمد هیچ جۆرە ئامانجێك نەهاتەدی، لەبەرئەوەی پلانەکان زۆر زۆر گەورەبوون‌و هەموو نەوەکانی ئەو سەردەمەمان بوون بەپێخۆری خەبات‌و تێکۆشان‌و قوربانی، ئەوە هیچ نەبێ بەنەوەی ئێستا، بەم ئەزمونەی کە بیناکراوە، بەو سەرکەوتنانەی کە لەعێراق بەدیمان هێناون، ئەمەمان بەدیهێناون، ئەم ئەزمونە پێویستە لەهەموبارێکەوە لەخەم برەخسێ. ئایندەش بەپاراستن‌و گەشەپێدانی ئەم ئەزموونە، بێگومان شتی زۆر گەورەتری تیا بەدیبێت، پێرار ئەم وەختە کێ دەیوت سەرۆك وەزیرانی تورکیا دێتە دیاربەکر دەڵێ: چارەسەرکردنی کێشەی کورد بۆ من بەجێبهێڵن، خەو بوو ئەم قسەیە پێرار من (٢٠٠٦) پێشبینی دەکەم لەدەوڵەتی ئێرانیش ئاڵوگۆڕێك ببنم، لەسوریاش ئاڵوگۆڕێك ببینم، بەڵکو بەهەوڵی خۆیان ئەم دەوڵەتانە، بەڵکو ڕێگەیەك لەڕێگاکان بدۆزنەوەو بیانەوێ جڵەوی مەسەلەکان بگرنەدەست، ئەمە هەمووی لەژێر فشاری ئاڵوگۆڕەکانی دنیادا، زیاتریشی بەبەرەوەیە، باشتر دەبێ ئامادەبین‌و زۆر سوپاس بۆ گوێگرتنتان.

## مەترسی ئیسلامگەرا
## لەسەر نەتەوەی بێدەوڵەت (+)

کارەساتی یەکی شوبات لەباشتر ناساندنی تیرۆریستەکان، بۆ رای گشتی گەلەکەمان کاریگەریەکی زۆری هەبوو. ئەگەر ئەو کارەساتە نەبوایە هێشتا دودڵیی لەناو هێزە سیاسیەکانو هەندێك لەرێکخراوە مەدەنیەکانو لەناو روناکبیرەکاندا هەر بمابایە بۆ باشتر ناسینی تیرۆریستەکان. دوایش کە گروپە درندەکەی شێخ زاناو ئەوانەش دەرکەوتن، ئەوەندەی تر رای گشتی گەلەکەمانی راچڵەکاندو ئەم چالاکیانەی کە ئێستا لەم کۆنفرانسە ئەکرێت، هاندەرێکی گەورەی یەکی شوباتە، بۆیە لەیادی یەکی شوباتدا کۆنفرانسەکە بەسترا. هیوادارم کۆنفرانسی ئاواو بیرکردنەوە لەتیرۆر، تەنها بۆ یادکردنەوە نەبێت، بۆئەوەبێ قوڵ ببینەوە لەچەمکەکانی تیرۆرو لەهۆیە کۆمەڵایەتیەکانی تیرۆرو لەچۆنێتی ریشەکێشکردنی تیرۆرو فرسەتی باشتر بدۆزێتەوە بۆ سەرکەوتنی دیموکراسی، کە ئێستا هەیە. بەداخەوە لەکوردستانساڵەهایە ئێمە گیرۆدەی تیرۆربووین، گیرۆدەی ململانێی ئەندێشەکانی تیرۆر بووین، کە رژێمی عێراقیش روخا، پانتایی تیرۆر نەك تەسك نەبووەوە، بگرە فراوانتریش بوو. ئەگەر جاران لەکوردستان بەئاشکرا تیرۆریان ئەکرد، ئێستا بەنهێنی ئەیکەن، مەیدانی عێراقیشیان بۆ ئاوەڵابووەو ئاشکراشە چ کاریگەرییەکیان هەبووە. ئەو رووداوانەی دوایی کوردستانو ئەم رووداوانەی ئێستای عێراق، هەموو دەیسەلمێنن کەوا، هەڵەی گەورەی زیانبەخش بەرامبەر ناسینی رەگەزەکانی تیرۆرو دژایەتی ئەندێشەی تیرۆر لەسەد ساڵی رابوردودا کراوە.

---

+ کۆڕێکی تایبەت لەکۆنفرانسی دژە تیرۆر (١/ ی شوباتی ٢٠٠٦) ئوتێل خانزاد/ هەولێر.

من ئەم بیروڕایانەی دەریاندەبڕم حەزدەکەم هەموو ئەوانەی لێرە دانیشتوون یان دوایی دەیبیستن، بەبیروباوەڕی خۆمی بزانن، بەهی (ی.ن.ك)ی نەزانن، هیچ تەعبیر لەیەکێتیی یا مەکتەبی سیاسی یەکێتیی ناکەن، خودی خۆم، قسەی خۆم، بۆچونی خۆمە، دەریدەبڕم، ئێوەش ئازادن باوەڕی پێئەکەن سوپاستان دەکەم، باوەڕی پێناکەن ئازادن. بەڵام ئەشێ ئینسان لانی کەم پرسیاری لادروست بێ، موناقەشەی لا دروست بێ، بەهیوای ئەوەی سەرەنجام بگەینە ئەنجام، تۆزێ کراوەش قسە ئەکەم، من ئەگەر هەربەڕێزێك زۆر پێچەوانەی ئەویش قسە بکەم، هیوادارم بەئاسایی وەریبگرێت، بەنائاسایی وەرینەگرێت، من ناتوانم هەندێ شت هەیە پەیوەندی بەچارەنوسی دیموکراسیو ئازادیو مەدەنیەتو نەتەوەکەمەوە هەیە موجامەلەی کەسی تیا بکەم، بەڕاستی، کە وەکو حزبیی قسە نەکەمو وەکو خۆم قسە بکەم، حزبەکەم رەنگە سەد جار دیپلۆماسیەت بەکاربهێنێ، بەڵام من ناتوانم دیپلۆماسیەت لەسەر فکر، لەسەر فەلسەفە، شتی عەلمانیو جیهانبینی فەلسەفە، خاتر بگرم. هۆی سەرەکی سەرەباسی ئەم بابەتە لای من لەوەوە هاتووە کە بۆچی هێزە ئیسلامیەکان، بەتایبەتی توندڕەوەکانیان کە هەمیشە، لەکاتێکدا شۆڕشی گەلێك لەپێناوی ئازادیو دیموکراسیدا ئەیەوێ بگاتە سەرکەوتن، ئەمانە سەرهەڵئەهێنن، شۆڕشی پیشەسازیو تەکنەلۆژیو زانستو ئەقڵانیەت ئەیەوێ بچێتە ناو کۆمەڵەوەو ببێ بەبەشێك لەرای گشتی، ئەمانە سەرهەڵئەهێنن، سەرکەوتن بەدی دێت ئینجا تیرۆریزمی ئیسلامی سەرهەڵئەهێنن، هۆی چییە ئەم هێزە ئیسلامگەرایانە، بەتایبەتی چەکدارەکانیان، کە ئەیانەوێ دەسەڵات بگرنەدەست بەچەکەوە هەوڵی دەسەڵات گرتنەدەست دەدەن؟ هۆی چییە لەسەدەی هەژدەهەمەوە، نۆزدەهەمو بیستەم، تا ئێستاشی لەگەڵ بێ، لەسەروبەندی سەرکەوتنی شۆڕشی دیموکراسیدا زۆرتر سەرهەڵئەهێنن؟ من ناڵێم هەرهەموویان، دەڵێم زۆرتر سەرهەڵئەهێنن، لەکاتێکدا بەشی زۆریان لەکاتی تەنگانەو خەباتی رزگاریو شۆڕشو قوربانیدانیدا، بەشی زۆریان خۆیان مات ئەکەنو کنە ئەکەن، قسە ناکەن، هەتا ئەوکاتەی دیموکراسی لەسەرکەوتن نزیك ئەکەوێتەوە، نیشتمان لەسەرکەوتن نزیك ئەکەوێتەوە، ئازادی خەریکە لەناو میللەتاندا دێتەدی، بەشێك لەم هێزە ئیسلامگەرایانە سەرهەڵئەدەن، چەك هەڵئەگرنو دەسبەجێش بەشی زۆریان، دروشمەکانیان، سیاسەتەکانیان لەناوبردنی هێزە عەلمانیو

دیموکراسیەکان ئەبێ، هۆیەکانی ئەمە چییە؟ لەسەر چ رەگێك ئەم ئەندێشانە ئەڕوێت؟ لەسەر چ رەگەزێك ئەم ئایدیۆلۆژیانە ئەڕوێت؟ بەڵێ سەرهەڵدانی ئەمانە لەهەلومەرجە هەستیارەکانی میللەتانی وکو ئێمە کە روبەڕوی دیموکراسی ئەبینەوە، روبەڕوی تەکنەلۆژیا ئەبینەوە، روبەڕوی زانستو زانیاریو پێشکەوتن ئەبینەوە، یاخود کاتێك نزیك ئەبینەوە لەسەرکەوتن، ئەم هێزانە بۆ دێنەپێشەوەو پرۆژەیەکی پێچەوانەی پرۆژەی نەتەوە، پرۆژەیەکی پێچەوانەی دیموکراسی، پرۆژەیەکی پێچەوانەی زانیاریو عەلمانی ئەهێننەپێشەوەو ململانێیەکی توندیشی پێئەکەن. خۆ دەورو بەریشمان ئاشکرایە، سەیری شۆڕشەکانی کوردستان بکە، ئەگەر خاتریان بگرین لەسەدەی نۆزدەهەمەوە بڵێین کە هەر ئەوکاتە ئەحزابی ئیسلامگەرا نەبووە، خۆ لەسەدەی بیست بەتایبەتی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانو جەنگی دوەمی جیهانو لەدوای جەنگی سارد، ئەحزابی ئیسلامگەرا هەبووە، کاریگەریشیان هەبووە، سەنگیشیان هەبووە، کەچی ئەبینی لەشۆڕشی ئەیلولدا دیار نین، لەشۆڕشی نوێدا دیار نین، لەفەلەستیندا سالی شەستوپێنج شۆڕش بەرپائەبێ کەچی هیچ هێزێکی ئیسلامگەرا دیار نیە، بەڵام راپەڕین کە نزیك ئەکەوێتەوە لەسەرکەوتن، جۆرەها هێزی ئیسلامی دروست ئەبێو چەك هەڵئەگرێتو ئاڕاستەیەکی تر پێچەوانەی شۆڕشی دیموکراسی فەلەستین ئەهێنێتەپێشەوە. سەرەنجامیش بینیتان کە چەندین پرۆژە تێکەڵاوبووە لەفەلەستینو کێشەکان وایلێهاتووە کە ئێستا هەموو دەوڵەتانی دنیا نیگەرانن بەرامبەر بەو دۆخەی کە لەناو فەلەستینا هەیەو نوێنەری شەرعی خەڵکی فەلەستین، ئێستا کەوتۆتە ژێر پرسیار، نوێنەری دیموکراسی لەفەلەستین ئێستا کەوتۆتەژێر پرسیار، لەکاتێکدا هێزێك دێتەپێشەوە نە باوەڕی بەدیموکراسیە، نە باوەڕی بەعەلمانیەتە، نە باوەڕی بەئازادیەو نەجۆرێکی تر بیر لەژیان، بیر لەسیاسەت، بیر لەدەسەڵات ئەکاتەوە، ئەمانە پرسیارگەلێکن بەراستی ئینسان ئەترسێنێ، لەباتی ئەوەی هاندی بدا، لەباتی ئەوەی دڵخۆشت بکات، لەبەرئەوە ئەم پرسیارانە ئەبینم، مەترسیەکانی لای خۆمان ئەبینم، مەترسیەکانی لەشۆڕشدا ئەبینم، مەترسیەکانی لەدوای شۆڕش ئەبینم، لەدوای راپەڕین ئەبینمو ئێستاش هەلومەرجێکی تازە هاتۆتەپێشەوە، کێ ئەڵێ چەند ساڵێکی تر ئێمە بەرەو دنیایەکی تر ناڕۆین، بەرەو دەستکەوتی سیاسی گەورەتر ناڕۆین، ئێستا ئەو دەستکەوتە سیاسیە

گەورەیە رەنگە بەرەو دەوڵەتمان بەرێ، گەر بەرەو دەوڵەت رۆشتن، ئێمە چۆن رووبەڕوی ئیسلامگەرامان ئەبینەوە، هێزە پشتیوانەکانی ئیسلامگەرا چۆن مامەڵە لەگەڵ ئیسلامگەراکاندا ئەکەن؟ بۆئەوەی لەبەرامبەر پرۆژەی دەوڵەتبوونی کورد کایە بکەنو بەدڵی ئەوان بێت، کە بەدرێژایی مێژوو ئەم بابەتانە هەر هەبووە، ئەم ململانێیە هەر هەبووە، ئیتر ئەبێ بەراستی پێم وایە تۆزێ کراوە قسە لەسەر ئەم مەسەلانە بکەین، بەهیوای ئەوەی کۆمەڵێ گرێی دەروونی هەیە لەناخی هێزە سیاسیەکان، لەناخی هێزە ئایدیۆلۆژیەکان، ئیتر هەقی وایە تۆزێ بەکراوەتر قسە لەسەر ئەمە بکەینو نەترسین لەوەی ئەبێ بیڵێین، نەترسین لەوەی کە لەقازانجی نەتەوەکەمانە لەباری فکریەوە، لەباری فەلسەفیەوە، هەقی وایە تۆزێ بەکراوەیی قسەی لەسەر بکەین.

بۆئەوەی بتوانم لەماوەی چل دەقیقەدا بابەتەکەم تەواوبکەم، هەوڵ دەدەم تۆزێ بەچڕی قسە بکەم هەرچەند ئەم بابەتە، زۆر کات هەڵئەگرێ، لانی کەم دوو سەعاتی ئەویست ئینسان بتوانێ سەعاتو چارەکێ قسەی لەسەر بکاتو سێچارەکە سەعاتێکیش موناقەشەی لەسەر بکات، بەڵام تازە لەناوی هەڵئەکێشین، چل دەقەیە قسە ئەکەم، بیست دەقەش بۆ ئێوە. مەسەلەی نەتەوەو مەسەلەی دەوڵەت دوو مەسەلەی پێکەوەبەستراون کە تۆ ناتوانی باس لەیەکێکیان بکەی، ئەوی تریان فەرامۆش بکەیت، بەهیچ شێوەیەك، ئەوەتەی نەژادەکان لەدنیادا چەکەرەیان کردووەو زمانی نەژادەکان پژاون لەدنیادا، ئەوەتەی رەگەزی نەژادەکان رۆچۆتە ژیانی کۆمەڵایەتیو ژیانی بەشەری لەدنیادا، هاوشانی ئەوە وردەوردە مەسەلەی دەسەڵاتی ئەم نەژادانە لەدنیادا بووە بەمەسەلەیەك لەمەسەلە گرنگەکانی دنیا، پێش پەیدابوونی ئاینەکان نەژاد هەبووە، لەکاتی پەیدابوونی ئاینەکاندا نەژاد هەر ماوە، لەدوای پەیدابوونی ئاینەکانیش نەژاد هەبووەو هەر رەگەزەکانی ئەم نەژادبوونەش، لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا رۆچوونو کارلێکیان کردووەو وردە وردە هەتا گەشتونەتە سەردەمی سەرمایەداریو شۆڕشی تەکنەلۆجیو لەگەڵ ئەمانەشدا، ئیتر هەڵچووە، مەسەلەی نەژاد بەرەو نەتەوەبوون چووە، بەرەو بزوتنەوەی رزگاریخواز چووە، بەرەو دەوڵەت بوون چووە، بەرەو یەکخستنی بازاڕ چووە، بەرەو یەکخستنی زمان چووە، هەتا وای لێهاتووە کە دەوڵەتی مۆدێرن دروست بێو دەوڵەتی مۆدێرنە تەعبیر بووە لەخولیا یا ئاواتە دیموکراتیەکانی میللەتانی

جیاواز جیاواز لەسەر ئەرز، هەتا شۆڕشی پیشەسازی لەدنیادا نەبووە بەپێی بۆچونی زۆربەی تیورناسەکانی دەوڵەتناسی لەدنیادا، ناشێ ئەو دەڵەتانە، یا ئەو دەسەلاتانە، یا ئەو قەڵەمڕەوانە، یا ئەو ئیمپراتۆریەتانەی کە لەدنیادا هەبووە، بەدەوڵەتی هاوچەرخ، یا دەوڵەتی مۆدێرن یا دەوڵەتێ کە ئێستا هەموو سیفەتەکانی دەوڵەتی تیایە، لەم سەردەمە حسابیان بۆ بکرێت، بەلام دەسەلات بوون، قەڵەمڕەو بوون، خاکیان یەك خستووە، میللەتانیان بەزۆری زۆرداری خستۆتە ناو قەڵمڕەوەکانیان، یاسایان هەبووە، دین لەپاڵیان بووە، مەزهەب لەپاڵیان بووە، ئایدیۆلۆژیەت لەپاڵیان بووەو پێش ئاینەکانو دوای ئاینەکان جۆرێك لەشورا، پەرلەمان، راوێژکردن، مەجلسی پیران، ئەوانە هەرهەمووی لەدێرزەمانەوە هەبووە، نەك ئێستا، لەزەمانی یۆنانیەکاندا هەبووە، لەزەمانی رۆمانیەکاندا هەبووە، زیاد لەهەزار ساڵ لەبەریتانیا هەبووە، لەزۆر ولاتەکانی تر ئەو جۆرە دەسەلاتانەو دەوڵەت هەبووە، بەلام دەوڵەتی مۆدێرن نەبووە، وەکو ئێستا کە دەوڵەتێك پێی بوترێ جێگیربووە، پێی بوترێ ئەتوانێ مقاوەمەتی دژەکانی خۆی بکات، ئەتوانێ لەپرۆسەیەکی دوورودرێژی مێژویدا تەواوی پەیامو پەیمانەکانی خۆی بەدیبهێنێ، کەوابێ بەدرێژایی مێژوو شتێك هەبووە، بەناوی دەوڵەت یان ئیمپراتۆریەت بوبێ، هەرشتێ بوبوێ شتێك هەبووە بەناوی دەسەلات، کە ئاینەکانیش هاتوون دیسان دەسە لات هەر هەبووە، قەڵەمڕەو هەر هەبووە، ئیمپراتۆر هەر هەبووە. لەتێکستە پیرۆزەکانیشدا چ لە جولەکە، چ لە مەسیحی، کە لەدوای ئەوەی رۆمیەکان مەسیحیەتیان کرد بەئایدیۆلۆژیەتی خۆیانو چ لەئیسلامیشدا، مەسەلەی دەسەلاتو مەسەلەی قەڵەمڕەو لەئارادا هەیە، قسەی لەسەرکراوە، هەولێ بۆدراوە، سەپێنراوە، یاسای بۆ دانراوە، مەزاهب قسەی لەسەر ئەوە کردووە، ئیجتیهادات لەسەر ئەو مەسەلانە زۆر زۆر هەیە، ئەوەی کە راستەوخۆ لەگەڵ ئێمە لەدرێژایی مێژوو دەسگیر بووە ئەگەر لەپێش سەرهەڵدانی دەسەلاتی ئاینەکان گەرێین، بێنە ناو دوای سەرهەڵدانی ئاینەکان، ئەوەی لەگەڵ ئێمەدا دەستگیر بووە زۆرتر دەسەلاتی ئاینی، بەتایبەتی دەسەلاتی ئیسلامی بووە، تکایە دیقەت لەقسەکەم بدەن، من ناڵێم ئیسلام، ئەڵێم دەسەلاتی ئیسلامی، چونکە ئیسلام شتێکە، دەسەلاتی ئیسلامی شتێکی ترە، دوو شتی جیاوازە، ئیسلام پیرۆزەو عەقیدەیە، ئینسان خۆی لەگەڵ خوای خۆی، لەگەڵ پێغەمبەری خۆی، لەگەڵ مەزاهبی خۆی، لەگەڵ

قەناعەتی خۆی، ئەوە زۆر زۆر ئاساییەو هەمیشە ئەم باوەڕانە هەبووەو هەقە ئازادی تەواوی بدرێتیو ئەقڵانیانە قسەی لەسەر بکرێ. بەڵام کە قسە دێتە سەر دەسەڵات، کە قسە دێتە سەر چۆنیەتی سەپاندنی دەسەڵات، قسە دێتە سەر مامەڵەی دەسەڵاتی ئیسلامی لەگەڵ ئەقوامی وەکو ئێمە، ئەمەیان هەزار جۆرە موناقەشە هەڵئەگرێ، پەیوەندیشی بە پیرۆزیی ئاینەکەو قورئانەکەو مەزهەبەکانەوە نییە، دوو بابەتی زۆر جیاوازە؛ چونکە خۆتان ئەزانن چەند ئیجتهاد بۆ دەسەڵات هەیەو دەسەڵاتەکانی ئیسلامی چ لەئومەویەکاندا بێ، چ لەعەباسییەکاندا بێ، چ هەتا لەسەردەمی خولەفای راشدینیش بێ، چ مامەڵەیەکیان کردووە لەگەڵ وڵاتانی وەکو ئێمە، چ مامەڵەیەکیان کردووە لەگەڵ دەسەڵاتەکانی بەرامبەر دەسەڵاتەکانی خۆیان کە هەیانبووەو سەرەنجام چ کوشتوکوشتارێکو چ تاڵانی گەورەگەورە لەمێژوودا بەرامبەر ئەقوامی وەکو ئێمە رویداوە تاوانی یەکجار گەورە بەناوی دەسەڵاتی ئیسلامیەوە بەرامبەر ئەقوامی وەکو ئێمە رویداوە، بەراستی ئەو کوشتوکوشتارەی کە لەوڵاتی عێراقدا، لەوڵاتی فارسدا، لەزۆرێك لەوڵاتانی دنیادا سەرەنجامی فتوحاتی ئیسلامی بەرامبەر ئەقوامی وەکو ئێمە کراوە، ئەو تاوانانەی کە کراون، تاوانی بێوێنەن لەمێژودا، بەناوی دەسەڵاتی ئیسلامییەوە، هیچ دەسەڵاتێك نە دەرەبەگایەتی، نە میرنشینی بەرگەی هێرشەکانی فتوحاتی ئیسلامی لەکوردستاندا نەگرتووەو هەتا سەدەی حەڤدەهەمو هەژدەهەمیش دوامیرنشینی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی، ئەگەر لەناوچووبن، یان هێرشەکانی بەرایی ئیسلامیو دەسەڵاتی ئیسلامی لەناوی بردوون، یان صەفەویەکان یان عوسمانیەکان لەناویان بردوون، دەوڵەتی بێگانە، ئیمپریالیزم، کۆلۆنیالیزم، ئینگلیز، بەریتانیا، ئەڵمانیا، فەرەنسا، ئەمانە لەئارادا نەبوون، بەپێچەوانەوە ئەوانە پاشان هێنراون ئیمپراتۆریەتەکانی عوسمانیو صەفەویشیان پێ بەهێزکراوە.

کاتێ کە شۆڕشی پیشەسازی کراوە، تەکنەلۆجیای ئەوانیان هێناوە، تۆپی ئەوانیان هێناوە، جەنەراڵەکانی ئەوانیان هێناوە، میرنشینەکانی کوردیان پێ تەفروتونا کردووە، یەك لەدوای یەك میرنشین لەئەنجامدا لەکوردستان نەما، کە هەموو میرنشینەکانی دنیا، ئەو میرنشینانەی کە لەکوردستاندا هەبووە، لەهەموو دنیاشدا ئەو میرنشینانە ناوکی پەرەپێدانی دەسەڵاتو فراوانی دەسەڵاتی ناسیۆنالیزمی میللەتانی دنیا بوون، یانی میللەتان لەخۆیانەوە نەبوون بەخاوەن

دەسەڵاتی ناسیۆنالیستی، میللەتان لەخۆیانەوە نەبوون بەدەسەڵاتی مۆدێرنێتەو پێشینە دەسەڵاتی دیاریان هەبووە، ئەویش دەسەڵاتی میرنشین بوون. ئەم دەسەڵاتانە وردە وردە گەشەی کردووە، تێکەڵاو بەشۆڕشی پیشەسازی بووەو سەرەنجام بزوتنەوەیەکی رزگاریخوازی میللی، کە هەموو میرنشینەکانی ڕێکخستووەو یەك قەڵەمڕەوی سیاسی لەمێژوودا دروستکردووەو دوایی دەوڵەتی مۆدێرنیشی لێپەیدا بووە، دوایی دیموکراتیشی لێ دروست بووە، دوایی ئەو پێشکەوتن و سەرکەوتنانە بەدیهاتوون کە ئێستا لەرۆژئاوا ئەیانبینین، کە دەوڵەتانی رۆژئاوا چەند دەوڵەتی گەورە گەورەو چەند دەوڵەتی خاوەن زانستو زانیاری و دەوڵەتی ئەوتۆ لەئارادان، کە ئێستا هەموو دنیایان خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. کەوابێ لەبەرامبەر پرۆسەیەکی سیاسی، دەسەڵاتدارێتی گەورەی مێژوویی دابین، وەکو کورد کە بەدرێژایی مێژوو بەهیچ شێوەیەك دەسەڵاتدارەکانی ئیسلامی، ئیمپراتۆریەتەکانی ئیسلامی، قەڵەمڕەوەکانی ئیسلامی لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی، بەهیچ شێوەیەك بواریان نەداوە هەناسەیەکی دەوڵەت مەداری لەوڵاتی خۆمانا بکێشین و بواریان نەداوە ناوکی دەسەڵاتی میرنشینەکانمان وردەوردە لەگەڵ ئاڵوگۆڕەکاندا گەشەبکات؛ بگرە بەپێچەوانەوە، هەمیشە سەرکوتیان کردوون، برادەرێك لێرەیە کاك (شوان) لەتێزێکی ماجستێریدا، سەلماندویەتی کە چۆن چۆنی وردەوردە دەسەڵاتەکانی ئیسلامی، دەسەڵاتەکانی کوردیان لەناوبردووەو کوڕێکی تر بەناوی ( فوئاد ئەسکەندەر) کتێبێکی تازەی دەرکردووە تێزی دکتۆرایەکە کاك (جەوهەر کرمانج) تەرجەمەی کردووە، تێزەکە زۆر بەوردی و بەدیقەتو بەخوێندنەوەی سەدان سەرچاوەی ئیسلامی سەلماندویەتی کە هەموو سەرکەوتنێکی دەسەڵاتدارانی ئیسلامی لەکوردستاندا، لەسەر حسابی میرنشینەکانی کورد بووەو میرنشین دوای میرنشین لەسەرەنجامی هێرشەکانی دەسەڵاتدارانی ئیسلامی لەکوردستاندا لەناوچوون، من ئەپرسم تێکشکانی ئەم هەموو دەسەڵاتەو سەرەنجام نەمانی دەسەڵاتەکان، چ کاریگەرییەکی هە بووە بۆئەوەی مەسەلەی نەتەوایەتی لەلای ئێمە درەنگ بخەملێ، درەنگ بکەوێتەوە لەمێژوودا، کە خۆمان ئەزانین دەسەڵات بۆ یەکخستنی بازاڕ، بۆ یەکخستنی زمان، بۆ زانست، بۆ تەکنەلۆژیا، بۆ کەلتور هەتا بۆ پێکهاتەی دەروونی، بۆ ئەدەب، بۆ کەلەپور، بۆ هەموو شتێك، دەسەڵات مەسەلەیەکی یەکجار گرنگە لەمێژوودا،

یانی هەموو ئەو میللەتانەی، هەموو ئەو نەتەوانەی لەمێژوودا دەسەڵاتیان هەبووە، ئێستا ئەو نەتەوانە لەنە تەوە هەرە دەوڵەمەندەکانی کەلتوری، ئەدەبی، سیاسی، یاسایی‌و کۆمەڵایەتین، بەپێچەوانەشەوە، ئەو نەتەوانەی کە دەسەڵاتیان لەمێژوودا نەبووە یان دەسەڵاتیان هەبووەو لەناوبراون لەمێژوودا، ئەو نەتەوانە ئەبێ کون‌وکەلەبەری مێژوو بگەڕێین بۆئەوەی پاشماوەی فکریان، پاشماوەی سیاسەتیان، ئەدەبیان، کەلەپوریان، فۆلکلۆریان، پاشماوەی زمانیان، کۆکەنەوەو تازە نەتەوەکانی وەکو ئێمەش، دە دوانزە فەرهەنگێکمان هەیە، لەملاوئەولا زمانەکانمان کۆبکەینەوە، ئەوە ئەرمەنەکان حاڵیان ببینن، ئەوە بلوجەکان حاڵیان ببینن، ئەوە تامیلەکان، ئەوەش کشمیریەکان، ئەمانە کە سەرەنجامی سەرکەوتنی قەڵەمڕەوەکانی ئیسلام هیچیان دەسەڵاتیان نەما، با بزانن چ حاڵێکیان هەیە، ئەویش لەسایەی ئەم دەسەڵاتانەی کە ئێستا هەیەو ئەو دەسەڵاتانەی کە لەوەوبەریش هەبووە؛ کەوابێ، لەلایەکەوە زەرەرێکی گەورەمان کرد کە دەسەڵاتەکانمان نەما، لەولاشەوە زەرەرێکی گەورەمان کرد کە خەملینی یا گەلاڵەبوونی پێکهاتە نەتەوایەتیەکەمان زۆر زۆر دواکەوت، ئەمەش بەدرێژایی مێژوو، سەدەی رابردوو، ئەتوانم بڵێم کاریگەریەکی یەکجار نیگەتیڤی کردە سەر بزوتنەوەی سیاسی نەتەوەکەمان‌و نوێنەری بزوتنەوەی سیاسیمان‌و سەرەنجام ئەو کێشەو بێشانەی توشمان بوون، یەکێك لەهۆیەکانی ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە نەتەوەکەمان درەنگ خەملی‌و بزوتنەوەکەشمان لەسەر بنچینەیەکی زانستی‌و تەکنەلۆژی‌و ئەقڵانی تەواو دروست نەبوو، هەربۆیە ئەو بزوتنەوانە ئەوەندە هەڵپەی ئەوەیان بوو لەناومان نەبەن، ئەوەندە نەیانئەتوانی لەباری بابەتیەوە ستراتیژی خۆیان، بەرنامەی دوورونزیکی خۆیان بخەملێنن‌و سەرەنجامیش بزوتنەوەکە ئەوەندە بەهێز بێ‌و بتوانێ بەرگەی دوژمنەکانی خۆشی بگرێت، لەکاتێکدا ئەگەر ئێستا سەیری بکەیت، ئەگەر ئێستاو سی ساڵ لەمەوبەریش سەیر بکەی، دوژمنەکانی ئێستای داگیرکەری کوردستان زۆرزۆر بەهێزتر بوون لەهەندێ دوژمنی لەوەوبەر کە هەڵیانکوتاوەتە سەر نەتەوەکەمان، لەبەرئەوەی کە لەهەناوی مەسەلە نەتەوایەتیەکانی ئێمەدا خەملێنێکی تەواو نابینی، پێکەوەبەستنێکی تەواو نابینی‌و رێگا گیراوە لەوەی کە سەرەتای سەرهەڵدانی بازرگانی بەرەو تەکنەلۆجیا بڕواو بازاڕ یەك بخات‌و زمانت یەك بخات؛ سەیرئەکەی ئەو نەتەوەیە

که هەشبوە، ویستویەتی پێبگات، ویستویەتی تێبگا، ویستویەتی بەرزبێتەوە بۆ ئاستی راپەڕاندنی ئەرکەکانی سەردەمی خۆی، لەبەرئەوەی لاوازبووە، لەبەرئەوەی کاریگەرییە نالەبارەکانی بەدەر لەمەسەلە نەتەوایەتییەکان، لەسەر نەتەوەکەمان هەبووە، ئیتر ئەوە نەتەوەیە نەیتوانیوە بەرگەی دوژمنی لاوازیش بگرێت؛ لەکاتێکدا دوژمنەکانیشمان هەمیشە دوژمنی یەکتر بوون، هەمیشە عوسمانیو صەفەوی دوژمنی یەکتر بوون. ئێوە لاتان سەیر نەبێ راپەڕینێك وەکو راپەڕینەکەی سمکۆ لەسەردەمێکدا سوپاکەی لەسوپای شای ئێران بەهێزتر بووە، نەشیتوانیوە سەربکەوێ، شێخ عەبدوڵڵای نەهری رائەپەڕێ، دووسەدوپەنجا هەزار چەکدارو موریدی ئەبێ، ناشتوانێ سەربکەوێ، بەدرخان ئەچێ شەڕ لەموسڵ ئەکات، ئەوەندە خۆی بەبەهێز ئەزانێ لەموسڵ شەڕئەکات، شێخ عەبدوڵڵای نەهری ئەچێ شەڕ لە ورمێو تەبرێز ئەکات، لەگەڵ ئەوەشدا چونکە لەناوخۆیدا پێکهاتەکەی بەحوکمی کاریگەرییەکانی دەرەوەی مەسەلە نەتەوایەتییەکان، لەناوخۆیا ئەوەندەی پوکاندۆتەوە، ئەوەندە لەژێر هەژموونی دەرەکی خۆیا بووە، ئیتر شتە ناوکییەکانی خۆی وەکو پرۆسیسێکی مێژوویی پێویست پێناگات، تێناگات، ناخەملێ، لەناو کۆمەڵەکەیو لەناو هەستەکانیان رەگ داناکوتێ، لەناو پێویستیە مێژووییەکانیان، لەناو ژانی لەدایکبوونی پرۆسەیەکی مێژوویی، نەتەوەیی، دەوڵەت دروستکردندا، لەبەر ئەوەیانە جەماوەرێکی یەکجار زۆریش کۆئەکاتەوە، کەچی ناشتوانێ سەربکەوێو بەرگەی یەك قۆرتە لەقۆرتەکان ناگرێ، بەرگەی یەك جەزرەبەی کوشندە ناگرێ، چونکە لەناوخۆیدا تەواو رەگاژوو نەبووە بەپێویستیەکانی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوە، لەبەرئەوە دژەکانی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوە لەدەرەوە بەهێزتر بووە لەسەری، ئەنتی بایتیکەکانی ئەم بزوتنەوە نەتەوایەتیە بەرامبەر کاریگەرە دەرەکییەکان لاواز بووە، لەکاتێکدا میللەتانی تر وا نەبوون، میللەتانی تر ئەنجامی ئاسایی گەشەکردنی خەباتی ئەوانو قۆناغی گەشەکردنیان سەیر ئەکەی، ئەوانە لەبەرامبەر دینێکی بەهێزتر، ئێمە واتێنەگەین مەسیحی لاوازتر بووە لەئیسلام، ئێستاش لەدنیادا سێ ملیار مەسیحی هەیەو یەك ملیار موسڵمان هەیە، هەمیشە دەسەڵاتی مەسیحیەکان لەدنیادا دەسەڵاتێکی بەهێز بووە، دەسەڵاتی رۆمیەکان ئاشکرایە چ دەسەڵاتێکی بەهێز بووەو زمانێکی یەکگرتووشی هەبووە، ئەگەر بوترێ دەسەڵاتی ئیسلامی لەبەرئەوەی دینی

هەبووە، مەزهەبی هەبووە، ئیجتاهادی هەبووە، زمانی یەکگرتووی هەبووە، سوپای هەبووە، شەریعەتی هەبووە، بۆ سەرکەوتون مەسیحیەکانیش ئەمانەیان هەمووی هەبووە، بەلام لەوێدا چونکە گەشەکردنی ئاسایی ئەرواتە پێشەوەو سەرەنجام دەسەلاتی مەسیحی کە ئەگاتە بنبەستو ناکۆکیەکانی لەگەڵ پەیوەندی بازرگانی، شۆرشی پیشەسازیو هێزەکانی بەرهەمهێنانو پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان ئەتەقێتەوە، نوێنەرەوەی شۆڕشی پیشەسازی لەوکاتەدا بەهێز دێتەپێشەوە، سەیرئەکەی لەبەرامبەریدا دەسەلاتی ثیوکراتی مەسیحی خۆی ناگریو سەرەنجام شۆرشی پیشەسازی، شۆڕشی نەتەوەیی، شۆڕشی یەکخستنی زمانو بازاری ئەو ولاتانە یەکەیەکە سەرکەوتن بەدەست ئەهێنن‌و بەهێزترین قەلمرەوەکانی ئەو سەردەمەی مەسیحیەکان یەك یەك لەناوئەبات، ئەگەرچی ئەو قەلەمرەوە لەرێنسانس بەولاوە هەتا ئەگاتە دادگاکانی پشکنین، تا ئەگاتە سەدەی هەفدەهەم پێنج ملیۆن ئینسانیش ئەکوژن، بەلام لەبەرامبەریا بزوتنەوەیەکی مێژووکردی بەهێز کە پێکهاتەکانی، رەگەزەکانی، پرۆسیسەکەی زۆر بەهێز دێتەپێشەوە، لەسەر بنەمایەکی ئابوری بەهێز دێتەپێشەوە، ئەتوانێ بەرگەی هەموو هێرشەکانی ئەو دەسەلاتە ثیوکراتیە مەسیحیە بگرێو ئەتوانێ بەرگەی هەموو ئەو قەتلوعامە بگرێو ئەتوانێ هەتا بەرگەی ئەوەش بگرێت کە بەسەدان ئەندێشمەندو عالمو سەدان ئابوریزان، لەناو ئەو بزوتنەوەیە لەناویش ئەچن، بەلام هەرخۆی ئەبێ بەکانگای ئەوەی هەزارانی تر دروست بکات، چونکە زەرورەتێکی بابەتی لەدوایەوە بووەو لەناو خۆشیا، لەناو پرۆسەکە، رەگەزەکانی پێکهێنانو بەهێزبوونی هەمیشە لەبەهێزبوندا بووە، بۆیە دژەکانی نەیانتوانیوە بەرەنگاریو خۆراگریەکانی ئەم لەناوبەرێ، لەکاتێکدا ئێمە هەمیشە دژەکانمان توانیویانە توخمەکانی خۆراگریەکانی پێکهاتەی نەتەوەییمان لەناوبەرن، یەك فەتوا بەس بووە پاشای کۆرە لەو رەواندوزە ئازیزەی خۆمانەوە، چەکەکەی دابنێ بچێ بۆلای خەلیفەی عوسمانی، خەلیفەی عوسمانیش هەزار سوێندی بەمێزەرو قورئانەکەی بۆ خواردووە، کە هیچی لێناکات، سەرەنجام خۆمان زانیمان چی لەمیری رەواندوز کراوە، خۆمان زانیمان چی لەشێخ عەبدوللای نەهری کراوە، چ لەبەدرخان کراوە، چی لەهەموو سەرکردەی راپەرینەکانی کوردستان کراوە، کە هیچیان نیە سوێندو قورئانو هەزار شتی تریشی بۆ نەخورابێ، هەتا بچنە لای سولتانەکان، کە چوشن

بـەرێزەوە مامەڵـەیان لەگـەڵ كـراوە. رێزەكـە لەئەنجامـدا بەشــی زۆریــان یــا دەستبەسەركراون یان نەفی كراون بۆ یونان، یا بـۆ عەرەبـستانی سعودی، یـان بەموئامــەرە لــەناویان بـردوون، ئــەم وەزعیەتــە بەدرێـژایی مێـژوو هــەتا ئەگاتــە جەنگی جیهانی دووەم بەردەوام بووە.

من بەش بەحاڵی خۆم یەكێك لەبەرپرسیارێتیەكانی دروسـتنەبوونی دەوڵـەتی كوردسـتان لەمێـژوودا ئەگێڕمــەوە بـۆ دەسـەڵاتدارەكانی ئیسلام، یـەكێك، نـاڵێم هەمووی، بەڵام هۆیەكی زۆر زۆر گـرنگیش بـووە، ئـەو دەسـەڵاتانەی لەهــەزارەی یەكـەمو دوەمـدا لەناوچـوون، دەسـەڵاتە ئیـسلامیەكان لـەناویان بـردوونو ئـەو بزوتنەوانـەی سـەریش نەكـەوتن، كاریگەریـەكی هــەرە نیگـەتیف لەسـەریان، كـە سـەرنەكەوتوون، ئەگەڕێتــەوە بـۆ دەسـەڵاتەكانی ئیـسلام؛ لەجـەنگی دووەمـی جیهـان بەدواشـەوە، ئـیتر خۆمـانو ئیمپریـالیزم دێتەپێـشتەوە، كـە بەهەقیقـەت لەدوای جەنگی یەكەمی جیهان هـەلی بـاش هەڵكـەوت بـەداخێكی زۆرەوە هەڵـەی گەورە كراوە بەرامبەر بەوە، كە شێخ محمودی نەمر پیاوێكی گەورەیە لەمێـژوودا، هیمەتێكی یەكجار گـەورەی كـردووە لەمێـژودا، پیاوێكـە بەبنەماڵـە دینـی، بـەڵام بەئەقڵ ئـەقڵانی بـووە، نەیویـستووە دەوڵـەتی دینـی دروسـتبكات، ویـستویەتی دەوڵـەتێكی قـەومی دروسـت بكـات، بـەڵام بـەداخێكی زۆرەوە، هەنـدێ هەڵـەی تەكتیكی قورسی كرد، سەرەنجام زۆر خراپ لەسەری كـەوت، ئـەوەبوو فرسـەتی سیڤەرو ئەو وەزعیەتەی كە هەڵكەوت، لەدەستچوو، لەدەستچوونەكەش ئـەوەبوو كە وتم، هەم سیاسەتی كۆلۆنیالیزمی پرۆژەیەكی نەبوو بۆ كوردو هەم هەڵـەكانی سەرداڕانو سەركردەكانی خۆشمان كەم نەبوون ئەوكاتە.

بێگومـان لەجـەنگی یەكـەمی جیهـانی بەدواوە تـا جـەنگی دووەمــی جیهـانی لــەبیرمان نەچــی كـــە بزووتنەوەیـــەكی فەندەمەنتالیــستی بــەهێز لەمیــسر سەرهەڵـدان بەناوی (ئیخوان موسلمین) ئـەم بزوتنـەوە فەندەمەنتالیـستە، ئـەو كاریگەریەی نەبووە لەوڵاتانی ئێمەدا، بەڵام لەمیسر خۆی كاریگەریـەكی بـەهێزی هەبووە، ئەلتەرناتیڤێكی بەهێز هەبووەو بەرامبەر دەسەڵاتی مەلەكیو لەبەرامبەر ئـەو خەباتـە دیموكراسیەی كـە هـەبووە، ئیخـوان موسـلمین دیـوارێكی گـەورەی بەرامبەر مەسەلە دیموكراتیەكانی ئەوكاتە هەڵچنیەوە كە لەرۆژئاواوە بـۆ وڵاتـانی ئێمە هاتووە، پێش ئەوەش كـە نـاپلیۆن هـاتووە بـۆ وڵاتـانی ئێمـە، چاپخانـەی هێنــاوە، ئـــەقڵی هێنــاوە، هـــەموو رەوتـــە ســـەلەفیەكانی ئەوكاتـــەش دژی

گواستنەوەی ئەقڵی مەدەنیو مۆدێرن بوون لەوڵاتانی ئەورووپاوە بۆ میسرو دەوروبەری، لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانیش ئیخوان موسلمین کە دروستئەبێ، پرۆژەیەکی بەپێچەوانەی پرۆژەی مۆدێرنێتەکردن، پێچەوانەی پرۆژەی ئازادی، پێچەوانەی پرۆژەی بەئەقڵانیکردنی کۆمەڵگا دەپێچێتە تێکستی پیرۆزایەتی ئیسلامو بەتوندی دژی سەرهەڵدانو نشونماکردنی دیموکراسی دەبن.

لەدوای جەنگی دووەمی جیهانیش کە تەیاراتی ئیخوان موسلمین نەقڵ ئەبێ بۆ وڵاتانی ئێمە، بەهەمان ئەقڵیەت نەقڵ ئەبێ، لەپەنجاکان بەدواشەوە کە ئەحزابی ئیسلامی لەوڵاتانی ئێمە دروست ئەبێ لەژێر کاریگەری ئیخوان موسلمین سەرهەڵدەدەن. بچن مێژوویان بخوێننەوە لەهەموو وڵاتانی لەمەڕ خۆمان، یەکێك لەمانە یەك پرۆژەی نەتەوایەتی نیە، یەك پرۆژەی دیموکراتی نیە، یەك پرۆژەی مۆدێرنێتەی نیە؛ لەوڵاتانی ئێمەدا، ئیخوان موسلمین بەدرێژایی مێژوو ئەو پرۆژانەی هەر نەیبووە، تازە تازە قسە لەدیموکراسی ئەکەن. چەند ساڵێکە کە ئەزانن دیموکراسی بەرەو برەوی سەرکەوتنی گەورە ئەڕوات، ئیخوان موسلمین هەوڵئەدات بگونجێ لەگەڵیا. نەك دیموکراسی بکات بەپرۆژەی ستراتیژی خۆی، ئیستغلالی ئەو دیموکراسیە بکات بۆئەوەی بتوانێ بێتە سەر حوکم، کە هاتە سەر حوکم مەگەر خۆیانو خوای خۆیان بزانن چیمان لێئەکەن ئەوانە، مەعلومیشە کە ئەو تێکستەی ئەوان باوەڕیان پێیەتی، ئەو خیتابەی ئەوان باوەڕیان پێیەتی، دەوڵەت بەرەو کوێ ئەبەن ئەوانە، هەموو ئەو لایەنانەی کە لەژێر کاریگەری ئیخوان موسلمینەکان، لەوڵاتانی ئێمە دروست بوون، بچن سەیری مێژوویان بکەن، لاپەڕەیەکم بۆ بێنن لەمێژووی خۆیاندا، یەك لاپەڕە، پرۆژەیەك دوورونزیك، پرزەی مەسەلەی نەتەوەیی و پرۆژەی دەوڵەتی نەتەوەیی لەدوایانەوە هەبێ، پرزەیەکیشی تیا نیە، تروسکاییشی تیانیە، هەرگیز تیایا نیە، بەپێچەوانەوە، نەك هەر تیایدا نییە، بەڵکو لەساڵی (١٩٧١-١٩٧٢) بەبڕیاری مورشیدی ئەعلای ئیخوان موسلمین، حزبی ئیسلامی عێراقی کە ئێستا نوێنەرەوەی ئیخوان موسلمینە لەعێراقداو ئەوانەی لەکوردستانیش لەناو ئەو حزبە بوون، لەسەر بڕیاری مورشدی ئەعلاو سەرکردایەتی ئیخوان موسلمین خۆیان تەجمید ئەکەن، تا ساڵی ١٩٩٤ لەکوردستاندا کە راپەڕین بوو، کە سەرکەوتن، کە حکومەت دامەزرا، کە پەرلەمان بوو، ئینجا یەکگرتوو لێرە ئیعلانی خۆی کردو وتیان هەینو لەبەیاننامە ناوخۆییەکانیاندا ئەڵێن ئێمە لەساڵی (١٩٧١-١٩٧٢) خۆمان

تەجمید کـردووە، نــەك هــەر ئەوەنـدە بــەڵکو لــەدوای کیمیابـاران کردنــی هەڵەبجەشدا، کاتێك کە کۆمەڵێك لـەو ئیسلامیانە دێنـە دەرەوەو ئەچنە ئێـران، لـەوێ ئەیانـەوێ جیهـاد بکـەن، ئەیانـەوێ چـەك هـەڵبگرن بـەناوی بزوتنـەوەی ئیسلامی، ئـەم تـەیارەی کـە ئێـستا یـەکگرتووی ئیسلامی دروسـتکردووە، زۆر بەتونـدی دژی ئەوانــە بـوون، هــەموو ئۆردوگاکـانی ئەوکاتــە ئەگـەڕێن لــەناو کوردەکاندا ئەوخەڵکانـە ساردئەکەنەوە کـە ئەیانـەوێ بـەناوی جیهـادەوە چـەك هەڵبگرن‌و بێن مقاوەمەتی بەعس بکەن، یـانی نـەك قبولێـان نـەبووە، خـەباتێکی نەتەوەیی‌و رزگاریخوازی بەرەو ئۆتۆنۆمی‌و فیدراڵ‌و دوایی بەرەو دەوڵەت بـڕۆی، بگرە ئـەوەی کـە ئیـسلامییش بـووەو رۆژێ لـەرۆژان بەباشـی بـیری کردۆتـەوە بۆئـەوەی بێتـە نـاو ئـەم پـرۆژە نەتەوەییـە لـەپاڵیا سـەنگەرێکی تـر لێبـدات، ئەویشیان قبوڵ نەبووە، بەبڕیاری مورشیدی ئەعلا کە هاتوون تـەبلیغی مامۆسـتا مەلاعەلی، مامۆستا مەلا عوسمان، مامۆستا مەلا سدیق‌و هەموو ئەو سەرکردانەی کـە ئەوکاتـە ئیـشیان کـردووە، مامۆسـتا عـەلی بـاپیر ئێـستا ئـەمیری کۆمـەڵی ئیسلامیە، هەموو ئەمانەیان تەبلیغ کردووە وتویانە ئیخوان موسلمین پێیان بـاش نیە ئێوە چەك هـەڵگرن، ئـەم پرۆژەیـە پـرۆژەی ئیسلام نیـە، نامیلکەیـەکم لایـە برادەرێك نوسیوێتی بەناوی نهێنـی ئـەڵێ مـەلا صـدیق کـە بزوتنـەوەی راپـەڕینی ئیسلامی دروستکرد، ئەڵێ کە نامەکەی مورشیدی ئیخوانەکانی دیوە ئەمرەکەیان بۆهاتووە بەناوی (بسم الله الرحمن الرحیم) دەستپێکردووە کە نابێ ئێـوە جیهـاد بکەن‌و چەك هەڵگرن‌و لەگەڵ مەسەلەی کورددا بن، مـەلا صـدیق وتویـەتی (بـسم الله)ی لـێ‌لابەن ئەیخەمە ژێرپێم، ئەمەم قبوڵ نیـە کـورد لەمیحنەتێکدایـە نـاکرێ چـەکی بۆهەڵنـەگیری‌و بەقـسەی ئـەوانیش ناکـەین‌و فعلـەن نـەیکرد، هـەتاوەکو هاتیشنەوەو بزوتنەوەی راپەڕینیش دروست بوو، دوایی لەگەڵ بزوتنەوەش یەکی گرتەوە، بەڵام لەگەڵ یەکگرتوی ئیسلامی یەکیان نەگرت لەسەر ئەو بڕیارەی کـە درابوو.

بۆئــەوەی زۆر کاتەکــەم نــەڕوات دێمــە ســەر ئێـستا.. ئێـستا تـازە ئێمــە رابردوومـان لەدەسـتچوو، هـەر هۆیـەك لەهۆیـەکان بوبـێ بـەهۆی سـەرنەکەوتنی هـەموو ئـەو خـەبات‌و ئومێـدەی کـە داومانـە، تـازە رابردوومـان لەدەسـتچوو، ئایەومایە هاتوینەتەسەر ئـەم دەسـەڵاتەی کـە ئێـستا هەمانـە، هـەموو نەتـەوەی کورد لەچل تا چل‌وپێنج ملیۆن ئینسان چاوی ئومێدی بڕیوەتە ئەزمونی ئێستای

که لەباشوری کوردستان هەیە، باشوری کوردستان خۆشبەختانە فرسەتێکمان بۆهەڵکەوتووە، ئۆتۆنۆمی تێپەڕی، هاتوینەتەسەر فیدراڵ، فیدراڵەکەش بەشێوەیەکی ئەوتۆیە کە ئینسان دڵی پێی خۆشە، ئەگەرچی هێشتا ماوێتی بەتەواوەتی باقی ئەرکەکانی تری فیدراڵ بەدیبێت. بەڵام سەرکەوتنەکانی، پێشکەوتنەکانی، چارەسەرکردنی کێشەکانیو چەسپاندنی ئەو بنەمایانەی کە هەیە بۆ فیدراڵ ئێستا لەکوردستاندا بەمانە دڵخۆشی لەناو نەتەوەی کورددا دروست بووە، ئەم مەسەلەیە بەتەسەوری من ئەگەر بتوانین بیپارێزین پاشەرۆژێکی جوانی ئەبێ، یەکێ لەمەترسیەکان (مەترسی زۆرە) یەکێ لەمەترسیەکان لەناو خۆمان ئەیبینم ئەویش پرۆژەی ئیسلامی سیاسیە، بەش بەحاڵی خۆم کاتی خۆی زاراوەیەکم بۆداڕشتووە بەناوی (ئیسلامگەرایی) لەبەرامبەر ئیسلامگەرایی رەوتەکانی ئیسلامگەراییدا، بەداخەوە تائێستا دراسەیەکی قوڵمان نیە کە ئەم ئیسلامگەرایانە، بەرەوتی جیاوازیشیانەوە، لەگەڵ مەسەلەی نەتەوە بەرەو کوێ ئەڕوات؟ ئایا یەکگرتوو لەگەڵ مەسەلەی نەتەوە بەرەو کوێ ئەڕوات؟ ئایا کۆمەڵی ئیسلامی لەگەڵ نەتەوە بەرەو کوێ ئەڕوات؟ ئایا بزوتنەوەی ئیسلامی لەگەڵ نەتەوە لەدواپەیامیا بەرەو کوێ ئەڕوات؟ ئاشکرایشە (جند الاسلام)و ئەوانە چی ئەکەن، ئەوانە با لەلیستەکە دەربکەین، وازیان لێبهێنین، من لێرەوە ئاوا قسەنەکەم ئەڵێم سەردەمەکە جیهانگیریە، جیهانگیریش پەیامێکی هەیە، پەیامەکەش دەوڵەتێکی دیموکراتیە کە کرانەوە تیایدا بەرقەراربێت، شەفافیەت تیایدا بەرقەرار بێت، بازاڕی ئازاد تیایدا بەرقەرار بێت، یەکسانی ژنو پیاوی تیادا بەرقەرار بێت، مافەکانی منداڵ تیایدا بەرقەرار بێت، ئەقڵیەتی هەمووی ئەبێ ئەقڵیەتێکی عەلمانی بێت، سکولاریزم بێت. ئەمە پەیامەکانی دەوڵەتی نەتەوەیە لەسەردەمی جیهانگیردا، جگە لەمە من شتێکی تر شك نابەم لەم سەردەمەدا. شتێکی تر ببێ کەواتە ئەبینە مایەی کاردانەوەیەکی دوری سیاسەتی نێونەتەوەیی بەرامبەر بەخۆمان، جا لێرەدا کورد لەبەردەم دوڕیانێکداین: رێیەکی دیموکراسیو عەلمانی، ئەقڵانی، مافەکانی مرۆڤ، بازاڕی ئازادو دەوڵەتێکی مۆدێرن بەتەواوی مانای وشە، ئەمەمان بوێ و ئیشی بۆ بکەینو خەباتی بۆ بکەین، دیارە پشتیوانی نێونەتەوەییمان بۆ ئەبێت، بەپێچەوانەشەوە، پشتیوانی نێونەتەوەیی لەخۆمان ئەتەکێنینەوە، رێگای سێیەم لەبەردەمدا نیە، یا رێگایەکی دیموکراتی مۆدێرن، یان رێگایەکی پێچەوانەی دیموکراتیو پێچەوانەی مۆدێرن کە ئەبینە مایەی ئەوەی ئەم هەموو

پـشتیوانیی و ئـەم هـەموو سـۆزە نێونەتەوەییـەی کـە بەرامبـەرمان هـەیانبووە، لەدەستی بدەین، یانی ئەرکی هێزەکانی رزگاریخواز، هێزەکـانی دیموکراتخـواز، هێزەکانی ئازادیخوازی ئێمە کامەیە، ڕێگایەك بگرینەبەر کە هەموو ڕێگاکانی دنیا پشتیوانی بکات و هاتوچۆی تیا بکەین، یا ڕێگایەکی تر کە هەموو ڕێگاکـانی دنیـا کوێربکەینـەوە تاکـە ڕێگایـەکمان بمێنێـەوە کـە ڕێگـای دەوڵـەتێکی پێچـەوانەی دەوڵـەتی دیموکراتیـەت دژی دەوڵـەتی مۆدێرنـەو سـەرەنجام گەلەکۆمـەکیمان لێبکرێت، بێگومـان ئەگـەر بمانـەوێ دەرس لـەڕابردوو وەربگرین، دەبـێ ڕێگـای دەوڵەتە دیموکراتە مۆدێرنەکە بگرینەبەرو پـشتیوانیە نێودەوڵەتیەکە بەرەبەرە زیاتر بکەین بۆخۆمان، ئەگەر بشمانەوێ بەپێچەوانەوە بیکەین و ڕێگاکانی ڕابردوو بۆخۆمـان بدۆزینـەوە، بگەڕێینـەوە بـۆ دەسـەڵاتەکانی سـەدەکانی ناوەڕاسـت، دەسـەڵاتەکانی سـەدەی ناوەڕاسـت، لەگـەڵ ئـەم سـتراتیژە نیـە، مـن قـسەم لەسەریەك تەرمینالّی نەتەوەییە، سوارئەبم و ئەچم ئـەبم بەدەوڵـەتی نەتـەوە، بـۆ شوێنی تر ناڕۆم، قسەکەم لەسەرئەوەیە ئەتانـەوێ سـواربین بـچین بـۆ دەوڵـەتی نەتەوەیی مۆدێرنی دیموکراسی، ئەمە ڕێگاکەمانە، ئەتانەوێ سواربین بۆ شـوێنی تر، ئەمە بابەتێکی ترە موناقەشەی ترە، قسەی تـرە، ئـەبێ کـۆڕی تـری لەسـەر ببەسـتین، بـەش بـەحاڵی خـۆم بـۆ ئـەم دەوڵـەتی مۆدێرنـە، بـۆ ئـەم دەوڵـەتی دیموکراسیە، هـەر هێزێکـی ئیـسلامی بـەڕونی لەگـەڵ نـەبێ بـەلوغمێکی ئـەزانم لەئایندەدا، دەبێ ببینە خاوەن پرۆژەیەکی نەتەوەیی، دیموکراسی، مـۆدێرن کـە تەواوی پشتیوانەکانی دنیا زیاتر بکات بۆ خـۆی، ئیـسلامگەرا بەخەتـەری ئـەبینم بۆ ئاییندە، لەبەرئەوە دەبێ لەگەڵ ئەم هێزە ئیسلامگەرایانە، جگـە لەمەسـەلەی سیاسەت، کە هەقی خۆیانە سیاسـەتمان لەگـەڵ بکـەن، ئێمـەش هـەقی خۆمانـە سیاسـەتیان لەگـەڵ بکـەین، جگـە لەمەسـەلەی سیاسـەت مـن ئـەڵێم ماوەیـەك لەبەردەماندا ماوە هەڵـەکانی ڕابـردوو نەکەینـەوە، لەهەڵـەکانی ڕابـردوو زەرەری زۆرمان کردووە چ لەهەڵەکانی پێش جەنگی یەکەم، چ لەهەڵـەکانی دوای جـەنگی یەکـەم و چ لەهەڵـەکانی دە بـۆ پـانزە سـاڵی ڕابـردوو، فەلـسەفەی حوکممـان، فەلسەفەی ئابوریمان، فەلسەفەی یاسامان، فەلسەفەی ئیدارەمان، فەلـسەفەیەك بـووە کـە بەڕاسـتی هەمووڵایـەك توانیـوێتی یـاری پێبکـات، خۆمـان ئەوەنـدەی ئیعتمادمان لەسەر مێژوو قوربانیەکانی خۆمان بووە، ئەوەندە ئیعتمادمان لەسەر پتەوراگرتنی کۆڵەکەکانی دەوڵەتێکی باش و دەسـەڵاتێکی بـاش و دیموکراسـیەکی باشمـان ڕانـەگرتووە، بۆیـە دەبینـی کـەموکوڕی و کـەلێن لەتێکستەکانی ئێمـە،

لەسیاسەتەکانی ئێمە، لەبەرنامەکانی ئێمە، لەپرۆژەکانی ئێمە، لەئیدارەی ئێمە، لەپەرلەمان‌و حکومەتی ئێمە، لەئابوری ئێمەو لەخیتابی سیاسی ئێمەو کەموکوڕی زۆری تیابووەو کەموکوڕیەکەش قۆزراوەتەوە، بەشێوەی جۆراوجۆر قۆزراوەتەوە، بەشەڕ قۆزراوەتەوە، بەتیرۆر قۆزراوەتەوە بەچەواشەکردنی خەڵك، بەفریودانی خەڵك، بەدژایەتیکردنی هێزە سیاسیەکانی ئێمەو بەشێوەیەکی فراوان‌و بەربڵاو بەهەموو ڕێگاکان هەرچی کراوە لەرابردوو کراوە بەرامبەرمان، ئەگەر توانیبێتمان، بەهۆی پێکهاتەی نەتەوەیی تۆکمەتری ئێستامانەوە بەرگەی ئەو هەموو کێشانە بگرین کە لەرابردوودا هەبووەو خۆشمان لەناوخۆماندا (یەکێتیی‌و پارتی بەتایبەتی ئەڵێم) هەڵەمان کەم نەکردووە، لەبەرامبەر لایەنەکانی تریشدا، ئەگەر شانسێکی گەورەمان هەبووبێ بەرگەی هەموو کێشەکانی بەرامبەرەکانمان‌و ناوخۆی خۆمانمان گرتبێ، ئەگەر رەگەزەکانی نەتەوەیی ئێستامان لەرابردومان ئەستورتر نەبان، کارەساتی ناوخۆیی خێراترمان بەسەردەهات. بەتایبەتی بەدەستی ئیسلام‌و ئیسلامگەراکان رێك ئێستا وەکو فەلەستینیەکان‌و جەزائیریەکان‌و، ئەفغانستانمان لێ‌ئەهات، دەشبێ بزانین ئەم شانسە هەمووجارێك بۆمان نایەتەپێشەوە، ئەم شانسە دەبێ ئاگامان لێی بێ، ئەم سیاسەتە دەبێ ئاگامان لێی بێ، ئەم پرۆژەیە دەبێ ئاگامان لێی بێ‌و دەبێ بزانین چۆنیەتی دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵ، دیموکراتیزەکردنی یاساکانمان، دیموکراتیزەکردنی دامودەزگاکانمان‌و ئاراستەکردنێکی جوانتری شارستانیەی پێویستیەکانمان، دەبێ بزانین نابێ بەپێێ رەوتی جاران بین. چونکە ئەگەری لاوازکردنی رەگەزە نەتەوەییەکانی ئێستامان بەدەستی ئیسلامگەراکان، لەئارادان.

چەند ساڵە تیرۆر لەکوردستان هەیە، من پرسیار ئەکەم: دە ساڵە لەکوردستان تیرۆر هەیە، تازە تازە کۆنفرانسی بۆ ئەبەستین، دە ساڵە تیرۆر هەیە تازە تازە بیر لەیاسای دژی تیرۆر لەپەرلەمانی کوردستاندا ئەکەینەوە، نەك ئەوە بگرە هەموو حزبەکانمان، حزبە عەلمانی‌و دیموکراتیەکانمان، بەچەپ‌و غەیرە چەپەکانمان، برۆ سەیری ئەدەبیاتیان بکە، پەیرەوپرۆگرامەکانیان سەیر بکە، هەتا ئاخرین کۆنگرەیان وشەی عەلمانیەت‌و وشەی مەدەنیەت لەپەیرەو پرۆگرامەکانماندا نیە، بەوانەی ئێمەشەوە بۆ ئاگاداریتان، پرۆژەیەکمان نیە پێی بڵێی پرۆژەی دیموکراتی هەمەلایەنە، خیتابێکمان نیە پێی بڵێی خیتابێکی دیموکراتی هەمەلایەنە، شەهیدەکانمان، قوربانیەکانمان‌و دڵسۆزی خەڵکەکەمان

بەهۆی کاریگەری خەباتی رزگاری نەتەوەییەوە، وایکردووە کە بەراستی بەرگەی هەموو کێشەکان بگرین، سەرەڕای ئەو هەموو خاڵە لاوازەی کە هەشمانە، نابێ دووبارەبێتەوە، مێژوو هەمووجارێ هەلمان بۆ هەڵناخات، بەتایبەتی وەکو وتم: من ئەمەم زۆر لا گرنگە، کورد روبەڕوی ئەگەری گۆڕانکاری گەورەین لەکوردستان، روبەڕوی ئەگەری گۆڕانکاری سیاسی وەرچەرخێنەر لەکوردستان‌و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەبینەوە، دەبێ ئامادەکاریەکی باشترمان هەبێ، دەبێ خۆمان بۆئەوە ئامادەبکەین کە هەموو ئەو مەترسیەی ئایدیۆلۆژی، مەزهەبی‌و سیاسیانەی کە لەناوخۆماندا، لەسەر پرۆژەی مۆدێرنێتەی نەتەوەیی لەکوردستاندا هەیە، کە تواناکانی بەدەوڵەتبوونمان، بەدەسەڵاتبوونی نەتەوایەتیمان، زیاتر لاواز بکات، دەبێ بەرامبەر بەوانە خۆمان بەهێز بکەین، لەهەموو بارەیەکەوە خۆمان بەهێز بکەین، لەپەرلەمان، لەحکومەت، لەناو کۆمەڵدا خۆمان بەهێز بکەین، لەناو رێکخراوە دیموکراتیەکاندا، لەراگەیاندندا، لەپەروەردەدا، لەهەموو شتەکاندا دەبێ خۆمان بەرامبەر بەو فشارانە بەهێز بکەین‌و ببین بەخاوەن فەلسەفەیەك، یا جیهانبینیەکی دەوڵەتداری رون‌ورۆشن، تەمومژی تیا نەبێ، بۆ ئەم مەسەلەیە، ئەرکمان ئەمەیە‌و دوبارەی ئەکەمەوە، بۆئەوەی رونتر بێ، ئەویش ئەوەیە: هەر هێزێکی ئیسلامگەرا لەگەڵ پرۆژەی دیموکراسی بۆ دروستکردنی دەوڵەت، دەسەڵاتی مۆدێرنی دیموکراسی کوردستان نەبێ، ئەوا ئەم هێزە هەر هەلێکی بۆ هەڵبکەوێ، هەڵدەکوتێتە سەر دەستکەوتەکانمان‌و چەشنی شۆڕشی چەواشە پرۆسەی دیموکراتیزەکردنی کوردستان تێك دەدا. لەساڵانی رابوردووشدا هەوڵ دراوە بەلام بۆیان نەچووەسەر. بەڵێ: هێزێکی ئیسلامگەرا بەیانی لێمان هەڵدەگەڕێتەوە، ئەگەر لەگەڵیشمان دەبن، دەبێ لەوبارەیەوە بەوردی پرۆگرامیان، بەرنامەیان‌و سیاسەتیان رۆشن کەن، نەك بەشداری ئەکەن لەهەڵبژاردن، دێنە ناو هاوپەیمانی کوردستان، ئەمانە مەسەلەی سیاسی رۆژانەن، سالانەن، بەلام مەسائیلی ستراتیژی هەیە لەناو کوردستاندا، لە مەسەلە ستراتیژیەکاندا دەبێ رون بن، تۆ لەبەرامبەر دیموکراسی راستەقینە بەهەموو چەمکەکانی، بەهەموو لایەنەکانی پرۆژەیەك هەیە پێی ئەڵێن پرۆژەی دیموکراسی‌و دەوڵەتێکی دیموکراسی، لەگەڵیا چۆن ئەبن، ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە دەبێ ببڕێتەوە. بەش بەحاڵی خۆم قەناعەتم وایە هەتا حزبەکان لەسەر ئەساسی ئاینەکان، لەسەر ئەساسی

مەزهەبەكان بن، ئەمانە دژوارە پرۆژەی دەوڵەتێكی دیموكراسی مۆدێرن قبوڵ بكەن، ئەمانە بۆئەوە دروست بوون سوپاو پرۆژەی خۆیان بهێننە سەر حوكم، ئەگینا دروست نەئەبوون، لەگەڵ ئەم حزبانە ئەبوون، مادام در وست بوون، كەواتە هەتا ئەوان حزب بن، ئایدیۆلۆژیەتیان هەبێ، قیادەیان هەبێ، بەرنامەی نزیك‌و دوریان هەبێ، ئەو حزبانە خەبات ئەكەن بۆ ئایدیۆلۆژی‌و ستراتیژی خۆیان، چونكە ئایدیۆلۆژیەت‌و ستراتیژیەتی دیموكراتی ئەحزابە دیموكراتیەكانیان قبوڵ بكردایە، لەریزی یەكێكیان دەبوون. هێزی دیموكراتی جۆراوجۆر هەیە لەكوردستاندا. لەوپەڕی چەپ تا ئەگاتە ئەمپەڕی ناوەڕاست (ناڵێم راست) هیچی ئەمانەی قبوڵ نەبێ، كەواتە ستراتیژەكانی ئەوانیشی قبوڵ نابێ لەئایندەدا، بۆیە هەقە ململانێی لەسەر بكەین، پرۆژەكەمان دەوڵەمەندتر بكەین، بەهیوای ئەوەی ئەگەر پرۆسەیەكمان هەبێ، پرۆژەیەكی باش بێ لەئایندە بتوانین بەدیبهێنین، ئەبێ مەسائیلی سیاسی ترمان یەكلا بكەینەوە، بەهیوای ئەوەی كە بەراستی یەك چاو ببینەوە لەگەڵ یەكداو هەموو لایەكیشمان بزانین ئەركەكانمان چییەو فرسەتی زۆر گەورەشمان لەبەردەم هەیە، رابردوومان لەكیس چوو، ئێستا ئەم فرسەتە هاتۆتەپێشەوە، ئەم فرسەتە گرێكەی كەوتۆتە دەستی خۆمان بیكەینەوە، بەدەستی خۆمان بیكەینەوەو نەیخەینە دەم باشە، كە خستمانە دەم گرفتەكانی جەزائیرو فەلەستین لەبەرچاوبگرین، ئەوانیش بەشۆڕشی چەكداری وەكو ئێمە، ئەوانیش بەقوربانیەكی زۆر وەكو ئێمە سەركەوتیان بەدەستهێنا، نەتیجەكەیان ئەوەیە كە ئەیبینی ئێستا.

زۆر سوپاس.

## دیالۆگێك دەربارەی

## (مەدەنیەت و ئیسلام و دیموکراسی؟) (+)

مەدەنیەت ئاخۆ ئەم زاراوە، ئەم چەمکە فەلسەفیە، ئەم زاراوە ئەفسوناوییە، چی بێ کەوا توانیویەتی لەچارەکە سەدەی دواییدا هەژموونێکی تەواو بکاتە سەر هەموو بوارەکانی ژیانی شارستانیتیمان؟، ئاخۆ ئەم زاراوە فیکری و فەلسەفیە، نهێنییەکانی لەکوێدایە کەوا توانیویەتی باڵ بکێشێ بەسەر فیکرو ئەندێشەی زۆربەی هەرەزۆری رۆشنفکرو سیاسییەکانی دنیای ئەمرۆدا، لەئەوپەڕی چەپەوە تائەوپەڕی راست؟ ئاخۆ رەگ و ریشەی مێژینەی ئەم چەمك و ئەم زاراوە فەلسەفیە ئەگەڕێتەوە بۆ کوێ؟ لەسەردەمی ئەمڕۆماندا ئاخۆ پیادەکردنی ئەم چەمکی لەژیانی واقعی بەشەردا لەخۆرهەڵات و لەخۆرئاوای ئەم دنیایەدا تاکوێ گەییوە؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانە، دوو میوانی بەڕێزمان هەیە لەستۆدیۆدا بەخێرهاتنیان دەکەین ئەوانیش بەڕێز کاك عبدالرحمن صدیق، ئەندامی سەرکردایەتی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانەو، بەڕێز کاك مەلا بەختیار ئەندامی سەرکردایەتی (ی.ن.ك)ە بەخێربێن سەرچاو..

---

+ دیالۆگێك لەگەڵ (عەبدولرەحمان صدیق) ئەندامی سەرکردایەتی یەکگرتووی ئیسلامی، شەوی ١٧–١٨ /١٩٩٩/٢ بەرنامەی (دایالۆگ)ی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان. لەژمارە (٣)ی گۆڤاری (مەدەنیەت) لەساڵی ١٩٩٩ دا بڵاوکراوەتەوە.

مامۆستا عبدالرحمن لەسەرەتاوە ئەمانەوێ لەدیدو گۆشەنیگای یەککگرتووی ئیسلامییەوە، وەك حزبێکی ئیسلامی سیاسی پێناسەیەکی کورتمان بۆ چەمکی مەدەنیەت، بۆ بکەیت:

**عبدالرحمن/** بسم الله الرحمن الرحیم؛ پێشەکی زۆر سوپاسی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان دەکەم (بەرنامەی دیالۆگ) کەدیارە لەزۆر موناسەباتا تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان کەهەر بابەتێ، باسێك دابەزێ جێگەی سوپاسە کەبەراستی ناوەکەی بەخۆیەوە بێ، هیواداریشین هەر بەم شێوازە بێت تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان؛ دیارە هەر مەسەلەیەك لەڕوانگەی ئایدۆلۆژیی‌و لەروانگەیەکی ترەوە رەنگە مسائیلێك هەبێ وجودێك تەعریفێکی عیلمی هەبێت کەئەوە هەڵنەگرێ لەروانگەی یەککگرتوو، یان یەکێکی تر چۆنبێت، پێم وایە ئەم زاراوەیە بەچەندەها قۆناغ تێپەڕی کردووە، هەر لەهاتنی وەکو چەمکێك‌و پاشان بۆ زاراوەو پاشان بۆ دروشم‌و پاشان بۆ ئەوەی کەبەهایەکی مەرجعی هەبێت، مەدەنیەت خۆی لەخۆیدا ئەمڕۆکە زیاتر باسی لێ ئەکرێت کوردەواریشمان لەمێژەوە پێی ئاشنابووە، بەڵام رەنگە چەمکەکەو ناوەکە وەکو مەدەنیەت ئێستا خۆی بۆ خۆی شتێکە ئەوترێ تازەیە، بۆیە مەدەنیەت ئەمڕۆ کەباسی ئەکرێ لە کۆمەڵی مەدەنی خۆی ئەبینێتەوە، لەتەواوی ئەو رێکخراوانەی کەلەهەموو بوارەکانی ژیاندا کاری خۆیان ئەنجام ئەدەن‌و ئەکەونە نێوان دەوڵەت‌و خێزانەوە، ئینجا ئەو هەموو کۆمەڵە گروپ‌و رێکخراو تاکەکەسانە ئەشێ لەبواری رۆشنبیری بێ، ئەشێ لەبواری سیاسی بێ، ئەشێ لەبواری کۆمەڵایەتی بێ، ئەو بوارانەی ژیان هەرهەمووی رێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی رۆڵی تیا ئەبینێ‌و بەو مانایە کۆمەڵی مەدەنی بریتییە لە تەواوی ئەو رێکخراوانەی کەدەکەونە نێوان دەوڵەت‌و خێزانەوە، لەبەرچی لەبەرئەوەی کە کۆمەڵی مەدەنی خۆی لەخۆیدا خۆبەخشی‌و سەربەخۆبوونی تیایە. ئەویش لەوەوە سەرچاوەدەگرێ کەکۆمەڵە کەسێك، ئارەزوومەندانەو خۆبەخشانە لەدەوری کارێکدا کۆئەبنەوە، بەبێ ئەوەی کەهیچ فشارێك لەسەریان هەبێ، بەبێ ئەوەی کەدەوڵەت بێ، بەبێ ئەوەی کەپەیوەندیەك پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی وەکو خێزان بێ، بەزۆر بەیەکەوە لکێندران لەو بابەتە بۆیە سەربەخۆبوون‌و خۆبەخشی لەکۆمەڵی مەدەنیا دوو چەمکی زۆر زۆر سەرەکین.

**دیالۆگ**/ بەڵێ کاك مەلا بەختیار مامۆستا عبدالرحمن مـەفهومی مەدەنیـەتو کۆمـەڵی مـەدەنی کـرد بـەپردێك لـەنێوان دوویەکـە کۆمەڵایـەتی یەکـەمیان سەرەتاییترین وەحدەیانە کە خێزانە، وەئەوی تریان باڵاترین وەحدەی اجتماعیە کەدەوڵەتە، جەنابت بۆ ئەو مەبەستە پێناسەتان چییە؟

**مـەلا بـەختیار**/ منـیش سـوپاس بـۆ تەلـەفزیۆنی گـەلی کوردسـتان، بـۆ بەرنامەکـەتان، بەرنامـەی دیـالۆگ کەبەراسـتی دیـالۆگ مەسـەلەیەکی ئێجگـار گرنگە، تاوتوێ کردنی هەموو ئەو دیاردەو دەسکەوتانەی لەناو کۆمەڵ هـەنو بـۆ زانینـی ئەرکـەکانی هـەموو لایـەكو هـەموو کەسێكو هـەموو گروپێـكو هـەموو رێکخراوێـك، بەرامبـەر بەکۆمـەڵ بەرامبـەر بەدەوڵـەت، بەرامبـەر بەدەسـەڵات، بەرامبـەر بەئینـسان، بەرامبـەر بەفەلـسەفە، بەرامبـەر بەمەزهـەب، بەرامبـەر بەهەموو مەسەلەیەك بەراستی مەسەلەکان روونو یەکالا بۆتەوە.

مەدەنیـەت وەکـو زاراوە، وەکـو چـەمك، بـەداخێکی زۆرەوە بـەحوکمی ژێـر دەسـتەیی نەتـەوەی کـوردو داگـیرو دابەشـکراوی کوردسـتان، وەکـو لـەماڤی چـارەنووسو مەسـەلە سیاسـییەکان ئێمـە بەدرێـژایی مێـژوو بێبـەش کـراوین، داگیرکـەرانی ئێمـە لـەکولتورە شارسـتانیو مـەدەنیو پێـشکەوتوەکانیش بەفلتەرێکی ئێجگار خەست، چۆڕ چۆڕ بەشیان داوین، یابەناچاری بـووە بواریـان داوە کۆمـەڵی ئێمـە لەچـەمکە شارسـتانیەکان، لەپەیوەندیـە شارسـتانیەکان، لەبۆچونە شارستانیەکان، تێ بگا وپێ بگا.

مەدەنیـەت یـەکێك لەزەرورەتـە هـەرە چارەنووسسازەکانی بینـای کۆمـەڵ، ئێـستا لەعیراقـدا بـەداخێکی زۆرەوە بەکـەمترین شـێوە، لـەناو ئێمـەدا رەنگـی داوەتەوەو بەکەمترین شێوە لەناوماندا بڵاوبۆتەوە، بۆیە تێگەیشتنیش لامـان زۆر کـزەو تەنانـەت ئـەتوانم بڵـێم؛ ئەمـە چـەند سـاڵێکە جاروبـار راسـتەوخۆ، یـا ناراستەوخۆ، قسە لەمەدەنیەتو بینای کۆمەڵی مەدەنی لای ئێمە دەکرێ.

مەدەنیـەت لەسـەدەی (١٧)ەوە سـەری هەڵـداوە، کەلـە سـەدەی (١٧)ەوە سەری هەڵدابێ، جیاوازی بۆچـوون لەسـەر مەدەنیـەت زۆرە؛ لەسـەر مەدەنیـەت وەکـو چـەمك، مەدەنیـەت وەکـو جێبـەجێکردن، مەدەنیـەت وەکـو پێشخستن، یەکالاکردنی دەوڵەتو دەسەڵاتو ئۆرگانە مەدەنیەکان، جیاوازییـەکی زۆر هەیـە؛ جیـاوازی لـەناو فەیلەسـوفەکان، کەهەمووشـیان مەدەنیـەتیان قبوڵـە، هەیـە، جیـاوازی لـەنێوان رێبـازی عـەلمانیو غـەیرە عـەلمانی هەیـە؛ جیـاوازی لـەنێوان

سۆشیالیستەکانو غەیرە سۆشیالیستەکان لەسەر بۆچوونی مەدەنیو چۆنیەتی بینای کۆمەڵی مەدەنی هەیە. خۆشبەختانە ئێستا منو کاك عبدالرحمانیش کەلێرەدا دانیشتووین، کاك عبدالرحمن وەکو یەککگرتوویەكو منیش وەکو یەکێتیەك، بێگومان هەردوولامان لەدوو روانگەی جیاوازەوە بۆ ئەم مەسەلەیە دەڕوانین، ئەمەش سودێکی باش بەدایالۆگ دەگەیەنێ. چونکە دایالۆگ لەچەندین روەوە باس کردنی مەسەلەیەکە، نەك لەدیدێکەوە، لەروانگەیەکەوە، لەفەلسەفەیەکەوە؛ تۆ بتەوێ ئەوەی خۆت بکەی بەئیلزام بەسەر خەڵك، بەسەر عەقڵی خەڵك، ئەوە کارێکی زۆر خەتەرناکەو خۆی بۆخۆی دژی مەدەنیەتە، بۆیە هەر لەئێستاوە با زەمینەیەك خۆش بکەین کەخوێنەرو بینەرو بیسەری ئازیز لەئێمەی قبوڵ بکا، کەبیروڕامان جیاوازە لەسەر ئەو مەسەلەیە، چونکە رۆشنە بەرنامەی ئەوان وەکو یەککگرتوو، بەرنامەی ئێمەش وەکو یەکێتی؛ هەرچەندە یەکێتییو یەککگرتوو وەکو (ناو)، چاوگەکەی یەك شت بێت، بەڵام وەکو فەلسەفەو جیهانبینیو کۆمەڵ بیناکردن، دووشتی ئێجگار جیاوازن لەیەکتر.

لەراستیا ئەگەر من ئیزافەیەکم هەبێ بۆ قسەکانی (کاك عبدالرحمن) ئەوەیە کەلەکۆمەڵی مەدەنیدا جگە لەوەی گروپی خۆبەخشو سەربەخۆ دادەمەزرێنو مەدەنیەت دادەمەزرێنن، سەربەستی ئازادی ئینسان زۆر گرنگە، ئازادی عەقڵ زۆر گرنگە، واتە: عەقلانیەت لەکۆمەڵی مەدەنی و ئازادی ئینسانی عەقلانی لەکۆمەڵی مەدەنیدا مەسەلەیەکی ئێجگار گرنگن.

**دایالۆگ**/ کەواتە لای تۆ کرۆکی مەسەلەکە ئازادییە..

**مەلا بەختیار**/ ئا ئازادی وەکو ئینسان، ئازادی وەکو رێکخراوبوون، ئەمە دوو مەسەلەی ئێجگار گرنگن. واتە: ئینسان دەبێ ئازادبێ لەبیرکردنەوەی، ئازادبێ لەئایدیۆلۆجیەت، ئازادبێ لەمەسەلەی مەزهەب، ئازاد بێ لەمەسەلەی هەڵبژاردنی فەلسەفەیەك لەفەلسەفەکانی ژیان،و دەبێ مەدەنیەتەکەی بەستراوی عەقلانیەتی ئینسانو ئازادی ئینسان بێ. واتا: مەسەلەی عەقلانیو فەلسەفە وضعیەکان، ئەوەی کە بوونی بابەتی لەناو کۆمەڵو لەناو سروشتدا هەیە، هەموو ئەو دیاردانەی کەبوونی بابەتییان هەیە، لەتێگەیشتنی مەدەنییەتو چۆنیەتی کارکردن بۆ کۆمەڵی مەدەنی لەعەقلی ئینسانی موتەمەدینا، عەقلانیانە بێتو بەعەقلانیەت خزمەتی مەدەنیو کۆمەڵی مەدەنی بکات.

**دایالۆگ/** باشە کاك بەختیار من لەقسەکانی بەڕێزتەوە پرسیارێك ئاراستەی کاك عبدالرحمن دەکەم:

کاك مەلا بەختیار لەدیدو بۆچوونی خۆیەوە، ئازادی لەهەموو لایەنەکانا، لەهەموو لایەنەکانی ژیانا، بەتایبەتی ئازادی عەقلو بیرکردنەوە ئەکاتە کرۆکی مەسەلەی مەدەنیەت بەرای بەڕێزت ئەوە چۆن ئەکەوێتەوە لات؟

**عبدالرحمن/** بێگومان دیارە متەفقم لەگەڵیا، چونکە بەراستی مەسەلەی مەدەنیەت کەباسمان لێکرد، جگە لەوەی کەباسمان لەسەربەخۆبوونو خۆبەخشیەکە کرد، ئازادی هاوزەمان لەسەربەخۆییەکەدا، لەبەرئەوە لەراستیا ئەو باسە، ئازادی ئینسانە کە عەقلانیەت ئەمانە هەمووی هیچی خیلافی لەسەر نیە. بەڵام ئەوەی کە وتی لەدوو بۆچوونی جیاوازەوەو جیاوازیشین، من پێم وایە راست دەفەرموێ، ئەگەر ئەوە جیاوازیە لەوەیا سەرچاوە دەگرێ ئەگەر بیروڕای ئێمە وەکو (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان) بیروڕای دینی بێ، جیاوازە لەوەی تەفکیری ئیسلامی بێ بۆ؟ لەبەرئەوەی کە ئێمە ئەبێ ئەو دوو چەمکەش لەیەك جیابکەینەوە: چونکە بەراستی بەشێکی زۆر ئەمڕۆ لەئیسلامخوازانی سەرتاسەری دنیا، کەلەرووە فیکریەکەوە سەرچاوەی هەموویان قورئانو سونەتە، دێن جۆرێك لەبیرکردنەوەی ئاینی هەیە، واتە چی بیرکردنەوەی ئاینی جیاوازی چیە لەگەڵ ئیسلاما، مەسەلەن ئەوە وا ڕوونە لەقورئانا لەبەرئەوەی کەئاین بەشێوازە کەنەسیەکە چۆن لەئەوروپا کەنیسە قۆرغی هەموو دەسەڵاتەکانی بۆ خۆی کردوە، بەهەمان شێوە جۆرێك لەبیرکردنەوەی ئیسلامیش بەباوەڕە دینیەکە هەیە بەو مانایەی کەپێی وایە ئەبێ هەموو کەسێك لەسەر یەك شێواز بیرکاتەوە، هەموو کەسێك بەیەك شێواز بڕوات.

**دایالۆگ/** هەموو شەمەندەفەرەکان لەسەر یەك هێڵ بڕۆن..

**عبدالرحمن/** بڕۆن، ئەمە لێرە مەسەلەیەکە ئەبێ روونی بکەینەوە، چونکە بەراستی یەکێك، یا چەند خەڵك، ئێستا حساب کەین لەسەر ئەوەی چین ئەو رێگرانە لەبەردەم بنیاتنانی مەدەنیەتو کۆمەڵی مەدەنیا، یەکێك لەوانە خۆی ئایینە. ئەگەر بەو شێوازە بیری لێ بکەینەوە وەکو ئاین، وەکو چۆن لەئەوروپا بەو شێوازەی کەنیسە پیادەی دەکرد، واتە من لێت ناشارمەوە جۆرێك

لەبیرکردنەوەی ئیسلامخوازان، جۆرێك لە منظرینی ئیسلامی کە شتێك دەربارەی کۆمەڵی مەدەنیە باس دەکەن، بەراستی ئەگەر چەمکەکە چەمکی دەوڵەتی ئاینی بێ کە ئینسانەکە مەعصوم بکات، ئەوە بەراستی ڕێ بەکۆمەڵی مەدەنی نادەن، بەڵام بۆچوونە ئیسلامیەکە من بۆیە لێرەوە بۆی دەچم، بۆ ئەوەی کەوا ئەمیان زیاتر روو لەمن دەکات، کەگوایا ئایا بەپێی قورئان ڕێگە هەیە بۆ کۆمەڵی مەدەنی، لەروانگەی قورئانا کەئێمە ئەیکەین بەمەرجەعیەتی کارمان، ئەبێ ڕێگە هەبێ بۆ کۆمەڵی مەدەنی، ئالێرەوە ئەبێ چارەسەری مەسەلەکە بکەین، چونکە ئەگەر لێرەوە دەرفەتەکە کرایەوە، ئیتر مانای وایە هیچ ڕێگرێکی تر نابێ بمێنێ لەبەردەم بنیاتنانی کۆمەڵی مەدەنی، دیارە من پێم وایە ئایەتێك هەیە زۆر جێگەی خۆیەتی هەرچی خوتەبا هەیە ئێستا لەشاری سلێمانی، کوردستان، سەرتاسەری جیهانی ئیسلامی، لەهەر مەسەلەیەکا جیاوازیان هەبێ لەیەك مەسەلە زۆر ڕێکن، ئەویش ئەوەیە مولاحەزە بفەرمووی کەهەرچی خوتەبا هەیە لەشارا، ڕۆژی جمعە کۆتایی خوتبەکەی بەئایەتێك دێنێ ئایەتی ژمارە (٩٠) لەسورەتی (نحل) ((ان الله يأمر بالعدل والأحسان وإيتاء ذى القربى وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي يعظكم لعلكم تذكرون)) دەوڵەتی ئیسلامی‌و کۆمەڵی مەدەنی، واتە خەتی گشتی دەوڵەتی ئیسلامی، لێرە روونە لەسەدا تقریبا ئەتوانە ئەگەر جیای بکەمەوە لەتفاصیلێکی دوورو درێژی ترا لەسەدا دەی دەسەڵا بەدەست دەوڵەتی ئیسلامییە، ئەبێ ببێ نەك دەوڵەتی ئاینی داخلی وردەکاری بێ، دەوڵەتی ئاینی بەچەمکی ڕۆژئاوایی کەداخلی هەندێك لەمفکرینی ئیسلامی بووە، لەبیرکردنەوەیا کەپێی وایە هەموو شتێك لەلای خۆیەتی، حەقەکە هەمووی لەلای خۆیەتی، وابیر دەکاتەوە کەتفاصیلی ژیانی ئینسانەکانی شار هەمووی بەدەستی ئەوەوە بێ، بەڵام لەدەوڵەتی ئیسلامیا شتە گەورەکان بەدەست دەوڵەتی ئیسلامییە، لێرە ئەگەر بەکورتی زۆر بەکورتی باسی بکەین ((ان الله يأمر بالعدل والأحسان وإيتاء ذى القربى)) لێرەدا ئەم چەمکی مەدەنیەتە لەقورئانا تێبینی ئەکەین؛ تفسیری قورئان بێنی ئیحسانەکە ئەچێتەوە سەرچەمکی مەدەنیەت، من نایگونجێنم هەر خۆی وایە، عدل لەهەموو تفاسیرەکان دەریبهێنە، عدل چیيە؟ عدل یەکسانییە لەمکافیئەکاری دەوڵەت، عدالەتە، دەوڵەت کە دروست دەبێ، دەوڵەتی ئیسلامی لەپێناوی ئەوەیە کەعەدالەت مسۆگەر کات بۆ هاووڵاتیان، عەدالەت ئەوەیە کەبەرامبەر کارێکی دیاریکراو، کرێیەکی دیاریکراو، بەرامبەر کارێکی ناشایستە بەرامبەر بەتاوانێك

چیه؟ سزایەکی تایبـەت هەیە ئەمە کارێکە ئەمە عەدلە، بـەلاّم احسان چیە؟ احسان ئەوەیە کەکارێك کرا لەبەرامبەر ئەوە زیاتری بـەیتێ ئەگـەر تـاوانیش بـوو هەوڵ بـدەی کـەم تـرین سـزای بـدەی؛ هـەموو کۆمـەڵی مـەدەنی شـتێکی فـشار دروست دەکەن لەسەر دەوڵەت، لـەم پێناوەیـە بۆیـە بزانـە ((ایتـاء ذي القربـی)) ئالێرەیا باسم لەخێزان بـوو، ((ایتـاء ذي القربـی)) واتـەخزمو کـەسو کـار، خـزم کـەسو کـار داخلـی کۆمـەڵی احـسان نابێـت. لەئیـسلاما واتـە دەوڵـەتمان هەیـە کەئیشی ئەوەیە کەعدل بپارێزێ، لەبەرامبەریشەوە احسانمان هەیە احـسان واتـە ئەو کۆمەڵەیە کەدەکەوێتە نێوان عدلو ایتاء ذي القربی ، ایتاء ذالقربـی بەمـەعنا خزمو کەسو کارە، ئەوە خێزانە ئەوەی ئارەزوومەندنیم واتا: تۆو مـن هـەر یـەك لەئێمە خێزانێکمان پێکەوە ناوە، ئارەزوومەندانە هاوسەری خۆمان هەڵبژاردووە، بەلاّم هەرچی عەشیرەتو خزمو کەسوکارەکەی منو تـۆ ئـەوە ئـەو کۆبوونـەوە: عەشیرەتیەیە، لەسەر ئـەو ئەساسـە ئـەو کۆبوونـەوە خێڵەکیـە، ئـەو کۆبوونـەوە خێزانییـە، بـەم جـۆرە بیکـەن بەکۆمـەڵوکاری لەسـەر بکـەین ئـەوە زۆر دژ ئەوەستێتەوە لەگەڵ کۆمەڵی مەدەنیا، رێگرە لەبەردەمی کۆمەڵی مـەدەنیا بۆیـە لەقورئانا جیاکراوەتەوە، لەبەرامبەریشا کەئەڵێ ((وینهـی)) خـوا لەچـی نـەهیتان ئەکا ((عن الفحـشاء والمنکـر والبغـي)) هـەر وشـەیەك لەبەرامبـەر ئـەوا (فحـشاء) تاوانە گەورەکانە ((مـاعظم قبحـة مـن الاقـوال والأفعـال)) ئـەوە ئیـشی دەوڵـەتی ئیسلامی سنورەکانو بودجەو دارایـی دەوڵـەتو ئـەو کارانـەی کەئـەمڕۆ دەوڵـەت لەسەری ئەمێنێتەوە، ئەو دوای کارەکان (منکر) بۆ کـێ دانـراوە؟ بـۆ بەرامبـەری (احسان) واتە کۆمەڵی مەدەنییە، دەسکاری کاری کۆمەڵ ئەکاتو بەجێی ئەوەی کـە وا شـت فـەرز ناکـات بـەوەی کـەوا هـەوڵ ئـەدا کارەکـانی خـۆی لەهـەموو بوارەکانی ژیانا. (منکر) چین شتە نامۆکان بەکۆمەڵ شـتی نـامۆ بەکۆمـەڵ ئـەوە لەوێیە بۆ لەبەرامبەر ئەو (بغی)) دانـاوە (بغـی) لەبەرامبـەری ئەوەیـە کـەخزمو دۆسـتو کـەسو کـار ئەوەندەیە پەیوەندیەکـەیان تێـك نەچـێ (بغی) (تطـاول) و(تجاوزی) حەدە، بەو مانایە لەم شەش وشەیە لەقورئانا سەرەتایەکە بۆ ئـەوەی کەئەم بۆچوونە، ئـەم تەفـسیرە کەچـی بکـا دەسـەلاّتەکان لەیـەك جیابکاتـەوە، دەسەلاّتی خێڵو خێزانو عەشیرەتو ئەوانە نابێ تێکەڵی کۆمـەڵی مـەدەنی بـێ، چونکە سەربەخۆ نییە، ئـازادی نییـە، لەدروست کردنەکـەیا لەهـەمان شێوەشـا (عدل) کاری دەوڵەتە (احسان) کاری کۆمەڵی مەدەنییە.

(ايتاء ذي القربى) ئەو كارەیە بۆیە یەك ئەگرمەوە لەگەڵ كاك مەلا بەختیار لەسەر مەسەلەی ئازادییەكە، ئەو تفصیلە بۆ ئەوە بوو كە (تأصیلی شرعی) بۆ مەسەلەكە هەیە یان نا، ئەگەر ئەوە ببێ ئیشەكە ئاسانترە ئەوە نەبێ قورسە.

**دیالۆگ**/ كاك مەلا بەختیار ئەو ئۆرگانە كۆمەڵایەتیانەی كاك عبدالرحمن ئاماژەی پێدان؛ خێزان، خێڵ، هۆزو عەشرەت، ئەوانە لەسەرانسەری مێژوودا دیارەو نكولی لێ ناكرێ كەرێگرن لەبەردەمی دروست بوونی كۆمەڵێكی یەككگرتووی سەرانسەری، یابابڵێین: كۆمەڵێك كەهاووڵاتی تیا دروست بووبێ، هاونیشتمانی تیا دروست بووبێ، چونكە بیرو بەرژەوەندیە بچكۆلەكان، هی یەكە بچكۆلەكانی كۆمەڵ، زیاترێ سەرنجی مرۆڤ رادەكێشێ بۆخۆی‌و پابەندی ئەكا بەخۆیەوە، رێی لێ ئەبەستێ كە ببێتە هاووڵاتی لەوڵاتێكی گەورە، لەمیللەتێكی گەورە، لەكۆمەڵێكی گەورەترێكدا، تۆ ئەوە چۆن لێك دەدەیتەوە ئایا ئەم دوو دژە چۆن كۆئەكەیتەوە لەیەك دێرا.

**مەلا بەختیار**/ من پێش ئەوەی وەڵامی جەنابت بدەمەوە، حەز دەكەم بۆ تەواوكردنی روونكردنەوەكەی خۆم، رەنگە رونكردنەوەیەكیش بێت دەربارەی چەمكی تیۆری مەدەنی، باشتر حەز دەكەم تۆزێ قسە لەسەر سەرتاسەری سەرهەڵدانی مەدەنیەت بكەم بەكورتی وئینجا دێمەوە سەر قسەكانت؛ رەنگە هەندێ تێبینیشم هەبێ لەسەر قسەكانی كاك عبدالرحمن.

جارێ مەدەنیەت پێشتریش وتم لەسەدەی (١٧)ەوە سەری هەڵداوە، لەسەدەی (١٧) ئەم چەمكە زادەی شۆڕشی پیشەسازی‌و سیستەمی دیموكراسییە؛ واتە كاتێك لەسەدەی ١٣وە بۆ ١٦ ئەوروپا دووچاری قەیرانی گشتی كۆمەڵایەتی‌و چینایەتی جوتیارو دەرەبەگ بوو، بازرگانی‌و پیشەسازی هاتە پێشەوەو، وەكو ئەڵتەرناتیفی سیستەمی دەرەبەگایەتی هاتە پێشەوە، كەسیستەمی دەرەبەگایەتی هەڵتەكا، بەپەیوەندی ئابوورییەوە، بەژێرخانی ئابوورییەوە، بەفەلسەفەوە، بەفكرەوە، بەمەزهەبەوە، بەمەزهەب‌و دەسەڵاتی مەزهەبی ئەوكاتەشەوە، كاتێك كەئەمە هەڵتەكا، ئینجا لەسەدەی (١٧) مەسەلەی مەدەنیەت بوو بەمەسەلەیەك وەكو تەواوكردنی سیستەمی دیموكراسی لەناو كۆمەڵا، لەهەناوی كۆمەڵاو بۆ بینای كۆمەڵ. كەوابێ لێرە ئەبێ بچینە سەر راستیەك ئەویش ئەوەیە: من بەش بەحاڵی خۆم قسەم لەسەر دەق نییە، دەقی

ایەتی قورئانی پیرۆزو ئەوانە قسەم نیە، قسەم لەسەر تەفسیرە، چۆن تفسیر
ەکەی، تفسیری دەق، هەر دەقێك بێت، یا حەدیس، یا قسەی هەر ئەولیایەك
ێ، ئەمە تەفسیرە، تفسیر جیاوازی هەڵئەگرێ، جیاوازی بۆچوون هەڵئەگرێ، من
ای بۆدەچم لەسەدری ئیسلامەوە، هەتا شۆڕشی پیشەسازی، هەتا سیستەمی
یموکراتی سەرکەوت، دوای ئەوەش شۆڕشی پیشەسازیو دیموکراسی لەولاتانی
ەڵەمڕەوی ئیسلاما ڕەنگی دایەوە، لەناو سیستەمی ئیسلامی سیاسیو
ەسەلاتی سیاسی ئیسلاما مەسەلەی مەدەنیەت نەبووە، موتڵەقەن نەبووە؛
ەدەنیەت بەم چەمکەی کەئێستە قسەی لێ ئەکەین، موتڵەقەن لەسایەی
ەسەلاتەکانی ئیسلامدا نەبووە، چونکە لەکۆمەڵەکانی حوکومڕانی ئیسلامیو
یسلامی سیاسیش ئەتوانم بڵێم؛ شۆڕشی پیشەسازی تیا ڕووی نەداوە، لە
ەچەدا کۆمەڵی دەرەبەگی بوو، لەڕاستیا ئاینە ئاسمانیەکان لەکۆتایی قۆناغی
ۆیلەیەتیو سەرەتای سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتیا پەیدا بوون، لەبەر ئەوە هەتا
ەڵەمڕەوە ئیسلامیەکان، غەیرەدینیەکانیش، مەسیحیشو ئەوانەش کەقەڵەمڕەو
وون، مەسەلەی شۆڕشی پیشەسازی لەناو سیستمی ئیسلامو چوارچێوەی
یسلامدا، هەروا دەسەلاتی مەسیحیەتیشدا، نەبووە، سیستەمی دەرەبەگایەتیو
زامی ثیوکراتیو ئوتوکراتی لەوێ حوکمی کردوە، ثیوکراتی واتە حوکمی
وتڵەقی ئیلاهییو سەرئەرزی؛ ئوتوکراتیش واتا: حوکمی موتڵەقی ئورستوکرات؛
ەمە هەمووی ڕەنگدانەوەی سیستەمی دەرەبەگایەتیە، لەبەر ئەوە ناکرێ بڵێین
و سیستەمەی کەزیاتر لەهەزارو چارەکە سەدەیەك ئیسلام تیایا قەڵەمڕەو
وە، لەناو ولاتە عەرەبیەکانو غەیرە عەرەبیەکانا، لەوێ مەدەنیەت هەبووە؛
ەدەنیەت لەئەوروپا سەری هەڵداوە، ئەمە حەقیقەتێکە نکولی هەڵناگرێ، چا
ستە تفسیر بۆ ئەوە بکرێ کەلەئاینی ئیسلامیشەوە بەشێك لەئاینەکە، بەشێك
تەفسیراتەکەی، بەشێك لەمەنتیقەکانی، بەشێك لەشتە عەقلیەکانی، بخرێتە ناو
ۆسەی مەدەنیەتەوە، ئەمە مەسەلەیەکە قبوڵە، ئەمە مەسەلەیەکی ترە،
گینا هەتا مەسەلەی عەقلانیەت کە کاك عبدالرحمن باسی کرد، عەقلانیەت
یوەستە بەمەسەلەی فەلسەفە، واتا کە دەڵێی عەقلانی هەموو ئەو شتانەیە
قڵ ئەیبینێ، هەموو ئەو شتانەیە فەلسەفە بەمەنتیق دەیسەلمێنێ، کەدەڵێین
قلانیو کەدەڵێین سیستەمی دیموکراتیو لەسایەی سیستەمی دیموکراتیشا
دەنیەت، دەبێ ئەو سیستەمە دیموکراتیە عەلمانی بێت، هیچ سیستەمێکی

دیموکراتی ناعەلمانی نەیتوانیوە بیسەلمێنێ کەئەتوانێ کۆمەڵێکی مەدەنی بیذ بکات. قەت شتی وانەبووە؛ سوودی وەرگرتووە لەدەسکەوتەکانی مەدەنی، بەڵا نەیتوانیوە کۆمەڵێکی مەدەنی یەکالا لەدەسەلاتی سیاسی بینابکا, بەش بەحاڵ خۆم ئەوە پەرچ نادەمەوە کە دەکرێ لەدینی ئیسلامو لەدینی مەسیحیش تەنانەت لەجولەکەش، سوود وەربگیرێ بۆ بینای کۆمەڵی مەدەنی، بەلام ناکن بیکەی بەبنەما بۆ بینای کۆمەڵی مەدەنی، کەبنەماکەی سیستەمی دیموکراسی بنچینەی عەلمانی، مەسەلەی عەقلانی‌و شۆڕشی پیشەسازی بێت، ئەم مەسەلەیەکە ئێجگار گرنگە ئەبێ ساغی بکەینەوە.

**دایالۆگ/** بچینە سەر ئەو بابەتەی تر کاك مەلابەختیار ئەو گروپ کۆمەلایەتیە بچوك بچوکانەی کەباسمان کرد خێزان‌و خێڵ‌و هۆزو عەشیرەت ئەوانە ئەگەر کۆمەڵی مەدەنی یا کۆمەڵی مەدەنی پرد بێ لەبەینی ئائەمانا دەوڵەتا چۆن ئائەم ئیشکالاتە ئەکەوێتەوە؟

**مەلا بەختیار/** ئەمەش ئەبێ مشتومڕێکی باشی لەسەر بکەین، هەمو پەیوەندییەك لەسەر بنچینەی خوێن لەگەڵ کۆمەڵی مەدەنیا ناگونجێ، هەمو بەڵێنێك لەسەر بنچینەی خوێن، هەموو پەیمانێك لەسەر بنچینەی خوێن، تەنانە لەگەڵ باوکتا، لەگەڵ خێزانتا، لەگەڵ عەشرەتتا، لەگەڵ خێڵتا، لەگەڵ هۆزت مەدەنیەت رەتیان دەکاتەوەو پەیوەندی بەخوێن مۆرکراو بیکەی بەپێوانە پێواندنی دیاردەکان، لەگەڵ کۆمەڵی مەدەنی ناگونجێ؛ کۆمەڵی مەدەن هاوولاتی دروست دەکا، هاوخێڵی دروست ناکا، هاوڕەگەزی، هۆز دروست ناک کۆمەڵی مەدەنی ئینسان لەخێڵ، لەهۆز، لەعەشرەت، ئینسان لەبنەماڵ دائەبڕێ‌و ئەیکا بەهاوولاتی ولاتەکەی.

**دایالۆگ/** بەڵێ کاك عبدالرحمن کەواتە کاك مەلا بەختیار ئەڵێ مەدەنیە هاوولاتی دروست دەکا، هاوولاتیش دابڕاوە لەهەموو پەیوەندییەکانی پێ ئاستی هاولاتیەك، یان بابڵێین: هاوولاتی شتێکی ئەپستراکتە لەهەم پەیوەندییەکانی پێش خۆی، کەهاتە ناو کۆمەڵی مەدەنیەوە، جەنابیشت باس خێزانت کرد خێزان بەتایبەتی خێزانی خۆرهەلاتی ئەو خێزانەی کەلەس پەروەردەیەکی ئایینی‌و رۆژهەلاتی پەروەردە کرابێ، سیستەمی باوك سالار

یایا زالـەو تەنانـەت هـیگلّ باسـی دەکـات کـەخێزان خـۆی بۆخـۆی نمونـەیـەکـی چکولەی دەولّەتـە، یاخود دەولّەت نمونەیەکی گـەورەکراوی خێزانـە، بـاوك تیایـا ەوری سەرۆکی ئەو دەولّەتە ئەبینێ، ئەو پێودانگەکانو ئەو پێوەرەکانی ژیـانو ەوشت دائەرێژێ لـەو خێزانـە، ئـەم دووشـتە چـۆن کۆبۆتـەوە لای ئێـوە واتـە: ێزان چۆن ئەتوانێ هاوولاتی دروست بکات.

**عبدالرحمن/** من پێم وایە پرسیارەکە تەقریبا مەرجە بابەتیەکـەی لەدەست اوە، چونکە من لەسەرەتاوە دەرم هێنا لەکۆمەلّی مەدەنی خێزان بەپێی ئایەت ـۆم تەفـسیر کـردی، خێـزان لەزەمـەنی پێکهێنـانی کۆمـەلّی مـەدەنی نییـە، اهـاوولاتی دروسـت بکـات، خێـزان هـەموو خێزانێـك مـنو تـۆو هەریەکـەمان ـەخێزانمان دروسـت کـردووە، ئێمـە ئەوەنـدە تیایـا سـەربەخۆبووین ەهەلّمان‌بژاردووە، لەبـەر ئـەوە پرسیارەکە وابزانم لـەو رووەوە باسـەکە لـەوێ ێیە کەخێزان چۆن هاوولاتی دروست دەکات، باسمان لەوە بێ ئێمـە لەکۆمـەلّیا ۆن بتوانین هاوولاتی دروست بکەین، چـی رێگـرن لەبـەردەم ئەوانـەی کەئەبنـە ینسان، ببێ بەهاوولاتی، مـن لەسـەرەتاوە پـێم وتـن ئـەوەی کەپەیوەندی بـەو اسەوە ببێ بۆیە کۆمەلّی مەدەنیە پێم وایە کە لێکدانەوە عیلمیەکەشی هەر وایە ەسەر ئەوەشەوە وابزانم جیاواز نـەبووین کەئەکەوێتـە بـەینی دەولّـەتو خێـزان، ونکە هەموو پەیوەندیەکانی تر کـەخێزانو ئـەوانی تـر دەگرێتـەوە، پەیوەنـدی ئوێنە تۆ ئارەزوو مەند نەبووی تیایا بۆیـە ئـەوە دەرمـان هێنـاوە لەمەسـەلەکە ەس باسەکە بێتەوە سەر شتێکی تر لەوێوە بێینەوە بۆ ئەو مەسەلەی دەولّـەتی ەدەولّەتی ثیوکراتی ئەو قسەیان راستە، ئاماژەم پێ کرد، دەولّەتی دینـی واتـە ەولّـەتی ثیـوکراتی ئینجـا ئـەوەش لەجێبەجێکردنـدا بـووە، یـان نـەبووە، مـن ەگەلّتام دەولّەتی ئیسلامی بەدرێـژایی مێـژووی ١٤٠٠ سـالّەی هـەمووکاتێ وەکـو ەك کۆمـەلّی مـەدەنی رۆلّـی تیـا نـەبینیوە، لەسـەردەمی خولـەفای راشـدین تـا ادەیەك لەسەردەمی ئەمەوییـەکان کوێربۆتـەوە، بەرادەیـەکی زیـاتر بـەم مانایـە ییە لەوێوە دێ کەتۆ سەیری هەرچی فوقەها بکـەیت، سـەیری هەرچـی ئەوانـە کەیت کەلەدەولّەتی ئیسلاما رۆلّیان بینیوە لـەبواری فیکـری لـەبواری حـیرەفـو ەو بابەتانە، ئەوانەی کەچوار مەزهەب هەیە لەئیسلاما بـەلای کەمـەوە کەئـەلّێ ـەم سەردەسـتەی مەزهەبانەکانـە هـەموویان چـی بـوون خۆیـان بۆخۆیـان مضطهد)بوونە لەدەولّەتی ئیسلام، تۆ نابینی هەموویان توشی ئاوارەیی‌و توشی

غەریبی بوون، بۆ؟ چونکە دەوڵەت هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵی مەدەنی وێك نایەتەوە، چونکە دەوڵەت حەز دەکا شتەکان وەکو خۆی بێت و کۆمەڵی مەدەنی حەزدەکا شتەکان بچنە پێش هەنگاوێك بنێ وەدەوڵەت حەز دەکا یاسا پیادە بکاو کۆمەڵی مەدەنی حەزدەکا قیەم لەبەرامبەریەوە بکاتە بەرگی یاساکانیەوە بۆیە دەوڵەتی ثیوکراتی کەئیشارەی پێ کرا دەوڵەتێکە لەئیسلاما وجودی نیە.

**دایالۆگ/** لەمێژووشدا؟

**عبدالرحمن/** لەمێژودا هەیە، بەڵام لەدەوڵەتی ئیسلامیا، دەوڵەتی ئیسلامی ئەگەر بێتو تەماشا بکەی ئەو کەسانەی.......؟

**دایالۆگ/** یا لەتەفسیری بەڕێزتانا بۆی نیە

**عبدالرحمن/** ئێستا نا، تفسیرنا، باسەکە ئێمە دەقمان هەیە، ئەم دەقانە شتێکی چاکە کەئێمە تەفسیرەکانمان جیاوازە خۆ ئەگەر یەك تەفسیری بۆ هەبووایە ئەوە ئەوکاتە موشکلە بوو، ئەبوو بەدەوڵەتی دینی کەلە دەستی چەند کەسێکا کۆ ئەبویەوە هیچ کەس لەئیسلام خوازان، لەفوقەها، هیچ کەس بۆی نییە حکرو احتکاری تأویلی نصوص بکا بۆ خۆی، لەبەر ئەوە دەق کراوەیە لەبەر ئەوە ئەبێ ئێمە لەو زاراوانەی کەلەئیسلاما بێزراون خلیفةالله، نائب اللة في الارض، ئەمانە هەمووی شتێکن لەئیسلاما وجودی نیە، بەڵام دوای کەدروستیان کردووە ئەوە لەوێوە شتەکان جیابونەتەوە بەرەو ثیوکراتی چووە، من یەك نمونەت بۆ دەهێنمەوە، نمونەیەك لەقورئانا سەیر دەکەی دەڵێ ((اطیعوا الله واطیعوا الرسول واولي الامر منکم)) ئالێرەدا مولاحەزە بکەی لەتفاسیردا ئەوانەی کەبردویانە بەلای دەوڵەتی دینیا ئەڵێ ئەوەتا ئەڵێ ((اولی الامر منکم)) وەکو (رسول) وەکو (خوا) لەپاڵ یەکدان، بەڵام وانیە کە مولاحەزەی وردی بکەی لێکدانەوەی ئێمە ((واطیعوا الله واطیعوا الرسول)) خواو پێغەمبەر ئیتاعەیان وەکو یەك ئەیکەین بەڵام ((واولي الامر منکم)) خوا ئیتاعەکەی لێرە کەلیمەکەی دووبارە نەکردۆتەوە، کەدووبارەی نەکردۆتەوە مەعنای وەلی امری موسڵمانان، دەوڵەتی ئیسلامی هەمان حوکمی خوای نیە، هەمان حوکمی پێغەمبەریشی نییە، کەس لەجێی پێغەمبەر نیەیە، کەسیش لەجێگەی خوا ناتوانێ قسە بکات، بەڵام هاتووە قورئان و سوننەت ئیزافە چی لێ تەفسیر ئەکات و لەبەر رۆشنایی قورئان و

سونەتا ئیشدەکا، من یەك نمونەت بۆ دێنمەوە بزانە ئەبوبەکری صدیق ئەبێ بەخەلیفە، سەیری ئەم قسەیە بکەی بۆت دەردەکەوێ دەوڵەتی ئیسلامی دەوڵەتێکی مەدەنی بووە، بەمانای چی ڕێی بەکۆمەڵی مەدەنی داوە، بۆ کەئەبێ بەخەلیفە ئەڵێ ((لقد ولیت علیکم ولست بخیرکم)) کەواتە چییە من مەعسوم نیم مادام (لست بخیرکم) واتە من لەئێوە چاکتر نیم مەرج نییە لەئێوە چاکتر بم هەڵبژێردراوم بەڵام مانای وایە من معصوم نیم عمری کوڕی خەتابیش ئەڵێ ((وان اسأت فقوموني)) مانای وایە معصوم نییە هەردووکیان دەڵێن (اطیعوني ما اطعت الله فیکم)) هەتا من بەقسەی خوا ئەکەمو هەتا من قورئانتان بۆ پیادە ئەکەم ئەوە بەقسەم بکەن، چۆن بزانم پیادەی قورئان ئەکەم من چۆن بزانم مانای مراقەبەشی هەیە دەوڵەت دەوڵەتی خەلیفەی ئیسلامی چی بووە مراقب بووە لەلایەن دینەوە.

**دایالۆگ/** باشە وەکو حەقیقەتە مێژووییەکە ئەمە چەند جێبەجێکراوە.

**عبدالرحمن/** بەڵێ ئەمە شتێکە

**دایالۆگ/** تواندراوە چەند خەلیفە لەسەر حوکم بخرێ..؟

**عبدالرحمن/** لێرەیا هەتاوەکو بیبینە فەترەی خولەفای ڕاشدین ئەم مەسەلەیە ئاوا پیادە کراوە بەو مانایەی کەیەکێك هەڵبژێردراوە شێوازی هەڵبژاردنی وەك ئێستا نەبووە.

**دایالۆگ/** باشە عەفوم کە مامۆستا عبدالرحمن کاك مەلا بەختیار تەنانەت لەسەردەمی عوسمانی کوڕی عەفاندا کەیەکێکە لەخولەفاکانی ڕاشدین جەنابت ئەڵێی جێبەجێش کراوە ئەوەتا ئەو فیتنەیە دەکەوێتە دەوڵەتی ئیسلامیو مێژووی ئیسلامی بۆ؟ چونکە خەڵك پێی ئەڵێ لاچۆ، لاناچێت، تا ئەبێتە شەڕو ئاژاوەو شۆڕشێ دروست دەبێ؟

**عبدالرحمن/** بۆ لاناچێ، ئەوە ئێستە دەستورە، ئێستە کەتۆ قسەیەکی برتراند ڕاسل بخوێنیتەوە ئەڵێ: ئەگەر زۆرینە خەڵکێکی هەڵبژارد ئەوە لەزۆرینەوە خۆشبەختانە لەبەینی هەموو خەلیفەکانا ئالیەتی هەڵبژاردن

لەئیسلاما تحدید نەکراوە، ئەمڕۆ ئەبینی هەموو جیهانی ئیسلامی ئەوەی کەدەوڵەتی ئیسلامیشی ناوناوە لەخۆی ئالیەتی هەڵبژاردن لەئاڵوگۆڕدایە، لەبەر ئەوە خۆشبەختانە لەبەینی هەموو خولەفا لەمالآنا پرس بەیەکە کە عوسمانی کوڕی عەفان بەهەڵبژاردن هەڵبژێردرا، ئەوانی تر بەرەزامەندی کەمینەیەك، لەبەر ئەوە ئەبینی بۆیە لاناچێ چونکە گەل هەڵیبژاردووە، جا من باسەکە لێرە ئەبەمەوە بۆ ئەوەی کە ئێمە نابێ ئینکاری ئەوە بکەین کەخراپ ئەنجامات هەیە لەمێژووی ئیسلامیا، دەوڵەتی ئەمەوی کردویەتی، دەوڵەتی عەباسی کردویەتی، بۆیە ئەگەر سەیری یاسای حسبە بکەین، سەیری اوقاف بکەین، دەوڵەتی ئیسلامی بەدرێژایی مێژوو کۆمەڵی مەدەنی بەڕێوەی بردووە، هیچ کاتێك ئەمیرەکانو خەلیفەکانی ئیسلامی لەغەمی کاروباری دەوڵەتا نەبوونە بەدرێژایی مێژوو تۆ سەیری کە ئەو هەموو شتە لەفەترەی ئەمەویدا روویداوە، تەنها ئەوە بووە فتوحاتیان کردووەو سنوورەکانیان پاراستوە ئەگینا کاری فکریو کاری رۆشنبیریو کاری ناوجەرگەی کۆمەڵ، کەهەرهەمووی ئێستا بۆئێمە ماوەتەوە، نوسینەکان هیچی دەوڵەت لێی رازی نەبووە، بەلآم هەمووی کۆمەڵی مەدەنی ئەو بوارانەی ئەنجام داوە لەناو دەوڵەتی ئیسلامیا بۆ؟ چونکە هەمیشە دەوڵەت قابیلە بۆ لادان، بەلآم کۆمەڵی مەدەنی ئەمینداری سروشتی نەریتەکانی ئیسلام بووە.

**دیالۆگ/** کاك مەلا بەختیار کۆمەڵێك بنیادی حوکم دەسەلآت تیایا لەسەر ئەساسی پاراستنی دەقە پیرۆزەکان بێتو بڕواهێنانو بەپیرۆزکردنی دەقەکان لەئاستی پەیوەندی تاك لەگەڵ خوای خۆی دەربچێتو تعمیم بکرێ بۆناو هەموو کۆمەڵ، لەکۆمەڵێکی وایا ئەتوانرێ چەمکی مەدەنیەت بەم چەمکە، تازەیەی ئێستای هاوچەرخی جێ بەجێبکرێت.

**مەلا بەختیار/** بێگومان نەخێر، نەخێرو ئەو نەخێرەش باروونکردنەوەیەك لەسەر قسەکانی کاك عبدالرحمن ساغ بکەمەوە، بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەوەدا نیم کە دەسەلآتی ئیسلامی سیاسی، کۆمەڵی مەدەنیی بینا کردبێ، چونکە ئەوە لەبنچینەیا هەڵتەکاندنی بنچینەکانی چەمکی مەدەنیەتە، مەدەنیەت زادەی شۆڕشی پیشەسازیو سیستمی دیموکراسیە، واتا: قۆناغێك لەقۆناغەکانی نوێی ژیان؛ کەقۆناغی سیستەمی دیموکراسییە، سیستەمی دیموکراسیش، شۆڕشی

بۆرجـوازیو شۆڕشــی پیـشەسازییەو سیـستەمێك لانەچـێ، پـاك ئەکرێتـەوە، هەڵئەتــەکێنرێ کـــە ئـــەویش سیـــستەمی دەرەبەگایـــەتیو پەیوەندیـــەکانی دەرەبەگایەتیو فەلسەفەی دەرەبەگایەتییە، ئەمە بەسەرخانو ژێرخانیـەوە، تـۆ ئەگـەر ئەمـەت قبوڵـە کـە مەدەنیـەت زادەی ئـەم سیـستەمە نوێیەیـە، دەبـێ سیستەمە کۆنەکەت فڕێ دابێ. ئیتر، وەکـو سیـستەم نـەك وەکـو مەزهـەب، مـن وەکـو مەزهــەب موناقەشــە لەبابەتەکــە ناکــەم، وەکــو سیــستەم ئــەبێ ئــیتر تێنەپـەڕیبێت بـۆ قۆنـاغێکی تـر، لەبـەر ئـەوە کـاك عبـدالرحمن دووقـسەی کـرد، قـسەکانی تـەقریبا نـاکۆکی هـەبوو لەقسەکانیـشیا ئـەڵێ هـەموو کاتێـك کۆمـەڵی مەدەنی ڕۆڵی لەدەوڵەتی ئیسلامیدا نەبینوە.

**عبدالرحمن/** بینیویە

**مەلا بەختیار/** نـەیبینیوە، ئـەوەڵ جـار وتـت، وەکـو یـەك نـەیبینیوە، واتـا: کۆمــەڵی مــەدەنی هــەبووە لەهەنــدێ قۆناغــەکانا، یــا لەهەنــدێ دەســەڵاتەکانی ئیــسلامیا، لەکۆتاییــدا (هەردیــسان نوسیم) ئــەڵێ: دەوڵــەتی ئیــسلامی کۆمــەڵی مەدەنی بـەڕێوەی بـردووە، ئەمـە ناکۆکیـە، ئەگـەر دەوڵـەتی ئیـسلامی کۆمـەڵی مـەدەنی بـەڕێوەی بـردووە، ئەگـەر هـەموو کاتێـك کۆمـەڵی مـەدەنی دەوری تیـا نـەبینیوە، واتــا: جــاری وا هــەبووەو جــاری وایــە نــەبووە، کۆمــەڵی مــەدەنی لەدەوڵەتی ئیسلامی دەوری هەبووە، واتا: ئەوەتەی دەوڵـەتی ئیـسلامی هـەبووە وهەر دەوڵەتێك دەوڵـەتی ئیـسلامی بـووە لـەو دەوڵەتانـەی کـە کـاك عبـدالرحمن قبوڵیەتی، بەئیسلامی سیاسی قبوڵە، کۆمەڵی مەدەنی بەڕێوەی بردبێ، مـن پـێم وایە لەئەساسا وانییە، بەراستی دەوڵەتی ئیسلامی هەبووە، حـوکمڕانی ئیـسلامی هەبووە، قبوڵمە، شتێکی زۆر سروشتییە لەو سەردەمانە لە ١٤٠٠ سـاڵ لەمەوبـەر بۆ دواوە، دەوڵەتی ئیسلامی هەبووبێ، حوکمڕانی ئیسلامی هـەبووبێ، خەلیفـەی ئیسلامی هەبووە،و حوکمیان کردووە، بەڵام ژیان ئەو کاتە ژیـانی دەرەبەگایـەتی بووە، دەرەبەگایەتی بەو مانایە نیە کە کولتـوری نیـە، دەرەبەگایـەتی کولتـوری هەیە، فکری هەیە، مـەنتیقی هەیـە، شێوەی حـوکمی هەیـە، دەسـەڵاتی هەیـە، بنـەمای هەیـە، ئـابوری هەیـە، پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی هەیـە، ئـەدەبی هەیـە، فەلسەفەی هەیە، شارستانیەتیشی هەیە، واتا: من ناڵێم ڕەنگە ئەوە بەشێك بـێ لەشارستانیەتی ئیسلامی، ئەوەی کاك عبدالرحمن باسـی ئـەکات، بـەڵام کۆمـەڵی

مەدەنی نیە، کۆمەڵی مەدەنی شتێکی ترە، مەدەنیەت و شارستانیەت دوو شتی جیاوازن، زۆر هەڵەیە ئەو دوو شتە تێکەڵاو بکرێن، هەیە ڕۆژنامەنووسە سیاسەت مەداری گەورەیە، لەکۆڕا، لەنوسینا، لەکۆبوونەوەیا، شارستانیەت و مەدەنیەت لێك جیاناکاتەوە، ئەوەی کاك عبدالرحمن وتی بەشێکە لەبینای شارستانیەتی ئیسلام.

**دیالۆگ/** بەڵام کۆمەڵی مەدەنی نییە.

**مەلا بەختیار/** کۆمەڵی مەدەنی زادەی قۆناغێکە لەقۆناغەکانی ژیان کەدەبێ ئەو بابەتە بەراستی ساغ بکەینەوە، تێبینیەکی ترم لەسەر قسەکەی ئەوەیە دەوڵەت و کۆمەڵی مەدەنی وێك نایەتەوە، وتی دەوڵەت و کۆمەڵی مەدەنی وێك نایەتەوە، وەك پرەنسیپ کۆمەڵی مەدەنی یەکالا کراوەیە لەدەوڵەت، بەڵام بەو مانایە نییە دوژمنی یەکن، بەو مانایە نییە شتی هاوبەش لەبەینیاندا نییە.

**دیالۆگ/** بەلکو بوونی دەوڵەت خۆی یەکێکە لەمەرجە ئەساسیەکانی کۆمەڵی مەدەنی.

**مەلا بەختیار/** ئینجا بوونی دەوڵەت هەتا ئەم سەردەمەش، کە من لێکدانەوەی تریشم هەیە بۆ ئەو قسەیەی تۆش، هەتا ئەم سەردەمەش بوونی دەوڵەت چوارچێوەی کۆمەڵی مەدەنیە، بەراستی ئەگەر دەوڵەت نەبووبێ کۆمەڵی مەدەنیش نەبووە، ئەوە بابەتێکی زۆر گرنگە، کەچی یەکالاشن، واتا ئۆرگانەکانی مەدەنی لەئۆرگانەکانی دەوڵەت یەکالا ئەبنەوە، بەڵام نەفی ناکات ئەمە واتا: وەکو ڕوونکردنەوە ئەبێ بیزانین ناکرێ لێرە خەڵك بەو گیانە پەروەردە بکەین کە هەرگیز وێك نایەنەوە، نەء وانیە، تەواوکەری یەکترن، بەڵا لەدوو کەناڵی جیاوازەوە، ئەویان لەکەناڵی یاسا و دیسپلین و ڕێکخستنی باری ئابووری و باری سیاسی و باری دبلۆماسی و باری دادوەری، بۆ هەموو ئەو مەسەلانە دەوڵەت زۆر گرنگە، کۆمەڵی مەدەنیش بۆ ئازادی ئینسان و بۆ ئازادی ڕێکخراوبوون و بۆ گروپ و بۆ تواناکانی ئینسان کەئینسانی واهەیە زۆر توانای هەیە و ناشیەوێ بەشێك بێ لەدەسەڵات، نایەوێ بەشێك بێ لەمەعریفەی دەسەڵات، نایەوێ بەشێك بێ لەڕووناکبیری دەسەڵات، نایەوێ بەشێك بێ لەیاسای دەسەڵات.

**دیالۆگ/** ئەشیەوێ خزمەت کات.

**مـەلا بـەختیار/** ئەشـیەوێ خزمـەت کـا، ئەیـەوێ توانـای زانستی، توانـای ئەدەبی، ڕووناکبیری، بەرەخنەوە بیهێنێتە ناو کۆمەڵ، زۆر ئاساییە، بەڵام نـەفی ناکا، کۆمەڵی مەدەنی ئەلتـەناتیڤی دەوڵـەت نییـەو دژ بەدەوڵـەتیش نییـە،و بـەو چەمکەش دژی دەوڵەت نییـە کـەبڵێ دەوڵـەتی هـەر قبـوڵ نییـە، ناکۆکـە لەگـەڵ دەوڵەت لەهەندێ چەمکدا، ئۆتۆنۆمیەکی خۆی هەیە، بەڵام نـەك لەسـەر حسابی یاساکانی دەوڵەتو مەرکەزیەتی دەوڵەت، وەکو بڵێی هیچی دەوڵەتی قبوڵ نییە، ئینجا سەبارەت ئەو بابەتـەی تـۆ وەکـو وتم نـەخێر هـەر بەراستی زۆر نـەخێرە، یەکـەم پرسـیارەکەت نـەخێر، واتـا نـاکرێ تـۆ کۆمـەڵی مـەدەنی بەچـەمکە تازەکەیـەوە، بەبۆچـوونە تازەکەیـەوە، بەپەیوەندیـە تازەکەیـەوە، بەفەلـسەفە تازەکەیـەوە، بەمەعریفـە تازەکەیـەوە، بگێڕیتـەوە بـۆ سـەدەکانی ناوەڕاسـت هەرئەوەندە دەڵێم.

**دیالۆگ/** کاك عبدالرحمن مەدەنیەت یەکێ لەپێناسە هـەرە هاوچـەرخەکانیا، بابڵێم یەکێك لەو پێناسانەی یا لەو خاڵانەی کەهـەموو پێناسـەکەرەکان لەسـەری کۆکن، ئەوەیە کەمەدەنیەت واتە داهێنـان، خولقـان، داهێنـانی ڕێگـەی تـازە بـۆ بیرکردنـەوەی ئینـسان، داهێنـانو دۆزینـەوەی ڕەهەنـدی تـازە لـەبیرو لـەجیاتی ئینسانو لاسایی کردنەوە خۆی بۆ خۆی واتە: دژایەتی کردنی مەدەنیەت؛ ئەگـەر لەگەڵ ئەم خاڵەی پێناسەکەیا کۆکیت، ئایا وەڵامتان چییە بۆئـەوەی کەهەنـدێك بیرو بۆچوونی فەلـسەفی، بـەڕێزتان وەکـو نوێنـەری حزبێکـی ئیـسلامی سیاسـی لێرەن، ئامادەن بۆیە نمونەکەمان لەسـەر ئـەوە ئەهێنینـەوە ئـەگینا سـەلەفیەت هەندێ بواری تریش دەگرێتەوە، ڕەنگە چەپڕەویش هـەبێ سـەلەفی بێـت، ئـەوە چۆن لێك ئەدەنەوە چۆن ئەکەوێتەوە، سەلەفیەت کەخۆی بـۆ خـۆی گێڕانـەوەی وەیـاخود پابەنـدکردنی مرۆڤـی ئـەم سـەردەمەیە، هـی هـەموو سـەردەمێکە بەکۆمەڵێك نەریتو چەمکی پێش خۆی بەسەدانو بەهەزاران سـاڵ، ئایا ئـەو دوو فیکـرە سـەلەفیەت لەگـەڵ داهێنانـدا کـەناکۆکن چـۆن ئەکەونـەوە لـەپێکهێنانو بەدیهێنانی کۆمەڵی مەدەنیا؟

**عبدالرحمن/** بەڵێ پێش ئەوەی بێمەوە سەر پرسیارەكە ئەبێ هەر ئاماژەیەك بەو قسانەی كاك مەلا بەختیار بكەمەوە

**دایالۆگ/** بەكورتی

**عبدالرحمن/** بەكورتی، بەڵێ ئەوە بۆ تەئكیدی ئەو قسەیە كاك مەلا بەختیار وەڵامی خەڵكێكی تری دایەوە، بێگومان كەرۆژێك لێرە باسی مەدەنیەتی كرد لای ئێمە روونە كەمەسەلەی شارستانیەت چییەو تەواوی شتە مادیی‌و شتە مەعنەویەكان بەیەكەوە شارستانیەتن‌و كۆمەڵی مەدەنی سەرەتا من ئەو تەعریفەی كردم هەردووكمان لەسەری رێكبووین، ئیتر ئەوە لەوێوە سەرچاوە ناگرێ جارێكی تر بێینەوە سەر ئەوەی مەدەنیەت‌و شارستانیەتم لێك جیا نەكردبێتەوە.

**دایالۆگ/** بەس لەوەدا كۆك نین، كەجەنابت مێژوەكەی بەسەردەمانێك ئەگێڕیتەوەو ئەو بۆ سەردەمێكی تر.

**عبدالرحمن/** بەتەئكید بەتەئكید، ئالەویا جیاوازین، كەوا ئەو باس لەوە دەكا بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی، من ئەیگێڕمەوە بۆپێش ئەوە، بۆ ئیسلامی ئەگێڕمەوە، من پێم وایە لەپێش ئیسلاما كۆمەڵی مەدەنی ئەبەدەن نەبووە چونكە پێغەمبەر (ص) لەو حەدیسانەی كەبۆ ئێمەی ماوەتەوەو كەئێستا ئەیبینین هەتا پیاوێكی وەك (ربعی كوڕی عامر) لێی تێگەیشتوە واتە كە (كیسرا) لێی دەپرسێ بۆچی هاتووی، ئەڵێ یەكێ لەوشتانەی لەپێناویا هاتووم (ومن جور الادیان الی عدل الاسلام) واتە اقرار ئەكا موسڵمانێك كەئەدیان جەوری هەیە، وەكو باسم كرد، زوڵمی هەیە، بەڵام بۆ ئیسلام ئەبێ عەدلی هەبێ، عەدلەكەی ئیسلام لەكوێوە سەرچاوەی گرتوە، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی لەچەند بوارێكی كەما هێشتۆتەوە باقیەكەی داوەتە كۆمەڵی مەدەنی، ئەو كەسانە لەدەوڵەتی ئیسلامیا لەهەموو بوارەكاندا رۆڵیان بینیوە، وەكو باسمان كرد كۆمەڵی مەدەنی بەدرێژایی مێژوو لەدەوڵەتی ئیسلامیا هەیە، بەڵام چییە، جاری وا هەیە، رۆڵی كەم دەبێ جاری وا هەیە زیاد دەكا، ئەوە باسەكە لەنیسبەتی ئەوەیە نەك لەبون‌و نەبونەكەی، دەوڵەت بوونی خۆی زەرورە بەو مەعنایەی كە

من خستمه کۆمەڵی مەدەنی، لەبەینی دەوڵەتو خێزاندا، مانای وایە نەخێزان خۆیەتی نەدەوڵەت بەڵام یەکێك لەبنەماکانی تری کۆمەڵی مەدەنی ئەوە کە چیە ئاشتیخوازی جۆری پەیوەندیەکانی نێوان دەوڵەتو کۆمەڵی مەدەنی ئەبێ بەئاشتیخوازانە، بو بەچەکداری بو بەشەڕ ئەوە بنەمای کۆمەڵی مەدەنی لەدەست داوە، ئەو ڕێکخراوە هەر ڕێکخراوێ شتێ بەسەر دەوڵەتدا بسەپێنێ، یاخود فشارێ بخاتە سەر دەوڵەت، چەکی تیا بەکارهێنرا، فشاری هێزی سەربازی، ئیتر لەمەدەنیەت دەرئەچێ لەوحاڵەتە بۆیە بەدەر لەسەربەخۆبوونو بوونی دەزگایەكو ئاشتی خوازیش یەکێکە لەمەرجەکان بوونی دەوڵەت خۆیشی مەرجێکە لەو مەرجانە.

بێینەوە سەر داهێنانو سەلەفیەتەکە: ئیسلام ئەگەر هەموو کارەکانی سەوابت بێ نەخێر ناگونجێ بۆ ئەم سەردەمە، بەڵام گۆڕانکارییە، ئیسلام ئەوەی لەصلبی عقیدەکەیەتی، سەوابتە، ئیمانمان بەخوا هەیە، بەمەلائیکە، بەپێغەمبەران، بەڕۆژی دوایی، ئەمانە سەوابتێکن ماونەتەوە، بەڵام چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ژیان ئەمڕۆ پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ لەحەدیسی صحیحی مسلمدا دەفەرموێ (انتم اعلم بأمور دنیاکم) ئەوە چی مانای وایی اموری دنیا تەنیا ئەوەیە گیانێکی ئیسلامی دەکەی بەبەردا، بەقیەمێکی ئیسلامی ئەگینا هەموو هۆکارەکەو هەموو شێوازەکە ئەبێ هەمووی هۆکاری سەردەم بێ ئەوە لەبەر ئەوەیە ئێمە حەدیسی ترمان هەیە ابوداود ئەیگێڕێتەوە (ان الله یبعث لهذه الأمة علی رأس کل مئة سنة من یجدد لها امر دینها) ئەمری ئەم دینە پێویستی بەتازەکردنەوە هەیە، ئینجا لێرەشەوە بۆچوونێکی جیاواز هەیە لەبەینی ئیسلام خوازان ئەو (من) هەندێك داینەوە پیاوێك بیت ڕۆژێك لەڕۆژان دنیامان بۆ چاك بکاتو تازەی بکاتەوە، ئێمە وای نابینین، ئێمە ئەو (من) بە کۆمەڵێ دامودەزگا ئەبینین کەمنو تۆو خەڵکانێکی تر هەمووی مشارکین تیایا، لەبەر ئەوە ئیسلام لەبەینی ڕەسەنیو ڕەسەنایەتی هاوچەرخی کۆمەڵێ شت هەیە عمری کوڕی خەتاب لەیەك مەسەلەیە دوو ڕای هەبوو وتیان تۆ دوێنێ وات نەوت فەرمووی (ذاك علی ما علمنا) ئەوەی دوێنێ پیادەمان کرد لەسەر ئەوە بوو کەدوێنێ ئەمانزانی (وهذا علی مانعلم) ئەوەی ئەمڕۆ لەسەر ئەوەیە کە ئەمڕۆ ئەیزانین کەواتە لەسەدا نەوەدی قیەمی ئیسلامی، قیەمەکانی ئیسلام سەوابتن، لەسەدا ٩٠ پرۆسەکە خۆی کەدەوڵەتی ئیسلامی ئێستاکە ئەو دەوڵەتانەی ئەمڕۆ

ئیسلامین مجلس وەزاری هەیە مەعنای وایە لەئالیەتە لەبەر ئەوە ئیسلامی بەواتای گونجاندن لەبەینی داهێنان لەبەینی رەسەنایەتی‌و هاوچەرخی بۆچونەکانی ئیسلام سەوابتەکانی زۆر دیاریکراون کەبرێك ئەچێتە بواری عەقیدە، بەڵام پیادەکردنی ژیانی رۆژانەمان هەمووی لەمەسەلەکانی گۆرانکاریدان، بەڵام چیمان مەتڵەبە ئێمە هەموومان تۆو ئێمە هەموومان هەر کەس بەخۆی دەڵێ موسڵمان ئەیەوێ ئەو نەریتە ئیسلامیانەی کە خوا ئەیەوێ لەقورئان‌و لەسونەت‌و ئەو نەریتانە وجودی بێ لەیاساکاندا، ئەما وەسائیلەکان، هۆکارەکان دەگۆرێن، بەگۆرانی زەمان لەبەر ئەوە داهێنان مانع نییە لەگەڵ ئیسلاما بەڵام لەگەڵ بۆچونێکی سەلەفیا بەڵێ مانعە.

**دیالۆگ/** ببورە کاك مەلا بەختیار لەبەرئەوەی کاتمان کەم ماوە دەمەوێ بچمە سەردوا تەوەرەمان، لەخۆرهەڵات‌و خۆرئاوا بەتایبەتی لەسەدەی بیستەما ئەم چەمکی مەدەنیەتە هەوڵدراوە بۆ پیادەکردن‌و هێنانەدی کۆمەڵی مەدەنی ئەگەر بکرێ لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا باسی پیادەکردنی کۆمەڵی مەدەنیمان بۆ بکەی لەخۆرئاواو لەخۆرهەڵاتا چۆن کەوتۆتەوەو گەیشتۆتە کوێ؟

**مەلا بەختیار/** رەنگە وەڵامەکەش وەڵامی کاك عبدالرحمنیش بێت من لەراستیا تقدیری باری کاك عبدالرحمن دەکەم کەپێ دائەگرێ کە کۆمەڵی مەدەنی لەسەدری اسلام‌و خولەفای راشدین‌و دەسەڵاتی ئیسلام‌و ئەوانە هاتووە، تەقدیری ئەکەم، ئەزانم ناتوانێ ئەو بابەتە لەوە زیاتر قەناعەت بکا، بەڵام دڵنیاشم لەناخی خۆیا، دڵنیاشم هەموو مێژوو باش ئەزانێ، کۆمەڵی مەدەنی لەدەوڵەتی ئیسلامیا نەبووە.

**دیالۆگ/** کولتوری مەدەنی هەبووە

**مەلا بەختیار/** نەء سلوکی شارستانی هەبووە، کولتوری مەدەنیەت وەکو چەمك، وەکو جێبەجێکردن، وەکو یەکالاکردنی ئازادی ئینسان‌و گروپ‌و ئەوانە نەبووە، مەسەلەی احسان‌و خێرو ئەمانە، هەرگیز لەکۆمەڵی مەدەنی جێگەی نابێتەوە؛ بەڵکو ئەمە بچوککردنی ئینسان‌و ئازادی ئینسانە، تۆ بە احسان‌و بەخێرو بەوانە سەیری مەسەلەی مەدەنی بکەی، ئازادی مەدەنی خزمەتکردنی خێری نییە، ئەوە حەقێکی ئازادانەی ئاسایی ئینسان خۆیەتی کە مومارەسەی

ئەکا، ئەوە نییە تۆ خێری پێ ئەکەی، بەخێرپێکردن برسیەك تێرئەکەی، ڕووتێك پۆشتە ئەکەی، ئەمە خێری پێ ئەکەی، بەڵام ئەو ممارەسەی مافی ئازادی خۆی، وەکو فەلسەفە، وەکو ژیانەکە، ئەوە مافی خۆیەتی ئەو کولتوورو مەعریفەی خۆی لەدەوڵەتی ئەسێنی، بەڕاستی، کاك عبدالرحمن ئەڵێ باسی کۆمەڵی مەدەنی لەئیسلاما ئەکا ئەمە کتێبێکە (انسان بین مادیگەریو اسلام) نوسینی سید محمد قطب کەیەکێکە لەعولەما گەورەکانی ئیسلامی سیاسی تەنانەت چونە دەرەوەی ژنیش قەدەغە ئەکا ئیلا لەحاڵەتی تایبەتی نەبێ بەڕاستی

**عبدالرحمن/** می کێ؟

**مەلا بەختیار/** محمد قوتب، چونە دەرەوەی ژن قەدەغە دەکا ئیللا لەحاڵەتی تایبەتی نەبێ یا بۆ هەندێ شوێن ئارایشت کردنی ژن، خۆرازاندنەوەی ژن، جوانی ژن..تاد

**دایالۆگ/** پێکەنین؟

**مەلا بەختیار/** پێکەنینی نەوتوە، لێرەدا من نەمخوێندۆتەوە بەڵام ئەم شتانەی هەموو قەدەغە کردوە ئەوە، من لاپەڕەکەیم نووسیوە (٢٨٧) اشارەتیشم پێ داوە، ئەوە کتێبی تر هەر ئیسلامی سیاسی، (بۆگەنجەکان) هی حەسەن بەنا، ئەسڵەن گەنج وا لێدەکا لەئامێرێك بەولاوە هیچی تر نەبێ، نەك ئازادی نییە ئامێری ئیسلامی سیاسیەو بەس؛ بۆ غایەتێك بەکار دێ، کەغایەتی ئیسلامی سیاسیە؛ ئەمە کتێبی ترم بەدەستەوەیە کەلەئێران چاپ کراوە ئاخر کتێبە لەسەر مەدەنی (جامعەی مدنیو ئیرانی ئەمرو) هەر هەموو چەندین نووسەرە، مونازەرەیەکی گەورەیە، لەسەر مەدەنیەت، هەرهەمووی تەئکید لەسەر ئەوە ئەکەن کەمەدەنیەت لەسەدەی ١٧ەوە، لەئەوروپاوە سەری هەڵداوەو، ئەڵێ ئێرانو مشرق زەمین هەرهەمووی وائەڵێ (ئێران مشرق زمین)و دەوڵەتانی ئیسلامی بەهیچ شێوەیەك مەدەنیەتی تیا نەبووە، ئەڵێ لەوێوە بۆمان هاتووە، جا ئێستە چۆن تعامل ئەکرێ لەگەڵیو چۆن ناکرێ، ئەمە مەسەلەیەکی ترە، ئەمە زیاتر لەبیست نووسەرە مونازەرەیە لەبەینیان وەهەمووشی لەروانگەی ئیسلامەوە قسەدەکا، نەك دژی ئیسلام، هەمووی لەروانگەی ئیسلامەوە ساغی دەکەنەوە کە مەدەنیەت زادەی ئەوروپایەو هاتۆتە لای

رۆژهەڵات، لەبەرئەوە ئەگەر ئەمە ئەساس بێ بۆ وەڵام دانەوەی جەنابت کاك بهات من پێم وایە مەدەنیەت بابەتێکە زادەی ژیانی شۆڕشی پیشەسازیو سیستەمی دیموکراتیو لەئەوروپاوە هاتووە، بەڵام وەکو (مشرق زەمین) وەکو رۆژهەڵاتی، وەکو دەوڵەتانێك نەتەوەکارێك، کەئێمە ئیسلامین، چۆن ئەم مەسەلەیە جێبەجێدەکەین، ئایا بەلاسایی کردنەوەی ئەوروپا، بەهەموو شتەکانی ئەوروپاوە ئەوە جێبەجێدەکەین؟ نەخێر.. نەخێر ئێمە کولتوری خۆمان هەیە، قەناعەتی روحی هەیە،وپەیوەندی کۆمەڵایەتی تایبەتیمان هەیە، کولتوری تایبەتیمان هەیە، رەگێکی مێژوی کولتوری تایبەتیمان هەیە، هەموو ئەمانە دەبێ لەبەرچاو بگرین. ئینسان دەبێ موتلەقەن ئازاد بێ لەمەسەلەی هەڵبژاردنی ئاینا، لەمەسەلەی روحیا، لەمەسەلەی مەزهەبی خۆیا، لەمەسەلەی خواپەرستی خۆیا، ئەمانە موتڵەقن، ئازادبێ بەڵام مەدەنیەتیش کۆمەڵێکە پەراستی دەبێ لە قۆناغی سەرهەڵدانیا، لەرووی عەقلانیەوە، لەروی رۆشنگەرییەوە، لەروی فەلسەفەوە، لەروی پراکتیزەی دیموکراسیەوە، لەروی ئازادی رەخنەگرتنەوە، لەروی ئەوەوە ئینسان خۆی حاکم بێ لەسەر عەقڵی خۆی، بڕیاردەربێ لەسەر چارەنووسی خۆی، نەخرێتە ژێر هەژمونەوە، بەترسو بیم، بەداستانو بەئەفسانە نەترسێنرێ، نەتۆقێنرێ، وای لێ نەکرێ هیچ رێگایەك نەدۆزێتەوە جگە لەرێگایەك هەموو مەسەلە عەقلیەکانی ئینسان لەئینسان وەرنەگیرێو شتی تری بدرێتێ، لەمێشکیا بئاخنرێ، ئەمانە مەسەلەی زۆر زۆر گرنگن بۆ ئێمە کەدەبێ بەئازادانە لەگەڵ ئینسانو لەگەڵ گروپەکانی ئینسانو وردەوردە لەگەڵ چۆنیەتی پرۆسەی بینای مەدەنیەت بچین، من لەگەڵ لاساییکردنەوەی ئەوروپا نیم ، لەگەڵ ناسینی تایبەتمەندێتی کۆمەڵی خۆمانو بەپێی ئەو تایبەتمەندیەش دەبێ پرەنسیپەکانی مەدەنیەت بگونجێنینو جێبەجێی بکەینو پێشی بخەین.

**دیالۆگ/** سوپاس، کاك عبدالرحمن هەمان پرسیاریش ئاراستەی بەڕێزتە، چۆن کەوتۆتەوە ئەوە لەخۆرهەڵاتو خۆرئاوا؟

**عبدالرحمن/** بەڵێ، بەتەئکید هەرئەبێ بچمەوە سەر ئاماژە بەدوو قسە کە ئەو تەعریفانەی ئێمە هەمانە مەرج نییە کاك مەلا بەختیار واتە وەکو بڵێی بەبۆچونێکی مسبقەوە هاتوە چونکە (٥-٦) کتێبی هێناوە مەرج نییە مەسەلەی کەلیمەی احسان واتە خێرکردن، وشەکانی قورئان بۆخۆی سیستەمێکە ئەمڕۆ احسان بۆتە خێرو خێرخوازی ئەو کەلیمەی کە من باسی ئەکەم ئێمە تفاسیرمان

هەیە باشترین مفرداتی راغبی اصفهانییە کەباسی کەلیمەی احسانو سیستەمێکە بۆخۆی هەموو ئەو کارانە دەگرێتە خۆ کەدەوڵەت پێی هەڵناسێو خێزانیش پێی هەڵناسی ئەوە تەعریفی ئیسلامی دووەم مەسئەلەیەکی تر دەربارەی ئەو کتێبانە ئێمە ملزمین بەکاری خۆمانو بەقسەی خۆمان محمد قوتب ئینسانێکە بیرو بۆچوونێکی هەیە بیروبۆچونی ئێمە نییە ئەفەرموێ محمد قوتب ژنی ممنوع کردووە لەدەرچوون ئەی ژن لەیەکگرتووی ئیسلامی کوردستان ئەندامی سەرکردایەتی بەشەفەقە نا بە ئینتخابات ٢\٣ی دەنگی کۆنگرەی هێناوە ئەوە حەقم چییە بە محمد قوتبەوە، جارێکی تر لەبەرئەوە ئەو بۆچونە هەر قورعانە بەڵام ئەم لەوێوە هاتوە ژن مەنع دەکا لەسعودیەش ژن ممنوعە سەیارە لێبخورێ بەڵام لێرە.

**دایالۆگ/** ئەو پشتی بەچی بەستووە بۆ ئەو تەفسیرە؟

**عبدالرحمن/** هەربۆخۆی پشتی بەچی بەستوە لەکتێبەکەیا ئەبێ بیخوێنیتەوە بزانی پشتی بەچی بەستوە.

**مەلا بەختیار/** بەقورئان

**دایالۆگ/** بەدڵنیاییەوە پشتی بەدەقێکی پیرۆز بەستوە

**عبدالرحمن/** (وقرنت فی بیوتكن) ئەوە هەموو مفسرێك ئەیزانێ واوی عطفە (یانساء النبی لستن كأحد من النساء) تایبەتە بەخێزانەکانی پێغەمبەر (واذکرن ما یتلی فی بیوتكن) بەڵام ئەوە ملزم نین بەخێزانی غەیری پێغەمبەر هەتا بەدوای وەفاتی پێغەمبەر عائشە دەرچوو لەشەڕا بەشداری کرد لەگەڵ امامی علی یا ئەوە مانای چییە بۆ لەماڵی خۆی دانەنیشت، مەعنای وایە تایبەتە بەفترەی زمنی خێزانەکانی پێغەمبەر لەژیانی پێغەمبەرا، ئەوە مەسەلەیەکە لەبەر ئەوە ئەمڕۆ کەی ڕێ لەوە ئەگرێ ئیسلام نەیەڵێ ژن دەرچێ، یا دەرنەچێ، ئەوە بابەتێکی ترە، بەراستی ئینجا مەسەلەیەکی تر دەربارەی خورافات ئەبێ ئەو خورافاتانە تەعریفی بکەین ئایا ئینسان مەسەلەن ئیمانی بەخوا هەیە، بەزیندووبوونەوە هەیە، ئیمانی بەوە هەیە بەهەشت پاداشتیەتی ڕۆژی قیامەت فردیە بەینی خۆمو خوا ئیمانمان بەوە هەیە دۆزەخ هەیە، ئەمانە ناکرێ پێی بوترێ خورافات، واتە مەبەستم ئەوە نییە ئەو وای نەوتوە کاك مەلا بەختیار وای

ئەوتوە، تەئکید دەکەمەوە بەس مەبەستم لەکۆمەڵی ئەمڕۆیە زاراوەکان بەشێوەیەکی وەکو بڵێی واتە مطاطی بەکار ئەهێنرێ، دیاری بکەین خورافە واتە چی؟ ئەمڕۆ خەڵکانێك هەن خەڵکانێکی تر هەن دەڵێن ئیمان بەخواش خورافەیە، خەڵکانێکی تریش هەن دەڵێن ئیمان بەرۆژی دوایش خورافەیە، ئەوە نەرێتە، ئەوە ئەرکانی ئیمانە، من مجبورم من ملزمم پێی کەشایەتمانم هێنا ملزمم بەئەرکانی ئیمان بەئەرکانی ئیسلام لەبەر ئەوە باسەکەمە ئەوەم نییە مەبەست واتە تۆ وات وتبێ بەس باسم لەوەیە دەبێ تەعریفی خورافە بکەین کامە خورافەیە چونکە من تەنها بەیەکێك بڵێم ئیمانمان بەخوا هەیە، بەڵێ ئیمانم هەیە، لەوێ محمدیشی ناردووە وەکو پێغەمبەر قورئانی بۆناردووین تفاصیلەکەی نارۆم پیایامن ملزمم بەئەرکانی ئیمان، ملزمم بەئەرکانی ئیسلام، بەو موسڵمان بومە هەموومان بەوە موسڵمان دەبین لەبەر ئەوە ئەبێ تعریفی خورافە بکرێ کامی خورافەیە واتە چی بکەین بۆ ئەوەی لەرۆژهەڵاتو رۆژئاوا چۆن رەوتەکە رۆیشتوە من دووبارە دێمەوە سەرئەوە کۆمەڵی مەدەنی اقصائی نییە. من ناتوانێ کۆمەڵی مەدەنی ئەو کۆمەڵ مەدەنیەی کاك مەلا بەختیار هەوڵی بۆ دەدا ناتوانێ من اقصا بکات، چونکە بەاقصاکردن نییە، بەمشارکەیە، منیش لەکۆمەڵ هەم ناتوانم اقصای بکەم شتەکان بەتسامح بەسەلماندنە، بەسەپاندن نییە، لەبەرئەوە هەموو ئەو شتانە یەکی تیا ئەگرینەوە بەڵام نەچێتە خانەی تەوزیف کردنی حزبایەتی قسەکە، قسەکە لەوێوەیە ئێمە ئەبێ لەژیانی رۆژانەمانا گرنگترین کار کەئێمە کردوومانە لەپێناوی ئەوەی کۆمەڵی مەدەنی دروست بێ، بێ میلیشیاییەکەیە کەخۆی گەورەترین خەتەر لەسەر کۆمەڵی مەدەنیو چەمکی مەدەنیەت میلیشیا بوونە، کەبەوە توانیومانە نسبەتێکی زۆری دووربوونی کۆمەڵی کوردەواری کەتائێستا دووربووە لەو وەزعە، نەبوونی دەوڵەتە، ئەبێ دەوڵەت خۆی مقەوماتی یەکێ مادام لەبەینی دەوڵەتو خێزانانیە ئەبێ دەوڵەتمان هەبێ ئینجا ئەو دەوڵەتە لەپێناوی ئەوەی دروست بێو لەپێناوی ئەوەی کۆمەڵی مەدەنی تسامحو ئاشتیخوازانە پەیوەندیەکی لەگەڵ دەوڵەتا بکا، نەبوونی میلیشیا کارێکی زۆر گەورەیە جالەبەر ئەوە لەو روانگەیەوە ئەوەی ئێمە..

**دایالۆگ**/ وەڵامی پرسیارەکەت نەدایەوە، لەخۆرئاوا جێبەجێکردنەکەی بەرای جەنابت گەیشتۆتە کوێ؟ وەلەخۆرهەڵات لەسیستەمی خۆرهەڵاتیا بەهەموو حوکمڕانیەکانیەوەو مێژوویەوە گەیاندویەتە کوێ؟ بەرای تۆ بەکورتی.

**عبـدالرحمن/** بەتەئکیـد خۆرهـەڵاتو خۆرئـاوا دووچـەمکی نـسبین واتــە
ۆرهـەڵاتێکی بلـۆکی رۆژهـەڵات هەیـەو خۆرهـەڵاتی ئیـسلامی هەیـەو ئەگـەر
بەستەکە تەنها باسی کوێیە

**دایـالۆگ/** خۆرهـەڵاتی شارسـتانی بـاس دەکـەین خۆرهـەڵاتی شارسـتانیو
ۆرئاوای شارستانی

**عبدالرحمن/** من قەناعەتم نییە بەدابەشکردنی دنیـا بەخۆرهـەڵاتو خۆرئـاوا،
ونکە خۆرهەڵات هەمووی باش نییەو خۆرئاواش هەمووی چاك نییە، خۆرهـەڵات
ەمووی ئیـسلامی نییـەو خۆرئـاواش هـەمووی کـافر نییـە، واتـە ئەمـەوێ رونـی
ینەوە کەبەراستی زاراوەو چەمکی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا چەمکی عەمەلی دەقیق
یە.

**دایالۆگ/** بەڵام ئێمە متفقین لەسەر ئەوە پێویـست ناکـا هـەموو جـارێ بـاس
رێتەوە، خۆرئاوا مەبەستمان لەو سیستەمە کۆمەڵایەتییە ئابووریـە سیاسـیەیە
پێی ئەوترێ سەرمایەداری پێشکەوتوو ئێستا وەئەوەش کەرۆژهەڵاتیەو پـێش
یستەمی سەرمایەدارییە.

**عبدالرحمن/** کۆمەڵی مەدەنی بـەو زاراوەیـەی کەئێستە لەسـەری تعریفمـان
ڕد لەخۆرئاوا بۆ ئەو خۆرئاوایەی کەئێستا ناوی ئەبەی خۆرئـاوای سـەرمایەداری
ووەتەپێش، خۆرهەڵاتی پێش سیستەمی سـەرمایەداری دواکـەوتووە لەبەرچـی
ەکو باسم کرد ئەگـەر عـائق هـەبێ لەبـەردەمی کۆمـەڵی مـەدەنیا ئایدۆلۆجیایـە
یدۆلۆجیا بەمانای دوگمابوونەکـە لەبـەر ئـەوە هـەر سیستەمێك قەناعـەتی بـوو
دیکتاتۆریەت قەت ناتوانێ کۆمەڵی مـەدەنی دروسـت بکـات، بۆیـە بەبۆچـوونی
ێنی من لەگەڵتام بۆچوونی دینی ناتوانێ دروستی کا بـەڵام بۆچوونی ئیسلامی
توانێ دروستی بکا من جیاوازی ئەخەمە بـەینی دینـەوە چـونکە ئیـسلام دینـە
ڵام هەموو دینێ ئیسلام نییە، لەبەر ئەوە ئێمە نابـێ بەچاوی مردوەکـان شـت
خوێنینەوە، ئێستا کە ئەوە قورعانە لەبەردەستی ئێمەیایەو لەبەر دەستی ئـەم
ـەڵکی کوردسـتانەو ئەیخوێنینـەوە کۆمـەڵی مـەدەنی یـەکێتی زانایـان ناچێتە
انـەی کۆمـەڵی مەدەنیـیەوە قورعـانو سـونەتیان لەبەردەسـتایە جیـاوازی
روبۆچونیشیان هەیە.

**دیالۆگ/** لەم کاتەدا؟

**عبدالرحمن/** ئا بەڵێ

**مەلا بەختیار/** یەکێتی زانایان لەم کاتەدا دامەزراوە خۆ هەزار ساڵ لەمەوبە یەکێتی زانایان نەبووە.

**عبدالرحمن/** عەینی ئەوەبووە امامی شافعی کەسەردەستەی بووەو خەڵکم لەگەڵا کۆبۆتەوە چی بووە یەکێتی زانایانی سەردەمی خۆی بووە، ابوحنیفەء احمدی کوڕی حمبل امامی مالك تصورکە امامی مالك کاتی خۆی کەئەو کتابەء دانا (الموطأ) لەفیقها ئەبوجەعفەری منصور وتی ئەمە بکەین بەئەساسم دەوڵەتی ئیسلامی ئەم قسەیە فەرمووی وتی ((ان الموطأ هو اجتهاد مالك) ئە قسەی منە ئەوە اجتهادی منە چونکە فقهە بریتیە لەچی بریتیە لەعیلاقەیەا تفاعلێك لەبەینی دەقو سەردەمو واتە واقعەکەو فەقیهەکە مادام فیقهەکە گۆڕ مادام سەردەمەکە گۆڕا دەقەکانیش تعریفەکانیو یابڵێین تفسیرەکانی ئەگۆڕێ لەباسەکە دوورناکەومەوە کەرۆژهەڵات بۆ نەیتوانیوە کۆمەڵی مەدەنی دروسە بکا لەبەربوونی دیکتاتۆریەت.

**دیالۆگ/** بەهەموو شێوازەکانیەوە؟

**عبدالرحمن/** بەهەموو شێوازەکانیەوە یادینی بووە یاخود ئایدیۆلۆژیکم سیاسی یەعنی

**مەلابەختیار/** من ئەو قسەیەم زۆر زۆر قبوڵە، دیکتاتۆریەت بەمەعن ئایدۆلۆجیەکەی یەك دەقی بۆ دەخوێنمەوە بزانە لەمە دیکتاتۆریەتێکم ئایدۆلۆجی کورت تر هەیە ئەڵێ: (جیهان سەرومڕ سەرلێشێواوەو شڵەژاوە، ئە رژێمانەی هەشن ناتوانن چارەی ئەم دەردە بکەنو لەئیسلامیش بترازێ هیه دەرمانێکی تر نییە، جا ناوی خوای لێ بێننو بڕۆنە پێشەوەو چارەی بکەن هەموو دنیا چاوەڕێی رزگارکەرێکەو لەئیسلامیش کەئێوە مەشخەڵەکەیتار هەڵگرتووە بترازێ هیچ رزگارکەرێکی تری نیە) ئەمە قسەی حسن بەنایە (الاجتهاد الاسلامی العالمی للمنظمات الطلابیة) وەریگێڕاوە بەزمانی کوردی، مە پێم وابێ لەمە تۆتالیتاریتر افکار نییە، بەراستی شمولیترو موتڵەقترین حوك لەسەر هەموو ئەفکارەکان ئەمەیە، واتە: نەفی ئازادی هەموو ئایدۆلۆژیکەکانە

ەموو بەرامبەرێکە، من بەش بەحاڵی خۆم پێم وایە ئیسلامی سیاسی ئێستا ئەو
ابەندبوونەیان بەمێژووی ئیسلامی سیاسیو پێ داگرتنیان لەسەر ئیسلامی
یاسی وەکو شمولیەتی ئایدیۆلۆژیا، پێم وایە کۆمەنیستەکانیش وەکو جاری
اران پێداگرتنیان لەسەر کۆمەنیزم، دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاو مەتریالیزمی
ێژوویی‌و دەقە پیرۆزەکانو تەقدیسکردنی ئەویش ئایدۆلۆجیەتێکی شمولیە،
ستە دنیایەکە کەبەقەد ئەم دنیایە ببینینو گۆڕانکاریەکانی هەمووی ببینین
ەشمولیەت زۆر خەتەرە، بەراستی فکری شمولی زۆر زۆر خەتەرەو نابێ بەهیچ
ێوەیەك ڕێگە بدەین بەفکری شمولی، ئەگەر برادەرانی یەککگرتوو کاك
بدالرحمن باسی دەکا باوەڕیان بەو دەقانە نییەو باوەڕیان بەدیموکراتیەت
ەیە، دەبێ ساغی بکەنەوە کەباوەڕیان بەدیموکراسیەت، بەعەلمانیەت هەیە،
نجا ئەکرێ بڵێ باوەڕی بەبیروباوەڕی ترو ئازادی ترو بیروباوەڕەکانی تر هەیە،
ونکە تەنها سیستەمی دیموکراسی عەلمانی باوەڕی بەئایدیۆلۆجیەتی تر هەیە؛
سیۆنالیستە گۆشەگیرەکان وانین، کۆمەنیستەکان وانەبوون؛ ئیسلامیەکان
درێژایی ١٤٠٠ ساڵ حوکمڕانییان کرد، وانەبوون، واتا: لە ئیسلاما مناقەشە
سەر مەسائیلی عەقلی هاتۆتە پێشەوە، زۆر خەتەر بووە، خەڵکیان لەسەر
شتوە، قەڵەم ڕەوەکانی حاکمەکانی دەوڵەتی ئیسلامی هەزاران کەسیان
سەر فکر کوشتووە، حاکمەکانی کەنیسە هەزاران کەسیان لەسەر فکر
شتووە، کە ئەڵێ (من تمنطق تزندق) واتە ئەوەی کەباسی مەنتیق بکا زندیقە،
مە لەکوێ؟ عەقلانیەتی ئازاد لەکوێ؟

**دایالۆگ/** ماوەی تۆش ئەدەین لەماوەی یەك دەقیقەیا کورتە وەڵامێك

**عبدالرحمن/** دیارە حەقی هەموو کەسێك هەیە، حەقێکی مەشروعی خۆیەتی
ێ: پرۆژەی من وایە، ئەوە شتێکی لەو بابەتە هێنانەوەی دەقەکانی حسن بەنا
سن بەنا ئینسانێکە مەعصوم نیە، حەسەن بەنا قسەی کردووە، ئێستا
وەڵەکانیو شوێنکەوتوەکانی پێچەوانەی ئەو دەکەن، حەسەن بەنا قەناعەتی
تەعددی احزاب نەبووە، لەسەردەمی داگیرکردنی ئینگلیز کەچۆن ئێمە ئێستا
ەڵێین باهەوڵەکان یەکخەین لەپێناوی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی، بەڵام
سن بەنا دوای ئەو قەناعەتیان بەو قسەیەی نەبووە ئەو قسەیەی لەموزەکەراتی
ژیا نووسیویەتی.

**مەلا بەختیار/** تازە چاپی کردووە

**عبدالرحمن/** قسەكە قسەى ئەوە حسن بەنا لەنووسينەكانيا ئەوە تەرجە
كراوە بۆ كوردى حەسەن بەنا قەناعەتى بەتەعددى احزاب نەبووە بەلام ئە
اجتهادێكى تايبەتو شەخسى بووە بۆ كاتێكى خۆىو ئێمە پىٚى ملزم نين
ئێمە قەناعەتمان بەتعددى احزاب هەيە لەدەولەتى ئيسلاميشدا، قەناعەتم
بەتەعددى ئيسلاميش هەيە ئەوە لەبەرئەوە مەسەلەيەكە ئێمە پىٚى لەسە
دادەگرين ئەمە يەك دوو مەسەلەن كە(أن الدين عندالله الاسلام ومن يبتغي غ
الاسلام دينا فلن يقبل منه وهو في الاخرة من الخاسرين) باس لەئاخيرەتە بۆيە
تێكەلاوى نەكەين، پايەكانى ئيمان باس لەدواى دنيايە، لەدنيا ئەبىٚ بەيەكە
بژين، لەدنيا باس لەهاوولاتى بوونە، باس لەوە نييە ئەو موسلمانەو ئەو كافر
ئەمە بۆچوونە تازەكەيە لەتەتبيقا كەئێمە بتوانين تەتبيقى بكەين لەبەر ئە
نابىٚ ئەو دووشتە تێكەلاو بكەين ئينجا مەسەلەى ئەوە كەقەناعەتە
بەديموكراسيەت هەبىٚ بەلىٚ قەناعەتمان بەديموكراسيەت هەيە ئێمە لەپەيڕ
پرۆگرامەمان نوسيومانە كەعێراق بۆ ئەبىٚ عيراقى فيدرالى ديموكراتى تعددى
لەبەر ئەوەى لەچەندين ئەقوامو خەلكى تر پێك هاتووە، ئەو ديموكراسييە نە
ئەو ميكانيزمە نەبىٚ ناكرىٚ دەولەتێكى ئايينى لەعێراقا بتوانىٚ حوكمى ئ
هەموو ئەقوامو نەتەوە جياوازە بكا، ئينجا ئەلىٚ عيلمانيەت، عيلمانيەت بەراس
ساغ نەبۆتەوە چونكە ئێستاكە پێم وايە لايەنێكى تر بەجۆرێكى تر لەعيلمانيە
ئەوە ئيشى كاك مەلا بەختيارە رونى كاتەوە لەجەلسەيەكى ترا كەبەدوورودرێ
لەسەرى قسە بكەين تا هەلوێستى لەبەرامبەر وەربگرين چونكە لەدانيشتنێ
تريشا پرسيارێكمان بوو كەهەلوێستتان بەعيلمانيەت چىيە عيلمانيەت ئە
خۆى تعريف كا پاشان ئەبىٚ هەلوێستى لىٚ وەرگرين.

**دايالۆگ/** زۆر باشە ئەوە هەلئەگرين بۆ دانيشتنێكى تر...
بينەرانى خۆشەويست بەناوى ئێوەشەوە، بەناوى بەرنامەكەشەوە
سوپاسى هەردوو ميوانى بەرێزمان كاك مەلا بەختيارو مامۆستا عبدالر
دەكەين
بەخێربێن سەرچاو تا ئەلقەيەكى ترى بەرنامەى دايالۆگ..

## (١١)ی سیتامبەرو
## روبەڕووبونەوەیەك لەگەڵ یەکگرتوودا [+]

سازدانی: توانا ئەحمەد

**PUK TV توانا ئەحمەد:** بینەرانی خۆشەویست، خۆشحاڵین کە لەئەڵقەیەکی تری بەرنامەی گفتوگۆی سێشەممە بەیەك دەگەینەوە، ئەڵقەی ئەنجارەمان تایبەتە بەقسەکردن لەسەر روداوی یانزەی سێپتەمبەر، ئەو روداوەی کە هەردوو هێمای ئابوریو سەربازی ئەمریکای زۆر بەتوندی خستەوە لەکردەوەیەکی تیرۆریستانە، هەندێ روداو هەن لەگەڵ خۆیاندا مێژوو دابەشدەکەن، یان دابڕانێکی سیاسیو کۆمەڵایەتیو مێژوویی دروست دەکەن لەگەڵ خۆیان کۆتایی بەجۆرێك لەبیرکردنەوەو تێڕوانین دەهێننو بیرکردنەوەو تێڕوانینی تر بەرهەمدەهێنن، یان سیستەمێکی پەیوەندی تێکدەشکێننو سیستەمێکی تری پەیوەندی سیاسیو نێودەوڵەتی بونیاتدەنێن، ئەگەر بمانەوێ نمونە بهێنینەوە رەنگە شۆڕشی فەرەنساو شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ ی روسیاو هەردوو جەنگی جیهانی یەکەمو دووەمو روخانی بلۆکی سۆفیەت ١٩٨٩ دیارترین ئەو نمونانە بن، کە کۆتاییان بەو وەهمە هێنا کە مێژوو درێژبونەوەیەکی زەمەنی بێدابڕانە، باسکردن لەدەوڵەتو ناسیۆنالیزم، لەدیموکراسیو لەمۆدێرنێتە لەسەدەی هەژدەی ئەوروپا، رەنگە جۆرێك بوبێ لەوە، هەندێ لەچاودێران پێیان وایە کە لەیانزەی سێپتەمبەری (٢٠٠١) سەدەی بیست کۆتایی پێدێتو هەر لەو

---

[+] دیالۆگێك لەگەڵ (م. محەمەد رەئوف)ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان، شەوی ١٠\١١ /٢٠٠٢/٩ بەرنامەیەکی راستەوخۆی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان، سازدانی (توانا ئەحمەد).

چرکەساتەش سەدەی بیستویەك دەستپێدەکات، کاریگەری یانزەی سێپتەمبەر بەسەر دونیا، بەسەر سیاسەتو بەسەر پەیوەندی نێودەوڵەتی تەنیا لەو کارەساتە مرۆڤایەتیەوە نایە، کە ئەو روداوە لەدوای خۆی جێی هێشت، بەڵکو لەو سەردەمە دێ کە توشی یادەوەری رۆژئاوای کرد، واتە رۆژئاوای خستە بەردەم دوژمنێکی تازە، لەیانزەی سێپتەمبەری ٢٠٠١ تاکو ئێستا جگە لەروخانی حکومەتی تالیبانو کۆتایی پێهێنانی دەسەڵاتی قاعدە لەئەفغانستانو هەروەها داواکردنی قەرەبوکردنەوەی ئەو خەڵکانەی کە بوون بەقوربانی ئەو کارەساتە، ئێستا ئێمەی زۆر بەسەختی خستۆتەبەردەم گۆڕانکاریەکان، واتە ئێمەی کوردی خستۆتە بەردەم ئەگەری گۆڕانکاری، گۆڕانکاری لەتێڕوانین، لەبیروبۆچونی ئێمە بەرامبەر بەهێزو گروپە توندڕەو و تیرۆریستیەکان، هەروەها بەرامبەر بەعێراقو بەرامبەر بەسیاسەتی نێودەوڵەتی، بەرامبەر پەیوەندیەکانمان لەگەڵ دەوروبەرو لەگەڵ دەرەوە، بۆ باسکردن لەو کێشانەو چەندین پرسیاری تر لەم بەرنامەیەدا، میوانداری هەریەك لەبەڕێزان مامۆستا (محەمەد رەئوف) ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەککرتوی ئیسلامیو کاك (مەلابەختیار) ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانمان کردووە.. بەخێربێن سەرچاو..

PUK TV : مامۆستا من بەپرسیارێکی زۆر سادە دەستپێدەکەم، یانزەی سێپتەمبەر چییە؟

**م. محەمەد رەئوف:** بسم الله الرحمن الرحيم، سوپاستان دەکەم بۆئەو دەرفەتەو جێگەی خۆیەتی بەڕاستی وەکو ئاماژەت پێکردو راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ئەم مەسەلەیە ئەمرۆو ئایندەش پەیوەندی بەئێمەوە دەبێ. پێش ئەوەی وەڵامی پرسارەکەت بدەمەوە جارێکی تر بەناوی خۆمو یەککرتووی ئیسلامیشەوە ئیدانەی ئەو کارە ئیرهابیە دەکەم، کە لەیانزەی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠١ دا رویدا کە ئەو کارە بەڕاستی جێگەی خۆیەتی لەمێژوشدا هەمووساڵێك لەورۆژەدا ئیدانە بکرێتو هەموو ساڵێك لەورۆژەدا لەسەری گفتوگۆ دەکرێت، دنیای توشی تەنگەژەو قەیرانێکی ئەوەندە نارەحەت کردوە، خەڵكو هەموو سیاسەتی دنیاو گۆڕانکاری دنیا بەرەو نادیار هەتاکو ئێستا دەڕوات، یانزەی سێپتەمبەر بەڕاستی ئەگەر زۆر کورت بمانەوێ پێناسەی بکەینو قسەی لەسەربکەین، دنیایەکی نوێی هێناوە، سەرەتایەکی نوێی هێناوە بۆ دنیایەکی نوێ کە هێشتا ئایندەی دیار نیەو کەس ناتوانێ زۆر بەتەواوی قسە لەئایندەی ئەو دنیا نوێیە بکات، دنیای

خستۆته بەر تەنگژەیەکی نوێ که دەوڵەتانی گەورەو بچوك ئێستا پێوەی ئەگلێن، من هەرئەوەندە ئەتوانم پێناسەی یانزەی سێپتەمبەر بکەم، که ئەوە هەوڵێکی تیرۆریستی بوو دنیای گۆڕی بەرەو دنیایەکی نوێی نادیاریش دەبیات.

PUK TV : پێش ئەوەی پرسیار له کاك مەلابەختیار بکەم، حەزدەکەم بینەران ئاگادار بکەم که بەرنامەکه راستەوخۆیەو دەتوانن بەژمارە تەلەفۆنی (٣١٢٨٨٦) بەشداری بکەن. کاك مەلابەختیار بۆ قسەکردن لەسەر یانزەی سێپتەمبەر ناتوانین تەنیا قسه لەسەر ئەو چرکەساته بکەین، بەڵکو پێویستمان بەوەیه که بگەڕێینەوە ناو ئەو باکگراوندە، بەرای تۆ هۆکارو باکگراوندی ئەو کارەساته چی بوو؟

**مەلابەختیار:** سوپاس بۆ بەرنامەکە، هیویدارم منو مامۆستا محەمەد رەئوف ئەمشەو بتوانین هەریەکه لەجیهانبینی جیاوازی خۆمانەوە، شتێك بەبینەری کورد بڵێین که وردتر لەرووداوی یانزەی سێپتەمبەر تێبگاتو بزانێ لەدنیای ئێستای کوردستانا، جیهانبینیه جیاوازەکان دەتوانن بەوپەڕی ئازادانه قسەی خۆیان بکەنو لەرووداوەکه بدوێن، پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە،سبەینێ یادی یانزەهەمین ساڵەی دامەزراندنی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستانه پێم خۆشه پیرۆزباییەکی گەرم لەم یاده بکەم، لەهەموو کارمەندانی بکەمو لەهەموو ئەوانەش بکەم که لەسەرەتاوە لەدنیای (ی.ن.ك)ەوە ئەم دامێنانه جوانەیان بۆ یەکەمین جار لەمێژووی ئازادی کوردستاندا بۆ گەلەکەمان دامێناوەو توانیان سەرکەوتنو راپەڕین رازاوەتر بکەن بۆ گەلی کوردستانو هەموو رۆژو شەویش تەلەفزیۆن بکەن بەمینبەرێك بۆ مینبەری جوانی ئازادیو جوانی ئەزمونەکەمان، هەر لەسەرەتاوە جارێکی تر پیرۆزباییان لێدەکەم، لەوانەی دایانمەزراند، لەوانەی درێژەیان پێدا، لەوانەی گەشەیان پێداو ئەوانەی که ئێستا بەردەوامن لەخزمەتکردن.

لەراستیدا تێبینیم لەسەر پێشەکیەکەشت هەیە، لەسەر رووداوەکان،دابڕانی رووداوەکان، زنجیرەی رووداوەکان، لەسەر مۆدێرنێتەو ئەوانە، من تەسەورم وایه دنیای مۆدێرنێته دنیایەکی بەردەوامە، بەڵام رووداوەکانی نەگۆڕین. وانیه بڵێی دادەبڕێن لەیەکتر، هەموو قۆناغێك لەقۆناغەکانی مرۆڤایەتی پیش زایین، دوای زایین، پێش ئیسلام، دوای ئیسلام، ئەگەر سەیری بکەی یەك قۆناغە، یەك

رەوتە، بەڵام دابڕانی زۆری تیایە، سەردەمی مۆدێرنێتەش سەردەمێکە لەباری فەلسەفیەوە، لەباری سیاسیەوە، لەباری کۆمەڵایەتیەوە، لەباری کۆمەڵێ بابەتی مەنتقیەوە، دەکرێت زۆر قسەی لەسەر بکەیت، بەڵام قۆناغی جیاواز جیاوازو رووداوی جیاواز جیاوازو ئەسڵەن کارەساتی چارەنوسسازی جیاواز جیاوازیشی تێدەکەوێت، بەڵام پرۆسیسی مۆدێرنێتە پرۆسیسێکە هەتا دنیا نەخاتە ناو بازنەی شارستانیەتی خۆیەوەو هەتا دنیا تەواوتێرنەخوات لەهەمو پێویستیەکانی مۆدێرنێتە، تەسەورم وایە دەبێ چاوەڕوانی رووداوی تریش بکەین، چاوەڕوانی چرکەساتی کارەساتبارو دڵخۆشکەری تریش بکەین، بۆیە تەسەورم وایە مێژووی مۆدێرنێتە مێژوویەکە لای ئێمە لێکۆڵینەوەی کەمی لەسەرە، کەمتر توانیومانە بنجوبنەوانی لێکبدەینەوە.

رووداوی یانزەی سێپتەمبەر لەراستیدا رووداوێکە، بەڵام سەرەنجامی پەنگخواردنی کۆمەڵێك کێشەو بێشەو تەنگوچەڵەمەشە لەمێژووی مرۆڤایەتی، لەمێژووی دەسەڵاتی سیاسی مرۆڤایەتیو لەمێژووی دەسەڵاتی سیاسیە، لانی کەم سەرمایەداری لەدوای جەنگی یەکەمی جیهان بەدواوە کە ئینسان دەکرێ قسە زۆر لەو بابەتە بکات، ئەمە زادەیەکە لەزادە تراژیدیاکانی ئەم سەردەمە، زادەی چییە؟ زاەی ژانەکانێتی، ژانی چی؟ ژانی سیاسی، ژانی کۆمەڵایەتی، ژانی ئابوری، ژانی کەلتوری، ژانی جیاوازی نێوان دنیای دەوڵەمەندیو دنیای هەژاری، ژانی چارەسەرنەکردنی کێشە سیاسیە هەڵپەسێردراوەکانی ئەم دنیایە، سەبارەت بەمیللەتانی وەکو ئێمە، ئاوا دەکرێ قسەی لەسەر بکەین، یاخود دەتوانین بەجۆرێکی تر قسەی لەسەربکەین، دەتوانین بڵێین ئەو دنیایەی کە پێی دەوترێ جیهانگیری لەچەند ساڵی رابوردوودا پەیامێکی پێ بوو، ئەم پەیامە پەیامی سیاسی، ئابوری، یاسایی، راگەیاندن، پەیامی چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمە کۆمەڵایەتیەکان بوو. دەپرسین ئایا ئەم جیهانگیریەو پێش ئەم جیهانگیریە ئەو سیستەمەی پێی دەوترا یموکراسی توانیویەتی ئەم پەیامانەی خۆی بەتەواوەتی لەسەر گۆی زەوی بەدیبهێنێو وای لێبکات کە رووبەری بەردەم کۆنەپەرستی، بەهەمو ماناکەی، نەك هەر بەیەك مانای تایبەتیەوە، رووبەڕوی کۆنەپەرستی، رووبەڕوی دیکتاتۆریەت، رووبەڕوی دژەکانی دیموکراسی لەسەر ئەرز بەتایبەتی لەرۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە دواکەوتوانە، ئایا توانێتی رووبەری بەردەمی ئەوانە ئەمەندە تەسك بکاتەوە توانای ئەوەیان نەبێ لەناوچەیەکی دواکەوتوی

دژی دیموکراسی، دژی ئازادی، دژی ژن، دژی مرۆڤی وەکو دەوڵەتی ئیسلامی ئەفغانی، لەوێوە بازدەن بۆئەمریکاو ئەو کارانە بکەن، بێگومان نەخێر نەیتوانی، هەم سیستەمی دیموکراسی پێش جەنگی ساردو هەم سیستەمی تازەی دوای جەنگی ساردو هەم ئەوەی کە پێی دەوترێ جیهانگیری، لەم چەند ساڵەدا توانی لەباری ئابوریەوە بازاڕەکانی بۆ هەموو دنیا هەڵخا، توانی لەباری راگەیاندنەوە گەشەبکاتو بچێتە کونجو کەلەبەری دنیا بەئەفغانستانیشەوە، بەڵام نەیتوانی کێشە سیاسیە چارەسەرنەکراوەکان چارەسەربکات، نەیتوانی قەیرانو ئاستەنگە ئابوری‌وکۆمەڵایەتیەکان چارەسەربکات، ئەمە دوو مەسەلەی زۆر گرنگ بوو، لێرەوە نائەمنیەك لەرۆژهەڵاتدا، نائەمنیەك لەدنیادا دروست دەبێت، کە بێگومان ئەگەر فشاری باشی نەخەیتەسەر، رێگاچارەی باشی بۆنەدۆزیتەوە، کارەساتی وەکوئەوەی ئەمریکا ئەمجارە لەئۆروپاش دەتەقیەوە.

PUK TV : کاك مەلابەختیار بەرای تۆ روداوی یانزەی سێپتەمبەر دەرەنجامی ئەو ململانێیە بوو کە لەنێوان رۆژئاواو رۆژهەڵاتدا بوو؟

**مەلابەختیار:** نەخێر، مەسەلەکە ئاوا سەیرناکرێت، کە دەرەنجامی ئەو ململانێیە لەنێوان رۆژئاواو رۆژهەڵاتدا، مەسەلەکە ئاوا سەیردەکرێت لەم دنیایەدا تەنگ‌وچەڵەمەوکێشەی گەورەگەورەهەیە چارەسەرنەکراون، کە چارەسەرناکرێت بێگومان هێزە کۆمەڵایەتی، هێزە سیاسیە جیاوازەکان هەریەکی بەجۆرێك سەیری ئەمە دەکەن، ئەوەی پێی دەوترێ سەلەفیەتی تیرۆریستی لەدنیادا، ئەمە لەجیهانبینی خۆیەوە چووە لەدواکەوتوترین ناوچەکانی ئەمرۆی زەمین کە ئەفغانستانە، کە هەندێ لەپاکستانە، لە کشمیرە، لەبەنگلادشە، هەندێ لەو وڵاتە دواکەوتووانە، ئەم کۆچی کردووە بۆئەوێ، قەیرانی ئابوری، قەیرانی سیاسی، قەیرانی کۆمەڵایەتی، قەیرانی سایکۆلۆژی، هەموو ئەوانەی قۆستۆتەوەو توانیوێتی یەکێکی وەکو ئوسامەبن لادن سعودیە بەجێبهێڵێ، هەموو دەوڵەمەندیەکەی خۆشی بەجێبهێڵی بچێ ئەو خەڵکە هەژارەی پڕ لەقەیرانە کۆبکاتەوە لەدەوری خۆی، بۆئەوەی کارەساتی ئاوا بخوڵقێنێ.

PUK TV : پەیوەندی تەلەفۆنی.. سەرەتا بەخێرهاتنی هەردوو میوانە بەڕێزەکە دەکەم، بەڵام پێشەکی تێبینیەکم هەیە، بۆ تەنها ئەو دوو لایەنە بانگ کراون‌و خەڵکی تربانگ نەکراوە، ئایا ئەو روداوەی یانزەی سێپتەمبەر دەکرێ بڵێین دەستی جولەکەی تیایە؟ دووەم پرسیارم بۆ کاك مەلابەختیار، ئایا ئێستا وەکو بیستومانە لەمیدیاکانی جیهانەوە ئەڵمانیاو فەرەنسا دژی لێدانی عێراقن بەهەموو شێوەیەك، ئایا ئەمە ناکاتەئەوەی کەئەمریکا پاشگەزبێتەوە لەلێدانی عێراق؟ زۆر سوپاس.

PUK TV : بەنیسبەت ئەوەی بۆ تەنها ئەو دوو لایەنە داوەت کراون، پەیوەندی بەتەبیعەتی بەرنامەکەوە هەیە کە تەنیا دوو کەس بانگهێشت دەکات. پرسیاری یەکەم مامۆستا روبەڕوی تۆی دەکەموە، روداوی یانزەی سیچپتەمەر دەکرێ بڵێین دەستی جولەکەی تیابووە؟

**م. محەمەد رەئوف:** حەزدەکەم ئاماژەیەکی کورت بۆ قسەکانی کاك مەلابەختیار پێشەکیەکی لەسەر پێشەکیەکەی جەنابت هەبوو، کۆمەڵی موفرەداتی زۆری لەخۆی گرت، لەراستیدا زۆرێك لەبڕگەکان گرنگن، ئەگەر لەوێوە سەیری بکەین لەوانەیە خوێندنەوەی دنیا لەوێوە بکەین، زیاتر ئەمریکا تاوانبار بکرێت، ئەوکاتە ئاخرەکەشی کە دەبەستێتەوە بەقاعدەو بنلادنەوە، من پێم باشە لەقاعدەو بن لادنی بچوکەوە سەیری دنیا نەکەین، چونکە ئەگەر دراسەیەکی ورد بکەین لەسەر دیاردەی بن لادن‌و قاعدە لەئەفغانستان دروست بوو، ئەوە نەتیجەیە پێشەکی نیە لەسەر دە پانزە ساڵی ئەفغانستان، کە بەشایەتی هەموو دنیا کە ئیسپات بووە، ئێستا دەستی ئەمریکا خۆی هەبووە لەبەرشێوەبردنی ئەو حاڵەتە شۆڕشە، جیهادە، هەرشتێکە لەئەفغانستانا کراوە، ئەو بەرماوەو پاشماوەی ئەو حاڵەتەیە کە بەهەرحاڵ لەوەدەچێ قسەکردن لەسەر ئەو حاڵەتە زۆر ئاوکێش بێ‌و دنیای ئەمڕۆ ئەوەندە گەورەیە، گەر لەبن لادنەوە سەیری بکەن ئەگەینە بنبەستێك کە قازانجێکی لێناکەین. بەنیسبەت ئەم پرسیارەوە جولەکە دەستی هەیە لەو مەسەلەیەدا، یا نیەتی، ئەوەی کەوا متابەعەمان کردووە ماوەی یەك ساڵە ئەوەش وا لەئەنتەرنێت متابەعەی دەکەین، دەیخوێنینەوە، سێ نەزەریە هەیە، سێ بۆچون هەیە لەسەر ئەم روداوە، بۆچونی ئەمریکی بۆخۆی کە تەرحی

دەکات ئەو کەسەیە کە وەك ئەمریکا بیردەکاتەوە، ئەوەیە کە هەر دەستی بن لادن و قاعیدەو تەنزیمی قاعیدەیەو ئەوەی کە باوەڕی بەو عەمەلیە تیرۆریستیانە هەیە، ئەو ئەنجامیداوەو توانیویانە ئەو چەند تەیارەیە بفڕێنن و ئەو عەمەلیەی پێ ئەنجام بدەن، زۆرێکی تر لەخەڵکی جیهانی عەرەبی ئیسلامی بەتایبەتی و هەندێکیش لەپسپۆڕانی غەربی، فەرەنسی، ئەڵمانی، عەجاییبی نیە ئەمریکیشی تیابێ کە تەحلیلی عەمەلیەکە ئەکەن، هەرگیز ناچێ بەئەقڵیانا لەژێر هیچ تەحلیلێك دەرناچێ، کە ئەو عەمەلیە بەودیقەتە، بەو وردەکاریە، خەڵکێکی نیمچەنەخوێندەوار لەچاو تەکنەلۆجیای ئەمریکی و بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای ئەمریکی بەو دیقەتە لەچاو ئەوان نەخوێندەوارن.

PUK TV : مامۆستا ببورە، بەکارهێنانی تەکنەلۆجیا لەبەرئەوەی ئەو رێکخراوانە یان ئەو خەڵکە توندڕەوەی کە هەیە کوڕی ئەو سەردەمەی ئێستایە..

م. **محەمەد رەئوف:** ئەویش دروستە، بەڵام ئەبعادی تری هەیە، قەزیەکە چۆن ئەوان توانییان ئەم هەموو مەوقیعە حەساسە کۆنترۆڵ بکەن، ئەم هەموو مواقعی کۆمپیوتەرە کۆنترۆڵ بکەن، ئینجا بەدیقەت لەیەك کاتدا لەپێنج شوێنی تایبەتیا، بەهەرحاڵ ئەو عەرەبانەی کە قسە لەسەر ئەمە ئەکەن، تەحلیلیان وایەو ئەیگێڕنەوە بۆ مێژوییەکی کۆنتر کە ئەمە دەستی حەرەکەی صەهیۆنیە نەك مەسەلەی جولەکە، جولەکە جیا لەم قەزیەیە، ئەو برادەرەی کە ئەو پرسیارە ئەکات، لەوانەیە شتی خوێندبێتەوە، حەرەکەی صەهیۆنی زایۆنی بەجولەکە تەفسیر بکات، دوو شتی لەیەك جیان، مەسەلەکە وا باس ئەکرێت کە پلانێکی صەهیۆنیە، حەرەکەی صەهیۆنی بۆ ئەهدافێکی گەورەتر کە دوای ئەو روداوە دەستپێئەکات، هەندێکی تریشیان وائەڵێن، عەرەبی هەر تیانەبووە ئەسڵەن، ئەوەیان زۆر لەوانەیە شایانی باس نەبێ، چونکە عەرەب بۆخۆی بن لادن و غەیری بن لادن خۆی بۆ خۆی ئیعتراف ئەکات نەفی مەسەلەکە ناکات، بەڵام دووهەمەکەیان جێگەی نەزەرە ئینسان لەسەری بوەستێ، ئەگەر بن لادن و ئەم چەند نەفەرە توانیبێتیان ئیشێکی ئاوا گەورەب کەن، کاری گەورەتریشیان لەدەست دێ.

PUK TV : خۆی دانی بەوەدا ناوە، کاسێتێکی جێهێشتووە کە خۆی ئەو کارەی ئەنجامداوە ! !

**م. محەمەد رەئوف:** ئەوە وا تەحلیل ئەکەن کە ئەوە هەمووی فەنی ئیعلامیەو ئەکرێ تەرتیب بکرێت، فنونی تەکنەلۆجیای ئیعلامی کە هەیە، ئێستا هەیە، بەڵام لەهەموو حاڵەتێکدا ئەو برادەرە کە ئەو پرسیارە ئەکات ئەویش ئەو شتانەی بەرچاوئەکەویو گومانیش لەچیدا دروست ئەبێ، ئەقڵی ئەمریکیو ئەقڵی حەزارەی ئەمریکی خەڵك وای سەیرناکات، ئاوا لەدوای ئەو روداوە هەموو دنیا بگرێتە بەردەم ئەم هەڵمەتە ئەیەوێ گۆڕانکار، گۆڕانکاریەکی دەستپێکردوە نە سنوری زەمانی دیارە، نە سنوری جوگرافی.

**مەلابەختیار:** سەبارەت بەپرسیاری ئەو برادەرە، یەکەم؛ نەخێر ئەمریکا گەرمە، دووەم؛ فەرەنسا دژی نیە، فەرەنسا دەڵێ هەموو رێگاکان لەبەردەم ئەو کیشەیە ئاوەڵایە بەجەنگیشەوە. بەنیسبەت ئەڵمانیا دوا لێدوانیان ئەوەیە دەڵێن ئەگەر بێتو ئەمریکاو بەریتانیا دیکۆمێنتی تازە سەبارەت بەتاوانبارکردنی عێراق لەبری کۆکردنەوەی چەکی کۆکوژیەوە، دەربخەن، ئەوکاتە هەموو سیاسەتی ئەڵمانیاش دەگۆڕیو هەموو قەناعەتی ئەڵمانیا سەبارەت بەو مەسەلەیە دەگۆڕی، دیسان دەیلێمەوە: گریمان فەرەنسا یا ئەڵمانیا دژی ئەوەیە، ئەمریکا خۆی رایگەیاندوە دەڵێ بەتاقی تەنهاش بێ ئێمە مەسئولیەتی لێدانو گۆڕینی عێراق تەحەمول دەکەینو رژێمی عێراقی هەر دەگۆڕین.

PUK TV : پەیوەندیەکی تر.. ئەوین خان، ئەگەر لێدانی ئەمریکا نەبوایە بوونی قاعدە نەدەبوە جێگەی شانازیتان وەکو حزبێکی ئیسلامی؟ بۆ کاك مەلابختیاریش ئەگەرلێدانی عێراق دوای شەڕی کوێتودوای کارەساتی یانزەی سێپتەمبەر ئەم دوو کارەساتە دەتوانین بڵێین ببێتە هەلێك بۆ گەلی کوردو ئەگەر ئەو کارەساتە لەئەمریکا نەبوایەو لەهەر وڵاتێکی تر بوایە مێژوەکەی دەگۆڕا؟

**مەلابەختیار:** پێش ئەوەی وەڵام بدەمەوە، هەندێ تێبینیم لەسەر قسەکانی (م.محەمەد رەئوف) هەیە، حەزدەکەم روونی بکەمەوە، ئەویش ئەوەیە کە من لەقسەکانما بێگومان کۆمەڵێك لەو کەمتەرخەمیەو لەو کێشەوبێشەی سیاسەتی دنیادا هەیە دەیخەمە سەر ئەمریکا، بەڵام ئەمریکا بەلێپرسراوی یەکەم لەو کارەساتانە نابینم، بەراستی ئەمریکا پەلاماردراوە، سەرەنجامی کێشەیەکیش پەلاماردراوە، خۆ ئەمە ناکرێت لەهەرلایەك کێشە هەبێت رەوابێ پەلاماربدرێ، دووەم؛ ئایا لە بن لادن‌و قاعدەوە سەیری ئەو دنیایە بکەین، یا لەدنیاوە سەیری بن لادن‌و قاعدە بکەین، بێگومان لەهەردوولاوە، هەم لەدنیاوە دەبێ سەیری ئەم کێشەیە بکەین، کە کۆمەڵێك هێزی تیرۆریستی لەدنیادا، ئەمە سیاسەت‌و بەرنامەیانەو هەم لەمانیشەوە، دەبێ لەجیهانبینی ئەمانیشەوە سەیری ئەوەبکەین، تۆ بزانە ئەگەر لەبەرئەوەی ئەمانە بچوکن لەبچوکی ئەوانەوە سەیری گەورەیی دنیا نەکەین، ئەوەنیە شتی بچوك کارەساتێکی گەورەی خوڵقاندوو ئەوەنیە ئەو کارەساتە بۆتە مایەی ئەوەی سیاسەتی دنیا بۆ قۆناغێکی تر بڕوات‌و ئەوەنیە سیاسەتی گەورەی دونیا کە بۆ قۆناغێکی تر دەڕوا، بچوکەکان دەوڵەتێکی وەکو ئەفغانستان ناهێڵێ‌و دەوڵەتانی تریش دەخاتە ژێر هەڕەشەوە، سەیرکە گەورەو بچوك، بچوك‌و گەورە ئەگەر بەشێوەیەکی هەمەلایەنە سەیری بکەیت، لەرووداوێکی ئاوادا دەکرێ کارلەیەکتر بکات، خۆ جەنگی یەکەمی جیهان هەموو زەمینەکەی خۆش بوبوو، بەڵام لەیوگسلافیا دوو تیرۆریست، دوو دۆقی نەمسایان کوشت، بەهۆی ئەوەوە ئاگرەکە بەربووەوەو هەمو دنیای گرتەوە، دوو کەس، کەواتە ئەم مەسەلانەش دەکرێت لەگەورەوە بۆ بچوك، لەبچوکەوە بۆ گەورە سەیری بکەی، چونکە ئەو مەسەلانە زۆربەیەکەوە دەبەسترێت لەچرکەساتی تایبەتی کە دنیا دەئاوسێ بەناکۆکیەکان، بەکێشەکان یاخود بەوەرچەرخانێکی تازە لەم دنیایەدا.

سەبارەت بەوەش کە هەن باوەڕیان وانیە کە قاعدە وایکردووە، بەڕاستی ئیتر هەق نیە ئەو قسەیە بکەین، ئەمە قسەی یەك رۆژ لەدوای رووداوەکەیە، دووهەمین رۆژی دوای رووداوەکە، هەموو شتێك بڕایەوە کە ئوسامە بن لادن، قاعدەیە، حکومەتی ئەفغانستان ئەم کارەی کردوە، کێشەکەش لەوەدایە نەك ئێستا مامۆستا محەمەد رەئوف، دوای ساڵێك قسەی وا دەکات، هەتا لەکاتی

روداوەکەش برادەرانی یەککگرتوو بەتەمومژەوە باسی ئەو مەسەلەیەیان کرد، لەچواردەی مانگ سێ رۆژ لەدوای روداوەکە لەژمارە (٣٥٥)ی رۆژنامەی یەککگرتوودا ئەگەر بیخوێنینەوە، زۆر بەتەمومژی باسی ئەوە دەکەنو ئەسڵەن قبوڵیشیان نیە ئەمریکا لەسەر ئەو روداوە پەلاماری هەموو هێزە ئیسلامیەکان بەئەفغانستانیشەوە، بەقاعدەیشەوە بات قبوڵیان نیە دوای ئەوە بەحەوت رۆژ لەژمارە (٣٥٦)یش کە هەموو شتەکان ساغ بوەوە، هیچ شتێك نەما کە خەڵك نەزانێ ئەمە ئەفغانستانە، ئەمە قاعدەیە، ئەمەش ئوسامە بن لادنە،و نەتەوەیەکگرتوەکانیش بڕیاری دا، بڕیاری (١٣٣٣)ی دا لە (١٨)ی مانگدا ئەو بڕیارەی دا، داوای تەسلیمکردنی ئوسامە بن لادنی کردو سەلمێندرا کە ئوسامە بن لادنو قاعدەو حکومەتی ئەفغانستان ئەوەی کردوە، دیسان هێشتا برادەرانی یەککگرتوو ئەوکاتە دانی پیانەنێن کە ئەوەیە بەشێوەیەك تەحلیلێك دەکرێت کە دەویسترێ بەئیجتیهادێکی ترا ببرێ، ئەوکاتە برادەرانی یەککگرتوو دەڵێن جەماعەتێکی یابانیو جەماعەتێکی صەهیۆنی هەن کە تاوانبارن، لەراستیدا ئەوە ئەگەر ئەوکاتە پاساوی هەبوبێ، هەفتەیەك دوای ئەوە ساڵێك دوای ئەوە، دوای ئەوەی هەموو دیکۆمێنتەکان بڵاوکرایەوە، ئیتر ئەوە دەرکەوت هەندێك ناسیۆنالیزمی عەرەبی، هەندێك هێزی ئیسلامی عەرەبی ئێستاش کە تەفسیرێکی زۆر نامەنتقی، زۆر دور لەواقع بۆ مەسەلەکان دەکەن، ناکری ئێستا ئیتر باسی بکەینەوە، چونکە بچوکترین تەمومژ لەسەر ئەو مەسەلەیە نەماوە.

ئەگەر لەئەمریکا نەدرایە ئایا ئەمە دەبوو، من تەسەورم وایە دەبوو، چونکە مەسەلەکە راستە ئەمریکا هەژا بەم کارە، کارەساتێکی گەورە بەرامبەر بەئەمریکا کرا، بەڵام ئەمریکا لەدوای ئەم کارەساتە سیاسەتێکی جیهانگیریو جیهان هەژێنی هەیە لەدنیادا، تۆ سەیرکە، خۆ ئەمریکا نایەت بڵێ من ئەگەر قاعدەم لەناوبرد وازلەمەسەلەکان دەهێنم، ئەمریکا ناڵێت حکومەتی ئەفغانستانم لەناوبرد واز لەمەسەلەکە دەهێنم، ئەمریکا حکومەتێکی تریشی هێنایەکایە لەئەفغانستان دیسان ناڵێ واز دەهێنم، ناشڵێ ئەگەر حکومەتی عێراق بگۆڕم واز دەهێنم، ئەمریکا دەڵێ تا پەنجا ساڵی تر درێژە بەم شەڕە دەدەم، لەهەرلایەکی تر ئەمە ببوایە ئەمریکا بێگومان وڵاتانی ئەوروپاش زۆرتر تەداخولیان لەم مەسەلەیە دەکرد، کاکە لەسەر مەسەلەی یوگسلافیا ئەمریکا کەمی نەکرد، تەواوی خەریتەی رۆژهەڵاتی ئوروپا لەسەر مەسەلەی یوگسلافیا گۆڕا.

PUK TV : مامۆستا محەمەد رەئوف، دەربارەی ئەو تەمومژەی کە لەسەر هەڵوێستی یەکگرتوو هەبوو لەبەرامبەر یانزەی سێپتەمبەری ٢٠٠١ تۆ چی دەڵێی؟

**م. محەمەد رەئوف:** بەراستی شتێکی وا هەست پێناکەمو شتێکی وا هەر نایەتەوەیادم، ئەسڵەن دیفاع کرابێت لەهەڵوێستی تیرۆریستان پەلاماردانی ئەمریکا، ئەگەر تەحلیلێکیش کرابێت، لەروی ئەو وتارو نوسینو تەحلیلاتانەوە ئەکرێ، ئێمە هەتاوەکو ئێستاش بەراستی خۆمان تەسەورمان بۆ دروست نابێت کە قاعدە بەو بچوکیە بتوانێ ئیشی وا گەورە بکات، نەك ئێمە، ئەوە خەڵکی فەرەنسا، خەڵکی ئەڵمانیا، خەڵکی عەجایب نیە وەکو ئیشارەتم کرد ئەمریکا ئیشەکە لەگەورەییدا تەسەور ناکرێت، کە خەڵکێکی ئاوا بچوك بتوانن ئیشی ئاوا گەورە بکەن، ئێمە هەر رۆژی یەکەم بەیاننامەمان دەرکردوە، نامەشمان ناردووە بۆ ئەمریکاو ئیدانەی فعلەکەمان کردوە، ئیدانەی فاعیلیشمان کردوە، ئەوە زۆر تەبیعیە چونکە ئیشەکە بەئیشێکی تیرۆریستیانە ئەزانین لەروی مەبدەئیەوە، لەروی فکریەوە ئەسڵەن بەکارێکی جائزی شەرعیشمان نەبینیوە.

PUK TV : ئەو دیکۆمێنتانەی کە ئێستا هەن لەوەدا نەماوە کە تەسەور بکرێت ئەوانن یان ئەوان نین؟

**م. محەمەد رەئوف:** ئەوەی کە لەبەردەستمە دوێنێ لەئەنتەرنێت دەرهاتوە، ئەوە تەقریبەن سەد لاپەرەیەك مقالاتی زۆری تیایە، کە ئێستاش بەو تازەیە تەحلیلی ئەوە ئەکەن لەسەر قسەی موتەخەصصی فەرەنسیو ئەوانە کە خەدیعەی کوبراو باسی ئەم مەسەلانە ئەکەن، تەسەوری ناکەن ئەو شتە لەتوانای ئەواندا بێ کردبێتیان، ئەگینا بەنیسبەت ئەسڵی مەسەلەکەوە، ئێمە پاساو بۆ کوێی ئەم قەزیە ئەهێنینەوە؟ ئەسڵەن جیهانی عەرەبی ئیسلامی زەرەری کرد، ئێمە زەرەرمان کرد، هەموو ئەو میللەتە چەوساوانە زەرەریان کرد کە کێشەکانیان دواکەوتوە، ئابوری جیهان بەرەو کزی ئەڕوات، یانی شتێك نیە تۆ پەنای پێبەری بۆئەوەی پاساوی بۆ بهێنیتەوە، نە بۆ فاعلی کارەکە، نە بۆ ئەسڵی کارەکەو بۆ ئەو ئایندە نادیارەی لەسەرەتادا ئیشارەتم پێکرد، هەموو حەرەکاتی ئیسلامیو صحوەی ئیسلامیو مەشروعی ئیسلامی لەسەرتاسەری

هەموو دنيادا زەرەرى كرد، دواى هەموو زەرەرە كەسێك بيرئەكاتەوە لەوەى پاساو بهێنێتەوە بۆ ئەم كارە، ئەوە هەر لەمومكينات نيە، بەڵام خۆ تۆ ناتوانى رێگە بگرى لەوەى من چۆن تەسەور بكەم بۆ ئەم كارە. يانى من لەوانەيە لەنزيكەوە زۆر دراسەم كردبێ لەسەر هەموو ئيسلامەكانى دنيا، بزانم توانايان چەندە ئەوان ئەو نين بتوانن ئيشى وا گەورە بكەن، لەوانەيە عەجايب نيە من قەناعەتى شەخصيم دواى ئەو هەموو خوێندنەوەيە بۆ دروست بوبێ، ئەمانە بەكارهێنراون لەعەمەليەكە، ئينجا واش بەكارهێنراون كە هەروەكو فعلى خۆيان بێ زۆر تەبيعييە، بەس ئەم لەئەفغانستانەوە پلان دارێژێت بۆ تێكدانى ئەمريكا من حەزدەكەم بەرێگايەكى زانستى تۆ قەناعەتم پێبكەى، ئينجا دەركەوێ لەنەتيجەشدا لەسەر شاشەى ئەو تەلەفزيۆنە كە ئەمشەو جزيرە هەندێ محاوەلەى كردوە، شەويش محاوەلاتى تر ئەكاتو شتى تريش ئەبێت ئەم مەسەلەيەش لەوانەيە پەنجا ساڵێ تر مەسەلەكە يەكلايى بكرێتەوەو لەچيەوە سەريگرتو نەتيجەش بەرەو كوێ ئەڕوات، هێشتا ماوێتى، پێمان خۆشە بەراستى رون بێتەوە بۆ هەموو دنيا، بۆئەوەى ئەمريكاش لەسەر ئەو ئەساسە مەوقيف بگرێت لەهەموو ئيسلاميەكانى دنيا، ئەڵێ بن لادن بووە، قاعدە بووە، بەس مەوقيف لەوڵاتێكى وەكو سعوديە ئەگرێت، مەوقف لەمسر ئەگرێت، موقف لەهەموو عالەمى عەرەبىو ئيسلامى ئەگرێت، هەمووى خستۆتە بەر موحاسەبەو موحاكەمە، ئێستا هەموو دەوڵەتەكان دەستيان گرتوە بەكڵاوە شڕى خۆيانەوە.

PUK TV : (١١) ى سێپتەمبەر دنيا ئەكەوێتە ناو تۆڕێكى پەيوەندى كە كارلێك زۆر ئاسانە هەموو كێشەكان زۆر بەراستەوخۆيى تەئسير لەيەكتر ئەكەن بۆ نموونە ئەمريكا ئەو دەوڵەتە نامێنێتەوە كە لەوديو ئۆقيانوسەكان بێ، كێشەيەك لەئەفغانستان يا لەئەفريقيا يا لەئاسيا روودەدات پەيوەندى بەئەمريكاوە دەبێ، بۆيە ئەمريكا تەقەبولى ئەو سيستەمە ناكات كە هەڕەشەن بۆسەر بەرژەوەندى؟

م. **محەمەد رەئوف:** ئەمريكا لەوێدا هەقى خۆيەتى هەركەسێ ئەمنى ئابورى، ئەمنى سياسى، ئەمنى حەزارى بخاتە مەترسيەوە، ديفاع لەخۆى بكات.

**مەلابەختیار:** بۆئەوەی هەریەکە بەشێوەیەکی دیپلۆماسی قسەبکەین، بەڵام پێم وابێ باشترین شت ئەوەیە کە ئەو پێ لەسەر هەڵوێستەکانی خۆی دابگرێ، منیش پێ لەسەر هەڵوێستەکانی خۆم دادەگرم، بەمیتۆدێکی جیاواز ئەگەر زۆر لەیەکیش جیاواز بین قسەبکەین، بۆئەوەی لەم دوو جەمسەرەوە راستیەکان بڵێین، پێم وابێ مامۆستا لەماوەی وەڵامدانەوەی مندا، دیسان سەلماندی کە تەمومژ دەخاتە سەر روداوەکە، کە من وتم لە ژمارە (۳٥٥)و (۳٥٦)ی رۆژنامەی یەکگرتوودا وایان وتوە، پێم وابوو ئیتر مامۆستا وەڵامم ناداتەوە بۆئەوەی کە بیبرمەوە رۆژنامەکە خۆی دەخوێنمەوە، لەژمارە (۳٥٥)دا دەڵێن: (**شایەنی باسە ناوەندەکانی جولەکەو بەرپرسیارانی ئیسرائیل لەهەوڵی ئەوەدان کە روداوەکان بدەنە پاڵ ئیسلامیەکان، بەڵام زۆرێك لەچاودێران و شارەزایان ئاماژە بۆئەوە دەکەن کە زۆر نزیکە ئەو هێرشانە لەلایەن خەڵکانی ناو ئەمریکاوە ئەنجامدرابن، هەندێ سەرچاوەش بەدوری نازانن کە قاچاخچیەکانی مادە سڕکەرەکان دەستیان لەروداوەکەدا هەبێ**) ئەمە تەحلیلی یەکەمیانە لەچواردەی مانگ سێ رۆژ دوای روداوەکە، بۆئەوەی کە لایەك تاوانبار بکرێ، کە هیچ پەیوەندیەکی بەئیسلامیەکانەوە نەبێ، دوای ئەوەی هەموو شتەکان ئیسپات دەبێ، ئەمریکا بەبەڵگەوە شتەکان ئیسپات دەکاتو تالیبان دەخرێتە قەفەزی ئیتهامو لەسەروتاری ژمارە (۳٥٦)ی رۆژنامەی یەکگرتوودا کە زمانحاڵی رەسمی یەکگرتوی ئیسلامییە بزانە چی دەڵێن، دەڵێن: (**پێمان وایە تاوانبارکردنی موسڵمانان هەموو گروپ و حزبێك کە ئیسلام بەرنامەو عەقیدەی سیاسی بێت، کە دیارە ئەفغانستان هەر دەوڵەتێکی ئیسلامی بێت، دووەم قاعیدەش بەرنامەو عەقیدەی ئیسلامی بووە لەوڵاتانی ئیسلامیداو لەسەر خاك و وڵاتانی خۆیانداو پەلاماردان و ناوزڕاندن و هەڵمەت بردن بۆیان کارێکی حساب بۆنەکراوە**)، پێم وابێ ئەمە زۆر زۆر رونە کە سەرەڕای هەموو بەڵگەکان خراوەتەڕوو. لێرەوە یەکگرتوو هێشتا ناتوانێ، هێشتا نایەوێ بڵێت ئەفغانستان یا قاعدە هەقە سزادبدرێ لەسەر ئەو تاوانە.

**م. محەمەد رەئوف:** ئەو ئەوزوعە زەرورە قسەی تیابکەین، پێشوەخت تەوەرێکی تر بکرێتەوە، پێشەکی هەرچی بزانم بەسەراحەت ئەوە ئەڵێم، ئەسڵەن نازانم قسەی دیپلۆماسیەتو شتی وا، ئەوەی هەفتەیەك دوای یانزەی سێپتەمبەر وتوومە بەقەناعەتەوە لەسەر رادیۆی یەکگرتو لەهەڵەبجەی شەهید، ئێستاش هەر

ئەو قەناعەتەم وتووە، هەندێکی بەهەقیقەتی ئەزانین دیفاع لەخەڵکی ئەمریکا وەکو هەموو خەڵکێك، ئینسانی ئەمریکی وەکو هەموو ئینسانێك مافی هەیە، ئەوە شتێکی مەبدەئییە بەلای ئێمەوە، دیسان ئاماژە بەوە ئەکەم: من پێم خۆش نییە هیچ بینەرو بیسەرێك وا حساب بکات کە مەلابەختیار دیفاع لەئەمریکاو مومەسیلی ئەوەو منیش دیفاع لەعالەمی ئیسلامیو تیرۆریستانی دنیای ئیسلام ئەکەم، ئەوە هەقیقەت نیە، ئەمریکا چەندێك پەیوەندی بە کاك مەلابەختیارەوە هەیە، ئەوەندەش پەیوەندی بەمنەوە هەیە، چونکە هیچ رەبتو ئیرتباتێك لەبەینی قەزیەکانا نیەو ناتوانین قەزیەیەکی مەنتقی لەو مەحالەدا دروست بکەین، نەتیجەیەك بدات ئەو بەدیوێکداو منیش بەدیوێکی تردا، قسە لەسەر مەسەلەیەكو روداوێکی جیهانی ئەکرێت، کە زەرورەتی باسکردنەکەی ئەوەیە کە لەنەتیجەدا بەجۆرێك لەجۆرەکان پەیوەندی بەئێمەو کێشەی ئێمەو دۆزی ئێمەوە هەبێو کاتیش بەو مەسەلەیە زۆرتر بەین پێم باشترە. ئەوەی کە لە جەریدەکەدا کاك مەلابەختیار خوێندیەوە، هەرچەند لەوانەیە پێی خۆش نەبێ بچمەوەسەری، ئەوە قسەو تەحلیلە یەکەم، وەکو هەر رۆژنامەنوسێکی تر کە قسە ئەنوسێ ئەویش نوسیوێتی، ئەمریکا تەبعەن لەسەرەتاوە کەوتە چەند هەڵەیەکی گەورەوە، یەکەم دژ بەکەلیمەی (مسلم) موسڵمانانو ئیسلام هەمووی قسەی کرد، تا دوایی لێی پەشیمان بوەوە، هەتا کەلیمەی حەربی صلیبی لەدەمی جۆرج بۆش دەرچوو، دوایی لەژێر فشارێکی دنیای ئیسلامو دونیای غەرب، ناچار پەشیمان بوەوە لەوەی کە ئەوە هەڵەیەو دەبێ پەشیمان بێتەوە، چونکە دوبارەکردنەوەی مێژویەکی تاڵە هەم بۆ جیهانی غەربی هەم بۆ جیهانی عالەمی ئیسلام، ئەوان لەو سەرەتاوە کە هەموو دنیای ئیسلامو باسی موسلیمیان تێکەڵ ئەکرد بەکەلیمەی ئیرهاب، ئێمەو هەموو تەیارێکی عالەمی ئیسلامی لەوکاتەدا رەدی خۆمانمان هەبووە، ئەوان ئێستا ئەو مەجالەیان تەسك کردۆتەوە، بۆیە دژ بەئیسلام قسەناکەن، ئێمەش مەوقیفێکی ترمان هەیە، هەموو موسڵمانێك ناونانێ تیرۆریست، مەوقیفێکی ترمان هەیە، ئەمریکا ئەگەر یەك قەرنی تریش بێتەپێش سەیتەرە بەسەر دنیاشدا بکات، ئەو دنیایەی وەکو باس ئەکرێت، ئەو دونیا نوێیەی کە ئەیانەوێ بیچەسپێنن بەسەر هەموو عالەمی عەرەبی ئیسلامی بیکەنە بەشێك لەغەرب، لەدیوی دووەمی عەولەمە، ئەوە هەرگیز سەرناگرێ، چارەسەر حیوارە، لەنەتیجە چارەسەری هەر ئەبێ حیوار بێ.

PUK TV : مامۆستا تۆ تەسەور ناکەیت فعلەن کێشەی ئەو هێزو گروپە توندڕەوانەی کە لەڕێگەی تیرۆرەوە دەیانەوێ بەدنیا بڵێن ئێمە هەین، کێشەی ئەوەیە کە زمانێك شك نابەن کە زمانی گفتوگۆو لێکتێگەیشتن بێ، شارستانی رۆژئاوا شارستانیەتێکە جێگای هەموو بیروباوەڕو هەموو فرەدەنگیو فرەرەنگیەکی تیا دەبێتەوە، بۆ ئەو هێزو گروپانە نەیانتوانی لەوێ ئەو حیوارو گفتوگۆیە دروست بکەن لەبیریشمان نەچێ هەموو سقلو هێزی ئیسلامیەکان بەزۆری لەئەوروپاو رۆژئاوایە؟

**م. محەمەد رەئوف:** بەڵێ جوانە، ئێمە ئەمریکاو غەرب هەرچەند دژی ئەو حاڵەتە بێ کە ئایندەی ئەخاتە خەتەر هەقی خۆیەتی، ئێمە زیاتر ماندوین بەدەست ئەو بیرکردنەوە تەکفیریو بیرکردنەوە تیرۆریستیانەی کە لەعالەمی ئیسلامیو دەرەوەشیا هەن هەتاوەکو ئەوان.

PUK TV : ستران عەبدوڵلامان لەگەڵە..

ئەم کاتەتان شاد، من هەندێ تێبینیم لەسەر قسەکانی مامۆستا هەیە، لەراستیدا ئەگەر بەراوردێك بکەین لەنێوان بەرنامەکەی ئێوەو ئێستا لەجەزیرە، ئەو کاسێتە لێدەدرێ کە بەڵگەی حاشاهەڵنەگرە لەسەر بەشداریکردنی قاعدە لەو تاوانەداو هەروەها بەڵگەیەکە لەسەرئەوەی کە پلان دانان بۆ ئەم تاوانە لەئەفغانستان کراوە، من پێم وایە کە ئەمەش جۆرێکە لەوەلام بۆ هەموو ئەو روانینانەی کە پێیان وابوو، گوایە نە قاعدەو نە حکومەتی تالیبان دەستیان لەو کردەوەدا نیە، ئەگەر ئێمە بیرمان بێ، رۆژە سەرەتاییەکانی روداوەکە کە وەکو کاك مەلابەختیار باسی کرد، لەناوەندی ناسیۆنالیستی عەرەبیو ناوەندی هێزە ئیسلامیەکانی عەرەبەوەو بەشێکی زۆری وڵاتانی عەرەب تەحلیلی ئەوە دەکەن کە گوایا ئەوان دەستیان لەوکارەدا نیە، بەلا م پاش چەند مانگێك هەر خۆی تەلەفزیۆنی جەزیرە، کە رێبەرایەتی ئەو هەڵمەتەی ئەکرد کە گوایا دەستی قاعدەی تیادا نیە، خۆیان ئێستا کاسێتێکیان بڵاوکردەوە پیشانی دەدەن کە بەفعلی بەڵگەکانی کە پێشکەش کران، راست بوونو من پێم وایە لەم هەڵمەتەشدا ئیعتماد دەکرێتە سەر ئەوەی کە زاکیرەی یادەوەری ئەو بینەرانەی کە رۆژانە متابەعەی هەواڵەکان دەکەن، رەنگە زەعیف

بێ و رەنگە خەڵك لەبیری بچێتەوە کە هەر ئەم راگەیاندنانەی کە ئێستا رایدەگەیەنن، دەستی قاعدەی تیادایە خۆیان دەیانگوت دەستی ئەوانی تیانیە، من پێم وایە ئەگەر هێزەکانی ناسیۆنالیستی عەرەبی و هێزەکانی ئیسلامی سیاسی، کەڵکێك وەربگرن لەوەی کە دەستی ئەو بەشداریکردنە بەشداریکردنی قاعدە بکەن، من نازانم هێزێکی کوردستانی یا ئیسلامیش بۆ چ ئیستفادەیەك لەوە دەکات کە حاشا لەوەبکات کە ئەو تاوانە قاعدە کردبێتی.

یەك تێبینی تریشم هەیە لەسەرئەوەی مامۆستا وتی، ئەم کارەی کە قاعدە نەیکردوەو ئیسلام زەرەری تیاکردوە، بەڵێ ئیسلام زەرەری تیا کردوە، بەڵام لەروانگە ی قاعدەوە کەڵکی لەم کارە وەرگرتوە، کەڵکێکی ناودەرکردن، هەرواش هەموو داخوازی و ئاواتەکانی هێزە توندڕەوەکانە کە خۆیان بەدڵسۆزەکانی ئەو ئایدیۆلۆجیایە دادەنێن کە تەکفیری دەکەن، من پێم وایە ئەوان لەروانگەی خۆیانەوە قازانجیان کردوە، ئەو مەسەلەیەی کە گوایا کەسانی موسڵمان و وڵاتانی رۆژهەڵات بەگشتی زەرەردەکەن، ئەوە لای ئەوان وارد نیە، پێم خۆشە مامۆستا بۆمان رون بکاتەوە، لەسەر چ بنچینەیەك حەزدەکەن ئەو تاوانە لەئەستۆی رێکخراوێك لابدەن، کە خۆیان ئەنجامیان داوە؟

**م. محەمەد رەئوف:** نازانم ئەو واتێگەیوە، خۆ ئێمە لەیەك نزیکین، من جاری بەرانەتی قەرارم نەدا بۆ قاعدەو ئەسڵەن هەر ئیمانیشم پێی نیەو ئەوەندە زەرەریان داوە لەهەموو دنیا، مافی ئەوەیان نیە هیچ دیفاعێکیان لێ بکەیت، یانی هەر نەشیکردبێ مادام خۆی ئەکات بەکوێخای مەسەلەکەو خۆی تێوەئەگلێنێ، ئەوە بەسە بۆ تاوانبارکردنی، ئینجا ئەو نەفی ناکات بەشداری نەکردووە، من بۆ نەفی ئەکەم، شتی وا هەر نیە، من باسی عالەمی ئیسلامیم کرد جیامکردەوە لەمەلەفی قاعدەو تالیبان، ئەوە دوو مەسەلەن تێکەڵ ناکرێن، یانی ئەمریکاو ئیعلامی ئەمریکی، یا ئیعلامێك کە لەپشتی ئیعلامی ئەمریکیەوە هەیە، بەتایبەتی ئەو ئیعلامانەی کە حەرەکەی صەهیۆنی ئەیانجولێنێ لەئەمریکاوە.

ئێمە خوێندنەوەیەکی تریشمان بۆئەوە هەیە، بەراستی خوێندنەوەی ئێمە بۆ شارستانی ئەمریکی جیا لەو خوێندنەوانەی تر کە ئەکرێت، ئێمە وائەزانین ئەمریکا بەشارستانیەتی بەتایبەتی بەشی تەکنەلۆجیای، ئابوری ئەو حاڵەتە ئیعلامیەی کە لەدنیادا هێناوێتیەکایە، بەم دەست تێخستنەی حەرەکەی صەهیۆنی لەدنیا بەتایبەتی ئەو دەزگا راگەیاندن و ئابوریانەی کە ئەمریکا ئەجولێنێ و تەسریحاتی غەڵەت غەڵەتیان پێ ئەدات، تەسریحات بەناوی

ئەمریكاوە ئەدەن، ئەوەشمان پێ حەیفە بۆ ئـەمریكا، بۆ شارستانی ئـەمریكی، ئەمە لەبابی موجامەلەو دیپلۆماسیەت نایلێم، هەر بەراستی ئەیلێین ئـەوە هـەموو تەسریحەكان كە ئەوان وتویانە لەبەردەستمایە ئێستا وەختەكەمان رۆیـی كـاتی خوێندنەوەی ئەو شتانەش نیە، من ئەو ئیشارەتەم كرد ئـەڵێم مەلەفەكە تێكـەڵ كرا لەبەینی قاعدەو تالیبان كە خۆیان ئیفتخار ئەكەن بـەو عەمەلیەیـەوە، ئـەوان كردبێتیان یا غەیری ئەوان، ئەو مەلەفە تێكەڵ نـەكرێت كە بڵـێ هـەموو عالـەمی ئیسلامی لەگەڵ تەیاراتی ئیسلامی لەهەموو دنیا كە گـەورەترین تـەیار كـە كـاك مەلابەختیار سەقافەی باشـی لـەو مەجالـە هەیـە، گـەورەترین تـەیار ئـەوەی كـە باوەڕی بەهیچ جۆرە ئیرهابیەك نیە لەدنیا مەلەفی ئەو بۆچی لەگـەڵ ئـەو تێكـەڵ بكرێت.

**PUK TV :** كاك مەلابەختیار تۆ لەسەر قسەكانی مامۆستا ئـەڵێ ئـەو ئیعترافـەی بـن لادن لەوانەیـە دروسـتكردنێك بێـت یـا فیلێكـی ئیعلامـی بێـت دروستكرابێت، بەتایبەتی كە لەكەناڵی جەزیرەش بڵاوكراوەتەوە؟

**مەلابەختیار:** مامۆستا ئەمە ئەڵێ‌و بـەرگریش دەكـات، یانی مامۆسـتا خورمـای دەوێ‌و مێوژیشی دەوێ، لێرەدا با ساغی بكەینەوە..

**م. محەمەد رەئوف:** ئیجازەم بدە، ئـەوە قـسەی مـن نـەبوو، بەراسـتی ئـەو برایـە پرسیاری جولەكەی كرد، وتم ئـەم مەوزوعە ئەگەر بمانەوێ قـسەی لەسـەر بكـەین دەبێ تەصنیفی بكەین، ئەمە قسەی خەڵكە ئەڵێم ئەكرێت شەرت نییە قەناعـەتی مـن وابـێ، مـن واتـەزانم ئەگـەر بـن لادن بـەیانی بـۆی بكـرێ هـەموو ئـەمریكا ئەسووتێنێ.

**مەلابەختیار:** مامۆستا جەنابت كە ئاماژە بەشتێك دەكەیت لەدیالۆگێكی ئـاوادا، بێگومان پەنابردنی جەنابتە بۆ ئەو شـتە، یـان جۆرێكـە لەپاسـاو بـۆ مەسـەلەكە بهێنیتەوە، بەبێ جیهـانبینی خـۆت، ئـەگینا بـۆ مـن نـالێم جولەكـە، خـۆ منـیش زایۆنیزم دەزانم دژی دیموكراتی‌و دژی گەلی فەلەستینەو بەدرێژایی ئەم شۆڕشەی (ی.ن.ك) هەڵوێستی بەرامبەر بەزایۆنیزم هـەبووە، ئێـستاش هەیـەتی، ئێـستاش لایەنگری كێشەی فەلەستینین ئەمە دەڵێین، من بۆ پەنا بۆ ئەو تەفـسیرە نابـەم،

چونکه موتڵەقەن باوەڕم پێی نیەو ناشمەوێ هیچ شتێك بڵێم ئیللا تەفسیرم وایە ئەمە قاعدە، تالیبان، مەلا عومەرو ئوستمە بن لادن ئەم کارەیان کردوەو ئەمە هیچ پاساوێك هەڵناگرێ، پەنا بۆ هیچ شتێکی تر نابەم، لەراستیدا حەزیش دەکەم عەرزی جەنابتی بکەم، دوو سەعات دوای روداوەکە لەمەکتەبی سیاسی کە ئێمە کۆبوینەتەوە، من ئەمە رام بووە، نەك دوو هەفتە، دوو سەعات دوای روداوەکە وتم بێگومانم لەوەی کە ئەمانە هەر لەم جەماعەتە دەوەشێتەوە، ئەمە یەك، دووەم سەبارەت بەئەمریکاو ئەو بابەتە، راستە نە من بەرگری لەئەمریکا دەکەم، خۆ من رەخنەم لەئەمریکا گرت لەسەرەتای قسەکەم، نە تۆش دەتوانی بەناوی هەموو دنیای ئیسلامەوە قسەبکەیت، من ئێستا بەناوی ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی قسەت لەگەڵ دەکەم، نە من وەکیلی هەموو دیموکراتخوازو عەلمانیەکانی دنیام، نە جەنابیشت وەکیلی هەموو ئیسلامیەکانی دنیای، تۆ زاتێکیت منیش زاتێکم. لەراستیدا من هەموو ئەو تەفسیرانەی مامۆستا دەگێڕمەوە بۆ یەك شت، بەراشکاویش دەیڵێم، من تەسەورم وایە هەموو هێزە ئیسلامیەکان بەبێ جیاوازی لەسەرچاوەی ئەندێشەو فەلسەفەو ئایدیۆلۆجیەتیان یەك میتۆدە، بەڵام نەهجیان جیاوازە، نەهجی یەکگرتوو جیاوازە لەگەڵ قاعدە، بەڵام میتۆدی بیرکردنەوەیان یەك میتۆدە، کە ئەویش میتۆدی ئیسلامی سیاسیە، لەوێوە بێگومان جۆرێك لەبەرگری لەیەکتر دەکن، بۆنموونە ئەم دەڵێ شەرع رێگام نادات پەلاماری بدەم، ئەو دەڵێ من نامەوێ بەهۆی ئەوەوە پەلاماری هەموو ئیسلام بدرێ.

PUK TV : پەیوەندی کاك ئاری..

ئەو جەنگەی کە ئەمریکا بەتەمایە بیکات دژی عێراق، ئایا دژی تیرۆرە یان مەبەستی تر لەپشت ئەم جەنگەوەهەیە؟

**م. محەمەد رەئوف:** ئەمریکا ئەهدافی زۆرە لەو مەسەلەیەدا، یانی ئەمریکا وەختێ دەستی داوەتە لێدانی عێراق‌و دەرکردنی لەخلیج‌و هاتنە خلیج، باسی تیرۆر ئەوکاتە هەر نەبووە، ئێستا تیرۆر هاتۆتە سەر مەسەلەکە، لەبەرئەوە رژێمی عێراقی ئیدانەئەکرێت بەوەی کە یارمەتی تیرۆر ئەدات، لەدنیا ئێستا

هەوڵدەدەن وەسائق کۆبکنەوە لەسەرئەوەی کە وا لەبەینی رژێمی عێراقو لەبەینی بن لادندا علاقەیەك هەبووە، یانی شتێکە مەلەفێکە ئەیخەنە سەر مەلەفەکانی تر، ئەمریکا بۆ مەسەلەی لێدانی عێراقو پەلاماری عێراقو تەغیری عێراق لەوانەیە زۆر پێویستی بەمەسەلەی تیرۆریش نەبێ.

PUK TV : پەیوەندی کاك عەبدوڵڵا حسێن..
ئەم کاتەتان باش، هەتائێستا لەکوردستاندا هەموو ئەحزابی ئیسلامی بەهەموویانەوە تاکو ئێستا وەکو پێویست نوسامە بن لادن بەتیرۆریست لەقەڵەم نادەن و زۆرجاریش یەکگرتوی ئیسلامی چەکدارەکانی چیچان بەجەنگاوەر لەقەڵەم دەدەن، زۆرجار لەتەلەفزیۆنی یەکگرتووەوە لەقتەیەکی فەلەستین پیشان دەدەن وەك لەوەی مەسەلەی کورد وەکوئەنفال و کیمیاباران پیشانی خەڵك بدەن؟

**مەلابەختیار:** دیارە هەموو مناقەشەکەمان هەر علاقەی بە یانزەی سێپتەمبەرو گەروەیی یانزەی سێپتەمبەرو سیاسەتی هێزە توندڕەوەکانەوە هەیە، لەراستیدا، دەکرێ دواییش دیسانەوە بێینە سەر بەرەنجامی مەسەلەی یانزەی سێپتەمبەرو ئەمریکا. سەبارەت بەپرسیاری کاك ئاری، ئایا (جندالاسلام) لەدوای روخانی عێراق نابێ بەکێشەیەك بۆ ئێمە، بێگومان جند الاسلام بەم نەهجەی کە ئێستا هەیەتی، بەم کینەیەی کە ئێستا هەڵیگرتووە، ئێستاو لەکاتی لێدانی عێراقو لەدوای ئەوەش دەبێ بەگرفتێکی گەورە، لەبەرئەوە دەبێ ئەو دومەڵە نەمێنێ. سەبارەت بەقسەکانی مامرستا محەمەد رەئوف کە ئایا هێزێکی توندڕەوی ئیسلامی دەبینی بەرگری لەوان بکات، هەروەکو من بەرگری لەوان ناکەم، دیسان دەیڵێمەوە: میتۆدەکەیان یەك میتۆدە، نەهجیان جیاوازە، بەڵێ هێزی توندڕەویش دەبینم بەرگری لەیەکگرتوو دەکات، جند الاسلام کە دادەمەزرێ بەیانی دامەزراندنی هەڕەشەیە لەهێزە عەلمانیو دیموکراتیەکانو لەناوبردنیان، بەڵام بچوکترین رەخنەی لەیەکگرتوی ئیسلامی نیەو ئێستاش کە ئێمە خێڵی حەمەو هەموو کارەساتەکانمان بەسەرهاتووەو ئێستاش کێشەیەکی گەورەیە رۆژانە پەنجا تۆپ بەئێمەوەدەنێت، بەڵام ئەمان رۆژانە پەنجا جار بەلایاندا بڕۆنو هاتوچۆ بکەن زۆر ئاساییە، ئێ ئەمە جیاوازی ئێمەو ئەوانە، لەگەڵ ئەوەشدا

هەڵوێستی یەکگرتوی ئیسلامی لەروی سیاسیەوە رونترە لەهەڵوێستی بزوتنەوەی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی، بەڵام ئەوان بەبەراورد لەگەڵ ئێمە، بێگومان ئەوان لەلای جندالاسلام هێشتا دوو هێزن توانیویانە بەیەکەوە هەڵبکەن، بۆ ئەوان لەگەڵ ئێمەو لەگەڵ ئەوان هەڵناکەین؟ چونکە نەهجمان زۆر جیاوازە لەگەڵ یەکتری، بەرنامەشمان زۆر جیاوازە لەگەڵ یەکتری.

سەبارەت بەهێزە عەلمانیەکان هەیە تیایدا ئیلحادە، هەر هێزێك من نازانم هێزی عەلمانیم نەدیوە ملحد بێ، بەڵام هەر هێزێك عەلمانی بێ و ملحد بێ لادانە لەعەلمانیەت، عەلمانیەت ئیلحاد نیە، عەلمانیەت دوو شتە هیچ پەیوەندی بەئیلحادەوە نیە، تەفسیرێکی خراپی سەلەفیەکان و کۆنەپەرستەکانە بۆ عەلمانیەت بەئیلحادی دەبەستنەوە، عەلمانیەت پێش ئەوەی دین و دەسەڵات جیابکەیتەوە، ئازادی ئەقڵە، ئەقڵ ئازادکردن و ئەقڵانیەت چەسپاندنە، ئینجا دین و دەوڵەت لەیەك جیاکردنەوەیە، هیچ دەوڵەتێکی دنیا نیە عەلمانی بێت ملحد بێت.

PUK TV : واتە کێشەی یەکێتیی لەگەڵ هێزە ئیسلامیەکان بریتیە لەوەی کە ئەو گۆڕانکاریانەی کە دێنەپێش چۆن بۆ قەزیەی کورد ئیستسمار بکرێنەوە لەبەرژەوەندی قەزیەی کورد؟

**مەلابەختیار:** بێگومان روداوی یانزەوی سێپتەمبەر دنیا هەمووی دەگۆڕێ، خۆت قسەیەکی باشت کرد لەپێشەکیەکەدا، وەرچەرخانێکی گەورە لەسیاسەتی نێونەتەوەیی و ناوچەییەوە بۆ ئێرە، ئەم سیاسەتی نێونەتەوەییە مەودای خۆی هەیە، مەودای سیاسی هەیە، مەودای ئابوری، مەودای کۆمەڵایەتی، مەودای میدیایی، بەش بەحاڵێ ئێمە چیمان دەوێ؟ دەمانەوێ مافی چارەنوسی خۆمان جێبەجێ بکەین، مافی چارەنوسی ئێستامان فیدراڵە لەچوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتی پەرلەمانیدا، ئایا جیهانگیری و ئەو گۆڕانکاریانەی لەدوای یانزەی سێپتەمبەر دێنەدی چی دەکەن؟ ئەمە بۆ ئێمە دابین دەکات یا دابین ناکات؟ یا فەزایەك دەخوڵقێ بتوانین ئەم چارەنوسەی خۆمان بەدی بهێنین یا نا؟ بەتەسەوری من، ئەو فەزایەی کە دوای یانزەی سێپتەمبەر لەدنیای رۆژهەڵات و

لەوڵاتانی ئیقلیمی خەریکە وردە وردە دێتەبەرەوە، بەتەسەوری مـن چارەسـەری دیموکراسی تیایە، دەوڵەتی عـەلمانی تیایـە، مەدەنیـەتی تیایە، ئـازادی بـازاڕی ئازادی تیایە، سەربەستی ژنی تیایەو مەسـەلەی چارەنوس دیـاریکردنی خۆمـان بەدەستی خۆمـانی تیایـە، ئـەو بابەتـە، ئـاخۆ کۆبونـەوەی پەرلـەمانی ئـەورووپی گـرنگترین بڕیارەکـان لەمێـژوودا لـەئاخر کۆبونـــەوەدا لەپەرلـەمانی ئـەورووپی پـشتیوانیەکی تـەواوی دەسـەڵاتی کوردسـتانی دەکـات، پـشتیوانی ئەزمونـە دیموکراتیەکە دەکات، پشتیوانی مەدەنیەتەکەی دەکـاتو یانتزەی سێپتەمبەر، روداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر لەوە گەشـتون کێـشە سیاسـیەکانی نەتـەوەکانی وەکو ئێمەو تەنگوچەڵەمە دواکەوتوەکانی کۆمەڵەکانی وەکو ئێمە، دەبێ بـەرەو چارەسـەرکردن بـڕوات، بـەش بـەحاڵی خۆمـان بەشـێکی گرنگـی ئـەم شـتانە بەئیجابیەت دەزانین دوای سلبیاتەکەش ناکـەوین، ئینجا کارلێـك دەکـات لەگـەڵ پێشهاتەکانی ئێمە.

PUK TV : پەیوەندی کاك بەهرۆزی حاجی سابیر..

بەخێرهاتنی میوانەکان دەکەم، پرسیارەکەم بۆ کـاك مەلابـەختیارە، شەڕی ئێستای ئەمریکا لەگەڵ عێراقدا، من تەسـەوری دەکـەم شـەڕی نـەوت بێ نەك شـەڕی ئوسـامە، لەبەرئـەوەی بۆچـونی ئێمـە وایـە کـە وەختـی خـۆی وتـی لەئەفغانستان دەدەین، خۆتان دەزانن ئێستا ئوسـامەو مەلاعومـەر لەسنورەکان دەسوڕێنەوە، بەڵام ئەگەر عێراقیش لێی بدرێ (سـەدام حـسێن) لەوانەیـە وەکـو ئوسامەو مەلاعومەر بسوڕێتەوە، ئەم شەڕەش بەشەڕی نەوت دەزانم؟

**م. محەمەد رەئوف:** وەکو تێبینیەکی جوانە، جێگـەی خۆیـەتی ئەگـەر لەقـەتاتی ئەنفالو ئەوانەی تیابێ، شتێکی باشە، بـەس ئێمـە لـەوەی کـە لەقتـەی کێشەی گەلی فەلەستینی تیایە لێـی پەشـیمان نـینو بەشـتێکی باشـی دەزانـین، وائـەزانم میللەتی کوردیش لەرۆژی یەکەمەوە تائێستا پشتگیری لەو کێشە زینـدوەی ئـەو خەڵکەو میللەتـە داماوە کـردووە، عـەیبی نیـە، ئێمـەش وەك هێزێکـی ئیـسلامی لەپـەیڕەوو پرۆگرامی خۆشمانـدا تەسـبیتمان کـردووە، ئیعلامـیش بـێ، ئێمـە پـشتگیری لەکێـشەی هـەر خـەڵکێکی هـەژار ئەکـەین ئەگـەر موسـڵمان بـێ

لەدەرەجەی یەکەم، ئەگەر موسڵمانیش نەبێ، هەرکەسێ بێ، مەزڵوم بێ، دیفاعی لێئەکەین، ئەوەش وەکو رەمزی هاوسۆزی لەگەڵ کێشەی خەڵکی فەلەستینا.

بەنیسبەت ئەوەوە کە ئێمە دژ بەئوسامە بن لادن قسەمان نەکردووە، ئەوە بیرکردنەوەی ئەوە تیرۆریست چییە، کەسێکە بیرکردنەوەیەکی ئیرهابیانەی ببێ باوەڕی بەوەبێ بەهێزو بەچەکو بەوە کێشەکانی یەکلایی بکاتەوە، زمانێکی تری پێنیە، مەنتقەن هەر لەئەوەڵەوە بەمن ناخواو من بەو ناخۆم، ئێمە بەپێویستمان نەزانیوە هەمووڕۆژێ لەسەر تەلەفزیۆن‌و لەئیسلام، چونکە مەشاکلی تر بۆ ئێمە ئەخولقێنێ، کە ئەوەش بەچارەسەر نازانین، ئێستا ئێمە بۆچی لەگەڵ (انصارالاسلام)و (جندالاسلام)و ئەوانە نەمانگەیاندۆتە بنبەست لەگەڵیاندا، ئێمە هەتاوەکو ئەم فەترانەی ئاخریش هەرچی هەوڵێك توانیبێتمان ئەوان هێورکاتەوە، وەزعەکە هێوریکاتەوە، ئەو کێشە ئاڵۆزتر نەبێت، ئێمە بووین لەو بەینەدا بەمشاوەرەی بەڕێز (مام جەلال)و بەپرسی ئەو، یەکەم وەخت چوە بۆ لای ئەوکاتەی (جندالاسلام) بووە یەکەم وەفد چوە بۆ لایان لەکۆبونەوەی تەواوی حزبە کوردستانیەکانی ئێرە بوو، کە من بەشداریم تیاکرد لەسەر راوێژی هەمووڵایەك، بەپرسی بەڕێز (مام جەلال) هەتا کە رۆشتم لەوێ بەوانیشم وت، وتم ئێستا من لای مام جەلالەوە هاتووم، قسەی ئەویش نەقڵ ئەکەم، هی هەموو ئەحزابی کوردستانیش کە ئێوە لێرە ئەگەر بمێنن، بەم بیرکردنەوەیە، بەم تەسەروفەوە، بەم سلوکەوە، ئیحتماڵە پێش یانزەی سێپتەمبەر ئێوە توانیبێتتان خەتەرێك دورست بکەن بۆ ناوچەکە، بەڵام دوای یانزەی سێپتەمبەر ئێوەش زەرەرئەکەن‌و هەرکەسێکیش لەپشتی ئێوەوە بێ. من ئەم دەقەم نەقڵ کردووە، پێش ئەوەی بڕۆم وتم (مام جەلال) کردی بەسوعبەت، وتی: بەعزێ ئایەت‌و حەدیسیش لەبەرکەی باشە پێت بێ، وتم لەوەیان مەترسە، بەس من ئەم جوملەیەم پێیە بۆئەوان، ئەو دەقەشم نەقڵ کردوە بۆ ئەوان.

PUK TV : کاك مەلابەختیار، بەنیسبەت پرسیارەکەی کاك بەهرۆز، کاك بەهرۆز پێی وایە شەڕی ئێستای ئەمریکا دژی عێراق شەڕێکە بۆ نەوت نەك دژی تیرۆرو ئیرهاب؟

**مەلابەختیار:** ئێستا عێراق ئامادەیە نەك نەوتەكەی هەموو عێراق بكاتە تاپۆ لەسەر ئەمریكا، بەس ئەمریكا شەڕی نەكات، خۆ نەوتەكە مسۆگەرە بۆ ئەمریكا كەی عێراق وتویەتی نەوت نادەم بەئەمریكا؟ كەی دەوڵەتانی كەنداو دەڵێن ئێمە نەوت نادەین بەئەمریكا؟ چ دەوڵەتێك هەیە لەدنیادا نەوت نەفرۆشێ، نەوت نەدات بەئەمریكا؟ ئەم بابەتە تەحلیلێكە لەسەر بنچینەی كۆنی سیاسەت، ئەو سیاسەتە نەماوە كە نەوت هەمووشتێك بێت لەدنیادا، ئێستا وڵات هەیە لەدنیادا یەك دڵۆپە نەوتی نیە، ئەمریكا بەرژەوەندی لەو وڵاتە زۆر زۆرترە لەسعودیە، ئەمە یەك، دوو، تێبینی ترم هەیە حەزدەكەم قسەی لەسەر بكەم لەسەر مەسەلەی ئەنفالو تەلەفزیۆنەكە، بەش بەحاڵی خۆم لەراستیدا تێبینیم كرد مامۆستا بەجۆرێ وەڵامی دایەوە، كە هەقە رونكردنەوەیەك بدەی، ئەنفال ساڵی ١٩٨٨ رویداوە، كارەساتێكی تراژیدی یەكجار گەورەیە، یانی سیانزە بۆ چواردە ساڵ پێش قەزیەی فەلەستین، راپەڕینی دووەمی فەلەستین رویداوە، جەنابی دەڵێ تێبینیەكی جوانە هەقە كێشەی ئەنفالیش پیشان بدرێ، ئێ باشە تۆ كێشەی فەلەستین بۆ بەو جۆرە زەقە پیشانم دەدەی، كێشەی ئەنفال لەكاتێكدا دیكۆمێنتت هەیە، لەكاتی خۆیدا بەقەد ئەوە پێشانی نادەی، مەسەلەكە ئەوەیە لەفەلەستینا حەماسو جهاد هەیە هەمان مەنهەجو نەهجەكەیە كە باسمان كرد، سۆزی تۆ لەگەڵ ئەو مەسەلە ئیسلامییە زۆر زیاترە وەكو مەسەلە نەتەوەییەكە لەكوردستاندا، كە كوردستانو خۆشت كوردیتو لەكوردستاندا هێزێكی سیاسی ئیسلامیت، بۆ ئەمە تێبینیەكی باشە هەقە ئەمیش هەبێ، ئەمە دەبێ لەهەقە هەقتر بێ، سەبارە ت بەخۆت، نەك ئەو واجب بێ لەهەقا، ئەمیش هەبێو واجب بێ، ئەبێ ئەنفالەكە واجب بێ، ئەویش لەپاڵیا جارجار باس بكرێ هەقی خۆیەتی، پشتیوانی بكەی، من نەموتووە نابێ پشتیوانی بكەی هەتا ماڵ وەستابێ مزگەوت حەرامە، ئەوە قسەیەكی زۆر گرنگە.

PUK TV : پەیوەندی كاك ئارامی حەمەی مینا..

شەوتان باش، من رونكردنەوەیەكو دوو پرسیارم هەیە، وەكو دەزانن لەرابردوودا چەندجارێك هەڵی زێڕینو لەبەر لەئەنجامی كارەساتە گەورەكانی دنیا

هاتۆتەپێش بۆ گەلەکەمان بەداخەوە لەئەنجامی پەرتەوازەیی خیتابی سیاسی کوردیدا گەلەکەمان نەیتوانیوە وەکو پێویست سودی لێوەربگرێ، یانزەی سێپتەمبەریش یەکێکە لەو هەلە دەگمەنانەی کە دەکرێ گەلەکەمان بەخەونە مێژوویی و گەورەکانیشدا بگات، بەداخەوە پێدەچێ ئەمەش وەکو پێویست ئیستسمار نەکرێ بەتایبەتی لەلایەن حزبە ئیسلامیەکانەوە. پرسیارەکەم ئەوەیە ئایا یەککگرتوو لەئاست ئەو گۆڕانکاریانەدا چ هەڵوێستێکی هەیە، بەتایبەت لەبەرامبەر گۆڕینی رژێم لەعێراقدا؟ من نازانم یەککگرتوو ئەو پاکانەیەی کە دەیکات، بۆ رێکخراوی عاقدە لەپای چییە؟

م. **محەمەد رەئوف:** لەمەسەلەی ئەنفالدا، ئێمە هەموو ساڵێ لەیادی ئەنفالی گەرمیان و دۆڵی بالیسانیشدا لەتەلەفزیۆن و لەجەریدەی خۆشمان یادی ئەکەینەوەو بەجدیش باسمان کردووە، ئێستاش رێکخراوێکی تازەمان دروستکردوە بابەگورگورِ هەر بۆ گرنگیدان بەو مەسەلانە، مەسەلەی کەرکوک و مەسەلەی ئەنفال و ئەو شتانەی تریش، بەلام فەلەستین ئەسڵەن هەستمان بەتەقصیرکردوە لەبەرامبەر فەلەستین لەقتەیەك لەتەلەفزیۆن ئاوا گەورەبکرێ، بەنیسبەت هەڵوێستی ئێمە لەبەرامبەر گۆڕینی رژێم، ئێمە لەهەموو کۆبونەوەیەکی مەکتەبی سیاسی هەردوو ئەو حزبە دەسەلاتدارەی کوردستان هەموو حزبەکانی ترو ئالیەتی ئەو پێنج حزبەی کە لەناویا هەین تەئکیدمان کردۆتەوە با کورد یەك خیتابی سیاسی هەبێت، یەك هەڵوێستی عەمەلیشی هەبێ، ئێمەش یەکێکین لەو هێزانە هەر پشکێك، هەر هەڵوێستێك، شتێکمان بەرکەوێ ئامادەین.

## دیدارێك لەمەڕ
## راپرسی دەستوور و هەڵوێستی یەكگرتوو [+]

**خاك:** سەرەتا بەخێربێیت، لەمێژووی مرۆڤایەتیدا كۆمەڵێك هێزو كۆمەڵێك گوڕ هەن، كە دەتوانن ببنە بزوێنەری دیموكراسی، ئەوان دەتوانن ببنە هێنانەدی دیموكراسی، ئاخۆ ئەو هێزە بزوێنەرانە چین، ئاخۆ ئەو پاڵنەرە سەرەكیو گرنگانە چین لەسەرجەم مێژووی مرۆڤایەتیدا، لەسەرجەم مێژووی فكردا، دەتوانن ببنە بزوێنەری دیموكراسیو سەپێنەری دیموكراسی لەكۆمەڵی مرۆڤایەتیدا؟

**مەلابەختیار:** زۆر سوپاس، من چونەناو بابەتەكەم زۆر پێخۆشە، چونكە بەراستی وەكو جەنابت وتت پروپاگەندەی سیاسیو خۆجوانكردن ئارایشتكردن لەباری سیاسیەوە، لەكاتی هەڵبژاردن، شتێكە ئاشكرایە لەهەموو دنیادا هەیە، با لەم كاتەدا ئێمە لایەنێكی تریش بگرین، ئەویش ئەوەیە هەموو ئەم پروپاگەندانەی كە ئەكرێن، هەرهەمووشی باسی دیموكراسی ئەكات، هەرهەمووشی باسی مەدەنیەت ئەكات، هەمووشی باسی ئازادی ئەكات، ئاخۆ لەپشت ئەم پروپاگەندانە كامیان راستگۆنو كامیشیان ئەیانەوێ خەڵك فریو بدەن، وەكو لەچەپو راستەوە هەرهەمووی كە باسی دیموكراسیو ئازادیو مەدەنیو كرانەوەو مافی مرۆڤو ئەمانە ئەكات، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە، بەراستی ئەم چەمكانە سەركەوتنیان لەكۆی رای گشتی دنیادا بەدیهێناوەو ئەو رێبازانە خەریكە لەرۆژئاواوە دێن بۆ رۆژهەڵات، مەبەستیشمە بڵێم: لەرۆژئاواوە دێنە

---

[+] دیدارێك لەگەڵ تەلەفزیۆنی خاك، ٢٠٠٥.

ڕۆژهەڵات، یانی ئەم چەمکانە، ئەم تیۆرانە، ئـەم فەلـسەفانە، ئـەم سیـستەمانە، ئەم ئەزمونانە، ئـەزمونی لـەدایکبووی ژیـانی ڕۆژئـاوان، فەیلەسـوفەکانیان لـەوێ بـوون، شۆڕشـەکانیان لـەوێ بـوون، تاقیکردنـەوەکانیان لـەوێ بـوون، ئایدیۆلۆژیەتەکانیان لەوێ بوون، هەروەکو چۆن شۆڕشە گەورەکانی پیشەسازی، داهێنانە گەورەکانی فیزیك، کیمیـاو تەندروسـتی فەلـەك، جوگرافیـاو هەندەسـە، ئەمانـەو هـەتا ئەگاتـە ئـەوەی کـە ئێـستا ئـەتۆم، لیـزەرو دەسـتکەوتە هەرەگەورەکانی دۆزراو لـەدنیادا، ئێستا مـوڵکی ئـەوروپان، هـەر بەوشـێوەیەش فەلسەفە جوانەکانی دیموکراسیو مەسەلەی مافی مرۆڤو ئەو مەسەلانە، هەمووی لەدایکبوی ئەوروپان، لەوێدا تاقیکراونەتەوە، دوو سەدەیەکە لـەوێ سـەرکەوتنی بەدەستهێناوەو خەریکە شەپۆلەکانی لـەوڵاتی ئێمـەش ئـەیبنین، کەواتـە هـامو ئەوانەی قسە لەدیموکراسـی، ئێستا ئەکـەن، چ ئێمـە وەکـو لیـستی هاوپـەیمانی کوردستان، چ دەرەوەی لیستی هاوپـەیمانی کوردسـتانو تەنانـەت ئەوانـەی کـە ڕێبازی دینـی، مەزهەبیـشیان هەیـە، کـە قـسە لەدیموکراسـی ئەکـەن، بمانـاوێو نەمانەوێ، ئەم چەمکانە کە هی خۆیان نیە، قسە لەفەلسەفەیەك دەکەن کـە هـی خۆیان نیـە، دیموکراسـی سـەرکەوتنەکەی لەوێدایـە، لەدایکبوونەکـەی لەوێدایـە، پێشگەیـشتنەکەی لەوێدایـە، پەروەردەکـەی لەوێدایـەو مامەڵەکەشـی لەگـەڵ دەسەڵاتو مەسەلە دنیاییەکان لەوێ ئاشـکرایە، یـانی شـتێکی شـاراوە نیـە ئـەو بابەتانە لەڕۆژئاوا وەکو کلیلی مێژوو دۆزرایەوە، ئەویش ئەوەیـە مێژوویـەك هەیـە لەئەوروپا، کە پێی دەڵـێن مێـژووی سـەرکەوتنی شۆڕشـی پیـشەسازی، مێـژووی سـەرکەوتنی دیموکراسـی، مێـژووی فەلـسەفەی ئـەقڵانی، مێـژووی عەلمانیـەتو مەدەنیـەت، مێـژووی دەسـتکەوتە جوانـەکانی دنیـاو چۆنیەتی چارەسـەرکردنی کێشەکانی دنیـایی، یـانی گەڕانـەوەی هێـزە بـۆ ئـەقڵ، گەڕانـەوەی ئەقڵـە بـۆ ئەقڵانیەتو ئیتر ئەقڵانیەت تەحەکوم کردنە لەسەر ڕوداوەکانو کێشەکانی ژیان، ئەمە مەسەلەیەکی یەکجار گرنگە، بۆ ئەڵێین گەڕانەوەی هێزە بـۆ ئـەقڵ، گەڕانـەوەی ئەقڵانیەتـە بـۆ ئـەقڵو ئەحکامـەکانی ئـەقڵ لـەژیانا کـۆنترۆڵی ژیـان ئـەکات، بـۆ وا دەڵـێین، چـونکە لەوەوبـەر ئـەقڵ گـەڕابوەوە بـۆ میتافیزیکیـا، گەڕابۆوە بۆ ئەودیوی سروشت، لەوێدا مەنتق نەمابوو، لەوێدا هەموو مەسـەلەکان لەدنیایـەکی خـەیاڵو لەدنیایـەکی ئایدیالیـستیا، لەدنیایـەکی میـسالیدا، خـۆی دۆزیوەتـەوەو ئەمـە کـەم نـەبووە، تەمـەنی دنیـای گەڕاندۆتـەوە بۆئـەودیوی سروشت، تەمەنی بەتاڵکردنەوەی ئەقڵ لەئەحکامەکانی ئـەقڵی دنیـایی، ئەمـەش زیاتر لەهەزارو پێنج سەد ساڵی خایاندووە، پـێش ئـەوەی ڕێنـسانس، سـەردەمی

ئەمزە لەوڵاتانی ئەوروپا پرشنگ بداتو وردەوردە ئیتر ڕێنسانس ببێ بەهەوێنی مەینی فەلسەفەکان، هونەرەجوانەکانو شتە دنیاییەکانو سەرەنجام، ئەو هەموو فەلسەفەیە، ئەو هەموو ئەقڵە، ئەو هەموو بیرە، ئەو هەموو زانستە، ئەو هەموو زانیارییە، وردەوردە لەدوای ڕێنسانس چاکسازی ئایینی، ریفۆرمی ئایینی دێتەپێشەوە، بزانە هەنگاوەکان چۆنە، ڕێنسانس ئەرکی مێژوویی گۆڕانکاری دێنێتەدیو زەمینەی خۆی ئەخوڵقێنێ، ژینگەی خۆی دروست دەکات، ئەم ژینگەیەی کە دروستی دەکات، ئەم ژینگەیە کار لەچی دەکات؟ یەکەم کار لەکۆمەڵ دەکات، کۆمەڵ کۆدەکاتەوە لەدەوری فەلسەفەیەکی تر، فلتەرێکی تر لەژیانا بۆ ئەقڵ دروست ئەبێ، ئەم ژینگە کۆمەلایەتیەی کە لەرێنسانسدا دروست ئەبێ، ناتوانێ بێ هەڵوێست بێ بەرامبەر بەژینگەکەی پێش خۆی، کاریگەریەکانی پێش خۆی، هەژمونگەریەکانی پیش خۆی، کە هەژمونگەری دەسەڵاتی مەسیحی بووە، کە ناتوانێ بێهەڵوێست بێ بەرامبەر دەسەڵاتی مەسیحی، کەواتە لێرە ناکۆکیەکی بنچینەیی، ئەقڵانی، دنیاییو یەکالاکەرەوە لەنێوان ڕێنسانسو شتە جوانەکانی کە ڕێنسانس کانگای لەدایکبونیان بووە دروست ئەبێ دژی بەرهەمە خەیاڵاویەکانی هەزارو پێنج سەد ساڵی پێش ئەوە کە دین تیایا کاریگەر بووە، دەسەڵاتی ڕۆحی کاریگەر بووە، کورتیەکەی با لێرەدا ئەوندە بڵێم: کە لەسەردەمی رینیسانسەوە تێپەڕینێك لەرابوردوەوە بۆ ئایندە هەیە لەمێژودا، ئەویش تێپەڕاندنی ئاراستە ئەقڵیەکانە لەخەیاڵی میتافیزیکیا، هێزێکی کۆمەلایەتیو تەوژمێکی فەلسەفیش کە لەرابوردوەوە بۆ ئایندە تێدەپەڕێو ئەیەوێ هەموو کاریگەریەکانی سەدان ساڵی رابردوو لابەرێ. لێرەدا بەحوکمی ڕۆژگار لەبەردەم شتێك ئەوەستی ئەویش ئەوەیە چی لەو کاریگەریەی رابردوو ئەکەی؟ وەکو خۆی ئەیهێڵیتەوە؟ فەرامۆشی ئەکەی؟ وازی لێئەهێنی؟ هەقت بەسەریەوە نیە؟ بتەوێو نەتەوێ ناتوانی وابکەی، لێرە قۆناغی دووەمی دوای ڕێنسانس بەریفۆرمی ئاینی دێتەپێشەوە، ریفۆرمی ئاینی یانی داماڵینی ئاینە لەهەموو ئەو قۆرخکردنەی کە چینە خاوەن دەسەڵاتەکان، چینە حوکمڕانەکان هاتوون بەناوی ئاینەوە سواری کۆڵی خەڵك بوون، سواری ئەقڵی خەڵك بوونو کۆنترۆڵی ئەقڵی خەڵکیان کردووە، تەنانەت وایان لێکردووە کە ئەسڵەن لەماڵی خۆشیا نەوێرێ قسەبکات، تەنانەت کلیلی بەهەشتیشیان بەپارە داوەتێ، چاکسازی ئایینی هات وتی: ئەمە ئاین نیەو ئێوە ئاین ئیستغلال دەکەن بۆ دەسەڵات، لێرەوە لەدوای ئاشوبێکی گەورە، لەدوای ململانێیەکی گەورە، لەدوای مەنجەنیق داخستن بۆ ئەقڵ، کوشتنی ئەقڵ،

خنکاندنی ئەقڵ، تاساندنی ئەقڵ لەلایەن ئەو دەسەڵاتەی کە نەدەکرا، وا بەئاسیائی تەختی حوکمی دەسەڵاتی رابردووی ئایینی واز لێبهێنێ، دوای ئەوەی کە پێنج ملیۆن ئینسان ئەبێ بەقوربانی ئەم ململانێیە، ئەوکاتە چاکسازی ئایینی ئەتوانێ پەیامەکانی خۆی بەدیبهێنێو لەدوای چاکسازی ئایینی، وردەوردە زەمینەیە خۆش دەکات بۆ رۆشنگەری، رۆشنگەری یانی سەردەمی (تەنویر) لەئەوروپا، سەردەمی سەرهەڵدانی کەڵـە فەیلەسوفەکانی ئەقڵو مەعریفە لەدنیادا، بۆئەوەی کە بەتەواوەتی دنیا بۆ شۆڕشێك ئامادە بکات کە پێی ئەڵێن شۆڕشی پیشەسازیو سەرەنجامەکەی گەیشتە شۆڕشی دیموکراسیو شۆڕشی دیموکراسیش، ئاشکرایە کە دەسەڵاتی کەنیسەو دەسەڵاتی دەرەبەگایەتیو هەموو هەژمونەکانیان لەناوئەباتو فەلسەفەیەك دێتەپێشەوە کە ئەویش پێی ئەڵێن فەلسەفەی (وضعي- دانراو)، یانی ئەو فەلسەفانەی لەجیهانبینی دنیاییەوە ژیان ئەبات بەڕێوەو ئینجا کۆی هەموو شتەکان، لەدەوری ئەم ژیانە دنیاییەی دێتەپێشەوە، دەسەڵاتەکەی ئەبێ بەدەسەڵاتی دنیایی، ئەقڵەکە ئەبێ بەئەقڵی دنیاییو ئینجا زانکۆکان ئەبن بەزانکۆی دنیایی، کانگاکانی مەعریفەو ئەندێشەو بەرهەمی فەیلەسوف، ئیدارە، ئابوری، بەرهەمی تواناکانی تر هەمووی ئەبن بەبەرهەمی دنیاییو ئەوکاتە ئیتر تێپەڕبونێکی گەورە لەمێژوودا دروست دەبێ، ئەویش تێپەڕین لەرابردووەوە بۆ ئێستا، ئەو ئێستایەی کە کۆی گشتی هەموو ئەو ئاڵوگۆڕانە پێی دەڵێن مۆدێرنێتەو تائێستاش مۆدێرنێتە ئەوروپای گرتۆتەوە، ئەوەتا خەریکە ئەگاتە ئێمەش، ئەمە راستی دیموکراتییە، کەس ناتوانێ نکۆڵی لەمە بکات، من خوڵقێنەری دیموکراتی نیم، جەنابی مام جەلال خوڵقێنەری دیموکراتی نیە، جەنابی کاك مەسعود بارزانی خوڵقێنەری دیموکراتی نیە، حزبەکانی پێش ئێمەش لەرۆژهەڵاتدا خوڵقێنەری دیموکراتی نەبوون لەناو ئێمەدا، لەناو ئێران، لەدەوروبەرماندا، لەوڵاتانی عەرەبیدا لەوەی کە پێی دەڵێن رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە، هەتا لەژاپۆندا، هەتا لەباشوری رۆژهەڵاتی ئاسیادا، لەئەمریکای لاتنیدا، خوڵقێنەری دیموکراتی نین، دیموکراتی زایگایەکی هەیە، ئاشکرایە کوێیەو ئاشکرایشە هەموومان چۆنی لێوەردەگرین، جا ئەمە راستییەکە کەس ناتوانێ لەم راستیە نکۆڵی بکات، جا وردەکاریەکەی چۆنە بۆ وڵاتی ئێمە، با بێینە ناو وڵاتی ئێمە.

**خاك:** پرسیارەکەم لەوێوە دەستپێدەکات چ هێزێکی رادیکاڵ، یاخود هێزی موحافیزکار، ئەتوانێ ئەو چەمکانە لەخۆرئاواوە بهێنێو لە کوردەواریدا بیکات

بـەو چـەمکە باوانـەی کـە بتوانـێ خـەڵکی لەسـەر رابهێنـێ، کـێ ئـەتوانێ ببـێ بەخاوەنی پرەنسیپەکانی دیموکراسی؟

**مەلابەختیار:** موحافیزکار جێی هەیە، یانی بەتەواوەتی ماوەیەکی زۆر جێی پـێ لێـژنابێ لەژیانـدا، بـەڵام ئـەوەی کـە دەتوانـێ پێـشەنگ بـێ، بێگومـان رادیکاڵەکانن، ئەوانەن کە هێزێکن نوێنەرەوەی هێـزی بەرهـەمهێنانی نـوێن، ئـەو هێزەی کە تەجاوزی هێزەکانی بەرهەمهێنانی رابـردوو دەکـەن، هێزەکـانی ئـەقڵ بەرهـەمهێنانی رابـردوو جـێدێڵن. هێزەکـانی کاریگـەر کـە چـەقیان لـەرابردوودا بەستووە، ئەو هێزانەن مۆدێرنێتەن کە دەتوانن تەجاوزی رابوردوو بکەن، نـاکرێ هێزێك خۆی لەهەناوی روداوەکاندا نـەبێ، هـەڵقوڵاوی پێویستیەکانی ئـەم هێـزە بەرهەمهێنە نوێیە نەبێ بۆ ژیان، بۆ فەلسەفە، بۆ جیهانبینی، بـۆ ئایدیۆلۆژیـەت، بۆ مەنتق، بۆ ئەقڵو بۆ زانست، بۆ هەموو ئەو مەسەلە جوانانـەی ژیـان، ناکرێـت هێزێك خۆی بەتەواوەتی لەناو ئەم پێداویستیانە هەڵنـەقولابێ، کـە هـەڵگری ئـەم شتە جوانانە نەبێو نوێنەرەوەیان نەبێو پێشەنگی هێـزی کۆمەڵایـەتیان نـەبێ، ناکرێ هێزێك وانـەبێ، بتوانـێ مۆدێرنێتـە بـەدیبهێنێ، هێـزی کۆمەڵایـەتیش ئـەو هێزەیـــە کـــە لەپەیوەنـــدی بەبەرهەمهێنــــەرەکانی نوێــوە دروســت دەبــێ، لەبازرگانیەوە دروست دەبـێ، دوایـی بـۆ دونیـای پیـشەسازی، دوایـی بـۆ چینـی ناوەڕاســت لـــەناویانا دروســت دەبــێ، ئەمانــە هـــەمووی تێپـــەڕێنن لـــەهێزی بەرهەمهێنـــەری دەرەبەگایـــەتیو کـــەلتوری دەرەبەگایـــەتی، لـــە فەلـــسەفەی میتافیزیکی دەرەبگایەتی، بۆ سەپاندنی مەزهەب لەسـەردەمی دەرەبەگایەتیـدا، بۆ ئەو کونوکەلەبەرانەی مەزهەب دروستی دەکات تیایدا، کۆمـەڵ تیایـدا بـەنگ دەکات، ئەقڵ تیایـدا بـەنگ دەکـات، ئینسانی تیـادا بـەنگ دەکـاتو سـەرەنجام هەموو ئەقڵەکان لەدەوری یەك فەلسەفە، یا یەك ئایدیۆلۆژیای توتالیتاری ئیفلیج دەکات، کە جگە لەروانگەی خۆی روانگەی تـر ناخوێنێتـەوە، ئەمانـەی تـر شـتی ترن دنیای دیموکراسیو دنیای پیشەسازیو دنیای کۆمەڵایەتیـە تازەکـان، ئەمـە شتێکی ترن لەناو ئەم دنیایە هێزی تازە دروست دەبێ، ئەم هێزە تازەیە هێزێکە پەیامی هەیە، فەلسەفەی هەیە، هێزێکە بەرنامەی لایەنی کەمو بەرنامەی لایـەنی دووری هەیە، هێزێکە دەچێتە ژێـر بـاری بەرپرسـیارێتیەکی مێـژوویی گـەورەوەو دەکەوێتـە شـەڕ لەگـەڵ رابـردوو، دەکەوێتـە شـەڕی سـەربازی، کۆمەڵایـەتی،

کەلتوری، پیشەسازی، ئابوری، هونەریو ئەدەبی، دەکەوێتە شەڕی ئەقڵانی هەتا شەڕی سایکۆلۆژی، شەڕی ماڵ، شەڕی تاك، شەڕی ژن، شەڕی منداڵ شەڕی پەروەردە. ئەمە پەیامێکی زۆر زۆر گەورەی مێژووییە کە تەنیا ئەو هێزانەی لەناو ئەو ڕێڕەوە لەدایك دەبن تەنها ئەمانە دەتوانن نوێنەری ڕاستگۆی ئەم کارە بن، ئەوانی تر کە دەیانەوێ ڕابردوو ئارایشت بکەنو بەنوێ بیفرۆشنەوە بەخەڵك، ناتوانن، چونکە لەبازاڕدا روپییە نەماوە شتی پێبکڕی لەبازاڕدا ئێستا دراوی تازە دەخوات، روپییە تەواو بوو، هەروا ئابوری ئالوێز تەواو بوو، ناکرێ هێلکە بەریو تەماتە بکڕی، تەماتە بەریو برنج بێنی، ئەو مێ سەدەکانی ناوەڕاست بوو، لەسەردەمی ئێستادا، کۆنخوازەکان بەزۆری زۆرداری تۆ لەسەر مەساحەیەکی ڕابردوو ماون، ئەیانەوێ ئەم مەساحەیە بکەنە ئەزەلی، کە پێشم وایە ئەزەلیەت لەدنیای کۆمەڵایەتیو سیاسیو هێز ڕادیکاڵەکاندا نیەو هەموو شتێك بەرەو گۆڕان دەڕوات.

**خاك:** کاك مەلابەختیار ئەو باکگراوندە چییە؟ ئەو زەمینەیە چییە کە وادەکات هێزێکی فیندەمیتالیزمی بتوانێ لەمڕۆی ڕۆژگاری کوردستاندا، بتوانێ بمێنێتەوە، یاخود بیەوێ بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەو دەبێتە میراتگری دیموکراسی؟

**مەلابەختیار:** فیندەمینالیزم پشت بە مەسەلەی دینی دەبەستێ، دینیش زۆر تێکەڵاوی ڕۆح بووە، مەسەلە مادیەکانی لێ‌دەربکەی یەکێك لەکاریگەریەکان کە کارلێك لەگەڵ مرۆڤدا دەکاتو ئاوێتەی مەسەلەی دەرونیو مەسەلەی ڕۆحی ئینسان بووە، مەسەلەی ئاینو مەزهەبەکانە. هێشتا لەوڵاتی ئێمە مەسەلە مادیەکان، مەسەلە ئەقڵانیەکان، مەسەلە دنیاییەکان، شۆڕشی تەکنەلۆژی بەحوکمی ئەوەی ڕابردوومان بەیارە لەرێنسانس، بەیارە لەچاکسازی ئایینی بەیارە لەرۆشنگەری، بەیارە لەشۆڕشی پیشەسازیو دیموکراسی، بۆیە هێشتا کاریگەریەکانی ئەو مەسەلە ڕۆحیانە لەسەر ڕوبەرێکی بەرچاوی خەڵك زۆرە بۆیە فەندەمەنتالیزم ئەتوانێ لەسەر ئەم ڕابوردووە بەیارە ئەرز بکێڵێ هەتاڕادەیەك سەوزیش ببێ، بەڵام ئەم قۆناغە ئینتقالیەی کە ئێستا تیایدا دەژین قۆناغێکی ئینتقالیە لەنێوان دنیای سەدەکانی ناوەڕاستی ئێمەو لەنێوان تێپەڕین لەدنیای سەدەکانی ناوەڕاستو دروستکردنی دەسەڵاتی دیموکراسی

جیهانبینیە جوانەکانی ئازادیو ئەقڵو مۆدێرنێتە، ئەم ئامانجانەش هێشتا تازە چرۆیان کردووە. گوژمەکانیان هێشتا تەواو خۆیان نەگرتووە، بۆیە ئەو مەسەلە رۆحیانەی کە لەخێزانی ئێمە ماوە، لەتاکی ئێمە ماوە، لەرابردوویەکی دەستکارینەکراوماندا ماوە، فەندەمەنتالیزم ئەتوانێ ئێستاش بەشێوەی جۆراوجۆر ئیشی لەسەربکات، بەشێوەی تیرۆر ئەتوانێ ئیشی لەسەربکاتو بەشی خۆی دابڕێ. بەناوی میانڕەوەوە ئەتوانێ ئیشی لەسەربکاتو رەهەندی تری لێ بدۆزێتەوەو بەشی خۆی لێدابڕێ، هەر ئەم بەشدابڕانەی جۆرەها رێگاکانی فۆندەمەنتالیزم بەڵگەی چییە؟ بەڵگەی ئەوەیە کە خۆی رابردوو کەوتۆتە قەیرانەوە، نوێنەرەوەی راستەقینەو چاکی نیە، بۆیە قەیرانەکەی وایلێکردووە هەر کۆمەڵێکی ئیسلامگەرا هەستێو بەشێوەیەك بتوانێ تەعبیر لەرابردوو بکات، ئەمە خۆی باشترین بەڵگەی شکستی رابردووە کە خاوەنێکی نیە، کە بتوانێ بیگونجێنێ لەگەڵ ئەم ئاڵوگۆڕانە، کە خاوەنی نەبێ، چەندین خاوەنێکی بۆ پەیدائەبێ، ئەم چەند خاوەنە ئاخرین سەنگەرەکانی فۆندەمەنتالیزمە، فۆندەمەنتالیزم بەبەرگو رەنگی جۆراوجۆرەوە.

**خاك:** دەتوانین ئەم سەردمە ناوبنێین سەردەمی رۆشنگەری؟

**مەلابەختیار:** سەرەتای سەردەمی رۆشنگەری کوردییە بەتەسەوری من، رۆشنگەری بەچەمکە مۆدێرنێتەکەی، ئەگینا رۆشنگەری وەکو رۆژنامە، وەکو گۆڤار، وەکو ئەدەب، رۆشنگەری وەکو زمان، وەکو ئایدیۆلۆژیەت لەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانەوە لەلای ئێمە سەریان هەڵداوە، رۆژنامەی کوردستان رۆشنایەکی رۆشنگەریە، کتێبە مێژووییەکانی نوێمان رۆشنگەرییە، گۆڤارو رۆژنامەکانی کە لەکوردستان دەرچوون، چەکەرەی رۆشنگەرییە، رەخنەکانی کە لای ئێمە هەبووە رۆشنگەرییە، شاعیرەکانمان بەشێکیان رۆشنگەرن، قەڵەمە جوانەکانی ئەو سەردەمە هەمووی بەشێکن لەرۆشنگەری، بەڵام ئێستا رۆشنگەری ئاوێتە بەمۆدێرنێتە بووە، وڵاتی ئێمەش وەکو جاران نیە دابڕاوبێت لەدەوروبەرو لەدونیاو لەو ئاڵوگۆڕانەی لەدنیادا هەیە، یانی کارلێك هەیە لەنێوان دەستکەوتە هەرەجوانەکانی بەشەری لەگەڵ سەرەتای مۆدێرنێتەکردنی کوردستان. ئیتر لەمەودوا کۆی ئەرکە رۆشنگەریەکان دەبێ بەدیبهێنرێن.

**خاك:** با تۆزێك چەمکەکانی فکر بەجێبهێڵین و قسەیەکیش لەسەر ئێستای خۆمان بکەین، حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەو حکومەتەی کە لەسەر ئەو بنیاتە دێتەکایەوە کە دەیەوێ چەمکەکانی دیموکراسی و سەرجەم ئەو چەمکانەی تریش کە لەسەروی هەموویانەوە ئازادییە بیناسێنێ بەدنیا لەلایەکی ترەوە کۆمەڵێك خزمەتگوزاری زۆر پێشکەشی خەڵك دەکات، لەلایەکی ترەوە هەوڵ دەدات بۆ دابینکردنی ئازادییەکان، هەموو ئەم شتانە.. بەڵام هێشتا خەڵکی ئێمە گلەیی هەیە ئاخۆ گلەییەکانی خەڵك تا چەند راستن؟ ئاخۆ حکومەتی هەرێم لەتوانایدا هەبووە لەوەزیاتر بکات لەوەی کە کردویەتی و ئێستا خەڵك لەم ساتەدا گلەیی لێدەکات؟

**مەلابەختیار:** وەڵامی ئەم پرسیارانە ئاماری دەوێت، بۆئەوەی ئینسان بتوانێ بەئامار قسە بکات، نەك نومێدەواری، نەك لایەنگری من بۆ حکومەت یا هەڵگەڕانەوەی من لەحکومەت، ئەمە یەك. پێش ئەوەی ئامارەکان بخەمەڕوو، ئەمەوێ بڵێم ئەم حکومەتەی ئێمە جارێ حکومەتێك نیە بەکامڵی توانیبێتی ئەرکەکانی دیموکراسی خیتابی دیموکراسی و مۆدێرنێتەو دنیای مەدەنی و ئازادی بەدیبهێنێ، لەبەر دوو هۆ: هۆیەکی بابەتییە، کە بەراستی لەباری بابەتیەوە هێشتا زۆرمان ماوە قۆناغەکە ببڕین، چواردە ساڵ لەراپەڕین بەدواوە، چواردە ساڵەکەش شەش حەوت ساڵ شەڕی ناوخۆ، شەش حەوت ساڵیش جۆرەها گەمارۆ، گەمارۆی نێونەتەوەیی هەبووە، گەمارۆی عێراقیش لەسەر ئێمە هەبووە، ئەمە جگە لەتەنگوچەڵەمەکانی خۆمان، بەراستی یەکێتیی و پارتی، کە وەکو دوو حزبی سەرەکی لەکوردستاندا بوین، کەم ئەزمون بووین و لەشاخ هاتبووینە شار، هێشتا لەفەلسەفەی حوکم، لەفەلسەفەی ئیدارە، لەفەلسەفەی ئابوری، لەدنیاکە وەکو پێویست وردنەبوینەوەو دەتوانم بڵێم کەموکوڕیەکی باشمان هەبوو لەچواردە ساڵی رابردوودا، بۆئەوەی بزانین فەلسەفەی حوکمان رون بکەینەوە، ئیدارەو ئابوری و شتەکانی ژیان و کەلتورو پەروەردەو هەموو ئەمانە رونتر بکەینەوەو پشت ببەستین بەخیتابێك کە بەراستی خیتابی ئەم سەردەمە بێت. ئەو کەموکوڕییانەی کە هەن، هەندێکی پەیوەندی بەبارە بابەتییەکەوە هەیە، هەندێکی پەیوەندی بەوەوە هەیە کە حکومەت چی بەجێهێشتووە، بەراستی لەلایەکەوە وێرانی جێهێشتووە، لەلایەکی ترەوە دامودەزگای بیرۆکراتی

مشەخۆری جێهێشتووە، خۆ ئێمە چیمان وەرگرتـووە؟ ئێمـە هـاتووین حکومـەت وتویەتی من بەرگەی روداوەکان ناگرم کوردستانم جێهێشتووە، کـە کوردسـتانی بەجێهێشـتووە مەجلـسی تەشـریعی بەجێهێـشتووە، کـە هـیچ بـوو، مەجلـسی تەنفیزی بەجێهێشتووە، کە هیچ بوو، پارێزگای بەجێهێشتووە، کە هیچ نـەبوون، ئەمە جگەلەوەی کە ٧٠٪ی ئەم ئیدارانەی بەناو هەبوو، پارێزگای کردبوو بەقەزا، ناحیەی کردبـوو بەگونـد، یـانی ئالیـاتی نەهێشتووە بینایـەی بـۆ نەهێشتووین، دامودەزگـای بـۆ جێنەهێـشتووین، بلـدۆزەری بـۆ نەهێـشتوین، شـۆفلی بـۆ نەهێشتووین، هیچ ئالیەکی بەجێنەهێشتووە کە تـۆ بتـوانی ئیشی لەسـەربکەی، ئێستا ئامارێکمـان لەبەردەسـتایە لەهـەموو ئـەو ئامارانـەی کـە بـۆ بـەڕێوەبردنی ناحیـە، گونـد، قـەزا، پارێزگـا پێویـستن لەسـاڵی ١٩٩٠ تـا ١٩٩١ لـەعێراق، لەکوردستان کە لێی بەجێماوە بەپێی زانستی ئابوری سفر یەکسانی سفر، یـانی هیچی لـێ بەجێنەماوە، یانی تۆ ناتوانی بڵێـی شتێك بـەجێماوە تـۆ ئـەم شـتەت گـەورەکردووە، نـەخێر تـۆ دەتـوانی بڵێـی لەسـفرەوە دەسـتت پێکـردووە، لەسفریشەوە پێنج هەزار گوندی خـاپورکراو ئـەبێ ئـاوەدان بکـەیتـەوە، بـەدەیان قەزاو ناحیە ئەبێ ئاوەدان بکەیتەوە، ئەمـە جگـە لـەوەی پارێزگاکـانیش خۆمـان ئـەزانین، پارێزگاکـان، سـاڵی ١٩٩١ هاتوینەتـە سـەر حـوکم، بـەڵام ئیمکانیـاتی کارەبا، ئاوەڕۆ، ژێرخان، ئابوری ئەم پارێزگایانە هـی پـەنجاکان بـووە، کارەبـای سلێمانی هی پـەنجاکان بـووە، کـە سلێمانیمان رزگـارکردووە، هـەولێر ئێـستاش ئـاوەڕۆی نییـە، هـەموو ئاوەڕۆکـەی بەسـەر کۆڵانەکانـدا دێـتو دەڕوات، تـەنها سلێمانی لەکوردستاندا توانیویەتی جوانترین ئـاوەڕۆ، دەتـوانم بڵێم نمونـەییترین ئاوەڕۆ کە شارەوانی سلێمانی لەسلێمانی کردویـەتی لەچـاو هـەموو پارێزگاکـانی عێراقیش شتی وا نییـە؛ هـەرگیز هـەتا بیـستو پێـنج سـاڵێ تـر کێـشەی ئـاوەڕۆ لەسلێمانی نـەماوە، ئـەم حکومەتـەی ئێمـە شانی داوەتەبـەری ئیشی کـردووەو هیلاك بووەو بێگومان ئەوانەی کە قسەش بەم حکومەتە دەڵێن، بەئێمەی دەڵێن، بەرای من جارێ قسەی دوژمنەکان بخەرەلاوە، چاك بکەیتو خراپ بکەیت دوژمن هەر قسەت پێدەڵێ، ئەمە یەك، ئەمێنێتەوە سەر هەندێ لەخەڵکە دڵسۆزەکە کە قسە دەکەن لەرۆژنامەکاندا، هەندێ نوسەری باش هەیە، هەندێ ئابوریزانی بـاش هەیە، قسەی باش دەکـات، هەقـە گوێیـان لێبگرین، گوێشیان لێگـراوە، هەشـە بەراستی تاقەتی هیچی نەماوە، باش بکـەیتو خـراپ بکـەیت هـەر قـسەدەکات،

نوسەری وا هەیە تەمەنی ناگاتە بیستویەك ساڵ، ستونێك دەنوسێت لەدێڕی یەکەمیەوە هەتا کۆتایی نە ئەقڵی بەدواوەیە، نە ئاماری بەدواوەیە، نە زانیاریی بەدواوەیە، سەرەنجام جگە لە ڕق هیچی تری بەدواوە نیە، ئینسانیش کە ڕق دایگرت بێگومان بۆچونەکانی یا کورت ئەهێنێ یا سەرئەکات، ئەگەر مۆڵەتم بدەی هەندێ ئامار دەخوێنمەوە کە ئاماری حکومەتە پێشکەشی کردووەو هەموشی وەزارەت بەوەزارەت لەبەردەستمایە، هەرکەسو ڕۆژنامەیەك بیەوێ ئەم ئامارانە تەحقیقی لێبکات دەتوانێ بچێ تەحقیقی لێبکات، هەر تەلەفزیۆنێك دەیەوێ با مێزگردی لەسەر بکات، کە ئاخۆ وەزارەت، بەوەزارەت با پسپۆڕەکانی ئەو وەزارەتانە بێن قسە بکەن لەسەر ئەم ئامارانە، بۆئەوەی بزانن کە ئاخۆ هیچ کراوە یان نەکراوە؟ کەموکوڕیش هەبێ یا نەبێ، گەندەڵی هەیە، من هیچ لاریم لەمە نیە، ئەمەش دەبێ چارە بکرێ، بەڵام ئەم ئامارانە بخوێنەوە بۆئەوەی بزانرێ ئەم حکومەتەی ئێمە ئەوەیە کە هەندێ ڕۆژنامەو خەڵك لەملاوئەولا قسەی پێدەڵێن، وەکو ئەوەی ئێمە هیچمان نەکردووە لەکوردستاندا، من لەحکومەت نەبووم، بێگومان لەیەکێتیی نیشتمانیمو کادری سیاسیم، بەڵام دەزانم ئەم حکومەتە غەدرێکی لێدەکرێو هەقیقەتەکان وەکو خۆی باس ناکەن، ساڵی ١٩٩١ ئێمە هاتینە سەر حوکم چاپخانە، کۆمپیوتەر، پرنتەر، ئیتنساخ، چاپ، ڕۆنیۆ، کامێرای ڤیدیۆ، سەتەلایت، تەلەفزیۆن، ڤیدیۆ، ئەمانە هیچی لەم وڵاتەی ئێمە نەبووە، ئێستا چوار چاپخانەی گەورە هەیە، (٤٩٧٦) کۆمپیوتەر لەدائیرەکاندا هەیە، (٢٢٧٢) پرەنتەر لەدائیرەکاندا هەیە، (٨١٨) ئیستنساخ لەدائیرەکاندا هەیە، چاپخانەی بچوك (٧٢١) هەیە، ڕۆنیۆ (١٤٢) لەدائیرەکاندا هەیە، کامێرای فۆتۆ (٢١٣) بۆ کاروبارەکان هەیە، کامێرای ڤیدیۆ (١٩٢) هەیە، سەتەلایت (٥٥٣) هەیە، تەلەفزیۆن (١٣٤٢) هەیە، ڤیدیۆ (٥)، جۆری تر (٤)، جۆری تر (٤٥) کۆی گشتی (١١٩٨٣) ئامێر لەو ئامێرانە لەکوردستاندا هەیە، تەربیەو باخچەی ساوایان لە١٩٩١ لەهەموو کوردستان (١٦) باخچەی ساوایان هەبووە، مەبەستم لەئیدارەی سلێمانیدا، ئێستا (٤٢) هەیە، خوێندنگە لەهەموو ئیدارەی ئێمە (٣٦٠) خوێندنگا هەبووە، ساڵی ٢٠٠٤ گەیشتۆتە (١٩٩٧) خوێندنگە، پەیمانگا ساڵی ١٩٩١ یەك پەیمانگا لەسلێمانی هەبووە، ئێستا (١٥) پەیمانگا لەسلێمانی هەیە، ساڵی ١٩٩١ زانکۆ لەسنوری دەسەڵاتی ئێمە هیچ نەبووە، ئێستا (٢) زانکۆ لەسنوری ئێمەدا هەیە، سێیەم

لەکەلار بەڕێوەیە، چوارەم هەفتەی ئایندە لەخانەقین بناغەکەی دادەنرێ، پێنجەمیش ئەوەی رانیەیە، مامۆستای زانکۆ ساڵی ١٩٩١ هیچ لەسلێمانی نەبووە، ئێستا مامۆستای زانکۆ (٦٢٧) دکتۆراو ماجستێر دەرس دەڵێنەوە، لەزانکۆ ساڵی ١٩٩١ هیچ خوێندکارێکی زانکۆ لەسنورەکانی دەسەڵاتی ئێمە نەبووە، ئێستا (١١٩٨٢) خوێندکار لەژێر دەسەڵاتەکانی ئێمە هەیە، ئەمە بەس لەبواری پەروەردەو زانکۆو ئامێرەکان، لەباری تەندروستی ساڵی ١٩٩١ (١١) نەخۆشخانە، (١٠١) بنکە، (١٨٣) پزیشك، (٩٦٠) کادری تەندروستی، (٩٢) ئۆتۆمۆبێلی فریاکەوتن هەبووە، ئێستا ساڵی ٢٠٠٤ نەك ساڵی ٢٠٠٥ بۆ ٢٠٠٦ نەخۆشخانە بووە بە(٢٧)، بنکەی تەندروستی بووە بە(٤٧٣)، پزیشك بووە بە(١٢٩٢)، کادری تەندروستی بووە بە(٦٨٨٨)، ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن بووە بە(٣٣٨)، هەندێ لەچارەسەرکردنەکانی وەزارەتی تەندروستی ساڵی ٢٠٠٢، سەردانی نەخۆش (٢٢٢٠٦٢٣) سەردانی نەخۆشخانەیان کردووە، چەند سۆنەر کراوە لەم وڵاتەی ئێمە (٥٢٣٥٤) کەس سۆنەری بۆکراوە بەبەلاش، کیسەی خوێنی کارکراو (٢٢٨٧٠)، نەشتەرگەری (٣٣٣٩٣)، شکاندنی بەردی گورچیلە (١٤٨٠)، نەخۆشی ددان (١٠٥٥١٦) نەخۆشی ددان چارەسەرکراوە، ئەمە خزمەتە یا خزمەت نییە؟

با بێینە سەر هەندێ ئاماری تر، شارەوانی، زەوی دابەشکراوە بەسەر چینەکانی کوردستان، (٥٣٨٦٩)، تۆڕی ئاوی پاکی راکێشراو لەشارو شارۆچکەکاندا (٦٩٢ کم)، شەقامی قیرتاوکراوەو هی کۆڵانەکانیش (٤٥٠٠٠٠ کم)، ئەنجامدانی ئاوەڕۆ (٦٩٢) کیلۆمەتر چوارگۆشە، دروستکردنی باخچە لەشارو شارۆچکەکان (٣٠٠) باخ لەشارو شارۆچکەکاندا دروستکراوە، دروستکردنی بینای تازەی شارەوانی شەش بینای گەورەی شارەوانی دروستکراوە، دابینکردنی ئامێری جۆراوجۆر (١٤١٤) ئامێری جۆراوجۆر بۆ شارەوانیەکان دابینکراوە، پێدانی مۆڵەتی خانوبەرە لەشارەوانی سلێمانی بۆ نموونە دروستکردنی خانوو (١٥٨٩٢) باڵەخانەو دوکان (١٨٣٤) زیادەو چاکردن (٦٣٩٢).

پێشم وایە ئامارەکان زۆر زۆر رونەو گۆڕینی شاری سلێمانی لەبەرچاوی هەموو لایەك دەزانین، کە چۆن گۆڕاوەو چۆن نەگۆڕاوە، ئەمە بەشێکی کەمی ئامارەکانە، بێگومان زۆر زۆر شت هەیە کە ئینسان دەتوانێ قسەی لەسەربکات،

ئەمەش ئامارێکە لەسەر گۆڤارو رۆژنامەی مۆڵەتدراوی ئازادی کە لەوڵاتی ئێمە دراوە، رۆژنامەی رۆژانە سێ دانە، هەفتانە سیانزە، دوو هەفتەجارێك سیانزە، مانگانە پانزە، وەرزی هەشت، هەفتانە دوو گۆڤار، دوو هەفتە جارێك چوار، مانگانە (٤٩)، وەرزی (٣٩)، بیستو یەك رادیۆ لەسلێمانی ئیش دەکات، کۆی سەرەکیو لقەکانی رادیۆ (٤١)، تەلەفزیۆنی ناوخۆی کوردستان لەسلێمانیدا (١٠) دانە بەشوێنەکانی تر (٣٧).

من نازانم ئەگەر ئەم هەموو گۆڤارو رۆژنامەیە نەتوانن ئازادی بیروڕا دەربڕن، ئەو هەموو نەخۆشخانەیە، ئەو هەموو خوێندنگەیە، ئەو هەموو پیشەسازییە، ئەو هەموو خزمەتە کە من دوێنێ باسی پیشەسازی وەزارەتی پیشەسازیم کرد بەسەدان ملیۆن دۆلار لەسەر کارگە، هەزاروپێنجسەد کارگە لەئیدارەی سلێمانی ئیش دەکات، کە ئەمە بناغەی ژێرخانێکی ئابوری پتەوەو سەرەتای دروستکردنی چینی مامناوەندییە لەکوردستاندا. هەر وڵاتێك ئەمە بناغەی ئابوری چینی ناوەڕاستی بێ، ئەو وڵاتە لەسەرەتای گەورەترین گۆڕانکاریەکانی مێژوودایە، ئەوروپای رۆژهەڵات، یەکێك لەهۆیە هەرە سەرەکیەکانی کە روخاوە، چینی ناوەڕاستیان بۆخۆیان نەهێشت، ئەوروپا ئێستاش کە دینامیکیەتی گەشەکردنە، چونکە چینی ناوەڕاستی لەباری ئابورییەوە بەهێزترین چینە، زۆرترین سەرمایەی هەیە، بۆیە دەتوانێ سەربکەوێت، ئێستا دووهەزار ملیۆنێر لەسلێمانی هەیە، ملیۆنێر بەدۆلار نەك بەدینارەکەی ئێستا، ئەمە ئەگەر هەبێ لەبەرچاوی نەگرێ، ئەم خزمەتانە لەبەرچاونەگرێ، تەنها ئەوە لەبەرچاوبگرێ جادەیەك هەڵکەندراوە یا کۆمەڵێك گەندەڵیو دزیو مشەخۆری هەیە، من دەڵێم هەیە، لەکۆبونەوەشدا وتومانە هەیە، بەبەرێز سەرۆکی حکومەتیشمان وتوە هەیە، سەرۆکی حکومەت خۆشی وتویەتی هەیەو ئێستا لەهیمەتێکی گەورەدایە بۆ چارەسەرکردن، ئەوە راپۆرتی چاودێری دارایی لەناو ئەم راپۆرتە هەیە کە ئەمە کراوە، کە چەند پشکنین لەدامودەزگاکاندا کراوە، چەند گۆڕاوە، چەند کەس سزادراوە، هەمووی لەناو ئەمە هەیەو ئێستاش لێکۆڵینەوەی تایبەت بۆ ئەمانە هەیە، من پێم وابێ نامەوێ چاوپێکەوتنەکەتان لەخوێندنەوەی کتێبێکی ئامار بکەم، من یەك کتێب ئامارم لەبەردەستە، پێنج لاپەڕە لەئامارەکەم خوێندۆتەوە، ئەم ئامارانە بەڵگەی ئەوەن ئەو ئیدعایانەی کە ئەمانکرد ساڵی ١٩٧٥ کە (ی.ن.ك) دامەزرا، سەرلەنوێ (پ.د.ك) کە بەناوی قیادەی موەقەتە

دامـەزرا، جزبـەکانی تـر کـە دوایـی دامـەزران و دوایـی هاوپـەیمانی کوردسـتانی پەیمانمان دا، وتمان ئێمە دێینەسەر حوکم ئاڵوگۆڕی زۆر گـەورە دەکـەین ئەگـەر لەم ئامارانـەی کـە مـن خوێندومەتـەوە، بەویژدانیشەوە خوێندومەتـەوە، لـەهیچ یەکێکیدا، لەهیچ بوارێك لەبوارەکاندا پەنجا بەرامبەری زەمانی حکومەتمان کەمتر نەکردووە، ئێمە کە چوینە شاخ پەیمانمان دا وتمان حوکمی زاتـی بەدیدەهێنین، ئێستا چیمان بەدیهێناوە؟ حوکمی زاتی یا فیدراڵمان بـەدیهێناوە؟ هەڵبـژاردنمان بەدیهێناوە، کێ لەخەیاڵیا بوو هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەرەسمی بناسرێ؟ زمـانی کـوردی ببـێ بـەزمانی رەسمـی لـەم وڵاتـە؟ ١٧٪ ی بودجـەی عێـراق بـۆ کوردسـتان تـەرخان بکـرێ؟ وەزارەتـی دەرەوەی عێـراق بـدرێ بـەکورد؟ بـۆ پەیوەندیەکانی هـەرێم لەنەتـەوە یـەکگرتوەکانیش قبـوڵ کـرا، کـێ خـەیاڵی بـوو جـەنابی مـام جـەلال بـەزمانی کـوردی لەنەتەوەیـەکگرتوەکان و لـەپاڵ سـەرۆکی ئەمریکا قسەبکات؟ کێ خەیاڵی بوو جـەنابی سـەرۆکی هـەرێم بـەجلی کوردیـەوە بچێ لەکۆشکی سپی وتار بخوێنێتەوەو وەڵامـی رۆژنامەنوسـەکان بداتـەوە؟ کـێ خەیاڵی ئەوەی هەبوو ئەم هەموو ئازادیەی هەبێ؟ کـێ خـەیاڵی بـوو ئـەم هـەموو حزبە دروسـت ببـێ؟ ئـەم هـەموو تەلەفزیۆنـە، خواخوامـان بـوو بەرپرسـەکانمان لەبەیانی ئازاردا، لەساڵی جارێك مقابەلەی بەرپرسێك لەبەرپرسەکان بکـرێ، خـەو بووە لەتەلەفزیۆن یەکێك لەبەرپرسەکان دەربچێ لەعێراقدا موقابەلەی بکەن، کـە موقابەلەیەکیش دەکرا، بەرپرسێکی گـەورەی پـارتی کـە وەزیرێکـی ئـەبینی خـۆ ئەمەمان نەئەبیست لەدورەوە یەك چرکە ئەمانبیسـت، ئەمـەشمان پێخۆشـبوو، ئێستا خۆمان چوار سەتەلایتمان هەیـە، لەهـەولێرو سلێمانی بیست بۆ بیسـتو پێنج تەلـەفزیۆنی ئازادمـان هەیـە، ئێـستا رۆژانـە حزبـەکان لەسـەر تەلـەفزیۆنن، لەمۆڵەکانن، لەرۆژنامەکانن، لەگۆڤارەکانن، لەسیاسەتی نێونەتەوەییدان، دەچنە دەرەوە، دێنە ناو وڵات. نادیدەگرتنی ئەمانە گوناحە.

**خـاك:** پەیوەندیەکی تەلەفۆنیمان لەگەڵدایە..

**رزگـار عبدالقـادر:** شەوتان باش، من حـەزم کـرد موداخەلەیـەك بکـەم لەسـەر ئەو ئامارانەی کە کـاك بـەختیار باسـی کـرد، لەوەدەچـێ ئـەو نـەتوانێ هـەمووی شیبکاتەوە، بەس من وەکو بەڕێوەبەری کۆمپانیای نۆکان هەنـدێ شـتم لایـە کـە لەسـەر بودجـەی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان جێبـەجێدەکرێ، حەزدەکـەم

ئاماژەی پێبکەم، ئێمە هەروەکو گروپی نۆکان ئێستا بایی حەوت ملیۆن دۆلار ئیشی حکومەتی هەرێمی کوردستان جێبەجێدەکەین لەوانە دروستکردنی خوێندنگەو نەخۆشخانە، چوارسەد خوێندنگاو نەخۆشخانەو خانوی تایبەت بەکارمەندەکان، لەسەرتاسەری کوردستاندا، دروستکردنی جادەی چەمی ڕێزان هەر لەلایەن کۆمپانیاکەی ئێمەوەیە، دروستکردنی حەوت باڵەخانەیە لەراپەڕین، کە ئەوە بەشێکێتی کە خۆی سێ بەشەو چل باڵەخانەیە کە دروست دەکرێت بۆ فەرمانبەران، هەروەها هەندێ ئیشی ترمان هەیە کە جێبەجێمان کردوە، دروستکردنی جادەی دووسادیی بەکرەجۆ، ئێستا ئیش لەسایدی بەکرەجۆ فرۆکەخانەی سلێمانی ئەکەین، هەروەها پێرێ بەردی بناغەی دروستکردنی کارگەیەکی خشت‌و بلۆکمان دانا کە شێوەیەکی تازەیە لەبازیان دادەمەزرێ، ئەمە کەمێکی ئەم شتانەم لەلایە ئەگەر بتوانرێ پەیوەندی لەگەڵ کۆمپانیاکاندا بکرێ، دەتوانن دەریبخەن کە چەند حکومەتی هەرێم بودجەی داناوە بۆ ئەو ئیشانەو من دڵنیاشتان دەکەم جەماوەری کورد بەهیچ کەسێك رای ناگۆڕێ‌و دوژمنانیش خەیاڵیان خاوە ئینشائەڵڵا هەر سەرکەوتوو دەبن. زۆر سوپاس.

**مەلابەختیار:** ئەوە بەس کۆمپانیایەکە، من وتم هەزاروپێنج سەد کۆمپانیا هەیە لەکوردستان کۆمپانیایەکی راستە گەورەیە، بەڵام ئەوە کۆمپانیایەکە لەکۆمپانیاکان، کۆمپانیای ولاتانیش حساب کە، کۆمپانیای چینمان لەگەڵدایە، ژاپۆنمان لەگەڵدایە، ئەڵمانمان لایە، وڵاتانی تر ئەمانە هەمووی حساب بکەن، ئەم ئالوگۆڕە گەورانە کە بەڕاستی وەرچەرخانە لەمێژووی ئێمە، ئەمە لەخۆیەوە دروست نابێ، من لەزانکۆی کۆیە بووم، خوێندکارێك لێی پرسیم، لەوانەبوو کە یاخی بوو، زانکۆی کۆیە بەرامبەرەکەی سی چل باڵەخانە چووە بەئاسمانا، هەمووی تازە دروست دەکرێت، لەولاشەوە هەیبەتسولتان تونێلێك لێدەدرێ، خوێندکارەکە لێی پرسیم وتی ئێوە چیتان کردووە؟ تۆ یەك سەعاتە قسە بۆ ئێمە ئەکەیت ئێمە هەموومان هیچ نابینین، وتم هەیبەتسولتان کون دەکەن نابینی؟ ئەو هەموو باڵەخانەیە لەبەرامبەرت نابینی؟ وتم ئەمە بەس لەقەزایەکدا.

**خاك:** لیستی هاوپەیمانی کرودستان لیستێکە با بڵێین لەسەر پرەنسیپەکانی دیموکراسی دامەزراوە، پرسیاری ئێمە لێرەدا ئەوەیە، بۆچی هەندێك هێز لەلیستی هاوپەیمانی کوردستان جێگەیان نەبۆتەوە، بۆچی یەکگرتوو جێگای نابێتەوە؟ بۆ پارتی چارەسەر جێگای نابێتەوە؟ بۆ بزوتنەوەی ئیسلامی‌و پارتی

کاری سەربەخۆ جێگەیان نابێتـەوە؟ ئـەم هێزانـە بۆچـی نـاتوانن ئـەمجارە لـەناو لیستی هاوپەیمانی کوردستاندا بن؟

**مەلابەختیار:** ئەوانـە بـەجێماون، خیتـابی ئـەوان خیتـابێکن لەرابردوودایـە، وەکو وتم خیتـابی ئێمـە مۆدێرنێتـەو دیموکراسـیو تێپەڕینـە لـەرابردوو، خیتـابی ئەوان بەجێماوە، کاتێك ئێستا دەزانن ئەوانە هاوپەیمانی کوردستان دەتوانێ زۆر شت بگۆڕێو ئەو گۆڕانە لـەباری ستراتیژیەوە، لـەقازانجی ئایدیۆلۆژیـەتی ئـەوان نیـەو چوارچـێوەی ئـەوان هەڵئەتـەکێنێ، بۆیـە ئەوانـە بەپاسـاوی جۆراوجـۆر هەریەکـە بـەجۆرێ، یـەکێ خـۆی هەڵواسـێوە بـەهێزی دەرەکـی، یـەکێ خـۆی هەڵواسیوە بەرابردوو، یـەکێ چـەقی بەسـتوە لـەولاوە، یـەکێ بـەناوی چـەپ کـە بەراستی هیچ خیتابێکیشیان بۆنی چەپی لـێنایەت، ئەمانە هەموویان بەجێماون، هی وا هەیە باسی ئەوە دەکات کە دەڵێ کۆمۆنیستی عەیارە بیستوچوارە، مـن خیتابەکانیان دەخوێنمەوە کۆنەویستی عەیارە بیستوچوارە، کۆمۆنیست نیـە، کە تۆ بەجێئەمێنی هێزێك نەتوانێ نوێنەرەوەی گۆڕانکاریە جوانەکانی ژیان بێت، بێگومان دەکەوێتە ناکۆکی لەگەڵتا، ئەو ناکۆکیـەی بەچـی ئەرازێنێتـەوە کـە تـۆ خراپـی، کـە نـادیموکراتی، تـۆ گەنـدەڵی، نـازانم چیوچـی بۆنموونـە: مـن ئـەمڕۆ لەدەربەندیخانیش ئەو قسەیەم کـرد برایـانی یەکگرتوو لـەناوخۆیان کـە زانیـاری باشمـان هەیـە لەسـەریان، لـەدەروەش کـە پروپاگەنـدە دەکـەن، دەڵـێن ئێمـە تەحـــەمولی ئــەم دوو حکومەتـــەمان نـــەماوە گەنـــدەڵنو نــاتوانن کێـشەکان چارەسەربکەن، یەك پۆستەریان دەرکردووە، یـەك دروشمـی سـەرەکییان هەیـە، دروشمـە سـەرەکیەکەو پۆسـتەرەکەیان هــەمووی باسـی ئـەم گەندەڵیـەی دوو حکومەتـەی کوردسـتان دەکـات، مـن ئەوەنـدەی کـە پەیوەنـدی بەگەنـدەڵی حکومـەتی ئێمـەوە هەیـە، قـسەی ئەوانیـشم قبوڵـەو دڵنیایـان دەکـەم، ئـەوان گەندەڵیان پێ چارەسەرناکری، ئێمەین دەتوانین چارەسەری بکـەین، بـەڵام مـن لەسەرکردایەتی یەکگرتوو دەپرسم؟ لەکادرەکانیان، لەوانەی کـە شـەوانە دەچـن لـەدەرگای ماڵـەکان دەدەنو دەڵـێن سـەرکردایەتی یـەکێتییو پـارتی ناتوانـێ وەفادربێ بۆ شەهیدەکانتان، بۆخەباتەکەتان، مـن لێیـان دەپرسم بەویـژدانیان، حزبێـك سـاڵی ١٩٧٢ خـۆی تەجمیـدکردبێ هـەتا سـاڵی ١٩٩٤ جوڵـەی نـەبووبێ، نـوزەی نـەبوبێ، وشـەی لێوەنـەهاتبێ بەرامبـەر بەهــەموو ئـەو کارەسـاتانەی بەرامبەر بەکورد رویداوە، ئیتر ١٩٧٢ تەسفیری فەیلیەکان دەستپێدەکات، ١٩٧٤

شەڕ دەستپێدەکات تا ١٩٧٥ سیاسەتی سوتماك بەرامبەر بەکوردستان بەکارهاتووە ١٩٧٥ موئامەرە دەکرێت هەرەسمان پێدێت، ١٩٧٦ دەستپێدەکەینەوە، ١٩٧٨ دێهاتەکانمان نامێنێ، شەڕی ئێران عێراق لە ١٩٨٠ دەستپێدەکات، ئینجا تەبعیس، ئینجا تەعریب، ئینجا کیمیاباران، ئینجا ئەنفال، کارەساتەکانی شەڕی ئێران– عێراق، ئەمانە هەمووی حزبێك تەحەمولی بیست ساڵی کارەساتو تاوانی رژێمی عێراق بکات، شەش مانگ تەحەمولی حکومەتی یەکێتییو حکومەتی پارتی ناکات، ئەمە مەنتقە؟ تۆ ئەنفالت تەحەمول کردو قسەت نەکرد، تۆ کیمیابارانت بینیو قسەت نەکرد، بەشێك لەکادرەکانت هەمووی خەڵکی هەڵەبجەن، تۆ پێنج هەزار گوندی خاپورکراوت بینیو تەحەمولت کرد، تۆ زیندانەکانی بەعس تێکۆشەرەکانی ئێمە هاواریان ئاسمانی دەگرتەوە، گوێت لێبوو تەحەمولت کرد، ئاخر تۆ ئەوانەت تەحەمول کردبێ، ئێ ئەمەشت تەحەمول بکردایە، دوو ساڵی تر، سێ ساڵی تر لەگەڵ ئێمە بویتایە، هیچ نەبوایە بەشت دەدرا. خۆ بێبەش نەدەبووی، ئاخر ئەم ئیدعایە دەشێ ئینسان ئەقڵی هەبیو باوەڕی پێبکات بڵێ تەحەمولم نەماوە؟ تەحەمولی چیت نەماوە؟!

**خاك:** دوو پەیوەندیمان لەگەڵدایە..

**یوسف حسێن:** بەخێرهاتنی کاك بەختیار دەکەم، دەڵێم بۆ ئەو هەڵبژاردنە، ئەوانەی کە باسی دیموکراسیو خزمەتگوزاری دەکەن لەبانگەشەکەیاندا، ئایا هیچ زەحمەتێکیان کێشاوە لەمەوپێش؟ سوپاس.

نەرمین سەعدون: من وەکو بنەماڵەیەکی شەهید، من نامەوێ کاتتان بگرم، بەڵام خەڵك هەمووی وشیارەو قسەی لەسەر هەموو ئەزمونەکان کردووە، تەنها یەك قسەم هەیە، ئەی ئەو کەسانەی کە دەنگ نادەن، ئەی ئەو کەسانەی کە خیانەت لەخۆتانو خاکەکەتان دەکەن، ئەی چۆن سبەینێ کە لیستی کوردو عەرەب جیاکرایەوە، چۆن دەتوانن لەسەر ئەم خاکە بژینو ئاووهەوای ئەم خاکە هەڵمژن؟ چی وەڵامی کوردستانی دایك دەدەنەوە؟ لەکۆتاییدا داوایەکم لەکاك بەختیار هەیە، کە چۆن هەردەم لەپێشەوەی خەبات بووە، چ لەشاخو چ لەشار، هیوادارم دوای هەڵبژاردنیش، هەردەم چاوپێکەوتنەکانی بەردەوام بێ لەنزیکەوە تێکەڵ بەکێشەکانی ناو کۆمەڵ بێ، چونکە چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان پشتوپەنای بنەماڵەی شەهیدانە.

**مەلابەختیار:** من ئەمەوێ لەسەر ئەو سۆزە جوانەی ئەو خوشکە بڵێم: ئەگەر وەفامان هەبێ بۆئەوەی سەری ئەو خوشکەو کەس‌وکاری هەموو شەهیدەکان بەرزبکەین، من لێرەوە پەیامم بۆ کاك عومەر فەتاح‌و وەزیرە بەڕێزەکان‌و بۆ حکومەتی ئێمەو مەکتەبی سیاسی ئەوەیە، کە مادام خاوەنی ئەو جگەرسوتاوانەین‌و ئاوا پەرۆشی ئێمەن، هەقە لەدوای ئەم هەڵبژاردنە، کە من دڵنیام خەڵکێکی زۆرزۆر دەنگ دەدات، هەقە دوای ئەوە دەستبەجێ ئیش بکەین بۆئەوەی ئەو گلەیی‌و گازندەو رەخنانەی کە خەڵك هەیەتی بەرامبەر بەهەر دەزگایەك لەدەزگاکان، هەقی وایە بەزوترین کات چارەسەریان بکەین، بۆئەوەی ئەو بیانوەش لەنەیاری حکومەتەکەمان‌و لەشەهیدەکانمان‌و لەسەروەریەکانمان ببڕین.

قسەشم ئەوەیە مەسەلەی دەنگنەدان، دەنگدانە، گرفتەکە ئەوەیە هەندێ کەس تێناگات کە دەنگنەدانیش دەنگە، بەڵام خراپترین جۆری دەنگدانە، دەنگنەدان دەنگدانە بەدژەکانی ئێمە، بەدژەکانی دیموکراسی، بەوانەی حەزناکەن ٧٣٠ بتوانێ پارسەنگی هاوکێشەکانی ئەم وڵاتە بێت، خەتەرە دەنگنەدان، دەنگنەدان خراپترین جۆری دەنگدانە، دەنگدان دڵسۆزترین جۆری دەنگدانە.

**خاك:** برادەرانی یەکگرتو، یا پارتی چارەسەر، یا بزوتنەوەی ئیسلامی لەبانگەشەکانیاندا باسی شێوازی خزمەتگوزاری دەکەن بۆ هەرێمی کوردستان، ئەوان کە لەپەرلەمانی عێراق بن چۆن چۆنی دەتوانن؟ ئەگەر ئەو سێ بۆ چوار کورسی بهێنێ چۆن دەتوانی ئەم هەموو خزمەتگوزاریەی کە بانگەشەی بۆ دەکات پێشکەشی خەڵکی کوردستانی بکات؟

**مەلابەختیار:** من لەوان دەپرسم، ئەوە ئەیاد عەلاوی چل کورسیشی هەیە لەپەرلەمان چی کردووە؟ هاواری لێ‌هەڵساوە بەرامبەر ئیبراهیم جەعفەری، بەرامبەر بەدەسەڵاتە بەهێزەکانی ناو پەرلەمان بەچل کورسیشەوە، یەکگرتوو بەچل ساڵی تر نابێ بەخاوەنی چل کورسی لەپەرلەمانی عێراقدا، نازانم بۆ کوردستان، بەڵام لەعێراقدا چل ساڵی تر، چل کورسی نابێ، ئەوان بەچل کورسی هیچیان پێ‌نەکرابێ، نەیانتوانیبێ یەك بڕیاری لیستی ئیئتیلاف بگۆڕن لەپەرلەمانی عێراقدا، ئەمان بەسێ کورسی‌و پێنج کورسی‌و شەش کورسی چییان پێ‌دەکرێ؟ ئەگەر ئێمە نەبین.

**خاك:** یەکێك لەو باسوخواسانەی ئەمڕۆی سەردەمی هەڵبژاردن دەبێتە جێی باسی زۆر کەسو هەندێك ڕۆژنامەو گۆڤار خۆیان پێوە خەریك کردووە، گەنجو فەرامۆشکردنی گەنجانە، بەڕێزت پەیوەندیەکی پتەو تۆکمەت لەگەڵ ئەو توێژەدا هەیە، ئەی چۆن دەتوانن قسە لەگەنج بکەن؟ گەنج کێیە؟ یا گەنجی ئێمە ئەو گەنجە یاخیەیە لەهەموو شتەکان رابکات، لەهەموو بەرپرسیارێتیەکان رابکات، ئەوەی ئەمڕۆ خۆی بەیاخی دەزانێ ئایا یاخیبونێکی مەعریفیە، ئەقڵە، بیرکردنەوەیەکی راستودروستی لەپشتەوەیە، یان بەتەنیا جۆرێکە لەخۆپیشاندان؟

**مەلابەختیار:** دیارە ئێمە هیچ ئامارێکی هەڵبژاردنەکانی پێشوومان لەبەردەستدا نیە بزانین چ چینو توێژێك زۆر دەنگی داوەو چ چینو توێژێك کەم دەنگی داوە، تۆ کە ئامارێکی کۆمەڵایەتی، سیاسیت لەبەردەست نەبێ، ناتوانی حوکمی رەها بدەیت، ئەوتریێ گەنج کەم دەنگی داوە، من دەڵێم ئەوەندەی زانیاریمان هەبێت دەوڵەمەندەکان کەمتر دەنگیان داوە، زانیاریەکان وادەڵێنو پێشم وایە زانیاری ئێمە بەهێزترە، ئەمە یەك، گەنج، لاو، لەلای ئێمە ئەوەی ساڵی ١٩٩٢ پێنج ساڵی تەمەن بوبێ، هێشتا هەژدە ساڵە، ئەمە نەوەیەکە رەگەکانی رابردووی لاوازە، سیاسەت وەکو دین نیە خێزانێك بتوانێ بەئاسانی نەقڵی بکات سیاسەت رۆح نیە، سیاسەت فکرو مەعریفەیە، فکرو مەعریفەش بەئاسانی نەقڵ نابن، ئەگەر تۆ دەزگای فکرو مەعریفی گەورەت نەبێ، بنەمای فکرو مەعریفی گەورەت نەبێ، کانگای بەرهەمهێنانی گەورەی مەعریفیت نەبێ، پەروەردەت بەتەواوەتی نەگۆڕیبێ، ناتاونی نەوە جیاوازەکان باش ئامادەبکەیت. خەلەلی ئێمە لێرەدایە، کە فەلسەفەی پەروەردەمان سەراپا لەباخچەی ساوایانەوە بۆ زانکۆ نەگۆڕیوە، خەلەلی ئێمە لێرەیە کە ئێستا لەزانکۆکان میتۆدی خوێندن لاوازە جارێ، بەشێك لەم گەنجەی ئێمە جۆرێك لەیاخیبوونی تیائەبینی، جۆرێك لەناڕەزایی تیائەبینی، بەڵام ئەوەی من موتابەعەی دەکەمو خۆشت دەزانی پەیوەندیم بەرێکخراوەکانی لاوان، خوێندکارانو ئەوانەوە زۆرە، بەڵام ئەمڕۆ نزیکەی هەزارو پێنج سەد خوێندکار لای جەنابی مام جەلال بوونو من لەناویان بووم، ئەو حەماسانەی لەو گەنجانە

بینیم سەرم سوڕما. ئەمە دوا ویستگەی تەقینراوی دەنگێکە کە بۆ نەتەوەکەی لەوەزیاتر خۆشیو خرۆشان نابینم لەئینسانێکدا، پێشم وانیە ئەوانە تەمسیلیان کردبێ، یەکێ تەمسیلی کرد؟ سەد کەس کردی؟ دووسەد تەمسیلی کرد؟ من ئەمڕۆ لەدەربەندیخان وەستابووم، دوو سێ هەزار کەس بەرامبەرم وەستابوون، هەرچەند سەیرم دەکرد ٧٠٪ ی گەنج بوو، ئەو چەپڵەیەی ئەوان لێیان دەدا پیرەکان هەر تاقەتیان نەبوو چەپڵە لێبدەن، دوێنێ لەسەیدسادق بەهەمان شێوە سەدان کەسیان کۆکردبوەوە، حەماسیێتێك لەوانم بینی لەکەسی ترم نەبینی، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەقی وایە شتەکان لێکبدەینەوە، لیژنەی تایبەتمان هەبێ، با بزانین گەنجو لاو پێویستی بەچییە؟ یەکەم پێویستیە پەروەردەییەکانی بەدیبهێنێ، دووەم ئارەزووەکانی بەدیدەهێنێ، چونکە ژیان هەر ئەوە نیە تۆ ئارەزوو بەدیبهێنی، ژیان ئەوەیە کە تۆ چۆن ئەقڵ پەروەردە دەکەیت، مەعریفە ئاوێتەی جیلێك دەکەیت ئایندەی دەکەوێتە دەست، لەبەرئەوە پەروەردەکردن لەسەر بنەمایەکی هاوچەرخی زانستیو بەدیهێنانی ئارەزوەکانو خەوە جوانەکانی لاوان، ئەرکی سەرشانی ئێمەیە، کەموکوڕی لەوبارەیەوە هەبێ هەقە دیراسەی بکەینو چارەسەری بکەینو من پێم وایە، پار، شەش مانگ لەمەوبەر لەهەڵبژاردنەکاندا پروپاگەندەی دەروونی زۆر کرا، موبالەغەش کرا لەدەوری لاو، لاویان والێکرد هەندێ خەڵك کە چارەنوسی میللەتەکە بەدەست ئەوانەوەیە، هەرگیز وا نیە، ئاینده بۆ ئەوانە، لاویان والێکرد ئەگەر تۆ دەنگ نەدەی ئیتر هەرهەمووی ئەڕوخێو هەمووی تەسلیم دەبی، ئیتر هەموو شتەکان دەگۆڕیت، وانیە، ئەوە ئاڕاستەیەکی هەڵەیە، من جارێکیان کوڕێکم هەبوو لاوێك بەتوڕەبوونەوە هەر قسەی کرد لەفێستیڤاڵی گەلاوێژدا، دوو شتی باسکرد، من وتم هەندێك نارەزایی لەسەر کارەباو ئاوی داخلی ئەوانەیە هەقە چارەسەر بکرێت، هەستاو وتی ئێمە ئەمەمان ناوێ، ئێمە دەمانەوێ حکومەتو حزب بگۆڕین، ئەمە یەك، دووەم وتی من بیستو دوو ساڵم چیتان بۆ من کردووە؟ من تائێستا سێکسم نەکردووە، وتم ئاقڵ بە دانیشە، حکومەتو حزب بەتۆ ناگۆڕێ، مەسەلەی سێکس بەدەست من نیە لەئەورووپاش ئەوە نیە کە تۆ دەیڵێی، ئەمە لادانە، لادانی سیاسیو کۆمەڵایەتیە، ئەمە چ پەیوەندیەکی بەئەقڵو مەعریفەوە هەیە؟

**خالك:** پەیوەندی تەلەفۆنی وەردەگرین..

**وشیار عەلی:** شەوتان باش، بەڕێز کاك بەختیار، دوو پرسیارم هەیە، من وەکو بەڵگەیەك دەیڵێم، ئایا کەرکوك چەندین شەهید دراوە لەشۆڕشی ئەیلول تا شۆڕشی نوێ، بەهەقەت هەمووی لەپێناوی کەرکوکدا شەهید بووە، ئەمە ئەوە، یەکگرتوی ئیسلامی ئایا دەتوانێ ئەو مافانەمان بۆ وەرگرێتەوە؟ کەرکوك بخاتەوە سەر هەرێمی کوردستان؟ پرسیاری دووەم: لەروی نەتەوایەتیەوە کەوا (ی.ن.ك) لەگەڵ هاوپەیمانی کوردستان یەکی گرتووە، خۆشحاڵین بەم وەزعەو ئایا لەروی فکریو ئایدیۆلۆژیەوە هیچ زەرەرێك بە (ی.ن.ك) ناگەیەنێ؟

**مەلابەختیار:** جارێ بەنیسبەت کەرکوكو یەکگرتو و مافەوە، وتمان کەرکوك بەئیرادەی نەتەوە دێتەدیو ئەگەڕێتەوە، بەئیرادەی حزبێك ناگەڕێتەوە هەتا یەکێتیو پارتیش بەتاقی تەنیا ناتوانن کەرکوك بگێڕنەوە، ئەوندەی من بزانم یەکگرتو تەنها مافی لەئێمە سەندوە، هیچ مافێکی بەدینەهێناوە، لەئێمەشو لەپارتیش تەنها مافی لێوەرگرتووین، بەڵام تائێستا هیچ جۆرە مافێکی سیاسی بۆ ئێمە بەدینەهێناوەو ئەو خزمەتانەی کە کردوشیەتی، خزمەتێکە هیچ پەیوەندی بەژێرخانی ئێمەوە نیە، پەیوەندی بەئەقڵی ئێمەوە نیە، پەیوەندی بەژیانی ئێمەوە نیە، پەیوەندی بەگۆڕانکاری کۆمەڵایەتیەوە نیە، یەکگرتو مزگەوتی دروستکردووە، سەدو دووسەد سێسەد مزگەوتی دروستکردووە، مزگەوتەکانیش بەشێکی پەیوەندی بەپروپاگەندەی خۆیانەوە هەیە، من تەسەورم وانیە ئەو مزگەوتانەی دروستنەکردایە، خەڵك وازی بهێنایە لەموسڵمانێتی، خەڵك لەماڵی خۆشیا نوێژ بکات هەر موسڵمانە، لەبەرئەوە یەکگرتوو نە خزمەتەکانی پەیوەندی بەبەدیهێنانی خواستی خەڵکەوە هەیە، نە هیچ دەستکەوتێکی سیاسی لەبەدیهێنانی مافەکانی ئێمە هەبووە، ئەشهەدوبیلا لەهەموو کۆبونەوەیەکدا مافی لەیەکێتیو پارتی زیاتر داواکردووە، ئەرزی داواکردوە، خانوی داواکردووە، موچەی داواکردووە، بودجەی مانگانەی داواکردووە، کە هاتۆتە سەر پەرلەمانی عێراقو وەزارەتەکان داوای کورسی زۆرتری کردوەوە.

دێمـه سـەر ئێمـەو پـارتی، یـا حزبـەکانی تـرو ئایدیۆلۆژیـەکان، ناکۆکیمـان کامانـەن، بـەڵێ ناکۆکیمـان هەیـە، جیـاوازی بیرکردنـەوەمان هەیـە، جیهـانبینی جیاوازیشمان هەیە، بـەڵام ڕێبـازی سیباسـی سـەرکردایەتی ئێستا لەوەدایـە کـە هەموو ئەو ناکۆکیانە دەخاتەلاوەو ئەرکە سەرەکیەکان دەخاتە بەرچاوی خۆیو لەسەر بەدیهێنانی ئەرکە سەرەکیەکان یەکدەگرێ، یـەکگرتنی پێشومان جیـاواز بوو، یەکگرتنی ئێستامان جیایەو هەلومـەرجی سیاسـیش وا بمێنێتـەوە، دورنیـە دوای چوار ساڵی تریش هەر بەیەکگرتوویی بمێنینەوە، بۆئەوەی کە بتوانین باقی ئامانجە بەدینەهاتوەکانمان بەدیبهێنین، بۆیە ئەوە هەڵەیـەکی گەورەیـە نـاکۆکی ئایدیۆلۆژی زاڵ بکەین بەسەر ئەرکە نیشتمانی، نەتەوەیی، سیاسیو دیموکراسیە گشتیە هاوبەشەکانی سەرشانی هەموولایەکمان.

**کامەران عەلی:** من مولاحەزەم هەیە لەڕێی ئەو پرسیارەی کـاك دڵشاد، کـە ئاڕاسـتەی جـەنابتی کـرد، کـە ئـەو لیـستانەی تـر بـۆ نەهاتونەتـە نـاو لیـستی هاوپەیمانی کوردستـان، بـەڕێزت وتـت کـە ئەوانـە لـەرابردوودا دەژیـن، بـەس مـن مولاحەزە دەکـەم خیتـابی تـۆ لـەرابردوودا دەژیـت، مقومـاتو مکونـاتی خیتـابی هەمووی رابردووە، مولاحەزەم کردووە کاتـێ وەڵامـی پرسیارەکان دەدەیتـەوە، هەمووی باسـی رابـردووە، لەکاتێکدا لـەبازاڕی دیموکراسـیدا ئـەوەی زۆر گرنگـە قبـوڵکردنی رای جیـاوازەو نەخنکانـدنی هـیچ دەنگێکـی جیـاواز بـەناوی مێـژوی دینیەوە، مێژووی نەتەوەییەوە، ئەمانە هـەمووی گـرنگن، بـەڵام گـرنگتر لەمانـە، ئەمانە هەمووی بۆئەوەیە کـە دواجـار زەمینەیـەك دروسـت بـێ کـە خزمـەتی رای جیـاوازو دەنگـی جیـاواز بکرێـت، بـەرای مـن یـەکێ لەبنـەما سـەرەکیەکانی دیموکراسـی عەدالـەت دابەشـکردنی یەکـەم دەسـەڵات، دووەم ئـابوری، سـێیەم ئـەکادیمیاو مەسـەلەی مەعریفـەو خوێنـدن. کێـشەی گەورەیـە بـەناوی شەهیدەکانەوە ئێمە ڕێزی زۆرمان هەیـە بـۆ شـەهیدەکان، ئـەم ئەزمونـەی ئێمـە هەمووی هی شەهیدەکانە، بەڵام بەناوی شەهیدەکانەوە تـۆ هـەموو زیندووەکانت کوشت، کاتێ تۆ خزمـەت بەشـەهیدەکان دەکـەی، ئێستا خزمـەتی زینـدووەکانی بکەیت، گەندەڵی نەهێڵی، گرنگ یەك لیستی نیە، گـرنگ یـەك هەڵوێستییە، ئایـا هەموو لیستەکان دوایی دەتوانن یەك هەڵوێستیان هەبێ؟ ئەمە زۆر گرنگە، بـەڵام هەموو شتەکان قۆرخ کراون.

**مەلابەختیار:** بەراستی زۆرم پێخۆشە یەکەم جەنابت بیری ئازادی خۆشت وت، دووەمیش ئازایانە قسەی خۆت کرد، من تەقدیرم هەیە بۆ قسەکانتو هیوادارم وەلامیشت دەدەمەوە، گوێ بگریو بتوانین هەردووکمان هەقیقەت چیە، سەرەنجام بینەری ئازیز حوکممان لەسەر بدات. تێناگەم تۆ کاتێ من باسی دیموکراسیو مۆدێرنێتە دەکەم، ولاتێکی کلۆلی وەکو ئێمە نە دیموکراسی دیوە، نە مۆدێرنەی دیوەو نە هێزی بزوێنەری مێژووی دیوە بچنە ناو مێژوو، کە ئەو خیتابە بەرابردوو بزانی تێناگەم ئیتر چۆن بەرگری لەیەکگرتوو یا لەهێزە ئیسلامیەکان دەکەی، کە ئەوانە خیتابیان لەهەزاروچوارسەدساڵ لەمەوبەرە، من دەڵێم دیموکراسیو مۆدێرنێتە تەجاوزی دەقەکانی رابردووە، بۆ ئەم دنیایە، ئەسڵەن چارەکە سەعاتی ئەوەڵی بەرنامەکەمان قسەکردن بوو لەسەر شتە تیۆریەکانی ئەم دنیایەو تێپەڕینی هەموو کاریگەریەکانی دنیای رابردوو، یانی من دەمەوێ بەتۆ بڵێمو بەبینەری ئازیز بڵێم: دنیایەکی دیموکراسی بەڕێوەیە کە هەموومان دەبێ بێینە ناو ئەم دنیایە کە لەناویا نین، تۆ بەچ بەڵگەیەك من دەبەیتەوە رابردوو؟ کاکە من لەرابردوودا نیم، زۆریش تەجاوزی رابردووم کردووەو هەموو هەوڵەکانیشم بۆئەوەیە کە جەنابتو خەڵکی تریش تەجاوزی رابردوو بکەنو هیوادارم وردبیتەوە لەم مەسەلەیە، قبوڵکردنی بەرامبەر، ئێمە نەمانوتووە یەکگرتو بۆی نیە خۆی هەڵبژێرێ، نەمانوتوە حزبەکانی تری دەرەوەی هاوپەیمانی بۆیان نیە خۆیان هەڵبژێرن، لیستیان هەیە، پروپاگەندەیان هەیە، ئیشی خۆیان دەکەنو ئەوەی روشیداوە لەدهۆك، لەزاخۆ، قبوڵمان نەبوو لەناوچەی ئێمە روینەداوە، تۆ بۆچی یەخەمان دەگری، بەپێچەوانەوە ئەو سەعاتەی کە ئەوە رویداوە ئیحتیاتی خۆمان کردووە کە هیچ کەسێك نەتوانێ بەهیچ بیانویەك بەرامبەر بەبچوکترین بارەگای یەکگرتو، یا هیچ لایەکی تر ئەم کارە بکات، لەبەرئەوە ئەو کارە کە کراوە ئێمە نین، کە دەڵێی ئازادی ئەوە ئازادییە، ئەوە فەرموو تەلەفزیۆنی یەکگرتوو برۆ گوێی لێبگرە بزانە لەم هەفتەیەدا، لەدوو هەفتەی رابردوودا، چ بیروڕایەکیان هەیە بەئازادی خۆیان دەریانبڕیوە، ئەوە تەلەفزیۆنیشە خۆ ئەوە نەشرە نیە بڵێن بیدڕین، تەلەفزیۆنە لەهەموو ماڵێکی ئەم سلێمانیە هەیە، لەهەولێریش تەلەفزیۆنیان هەیەو بەئارەزوی خۆیان قسەدەکەن، ئیتر ئەوانە خیتابیان هەیە، ئێمەش خیتابمان هەیە، ئەوان رەخنە لەئێمە دەگرن، ئێمەش رەخنەیان لێدەگرین، تۆ ئەمە بۆ بەتەجاوزی ئەزانیو بەقبوڵنەکردنی دەزانی، تۆ چاوت لەتەلەفزیۆنەکانە،

مشت‌ومڕەکان دەبینی، لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێی دیموکراسی ئەوەی خۆشە کە بەرامبەرەکەت قبوڵ بکەین، ئەوە نیە قبوڵمان کردووە؟ دامان بخستایە چیت دەوت، هەر ئەمەت دەوت، دامنەخستووە دەڵێی قبوڵت نیە، دایدەخەم دەڵێی قبوڵت نیە، ئەی ڕێگایەکمان پیشاندە با جوانتر سیاسەت بکەین؟ قۆرخکردنی ئابوری، دەسەڵات، ئەکادیمیا، نازانم جەنابت زانیاریت هەیە یەکگرتوی ئیسلامی چەند پرۆژەی ئابوری لێرەو لەهەولێرو دهۆك هەیە؟ ئاگاداری لەبازاڕی ئازادی ئێرە چەند باڵەخانەیان هەیە؟ چەند بەش پرۆژەی ئابوریان هەیە؟ لەبازاڕی ئازاددا چەند ئیش دەکەن بۆخۆیان‌و سەرچاوەی ئابوریان لەکوێیەو لەکوێ نیە؟ ئەگەر ئاگاداری هەق نیە وابڵێی، ئەگەر ئاگاداریش نیت هەقە بپرسیت ئینجا بڕیار بدەی، کاکە بازاڕی کوردستان ئازادە، هەزاروپێنج سەد کۆمپانیای ئازادی لێیە لەم کوردستانە ئیش دەکەن، چەندی هی ئێمەیە؟ گریمان دووسەدی هی ئێمەیە، هی بەرپرسەکانی ئێمەیە، کە بەداخەوە نەئەبوو وابێ، یا هی (ی.ن.ك) ئەی هەزاروسێ‌سەدەکە بۆ کێیە؟ خۆ ئێمە نین، چۆن قۆرخی بازاڕمان کردووە؟ خۆمان باوەڕمان بەبازاڕی ئازاد هەیە، لەبەرئەوە قۆرخی بازاڕ نەکراوە.

سەبارەت بەمەسەلەی دەسەڵات، مەسەلەی دەسەڵات ئێمە دەیبەینەوە، هەڵبژاردنەو دەیبەینەوە، بەیانی‌و دووبەیانی یەکگرتو بیباتەوە بەشێك لەدەسەڵاتەکەی دەکەوێتەدەست، ئێمە بردومانەتەوە، دەسەڵاتەکە لەدەست ئێمەیە، جارێکی تریش بیبەینەوە دەسەڵاتەکە لەدەستی ئێمەیە، جا وەزیرێك دەدەین بەیەکگرتوو یا نایدەینێ ئەوکاتە کەیفی خۆمانە، ئەگرە یەکگرتو چوار ئەندام پەرلەمان‌و سێ وەزارەتی برد ئەوکاتە ناچاردەبین هاوپەیمانی لەگەڵ بکەین، بەڵام مادام بردنەوەی ئێمە بێ بەئارەزوی خۆمان دەیدەین یەك کورسی دەدەین، سیان دەدەین، چەند وەزارەت دەدەین، ئەوە ئێمەین بڕیاردەدەین، لەدنیاشدا ئەمە وایە، ئێستا حزبی کۆماری لەئەمریکا چەند وەزیرو چەند دەسەڵاتی داوە بەحزبی دیموکرات؟ کە بەهێزترین حزبیشن لەئەمریکا، سۆسیال دیموکرات لەئەڵمانیا دەیباتەوە چەند کورسی دەدات بەلایەنەکانی تر؟ ئەگەر خۆیان زۆرینەی پەرلەمان بەکاربهێنن، حکومەت لەخۆیان پێك دەهێنن، سەبارەت بەقۆرخکردنی ئەکادیمیا برۆ بزانە لەزانکۆی سلێمانی چەند مامۆستای یەکگرتوو دەرس دەڵێنەوە؟ چەند خوێندکار دەرس دەخوێنێ لەماجستێر؟ لەدکتۆرا دەخوێنێ؟ لەکۆلێژەکان دەخوێنن؟ ئەگەر نیانە بۆ لەهەڵبژاردنەکان ١٤٪ و ١٥٪ و ١٦٪ و ١٧٪ هەتا ٢٠٪ یش دهێنن، لەهەڵبژاردنی کۆلێژەکاندا،

لەپەیمانگاکانیش هەروایە. من تێناگەم ئەم ڕێژە دەنگە لەکوێوە هاتووە ئەگەر بەتەزکیەی حزبی نەبێو بەزەرەبینی ئایدیۆلۆژی نەبێ خوێندکارمان لەزانکۆو پەیمانگاکاندا قبوڵ نەکردبێ، خۆ ئەگەر وایە هەمووی هی خۆمان دەبوو، تۆ کە ئەندامەکان دەبینیو موناقسمان دەکاتو ڕێژەیەکیش لەدەنگەکە دەهێنێ، هەرئەوەندەی هەیە من چی لێبکەم؟

یەك لیستی گرنگ نیە، یەك هەڵوێستی گرنگە، ڕاستە هاوهەڵوێستی گرنگەو جارێ دنیای سیاسەت زۆری ماوە بزانین هەڵوێستەکان بەرەو کوێ دەڕۆنو کوردایەتی جارێ سەنگەرەکانی زۆری ماوە بتوانین بەرەنگاری بکەین، یەکتریش دەبینینەوە، ئەو لیستانەی کە لەگەڵ هاوپەیمانی کوردستان نین لەپاشەڕۆژدا هاوپەیمانێتیەکانیان، بەرژەوەندیەکانیان بۆ کوێ دەڕواتو بۆ کوێ ناڕوات.

**غەریب سەعید:** من یەکێکم لەبنەماڵەی شەهیدانی پێنجوێن، شەهید موستەفا سەعید زۆراب، بێگومان من بمانەوێو نەمانەوێ خەڵکی کوردستان لەسەر بناغەی خوێنو شەهادەت دروست بووە، شاخەوشاخمان دەکرد بەدوای شەهیدەکانمان کە تەرمەکانیان بێنینەوە، ئەو خەڵکانەی کە نەیاری ئەمڕۆی زانستو زانیاریو مەعریفەو هەستو ویستی کوردایەتین لەکوێ بوون؟ کە قفڵ لەسیاسەتو ئەقڵو فکریان درابوو تا دوای نەوەدەکان لەکوێ بوون؟ هەروەها ئەم برادەرەش دەڵێ: کاك مەلابەختیار باسی ڕابردوو دەکات، بێگومان ئێمە هەموومان لەسەر ڕابردوو دروستبووین، بەراستی خەڵکی کوردستانیش پشت بەستووە بەخۆی. دووەم پشت بەستوە بەبنەماڵەی شەهیدان، چونکە بنەماڵەی شەهیدان کۆڵەکەی دامەزرێنەری خەڵکی کوردستانو حزبە سیاسیەکانی کوردستانن، لەبەرئەوە بەراستی ئێمە وەکو بنەماڵەی شەهیدان ئەگەر دەستمان نەبێ بەپەنجەی قاچ، قاچمان نەبێ بەپەنجەی دەست، دەچین بۆ دەنگدانو دەنگ دەدەین بەهاوپەیمانی کوردستان.

**مەلابەختیار:** ئەگەر کاك غەریبو کاك دڵشاد ڕێگەم بدەن، لەوەڵامی کاك کامەران کە دەڵێ قۆرخی بازاڕتان کردووە، من هەندێ ئاماری ئابوری بدەم سەبارەت بەکەرتی تایبەت، بێگومان ئەو کەرتەیە کە لەبازاڕی ئازاددا ئازادە، تاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ (١٤١٦) پرۆژەو کارگەی جۆراوجۆری گەورەو بچوك مۆڵەتیان وەرگرتووەو کاردەکەن، هەروەها (١١٣٨) کۆمپانیای ناوخۆیی

مۆڵەتیان وەرگرتووەو لەکاردان، ژمارەی لقی (٣٣٤) کۆمپانیای بیانی لەسلێمانی نوســینگەیان کردۆتــەوەو کاردەکــەن، ئــەم کۆمپانیایانــە بەڵێندەرایــەتی، گواســتنەوە، کەرەســەی بیناســازی، تــەرانزێت، بازرگــانی گــشتیو کەرەســەی کارەباو سنوردار، هەروەها بەپێی ئامارێك زیاتر لە(٤٥٠٠٠) شوێنی کاری تایبەتی لەم هەرێمەدا هەیەو کاردەکەن، ئەمە قۆرخی بازاڕە کاکە دڵشاد.. وەکو کـابرای سلێمانی وتی خواو بێ.

**ئەمیرە محەمەد:** ئەم کاتەتان باش، حەزدەکەم بەکورتی هەندێ قسە لەسـەر قسەکانی کاك بەختیار بکەم، سەرەتا دەمەوێ ئەوەش بڵێم وەکو گەنجێکی ئـەم شارە دەنگ بەلیستی هاوپەیمانی کوردستان دەدەم، ئەمـە ڕێگـر نیـە لەبـەردەم ئەوەی کە من بڵێم نەخێر گەندەڵی نیە، نەخێر نایەکسانی نیە، کاك مەلابەختیار لەمن باشتر تێبگات لەگەندەڵی، من دەتوانم زۆر نمونە بهێنمەوە کە لەشارەکەمدا زۆر نایەکسانی هەیەو گەندەڵی هەیە، بەڵام دەشتوانم ئەوەش بڵێم کـاك بـەختیار گیـان تــەنها یــەککرتوو نیــە داوای ئــەوە دەکـات گەنــدەڵی نــەبێتو دەیکـات بەبەرنامــەی خــۆی، گــەنجانی ئــەم شــارە زۆر داوای ئــەوە دەکــەن کــە گەنــدەڵی نەمێنێ، من تەنها ئەوەندە دەڵێم: داواکارم لەدوای هەڵبـژاردن ئـەو بەڵێنانـە کـە داویانە بیبەنەسەرو گەنجان لـەوەزیاتر فـەرامۆش نـەکرێن، ڕاسـتە دەتـوانم بڵـێم کەمێك ئاوڕ لەگەنج دراوەتـەوە، بـەڵام بـەگوێرەی پێویـست نیـە خۆتـان دەزانـن دنیای پێشکەوتنو شارستانیە، زۆر سوپاستان دەکەم.

**مەلابەختیار:** من هەر ئەوەنـدە دەڵـێم، منـیش دنگـم دەخـەمـە پـاڵ دەنگـی ئـەمیرەخانو بـا سـەرۆکی حکومـەتو دامودەزگاکـان بیبـستن، ئـەوە داخـوازی پاکترین ڕۆڵەکانی ئەم گەلەی ئێمەیە، بۆیە نابێ فەرامۆشیان بکەین.

**شیرین ئەحمەد:** شـەوتان بـاش، مـن سوپاسـی کـاك بـەختیار دەکـەم کـە کەسێکی زۆر ڕۆشنبیرەو هەمیشە دەچێتە ناو گـەنجانو ورەیـان بەرزدەکاتـەوە، ئەمڕۆ نابێ گلەیی لەکەنجان بکرێت، چونکە ئاواتیان زۆرە، تکا لەگەنجان دەکەم کە دەنگ بدەن بەلیستی هاوپەیمانیو زۆر سوپاس.

**خاك:** کاك بەختیار گەنجەکانی ئێمە وەکو ئەمیرەخان لەوەدەچێ، زۆربـەیان بڕیاریانـدابێ دەس لەسـەر برینـەکانیان دابنـرێن تـاوەکو شـانزەی مـانگ، لێـرە

پرسیارێکی ترمان لادروست دەبێ، زەمانەت چییە بۆئەو بەڵێنانەی کە بەخەڵکی دەدین ئەمڕۆ، چۆن دەتوانین بڕوا بەخەڵك بهێنین کە لەدوای شانزەی مانگەوە هەموو ئەو بەڵێنانەی کە پێش پانزەی مانگ داومانە، لەشانزەی مانگەوە دەست دەکەین بەجێبەجێکردنی.

**مەلابەختیار:** من پێش ئەوەی وەڵامی ئەوە بدەمەوە، با ئامارێکی تر بخوێنمەوە، دەڵێ هیچ بۆ گەنجەکان نەکراوە، بێگومان خوێندکاری ئامادەیی هەتا دەگاتە زانکۆ هێشتا لاوەو هێشتا گەنجە، ساڵی ١٩٩١ (١٩١١٨٣) خوێندکار لەهەموو سنورەکانی ژێر دەسەڵاتی هەرێمی ئیدارەی سلێمانی وەرگیراوە، ساڵی ٢٠٠٤ (٤٢٣٢٠) خوێندکار وەرگیراوە لەکوێ؟ لەسەرەتاییو ناوەندیو دواناوەندیۆ ئامادەیی پیشەییەکانو نەوجەوانان ئەمە یەك، پەیمانگا ساڵی ١٩٩١ (٤٠٨) خوێندکار لەپەیمانگا هەبووە، ساڵی ٢٠٠٤ ئەمیرەخان، شیرین خان، ساڵی ٢٠٠٤ (٦٧٥٦) خوێندکار وەرگیراوە، یانی ئەمە ئایندەی بەڕێوەیە، زانکۆ ساڵی ١٩٩١ هیچمان نەبووە لەدوای ١٩٩٢ دروستمان کردووە تائێستا لەزانکۆی سلێمانی (١١٩٩٩) خوێندکار تا ساڵی ٢٠٠٤ هەیە جگە لەزانکۆکانی تر، ئەمانە پێم وابێ هەمووی گەنجن، لاون وەرگیراون پەروەردەدەکرێنو ئامادەدەکرێن بۆ ئایندە، هەر تەنها لەشاری سلێمانی چەند ڕێکخراوی لاوانو تەنها لەناو شاری سلێمانی لەسەردەمی حکومەتی دکتۆر بەرهەم صالح بیستوشەش یاریگای بچوکمان لەناو سلێمانی دروستکردووە، کە یاریگاکان مەلەوانگەی تیایە، بالە، باسکەو فەرشیش کراوە بەتارتان، هیچ ناحیەیەك نیە ئەمەی تیا نکرابێو هیچ قەزایەکیش نیە یەك تا دووی تیا نەکرابێ، هەتا لەخانەقینو لەکەرکوکیش چەندین یاریگا لەمانە کراوە، ئەمە سەنتەری گەنجان، ئەمە سەنتەرەکانی تر، ئەمە ئەنتەرنێت، ئەمە خزمەتگوزاریەکانی تر، ئەمانە کە بۆ گەنج کراون، بەڵام هێشتا ماوە، بەڵێ ماوە. سەبارەت بەرپرسارەکەت من دەڵێم زمانەت چی بوو کە ئێمە بووین بەپێشمەرگە، مەرگی خۆمان بوو، زەمانەت چییە بۆئەوەی ئێمە ئەوە بکەین؟ زەمانەت ئەوەیە بۆئەوەی کە ئەو میللەتە لەگەڵمان بن، ئەبێ ئەو کارە بکەین، ئەگەر ئەو میللەتە لەگەڵمان نەبێ مەرگە، مەرگێکی خراپترە لەشاخ، ئەگەر بمردینایە لەشاخ سەروەر ئەبوین، ئێستا ئەگەر میللەت لێمان هەڵگەڕێەوە سەرشۆڕئەبین، کەواتە زەمانەت ئەوەیە کە ئەبێ ڕەزامەندی ئەو میللەتە لەنێوان خۆمان بەچاکسازیو بەپاکسازیو بەخزمەتگوزاری ڕابگرینو دڵیان خۆش بکەینو ڕەخنە باشەکانیان قبوڵ بکەینو دڵتەنگیەکانیان نەهێڵین.

**خاك:** بەشێك لەخەڵك یاخود بابڵێین بۆ خۆیان ناوی خۆیان ئەنێن نیوەی کۆمەڵ لەبەرنامەی لیستی هاوپەیمانی کوردستاندا، ژن، چۆن جێگەی بۆتەوە تا چ رادەیك بایەخی پێدراوە؟

**مەلابەختیار:** جاریٚ پەرلەمانی عێراق ٢٥٪ ی ژنە کە لیستی هاوپەیمانیش کوردستان ٢٥٪ ژنە، ئەمە یەك، وەزارەتەکانی هەرێمی سلێمانی ئەبینی چەند ژنی تیایە، مودیرعامەکان دەبینی چەند ژنی تیایە، قایمقام هەتا لەدادگا ژن چۆتە دادگا ٥٠٪ فەرمانبەری سلێمانی کچو ژنن، ٥٠٪ زیاتری خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی کچو ژنن، ئەمە ئامادەکردنی نەوەیەکی وشیارە لەژنان ئەوەوەی لەئایندەدا پۆستی گەورەترو فراوانتر بەدیبهێنن، من ئاگادارم کە کۆنگرەی ئایندەی (ی.ن.ك)دا بەرنامەیەکی باش هەیە بۆئەوەی لەمەکتەبی سیاسیەوە بۆ سەرکردایەتی (ی.ن.ك) دەرگا بکرێتەوەو توانای ژن بەقەد توانای پیاو بەرزبکرێتەوە، لەمبارەیەوە ئێمە وەکو (ی.ن.ك) دەتوانم بڵێم کەمتەرخەمیش بووین، ئەشیا لەدووەمین کۆنگرەش هاندانێکی باشترمان بەبوایە، لانی کەم سێ چوار پێنج ژن دەبوو دەرچونایە، پێم وابێ لەسێیەم کۆنگرە نابێ لەشەش حەوت کەمتر دەرچن، پانزەش بێ باشترە بێتەپێشەوە، قۆناغی یەکەم یەکەمین پەرلەمانی هەڵبژێردراو ٢٥٪ ژن بێ باشە، کە دیارە ئەبێ ژن بزانن هێزە ئیسلامگەراکان، هێزە ناسیۆنالیستەکان، دژەدیموکراتیەکان، ئەم رێژەیەشیان قبوڵ نبوو، ململانێی زۆر هەبووە تا ئەمە بەدیهێنراوە، ژنان خۆیان داکۆکیان کردووە، هەم دیموکراتخوازەکان لەپەرلەمانی عێراق داکۆکی باشیان کردووە، ئەم رێژەیە لەئەوروپا بەیەکەم هەڵبژاردنو دووەم هەڵبژاردنو دەهەمین هەڵبژاردنیش نەهاتۆتەدی، یانی وڵاتێکی وەکو سویسرا لەساڵی ١٩٦٧ ژن تەواوی مافە دیموکراتیەکانی لەدەستوردا وەرگرت، بۆئەوەی خۆی تەشریح بکات، سوید تاکە وڵاتە لەدنیادا ٥٠٪ ی ژن ئەندام پەرلەمانە، فەرەنسا لەساڵی ٢٠٠٦-٢٠٠٧ هەڵبژاردنی پەرلەمان دەکات، وەکویەکی لێئەکات، ئەم دوانە، هیچ پەرلەمانێکی ئەورووپی دیموکراتی لەدنیادا نیە وەکو یەك ژنو پیاو ئەندام پەرلەمان بن، بگرە لەزۆر وڵاتدا رێژەکە زۆر کەمە، عێراق لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست یانی لێدەربکەی لەهەموو ئاسیا عێراق ئێستا پێش هەمووی کەوت لەرێژەی

ژنی ئەندام پەرلەماندا، دیارە من ئەمە دەڵێم ئەمە منەت نیە، یانی ژن زۆر لەوەزیاتر شایانێتیو ژنان دەبێ ئەم هەلومەرجە سیاسیەی کە هاتۆتەپێشەوە، زۆر باشتر لەپێشوو بقۆزنەوە بۆئەوەی کە بتوانن زۆر لەم مافە بەدیبهێنن نەك هەر لەپەرلەماندا، لەحکومەتیشدا بۆ ٢٥٪ لەپەرلەماندا بۆ ٢٥٪ لەحکومەتیشدا نەبێ؟ بۆ ٣٠٪ نەبێ خۆ قابیلیەت هەر قابیلیەتە، ژنو پیاو، کوردەواری خۆمان دەمێکە وتویەتی شێر لەبێشە بێتەدەر چ نێر چ مێ، لەبێشە هاتۆتەدەر ئەوە شێرە ئیتر، لەبەرئەوە بۆ حکومەتیشو بۆ حزبیشو بۆ پەرلەمانیشو بۆ هەموو دامودەزگاکان چ نێر چ مێ.

**خاك:** کاك بەختیار دواپەیامی بەڕێزتان لەم دیدارەدا بۆ خەڵك بەگشتیو بەتایبەت بۆ ئەو توێژانەی کە بەڕێزتان پەیوەندیەکی نزیکتان لەگەڵیاندا هەیە چییە؟

**مەلابەختیار:** من جارێ بۆ ئەو توێژەی کە لاوانە، من دڵنیام ئەمجارەیان لاوان پێویستیان بەقسەی ئێمە نیە، خۆیان خاوەن هەڵوێستی خۆیانن، خاوەن هۆشی خۆیانو ئەزمونەکانی چەند مانگی رابردوو، موناقەشەکانو مشتومڕەکان کە هەیە، دەرسێکی باشی پێوتوونو پێشم وایە، ئەمجارەیان لاوی کورد دەیسەلمێنێ کە دەتوانی لەئاستی بەرپرسیارێتی تەمەنەکەی خۆی بێ، نەتەوەکەی خۆی بێ، چارەنوسەکەی خۆی بێ، دوبەیانی هاوڵاتی دانیشتووی ئەم وڵاتە هەرکێیەك ئەبی ببە، هەر ئایدیۆلۆژیەکت هەیە ببە، بەڵام بزانە تۆ یەك چارەنوست هەیە، مزهەبیت یا نیت، حزبی ئیسلامیت یا نیت، دیموکراتیت یا نیت، چەپی یا نیت، بێلایەنی یا نیت، هەرچی ببیت، خەڵکی شاری یا دێ، دەوڵەمەندی یا فەقیر هەر رێگایەكو مەوقیعێکی کۆمەڵایەتیت هەیە، هەتە، ببە، بەڵام یەك رێگاو چارەنوس لەبەردەمتە، ئەویش ئەوەیە دەبێ سەرکەوین لەبەغدا، سەرنەکەوین لەبەغدا خەتەرە، دەستکەوت دادەبەزێ، پیلان زۆر دەبێ، پاشەکشە دەبێو ئەو ئامانجانەی کە هەشمانە چاوەڕێی بەدیهێنانیان مەکەن، چارەنوسێکمان هەیە، هەمووماں لەو چارەنوسە کۆدەبینەوە، هەموو رێگاکان دەچنەوە بۆ بانە. دەنگنەدان بە (٧٣٠) چۆن هەموو جۆگەلەکان لەشاخەکان، لەکانیاوەکان ئەڕژێنە دەریا ئێمەش هەمووماں با هەڵقوڵێین، با

بیری جیـاوازو ڕەخنـەی جیـاوازو قـسەی جیاوازمـان هـەبێ، بـەڵام بـا بێینـە نـاو دەریاکە، لەدەریاکە بتوانین ٧٣٠ شەپۆلدارتر بکەین، جوانتر بکەین، بەرهەمدارتر بکەین‌و وشکانیەکانی ئەم وڵاتەی پێ ئاو بدەینەوە، بۆیە تکا دەکەم کە من ئـەم تکایە دەکەم خۆتان دەزانن مـن لەلیـستدا نـیم ٩٨٪ی سـەرکردایەتی‌و مەکتـەبی سیاسـی یـەکێتیش لەلیـستدا نیـە، بـۆ پەرلـەمانی عێـراق، ئێمـە لەپـشتی ئـەو خیتابـەین، هەڵبـژاردنی ئـەو لیـستە بەبەشـێك لەیـەك پرۆسـەی زۆر زۆر گـەورە دەبینین، نەك دەم‌وچاو دەگـۆڕین، دەموچـاو نـاگۆڕین، پـەیام دەگـۆڕین، مێـژوو دەگۆڕین، ئامانج بەدیدەهێنین، بۆیە هیوادارم هەمو ڕێگاکان بەرەو بانـە بـڕوات‌و هـەموو جۆگـەکان بڕژێنـە نـاو دەریاکـەوەو سـەرەنجام ٧٣٠ نابـێ لـەم ڕێژەیـە بەڕێژەی تەناسوبی ئاڵوگۆڕەکانی ئایندەی پەرلـەمانی عێـراق نابـێ، هاوپـەیمانی کوردسـتان لـەو ڕێژەیـە کـەمتر بهێنـێ‌و دەبـێ زۆرتـر بێـنین، زۆر باشـتر دەبـێ‌و هیوادارم ڕۆژی ١٢/١٥ لەهەشتی بەیانیەوە تا ئەوکاتـەی سندوقەکانی دەنگدان دادەخرێ، کوڕانی کوردەواری، کچانی کـوردەواری، ژنـان‌و پیـاوانی کـوردەواری، هەرهەمووەمان بزانین ڕۆحی پاکی شەهیدان سـەیرمان دەکـات، ئاینـدە سـەیرمان دەکـات، پلانـەکانی ئەملاوئـەولامان هێـشتا مـاون، دوژمنـان حەزدەکـەن دەنگنەدەین، دە ئێوەش بەدەنگی خۆتان دڵی ئەوانـە خـۆش بکـەن کـە دەنگـی ئێوەیان خۆش دەوێ‌و جەرگی ئەوانەش ببڕن کە دەنگی ئێوەیـان خـۆش نـاوێ.
زۆر سوپاس.

**خاك:** زۆر سوپاس کاك مەلابەختیار.

## مشتومڕێك لەگەڵ
## یەكگرتووی ئیسلامیدا (+)

نەوا: خۆشحاڵین لەرادیۆی نەواوە بەرنامەیەكی تایبەت بەهەردوو لیستی هاوپەیمانی كوردستان‌و یەكگرتوی ئیسلامی كوردستان، تاوتوێ بكەین، بۆ ئەم مەبەستەش میوانداری بەڕێز (سەمیر سەلیم) ئەندامی سەركردایەتی یەكگرتووی ئیسلامی كوردستان‌و لێپرسراوی مەڵبەندی یەكی یەكگرتوو كە لەستۆدیۆ ئامادەیە لەگەڵمان، هەروەها بەڕێز (مەلابەختیار) ئەندامی مەكتەبی سیاسی (ی.ن.ك)مان كردووە، كەبەتەلەفۆن لەگەڵماندایە. سەرەتای پرسیارمان رودەكەینە كاك (سەمیر سەلیم).. بەخێربێیت، وەكو لەبەرنامەكانی لیستی جەنابتان‌و لیستی هاوپەیمانی كوردستان سەرنجمان داو خوێندمانەوە، جیاوازیتان زۆر كەمە لەبەرنەاكەكانتاندا، بۆچی ئێوە بەیەك لیست دانەبەزین، لەكاتێكدا خاڵەكانتان هەمووی لەیەك نزیكن؟

سەمیر سەلیم: سەرەتا سوپاس بۆ ئەم دەرفەتە، دیارە دیاریكردنی پرۆژەو كارنامە، كۆمەڵێك ئیعتبارات‌و هۆكار دەورئەبینێ تیایدا، هەم لەجۆرپۆلەتیك‌و هەم لەهەلومەرجی تایبەتی‌و هەم لەهەلومەرجی زاتی هەر تەوژم‌و حیزبێكەوە، كە ئەبێ ئێمە دوابەدوای ئەوەی كە دەستور لەلایەن گەلی عێراقیەوە، ئیقرار كرا، بەگەلی كوردیشەوە، دیارە عێراق ئەگوازرێتەوە لەدەوڵەتێكی پۆلیسیەوە، لەدەوڵەتێكی ئەمنیەوە، لەدەوڵەتێكی ناسیۆنالیزمی قەومی عەرەبییەوە، بەرەو دەوڵەتێكی دیموكراتی‌و ئەم دەوڵەتە دیموكراتیە لەمەولا یاسا تیایدا سەروەر ئەبێ‌و هەموو رێی‌و

---

+ دیدارێكی تایبەتی رادیۆی نەوا لەگەڵ (مەلابەختیار) ئەندامی مەكتەبی سیاسی (ی.ن.ك)و (سونیر سەلیم) ئەندامی سەركردایەتی یەكگرتووی ئیسلامی كوردستان. پێش هەڵبژاردنی(٢٠٠٦).

شـوێنەکانو هـەموو مومارەسـەکردنی ژیـانی ڕۆژانـە، لەڕێگـەی یاسـاو دەستورەوە ئەبێ، کە زانیمان سوپاس بۆ خوا گەلی کورد قەزیەکەی وەکو قەزیەیەکی سیاسیەو لـەرووی بونـەوە، چۆتە دەسـتوری عێراقییـەوە و، فیدراڵیـەت چەسـپیوەو، تۆزێـك لەکـەناری مەترسـی دەربـازی بـووە، هەرچەندە ئەمە ئەوە ناگەیـەنێ کـە ئـەرکی سیاسیمان نـەمابێ، زانیمـان قەزیەکـەمان چـۆتە کـەناری ئـارامو چـۆتە نـاو پێکهاتـەی دەسـتورەوەو تەسبیت بـووە لـەناو دەسـتوردا، بیرمـان لـەوە کـردەوە کـە دابـەزینی لەمەولامان مامەڵە لەگەڵ ژیانی ڕۆژانە، چونکە لاکردنـەوە لـەژیانی ڕۆژانـە ئەگـەر لەقۆناغـەکانی رابـردوودا، موبـەریرێکی سیاسـی بوبـێ، بۆئـەوەی هاوڵاتیان مەحروم بکرێن لەخەمەکانو مافەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیـان، چ مافە تاکییەکان بێ یا مافە گشتییەکان، لەمەولا سەرەی ئەوە هاتووە کـە لایەك لـەژیانی ڕۆژانـەو مـافی تـاکی کـوردی بدرێتـەوە، بۆیـە بڕیارمـان دا بەلیستێکی سەربەخۆ دابەزینو هـەروەها تێبینـیو سـەرنجمان لەکۆمـەڵێ شت لەلیستی هاوپەیمانی، لەقۆناغی رابردوو هەبوو، چونکە ئێمە توانیمان بەشـدارییەکی سـەروەرانەو بەشـداریەکی روسـورانەی کێـشەی ڕەوای گەلەکـەمان بکـەین لەدەسـتوریکردنو بەیاسـایکردنو بـەدەربازکردنی لەقۆناغی قـەیراناوی بـەرەو کـەنارێکی ئـارام، ڕێکخـستنەکانی یـەکگرتوی ئیسلامی لەگەڵ هاوپەیمانی توانی بەشدارییەکی ژیرانـە بکـات، ئـەوە ئـەم قۆناغـە قۆنـاغی لاکردنەوەیـە، هـەم بـەقانونیکردنی مافـەکانو هـەمیش لاکردنەوە لەمافەکانی هاوڵاتیان، بۆیە ئـەو کێشەو گیروگرفتانـە لەڕێگـەی ئەنجومەنی نوێنەرایـەتی بەغداوە، بڕیارمانـدا چارەسـەرێکی بـۆ دابنـێین، چـونکە ئیـسلاح دوزو شـتی تیـا داواکـراوە، یـەك هەلومـەرجێکی زاتـیو هەلومـەرجێکی بابـەتی، ئێمـە توانیومانـە جیلێکـی پـسپۆڕو جیلێکـی پەروەردەکراو ئامادەبکەین بۆ ئیسلاح، ماوەتـەوە سـەر دەسـتکاریکردنی ئەو هەلومەرجە بابەتیەی چ زەمینەی کۆمەڵایەتی بێ، چ زەمینـەی فکـری بێـت، چ زەمینـەی ئیـداری بێـت، چ زەمینـەی ئـابوری بێـت، ماوەتـەوە دەستکاریکردنی ئەو زەمینانەو ئەو هاوکێشانە کـە گەنـدەڵیو فەسادییان بەهەرمهێناوە، دیارە گەندەڵیو فەسادەکەش ئێمە وەکو گەلی کورد مـادام بەسـەرکردە سیاسیەکانیـشەوە، بڕیارمانـدا کـە بەشـێك بـین لەدەوڵـەتی عێراقی فیدراڵ، رازی بین پێی، بـەواتای ئـەوە هاوکێشەی سیاسـی کـورد بەشێك ئەبێت لەهاوکێشەی سیاسی عێراقو، هەموو زەمینـەکانمان لەگـەڵ زەمینەکانی عێراق وردەوردە پێکەوە ژیانێك موزایکێکی تێکـەڵاو دروسـت

ئەبێ، کۆمەڵگایەکی فرە کەلتور دروست ئەبێ لەعێراقدا، پێمان باش بوو ئەم موعادەلەیە وردەوردە ئیسلاحاتێك لەم موعادەلەیەدا بکەین، بۆئەوەی هاولاتیان چی دی لەوەزیاتر ئەگەر حزبی کوردی لەقۆناغی رابردوودا نەیتوانیبێ لایەك لەمافەکانی بکاتەوە، بەهۆی ئەو ئەرکە سیاسیە زۆرانەی کە هەیبووە، قۆناغی داهاتوو قۆناغی لاکردنەوەیە لەمافەکانو بڕیارماندا بەلیستێکی سەربەخۆ دابەزین.

نەوا: کاك بەختیار جەنابت ئەڵێی چی؟ ئایا ئەو دوو لیستیە لەکاتێکدا خاڵەکان زۆر لەیەك نزیکن بوون، تۆ رەئیت چییە؟

مەلابەختیار: زۆر سوپاس بۆ ئیزگەی نەوا، گوێم لەقسەکانی کاك سەمیر سەلیم بوو، من بەش بەحاڵی خۆم بەشێوەیەکی گشتی وەڵام ئەدەمەوە، شێوە گشتییەکەشی ئەوەیە کە پێم وایە هەلومەرجی هەستیاری ئێستای ناوچەکە، جیهان، عێراقو کوردستان، هێشتا زۆری بەبەرەوە ماوە، نەك ئەم هەڵبژاردنە بەڵکو دوو سێ ئەتوانم بڵێم تا چوار هەڵبژاردنی تری بەبەرەوە ماوە، ئینسان خەڵك لەدڵەڕاوکێ سیاسیەکانی دڵنیابێو مافەکان بچەسپێنێو دڵنیابێ لەوەی کە ئەم هێزانەی لەناوچەکە، لەدەوروبەر، لەناو عێراقو هەتا ئەوانەی لەناو پرۆسەی هەڵبژاردنن، دڵنیابێ کە پێشێلی مافە سیاسیەکانمان ناکەن، یا دەستور پێشێل ناکەن، یا لەسەر دەستور هەڵناگەڕێنەوە، چونکە کاك (سەمیر) وەکو من باش باش ئەزانێ چەند مانگێك نوسینی دەستور دواکەوت، لەسەر چی دواکەوت؟ لەسەرئەوەی مافە دیموکراتیەکان قبوڵ نەدەکرا، مافە نەتەوایەتیەکانی ئێمە قبوڵ نەدەکرا، ململانێیەکی سەختو دژوار لەنێوان ئێمە وەکو هاوپەیمانی کوردستانو شیعەکان، سونیەکان، ناسیۆنالیستەکان هەبوو، ئەوانەی کە بەئاسانی ناتوانن ببن بەدیموکراتی، ئەمە مەسەلەیەکە ئەبێ بیزانین ئەمە یەك، بۆیە من پێم وایە هێشتا زەمەنێکی زۆرمان بەبەرەوە ماوە، بەیەکەوە سیاسەت بکەینو ئەرکی هاوبەش رابپەڕێنینو، وا بکەین کە قۆناغ بەقۆناغ میللەتەکەمان لەخەم برەخسێنین، کە لەخەم رەخسا، ئەرکە دەستوریەکەمان لەناوچەکە، لەجیهان، لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا چەسپا، ئەوکاتە رەنگە بواری ململانێیەکی ئازادترو باشتر بۆ هەموومان برەخسێ، کە بتوانین ئەو ئەرکانە راپەڕێنین، ئەگینا ئێمەش وەکو (ی.ن.ك) قسەمان زۆرە، هەڵوێستی جیاوازمان زۆرەو ئامانجی ستراتیژی جیاوازمان هەیە، فەلسەفەی جیاوازمان هەیە، رەخنی جیاوازیشمان هەیە،

بەڵام هەموو ئەو ئامانجانەمان کردووە بەقوربانی قۆناغەکە، دەستامان لێهەڵگرتووەو گیانی لیستی هاوبەشمان بەسەر خۆماندا زاڵکردووەو ئەمەشمان پێباشتر بوو، دووەم من پێم وانیە هەڤاڵانی یەکگرتوو چ ئەو پرۆژەیەی کە پێشکەشیان کردووەو چ ئەو قسانەی کە دەیکەن، بۆ مەسەلە سیاسیەکان وەرچەرخانێك، یا گۆڕانکاریەکی گەورەیان لەخیتابی سیاسی کوردایەتی بەدیهێنابێ، هەتا پاساوی جیابونەوەیان بەهێز بێ، من ناتوانم ڕێ لەیەکگرتوو بگرم کە خۆیان سەربەخۆ دابەزیون، ئەمە مافێکی ئازادی خۆیانە، خۆیان بڕیاری ئەوەیان داوە، پیرۆزیان بێ، بەڵام قسە لەسەرئەوەیە ئایە ئەوان توانیویانە شتێکی زۆر جیاواز بڵێن‌و ئەوەی ئەیڵێن قابیلی موناقەشەیە یا قابیلی موناقەشە نیە؟ ئەوە مەسەلەکانە.

تێبینیەکانیشم لەسەر قسەکانی ئەوەیە کە: من نەمزانی جیۆپۆلەتیك بۆ هاتە ناو باسەکەی، یانی بابەتی هەڵبژاردن پەیوەندی بەسەر جیۆپۆلەتیك‌و ئەوانەوە چی بوو؟ دووەم شت ئەوەیە جەنابی ئەڵێ زانیمان کێشەی کورد لەدەستوردا چەسپیوە بۆیە ئێمە بڕیارماندا بەسەربەخۆ دابەزین، یەکەم کێشەی کورد نەچەسپیوە، دەستورەکە خۆشی جارێکی کە پەرلەمانی عێراق لەئایندەدا قسەی لەسەرئەکات، بۆئەوەی بیکات بەدەستوری هەمیشەیی یا نەیکات، دووەم پەنجاودوو مادەی هەڵپەسێردراو لەناو دەستورەکەدا هەیە، دەبێ لەپەرلەمانی ئایندەی عێراقدا یاسای بۆ دابڕێژرێ، کێ یاسا دائەڕێژێ؟ ئەوانەی کە ئەچنە پەرلەمان دایئەڕێژن، کێ دەوری ئەبێ؟ زۆرینەو کەمینە دەوری ئەبێ، زۆورینە ئەتوانێ بەئاڕاستەی خۆی یاسا دابڕێژێ، کەمینە ئەگەر بەرپەرچیشی بداتەوە ناتوانێ بیگۆڕێ، مەترسی لێرەیە، هێشتا پەنجاو دوو مادە ماوە یاسای بۆ دابڕێژێ‌و دەستکەوتەکان دەڵەمەیە، دەستکەوتەکان نەچەسپیون، یانی پەرلەمان ئەتوانێ موناقەشە لەسەر دەستورەکە بکات، سەرلەنوێ بڕیاری لەسەربداتەوە، بۆیە جارێ کێشەی کورد لێی دڵنیا نین، نە لەئیقلیمدا لێی دڵنیاین، نە لەناو عێراقدا لێی دڵنیاین‌و هەتا دەستکەوتەکانیش کە بەخەبات‌و قوربانی خۆمان لە چەند ساڵێ ڕابردوو بەدیمان هێناوە، لەوانەش دڵنیا نین جەنابی! فەرمووی تێبینیمان لەسەر لیستی هاوپەیمانی هەبوو بۆیە بەسەربەخۆ دابەزین، من

پێم وابێ ئەوان بۆیان هەیە تێبینیان لەسەر حزبێك لەحزبەکانی هاوپەیمانی هەبێ، تێبینییان لەسەر دەسەڵاتێك لەدەسەڵاتەکانی هاوپەیمانی هەبێ، بەڵام ئەوان لەسەر هاوپەیمانی کوردستان بەگشتی حوکم بدەن قورسە، ئێستا هاوپەیمانی لیستێکە بۆ هەڵبژاردن، خۆ هاوپەیمانی کوردستان دەسەڵات نییە، تا لەسەر تەواوی لیستەکە قسەیان هەبێ، ئەگەر تێبینییان لەسەر دەسەڵاتی یەکێتیی هەیە، ئەوە هەقی خۆیانە، تێبینییان لەسەر دەسەڵاتی پارتی هەیە، ئەوەش هەقی خۆیانە، بەڵام ئەوان شەش مانگ لەمەوبەر، ئەوە خیتابەکانیان، ئەوە ئاخاوتنی بەپرسەکانیان لەبەڕێز سکرتێری یەکگرتووەوە تا ئەگاتە دوا ئەندامی مەکتەبی سیاسیان، کە وەسفی هاوپەیمانی کوردستان‌و سیاسەتی هاوپەیمانی کوردستان ئەکەن ئەڵێن: ئەمە واجبی شەرعییە، واجبی دینییە، واجبی نیشتمانیە‌و هەموو شتێکە، یانی بەشێوەیەك وەسفی لیستی هاوپەیمانی کوردستان ئەکەن، بەراستی من بەشبەحاڵی خۆم لەهیچ بەرپرسێکی تری حزبەکانی ترم نەبیستووە هەم ئاڕاستەیەکی شەرعی بداتێ، هەم ئاڕاستەیەکی دینی بداتێ، هەم ئاڕاستەیەکی نیشتمانی بداتێ.

نەوا: ئایا پێت وانیە جیابونەوەو پێکنەهێنانی یەك لیست، قورسایی لاینەکان لەکوردستان دەردەخات، خۆ ئەگەر جیاش بن دەتوانن لەناو پەرلەمان یەکدەنگ بن؟

مەلابەختیار: من پێم وایە ئەو وەسفەی کە ئەوان لەکاتی خۆیدا کردیان چ بۆ دەستورەکەو چ بۆ هەڵبژاردنەکەی پێشوو، زۆر زیاتر بوو لەو وەسفەی یەکێتیی یا پارتی یا لایەنەکانی تر ئەیانکرد، ئێستا بەپێچەوانەوە کەوتۆتەوەو بەجۆرێکی تر جیابوونەتەوە، جەنابی ئەڵێ ئێمە جیلێکمان بۆ ئیسلاح پەروەردەکردوە کە بتوانێ گوەندەڵیی چارەسەربکات، قسەکردن لەسەر گەندەڵیی ئێستا وەختی نیە ، بەڵام لێرەشەوە، وەڵامی ئەو پرسیارەی تۆش ئەدەمەوە، من پێم وایە ئەگەر یەکگرتوو نیازی وایە هاوشانی لیستی هاوپەیمانی کوردستان دەنگ بۆ پەرلەمانی عێراق زیاد بکات خۆ نابێ لەم حاڵەتەدا یەکگرتوو قسە بەیەکێتیی‌و پارتی بڵێت کە گوایە ئەمانە گەندەڵن، ئەمانە ناتوانن ئەرکەکان جێبەجێ بکەن‌و

ڕەخنــەمان زۆرە لەســەریان بۆیــە جیابوینەتــەوە، لــەخیتابو دیــداری بەرپرسەکانیان کە لەوماوەیەدا ئەیکەنو بڵاوکراوە ناوخۆییەکانیان کە لەم ماوەیەدا بڵاویــان کردۆتــەوە، هــەمووی بۆئەوەیــە کــە لیستی هاوپــەیمانی کوردستان بەتایبــەتی یــەکێتیی‌و پــارتی لــەناو خەڵکدا لاواز بکــەن، هــەتا کەمترین دەنگ بێنن لەناو خەڵکدا، خۆشیان دەنگی زۆرتــر بهێــنن، ئەگــەر ئەوان ئەیانەوێ بەئێمەو ئەوان کورسیەکان زیاد بکەین، ئەی بــۆ ئەیانــەوێ لەناو ڕای گشتی گەلەکەمان یەکێتیی‌و پارتی بچوك بکەنــەوەو لەبەرچــاوی ڕای خەڵکەکــە وای پــشان بــدەن کــە ئەمانــە هەڵــەیان زۆرە، گەنــدەڵییان زۆرەو ناتوانن ئــەمان کێشەکان چارەســەر بکــەن. دوای ئــەوە کــێ جیلــی دروســت کــردووە بــۆ ئیــسلاح؟ بەڕاســتی دروســتکردنی جیلێکــی تــازە بــۆ ئیسلاح‌و بۆ نەهێشتنی گەندەڵیی، ئەم قسەیە ئاسان نییــە ئینــسان قــوتی بدات، جارێ لەعێراقدا نەك جیلێك بۆ ئیسلاح دروســت نــەبووە، لەعێراقــدا ٩٥٪ی فەساد هەیە، لەباقی ناوچەکان (جگە لەکوردســتان) بەپێــچەوانەوە ئێستا جیل ونە، ئێستا خیتاب ونــە، ئێــستا پــرۆژە ونــە، ئێــستا بەهــەموو هێزی حکومەتی عێراق ناتوانێ بنکەیەك لەبنکەکانی ئابوریی‌و کۆمەڵایــەتی دابنێ. ئیسلاحات لەهاوکێشەی سیاسی بکرێ، مــن پــێم وایــە ئاســان نیــە لایەك بەم هەڵوێستەی کە ئێستا هەیەتی، بتوانێ ئیسلاحات لەهاوکێــشەی سیاسیدا بکات، بگرە بەپێچەوانەوە، کاردانەوەی ڕای گشتی لەناو خــەڵکدا ڕونــە کــە جیابونــەوەی لیــستی یــەکگرتوو ئاســان نییــە بــۆ ڕای گــشتی گەلەکەمان قوت بچێ‌و ئەمە ئەبێتە مایەی زیان لەباتی قــازانج. مەســەلەی قۆناغی داهاتوو گوایــە قۆنــاغی لاکردنەوەیــە لەمافــەکان، بۆیــە یــەکگرتوو جیابۆتەوە کە قۆناغێك لەپێــشمانەوەیە هــەتا لــەم قۆناغــە لایــەکی زیــاتر لەمافەکانی خەڵك‌و لەمافەکانی ڕای گشتی ئەکاتــەوە، مــن تەســەورم وایــە بەڕاســتی ئەمــە غــەدرە بەهــەق هــەموو ئــەو مافانــەی کــە لەکوردســتان بەدیهاتووە بۆ میللەتەکەمان، بۆ شارەکانمان، بۆ لادێکانمان،و هەموو ئــەو دەســتکەوتانە لەمافــە یاســاییەکان، لەمافــە سیاســیەکان، لەمافــە دەستوریەکان، لەمافــە کۆمەڵایەتیــەکان، لەمرچــەی خــەڵك لەهــەموو ئــەو خزمەتگوزاریانــەی کــە لەکوردســتاندا هەیــە، ئــەوە هــەموو وەزارەتــەکانی هەولێرو سلێمانی هەن، هــەموو ئامارەکــان هــەن، هــەمو بودجــەکان هــەن،

چەند ماف بەدیهاتووەو هاولاتی ئێستا بەشایەتی دۆستو دوژمن کە دێن کوردستان ئەبینن بەراوردی لەگەڵ ناوچەکانی تری عێراقدا دەکەن هەموویان ئەڵێن خۆزگە عێراق وەکو کوردستان بێو سلێمانیش دەکەن بەیەکێ لەمۆدە جوانەکان کە عێراق لەسەر قیاسی سلێمانی بینابکرێ.

نەوا: کاك سەمیر، ئێوە لەهەڵبژاردنی رابردوودا لەگەڵ لیستی هاوپەیمانی کوردستان دابەزین، ئەوە دوو هەڵبژاردن لەماوی ساڵێکدا ئەو ئیدارەیە ئەگەر گەندەڵ بێ، هەر پیشتریش گەندەڵ بووە، بۆچی پێشتر کە بەو لیستە دابەزین واتان باس نەدەکردو ئێستا باس لەوە دەکەن کە ئیدارەکە گەندەڵە؟ لەهەمانکاتدا باس لەوە دەکەن وەکو کاك مەلابەختیار لەقسەکانیدا باسی کرد، ئێوە باسی شەڕی ئوحودو شتی وا دەکەن، ئایا بەشەڕی ئوحود گەندەڵی کۆتایی پێدێ؟ یان یەکگرتووی ئیسلامی دەنگ دێنێ بۆ ئەو بەرنامەیەی کە هەیەتی؟

سەمیر سەلیم: جارێ باسی ئەو ئوحودو شتە لەناو فەرهەنگی ئێمەو کەلتوری ئێمەدا ئەسڵو ئەساسی نیە، ئەوە کە کراوە، چونکە ئوحود جەنگێکی براوە نەبووە هەتاوەکو خەڵك بیکاتە سەرمەشق، لەو بابەتانە ئەوە ئێمە رونکردنەوەمان لەسەر دەرکردووەو ئیدانەی ئەو شتەمان کردووەو ئەسڵەن رەبتی بەئێمەوە نیە، بگرە رکەبەرەکانمانو بەرامبەرەکانمان ئەوەیان بەناوی ئێمەوە کردووە، هەردەستێك هەیە ئەوە کەیفی خۆیەتی، ئەوە بەنیسبەت ئەوەوە، بەنیسبەت پرسیارەکەی جەنابتەوە، کۆمەڵێ تێبینیم لەسەر قسەکانی کاك مەلابەختیار هەیە، کاك مەلابەختیار ئایا بۆ لەقۆناغی پێشوودا من عەرزم کردن قۆناغی پێشوو قۆناغی نوسینەوەی دەستور بوو، قۆناغی ئیقرارکردنی دەستور بوو، قۆناغی جێکردنەوەی مافەکانمان بوو لەناو دەستوردا، بەدەستوریکردنی مافەکانی گەلی کورد بوو، ئێمە لەهەموو مافێك، لەهەموو کەموکورییەك، لەهەموو سیاسەتێك چاوپۆشیمان کرد، لەبەرخاتری چارەنوسی میللەتەکەمان، لەبەرخاتری قەزیەی میللەتەکەمان چاوپۆشیمان کرد لەو سیاسەتە هەلانە، چاوپۆشیمان کرد لەو گەندەڵییانە، چاوپۆشیمان کرد لەکۆمەڵێ ئیجرائاتی ناتەندروست کە لەگۆرەپانەکەدا هەیە، ئەوە ئەبێ بەفەخر بۆ یەکگرتوو، ئەبێ بەگەورەیی بۆ یەکگرتوو، کە چاوپۆشیی کردووە لەمافەکانی خۆیو

لەسیاسەتە هەڵەکانی کە کراون لەبەرخاتری تێپەڕاندنی ئەو قۆناغە حەساسەو کە ئێمە گواستومانەتەوە، وەکو کاك مەلابەختیار ئەڵێ هێشتا قۆناغەکە زۆری ماوە، ڕاستە زۆری ماوە، بەس ئێمە ناتوانین چارەنوسی ژیانی ڕۆژانەی میللەتێك بسپێرین بەو هەڵە نموونەییانەوە کە سەرکردەکانی کوردو حزبی کوردی بیەوێ فەراهەمی بهێنێ، ناتوانین مافی هاوڵاتیان بسپێرین بەو هەلومەرجە نمونەییەوە کە هەر نایەتەدی، تەمەنمان هەمووی سەرف کرد لەپێناو ئەو هەلومەرجە، ئینجا ئەوە دیدی کاك مەلابەختیارە، هەلومەرجەکە وەك ئەڵێ زۆری بەبەرەوە ماوە، وەکو من کە لەبواری سیاسەتدا ئیش دەکەن، خوێندنەوەکان بەرەو ئیستقرار ئەچن، دەستور مادام چەسپیوە ئەسڵەن دەستوری عێراقی ڕاستە کۆمەڵێك بڕگەو مادەی ماوە کە قسەوی لەسەر بکرێ، ئێمەش لەولاوە هەلێکی ترە کە ئەمانەوێ تەوزیفی بکەین، ڕەهەندی ئیسلامی ئێمە، بوعدی ئیسلامی ئێمە تەوزیفی بکەین لەخزمەتی دۆزی ڕەوای گەلەکەمان بتوانین پشتیوانی زیاتر، بتوانن دەنگی زیاتر بۆ گەلەکەمان لەئەنجومەنی نوێنەرایەتی عێراقدا دابین بکەین، چونکە ئەوە ئێمە بووین توانیمان ڕەزامەندی بەحزبی ئیسلامی دەربڕین بێ پشتیوانی لەفیدراڵیەت بکات، لەکاتێکدا لیستی هاوپەیمانی تەحالوفی لەگەڵ ئیئتیلافی شیعیدا هەبوو لەگەڵ مەجلسی ئەعلا، لەگەڵ حیزبی دەعوە، لەگەڵ ئەمانە هەبوو لەکاتی ئیمزاکردنی دەستوری کاتیشدا نوێنەرەکانیان چونە دەرەوە، ئێمە توانیمان حزبی ئیسلامی قەناعەت پێبهێنین بەشایەتی کام مەلابەختیار خۆشی کە لەکوردستانو خاكو گەلی کوردستان تەسرحی دا، توانیومانە وابکەین حزبی ئیسلامی پشتیوانی لەدۆزەکەمان بکات، ئێستاش پێمان وایە ئەتوانین ڕایەکی زیاتر، دەنگێکی زیاتر، پشتیوانیەکی زیاتر بێن بۆ ئەو دەنگە، چونکە ئەوەندەی گوتاری ئێمە ئەتوانێ تەئسیر لەوان بکات، وەك ئەڵێ ئێمە لەمەداخلو لەمەنافسی فکری ئەوانو دیدی ئەوانو تێڕوانینو خیتابی ئەواندا ئەیزانین، پێئەچێ لایەنێکی تر نەتوانێ، ئێمە ئەمانەوێ بوعدی ئیسلامی تەوزیف بکەین لەپێناو بەهێزکردنی نوێنەرایەتی کورد لەبەغدادا، یەکێ لەکێشەکانی کە تێبینیەکانمان لەسەر هاوپەیمانی هەمانبووە، ئەوەبووە، لەبەغدادا هاوپەیمانێتی هەر یەکێتییو

پارتی خۆیان کردویانە، هیچ حزبێك مافی دەسەڵاتدارێتی نەبووە، ئەویش موشارەکەی پێنەکراوە، پرس‌ورای پێنەکراوە، لەم ئەخیرەوە بەعزە شتێك کراوە کە ئەویش وەك ئەڵێ جێی لە پەراوێزدا مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، ئێمە ئەمانتوانی دەورێکی زۆرتر، باشتر ببینین ئەگەر پێمان بدرایە، بەڵام ئەو رۆڵەش کە نەدراوە هەقێکی سیاسی خۆمانە کەسبی وەلا بکەین، کەسبی دەنگ بکەن بۆ پشتیوانیکردنی قەزیەی رەوای گەلەکەمان، جیۆپۆلەتیك بۆ هاتە ناو مەسەلەکەوە؟ جیۆپۆلەتیك لەقەزیەی داڕشتنی پرۆگرامدا هاتۆتە ناو باسەکەوە، کاتێك هەر حزبێك پرۆگرامی سیاسی، مەشروعی سیاسی تەرح بکات، هەلومەرجی بابەتی زائیدەن ئیمکانیەتی زاتتی ئەو حزبە دەورئەبینێ لەداڕشتنی پرۆگرام‌و کارنامەکەیدا، یەکێ لەوانە ئێمە، جوگرافیای سیاسی ئێمە، ئێستا بەنیسبەت عێراقەوە وەکو شوێنێك کە بەشێکە لەموعادەلەی عێراقی دەورئەبینێ لەدیاریکردنی ئامانجە سیاسیەکان، لەدیاریکردنی ئەرکە سیاسیەکانی هەر حزبێك بەدەر لەجیاوازی ئایدیۆلۆژیا.

نەوا: ببورە، لەخاڵی هەشتەمی بەرنامەکەی ئێوەدا هەندێ ناکۆکی هەیە لەگەڵ خاڵەکانی دیکەدا، مەسەلەن ئێوە باس لەوە دەکەن دەڵێن لیستی یەککگرتوو کاردەکات بۆ پارێزگاریکردن لەماف‌و دەستکەوتە دەستوریەکانی گەلی کوردستان‌و ماف‌و ئازادییە گشتیەکان‌و شوناسی ئیسلامی زۆرینەی کۆمەڵگا لەکاتی رێکخستنی ئەو مادانەی دەستور کە دەبێ بەپێی یاسا دیاری بکرێن‌و رێکبخرێن، لێرەدا باسی شوناسی ئیسلامی دەکرێ، یانی بەوپێیە لەکاتی رێکخستنەوەی مادەکانی دەستوردا مامەڵە لەگەڵ ئەو برگانە دەکرێ کە لەدەستوردا هێشتا نەچەسپیوە، مانای وایە لێرە بۆچونی لیستی هاوپەیمانی، بۆچونی داخوازییەکانی کورد لەگەڵ ئەم داواکاریەی ئێوە یەکناگرێتەوە، ئەمە چۆن لێك ئەدەیتەوە؟

سەمیر سەلیم: شوناسی ئیسشلامی تەبیعی لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی سەردەمدایە، شوناسی ئیسلامی بەو فۆرم‌و بەو پرۆژە تەقلیدیە مێژوییەوە نیە کە لەرابردوودا تەرح کراوە، بویستڕێ تەفسیری شوناسی ئیسلامی بەوەبکرێ، ئێمە شوناسی ئیسلامی خۆمان لەگەڵ مافەکانی گەلی کورد

پێشتر خستووە، رازی نابین تەرحێکی ئیسلامی غەیرە کوردی با بڵێین بێت مەرجەعیەتی شیعە بێ یا سوننیەکان بێ بیانەوێ شوناسێکی ئیسلامی فەرز بکەن، بەڵام ناسنامەی گەلی کورد یا شوناسی کوردی ئێمە بسڕنەوە، ئێمە هەردوکیمان تێکەڵ کردووە، بەواتا گوتارێکە بۆ عەرەبە ئیسلامیەکانی تر، ئێمە رازی نابین لەسەر حسابی ئیسلامیبوون شوناسی کوردی ئێمە بسڕێتەوە، مافی گەلی کورد فەرامۆش بکرێتو هەروەها بۆ ناسیۆنالیزمی کوردیش لەبەرخاتری مافەکانی گەلی کورد، رازی نابین شوناسی ئیسلامی لەناوببرێ.

ەوا: کاک بەختیار جەنابت لەسەر ئەو شتانە ئەڵێی چی؟

ەلابەختیار: قۆناغی نوسینی دەستور تەواونەبووە، کاک سەمیرو حزبەکەی تەحەمولی سیاسی نیە، ئەگینا قۆناغی نوسینی دەستور لەوڵاتاندا بەپەنجا ساڵیش لەخەم ناڕەخسێ، نوسینی دەستور وەکو نوسین شتێکەو، تەتبیقکردنو دانانی بنکەی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی کە دەستور لەسەری بوەستێو تەتبیق ببێ، ئەمە شتێکی ترە، دەستور هێشتا دەڵەمەیە، هێشتا ماوێتیو یەکگرتوو ناتوانێ بڵێ ئەو قۆناغە تەواو بووە، قۆناغێکی زۆر ماوەو ئەشیبینین چ قۆناغێکی سەخت لەبەردەممان ماوە تا دەستور لەم وڵاتە بچەسپێنین، لەبەرئەوە ناکرێ وا بەئاسانی لەسەری بوەستین، برادەرانی یەکگرتوو مێژوویەکی هەزارو چوارسەد ساڵەی دەسەڵاتی ئیسلامی هەبووە، قەد دەستوری دنیایی تیانەبووە، ئێستا شانازی بەهەموو ئەو مێژووەوە ئەکەن، کەچی ئێستا سەیرە، ئەڵێ قۆناغی دەستور تەواو بووە، ئەمە سەیرە بەلامەوە ئینسان تەحەمولێکی مێژوویی هەزاروچوارسەد ساڵە بکات بەبێئەوەی دەستوری دنیایی تیابووبێ، بەڵام ئێستا بەسێ مانگ قۆناغی دەستوری تەواو بووە لایان، لەلایەکی ترەوە ئەڵێ: لەمەزیاتر تەحەمولی هەلومەرج ناکەین کە هەر نایەتەدی، تەمەنمان لەسەر سەرف کردو نایەتەدی، جارێ کاکە باسی تەمەن مەکە، چونکە حزبی یەکگرتوو لەساڵی (١٩٩٤)ەوە دامەزراوە، تەحەمولی هیچیشتان نەکردووە، تەحەمولی قۆناغی سەختی خەباتو ئەرکی سەختی خەباتو قوربانیەکانی سەختی خەباتتان نەکردووە، تا بڵێی تەحەمولتان کردووە یەکگرتوو هاتوونەتە هەلومەرجێکی سیاسی

ئـازاد و ئامـادە، لەبەرئـەوە تەمـەنتان لەسـەرئەوە نەبردۆتەسـەر، ئـەوە هێزەکانی ترن کە تەمەنیان بردۆتەسـەرو تەحـەمولی ئـەوەیان کـردووە تـا ئـەم رۆژگارەیـان هێناوەتـەدیو بەشـدارییان کـردووە لەبـەدیهێنانی ئـەم رۆژگـارەو هـەر ئـەبێ تەحـەمولیش بکـەین، بۆئـەوەی هەلومـەرجی تـر بێتەدی، تەحەمولی ناکەی یانی چی؟ لەسیاسەتدا ئەڵێ هەلومەرجی ئێستا جیاواز نیە لەهەلومەرجی دەساڵ لەمەوپێش، هی دەساڵ لەمەوبەر، ئەمـە وانییـە، سـێ سـاڵ لەمەوبـەر، هەلومـەرجی جیهـانی گـۆڕا، هەلومـەرجی ناوچەیی گۆڕا، هەلومەرجی عێراقی گۆڕا، هەلومـەرجی کوردسـتانی گـۆڕا، لەبەرئـــەوە راســـتە تەمـــەنو خـــەباتمان ســـەرف کـــردووە، بـــەڵام هەلومەرجیشمان گۆڕیو هەلومەرجی گـۆڕاوی تـریش بەڕێوەیـە کـە ئـەبێ باقی تەمەنمانی بۆ سەرف بکەین، کەوابێ: بێتەحەمولی لەسیاسەت وەکـو ئەو برادەرە ئەڵێ تەحەمولمان لەوەزیاتر نیەو تەمەنمان لەسەر سەرفکرد، هەڵەیە، یەککگرتوو تەحەمولی ئـەنفالی کـرد مقاوەمـەتی نـەکرد، کیمیابـاران کراین مقاوەمەتی نەکرد، حزبێك دێهاتەکانمان هـەمووی روخـا مقاوەمـەتی نەکرد، حزبێك هەموو ئەو کارەساتانەمان بەسـەرهات مقاوەمـەتی نـەکردو تەحەمولی کرد، بۆچی ئێستا تەحەمولی ئەم هەلومەرجـە سیاسیە ناکـات؟ وا بەپەلە بڕیاری دا لەلیستی هاوپەیمانی کوردستان جیابێتەوە؟ یانی ئـەو هەموو تەحەمولـەی سـەردەمی ئـەمانی کـورد بـۆ؟ ئـەم بێتەحەمولییـەی سـەردەمی هاوپـەیمانی کوردسـتانی بـۆ؟ ئەمـە پرسـیارە جگـە لـەوە مەسـەلەکە ئـەوە نیـە تەحـەمولی دۆخەکـەیان نـەکردووە، ئەوانـە لەسـەر کورسی موناقەشەیان بوو لەگەڵ لیستی هاوپـەیمانی کوردسـتان، کورسـی زۆرتریان پێبدرایە ئێستا ئەم قسەیەیان نەئەکرد، لەباتی حەوت کورسـی، نـۆ کورسـیمان پێیـان بدایـە یانزەمـان پێبدانایـە ئێسـتا ئـەم قسـەیەیان نەئەبوو، بەپێچەوانەوە قسەیان ئەکرد، ئەیانووت: بەشداریکردن لەلیـستی هاوپەیمانی کوردستان شەرعە، ئاینە، دینـە، موقەدەسـاتەو وایـە و وایـە، کە کورسیەکان کـەم دەستکەوت، دوایـی ئەچن پاسـاو ئەهێننـەوەو بـەم جۆرە قسە ئەکەن کە ئێستا قـسەی لەسـەرئەکەن، وەکـو چۆن لەلیـستی هاوپەیمانی پێشوو بەجۆرێکی تر قسەیان ئـەکرد، چـونکە بەکورسـیەکان رازی بوون، ئێستا بەکورسیەکان رازی نەبوون بەجۆرێکی تـر قـسەئەکەن،

ئەمـە لەلایـەك، لەلایـەكی تـریش ئـەڵێ ئێمـە ئەمانـەوێ بوعدی ئیـسلامی لەبەغدا تەوزیف بكەین، كاكە بوعدی ئیسلامی جۆری زۆرە، لەبەغداد ئێمە گرفتـی گـەورەمان هەیـە كـە ئێستا ئـەبعادی ئیـسلامی جۆراوجۆر تـەرح ئەكرێتە سەرمان، بەمەش بەجۆرێكی تریش بوعدی ئیسلامی لەكوردسـتان فەرزئەكرێ بەسەرمانا.

نەوا: كاك مەلابەختیار هەقی خۆیان نیە داوای كورسی بكەن؟

مەلابەختیار: هـەقی خۆیانـە داوا بكـەن، بـەڵام هـەقیان نیـە كـە لەسـەر كورسـی جیابونەتـەوە بڵـێن وەڵـڵا ئێمـە لەسـەر دیموكراسـیو گەنـدەڵییو ئەوانـە هەڵوێـستمان وەرگرتـووە، بڵـێن بابـە كورسـیەكان كـەم بـوو بۆیـە ئـەو هەڵوێستەمان هەبوو، ئەمە هەقی خۆیانە، بەڵام پاساوی تر تێكـەڵاو بـەوە ئەكات، چونكە وای ئەوتووە كە گفتوگۆی لەگەڵ ئێمـە كـردووە، وتویـەتی كورسیەكانم كەمە.

نەوا: ئەو گفتوگۆیە لەكوێ كراوە؟

مەلابەختیار: لەهەولێر كرا، لەسلێمانی كرا.

سەمیر سەلیم: لەسلێمانی وەفەكە من بووم، ئەسڵەن كە وەختێ لەگەڵ نوێنـەری هاوپـەیمانی قـسەم كـرد وتومـە باسـی كورسـی نیـە، ئەگـەر هـەر شـەش كورسیەكەی جاری پێشوو لەسلێمانی بماندەنێ بەشداری ناكەین.

مەلابەختیار: ئاخر وانیە، ئێستا تۆ خەڵك چەواشە ئەكەیت، من خۆم دانیشتبووم تەلەفۆن لەگەڵ ئێـوە كـراوە، تەلـەفۆن لەگـەڵ كۆمـەڵی ئیسلامی كـراوە، تەلەفۆن لەگەڵ حزبی شیوعی كـراوە، ئێـوە وتتـان بـەو كورسـییانە رازی نابین.(*)

سەمیر سەلیم: وەفدی مفاوەزە من بووم لەسلێمانی لەگەڵ نوێنـەری هاوپـەیمانی كە نوێنەری (ی.ن.ك) بووە قسەم كردووە، تەحەدا ئەكەم باسی كورسـی نـەكراوە، مـن خـۆم وەفدەكـە بـووم، لەبەرئـەوە جـەنابت چەواشـەكاری ئەكەیت.

---

* بۆ ئەم مەبەستە پرسیار لە ئیسماعیل مـەحمود (لێپرسراوی پەیوەندییە نیشتمانیەكانی ی.ن.ك) كـرا، كـە نوێنـەری گفتوگـۆ بـوو لەگـەڵ لیـستی یـەككرتوو، جـەختی لەسـەرئەوە كردەوە كە بەڵێ: یەككرتوو تەنها قسەیان لەسەر زیادكردنی كورسـیەكانیان لەگفتوگۆكاندا كردووە.

مەلابەختیار: ئەی گفتوگۆت لەسەرچی کرد؟
سەمیر سەلیم: وتم ئێمە تێبینیمان لەسەر هاوپەیمانی هەیەو رازی نابین بەوجۆرە.
نەوا: تەلەفۆنمان لەگەڵدایە کاک ئەحمەد لەسلێمانی.. فەرموو..
کاک ئەحمەد: ئەم کاتەتان باش، ئەگەر یەکگرتووی ئیسلامی لەبەغداد کورسیەکانی ناخاتە پەنا کورسیەکی مەسەلەن حزبی موعارەزە بۆ کورد، ئەگەر ئەیخاتە ناو هاوپەیمانی کوردستانیەوە، من پیرۆزبایی لێئەکەمو خۆشم دەنگیان ئەدەمێ. بەڵام ئەگەر بیانەوێ تکراری صلاح الادینی ئەیوبیمان بۆ بکەنەوە لەبەرخاتری دینی ئیسلام.
سەمیر سەلیم: ئێمە بەردەوام هەموو جەماوەر دڵنیادەکەین، بەردەوام پشتیوانی لەمافە رەواکانی گەلی کورد ئەکەین، هەرگیزاوهەرگیز رازی نابین لەسەر حسابی مافەکانی گەلی کورد هیچ بریارێك، هیچ هەڵوێستێك، هیچ پرۆژەیەك تێپەرێ، لەبەرئەوە هەمیشە سەربازێکی بێئەرکو سەربازێکی ئامادەو سەربازێکی گیانلەسەردەستین لەپێناو مافەکانی گەلەکەمانداو ئەمەشمان لەپێناو مافی گەلی کورددا کردووە کە بەسەربەخۆیی دابەزیوین.
نەوا: کاک سامانمان لەگەڵدایە لەرانیەوە.. فەرموو..
کاک سامان: ئێمە قسەکانمانو دەنگمان دەخەینە پاڵ قسەکانی کاک مەلابەختیار، کە بەراستی قسەکانی هەمووی راستن.
نەوا: کاک سۆرانمان لەگەڵدایە لەسلێمانیەوە.. فەرموو..
کاک سۆران: باسی شوناسی ئیسلامی کرا، شوناسی ئیسلامی لەدەستوری عێراقیدا چەسپاوە کە دینی دەوڵەت ئیسلامە، لەبەرئەوە ئەگەر کاک مەلابەختیار بەو شوناسە رازی نییە ئەتوانێ لەبەغدا بکشێتەوەو بڵێ لەو بریارە هەڵەیە، دووەم سەبارەت بەئەقلیەتی ئەوەی کە بەیەکگرتوو ئەڵێ ئێوە هیچتان نەکردووە، هەمان ئەقڵیەت بوو، کە بەعس قسەی پێئەکرد لەگەڵ نەیارەکانی، لەبەرئەوە ئەو ئەقڵیەتە ئەقڵیەتی نیبادەکردنە.
نەوا: کاک کاروان لەهەولێرەوە.. فەرموو..
کاک کاروان: من دەڵێم بە کاک مەلابەختیار، زەمەنی ئەوە تێپەریوە جەنابت خەڵك چەواشە بکەی، من پێم وایە جەنابتان پرۆژەتان سوتاندنی مەڵبەندە، چونکە هەمان پرۆژە لەپشتی خیتابی جەنابتانەوە وەستاوە.

نەوا: کاك مەلابەختیار، لەسەر ئەو پەیوەندییانە جەنابت رات چییە؟

مەلابەختیار: من ئەڵێم ناکرێ ئێمە لەناو ئەم هەموو ئەبعادە ئیسلامیە، بوعدێکی تر بەناوی قەومی کوردییەوە بچێتە ناو کێشەکەوە، مەسەلەی دیموکراتی شتێکە پەیوەندی بە مەسەلە دنیاییەکانی ئێستاوە هەیە، ئەمە بابەتێکە موناقەشە هەڵناگرێ، ئەم ئەبعادانە هەمووی سەرلێشێواندنی خەڵکە، ئەمە یەك، دووەم بەنیسبەت ئەو برادەرەوە، کە باسی ئەوە ئەکات ئیسلام لەدەستوردا چەسپێنراوە، بەڵێ ئەمە هاوسەنگیو یەکێتی دژەکانە لەدەستوردا، ئێمە بەشێکی مەبادیئە عەلمانیو دیموکراتیەکەی خۆمانمان چەسپاندووە، هێزە ئیسلامیەکانیش بەشێکی خواستەکانیان چەسپاندووە، هەمووکەسێك باش باش ئەزانێ بەگفتوگۆیەکی گەرم ئەمە چەسپیوەو دەستەبەری دیموکراتیو مەبادئی عەلمانی لەدەستوردا زاڵترە بەسەر بیروڕاکانی تردا. هەمووی بخوێنەرەوە، هەتا ئازادی ویژدان لەدەستوردا هەیە کە ئینسان ئەتوانێ ئیماندار بێ یا نەبێ، لەبەرئەوە، ئەوەی کە لەدەستوردا چەسپاوە بەرگری لێدەکەین، مەبادئی دیموکراتیو وەدەستورەکەی کوردستانیش کە خۆمان دایئەنێین، بەبێگومان لەروانگەی گەلی کوردو دیموکراسی لەکوردستانەوە دایئەنێین.

سەبارەت بەیەککگرتوو، ئەو برادەرە حەماس گرتی، منی شوبهان بەبەعس، سوپاسی ئەکەم، چونکە ئەو بەعس ناناسێ، ئەگەر بەعسی بناسیایە، خەباتی ئەکرد دژی بەعس، خۆیو حزبەکەشی خەباتیان ئەکرد دژی بەعس، لەبەرئەوە بەعس ناناسێو لەژیانیا خەباتی نەکردووە دژی بەعس، ئێستا دێت ئەم هەموو ئازادیو دیموکراتیە بەراورد ئەکات بەبەعس، سێیەم زەمەنی چەواشەکردن نەماوە، بەیانیو دوبەیانی هەڵبژاردنە کە دەرئەکەوێ کە ئایا زۆرینەی هەرەزۆری خەڵك گوێ لەخیتابی دیموکراسیو ئازادیخوازی لیستی هاوپەیمانی ئەگرێ، یا گوێ لەخیتابی ئیسلامیو خیتابی ئەوان ئەگرێ، من بەش بەحاڵی خۆم دەنگم لەگەڵ دەنگی جەنابی کاك مەسعودەو دەنگی لیژنەی باڵای هەڵبژاردنە دژی ئەو فەوزایەی کە لەدهۆك کراوەو هەرگیزاوهەرگیز ئەمەم پێ باش نیە، ئێستا بەتەلەفۆن لەخانەقینەوە قسەئەکەم، هەموو یەککگرتوو با باش بزانێ، دوێنێشەو من قسەم لەگەڵ جەنابی کاك نەوشیروان مستەفا کرد،

که جەنابی مام جەلال لێرە نییەو وتومە تکا ئەکەم، هەموو هێزی خۆمان بخەینەکار بۆئەوەی یەکگرتوو بپارێزین، نەکا هیچ کەسێك هەڵەیەکی بچوکیش بەرامبەریان بکات، ئەوە خیتابی ئێمە نیە، خیتابی ئێمە خیتابە دژی کۆنەپەرستیو دژی سەلەفیەت بۆ سەرخستنی دیموکراتییە، قبوڵتە ئەمە خیتابی ئێمەیە، قبوڵت نیە جەنابت ئازادی بۆ خۆت.

نەوا: کاك سەمیر، هەندێ لەتەلەفۆنەکان باس لەوە دەکەن گوایە یەکگرتوو دەیەوێ سیستەمێکی دوور لەمەدەنیەتو عەلمانیەت لەوڵاتدا دروست بکات، جەنابت رات چییە؟

سەمیر سەلیم: حەزدەکەم هەندێ تێبینیم لەسەر قسەکانی کاك مەلابەختیار بدەم، دوایی دێمە سەر پرسیارەکەی جەنابت، یەکەم پێم وایە گوتاری ناسیۆنالیزمی کوردی لەم قۆناغەدا، گوتارێکە کاك مەلابەختیار خۆی ناوی بنێ سەلەفیەت، چونکە هەموو بیرێکی رابردووی ناوناوە بیری سەلەفیەت، گوتاری ناسیۆنالیزمی کوردییە رەشید گەردی زیندووکردۆتەوە، تەکفیری خەڵك ئەکات، روداوەکانی دهۆك ئەخوڵقێت، گوتاری ناسیۆنالیزمی کوردییە ئێستا تەبەنی خیتابی دینی ئەکات، ناچار بۆ کۆکردنەوەی دەنگ تەکفیری خەڵك ئەکات، ئەوەی دەنگ بە (٧٣٠) نەدات هین ئەکات، هەر کاك مەلابەختیار خۆی بوو باسی وەزیری ئەوقافیان لێکردو ئێستا بەیانێکیان پێدەرکردووە بانگەشە بۆ (٧٣٠) بکەن، کە خروقاتە لەمزگەوت لەخوتبەکانی جومعەدا باسی (٧٣٠) بکرێت، بەراستی هەر ئەمەیە کە وایکردوە یەکگرتوو وەکو هێزێکی ناسیۆنالیزمی کوردی، بەهێزێك لەدەرەوەی یەکێتیو پارتی بەلیستی سەربەخۆ دابەزێ، ئەیانەوێ بەخاریجی نیشتمانو خارجی نەتەوە لەقەڵەمی بدەنو بەهێزێکی عەرەبیو غەیرەکوردی لەقەڵەمیان بدەن، ئەم کەلتورەیە کە کەلتوری بەعسە، ئەمە موشکیلەی ئێمەیە، ئەم کەلتورە، ئەم گوتارە کە ناسیۆنالیزمی کوردی ئاراستەی هاوڵاتیانی کوردی ئەکات، ئاراستەی گشتی ئەکات، شەحنکردنو بارگاویکردنی هاوڵاتیانە بەکۆمەڵێ داینەمۆ، بەکۆمەڵێ سلوکیاتی چەوتو سلوکیاتی توندڕەوانە، کە ئەو روداوانەی دهۆکی خوڵقاندووە، بەراستی بەئیجرائاتی ئیداری کۆنترۆڵ هەندێ شت ناکرێ، کاك مەلابەختیار گوتارەکانی هەمووی گوتاری ئاراستەکراوی

بارگـاویکراوی شـەحنکردنی هاولاتیانـە بۆئـەوەی کـە یـەککرتوو وەکـو کیـانێکی سیاسـی فـڕێ بداتـە دەرەوە، بیـسڕێتەوە، ئێمـە بەراسـتی ناسیۆنالیزمی کوردی گوتـارێکی هەیـە خـەڵك لـەدەرەوەی خـۆی دائـەنێ، بـەخارجی نیشتمانو بـەخارجی نەتـەوە، کـە ئـەمـە فەلـسەفەی سـەدام حسینە، راستە کاك مەلابەختیار خەباتی هەیـە، مێـژووی هەیـە، ناشـوبهێ لەروی هینـەوە، بـەڵام گوتارەکـانی موشـابهی بەیـەکن، یەکسانن بەیـەك، لەبەرئـەوە ئـەو گوتارەیـە لەراسـتیدا هاولاتیـانی والێکـردووە هـەر دیموکراتیـەت ئـەتك بکرێـت، مەلابـەختیار چـەند سـاڵە بـەگوتاری خـۆی بەحسابی قسەی خۆی دیفـاع لەدیموکراتیـەت ئـەکات، ئـەمڕۆ لەبەرچـاوی هەموویانـەوە دیموکراتیـەت ئـەتك ئـەکرێت، لەکوردسـتاندا تەحـەمولی گوتارێکی سیاسی ناکرێت.

لەراستیدا قۆنـاغی نوسینەوەی دەسـتور قۆنـاغی تەعدیلی دەسـتوری هەیە، لەهەموو دنیادا دەستور ناکرێ بوەستێ لەئاستێکدا، ئەنوسرێتەوەو گۆرانی بەسـەردا دێـت، تـازە دەسـتوری عێراقـی نوسرایەوەو ئیقـرار کـرا لەلایەن زۆرینەی گەلی عێراقـەوەو ئـەکرێ لـەقۆناغی داهـاتوودا پـەرلـەمانی عێراقـی پـرۆژەی دەسـتوری تەعـدیلی دەسـتور تـەرح بکـاتو بیخاتـەوە بـەردەم جـەماوەر خـۆی. هەلومەرجـەکان گۆڕانکـایـان بەسـەردا هـاتووە، بەڵام بـەس مامەڵـەی ئـەحزابی کـوردی لەگـەڵ هاولاتیانـدا، لەگـەڵ ژیـانی هاولاتیانـدا گـۆڕانی بەسـەردا نـەهاتووە، هـاولاتی کـوردی ئێـستاش لەکولەمەرگیو ئێستاش لەنارەحەتیو لە ستەمدا ئـەژی، ناتوانـێ تـەعبیر لـەخۆی بکـات، ناتوانـێ مومارەسـاتی سیاسـی خـۆی تـەعبیر لـێ‌بکات، ناتوانێ بەشـداری سیاسـی بکـات، بـڕۆ لـەبادینان بپرسـە ئەگـەر ئێـرەش ئەڵێی ئێرەش خۆ بەردەوام دەنگ‌وباسەکان هەیە، راستە مەسئولین ئێمـە سوپاسیان ئەکەین بەدەمەوە بوون، ئیجراناتیان کـردووە، هـەوڵیان داوە، بـەڵام کاکـە ئەمانـە هـەمووی تـەوازوناتو حـسابی بـۆ ئـەکرێ، تەمـەن تەحەمول نەکات، من وتم میللەت تەحەمول ناکات نەم وتووە حـزب، ئێمـە لەپێناوی میللەتدا تەحەمولی زۆر شتی تریش ئەکەین، ئامادەین بۆ هـەموو قوربانییـەك لـەپێناو مافـەکانی ئـەم میللەتەمانـدا، لەگـەڵ هەناسـەکانی ئەنفالیاندا بـوین، لەگـەڵ مردنـەکانی کیمیابـاران بـووین، لەگـەڵ نـەبونیو ناسۆریەکانیاندا بووینو لەگەڵ چارەنوسیشیاندا دەبین.

نەوا: کاك توانا لەخورماڵ لەسەر تەلەفۆنە..
کاك توانا: من پرسیارێکم لەبەڕێز کاك مەلابەختیار هەیە، یەکگرتوو ئەگەر مێژووشی نەبێ بۆ مەلەفی نییە وەکو (١٩٦٦)و (٣١ ی ئاب).
مەلابەختیار: من ڕەئی ئەم برادەرە کە باسی شەستوشەشو نەوەتو شەش ئەکاتو ئەو برادەرەی کە یەکێتیيو پارتی ئەشوبهێنێ بەبەعس، ئەکەم بەنمونە، هەتا بزانرێ یەکگرتووی ئیسلامی کادرەکانی خۆی چۆن پەروەردە ئەکات، لەناوخۆیدا چۆن پەروەردەیان ئەکات، ئاوایە پەروەردەی یەکگرتوو بۆ کادرەکانی، یەکەم ئێمە بەبەعس ئەشوبهێنێو ئەمانخاتە موعادەلاتی بەعسەوە، دووەمیش شەستو شەشو نەوەتو شەش، مادام ئێوە ئەمە بیروڕاتانە، ئیتر مەعلومە کە ئێوە خۆتان بۆچی ئامادەئەکەن لەئایندەداو ئەتانەوێ ببن بەخاوەن چ دەسەڵاتێ لەئایندەداو چی بکەن بەرامبەر بەم دوو هێزە کە مێژویەکیان هەیە، ئەگەر ئێمە نەبووینایە، یەکگرتوو ئێستاش نەئیەوێرا خۆی ئیعلان بکات.
کاکە سەمیر غەڵەت لەناسیۆنالیزمی تێگەیشتووە، بەڕاستی ناسیۆنالیزم ئەسڵەن بەشی زۆری دنیای ناسیۆنالیزمی هەموو وڵاتانی دنیا، دین نییە، کەلتوری دین بەشێکە لەدنیای ناسیۆنالیزمو دین ڕەفز ناکرێت لەبزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی ڕزگاریخوازیو ئازادیخوازی دنیا کاکە ئەوە ئێوەن ئەتانەوێ ناسیۆنالیزم ئیستفادە لێبکەن، ئەسڵەن دین ناسیۆنالیزمی تیا نییە، تۆ بۆچی مەسەلەکە بەهەڵە باس ئەکەیت، خەڵك چەواشە ئەکەی، لەدنیا، لەخیتابی دیندا مەسەلەی ناسیۆنالیزم نیە، مەسائیلی کۆسمۆپۆلیتیك هەیە،(*) لەدیندا، خیتابێك هەیە، خوایەك هەیە، تێکستێك هەیە کە قورئانە، پێغەمبەرێك هەیە کە موحەمەدە، ئەمانە هەیە، ناسیۆنالیزمو دیموکراسی نیە لەخیتابی دینیدا، هەموشمان دەبێ لەخزمەتی ئەو خیتابە بین کە بەزمانی عەرەبی نوسراوە، ئەو مەسەلانە رونە هەق نییە ئێوە ختوکەی سۆزی نەتەوەیی کورد بدەن، بەحسابی خۆتان ئەتانەوێ خیتابێکی تر بدۆزنەوە، سەبارەت بەخیتابی سەدامو ناسیۆنالیزمی کوردیش، کاکە خیتابی سەدام خیتابی فاشییە، خیتابی ناسیۆنالیزمی کورد خیتابی میللەتێکی ژێردەستەیە، میللەتێکی ژێردەستە خەبات ئەکات بۆ دیموکراتی، خەبات ئەکات بۆ ئازادی، سەدام

---

* کۆسمۆپۆلیتیك: سڕینەوەی سنوری نەتەوەییو نیشتمانی.

خیتابی ئەوەبوو کە میللەت نابێ ئازادبێ‌و لەناو بۆتەی نەتەوەی عەرەبدا بتوێتەوەو نەمێنێ، ئێوە ئەو دوو مەسەلەیە تێکەڵاو ئەکەن‌و چاکتر وایە حەماس نەتانگرێ، روداوێك رویداوە بەرامبەرتان لەدهۆك، واتان لێهاتووە وائەزانن سەری دنیاتان لێهاتۆتەوەیەك، ئێمە سەدان قۆناغی سەختی خەباتی وامان بینیوە، سەرەڕاش مەنتقمان لەدەستنەداوەو توانیومانە جڵەوی خەبات بگرینەدەست، توانیومانە سەنگەر بەرنەدەین، لەئەنفالدا بەرمان نەدا، لەکیمیابارانەدا بەرمان نەدا، رۆژی وا هەبووە نان نەبووە بیخۆین، هەر بەرگەمان گرتوەو هەڵیش نەچوین. یەك رووداو روبەڕوتان بۆتەوە، سەرۆکی هەرێم، لیژنەی باڵای هەڵبژاردن هەمووی ئیدانەی ئەکات‌و هەموومان پێمان ناخۆشە ئەمە رویداوەو ناوچەکانی ئێمە هەمووی پارێزراوەو کەس ناتوانێ تەجاوز بکات بۆ ئێوە، بەیەك خیتاب هەڵنەچن، ئێوە ئەگەر ئێمە بەبەعس بزانن زۆر هەڵەیەکی گەورە ئەکەن، ئێوە خۆتان دوچاری ئیشکالی سیاسی گەورە ئەکەن، هیچ نەبێ لەناو خۆتانا دوچاری ئەبن.

نەوا: کاك محەمەدمان لەگەڵە لەسلێمانی.. بەڵێ فەرموو..

کاك محەمەد: پرسیارێکم هەیە بۆ کاك مەلابەختیار، ئەو پیاوە بەڕێزە تائێستا لەهەرشوێنێکدا قسەئەکات.. پرسیارەکەم ئەوەیە بۆچی بەردەوام ئێمە ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ دەوری سەلەفیەت‌و رابردوو.

کاك هۆشمەند: من قسەیەکم هەیە بۆ ئەو برادەرەی یەککگرتوو، بۆچی پێش ئەم هەڵبژاردنەی کە لەسەر ئاستی عێراق ئەکرێت بۆچی حکومەتی یەکێتی‌و پارتی گەندەڵ نەبوون‌و بەرنامەکەشیان هیچ شتێکی تیا نیە بۆ خزمەتی گەلی کورد؟

کاك بەهرۆز حەمەرەشید لەسوید: من دوو تێبینیم هەیە، یەکەم بۆ ئەو برادەرەی یەککگرتوو، بەراستی بەداخەوە چاوەڕوانم ئەکرد لەیەککگرتووی ئیسلامی زمانحاڵی ئیخوان مسلمین لەکوردستانی عێراق، هەڵوێستێکی جوامێرانەی هەبوایە بەرامبەر بەهەڵوێستی گشتی ئیخوان مسلمین لەهەموو دنیادا، بەرامبەر بەکێشەی ئێستای کورد لەکوردستانی عێراقدا، ئەوانیش وەکو ئیخوانەکانی کوەیت کاتێ سەدام کوەیتی داگیرکردو ئیخوانەکانی میسر پشتگیریان لەسەدام نەکرد، ئیخوانی کوەیت هەڵوێستێکی جوامێرانەیان هەبوو، ئەوەبوو دەستبەرداری رێبازی ئیخوان بوون، ئەبوایە یەککگرتووی

ئیسلامیش ئەو هەڵویستەی هەبوایە، نەك ئاوا بەلیستێكی جیاواز. یەك داواشم لەكاك مەلابەختیار هەیە.. تكا لەكاك مەلابەختیارو هاوپەیمانی كوردستان ئەكەین مەزلومیەت مەیەن بەیەكگرتووی ئیسلامی سەركەوتن بەدەستبهێنێ، ئەو كارەساتەی كە خولقا شتێكی خراپ بووە كە كراوە لەدهۆك، پێویست ناكات كاری لەوجۆرە دوبارەبێتەوە، چونكە ئەوان لەسەر مەزلومیەت ئەتوانن سەركەون.

كاك سامان لەسلێمانی: ئێمە خاوەنی (١٨٢ هەزار) ئەنفالین، بەراوردمان ئەكات بەحزبی بەعس..

ئەوا: كاك سەمیر ئەو بەراوردكردنە لەگەڵ حزبی بەعسدا جەنابت چۆنی ئەبینی؟

سەمیر سەلیم: من هەڵسەنگاندنم بۆ گوتاری سیاسی ناسیۆنالیزم كردووە، بەراستی هەڵسەنگاندنی گوتارەكە جیا لەشویهاندن، یا بابڵێین وەك یەك كردنی حزبەكە، ئەمڕۆ راستە من بەراستی ئەو خەلفیەتە فكریەی كە ناسیۆنالیزمی كوردی ئەمڕۆ هەیەتی، لەپشتیەوە بەفكری چەپیەوە، بەهەرشتێكیەوەو تەیدی كاك مەلابەختیار ئەكەم بەعس فاشیەتی بەرهەمهێناوە، خەریكە بەرەو بەرهەمهێنانی فاشیەت ئەچێ، كەس ناتوانێ خۆی ببینێتەوە ئەوە خاڵێك، خاڵی دووەم ئێمە روداوەكانی دهۆك بەئەقڵی خۆمان مامەڵەی لەگەڵ ئەكەین، بەراستی پرۆژەمان پێیە، مەنهەجی تەغیرمان پێیە، نە ئەو روداوەو نە سەدان روداوی تریش نە لەخشتەمان ئەبات نە بەرزو نزم ئەكەین بەئەقڵو تێڕوانینی خۆمان مامەڵە لەگەڵ ئەو روداوانەدا ئەكەین، داهاتوش ئەیسەلمێنێ چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو روداوانەدا ئەكەین، هەرگیزاوهەرگیزیش ئەو جەنگە لاوەكیانە لەستراتیژی تەغیری خۆمان لامان نادات، دین رەفز ناكات، بەلاّم كاك مەلابەختیار خۆی قبولی نیە قەزییەی ئیسلامی تەرح بكرێتە ناو حەرەكەی سیاسی كوردیەوە، ئەی ئەمە ئەگەر رەفزكردن نیە، پێكهاتەی فكری ناسیۆنالیزمی كوردیش وازحە، هەتاوەكو ئەمڕۆ یەكێ لەئیشكالەكان كە توشی ئیفلیجكردنی كردووە، ئەو حاڵەتەیە بەراستی ناتوانێ داهێنانی تازە بكات لەو چوارچێوە فكریانەی خۆی ناتوانێ دەرچێ، ئینجا بەراستی فكری چەپیش وەكو دروشمێكو ریكلامێكی سیاسی هاتۆتە كوردستانەوە، ئەگینا وەكو میتۆدێكی فكری بەتایبەتی

فکـری مارکـسیزم، وەکـو میتـۆدێکی فکـری‌و فەلـسەفی هێـشتا تـەرح نەکراوەتـە نـاو ساحەی کوردییـەوە، بۆیـە حەرەکـەی سیاسـی کـوردیش توشی ئەو ئیفلیجبوونە هـاتووە، خۆمـان بۆچـی ئامادەئەکـەین، بەراسـتی هـەموو کۆمـەڵگا دڵنیائەکـەین خۆمـان بـۆ خزمـەتکردنی ئـەو کۆمەڵگایـە ئامادەئەکەین، تەقیمی هەموو ئەو فکرانە ئەکەین، تـەقیمی سیاسـەتەکان ئەکـەین، هەڵیانئەسـەنگێنین، فرێیـان ئەدەینـە بـەردەمی جـەماوەر، بـا جـەماوەر خـۆی حـوکمی خـۆی لەسـەر بـدات، ئامـادەین بۆئـەوەی کـە جەماوەر ئەیخاتە ئەستۆمان نەك خەڵك خێرمان پێ‌بکات‌و بـەشمان بـدات، ئەوە ئەسڵی مەوزوعەکەیە، لەبەرئـەوە راسـتە ئێمـە شـۆفێنی نـین، بـەڵام تەبـەنی مەسـائیلی قـەومی‌و مـافی رەوای قەومەکـەی خۆمـان کـردووەو ئەیکـەین‌و دیفاعیـشی لـێ‌ئەکەین تادواهەناسـەمان سـەربازێکی بـەوەفاو بێ‌ئەرك ئەبین بۆ ئەو میللەتە. سەبارەت بەوەی ئێمە بەشـێکین لـەئیخوان مـسلمین، ئەسـڵەن پـرۆژەی سیاسـی ئێمـە لـەئیخوان مـسلمین زۆر دورە، ئەگـەر لـەروی فکریـەوە، وەکیـەکبونێك لـەنێوانمان لـەروی مەنهـەجی تەربەویەوە هەبێ، ئەوا پرۆژەی ئێمەو ئیخوان زۆر دوورە لەیەکەوە.

نەوا: پەیوەندی تەلەفۆنی وەرئەگرین.

کاك محەمەد لەهەولێر: ئێمە پاڵپشتی قسەکانی کاك بـەختیار ئەکـەین، هـەمووی لـەجێی خۆیـەتی، بەراسـتی ئـەو برادەرانـەی یـەککرتوو لەگـەڵ حزبـی ئیسلامی عێراق هیچ فەرقێکیان نیـە، ئایـە لەپەرلـەمانی عێـراق بـۆ عێـراق ئیش دەکەن یا بۆ کوردستان.

کـاك فـاخر لەکۆیـە: مـن دەمـەوێ بـزانم هـەموو ئەنـدامانی مەکتـەبی سیاسـی‌و سـەرکردایەتی یـەککرتوو، هـەموو ئەندامـەکانیان بەقـەد مەلابـەختیار خەباتیان کردووە؟

کـاك سـامان لەسـلێمانی: یـەککرتوی ئیـسلامی جگـە لـەزەرەر هـیچ قـازانجێکی بەکورد نەکردووە، من دەڵێم بەریش نییە بەئیشە.

کاك نەوزاد لەهەولێر: من ئەمەوێ ئەوەبڵێم ئـەوان کـە ئیـدعای ئـەوە ئەکـەن کـە ئەوان بـۆ کـورد ئـیش دەکـەن، مـن پـێم وانیـە، لەبەرئـەوەی ئـەوان رۆژی (٤/١٤) یادی ئەنفالی کوردستانە، ئەوان رۆژێکیان دانـاوە بـەناوی نوێـژ بـۆ شەهیدانی فەلەستین.

کاک کاروان لەسلێمانی: یەکگرتوو تائێستا سەرچاوەی داراییان رون نیە لای خەڵك کە لەکوێوە سەرچاوەی داراییان بۆدێ؟

کاک سەباح لەسلێمانی: کاک سەمیر دەڵێ قسەمان لەگەڵ نەکراوە، بەڵام خۆم لەتەلەفزیۆن گوێم لێبوو ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی یەگرتوو وتی: تەلەفۆنمان بۆکراوەو دوو کورسیان داوینەتێ ئێمە بەدوو کورسیەکە رازی نەبووین‌و خیتابی ئێستاشیان خیتابێکی زۆر ئیستفزازییە بەراستی.

کاک هەڤاڵ لەکۆیە: ئایا کاك بەختیار قبوڵێتی کە یەکگرتووی ئیسلامی وەکو حزبێکی موعارەزە، کە مافی دیموکراتی خۆیەتی ببێ بەموعارەزە؟

عبدالقادر لەحاجی ئاوا: کاك بەختیار ئایا یەکگرتوی ئیسلامی ئەو ئەزمونەی کە هەیەتی، یا هەیبووە، لەئەنجومەنی حوکم‌و ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقدا، هیچ رەخنەو کەم‌وکورپیەکی هەیە لەروی نیشتمانی.

نەوا: کاك سەمیر گوێت لەتەلەفۆنەکان بوو جەنابت لەسەر ئەو پرسیارتنە ئەڵێی چی؟

سەمیر سەلیم: کاك محەمەد هەولێری باسی حزبی ئیسلامی‌و جاریێ حزبی ئیسلامی دیفاعی لەفیدراڵیەت کردووەو جەعفەری کە هاوپەیمانی هاوپەیمانی کوردستانەو ئێستاش لیستی هاوپەیمانی هەولی رێکخستنی ئەوراق ئەدەن، بۆ رێکەوتن لەگەڵ ئیئتیلافدا، لەگەڵ حزبە شیوعیەکاندا کە ئیعتراف بەقەزیەی کوردی ناکەن بەفیدراڵیەتی کوردیشەوە، حزبی ئیسلامی پشتیوانی لێکردووە، ئەمە یەك، دووەم ئێمە پرۆژەی سیاسیمان‌و بەسیترین شتمان زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەواندا، هەرچەندە یەکانگیردەبینەوە لەهەندێ مەنهەجی مامەڵەکردن لەگەڵ حزبی ئیسلامیدا، هەر ئوندەیە کە خوامان یەکەو پرۆژەی دینمان یەکە، پرۆژەی سیاسی زۆر جیاوازە، ئەمە بەشێك، بەشێکی تر بەقەدەر هەڤاڵ مەلابەختیار ئێمە خەباتمان نەکردووە، ئەگەر خەباتەکە کورت بکەینەوە بۆ خەباتی چەکداری پێئەچێ ئەمە راست بێ، بەڵام تەنها خەبات خەباتی چەکداری نییە، خەباتی کۆمەڵایەتی هەیە، خەباتی فکری هەیە، خەباتی ئابوری هەیە، خەباتی دیبلۆماسی هەیە، یەکگرتوو ناسراوان کەسەکانیان لەناو واقیعی کۆمەڵگای کوردیدا، ئەوە ئەگەر یەکگرتوو رابردووی سەروەری نەبوایە، لەدە دوانزە ساڵێ رابردوودا ئەو گەشەکردنە، ئەو

بەرەوپێش چوونە، ئەو قبوڵە جەماوەرییە، بەراستی دەست نەئەکەوت، بەنیسبەت شەهیدانی فەلەستینو ئەمانەوە قسەی ستۆك بوون، یانی شتێك نیە قابیلی جوابدانەوە بێ، سەرچاوەی دارایی، من پێم باشە خەڵك بچێ سەرچاوەی داهاتی ئێمە زۆر وازحە، بەڵام با خەڵك بچێ سەرچاوەی داهاتی حکومەتی هەرێم بپرسێ لەکوێوە هاتووە، چۆن سەرف ئەکرێو بەکێ ئەدرێ. بەکورسی رازی نەبووین، من جارێکی تریش ئەڵێم بەکاك سەباح من بووم وەفدی مفاوەزاتو من بووم قسەم لەگەڵ نوێنەری هاوپەیمانی کردو تەلەفۆن بۆ من کراوە، ئەوان راستە تەرحی دوو کورسییان کردووە، ئێمە وتوومانە موشکیلەی کورسیمان نیە، تێبینیمان هەیە لەسەر خودی پرۆسەی هاوپەیمانێتی، تێبینیمان هەیە لەسەر ئەزموونی هاوپەیمانێتی رابردوو، لەبەرئەوە ناچینە ناو ئەو مەوزوعەوە.

نەوا: کاك مەلابەختیار وەڵامی جەنابت لەسەر تەلەفۆنو پرسیارەکانی بەشداربوان؟

مەلابەختیار: لەوەڵامی کاك موحەمەد کە وتی کاك بەختیار باسی سەلەفیەت زۆر ئەکات، هیچ رێگایەك شك نابەم رێگایەکی هاوچەرخ بێت جگە لەرێگەی دیموکراسیو ئەقڵانیەتو عەلمانیەتو مەدەنیەتو ئازادیو سەربەستی ژنو پیاوەوە، رێگای سەلەفیەت، من خۆم سەلەفیەت بەبیرێکی کۆنەپەرستی دژە دیموکراسیو بەخەتەرناك ئەزانم لەسەر ژیانی ئێستا، ئەوەی باوەڕی پێیەتی با پێی بێ، خۆ نە گرتومانەو نە هیچمان کردووە، با لەرێگای خۆی بەردەوام بێ، بەس چەكو تیرۆر، نەکات چەك بەکارنەهێنێ، نەچێ لەپاڵ تیرۆریستەکان بێ، بیری ئازادە با ئازاد بێ بۆخۆی، دووەم لەسەر قسەکانی کاك سەمیر، بەراستی لەسەر مەسەلەی ناسیۆنالیزم، لەسەر مەفامیمەکانی قسەم هەیە، من پێم وایە ئەو حیزبانەی لەناو عەرەبدان، کە قورئان بەزمانی عەرەبیش دابەزیوە، نەیانتوانی بەخیتابی دینی پەتی، بزوتنەوەی رزگاریخوازی ناسیۆنالیزمی عەرەبی رزگاربکەن، چ جای بۆئەوەی ئەقوامی تر بتوانن بەخیتابی دینی ئەقوامی غەیری عەرەب رزگاربکەن، یانی قورئان عەرەبیە، پێغەمبەر عەرەب بوو، خولەفای راشیدین عەرەب بوون، کەلتوری ئیسلام ٩٥٪ ی کەلتوری عەرەبو خولەفاکانی عەرەبە، ئیسلامگەراکانی عەرەب ناتوانن بەو کەلتورە، بەو خیتابە لەو قورئانە عەرەبییە، قەومیەتی عەرەبی رزگار

بکەن، چ جای بزئەوەی کورد یا تورکمان یا فارس بەخیتابی تر بتوانن قەومیەتی خۆیان رزگاربکەنو وەکو مەسەلەی ناسیۆنالیزم نەك وەکو مەسائیلی دەسەلاتو ئەمانە، ناسیۆنالیزم پرۆژەو پرۆسەیەکی دنیاییە، پرۆسەیەکە پەیوەندی بەدیموکراسیەوە هەیە، پەیوەندی بەئەقلانیەتەوە هەیە، پەیوەندی بەئابوری ئەم دونیایەوە هەیە، لەبەرئەوە ناکرێ ئەو دوو شتە تێکەڵاو بکرێ، پێت وا نییە خەڵکی دینیی بتوانن ناسیۆنالیزمێکی باشتر بن لەناسیۆنالیزمەکان، ئەحزابی ئیسلامی، ناتوانن ئەحزابی ناسیۆنالیزمی غەیرە عەرەب بن، هەروا ئیمکان نیە، ئەحزای دینیی راستەقینە ناتوانن ئەحزابی دیموکراتی بن، ئەمە نابێ چونکە دوو ئاراستەی زۆر جیاوازن، وەکو مەفهوم، وەکو مەسەلەی تیۆری، وەکو شتی فەلسەفی، لەبەرئەوە تێکەڵاوکردنیان شتێکە بەراستی هەم زەرەری بۆ دینەکەش هەیە، هەم زەرەری بۆ ئەرکەکانی ئەم دنیاش هەیە.

من لەسەر مارکسیزم قسە ناکەم، لەهەر قسەی ئەو برادەرەش سەد جار قبوڵمە یەککگرتو سەربەخۆ بێ، خیتابی سیاسی جیاوازی هەبێ، بەڵام ئەو مادام موناقەشەی لەسەر گەندەڵیو مەسەلەی دیموکراتیو ئەوانە دەستیان پێکردووە، دژی هاوپەیمانی کوردستان، ئێستا من رونمکردەوە، ئەمشەو لەگەڵ بەڕێز کاک ئەوشیروان قسەم کرد وتم: تکایە هەوڵ مەوڵێك بدەن لەگەڵ وەزارەتی ناوخۆو هێزەکانیان وابکەین کە قەد ئەو رووداوانەی دهۆکو ئەوناوچانە رویاندا، لەخارجەکانی ئێمە رونەدات ئەمە عەیبەیەکی گەورە ئەبێ بۆ ئێمە، ئەگەر یەککگرتوو نەپارێزین.

نەوا: ئەو روداوەی دهۆك چۆن ئەبینی؟

مەلابەختیار: من پشتیوانی قسەکانی جەنابی کاك مەسعود ئەکەم، لیژنەی باڵای هەڵبژاردنیش ئیدانەی کارەکەیان کرد، منیش لەگەڵ ئەوانم، ئیدانەیان ئەکەمو قەد نەدەبوو ئەوە روبدات، بەراستی شتێکی زۆر زۆر خراپ بوو، بەش بەحاڵی خۆم موعانات لەگەڵ موعاناتی یەککگرتووەو دڵخۆشیان لێئەکەم لەسەرئەوەی کە دەبێ ئاوڕك بن لەم وڵاتەی ئێمەدا.

کاکە من موشکیلەم لەگەڵ قسەکانی کاک سەمیر کوردیە کە کاك سەمیر ناکۆکە لەگەڵ قسەکانی خۆی ئەڵێ ئەحەرامان نەماوەو تەمەنمان سەرفکردووە ئەو هەلومەرجە نەهاتەوەی، دوایی ئەڵێ راستە حکومەت

تەحــەمولی ئــەوی‌و تەحــەمول ئەکــەین‌و ئــەم شــتانە، ئێمــە والێنــە[illegible]د لەلایەکەوە ئەڵێ ناسیۆنالیزم برادەرەکەی لەولاوە قسەئەکات ئەڵێ ئێوەو بــەعس هــیچ فــەرقێکتان نییــە، لــەملاوە کــاک ســەمیر دێت شــەرحی ئــەو قسەیەش ئەکات ئەڵێ بەعسیش وایکردو ناسیۆنالیزمی عــەرەبی وایکــردو نەتیجەکەی وا هات‌و وا هات، ئەم ناکۆکییە لەتەرحا ناکۆکیەکە باش نییە، یانی تۆ خیتابێکت هەیە ئیسلامیت بەسەرچاو، رێزت هەیــە، ئیــتی [illegible] بەئاشکرا بکە، بەڵام تێکەڵوپێکەڵییەك لەقسەکانتدا هەیە، جارێکیان [illegible] تەحــەمول ئەکــەم جــارێکیش بڵــێ تەحــەمولم نــەماوە. حزبــی ئیــسلامی عێراقی، کاك سەمیر ئەو حیزبە لەدوای موناقەشەیەکی زۆر دانی بەک[illegible]ی کــورد نــاوە، وەرە ئــەوە هــەموو خیتــابی حزبــی ئیــسلامی [illegible] لەبەرچاومانە، من سەرکردایەتی حزبی ئیسلامی عێراقم بینیــوە، مامۆ[illegible] موحسین عەبدولحەمیدم بینیــوە، مەکتــەبی سیاسییانم بینیــوە، مامۆستا عەبدولحەمید تروحــاتی لەســەر کــەرکوك‌و مەســەلەی کــورد جیــاواز بووە، هەربۆیە لەسکرتێری دەریانکردووە، یەکێکی تریان کردووە بەسکرتێر، من خــۆم لەمەســئولی ئێــستای حزبــی ئیــسلامی عێــراقم پرســیوە بــە[illegible] جەنابی مــام جــەلال، کــاك دکتــۆر بەرهــەمیش دانیشتبوو، وتم ئێــوە هــەر بەراستی لەروی ویژدانیەوە کەرکوکتان پێ کوردستانیە؟ وتی ئەبــەد ئێمە کــەرکوکمان پــێ کوردســتانی نییــە، حزبــی ئیــسلامی عێراقــی کــە زا[illegible]ن مەشــاکیلی ســوننەو شــیعە قــوڵ بــووەو موشــکیلەکان بــەرەو ئیجتهــادی خەتــەرناك ئــەڕوات‌و هاوپــەیمانی کوردســتان‌و کوردســتان مەســەلەیەکی گرنگە، وردە وردە لەسەرەتاوە نــەیان ئــەوت کــورد هــەقی هەیــە، دوایــی وتیان حوکمی زاتی، کە زانییان حــوکمی زاتــی ســودی نیــە، ئینجــا وتیــان فیدراڵمان قبووڵە، بەڵام فیدراڵی باشورمان قبــوڵ نیــە. کــاك ســەمیر ئــەڵێ راستە ئێمە خەباتی شاخمان نەبووە، بەڵام خەباتی کۆمەڵایەتی، خــەباتی فکری، خــەباتی ئابوریمــان هــەبووە، یــانی چــی خــەباتی فکــری، خــەباتی کۆمەڵایــەتی، تــۆ تــەنزیمێکیت لــە(١٩٧٢/٤/٢٦)وە بڕیــارت داوە خــۆت تەجمید کــردووە، هــیچ جــۆرە خــەباتێکت نــەماوە، دوایــی لــەماڵی خۆتا قسەیەکت کردووە یا نەتکردووە، ئەمە پێی ناوترێ خــەباتی کۆمەڵایەتی، خەباتی فکری، تۆ بەدرێژایی لە(١٩٧٢) تا (١٩٩٤) خۆت تەجمید کردووە.

ئەڵێی سەرچاوەی داهات، کاکە سەرچاوەی داهات یە کەم پارەکەی لەحکومەتی عێراق وەرئەگیرێ ئەوە رونە لەبانقەکان دائەنرێ، دووەم ئێمە لیژنەی چاودێری دارایی هەیە لەوەزارەتی دارایی، لەئیدارەی دارایی پارتیش هەیە، حەزدەکەین کاك سەمیر یەکێك بنێرێت بۆ چاودێری دارایی ئەزانێ حکومەت چەند ئەدات بەحزبەکان‌و چەند ئەدات بەدەزگاکان؟ چەند ئەدات بەرێکخراوەکان؟ حزبەکەی خۆشی چەندی وەرگرتووە لەئێمە؟ چەند وەرئەگرێ لەپارتی؟ مەسەلەی ئەوەی کە ئەڵێ گوایە هاوپەیمانی کوردستان دوو کورسییان داوە بەئێمە، دیارە دوو کورسی نییە پێنج کورسییەو فیعلەن لەسەر کورسی موناقەشەیەکی گەرم بووە، من خۆم لەکۆبونەوەکان بووم‌و هەتا کاتی خۆی لەئەنجومەنی نیشتمانی مامۆستا صلاح الدین بەهادین لەوێ بووە، لەسەر مەسەلەی ئەندامانی پەرلەمان بەخۆمی وتوە هەرچۆنێك بووە بچن بۆمان بکەن بەدوو کورسی، ئەوکاتە ئەنجومەنی نیشتمانیی یەکەم، دوای ئەوەش موناقەشە لەسەر کورسیەکان هەبووە، ئێستاش موناقەشە هەر لەسەر کورسیەکان هەیە.

نەوا: دەگەڕێینەوە لای پەیوەندیەکان..

کاك کرێکار لەچوارقوڕنە: هەڵوێستی هاوپەیمانی کوردستان ئەگەر هاتوو هەڵبژاردنەکان تەواو بوو سندوقەکانی دەنگدان کرانەوەو کورسیەکانی یەکگرتوو دیاریکران‌و چوە پاڵ حزبێکی عەرەبی عێراقی، ئەوکاتە هەڵوێستی هاوپەیمانی کوردستان چی دەبێ؟ یەکگرتوو چ شەهیدێکی لەپێناوی میللەت بەخشیووە؟

کاك کارزان لەسلێمانی: پرسیارەکەم بۆ کاك سەمیر لەکاتی بەعسدا ئێوە ئەتانتوانی خاوەنی ئەو کیانەی ئێستا بن، باسی مەلاکان ئەکەن ئەڵێن بانگەشە بۆ (٧٣٠) ئەکەن، ئەی بۆ کادرەکانی ئێوە لەمزگەوت رۆژنامە دابەش دەکەن‌و ئەڵێن دەنگمان بدەنێ.

کاك سەمەد لەهەولێر: من تەیدی قسەکانی کاك مەلابەختیار دەکەن.

کاك سیروان لەهەڵەبجە: جاری پێشوو کە یەکگرتوو لەتەحالوفی کوردستان بوو، بەڵام ئێستا کە جیابۆتەوە لەسەری ئەخوێنن‌و سوکایەتی بەئیسلام ئەکەن.

کاك رزگار لەسلێمانی: من وەکو کورە ئەنفالێك پشتگیری لەقسەکانی کاك مەلابەختیار ئەکەم، چونکە ئایا یەکگرتووی ئیسلامی تائێستا چ بۆ ئەنفالەکان کردووە.

کەیوان لەسلێمانی: ئەو باس لەوەدەکات کە ئێمە جیاوازی ناکەین لەنێوان چەپو راستو یا چ بۆنوێکیان هەیە، من یەك نمونەی رون دێنمەوە، کاتی گرانیەکە، کە یەکگرتوو تازە خۆی ئیعلان کردبوو، پارەیان ئەبەخشیەوە بەسەر ئەندامانی خۆیانداو هیچ حسابێکیان بۆ خەڵکی تر نەدەکرد.

نەوا: کاك سەمیر قسەت چییە لەسەر پەیوەندیەکان؟

سەمیر سەلیم: بۆ کاك کرێکار لەچوارقورنە لەراستیدا وەك کوڕێکی شەهید، ئێمە شەهید شەهیدانی میللەتن، بۆ قەزیەی ئەم میللەتە قوربانییان داوە، راستە لەقۆناغی رابردوودا فیداکاریو قوربانیەکان لەچوارچێوەی حزبدا بوون، بەس ئێستا مادام وردەوردە بەرەو کیانێکی سیاسی ئەچین، ئەبێ هەموو ئەو قوربانییانەو هەموو ئەو رێوشوێنە پارێزگارییانە بچنە چوارچێوەی حکومەتەوە، لەبەرئەوە هەموو ئە و شەهیدانە بە هی خۆمانیان ئەزانین، هەرکەسێ خزمەتی ئەم میللەتەی کردبێ ئێمە لەراستیدا خۆمان بە هی ئەو ئەزانین، خزمەتکاری ئەو خزمەتکارانە ئەبین، سەبارەت بەو مزگەوتانە، لەراستیدا هیچ کەسێکی ئێمە لەمزگەوتدا بانگەشەی نەکردووە، ئیلتزاممان بەهەمو رێنماییەکانی کۆمیسیۆنەوە کردووە، بەپێچەوانەوە ئەمڕۆ ئەبینین لەهەندێ لەو مەلایانەی کە لەرێگەی دەسەڵاتەوە ئاڕاستەدەکرێن، لەمینبەری مزگەوتەکانەوە دژ بەئێمە ئاڕاستەدەکرێن، من حەزدەکەم بێمەوە سەر قسە تێکەڵوپێکەڵەکەی کە کاك مەلابەختیار ئاماژەی پێکرد، جاری ئیعترافی کرد کە حزبی ئیسلامی ئیعترافی بەقەزیەی کورد کردووەو پشتیوانی کردووە بەحزوری جەنابی مام جەلالیش، ئەوە جوابێکە بۆ هەموو ئەوانەی کە باسی قەزیەی کوردی ئەکەن، بۆ ئەوانەش کە ترسیان هەیە لەهەر مامەڵەیەکی مستەقبەلی لەگەڵ حزبی ئیسلامیدا، ئەوە وەڵامە بۆ هەموو ئەوانە، بەڵام ئایا مەجلسی ئەعلاو حزبی دەعوەو تەیاری صەدرو حزبی فەزیلەو ئیئتیلافی شیعیو مەرجەعی شیعی بەسیستانیەوە کە لێرە یەکێتی زانایان چونە لای سیستانی بۆئەوەی ئیعتراف بەقەزیەی کوردی بکاتو، قەزیەی کوردستانیەتی کەرکوك ئیعترافی پێنەکردو تائێستاش ئیعتراف ناکەن،

من ئەڵێم ئەگەر لیستی هاوپەیمانی لەموستەقیەلدا لەگەڵ ئیئتلافی شیعە مفاوەزاتی کرد، ئەی ئەوە ناوئەنێن چی؟ ئەی ئەوە لەسالحی قەزیەی کوردییە یا لەدژی قەزیەکە؟ ئەی بۆ هاولاتیان ئەمە هەڵناسەنگێنن، لیستی هاوپەیمانی لەقۆناغی رابردوودا هاوپەیمانی کرد، لەراستیدا بەزەبرو قوەت و ئاڕاستەی دوو هێزە دەسەلاتدارەکە، چونکە حسابیان بۆ هیچ پێکهاتەیەکی تر نەکرد، باسی تەجمیدی ١٩٧٢ ئەو مێژووە بۆ کاك بەختیار خۆی بەجێئەهێڵم، دیارە پەیوندی بەحزبی ئیسلامی عێراق و ئیخوانەی عێراقیەوە هەیە، چونکە هیچ قەرارێك ئێمە لەکوردستاندا پابەند نەبووین بەهیچ قەرارێکەوە، بۆ خۆمان تەنزیمی سەربەخۆی خۆمان هەبووە، وەکو کۆمەڵێك خوێندکارو قوتابی لەزانکۆکاندا، ئێمە فەصل کراوین لەسەر جەیشی شەعبی، ئێمە سجن کراوین لەبەرئەوەی لەکوردستان تەنزیمێکی سەربەخۆی خۆی بووە، و رێزو حورمەتی تایبەتیشمان هەیە بۆ هەموو ئەوانەی لەخەباتی چەکداریدا بەشدارییان کردووەو حزمەتیان بەم میللەتە کردووە. ئەفەرمویّ پێنج کورسیمان داوە، لەراستیدا راست ئەکەن لەدوو کورسیەوە تا پێنج کورسی هاتن، پەس ئێمە وتمان موشکیلەی کورسیمان نیە، هەر نایەین نەك بۆئەوەی بیکەن بەشەش.

نەوا: پێمان باشە لەوماوەیەی کە مارمانە لەماوەی پێنج دەقەدا قسەتان لەسەر لیستەکەتان و رەخنەتان لەبەرنامەی لیستی بەرامبەر، سەرەتا فەرموو کاك سەمیر سەلیم..

سەمیر سەلیم: ئێمە وەکو لیستی یەکگرتوو لەراستیدا یەکم ئیش کە لەسەری کراوە، لەروی قانونیەوە دیاریکردنی سنوری جوگرافیای کوردستان بەگەڕاندنەوەی ئەو ناوچانەی کە دابڕاون بۆ سەر هەرێمی کوردستان، ئەمیش بەکۆمەڵێ ئیجرائاتی قانونی و یاسایی دەبێت، مەسەلەن قەراری (٥٨) بەنیسبەت کەرکوکەوە، گەڕانەوەی هەموو ئەو قەزاو ناحیانە بۆ سەر پارێزگای کەرکوك، ئاماری هەموو ئەوانە ئەکرێت، ئێمە لەرێی ئەنجومەنی نوێنەرانەوە یەکێ لەئەرکە سیاسیەکانی قۆناغی داهاتووی نوێنەرانی کورد، لەئەنجومەنی نوێنەرایەتیدا بریتییە لەچارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك و گەڕانەوەی بۆ سەر هەرێمی کوردستان و چارەسەرکردنی کێشەی ناوچە دابڕاوەکانی ترو گەڕانەوەی بۆ سەر

هـەرێمی کوردستـان‌و دوابـەدوای ئـەوە دیـاریکردنی سنوری کوردستـان، مـادەی (٥٨) بۆتـە مادەیـەك لـەمادەکانی دەستوری عێـراق، لەبەرئـەوە هەرکەسێکی تریش بێت ئەبێ قسەی جدی لەسەر ئەمە بکات، پێم وانیـە هیچ هێزێك بتوانێ ئەو مادەیە لەناو دەستوردا بکاتە دەرەوە، ئینجا خاڵی دووەم پرۆژەی سیاسی قەزیەی کوردی لەناو پێکهاتەی دەوڵەتی عێراقـدا، بەشێکی تری ئاسەواری ئەو سیاسەتە چەوتانەی کـە لـەقۆناغی رابـردوودا لەسەر میللەتەکەمان ماوە، چ لەئاسەوارەکانی کیمیابـاران، ئاسـەوارەکانی پرۆسەی ئـەنفال بێ، چ ئاسـەوارەکانی ئـەو کاولکارییانـە بێ بەنیسبەت کوردســتان‌و ئاوەدانکردنــەوەی بەشــێك لــەوە، ئێمــە دوو ســێ شــوێن پرۆگراممان بۆدانـاوە لەرولنگەی ئـەوەوە، لەراسـتیدا ئەبێتـە ئەولەویـەتی یەکەممان بۆ ئیشکردن لەقۆناغی داهاتوومان، بەشێکی تر کە ئێمە توشـی هاتووین بریتییە لەو کەلتورە ئیشکردن لەسـەر ئـەو کـەلتورەی کـە ئێمـە کوردستان‌و گەلی کوردی توشی ئەو قەیرانە کردووە، ئـەویش هـەم لـەروی فکرییەوە، هەم لەرووی عونفـو تەمنوتیزییەوە، بەراستی ئیش لەسەر ئـەو بەرنامەیە ئەکـەین، بەشـێکی تـر ئـەو تەوافوتـە کۆمەڵایەتیـەی کـە هەیـە، لەکۆمەڵگای کوردیدا بەنیسبەت ئافرەتـەوە، موشـارەکەپێکردنی ئـافرەت، گەشـەدان بەبەشـداریکردنی ئـافرەت، ئێمـە بەراسـتی بەرنامـەمان هەیـەو نوێنەرەکانیـشمان بۆئـەوە دابەزانـدووە بـەئافرەت پـشکی باشـی هەیـە لەنوێنەرایـەتیکردنی ئێمـەدا، ئێمـە بڕیارمـان داوە بەرنامەکـەمان لەسـی‌و پێنج خاڵ پێکهاتووە، لەباسکردنی ئـەو سی‌وپێـنج خاڵـەدا لـەماوەی پێـنج دەقەدا پێم وایە کارێکی ئاسان نییە، یەکێکی تر لەوانە قسەکردنە لەسـەر داهـاتی هـەرێمی کوردسـتان، ئێمـە لەراسـتیدا بەجـدی قـسە لەسـەر گەڕانەوەی ئەو داهاتە با بڵێین زیادکردنی رێژەکەی‌و سەرفکردن‌و هێنـانی بۆ کوردستان، چاودێریکردنی جۆری سەرفەکەو دابەشکردنەکەش یەکێکـە لەئیشەکانی خۆمـان، چـونکە بەشـێك لەگنـدەڵیی ئـابوری کـە ئـەخولقێ، لەچۆنیەتی مامەڵەکردنە لەگەڵ ئەو داهاتـەی کـە دێـت، بەشـێکی تـر وەك جاری پێشوو عـەرزم کـردن، لەراسـتیدا تـەوزیفکردن‌و بـەکارهێنانی ئـەو بوعـدە ئیـسلامییەیە بـۆ پـشتیوانیکردنی قەزیــەی رەوای گەلەکــەمان‌و بەردەوام ئەو سەربازە ئەبین کە لـەریزی پێشەوەی داواکـارانی مافـەکانی

میللەتەکەمان ئەبین. فراوانە پرۆژەکە، سی و پێنج خاڵە، با جەماوەر خۆی قسەی خۆی لەسەربکات.

نەوا: بەڵێ کاک مەلابەختیار جەنابت بۆ بەرنامەی لیستی هاوپەیمانی کوردستان دەتوانی قسە بکەیت؟

دیارە پەیوەندیەکەی کاک مەلابەختیار پچڕاوە، دێمەوە لای مامۆستا سەمیر سەلیم، ئێوە لەسەرەتای لیستەکەدا دەڵێن لەپێناو نەهێشتنی گەندەڵی لەژێر ئەو دروشمە ئەو لیستەتان پێشکەش بەجەماوەر کرد، بۆئەوەی دەنگتان پێبدەن، گەندەڵیی لەشەوورۆژێکدا دروست نەبووەو لەشەوورۆژێکیشدا کۆتایی پێنایەت، ئایا تا چەند هەقیقەتی تیایە یەکگرتوی ئیسلامی کوردستان لەسەر مەسەلەی کورسی لەهاوپەیمانی کوردستان جیابۆتەوە؟

سەمیر سەلیم: ئێمە وەک عەرزم کردی و کاک مەلابەختیاریش ئاماژەی پێدا، لیستی هاوپەیمانی تا پێنج کورسی هاتوون، ئێمە لەسەر کورسی نەبووەو رەفزمان کردووە، وتومانە قەزیەکە لەسەر ئەوە نیە، دیارە گەندەڵیی سیاسی سەرچاوەی هەموو گەندەڵییەکانی ترە، ئەو گەندەڵییە سیاسیەی کە لەکوردستاندا هەیە، هەر لەدولەتکردنی حکومەتەوە هەتا بەحزبکردنی حکومەت، کێشەیەکی گەورەیە کە گرفتی ئێمەو ژیانی رۆژانەی ئێمەیە، ئەگەر هاوپەیمانێتی لەقۆناغی رابردوودا لەپێناو بەدەستوریکردنی مافەکانی کورد بوبێ و لەپێناو بەهێزکردنی نوێنەرانی کورد بوبێ و ئەو ئەرکانەی بەجێهێنا، یەکێکی تر لەئەرکەکانی هاوپەیمانی ئەوەبوو، بتوانێ دوو ئیدارەکە بکاتەوە بەیەک، بەڵام زۆر بەداخەوە هەتا ئەمڕۆ هاوپەیمانی نەیتوانیوە.

نەوا: کاک سەمیر دێینە سەر دوو ئیدارەکەش، کاک بەختیار داوای لێبوردن دەکەین، دیارە هێڵەکە پچڕابوو، ئەتوانی لەماوەی پێنج دەقەدا بەرنامەی لیستی هاوپەیمانی باسبکەی؟

مەلابەختیار: سەرەتا ئەگەر دوو دە قەی پێنج دەقەکەم بدەیتێ هەندێ تێبینیم هەیە با دەریبڕم، باقیەکەی وەڵامی پرسیارەکەت ئەدەمەوە. کاک سەمیر

وتی: جاران شەهیدبوون لەچوارچێوەی حزبدا بوو، حزب بەشێك بوو لەنەتەوە، لەمیللەت، شەهیدیش شەهیدی میلەتو خەباتی رزگاریخوازی بوو لەرابردوو و ئێستا رەمزی ئەم تەجروبەو دەسەڵاتەیە، بەراستی ناكرێ حزب دابـبڕێ لەبزوتنـەوەی میللـەتێك چـونكە حـزب هـەڵقولاوی نـاو میللەتەكەیە، ئەمە یەك، دوو: ئەو وتی كاك مەلابەختیار ئیعترافی كرد كەو حزبی ئیسلامی دانی بەمافەكانی كورددا ناوە، بەراستی كاك سەمیر قسەكانی قرتاند، قسەكە من وتم حزبی ئیسلامی لەم ئەخیرە لەحوكمی زاتیەوە دەستپێكرد، وردەوردە لەژێر فشارەكان مەسەلەی فیدراڵی قبوڵ كردو فیدراڵی جنوب قبوڵ ناكات، یانی بەدرێژایی پەنجا، شەست ساڵی رابردوو ئیخوان مسلمین لەعێراقدان دورونزیك مافی كوردیان نەسەلماندووە، لەم ئەخیرە لەژێر فشاری كوردستان وردە وردە مافەكانیان سەلماندوین، غەدرێكی گەورەی كرد كاك سەمیر لەمەجلسی ئەعلا، كە وتی ئەوانە مەسەلەی فیدراڵ ناسەلمێنن، لەهەقیقەتدا مەجلسی ئەعلا فیدراڵی سەلماندووە، زیاتریش لەحزبی ئیسلامی عێراق، من كە ئەم قسانە ئەكەم خەڵكی خانەقینمو شیعەش نیم، بەڵام هەقیقەتەكانیش وەكو خۆی باس بكرێ باشە، مەجلسی ئەعلا فیدراڵی سەلماندووە، فیدراڵی جنوبیشی سەلماندووە، ئەمە جگەلەوەی بەدرێژایی مێژوو شیعەكان لەسوننیە موحافیزكارەكانی عێراق باشتر بوون، عەبدول موحسین حەكیم كە گەورەترین عالمی دینی شیعەكان بوو، لەساڵی (١٩٦١) فەتوای دا كە شەڕكردن لەكوردستان حەرامە، تائێستا تەحەدا ئەكەم یەك مەلای دینی گەورەی سوننە لەبەغدا قسەیەكی وای كردبێ، بگرە بەپێچەوانەوە زۆرترین كۆنگرەكانی مەلا سوننیەكان، بۆ سەدام بوو، بۆ حەلاڵكردنی قەتلوعامو جینۆسایدەكانی بوو، سیاسی شت وەكو خۆی باس بكاتو مەجلسی ئەعلا لەمونتەمەری صەلاحەدینەوە، تائێستا ئیعترافی بەفیدراڵ كردووە.

بەرنامەكەشمان ئەوەیە كە ئێمە بەرنامەیەكی دیموكراتی هەمەلایەنەمان هەیە، هەم بۆ عێراق هەم بۆ كوردستان، مەسەلەی جێبەجێكردنی مادەی

(٥٨) و مەسەلەی چارەسەرکردنی کێشە چارەسەرنەکراوەکان، مەسەلەی فەیلیەکان، مەسەلەی ژنان، مەسەلەی پێشکەوتن، مەسەلەی ئەمن، مەسەلەی بوژانەوەی ژیانی خەڵك، مەسەلەی ئازادیەکانی فراوان، مەسەلەی ژیانی مەدەنی، هەموو ئەوانە لەبەرنامەکەی ئێمەدا هەیەو چەسپیوە، یانی بەرنامەیەکمان هەیە بەگشتی بۆ عێراق، بەشەکەی عێراق، دیموکراسی بۆ عێراقو ئەمن بۆ عێراقو ژیانی ئابوری باش بۆ عێراق تیایە، بەشەکەی کوردستانیش سنوری کوردستان کە کەرکوكو خانەقینو شەنگار بێتەوە سەر کوردستانو فەیلیەکان بەشێك بن لەنەتەوەی کوردو مافە سیاسیەکانیان دابین بکرێت، تەعویزی قوربانیانی ئەنفالو شەهیدو ئەوانەی تیایە، بەرنامەکەی ئێمە بەرنامەیەکی دیموکراسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئازادی، مەدەنیو کوردستانی رونەو باسمان کردووە، ئەمە بەرنامەکەی ئێمەیە.

نەوا: بەڵام بۆ لەبەرنامەکەی لیستی هاوپەیمانی کوردستاندا باسی یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەی تیا نیە، یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارە داخوازی هەموو خەڵکە، لەکاتێکدا هەندێ لایەنی ناو لیستی هاوپەیمانی کوردستان یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارە بەگرنگ نازانێ؟

مەلابەختیار: بەش بەحاڵێ خۆمان یەکگرتنی ئیدارە ئەوەندە بەگرنگ دەزانین کە ئەسڵەن قابیلی ئەوە نیە کەسێك بتوانێ موناقەشەی تیا بکات.

نەوا: ئەی بۆ نیە؟

مەلابەختیار: بۆ نیە، لەبەرئەوەی کە یەکگرتنی دوو حکومەت بەم هەموو دامودەزگایە، بەم هەموو فەلسەفەو ئەقڵی جیاوازەوە، بەم هەموو تەئیسراتی شەڕو مەشاکیلانەی کە هەبوون ئەگەر پەلەی تیا بکرێت مومکینەو زەرەرێکی زۆری لێی بکەن دەبێ بەشێنەیی بیکەین.

نەوا: ئایا کاك بەختیار نەدەکرا بکرێتە خاڵێك مەوعیدێکی دیاریکراو دابنرایە بۆ یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارە لەلیستی هاوپەیمانی کوردستان؟

مەلابەختیار: چەند جار مەوعیدا دانرا و جێبەجێش نەکراوە، مەوعید دانەنێی باشترە لەوەی مەوعید دانێیتو جێبەجێی نەحکەی، گرنگ ئەوەیە

هەردوولامان قەناعەتی موتڵەقمان هەیەو ئیشیمان بۆکردووەو ئەشتوانم بڵێم ٨٠٪ی بۆچونەکانمان هاوبەشە لەسەر یەکگرتنمان.

نەوا: بەڵام ئێوە هەردوو ئیدارە، هەروا ئەڵێن، ئەڵێن شتی بەسیت هەیە، ئەو شتە بەسیتانە بۆ بەخەڵك ناڵێن؟

مەلابەختیار: ناڵێم شتی بەسیت هەیە، دەڵێم ٨٠٪ی بیروبۆچونی هاوبەشمان هەیە، ٢٠٪ ماوە ئەوەش شتی زۆر ئەساسی تیایە لەبەرئەوە ئەگەر ئەتانەوێ بەپەل بکەین‌و دوایی یەکگرتنەکە تێکبچێ‌و دوایی دە بۆ پانزە ساڵی تر ئەمە حاڵمان بێت، ئەمە شتێکە، ئەگەر ئەشتانەوێ بەشێنەیی، خەڵك ئەیەوێ بەشێنەیی، هێزەکان ئەیانەوێ بەشێنەیی ٢٠٪ ەکەی کە ماویشە لەنێوانمان کۆتایی پێبهێنین ئەبێ مۆڵەت بدن، ئەبێ خەڵك لەگەڵ ئەوە بێ کە چارەسەری ریشەیی بۆ بدۆزینەوە.

نەوا: کاك مەلابەختیار زەمانەت چییە؟ پێشتریش لەهەڵبژاردندا کۆمەڵێ وەعد بەخەڵك دراوە ئێستا ئێوە لەگەڵ لیستی بەرامبەریش یەکگرتوی ئیسلامی وەعد بەخەڵك دەدەن کە ئەوشتانە جێبەجێ بن، لیستی هاوپەیمانی جارەکەی تریش سەرکەوت، زەمانەت چییە کە ئەوشتانەی لەبەرنامەکەتاندایە کە باسی دەکەن لەکاتی سەرکەوتنتان لەهەڵبژاردن بۆ خەڵك جێبەجێی دەکەن؟

مەلابەختیار: زەمانەت، پێم وابێ مێژوویەك شایەتی خەباتو زەمانەتدانە بەمیللەت، کە ئێمە چیمان بەمیللەت کردووە، ئەم چەند ساڵە ی کە لەکوردستانیش بووین، وردە وردە ستراتیژی ئۆتۆنۆمیمان گۆڕیوە بەفیدراڵ‌و کێشەی کوردمان تێکەڵاو بەدنیا کردووەو دەستکەوتو سەرکەوتنەکانی کە ئەمڕۆ بەدیهاتوون، هەمووی زمانەتن کە میللەت ئەزانن لەتاقیکردنەوەکاندا ئێمە ئەوەی ئەیڵێین هەر بەقسە نیە، خۆ حزبەکانی موعارەزە هەتا ئێستا هەر بەقسە ئەڵێن ئەمە بۆ کورد ئەکەین، ئێمە ئەمە لەسەر دەسەڵات بۆکوردمان کردووە، بەدەستکەوتو کردەوە ئەمەمان بۆ کردووەو جگەلەوەش باقی ئەرکەکان لەعێراقدا ئەبعادی هەیە، قوڵایی هەیە، ئێمە دەبی کاتمان هەبێ بتوانین بواری ترمان هەبێ بتوانین

باقی ئەرکەکان بەدیبهێنین، زەمانەت سیاسەتی دەولی بەدیهێنانە، زەمانەت سیاسەتی ئالوگۆڕی جیهانە، زەمانەت ئەوەیە کە ئێمە دەبێ لەدەستوردا مافەکانمان بچەسپێنین‌و لەپەرلەمانیشدا بتوانین بەرگری لەمیللەتەکەمان بکەین‌و باقی گرفتەکانمان چارەسەر بکەین‌و ئەزمونی رابردوش زۆر شتی دەرخستووە تائێستا.

نەوا: خەڵکانێك هەن لەوباوەڕەدان کە بەر لەهەڵبژاردنەکان کۆمەڵێ وەعد دەدرێ‌و کۆمەڵێ شت دەکرێ، بەڵام دوای هەڵبژاردنەکان ئەو وەعدانە دەبنە بلقی سەرئاو، جەنابت چۆن دەتوانی بۆمان تەئکید بکەیت کە ئەو وەعدانە جێبەجێ دەکرێ؟

مەلابەختیار: من بەش بەحاڵی خۆم هەموو وەعدێك کە دەدرێ ١٠٠٪ حزبەکان ئیلتزامی پێوەبکەین‌و ناشرینە وەعد بدرێ‌و جێبەجێ بکرێ، گەندەڵیش شتێك نیە تایبەت بێ بەکوردستانی عێراق، عێراق ١٠٠٪ گەندەڵە با کوردستان کەمتریش گەندەڵ بێ‌و ئەوە دەبێ چارەسەری بکەین‌و نەیهێڵین، ئەوە شتێکی زۆر زۆر ناشرینە مەسئولیەتیشمانە کە نەیهێڵین‌و ئێستا لیژنە هەیە لەناو (ی.ن.ك) لیژنە دروستکراوە لەناو حکومەت بۆئەوە، دەیان مودیر عام‌و مەسئول‌و خەڵك‌و وەزیرو ئەوانە وردە وردە لائەبرێن، دەیان کەس لیژنەی لێکۆڵینەوەی لەسەرە، لیژنەی تایبەتی هەیە بۆ ئەو بابەتە، گەرمتریش دەبێ، لەسەردانی جەنابی مام جەلال بۆ لای کاك مەسعود رێکەوتون دەسبەجێ دوای ئەم هەڵبژاردنە لیژنە دروست بکرێ بۆئەوەی لەهەردوو ئیدارە، ئەو گەندەڵیانە نەهێڵین‌و کۆتایی پێبێت‌و خواحافیزی لێبکەین، من بەش بەحاڵی خۆم، لەهەموو کەس نیگەرانترم بەرامبەر بەم گەندەڵییەی کە هەیەو منیش وەکو هەموو کەس خەبات دەکەم بۆئەوەی ئەم گەندەڵییە نەمێنی‌و دڵنیام نامێنێ، یانی ئەوەی کە ئەیبیستم لەکۆبونەوەکاندا، ئەوەی کە ئەیزانم لەموناقەشەکاندا، پرۆژەیەکی گەورە هەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیەو پێشم وایە راستگۆییەکی زۆر گەورەش لەپشت ئەو پرۆژەیەوە هەیە.

نەوا: ئەی کاک مەلابەختیار رەخنەت چییە لەبەرنامەی یەکگرتووی ئیسلامی؟

مەلابەختیار: هەر جیابونەوەیان لەلیستی هاوپەیمانی خۆی مونتەڵقی هەڵەکە دیارینەکاتو پێشم وایە ئەو ناکۆکیەی کە دروست بوو، کە خەڵك تەفسیری جیاوازی هەیە، مەشغوڵ بوون بەکێشەی جیاوازەوە، ئەمانە هەمووی هەڵەیە، سەرەنجام ئەگەر بەرنامەکەشیان تۆزێ لەبەرنامەکەی ئێمە جیاوازبێ، ئەوەی نەدەهێنا جیاببنەوە، با لەگەڵمان بونایە چوار ساڵی تریش یەکتریمان تاقی بکردایەتەوە مومکین بوو هەم ئەوان باشتر لەئێمە بگەنو هەم ئێمەش لەوان باشتر تێبگەیشتینایە، یانی مونتەڵەقەکەیان کە جیابوونەوە، من ئەڵێم لەسەر کورسیە، کاك سەمیر ئەڵێ لەسەر کورسی نیە لەسەر هەر شتێ بێ، جیانەبونەوەیان باشترە لەجیابونەوەیان.

نەوا: ئێستا رێگا بە کاك سەمیریش ئەدەین کە قسەی خۆی بکات، ئایا رەخنەی چییە لەلیستی هاوپەیمانیو هۆکاری جیابونەوەیان؟

سەمیر سەلیم: حەزدەکەم لەسەر جیابونەوە نا، بەڵکو نەچونە ناو هاوپەیمانی، چونکە هیچ رێکەوتنو پرۆتۆکۆلێك لەلیستی هاوپەیمانی نەبووە بۆئەوەی تەمەنی هاوپەیمانی دیاری بکات، بەڵام ئەگەر یەکێتییو پارتی لەنێوان خۆیاندا ئیتفاقێکی سرییان هەیە، ئەبێ هەموو ئەحزاب لەسەردەستی ئەوان بسورێتەوە، ئەوە ئێمە ناچینە ناو ئەو فەلەکەوە، ئێمە لەراستیدا قۆناغی ئیسلاحمان دەستپێکردوە لەهەرێمی کوردستاندا، ئێمە دەزانین کە تەمەنی درێژی هەیە، کە هەموو ئەو شتانە رێکبخەین، بەڵام شەرەفی قۆناغی ئیسلاح بەئێمە دراوە.

مەلابەختیار: کاکە لەساڵی ۲۰۰۰ سەرۆکی حکومەتی یەکێتیی لەسەر تەلەفزیۆن رایگەیاند کە ئیسلاح دەستپێدەکەین.

سەمیر سەلیم: ئەوە قسە بوو، ئێمە ئێستا وەکو پرۆژەی ئیسلاحمان دەستپێکردووە بۆ جیلەکانی داهاتوو دەرگاو پەنجەرەی ئیسلاحمان کردۆتەوە، ئەرکمان بۆ نەوەکانی داهاتووش دیاریکردووە، نەك هەر بۆ ئێستا، ئەوە خاڵێك، خاڵی دووەم بۆئەوەی دەمج بێت بەزمانەتەوە بۆ

جێبەجێکردن، ئێمە بەم تەنیا دابەزینە ئیعتبارو نرخو بەهامان بۆ رای هاوڵاتی گەڕاندەوە، لەمەولا لەرێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە پرۆژەی تەغیر دەستپێئەکات، زمانات دەستپێئەکات، یەکێتیی و پارتیی و هەموو ئەحزاتبەکان بەیەککگرتو و غەیری یەککگرتووەوە ئەبێ نرخ بۆ رای هاوڵاتی دابنێین، چونکە لەرێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە پرۆژەیان ئەگۆڕن، مەوقیعیان ئەگۆڕن، کاریگەرییان ئەگۆڕن، هەموو ئەوانە ئێمە توانیومانە بیکەین ئەبێتە زەمانات، خاڵی سێیەم: ئێمە وەکو لیستی یەککگرتوو لەراستیدا هاوکاری لیستەکانی تر ئەبین، خەبات دەکەین بۆ چەسپاندنی مافەکانی گەلی کوردو قەزیەی سیاسی میللەتەکەمان فەرامۆش ناکەین و هەر قەزییەیەك دژ بەموعادەلەی سیاسی کورد بێت ئێمە دژی ئەوەستینەوەو هەرکەسێ پشتیوانی لەقەزیەی سیاسی میللەتەکەمان بکات، ئێمە پشتیوانی لێئەکەین لەو بەشەی کە پشتیوانی لێئەکات، نەك لەسەرتاسەری پرۆژەکانی تردا، بەنیسبەت جیابونەوەوە، لەراستیدا ئێمە دەستپێکردنی مێژووی ئیسلاح، دروستکردنی سەرەتای ئەزمونێکی ئیسلاحخوازانەیە، ئەوەش بۆ جەماوەر بەجێئەهێڵم، ئێمە وەکو یەککگرتووی ئیسلامی ئامادەین بۆ ئەو ئەرکانەی کە جەماوەر بەئێمەی ئەسپێرێ، لەراستیدا یەکنەگرتنەوەی دوو ئیدارەش بۆ پەلەنەکردن و ٨٠٪ و ٢٠٪ کە کاك مەلابەختیار ئاماژەی پێکرد جۆرێکە لەتەنزیرکردن بۆ هێشتنەوەی دوو ئیدارە، من حەزم کرد ئیدانیەکی باش بکرایە، پاساو بۆ دواخستن و درەنگکەوتنی دوو ئیدارەکە نەهێنرایەتەوە.

نەوا: کاك مەلابەختیار لەسەر پاساو ئەڵێی چی؟

مەلابەختیار: جارێ لەسەر مەسەلەی ئیسلاح، من پێم وابێ کاك سەمیر غەدرێکی گەورە ئەکات، ئیسلاح چەند ساڵە لەناو (ی.ن.ك)و حکومەتەکەدا دەستپێکردووە ئەتوانم بڵێم بەلیست هەتا ئێستا دووسەد جۆرە پۆستی گەورە گەورە و دەزگای گەورە گەورە خراونەتە ژێر لێپێچینەوەوە، دۆخەکە باشتر ئەڕوات.

سەمیر سەلیم: ئەنجامەکانی چی بوو؟

مەلابەختیار: بزانە لەساڵی رابردوو چەند وەزیر گۆڕاوە، چەند مودیر عام گۆڕاوە، چەند پرۆژە گۆڕاوە، چەند قۆنتەراتچی لادراوە، چەند مشەخۆر لابراوە، وەرە هەموو ئامارەکەت لەئەنجومەنی وەزیران پێئەدەم، بۆئەوەی بزانی کە تۆ بەبێ زانیاری ناتوانی قسە بکەیت، من هەموو ئامارەکانم لایە، هەر ئێستا هەشت مودیر عام کە موستەهەقی مودیر عامیی نەبوون، لەژێر لێکۆڵینەوەدان، ئەمە یەك، دووەمیش ئیعتبار کردن بۆ هاوڵاتی بەراستی ئەمە.

نەوا: ببورە کاك بەختیار ماوەی بەرنامەکەمان کەمی ماوە، حەزدەکەین چەند پرسیارێك هەیە بکەین، ئەو روداوەی دهۆك کە رویدا جەنابت لەوباوەڕەدا نیت کە وائەکات ئەو کەسانەی کە دژن یا لیستی جیان لەجەبهەیەکدا کۆبکاتەوەو زەرەر لەپرۆسەی دیموکراسیو سومعەی دیموکراسی بگەیەنێ لەکوردستان؟

مەلابەختیار: جارێ وەڵامی ترم هەیە، ئەو برادەرە دەیەوێ خۆی وا پیشان بدات کە خزبەکەی ئیعتباری بۆ جەماوەر گێڕاوەتەوە، من پێم وابێ ئەمە تەوهینکردنە بەهاوڵاتی، حزبێك هیچ مێژوویەکی نەبێو خیتابێکی ئیسلامی هەبێو ئیعتباری هەموو هاوڵاتیەك بەئینتمائاتی جیاوازەوە، بەبیرو فەلسەفەی جیاوازەوە، بگێڕێتەوە بۆ خیتابی خۆی، ئێمە بەتاقی تەنیا ناتوانین هەموو ئیعبارێك بۆ هاوڵاتی بگێڕینەوە، پارتیش بەتاقی تەنیا ناتوانێ، هیچ حزبێکیش بەتەنیا ناتوانێ ئەمە بکات، ئەفکارو فەلسەفەو بیروبۆچون جیاوازن، لەبەرئەوەیە یەکگرتو ئەتوانێ تەنیا بۆ ئەندامەکانیو ئەوانەی باوەڕیان بەخیتابەکەی ئەو هەیە ئیعتباری ئیسلامی بۆ ئەوان بگێڕێتەوە، یا بەشێکیش سیاسەتی تیا بێ، بۆ پرسیارەکەی جەنابت، من بەروتی قسەم کرد، ئێمە وەکو (ی.ن.ك) لەناوچەکەی ژێر دەسەڵاتی خۆمان هەرگیزاوهەرگیز رێگەنادەین هیچ کەسێك ئەم کارانە بکاتو جەنابی سەرۆکی هەرێم، لیژنەی باڵای هەڵبژاردن بەبەیانی رەسمی ئیدانەی کارەکەیان کردووەو بێگومانیش زەرەری هەیە بۆ پرۆسە دیموکراسیەکەی ئێمە، بۆیە ئیدانە کراوە.

سەمیر سەلیم: وابزانم کاك بەختیار بەرەوای نابینێ ئێمە ئیعتباریش بکەین بۆ ئەو هاوڵاتیانەو پێشم وایە پرۆسەی گۆڕانی لەمەولا ئەو رەدی ئیعتبارە بەگەڕی ئەخاتەوە.

مەلابەختیار: ئەوە نیە ئیخوان موسلمین لەمیسر ئیعتباری گەڕاندۆتەوە، ئەوە نیە ئیخوان موسلمین لەئوردن‌و کوەیت‌و کوێ‌و کوێ ئیعتباری بۆ هاوڵاتی گەڕاندۆتەوە.

سەمیر سەلیم: ئێمە لەکوردستان دەیکەین.

مەلابەختیار: ئەگەر موسڵمانێکی کوردستانی بویتایە مقاوەمەتت ئەکرد.

سەمیر سەلیم: ئێ کاکە مقاوەمەتیشمان کردووە.

مەلابەختیار: زۆرت کردووە، ئەوە نیە قایمەی شەهیدەکانت ئەوەندە زۆرن حکومەت پارەکەی بۆ نادرێ!!

نەوا: بەڵێ، سوپاس بۆ بەڕێز کاك مەلابەختیار ئەندامی مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك) کە بەتەلەفۆن لەخانەقینەوە لەگەڵمان بوو، سوپاس بۆ بەڕێز سەمیر سەلیم ئەندامی سەرکردایەتی یەکگرتوی ئیسلامی لەستۆدیۆ بۆ ئەم بەرنامە تایبەتە، سوپاس بۆ ئێوە.

مەلابەختیار: لەکۆتاییدا سوپاس بۆ کاك سەمیرو عاجز نەبین لەیەکتر باشە، خواتان لەگەڵ.